


سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح

کۆکردنەوە و ڕێکخستنی: محەمەد ئەحمەد عەلی بەرزنجی

# ئاوێنەی ژینم

## یادداشتەکانی شاکر فەتاح



سەرجەمی بەرهەمی شاکر فەتاح

کتێبی یەکەم

# ئاوێنەی ژینم

## یادداشتەکانی شاکر فەتاح

لەگەڵ ڕۆژنامەکانی: خورماڵ، باسەرە، چەمچەماڵ، ئاگرێ و پرۆژەی خوێندەواری کورد

ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی

ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی

ناوی کتێب: ئاوێنەی ژینم - کتێبی یەکەم لە سەرجەمی بەرهەمەکانی شاکر فەتاح
دانانی: شاکر فەتاح
ڕێکخستن و لێکۆڵینەوەی: ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٢١٥
پیت لێدان و دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
خۆشنووسیی بەرگ: محەمەد زادە
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٣
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣١٤)ی ساڵی ٢٠٠٣ی دراوەتێ

# پێشەکی

## شاکر فەتاح

### پیاوێکی دەگمەن تا پلەی شەهادەت

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان..

کە دەزگەی ئاراس رووی لێ نام بۆ لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی بەرهەمەکانی نووسەری شەهید شاکر فەتاح، زۆر خۆشنوود و خۆم بەبەختەوەر زانی؛ چونکە ماوەیەکی زۆر بوو کە منیش لە خودی خۆمدا ئەو خولیایەم دەهێنا و دەبرد، بەڵام کە بیرم لە کاری چاپکردن و بڵاوکردنەوەکەی دەکردەوە... خاو دەبوومەوە، حەزم کرد هەر دەزگەیەکی لە چەشنی ئاراس ئەم کارە بگرێتە ئەستۆ، چونکە تێچوونی چاپکردنی هەمیشە ئاستەنگێک بووە لەبەردەم نووسەراندا.

شەهید شاکر فەتاح، پیاوێکی ئاسایی ناو کۆمەڵەکمان نەبوو کە بەدرێژایی ژینی پابەندی کار و وەزیفەکەی بووبێ و دواتر خانەنشین کرابێ و دیسانەوە هەلی بۆ رەخسابێ و کەوتبێتەوە خزمەت، خزمەتکردن لە دامەزراوێکی دژ بەداوا رەواکانی میللەتەکەی، دوایی هەڵەیەکی لە پیلکە دەرچووبێ، بووبێتە مارەکەی شێخ ئۆمەر و لە گەردنی ئاڵابێ تا ئاستی هەناسە لێ بڕین و تاساندن.

زۆرن لەو جۆرە کەسانە، لە گەرمەی (خزمەت)یاندا هەڵەیەک لە دەستیان دەرچووە و... دوایی لەسەر ئەو سنووقەی کە تیایدا ناردوویانەتەوە بەدەست و فلچەیەکی نارێک رەنجی پێشووشیان بەبا دەدا...!!

ئەم وەک لیی دەدوێن: «لە مێژووی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی هەر نەتەوەیەکدا کەسانێک پەیدا دەبن، چ بەنووسین. یا بە پەند و ئامۆژگاری، ئەو بەهاو چاکە گشتییانە دەپارێزن و خەڵکی بۆ رێنمایی و پابەندبوون بەوانەوە رادەهێنن؛ لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە کەسانێکی وا پەیدا دەبن، هەرچەند کەمن، کە لە پێناو بەرجەستەکردن و پاراستنی ئەو بەها گشتیانەدا، گیانی خۆیان بەخت دەکەن، واتە: بەهادارترین بەهای وجودیان کە خودی ژیان و مانەوەیانە دەکەنە فیدای بیر و باوەڕیان، هەر بۆیەشە کە دەڵێم: شاکر فەتاحی شەهید بەلای منەوە، یەکێکە لەو شەخسییەتە مێژووییانەی نەتەوەی کورد».[1]

ئا لێرەدایە جیاوازیەکە بەراشکاوی دەردەکەوێ: کەسایەتییەکی خاوەن باوەڕێکی نەگۆڕ بەمافی نەتەوەکەی، وەک مرۆڤ، بەژیانێکی سەربەرز و ئازاد و دوور لە چەوساندنەوە و داگیرکردن. ژیان و کار و چالاکی خۆی بۆ ئەو پێناوە تەرخان دەکات، بەشێوازێکی هێمنانەی دوور لە توندوتیژی کە هەست و

(١) فەلەکەدین کاکەیی: شاکر فەتاح شەهیدی ئازادیی بیرورا دەربڕین، لە دستووسێکی شاکر فەتاحی شەهید، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر ١٩٩٨، ل ١٧٦.

ئەستی ناسکی ڕێگای پێ نادات هەتا بەرامبەر دوژمنەکەشی ڕەقی و زۆرەملێ بنوێنێ، ئەم هەر لە سەرەتای ڕێگایدا ئەو خواست و ئامانجەی بۆ خۆی دەستنیشان کردووە. بڕوانە ئەم ئاوێنەی ژینەی کە چۆن شەوقی ئەو حەقیقەتە بەرجەستەکراوە دەداتەوە کە لە هەرزەییەوە تا ئاوابوونی ئەستێرەکەی هەمیشە و لەهەر جێیەک بووبێ ئەو نەتەوە و گوزەران و ئازادی و ئازادی ڕادەربڕینی لە لا لە هەموو شت لە پێشتر بووە... منالّ دەبێ، لەو ماوە کەمەی حوکمی شێخ مەحمووددا، لە سلێمانی، ئەو بەحەسرەتەوە یادی دەکاتەوە: «دڵی هەموو لایەکمان خۆشبوو بەو ئازادی و سەربەستییەی کە دەست نەتەوەی کورد کەوتبوو، هەر ڕۆژە بازێکمان دەدا بەرەو سەربەرزی و تێگەیشتن و کامەرانی».

دەبێ ئەو ڕاستییە مێژووییەش لەمەیدا بخەینە بەرچاو کە هەرچی چینی دەوڵەمەند و بازرگانەکانە، ئەو ڕۆژانە، بەستەوەی باشووری کوردستانیان بەبەغداوە لە لا باشتر بوو، شاکر فەتاحیش کوڕی یەکێک لەو خانەوادە و بنەماڵانە بوو لە دەرگەزێن، بەڵام خۆشەویستی نەتەوەی هێند چوو بوو بەدڵدا کە (رفض الطبقي)یەکی لە لا دروست کردبوو.

شێوازی هێمنی و دوور لە توندوتیژی لە خەبات و هەوڵدانیدا وەک زۆر کەس، لە دوای تەجرەبە و تاقیکردنەوەی درێژی ژیاندا نەبوو، لە هەرەتی لاوێتیشیا هەر بەو شێوازەوە پابەند بووە، ئەمەش وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە کە: بۆ لە ژیانیدا نەچۆتە ناو هیچ تاقم و حیزبێکی سیاسییەوە؟

ڕاستە ئەو کە فامی کردۆتەوە و بۆتە لاوێکی ئاگا بەرووداوەکانی دەوروپشتی، نەتەوەکەی لە نوشوستییەکەوە بۆ یەکێکی دی دەچوو، نسکۆ لە دوای نسکۆ بەرەو ڕووی کورد دەبۆوە، شۆڕشەکانی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری، شێخ عەبدوسەلامی بارزانی، شێخ مەحموود و سمکۆی شکاک، شێخ سەعیدی پیران، دەرسیم و بارزانی یەکەم... تا ئەمانە هەموویان کەش و هەوایەکی سامناکی لە ناواندا خستبۆوە، بێ ئومێدی و دەست لە خۆشتنی لە دەرووندا دەناخنی، لەو ڕۆژانەدا ئەوەی بەپێچەوانەی تەوژمەکانەوە، دەڕۆیی و سنگی دەدایەبەر تەنیا چینی خوێندەوار و ئەوانە بوون کە بەراستی چەکەی ئاگری داگیرکردن و زوڵمەکە دەبیرژاندن.

ئەم لەوانەبوو کە لە نزیکەوە هەستی بەئازارەکانی دەکرد، کەپەی ئازاری شەشی ئەیلوولی ۱۹۳۰ لە دڵ دەرنەدەچوو، هانی دەدا، وەک کەپەکانی تر، بۆ زیاتر بەتەنگەوە هاتنی گەلەکەی... هەتا ناردنی کارتی جەژنە پیرۆزەی بەلاوە شوورەیی دەبێ، دەڵێ: چۆن جەژن بکەین و نەتەوە وا لەژێر باری خەمدا؟ کە لە لوبنان دەبێ و لەگەڵ هاوەڵە عەرەبەکانیدا دەخوێنێ، لە یادی لەدایکبوونی مەلیکی عێراقدا دەیانەوێ زەماوەند بکەن.

ئەم تیادەمێنێ، لە نێوان ئەرکی برادەرایەتی ئەوان و کوردبوونی خۆی کە هێشتا یادەوەرییە تاڵەکان بەبەرچاویەوەن... دوایی بڕیار دەدا:

- ئەگەر نەیکەم دەبێ ۳۵ هاوڕێ لە خۆم بکەم، بەڵام کورد و بەرزێتی کوردایەتی لە هاوڕێیەتی گەورەتر نییە؟

لە ژیانی وەزیفەیشیدا هەر هەمان بیر و هەڵوێست و پاڵنەر لەنگەری کردەوەکانیان گرتووە، چۆتە هەر

جێیە سەرەتا بیری لە چۆنێتی دەرد و ئازارەکانی خەڵکەکە کردۆتەوە، ئەوسا گەڕاوە بەدووی ڕێگاچارە و شێوازی خزمەت بەو مەحروومانەی گیرۆدەی دەستی (نەخۆشی و هەژاری و نەخوێندەواری) بوون.

لەناو خەڵکەکەدا بێ پەروا بەدووی دڵسۆز و کوردپەروەردا گەڕاوە، ئەوەتا لە لادێی قەرە حەسەندا: لە یەک دووانێکەوە ئەبێ هەستێکی بڵندی کوردایەتیم لەناو خەڵکەکەدا نەدی!!... بەڵام ئەمە پاساوی ئەوە نابێ بۆ خزمەت نەکردنیان.

چونکە ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە: (جۆری ڕژێمەکە هەر چۆنێ بێ، کاربەدەستی کوردی دڵسۆز دەتوانێ بەپێی دەرفەت، یا ئەو دەرفەتە بخولقێنێ و خزمەتگوزاری خۆی بەو خەڵکە بکات، بەڵام کە کاربەدەست ناپاک و دز و چاوچنۆک بوو، هەتا لە سایەی حوکمێکی کوردیشەوە خیانەت و ناپاکی خۆی هەر دەکات).

مێژووی ئەم قسەیەی سەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی پێشوو، ئەمڕۆ ئاخۆ چەندان کەس بیانگرێتەوە!!... مەزنی بیر و کرداری ئەو پیاوە تا لەمەدا بووە، چونکە: «إن الفكرة والشخصية شيئان متناقضان بمعنى معين، لكنها، من جانب آخر، تتشابهان تماماً. يعيش الأنسان وهو يتعمق في العالم الخارجي ويتفاعل باستمرار مع كافة ظواهره. وهذا هو بالضبط الطريق نحو الفكرة والشخصية»[1] ئەو ڕێڕەوەکەی ڕوون و ئاشکرا بووە، بێ وەی وەک پەپوولەیەک بەناو چەرە دووکەڵێکی پاوەنێکی سووتاودا دەڕۆیی، شەیدای پانتاییە ئاسوودەیی بوو، کە نەیدەدی... هەوڵی دەدا خۆی بیهێنێتەدی، تا دەوروبەرەکەی تیادا بحەوێنێتەوە... ئەو پیاوە لیۆن تۆلستۆی و ڕۆمان ڕۆلان و گاندی سەردەمی خۆی بوو... بەڵام لە کوردستانێکی پارچە و بریندارا.

لەم سۆنگەیەوە دەبێ بڕوانینە کار و فەرمانەکانی، بەرهەمەکانی؛ دەیویست بەو خەڵکە بڵێ بڕوانن: گەورە پیاوانی دنیا چۆن بوونە مرۆ و ڕێگای نەتەوەکانیان ڕۆشن دەکردەوە، بزانن: گەلان چۆن ژیاون و ئێستا چۆنن، تێبگەن: مێژووی ڕابردووی خۆتان بۆ پڕە لە داماوی و ستەم و جێگا شەپازلەی بیانی؟ ڕامێن: بۆ بوونە کەوی ناو قەفەس؟! دەبانەوەی دلهاتوو وا نەبێ، باهەمان هێڵی پێشوو نەکێڵنەوە، بۆ ئەمە یەکەم کەسێک بوو دەرگای ئەدەبی منداڵانی تەقاندەوە و لێی دا، لە (خانووی تازە)وە دەستی دایە بەرەو (هاوڕێی منداڵ) و... هتد.

تێفکرە، چۆن دەچووە هەر قەزا و ناحیەیەکی کوردەواری، سەروەتی نەبوو: چاوێکی بەمناڵە هەژارەکانی ناو ئەو ژوورە ئزمە بچووکە بێ پەنجەرانەدا دەگێڕا، گورج دەکەوتە داگیرساندنی دەیان مۆمی ژیان لە ڕێیاندا... حکوومەت پارەی نەدەدا، ئەم ڕەزامەندی وەردەگرت پیتاکی بۆ دەکردن، (باخچەی گشت لایی) بۆ دەکردنەوە، ئاهەنگی گۆرانی و شانۆگەری ساکاری بۆ دەگێڕان، ڕۆژنامەیەکی دەستنووسی دیواری بەدەستی خۆی بۆ دەردەهێنان و هەر ئەبێ ڕادیۆیەکی پاتری بۆ پەیدا دەکردن... هۆکانی پەیوەندی و ڕاگەیاندن بەساکارترین شێوە، ئاوا دەیویست دەستی ئەو کوردە بگرێ و لە کلاوڕۆژنەیەکی ئەگەر

(١) بوريس بورسوف: الواقعية اليوم وأبداً، وزارة الأعلام، بغداد ١٩٧٤، ص ١٥.

بچووکیشەوە بێ دنیای ئەو ڕۆژەیان پیشان دات. بزە سەر لێویان خات، ئەگەر بۆ چەند ساتێکیش بێ هیلاکی و ماندوویەتی و داوماوییان لەبیر بەرێتەوە... ئەو باوک و برا و دۆستیان بوو، بەر لەوەی بەڕێوەبەری کاروباری حوکمەت بێ لە دەڤەرەکەدا.

ئێمە کە دیفاع لەو پیاوە دەگمەنە دەکەین دەبێ بەڵگەمان پێ بێ، تا خوێنەر قایل بێ. دیقەتی ئەم بەڵگەیە بدە. ورد بیخوێنەرەوە و ئەوسا بزانە ئەو پیاوە چ ڕاستگۆ و چ بوێرێک بووە.

لە سەرەتای ساڵی ۱۹۷۳وە حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی حزبی بەعس دەستیان کرد بەرێکخستنی چەند کۆڕ و کۆبوونەوەیەک لەگەڵ نوێنەرانی حزبی شیوعی عێراق (کە ئەوسا ڕێککەوتننامەی بەرەیەکیان لە نێواندا بوو) و کەسایەتییە بێ لایەن و دیموکراتییەکاندا بەمەبەستی گەیشتن بەڕێگەچارە و شێوازێکی مەسەلەی کورد و پرۆژەی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان وە جێبەجێکردنی ناوەرۆکەکانی ڕێککەوتننامەی یانزەی ئازاری ۱۹۷۰ کە لەگەڵ سەرکردایەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و ڕابەرەکەی بارزانیی نەمردا مۆر کرابوو. لە ڕاستیدا حکومەت و حزب دەیانویست بەم کارەیان گەلێ مەبەستی جیاجیا ئەنجام دەن: لەلایەکەوە وای بسەلمێنن کە سەرکردایەتی بزووتنەوەی کورد و بارزانیی نەمر تاکە لایەنێک نین کە نوێنەرایەتی کوردی عێراق بکەن، بەڵکو ئەو کەسایەتییە کوردانەی کە خۆی کۆی دەکردنەوە، لایەنێکی حیساب بۆ کراون... بەمەش درزێکی لە ڕووبەری بزووتنەوەکە و گەلی کورددا دروست دەکرد.

لەلایەکی دی حزبی شیوعیشی وا هێنایە کایەوە لە لایەنێکی سیاسی بەڕێوەچوونی حوکمی عێراقە (بەپێی ئەو بەرەیەی کە لە نێوانیاندا هەبوو) لەناو گەلی کوردیشدا هەر سەرکردایەتی مەلا مستەفای بارزانی و پارتەکەی نییە. خۆ هەر چەندە سەرکردایەتی عێراقی هێند ڕاوبۆچوونەکانی ئەو کۆڕ و کۆبوونەوانەی بەبایەخ هەڵنەدەگرت، خۆیان چیان بڕیاردابوو هەر ئەوەبوو، بەڵام لە ناوەرۆکدا لاوازکردنی سەرکردایەتی کورد ئامانجی بەرودوابوو... چونکە ئایندە و ڕووداوەکانی دوای ئەمانە ئەم ڕاستییەی دەرخست. دەربارەی کۆڕ و کۆبوونەوەکان، ڕۆژنامەی (الثورة)ی ئۆرگانی حزبی بەعس لە ژمارە ۱۳٤۱ی ٤/۱/۱۹۷۳دا، لە سەروتارەکەیدا دەڵێ: «... كانت تلك الأوساط والعناصر -الدوائر الأستعمارية والرجعية والعناصر الحاقدة على مسيرة الثورة. أ.ب.- تستهدف، عن عمد، تشوية الوجه الديمقراطي لتجربتنا الثورية، وإظهار الحوار الصريح والجاد سواء بين ممثلي الحزبين، أو على صفحات الصحف وكأنه بداية للصراع... وليس الطريق الصائب والناضج لمعالجة مشكلات الوطن». تا دەگاتە ئەوەی دەڵێ:

«وعلى هذا الأساس فقد بادر حزب البعث العربي الأشتراكي إلى إستئناف الحوار مع الحزب الديمقراطي الكردستاني وبمشاركة ممثلين عن الحزب الشيوعي العراقي والشخصيات القومية والديمقراطية».

لەلایەکی ترەوە هەر (الثورة) دەستی کرد بەبلاوکردنەوەی زنجیرە وتارێک، لە ژمارەی ڕۆژی ۳/۱/۱۹۷۳وە، لە گۆشەی (آراء حرة) بەناونیشانی (مساهمة في الحوار الكبير) بەپێنووسی (کاتب

ساسي)، که گوایه وەلامدانەوەیەکی زنجیرە وتارەکانی (التآخي)یە، بەلام لە ڕاستیدا هێرش بردنە سەر سەرکردایەتی کورد و شۆڕشەکەی بوو، بروبیانوو هێنانەوە بوو بۆ دابڕانی جەماوەری کورد لەو سەرکردایەتییە. لە بەرچاوخستنی شەخسی بارزانیی نەمر لەلای گەلەکەی وەک ڕەمزی شۆڕش و سووربوون لەسەر داوا ڕەواکان.. دیارە ئەم (لێدان و لەبەرچاوخستنە) ئامانج و ئاواتی هەموو دوژمنانی گەل و شۆڕش بووە، بۆیە لەم پێناوەدا خواهەڵناگرێ درێغیان نەکردووە. لە دوا زنجیرەی ئەو وتارەدا (الثورة) دەڵێ:

«بقيت نقطة أخيرة أود أن أمر عليها قبل الأنتهاء، وهي الخاصة بتعريف العراق بأنه قطر عربي، وجزء من الوطن العربي -لايعني المفهوم الآخر القائل بأن العراق جزء من الأمة العربية.

فاعتقد أن الأعتراض على هذا التعريف هو إعتراض على حقيقة تأريخية وسياسية ودولية وعلمية، وهو إعتراض مرفوض، فقطرنا جزء من الوطن العربي ولكنه جزء يضم على أرضه شعبين- الشعب العربي الذي هو جزء من أمة عربية أكبر، والشعب الكردي الذي هو جزء من أمة كردية أكبر تبلغ ١٢ مليون نسمة... وهذا القطر هو موطن مشترك للشعبين المتآخيين عزيز عليهما كليهما، وليس أبداً -كياناً خلقه الأستعمار-»[1]

ئێمە (بەتایبەت) ئەم بەشەی ئەڵقەی زنجیرەکەمان بۆیە خستەڕوو، تا خوێنەری هێژا ڕادەی چوونە ناوەوەی باسەکان لەگەڵ میریدا بزانێ و تێبگات کە سەرکردایەتی کورد تا چ ڕادەیە پەرۆش و پابەندی (خاک) و (نەتەوە) بووە وەک دوو یەکەی تەواوکەر و لێک نەپچڕاو، بەلام بەرامبەر چۆن لەم مەسەلە وردە گرنگەدا بەبروبیانوو هەوڵی لێڵکردنی ئەو باسە دەدات. عێراقیش بەقەبارەیەکی وا دادەنێ کە (لیس أبداً خلقه الأستعمار)، ڕاستییە مێژووییەکانی سایکس بیکۆ و کۆنگرەی قاهیرەی ١٩٢١ هەمووی گەواهن کە عێراق چۆن خولقێنرا!!

هەرچەندە باسەکەی ئێمە لێرەدا ئەمە نییە، بەلام دەبێ ئەو ڕاوبۆچوونانەی کە مامۆستا لە خوارەوە نووسیونی بەهێندی وەرگرین، وەک ڕاستییەکەی شاکر فەتاح یەکێک بووە لەو کەسایەتییە ناودارانەی لەلایەن حکومەت و حزبەوە لە بەغدا حیسابی بۆ کراوە، مەبەستیان بووە کە بەشداری بکەن لەو کۆڕ و کۆبوونەوانەدا. وەک کەسایەتییەکی نیشتمانی بێ لایەنی خاوەن ڕاوبۆچوونی تایبەتی خۆی، ئەوان مەبەستیان بووە کە بەشداری بکەن، کە داوەتنامەکەیان بۆ ناردووە، ئەو لە هەڵوێستی نەگۆڕی خۆیەوە بەرامبەر بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و سەرکردەی گەلەکەی، حەزی بەو بەشدارییە نەکردووە؛ چونکە بەچاکی ئەزانیوە کە لە پشت ئەو لایەنەی هەر لە سەرەتادا ڕێککەوتننامەکەی یانزەی ئازاری لەگەڵدا مۆرکرا، ئەمان لە مەسەلە و پرۆژەیەک بدوێن کە ڕاستتر وابوو بەرەوڕووی خاوەنە ئەسڵییەکەی بکرێتەوە.

(١) الثورة: العدد ١٣٥٧ في ١٩٧٣/١/٢٦، الحلقة السابعة. ص ٣.

بۆیە وەک زۆری تر لەو کەسایەتییە نیشتمانپەروەرانە بەپیر ئەو داوایەوە نەچوو و بەشداری نەکرد.

بەڵام لە بەغدا، هەردەیانەوێ (بەهەچ شێوەیەک بێ) ئەم و ئەوانەی وەک ئەمن... ڕایانکێشنە ناو بازنەی گەمەکەوە. بۆ دووەم جار نامەیەکی تری ئاراستە دەکەنەوە.

وەڵامی ئەمجارەیان بیر خەرەوە (مذکرة)یەک دەبێ کە بەخەتی خۆی ئاراستەیان دەکا و زۆر بەڕاشکاوی و بوێرانە و ژیریەوە ڕاوبۆچوونەکانی خۆی دەردەبڕێ.

***

مامۆستا لە مانگی تشرینی دووی ١٩٧٣دا نووسراوێکی ڕەسمی مۆرکراوی لە (القیادة القطریة لحزب البعث العربي الأشتراكي -مكتب أمانه السر للقطر العراقي)یەوە ئاراستە کراوە (بەبێ بەروار، تەنیا مامۆستا خۆی لە داوێنیدا نووسیویە -أجیب في ١٩٧٣/١١/١٦ و ئیمزای کردووە) ئەمە دەقەکەیەتی:

تحية وتقدير

سبق وان وجهت القيادة القطرية لحزب البعث العربي الأشتراكي دعوة لحضوركم مناقشة مشروع الحكم الذاتي بهدف الأستفادة من رأيكم ووجهة نظركم حوله.

إن الأجتماعات التي جرت لمناقشة هذا الموضوع ومنها الأجتماع الخاص بالشخصيات الوطنية الكردية المستقلة كانت مثمرة للغاية في تقديم الملاحظات والأقتراحات البنا ءة حول المشروع الأمر الذي يدفعنا الى طلب المزيد من المشاركة والمساهمة في بحث المشروع وإنضاجه.

وإننا إذ نقدر تمام التقدير الظروف الخاصة الدقيقة التي أحاطت بكم وحالت دون حضوركم الأجتماع المخصص لمناقشة المشروع مع باقي الشخصيات الوطنية الكردية المستقلة، نأمل مشاركتكم في مناقشة المشروع بارسال مقترحاتكم وملاحظاتكم التحريرية التي ستكون موضوع إهتمام وتقدير الى القيادة القطرية (مكتب أمانة سر القطر - بغداد) بالطريقة التي ترونها ملائمة لظروفكم.

مع التقدير

القيادة القطرية

لحزب البعث العربي الأشتراكي

(الختم)

مامۆستاش بەم بیرخەرەوە (مذکرة)یە وەڵامێکی دەستنووسیی خۆی داوەتەوە، کە نوسخەی دووەمی، کە بەکاربوتە، لەگەڵ نووسراوەکەی سەرەوە لە هەینی ٢٠٠٢/٧/٢٦ لەناو کۆمەڵێ نامە و نووسراوی تایبەتیدا لەگەڵ بەڕێز د. شێرکۆی کوڕیدا دۆزیمانەوە، ئەمەش دەقی بیرخەرەوەکەیە وەک وەڵامێ بۆ داواکەی (مكتب أمانة السر القطر العراقي) کە بەخەتی خۆیەتی:

القيادة القطرية لحزب البعث العربي الأشتراكي المحترم

مكتب أمانة سر القطر - بغداد

تحية طيبة وتقدير

لما كانت المقترحات التي قدمها إليكم (الحزب الديمقراطي الكردستاني) حول الحكم الذاتي في كردستان العراق؛ هي ثمرة مناقشات طويلة وعميقة عبر السنين مع المثقفين الأكراد الوطنيين والزعماء السياسيين المخلصين، فهي تعتبر بحق تعبيراً حقيقياً عن رغبة الشعب الكردي وآرائه ومعتقداته حول الحكم الذاتي في كردستان العراق، بكافة طبقاته وقواه الوطنية المختلفة.

وإذ ليس هناك أي حزب سياسي ناضل بجدارة وإخلاص في كردستان سوى (الحزب الديمقراطي الكردستاني) بقيادة زعيمه المخلص الملا مصطفى البارزاني، فهو يعتبر بحق جهة ذات إختصاص في موضوع الحكم الذاتي في كردستان العراق.

وعليه ينتظر الشعب الكردي بفارغ الصبر إتفاق حزبكم الموقر مع الحزب الديمقراطي الكردستاني على موضوع الحكم الذاتي وفق ما إقترحه عليكم الحزب المذكور.

ولما كان الوطنيون الأكراد ومثقفوهم يقدرون مواقف حزب البعث العربي الأشتراكي المجيدة في سبيل الأعتراف بالحقوق القومية للشعب الكردي في العراق بما فيه (الحكم الذاتي) و(تقرير مصيره)، ولما كانت رغبة الشعب الكردي على لسان حزبه الديمقراطي الكردستاني هي (الأتحاد الأختياري) لا (الوحدة القسرية) ولا (الأنفصال)، فإن كل وطني كردي غيور على المصلحة العامة ينتظر من حزبكم المحترم إنهاء مشكلة الحكم الذاتي في كردستان باسرع وقت ممكن.. وذلك بالتعاون الوثيق وبروح الصداقة والود مع الحزب الديمقراطي الكردستاني الذي هو الحزب الوحيد الذي يمثل آمال الشعب الكردي وأمانيه.

إن شعاراتكم العزيزة: (الوحدة والحرية والأشتراكية) لتوحي إلينا، نحن الأكراد، بأنكم ستواصلون أعمالكم الجادة والخالدة في سبيل هذا الموضوع الحيوي، وذلك بالأشتراك مع صديقكم وحليفكم الحزب الديمقراطي الكردستاني، وستؤمنون للشعب الكردي (حريته وإشتراكه) في الحكم، و(وحدته) مع الشعب العربي في العراق على أساس من المساواة التامة في الحقوق والواجبات بين الشعبين الأخوين (العربي) و(الكردي).

إنكم بذلك فقط تضمنون وحدة العراق الوطنية وأمنه وسلامته وتقدمه وإزدهاره. كما وتسدون كافة الثغرات بوجه أي دس أو تشويش أو فتنة تقوم بها الرجعية والحاقدون على السلطة الوطنية، وتقطعون كافة السبل أمام الأمبريالية وأذنابها لأيّ تدخل خارجي.

هذا هو الأمر الذي يتمناه كل رجل شريف، ووطني غيور، سواء كان (كردياً) أم (عربياً).

هذا وفي الختام أرجو من الله أن يوفق العاملين المخلصين للمصلحة العامة. والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

وشكراً مع التقدير

شاكر فتاح
سليمانية - محلة شورش
صاحب مكتبة (پرۆژەی خوێندەواری کورد)
١٩٧٣/١١/١٦

بروانە ئاوێنەی ژینی... ئەمانە مشتێکن لە خەروارێک.

دوای نسکۆی ١٩٧٥ کە شەوی دەیجوور باڵی بەسەر وڵاتدا دەدا، ئەم وەک هەموو خاوەن باوەڕێکی گەشبین و ورە بەرز... شان دەداتە بەر و دڕ بەو تاریکییە دەدا، دەیڕەوێنێتەوە و خەم دەخوات، بەڵام بەبێ دەنگ.

بەر لە سی و نۆ ساڵ ئەو لە ڕوانگەی بەراوردکارییەکەوە لە نێوان سێ نەتەوەی ئەڵمان و ئینگلیز و کورددا، کە لە (فرانکفۆرت) دەبێ، دێتە سەر ئەو ئەنجامەی بڵێ: «بڕوام وایە گەلی کورد لە سروشتدا لە ئەڵمانەکان دەکەن، هەرچەندە لە گەلەکانی دراوسێی خواناسترو کارگوزارتر و دڵتەڕتر و زیرەکترە، بەڵام داخەکەم خوێنگەرمی و سەرگەرمی و کەللە ڕەقییەکەیان تا ماوەیەکی دوور و درێژ دووریان دەخاتەوە لە یەکگرتنی ڕاستەقینە و گەیشتن بەئامانجی هەرە گەورەمان کە سەربەستی و ئازادی و سەربەخۆییە.

دەبێ لە مێژوومانەوە فێربین کە: ژیان زۆرتر پێویستی بەژیری و مەندی و زرنگی و ئارام هەیە، بەسەرڕچڵی و هەڵەشەیی و جەنگاوەری هیچمان بۆ ناچێتە سەر».

کرۆکی ئەم بۆچوونەی ١٩٦٣ هەر هەمان ڕاوبۆچوونی سی و چلەکانە، بەڵام لە ڕووی لێکدانەوە و بەراوردکارییەکی واقیعی وردبینانەوە.

هەر بەو گیانەشەوە، بەو بڕوایەشەوە لە دامەزراوە حکومییەکانی دوای ١٩٧٥دا بەشدار دەبێ، دەرفەت ئەگەر هەبێ یا بتوانێ بیخولقێنێ، تا لە ڕێیەوە دیسانەوە مۆمێک داگیرسێنێ.

هەرگیز لەو بڕوایەدا نیم کە شاکر فەتاح بەبیر و نیازی کەسێکی سەرسەختی کەللەڕەقەوە چوو بێتە ئەو دامەزراوانەوە، ئەو چەکداری ناونووس نەدەکرد، ئەو دەرزی ئاژنی جەستەی نەتەوە بریندارەکەی نەدەکرد، ئەو بڕوای وابوو -وەک چەندانی کە- کە لەو جێگایانە ئەوبێ لە داخ لە دڵ و نەزانێکی تر باشترە... چونکە دەمێک بوو ئەو چەوتی ئەو فیکرەیەی کە دەڵێ: «یا هەموو یا هیچ»ی بۆ ساغ ببووە.

مارف جیاووک، تۆفیق وەهبی، سەعید قەززاز، ڕەفیق حیلمی، ئەمین زەکی و جەمال بابان و... کێ و کێ... ئەمانە لە سەردەمانێکی تاریکی وەک ١٩٧٥دا، کە کارمەندی دامەزراوە جۆربەجۆرەکانی ساڵانی ١٩٢٥ - ١٩٥٨ بوون... ئەوانە سوود و قازانج و خزمەتیان زیاد لە بارستایی سوود و قازانجی کەسێکی بیانی نامۆ بووە بەوڵات و نەتەوەکە و بگرە داخ لە دڵیش.

شاكر فەتاح نەخشە و پلانی کاولکردن و تەقاندنەوەی کانیاو و پرد و کاریزی دادەنا، مەفرەزەی نەدەگەیاندە سەر ماڵ و خێزانی کپ لە باوەشی خەودا...

ئەو هەمیشە قومن ئاو بووە بۆ ڕێبوارێکی شپرزەی گەرما بردوو لە بیابانێکی چۆڵی بێ سێبەردا... کە زەمەنیش وردە وردە نێزیک دەبۆوە لە ترۆپکی تاوان و ژێنۆساید. کە دوژمن ڕۆژ بەڕۆژ شوولی زیاتر لێ هەڵدەکێشا و شمشێری خوێناوی ڕقی بەهەر چوار لادا کوێرانە دەوەشاند... ئا لەو کاتەدا شاکر فەتاح بوێرانە دوو قسەی خێری بۆ نەتەوەکەی کرد... دوو قسە، کە مومکین نییە لە فەرهەنگی هیچ یاسا و عورف و حوکمێکدا هیچ پێویستی بە (بوێری) بکا و ئاوها سەرەنجامێکیشی لێ بکەوێتەوە.

ئەو بەپێی دەرککردنی ورد و ژیرانەی خۆی، بەشارەزایی و لێزانینی چەندەها ساڵی ژیانی، هەستی بەگەورەیی پێشهات و کارەساتە ساماکەکانی ئایندەیەکی نێزیک دەکرد. دەیزانی چ گەردەلوولێکی ڕەش و کاولکەر بەڕێوەیە... بۆیە گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە ئەو دوو قسە خێرە بدات بەگوێی ئەوانەی ئابیستن.. بەشکم بیستن.

گومان لە باوەڕی بەهێز و قایمی مامۆستا نییە بەخوا و ڕێنماییەکانی ئیسلام، دەیان جار ئەمە لە بیرەوەرییەکانیدا دەخاتە ڕوو، هەر لە قۆناغی لاوێتییەوە تا قەڵەمەکەی لە دەست دەستێنێ.

بەدرێژایی ژیانی حوکمێکی دادپەروەر و هێدی و شەرعی بەسەرخۆی و وڵات و نەتەوەکەیەوە نەدیوە... جا بەو پێیە (تقی)یەک بووە بۆ خۆی.

خوای گەورە دەفەرمووێ: «لا يتَّخذ المؤمنون الكافرين أولياء منْ دون المؤمنين ومن يفعل ذلك فليس من اللّه في شيء إلاّ أن تتّقوا منهم تُقاةً ويُحذِّرُكُمُ اللهُ نفسهُ والى اللّه المصيرُ .»

(آل العمران - ٢٨)

«تقاة: مصدر بمعنى التقية وهي أن يداري الأنسان مخافة شره». هەروەها: «التقية عند الخوف على النفس أو المال، أو التعرض للأذى الشديد» وە «التقية: أن يتكلم بلسانه وقلبه مطمئن بالأيمان».[١]

قسەمان لەسەر بەرپرسێتییەکەی دوای (١٩٧٥)ە، کە وەک وتمان گومان لە نییەتی پاک و خاوێنی نییە، لە ڕووکاری باوەڕی خۆیشەوە و پابەندبوونیەوە بەئاینە پیرۆزەکەیەوە و شێوازی تێکۆشانی هێمنی و دوور لە توندڕەوی... ئەم پیاوە ئەو جۆرە مامەڵەیەی لەگەڵ حوکمی سەردەمدا کردووە کە خوا ڕێگای پێ داوە و پێغەمبەرەکەشمان (د.خ) تیایدا دەفەرمووێ: «انا لَنَبشُّ في وجوه قوم وقلوبنا تلعنهم».

کەواتە مودارات و موسایەرەکردنی هێز و دەستەڵاتی خراپە و شەڕانگێزان و جینایەتکاران لە ناچاریدا لەلایەن موسوڵمانەوە کارێکی دروست و شیاوە، بەمەرجێ نەبێتە مایەی زیانبەخشین و ئازاردانی کەسانی دی.

بەدرێژایی کارکردنەکەشی، چ لە دامەزراوی (ئەنجومەنی گەل لە سلێمانی) و چ لە (ئەنجومەنی

(١) محمد علي الصابوني: تفسير آيات الأحكام، ج (١) -دار الأحسان للنشر- طهران، ص: ٤٠٢، ٤٠٤.

یاسادانانی ناوچەی کوردستان) لە هەولێر. بەگەواهی ئەوانەی کاریان لەو دامەزراوانەدا کردووە و لەناوماندان. لە ویستی چاکە و خێر و بەختەوەری خەڵکەکە زیاتر چی دی نەبوو. چونکە ئەو هەروا بەناسانی رابردوویەکی پڕ لە شانازی و شکۆداری دوور و درێژ لەکەدار ناکا... ئەو کاتێ هەنگاوی بەرزکردەوە سەر لوتکەی تێکۆشانی خۆی. کە لە ١٩٨٨/٣/١٢دا ئەو دوو قسە خێر و پڕ لە ئازاییەی دا بەرووی دەسەڵاتەکەدا.

ئەبوبەکری سەدیق (د.خ) دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا (د.خ) دەیفەرموو: «إن الناس إذا رأوا المنكر ولم يغيروه أوشك أن يعمهم الله بعقاب - أخرجه أبوداود والترمذي والنسائي عن قيس...».

کۆششکردنەکەی ئەویش بۆ (گۆڕینەکە) بەشێوازەکەی خۆی بووە... بەقسە و داواکردن و شێوازێکی بەدەر لە توندوتیژی.

مەزنی ئەم پیاوە لەوەدابوو کە هەرچەند لەگەڵیدا خەریک بوون (بەر لە دەستگیرکردنی و لە دواییشدا) ئامادە نەبوو پەشیمان بێتەوە یا سەودا و مامەڵە لەسەر ژیانی بکات... چونکە ئەو لە (١٩٢٧)ەوە وتبووی: «... لە دوای خوا کەسی ترم لە نەتەوەی کورد خۆشتر نەدەویست. لە راستیدا -کوردایەتی-م دەپەرست، بڕیارشم دا: هەتا دەمێنم سامان و گیان لە پێناو کامەرانی و پێشکەوتن و سەربەرزیی - کورد-دا بەخت بکەم...».

رەنگە مەزندەیەکی ئەوتۆش بێ کە بەشداریکردنەکانی ئەم دواییەی بۆ پلە و پایە و پارە بووبێ: ئەممش راستییەکانی بار و ئاستی ژیانی خۆی جۆرە بیرۆکەیەکی وا رەت دەکەنەوە و دەیدەنە دواوە.

ئەو بەپێی پلەی چینایەتی و کۆمەڵایەتی لە بنەماڵەیەکی بووە و خانەدان و موڵکدار و بازرگان بووە، وەزیفە و پایەی کارکردن لە حوکمدا هۆیەک نەبووە بۆ بەدەستخستنی پارە و سامان... ئێ هێند پارەدار و خاوەن بەرژەوەندییەکی بازرگانی ئەوتۆش نەبووە تا وەزیفە حکومییەکە بکاتە هۆیەک بۆ ململانێ و پێشکەوتن لە دنیای پارە و بازرگانی و کاردا... وەک نەیسابوری دەڵێ: «حب المال يكون في حالتين: عند كثرته منافسةً فيه، أو عند قلته حاجةً إليه. ص ٢٥٧».[1]

کەواتە شەهید شاکر فەتاح رۆڵەیەکی بەئەمەک و دڵسۆزی خاک و نەتەوەکەی خۆی بووە، پەرۆشی ئازادکردنی و رزگاربوونی بووە لە ژێردەستی و داگیرکردن. شەیدای ئەو رۆژە بووە کە گەلەکەی لە رووی شارستانییەوە بکاتە ریزی گەلانی پێشکەوتوو، حەزی بەنەهێشتنی ئەو دەردانە کردووە کە خەڵکە داماوەکەی پێیانەوە دەناڵێ (هەژاری، نەخۆشی، نەخوێندەواری...) هەرچەندە ماکی ئەمانەی هەموو دەگێڕایەوە بۆ ئەو بارە ناهەموارەی کوردستانی تیادایە بەدەست داگیرکەر و حوکمی بیانییەوە، بەڵام بەپێی ئەو دەرفەتانەی بۆی دەرەخسان کۆششێکی بەردەوامی دەکرد لە پێناو کەمکردنەوەی ئازارەکانی گەلەکەیدا. ئەو نموونەی کاربەدەستێکی دڵسۆز و خەمخۆر بووە لە حوکمێکی بیانی دامەپاو بەسەر وڵات

(١) محمد بن ابي الحسن بن الحسين النيسابوري: وضح البرهان في مشكلات القرآن. السفر الأول. دار القلم. دمشق ط١. ١٩٩٠.

و نەتەوەکەیدا، لەو جۆرە کاربەدەستە خاوێن و دەسپاکانە بووە کە مێژووی سەردەمی خۆیان شانازییان پێوە دەکات، هەروا قەڵەمە ماندوو نەناسەکەشی بەدرێژایی تەمەنی پڕ لە تەقەللای شانبەشانی خۆی مۆمێک بووە و تاریکایی ژیانی لەبەردەم نەوەکاندا ڕووناک کردۆتەوە... ئەم خەمخۆری و گیانی لەخۆبوردنەشی لە هۆشیدا، هەتا تەمەن بەرەو پیری دەبرد، زیاتر جۆشی دەسەند و بەبێدەنگیش خەمەکانی نەتەوەکەی لە ناخیدا پەنگیان دەخواردەوە.

شاکر فەتاح تێکۆشەرێک بوو لە جۆرێکی دەگمەن کە کورد بەخۆوەی بینی، چەکەکانی دەستی ئەو چەکە تەقلیدیانە نەبوو، زەوەند بوون چ لە ڕووی چۆنێتی و چ لە ڕووی چەندێتییەوە: ئەو هەتا پلە و وەزیفەی حوکمەتیشی کردبووە چەکی تێکۆشان، نووسینە فرەبابەتەکانی، گەشت و سەفەرەکانی بۆ دەرەوەی وڵات... لە پاڵ ئەمانە هەموویدا بڕوایەکی پاک و پتەو بەخوا و ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

ئەوە ماوە کە لەگەڵ مامۆستا فەلەکەدین کاکەییدا سۆز و عاتیفە وەلاخەم و ئەو چارەنووسە تراژیدیاییەی بدەمە دەست مێژوو... بڵێم:

«بەهەق و هەقیقەت، شاکر فەتاح وەک عەلائەدین سەجادی وەک پیرەمێرد و مام هەژار، یەکێکە لەو کۆڵەکە پتەوانەی مێژووی سەرهەڵدان و بووژانەوەی کورد، ئەمانە مانیفێستی سیاسییان نەنووسیوە، بەڵام زەمینەی جووڵانەوەی سیاسیی کوردیان دارشتووە».[1]

***

وەک هەنگاوی یەکەم بۆ بەجێهێنانی ئەم پرۆژە پیرۆزە، پەیوەندیم کرد بەخانەوادە بەڕێزەکەی مامۆستاوە لە سلێمانی (جەمیلەخانی هاوسەری و د. شێرکۆی کوڕی)، مەبەست و لایەنەکانی کارەکەم تێگەیاندن و بۆم ڕوون کردەوە و ئەوانیش خۆشحاڵی خۆیان بۆ ئەنجامدانی کارێکی ئاوها دەربڕی و سوپاسی دەزگەی ئاراسیشیان کرد بۆ ئەو بەتەنگەوە هاتنەی.

هەڵبەت خوێنەری هێژا لە جێیەکی تری ئەم ژیاننامەیەدا دەقی ڕەزامەندێکەی بەڕێز د. شێرکۆ بەخەتی خۆی دەبینێ. هەروا زۆر بەسوپاسیشەوە هەرچی پاشماوەکانی مامۆستایە، لە کتێب و دەستنووس و گۆڤار (ئەوانەی کە ماون) خستیانە بەردەستم تا بەپێی قۆناغەکانی پرۆژەکە سوودیان لێ ببینم.

بەداخەوە لەوەبەر دەستی کەسانێکی تر گەیشتۆتە ئەو کتێبخانە و پاشماوانە، سا بەبیانووی توێژینەوە و نووسین لەسەر مامۆستایێ یا ئەو ژمارە زۆرەی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامانەی کە جەمیلەخان بەدۆڵابەکانەوە داونی بەکتێبخانەی زانکۆی سلێمانی... کە دوور نییە ژمارەیە وێنە و دەستنووس و کاغەزی تایبەتی تێدابووبن...

ئەوەی خرایە بەردەستی من سێ دۆڵابی بچووکە، یەکیان پڕە لەو نامیلکانەی کە چاپ کراون و وا دیارە هەروا ماونەتەوە، دووەم کۆمەڵێ کتێب و گۆڤاری (کاروان و ئۆتۆنۆمی و ڕۆشنبیری نوێ)یە، لەگەڵ هەندێ کتێبی ئینگلیزی، سێیەم تایبەتە بەدەستنووسی هەندێ لەو کتێب و نامیلکانەی کە چاپی

(١) دەستنووسێکی شاکر فەتاحی شەهید، وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٨، ل ١٧٩.

کردوون: گەشتەکانی شارباژێڕ و سرۆچک و پێنجوین و... هەروا (ئاوێنەی ژینم) دەقە دەستنووسە ئەسڵییەکانی کە بریتییە لە چوار دەفتەری ٦٠ پەڕەیی و خۆی ژمارەی لەسەر داناون. جگە لە یادەوەرییەکانی ساڵی ١٩٣١ - ١٩٣٢ بەپاڵ چەند دەفتەرێکی بچووکەوە کە یادەوەری ئەو سەفەرانەی تێدا نووسیون کە بۆ دەرەوەی وڵاتی کردوون.

جا دوای خوێندنەوەی هەندێ لەو نووسینانەی لەملا و لەولا لەسەر مامۆستا نووسراون و ئەو نامەی ماستەرەی کاک (شوان سلێمان بابە) لە ساڵی ٢٠٠٠دا بۆ زانکۆی سەلاحەدین - کۆلیجی ئاداب بەشی زمانی کوردی ئامادەکردووە، ئەوەم بۆ ساغ بۆوە کە بەشێکی زۆر لە دەستنووسەکانی فەوتاون، یا بردوویانە و نەیانگێڕاوەتەوە، لەوانە یادنامەکانی ساڵی ١٩٣٠، دەستنووسی کتێبی تایبەت بە( قضاء عقرة) و دەستنووسی کۆمەڵە ڕۆژنامەی (باسەرە) و زۆری تر وەک یادەوەری سەفەری لەندەن و تورکیا و تاران.

بۆ ئەنجامدانی کاری پرۆژەکە، سەرەتا وامان بەباش زانی کە بەر لە هەموو شتێ (ئاوێنەی ژینم) کە یادەوەری و یادداشتەکانی خۆیەتی و لە دووتوێی فایلێکدا پاکنووسی کردووە، بکەینە بنەمایەک بۆ ئامادەکردنی (یادداشتەکانی شاکر بەفتاح) و وەک هەنگاوی یەکەم چاپکرێ.

وەک دەزانین شەهید شاکر فەتاح لە ژیانی خۆیدا هەر ئەم ئاوێنەی ژینەی لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا بە سێ بەش بڵاو کردۆتەوە[1]، بەڵام تەواوی نەکردووە. کە چوومەوە سەر ئەو بەشانە و هەتا ئەوەی دووتوێی فایلەکەی بەردەستیشم و بەراوردم کردن، دەرکەوت لەگەڵ ئەو چوار دەفتەرە دەستنووسەی کاتی خۆی نووسیونی، زۆر جیاوازیان هەیە و گەلێک باس و ڕووداوی لێ دەرهاوردووە، (دیارە ئەوەش بەپێی ئەو بار و ڕۆژگارەی ساڵانی هەشتاکان).

جگە لەمە، یادەوەرییەکانی ١٩٣١، ١٩٣٢ کە لە دوو دەفتەری سەد پەڕەییدان و بەخەتێکی زۆر جوان نووسیونی، ئەوانە بەشێکن لە قۆناغێکی گرنگی ژیانی، دیسان ئەو یادەوەرییانەی کە لە پاریس و ئەڵمانیا و قاهیرە نووسینی، هەریەک لەمانە گەواهی چۆنێتی بیرکردنەوە و بۆچوونی پیشان دەدەن، سەرباری ئەمانە دەستنووسی ئەسڵی ئەو ڕۆژنامە دیوارییانەی لە: ئاکرێ، خورماڵ، چەمچەماڵ، قادرکەرەم ئامادەی کردوون و نووسیونی (نەک ئەوانەی دوایی لە شێوەی ئامیلکەدا چاپی کردن)[2] هەریەکەیان بەشێکن لە کار و هەڵسوکەوتی مامۆستا لەو سەردەم و ڕۆژگارەی کاربەدەست بووە لەو جێیانە.

سەرباری ئەمانە هەمووی: ئەو گەشتانەی کە کردوونی بۆ: شارباژێڕ لە ١٩٢٩، پێنجوین لە ١٩٣٠، سرۆچک ١٩٣٢، هەڵەبجە و هەورامان لە ١٩٣٣. ئەمانە لە ساڵانی ١٩٧٢ - ١٩٧٣ بەدوی یەکدا لە

(١) بڕوانە: ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٠٣ - ١٠٤، ١٠٥ ساڵی - ١٩٨٤ دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، بەغدا.

(٢) چونکە هەندێ جیاوازی بەرچاو لە نێوان دەقە دەستنووسەکان و چاپکراوەکاندا هەیە، کە بەپێی باری ئەمڕۆ دەبێ پشت بەئەسڵەکان ببەسترێ.

چاپی داون... بەڵام هەریەکەیان بەشێکە لە یادەوەری ئەو ڕۆژەی کە گەشتەکەی تێدا کردووە. بۆیە بڕیارمان دا ئەمانەی باسمان کردن، هەمووی، هەریەکە و لە جێی خۆیدا بەپێی قۆناغە مێژووییەکەی بیانخەینە سەر یادداشتەکان و پێیان دەوڵەمەند کەین... جگە لە وێنە و بەڵگەنامەی سەردەمی خۆی.

سەرباری ئەمانە هەمووی، ئەوەی لە تواناداین لە ناوی کەسان و جێگە و مێژووی ڕووداو و ڕوونکردنەوەی پێویست لە پەراوێزدا بۆی دابنێین، ئەویش بەپشت بەستن بەسەرچاوەی پێویست و پرس و ڕاکردن و سەردانی کەسانی پەیوەندیدار بۆ زیاتر ڕاستی دەرخستن و ڕوونکردنەوە... وەک کارێکی پێویست لە ناوها پرۆژەیەکدا.

ئەمێنێتەوە ئەو بەرهەمە زۆر و زەوەندانەی تری مامۆستا کە لە چوارچێوەی (پرۆژەی خوێندەواری کورد)یدا دای ناون، وەریگێڕاون یا ئامادەی کردوون.. ئەمانە لە زۆر شوێندا لیستی بۆ کراوە و پۆلێن کراوە و خراوەتە بەردەستی خوێنەر[1]، زۆرتر ئەو بەرهەمانە لە شێوەی نامیلکەدان (چاپکراوەکانیان)، وامان بیر لێ کردۆتەوە کە هەر کۆمەڵە و بەپێی بابەتی خۆی بەدووی یەکدا لە داهاتوودا چاپ کەین و بەم جۆرە:

١- بابەتی ئەدەبی لە چیرۆک و پەخشان و شیعرەکانی.

٢- بابەتی ئەدەبی منداڵان، لە چیرۆک (هی خۆی و وەرگێڕدراو)، نووسین و ئامۆژگارییەکانی، شیعرەکانی... هتد.

٣- بابەتی لێکۆڵینەوە و نووسینی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و...هتد.

٤- بابەتە پەرچڤە (ترجمة) کراوەکان کە لە زمانانی ترەوە گۆڕیونی بۆ کوردی.

٥- کۆکردنەوەی هەموو ئەو نووسین و بابەتانەی کە لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بەعەرەبی نووسیونی و بڵاوی کردوونەتەوە لە چاپدانیان.

دیارە ئەنجامدانی پرۆژەیەکی ئاوا توانا و کارێکی زۆری دەوێ، پشت بەخوا لە داهاتوودا هەوڵی جێبەجێکردنیان دەدەین.

(١) بەپێی یادداشتی مانگی تەممووزی ١٩٦٤ نۆ مانگ بووە (پرۆژەی خوێندەواری کوردی) لە دایک بووە، (یانی لە مانگی تشرینی دووی ١٩٦٣وە) لەوێدا یەکەم جار ناوی دێنێ. لە پاییزی ١٩٦٧دا لە ڕۆژنامەی برایەتی ژ ٢١٤ ٢١٥دا پرۆژەکەی بڵاوکردۆتەوە هەروا لە تەممووزی ساڵی ١٩٨٤ لە ژمارە (٢-١)ی گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێدا بەدوور و درێژی گشت لایەنەکانی پرۆژەکەی خستۆتە ڕوو. بێجگە لەمە لە (دەستنووسێکی شاکر فەتاحی شەهید)دا کە مامۆستا فەلەکەدین کاکەیی و مەحموود زامدار ئامادەیان کردووە چەند بەشێکی پرۆژەکە دیسان خراوەتە ڕوو.

## یاددشت لەلای شاکر فەتاح

بەبڕوای من، چونکە مامۆستا هەر لە قۆناغی هەرزەکارییەوە خولیای خوێندن و نووسینی کەوتۆتە مێشکەوە و چونکە هەر لە بەرەبەیانی فامکردنەوەیدا خۆشەویستی نەتەوە و نیشتمانی لە دڵدا جێگیر بووە، جا مەسەلەی وشیارکردنەوە لای ئەو بۆتە مەبەستێکی هەرە گرنگی لە پێداویستییەکانی هەنگاونان بەرەو ئازادی و سەربەخۆیی، بۆیە دەبینین هەر لە زووەوە دەستی داوەتە ئەم کارە، لە هاویناندا چووە بۆ ناوچەکانی دەوروپشتی سلێمانی، ئەو وەک دەیان لە هاوڵەکانی کە ڕەنگبێ هەمان گەشتیان کردبێ، بەڵام جیا لەوان، مەبەستی تایبەتی خۆی بووە، ویستوویە چۆنێتی ژیان و گوزەران و باری کۆمەڵایەتی و ئابووری خەڵکەکە و سروشتی ناوچەکە بخاتە ڕوو، لە شێوەی گەشتنامەدا بۆ دوارۆژ تۆماریان کات. دیسان لە کاتی خوێندنی لە لوبنان -برومانا- و دواتر شوێنانی تر، ئەمانە هەمووی دەبنە ژێدەرێک بۆ باری فرەلایەنی ژیانی خۆی و نەتەوەکەی لەو سەردەمانە.

ڕاستی تۆمارکردن و گەڕان بەدوای حەقیقەتدا، یەکێکە لە خولیاکانی مامۆستا، هەروا ڕاگوزاریانە بەڕووداوەکاندا تێنەپەڕیوە، لێکی داونەتەوە و توێژینەوەی لەسەر کردوون، ڕاستی هەرچەندە تاڵیش بێ ئەو نەیبواردووە... هەتا دەربارەی خودی خۆی و ژیانی خێزانی لەگەڵ دایک و باوک و هاوسەریدا، یان لەگەڵ ئەو ڕووداو و هەواڵانەی دواتر مەبەستی بوون و تۆماری کردوون.

لەم ڕاستی وتنەیدا، نووسەر بەها و نرخی یادداشتەکانی گەلێ بەرز دەکاتەوە ڕادەی بڕواپێکردن (مصداقیة) پێیان بەهێزتر دەکات، جا وەختە لەم حاڵەتەدا بکاتە ڕاستگۆییەکانی (ژان ژاک ڕۆسۆ[1] و هنری شاریێر، پاپیۆن[2]ی فەرەنسی و کۆڵن ویلسن[3]ی بەریتانی و گەلێکی تر) کە لە یادداشتەکانیاندا وردترین ساتەوەختی ژیانیان فەرامۆش نەکردووە... هەتا شتە تایبەتییەکانیش.

باسەکانی تافی منالی و پەیوەندییەکانی نێوان ئەندامانی خێزانەکەی، حەز و ئارەزووی خۆی لە بەغدا و مورعاناتی لەگەڵ پێکهاتە و هەڵکەوتەی جەستەیدا، ئەو هەواڵانەی دەربارەی کورد و جووڵانەوە سیاسییەکان دەینووسێ:

(ئەی خوێنەواری خۆشەویست، تۆ وا تێنەگەی ئەم هەواڵانەی ئێمە لێرەدا دەینووسین خۆهەڵبەست یاخود لە بیستنێکی بێ سەروپاوە بیگۆڕینە سەر نووسین و لێرەدا بیخەینە پێش چاوت.. هەرچی هەواڵێ ڕاست نەبێ، خۆمان بەتەواوەتی نەچینە بنج و بناوانی لێرەدا نایینووسین، چونکە ئەگەر وانەکەم ئەو حەلە

(١) ژان ژاک ڕۆسۆ: ١٧١٢ - ١٧٧٨ نووسەر و فەیلەسووفی فەرەنسی، خاوەن کتێبە بەناوبانگەکەی (پەیمانی کۆمەڵایەتی)یە، یادداشتەکانی بوێرانە نووسیوەتەوە، بۆچوونە سیاسییەکانی کاریگەرییەکی گەورەیان هەبوو بۆ سەر بیروباوەڕەکانی شۆڕشی فەرەنسا.

(٢) هنری شاریێر -پاپیۆن- خاوەنی یادداشتەکانی زیندانییەک -پەپوولە- ١٩٦٩.

(٣) کۆڵن ویلسن: فەیلەسووفی بەریتانی و خاوەنی دەیان کتێبی وەک: رحلة نحو البداية اللامنتمي... کە تیایاندا بەڕاستییەکی سەیرەوە باسی یادەوەرییەکانی خۆی دەکا.

ئەم نووسـراوەیە بەهای پووشکەیەکی نابێ، ئینجـا ئەو حـەلە هەرچی ڕەنجـێکم تیـا داوە بە با دەچێ. (١٩٣١/٤/١٨).

ئەوەی یادداشـتەکانی بەووردی بخوێنێتەوە تێدەگات کە ئەو پیاوە ویـستوویە تەجرەبە تاڵ و شـیرینەکانی ژیانی خۆی و دەوروبەر و نەتەوەکەی بکاتە پەند و ئامۆژگارییـەکی سـوودبەخش بۆ نەوەکانی دوای خۆی، هەروا بەدیارخـستن و هێشـتنەوەی گەلێ ڕاسـتیی مـێژوویی وەک خۆیان و ڕزگـارکردنیـان لە فـەوتان و ئاوەژووکردنەوە.

جگە لەمـانە لەم یادداشـتانە و نووسـینەکانی تریدا، دەبینین هەر لە سـەرەتاوە مـامۆسـتا بۆ دارشـتنی باسـەکانی هەتا بۆی کراوە پەنای بردۆتە بەر کوردییـەکی پوختی ڕەوان، کە ئەمەش لایەنێکی دەرخـستنی سـەربەخۆیی زمانەکەی بووە، شـاکر فەتاح لە پێشـەنگانی نووسـینی پەخشـانی هونەریی کوردی بووە، بۆ ئەمەش دەیان وشـە و زاراوەی کوردی ڕەسـەنی لە بەرهەمـەکانیـدا بەکارهێنـاوە و هەتا هەندێکیـان بوونەتە سـیمایەکی تایبەتی شێوازی نووسین و دەربڕینی ئەو.

جا با سەرنج دەینە ئەم ڕستە و وشـە و زاراوانە کە تایبەت بەکاری هێنـاون:

ئاهەنگی نەژادانە: ڕێزلێنان، تکریم

ئاودان: مەتارەی ئاو، ترموس

ئەستوورک: سـەموون

باڵباز: پۆلیس

بنکەی لادێ: مرکز ناحیة

بیدەوبستێن: بازرگانی، تجارة

بیرکە: بیرۆکە، فکرة

پرس: لێکۆڵینەوە، لێپێچینەوە، تحقیق

پشتیوان: پارێزەر، محامي

تەڕاودان: تازەکردنەوە، نۆژەکردنەوەی خانوو و ناوماڵ (دەست پیاهێنان -تعمیر- ناگرێتەوە)

تیژکردن: هاندان، دنەدان، تحریض، تشجیع

جەزرەبە: سزادان، قصاص، عقاب

جێنشین: قایقام

چادەر: چایچی

چاونەنداز: دیمەن، منظر

چرووک: لاواز، ضعیف؛ بەم دوو مەبەستەی بەکارهێناوە، بەلام بۆ (ڕەزیل. ڕژد، پیسـکە)ش بەکاردێ.

خاک: ناوچە، دەڤەر، لواء (وحدة إداریة)

خۆرە: میکرۆب

خۆرشت: خواردن، غذاء

دەزگای ژیاندن: (دائرة الأعاشة)

دەستە: حیزب، پارتی سیاسی

دەستنیژ: دامەزراو، بنیاتنراو

دەلیا: فەرهەنگ، قاموس

رەنگرێژی: پلان دانان، نەخشەسازی، تخطیط

رێباز: شۆستەی شەقام، پێرەو

زرنگکاری: سیاسەت

زیچوین: زیوین، وەک زیو، فضّي

سازاندن: هەرسکردن، عملیة الهضم

سەرئەفراز: سەربەرز

سەرکۆمار: ئەفسەر، ضابط

سرەوت: پشوو، إستراحة

شاگرد: قوتابی، تلمیذ

فەرمانڕەوایی: رژێم، حکوومەت، سلطة

فسیاندایەوە: دامرکانەوە، خامۆش بوونەوە، هێدی بوونەوە.

فیفرە: شمشاڵ

کاربەدەست: وەزیر

کارگێری لادێ: بەڕێوەبەری ناحیە

کەلکەوەر: سوودبەخش

کوشتی خانە: قەسابخانە، مجزرة

کۆڕی نەتەوە: پەرلەمان، مجلس الأمة

کۆگرە: کۆنگرە، مؤتمر

کێلگەی باو: مزرعة حدیثة

لادێ: ناحیە (وەک یەکەیەکی ئیداری)

لاسایی کردنەوە: تەمسیل کردن، شانۆگەری

مانگی رۆژوو: رەمەزان

مشتاخان: مانگی ئەیلوول (سەپتەمبر)

میم وەستا: مامۆستای نافرەت، معلمة

میوەخۆش: مانگی تەمووز (ژولای)
ناتەواو: ئیکمال (لە تاقیکردنەوەی خوێندندا)
ناردن: ناردن بۆ خوێندن لە دەرەوە، البعثة
ناوچە: قەزا (وەک یەکەیەکی ئیداری)
نووسراو دان: دۆلابی کتێب، مكتبة
وردەواڵا: (كائنات مجهرية)
هەڵبەسە: دڵداری (لە شیعردا)، غزل
لەخۆبووردن: پیاهەڵدان (لە شیعردا)، مدح
لاوانەوە: (رثاء)
لێچوون و لەوچوون: (مشبه و مشبه به)
لاوە: (نسخة)
یەک تاکی: (فردي)

ئێمە پێشەکییەکەمان لەمەڕ یادداشتەکانی شەهید شاکر فەتاح لێرەدا دەبڕینەوە، ئەوەی کە مابێ بۆ بەشەکانی دی کە پشت بەخوا لە داهاتوودا ئامادەیان دەکەین و چاپ دەکرێن.

دیارە بۆ هەریەکێ لەو بەشانەی پێشتر ئامادەمان پێ دا نووسین و لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل هەڵدەگرێ، تا بەهەمووی ببنە دیراسەیەکی فراوانی هەمەلایەنەی ئەو پرۆژە پیرۆزەی ئاواتەخواز بوو لە ژیانیدا بیگەیەنێتە ئەنجام و بەو نەتەوەیەی پێشکەش کات کە تا گیانی سپارد هەر خۆشی دەویست.

(هەروەک لە خودایییەوە یادداشتێکی گەورەم درابێتێ وابوو، بەرە بەرە چووە دڵمەوە: ئەم کارەی بەدەستمەوەیە کە بریتییە لە «پرۆژەی خوێندەواری کورد» بەرز و پیرۆزە... ڕۆژێک دێ تیشکی کەڵک و چاکە و فەڕی بەگشت لایەکی کوردستاندا پرشنگ دەدات).

سڵاوی ڕێز و ئەوازش بۆ شاکر فەتاح کە بەدرێژایی تەمەن تێدەکۆشا بۆ هێنانەدی ئازادی و ژیانێکی بەختەوەر بۆ نەتەوەکەی... بۆ شەهیدی ئازادی بیروڕا دەربڕین.

درودد بۆ گیانی پاکی و جەستە پیرۆزەکەی لە هەر کوێیەک بێ.

ئەحمەد
٢٠٠٢/٦/٢٤
سلێمانی

# پێشەکی

خوێندەواری خۆشەویست!

ئەم نووسراوە بریتییە لە چیرۆکی ژیانی پیاوێک پشتی بەخۆی دەبەست و بڕوای بەخودا هەبوو بەڵام بڕوای بەچارەنووس (قضاء وقدر) نەبوو.[1]

کە لە تەمەنی چواردە ساڵیدا ڕاپەڕی و چاوی کردەوە، بۆی دەرکەوت هەر پەروەردەکردنێکی لە باوک و

(١) وا بزانم پێویست بەوە ناکات کە مامۆستا لەگەڵ ئەو باوەڕە پتەوەیدا بەخوا و ئایینی پیرۆزی ئیسلام، ئەوەی لەلا شاردراوە بووبێ کە باوەڕ بەقەزا و قەدەر یەکێکە لە شەش پایەکانی ئیمان و ئەمانە بەهەموویان یەکەیەکی تەواوکەر (وحدة متكاملة) پێک دێنن و موسوڵمانی تەواو ئەو بوارەی نییە کە لەوانەدا (إنتقائي) بێ.. چونکە کە باوەڕ بەیەکێ لەو شەش پایەیە لاواز و لەق بوو یا خوانەخواستە نەبوو، ئەوا پێنجەکەی تریش یەک بەدوای یەکدا لەق دەبن و پەنا بەخوا ئەو کەسە بێ باوەڕ دەبێ. لێرەدا مامۆستا لەو ڕووەوە باس لە قەزا و قەدەر دەکات کە دوو بەشی باوەڕی حاڵی و ویژدانین، نەک زانستی و تیۆری، کەواتە هێند لەسەر ئەم ڕوکەی ئیمان کوڵراوەتەوە و باس هەیە (لە ڕاستیشدا بەپێی سروشتەکەی هەڵدەگرێ) لەسەر ئەوانی دی نییە و ئەوان بەدیهیاتن و قابیلی وتووێژ و تاوتوێکردن نین. (ئەوانەش کە لە ناوەندی چەمکەکانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا لە قەدەر ئەکۆڵیونەتەوە، لە ڕێ ترازاون و دووچاری گومرایی بوون. عەقلانییەتی موعتەزیلەکان و حەتمیەتی جەبرییەکان هەندێکن لەو گومرایی و لە ڕێ ترازانە).[1] مامۆستا خۆی لە جەبرییەکان دوورەدەکەنار گرتووە کە هەموو کردارێک لە عەبد وەلا دەخەن و دەیدەنە پاڵ خوا، بەچاکە و خراپەوە، مامۆستا شێخ محەممەد عەبدە ئاسا بیری لەوە کردۆتەوە کە: ئەوانە (يؤمنون ثم يستدلون بدلاً من أن يبنوا إيمانهم على إستقراء الوقائع والأستدلال). ئەگەر زیاتر بچینە ناو باسەکانی ئەم ژیاننامەیەوە، باشتر تێدەگەین کە مامۆستا لەوانە نەبووە کوێرانە و بێ بناغە دوای بیروبۆچوون و دیاردە ژیارییەکان بکەوێ.. لێیانی کۆڵیوەتەوە، تاوتوێی کردوون، پشکنیونی، ئەوسا بەپوختی ڕای دوایی خۆی دەربڕیوە. ئەو ئەمەودا و بواری بۆ توانست و خواست و ئیرادە و ویستی عەبد هێشتۆتەوە ئەوسا پشتی بەخوا بەستووە کە چاکترین و باشترین یارمەتیدەر و پشت و پەنایە (فاذا عزمت فتوكل على الله - محمد/٢١). (إن خلق العمل في الأنسان يكون بعد قصدة العمل وتلبسه به. فالفعل يقع لامحال ولكن ليس جبراً من الله تعالى للعبد. فالله تعالى يرضى من عبده فعله الحسن وهو الموافق لأوامره، ولا يرضى له أن يعمل القبيح وهو فعل مانهي عنه).[2]

(١) محمد فتح الله گولن، قەدەر لە ڕووناکی قورئان و سوننەت دا، گێڕانی فاروق رسول يحيى، چاپخانەی تازە هەولێر ٢٠٠١، ل ١٤.

(٢) د. عبدالملك عبدالرحمن السعدي، شرح النسفية في العقيدة الأسلامية، ط١ دار الأنبار، بغداد ١٩٨٨، ص١٠٨-١١١.

دایکی و خوێندنگاکانی و، کۆمەڵایەتییەکەیەوە کراوە، بەکەڵکی ژیانی نەهاتووە، تا بتوانێ بەرگەی ژیان بگرێ و، خۆشی لە ژیانی خۆی بچێژێ، بەڵکو زیانی زۆریشی پێ گەیاندراوە، لەبەر ئەوە بڕیاری داوە:

١- هەوڵ بدات، خۆی بکات بەمامۆستای خۆی و سەرلەنوێ خۆی پەروەردە بکاتەوە و، خۆی پێ بگەیێنێ تا خۆشی لە ژیانی خۆی ببینێ.

٢- هەوڵیش بدات، ئەتەوەکەی خۆی وریا بکاتەوە و، ئەویش هەموو تاکێکی هەوڵ بدات ببێتە مامۆستای خۆی و، سەرلەنوێ خۆی پەروەردە بکاتەوە و، خۆی پێ بگەیێنێ، تا بتوانێ خۆشی لە ژیانی خۆی ببینێ.

خۆپێگەیاندنیش بۆ ئەو ئاسان نەبوو، چونکە شارەزایی دەویست لە زانستەکان و هونەرە جوانەکان و خوداناسی و ئایینداو لەبەر ئەوە هەتا توانی ژمارەیەکی گەورەی لە نووسراوانی (ئایین) و (وێژە) و (مێژوو) و زانستەکانی (پەروەردەکردن) و (ڕاهێنان) و (خۆناسین) و (کۆمەڵایەتی) و (تەندروستی) و (هونەرەکانی ژیان) و (هونەرەجوانەکان) خوێندەوە، بۆ ئەمەی بەکاریان بهێنێ لە پەروەردەکردنی خۆیدا. ئەوەی لە هەموویان بەکەڵکتر بوو، بۆ ئەوە، (خوداناسی) و (ئایین) بوو، چونکە هەرچی ڕەوشت و خووی جوان و، کرداری شیرین هەیە، لەو سەرچاوەیەوە دەستی کەوت و خۆی پێوە ڕاهێنا. تەنانەت (نیشتمانپەروەریی) و (گەل پەروەری) و (مرۆڤ دۆستی)یش لە خوداوە فێربوو. ئینجا کە توانی ببێتە مامۆستای خۆی، دەستی کرد بەپێگەیاندنی خۆی.

هەرچەندە تا ئەم پەروەردەکردن و خۆپێگەیاندنە گەیشت بەئەنجام، گەلێکساڵی پێ چوو، بەڵام خوداناسییەکەی و باوەڕکردنەکەی بەخودا، هەر لە یەکەم ساڵەوە، ڕێگای بۆ ڕۆشن دەکردەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی دەهاتنە بەردەمی و، ئەو تەنگ و چەڵەمە و کەند و کۆسپانەی تووشی دەبوون. ئینجا کە خۆ پێگەیاندن و پەروەردە کردنەکەی، گەیشتە ئەندازەی خۆی، بەرە بەرە باری ژیانی بەجارێک گۆڕا.

لە (هەژاری)یەوە گۆڕا و بوو بە(دەوڵەمەندی)

لە (نەخۆشی)یەوە گۆڕا و بوو بە(تەندروستی)

لە (نەخوێندەواری)یەوە گۆڕا و بوو بە(ڕۆشنبیری)

تەنانەت وای لێ هات دەستی دەدایە هەر شتێک، هەر کاروبارێک تێیدا سەردەکەوت. جاری وایشی بۆ هەڵدەکەوت، کە لەم سەرکەوتنەوە بازی دەدا بۆ ئەو سەرکەوتن. ئەنجامی ئەمەیش بەوە گەیشت تێکڕا بەزۆربەی ئاواتەکانی خۆی گەیشت. (کامەرانی) و(سەربەرزی) و (خۆشەویستی) و (خۆشگوزەرانی) بوون بەهاودەمی.

خوێندەواری خۆشەویست!

ئەم پیاوەی باسیم بۆ کردیت، (شاکر فەتاح) بوو، ئەگەر لاپەڕەکانی ئەم نووسراوە کە ناوم ناوە (ئاوێنەی ژینم) بخوێنیتەوە، بۆت دەردەکەوێت تا چ ئەندازەیەک لە (ژیانی تایبەتی) و لە (ژیانی گشتیی)مدا سەرکەوتنم دیوە. منیش کە ئەم نووسراوەم پێشکەش کردوویت، بەو مەبەسەیە کە تۆ کەلک و خۆشیی لێ ببینیت. لە هەڵەکانی من خۆت دوور بخەیتەوە، لە کردەوە چاکەکانیشم خۆت نزیک بخەیتەوە. تۆیش ئەوەت لەبیر نەچێ کە وەک من سەرلەنوێ، بەو شێوەیەی من کردوومە، خۆت پەروەردە بکەیتەوە و، خۆت پێ بگەیێنیت، تابتوانیت کەڵک و چاکە بەخۆت و بەنەتەوەکەت بگەیێنیت.

خودای گەورە ئەم بەهەشتی سەر زەمینەی بەخۆرایی پێ ئەبەخشیوین، بۆ ئەمەی پێ بەخشیوین کە تا سەر بەخۆشییەوە تێیدا بژین. ئەم ئاژاوە و پشێوی و پەژارەیە و، ئەم شەڕ و شۆڕ و شۆڕش و جەنگە و، ئەم جوێن و خوێنەی کە لە هەموو لایەکی جیهاندا ڕوو دەدەن، ئەم هەموو پشم و قین و بەربەرەکانێ و دوژمنایەتییە، ئەم هەموو فروفێڵ و تەڵەکەبازی و گزی و دزی و فزییە، کە لە جیهاندا دەیانبینین، ئەم هەموو ماڵوێرانی و سەرگەردانییەی کە بەسەرماندا دێن... ئەمانە هەموویان لە ئەنجامی خودانەناسین و شکاندنی یاسای خوداییەوە لێمان ڕوو دەدەن. کەواتە ئەگەر بمانەوێ تا سەر بەخۆشی و کامەرانییەوە بژین، بام پەیڕەوی دەستووری خودا بکەین و، لە پێناو دڵ ڕاگرتنی ئەودا خۆمان بەخت بکەین و، وەک برا و خوشکی یەکتر، بام خۆشەویستی و برایەتی و دۆستایەتی و یارمەتیدان و بەزەیی هاتنەوە، بنە چرای ژینمان و تا سەر بەسەربەرزی و کامەرانی و تەندروستی و خۆشگوزەرانییەوە بژین.

شاکر فەتاح

«خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد»

سلێمانی

١٩٨٨/١٢/٣١[1]

(١) لە دەستنووسە ئەسڵییەکەی ماموستادا ئەم مێژووە نووسراوە، هەروا لە جێی تریشدا لە کۆتایی ئەم یادداشتانەدا، لە کاتێکدا خۆی لە ١٩٨٨/٣/١٨ەوە دەزگیرا کراوە... جا هۆی ئەمەم بۆ ڕوون نەبۆوە.

## سلێمانی و جەنگی جیهانی

لە دەمی خۆید ناونووس نەکرابووم. بەڵام وەک لە کەسوکاری خۆمم بیستووە دەبێ لە ساڵی ١٩١٤دا لەدایک بووبم. ئەو کاتە شاری سلێمانی بچکۆلە بووە. ژمارەی دانیشتوانی خۆی داوە لە (١٢٠٠٠) کەس. لەژێر چنگی تورکەکانی عوسمانیدا بووە. بۆیەکا هەتا هاتووە بەرەو پاش هاتووە. بەهۆی زۆرداریی ئەوانەوە: (هەژاری) و (نەخۆشی) و (نەخوێندەواری) تا هاتووە پەرەی سەندووە. خۆ، کە فەرمانڕەوایی عوسمانی کەوتە ناو جەنگی جیهانیی یەکەمەوە، لە ساڵی ١٩١٦دا، ئیتر کوردستان کەوتە ئەوپەڕی سەرگەردانی و شپرزەییەوە. ئەم شەڕە بێجگە لەوەی کەڵکی بۆ فەرمانڕەوایی عوسمانی خۆی تێدا نەبوو، زۆر زیانیشی بەخشی بەو و بەکوردەواری. سلێمانیش یەکێک بوو لە شارە بەناوبانگەکانی کوردستان. بەداستەم بیرم دێ کە چۆن دانیشتوانی شارەکەم، ناچاربوون ڕەو بکەن بۆ لادێ لە ترسی هورووژمی (ڕووسەکان)[1]!. شەوێکیان لە باخەڵی دایەنەکەمدا (پیرۆز) نوستبووم، لە بن دیوارێکی جافەتیی دێی (ئەمەڵ)دا، تا بەیانی مارێکی زل لەناو جێگاکەماندا خۆی مەڵاس کردبوو، کە خەبەرمان بووەوە و مارەکە خشەی کرد، ئینجا پێمان زانی!. ڕەو تەواو بوو. گەڕاینەوە سلێمانی. بیرمە: لە تاو گرانی، ڕۆژێکیان نانم برد بۆ هەژارێک لەبەر دەرگاکەمان. تا نانەکەم دایە دەستی کڵاو و مشکیەکەمی فڕاند!. باوکم هەرچەند ئەم لاو ئەولای کرد و، ڕای کرد بەدوایدا نەیدۆزییەوە! کڵاو و مشکی چوو...! هەروەها لەبیرمە بەو بەر ماڵەکەمانەوە سەربازە تورکەکان، هەر ڕۆژە چەند ئێستر و

(١) ئەوەی لەم بارەیەوە بوترێ ئەوەیە کە سلێمانی لەچاو موسڵ و بەغدا و کووت و بەسرەدا دوور بوو لە بەرەی ئەو شەڕە جیهانییەی دەوڵەتی عوسمانی لە تشرینی دووی ١٩١٤دا بەشداری تێدا کرد، هەر لەو ساڵەدا بەریتانیا بڕیاری گرتنی بەغدای دا و لە بەسرەوە پێشڕەوی کرد بەرەو ژوور، کوردی - سلێمانی خۆیان خستە ناو کڵپەی ئەو شەڕەوە، ئەویش بەبەشداریکردنیان لە شەڕی (شوعەیبە) و بۆ یارمەتی لەشکری عوسمانی، گوایە بەرگریشە لە ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلام. کە ئینگلیز پەلاماری کووتی دا و سەرکەوتنی شەڕەکەی لێ بووە ئێوەگلانێک لەو شارەدا و نابڵوقە درا، ئیدی لەشکری ڕووس کە پێشڕەوی کردبوو لە ئازربایجان و باکووری ڕۆژئاوای ئێراندا و هەتا دەڤەرەکانی سنە و کرماشان. ئەرکی ئەوەشی پێ سپێردرا کە کارێکی وا بکات لەشکری عوسمانی شپرزە بکات تا ئەو مەترسییەی لەسەر (کووت)ە کەم بکرێتەوە و دوا جار لەشکرەی ئینگلیزی بەرەو بەغدا سەرکەوێ.

تا لێرەدایە کە باشووری کوردستان کەوتە ناو بازنەی مەترسیکانی ئەو شەڕە جیهانییەوە، زیاتر لە دوو جەبهەوە: سلێمانی و ڕەواندز. لە بەهاری ١٩١٦دا ڕووسەکان بەرەو خانەقین و ڕەواندز کشان. لە ١٣ی مارسی ١٩١٦ ڕەواندز گیرا، بەمە تورکەکان لە سلێمانیش ترسان کە بگیرێ. جا لەشکرەکەی ئەوێیان بەهێز کرد و بەرەو پێنجوێنیان نارد، دوای شەڕ و کوشتار، لە کۆتایی حوزەیرانی ١٩١٧دا ڕووسەکان پێنجوێنیان گرت، بەمە شار کەوتە مەترسی تەواوەوە، خەڵکی لە ترسی دڵڕەقی ڕووس و (خوانەناسییان - وەک لەناو خەڵکا باو بوو) بەهەموو لایەکدا پەرەوازە بوون. (بۆ زیاتر بڕوانە: العمید شکري محمود ندیم/ الجیش الروسي في حرب العراق، ط٣، مطبعة العاني بغداد ١٩٧٤).

بارگیرێکیان بەتۆپیوی فڕێ دەدایە گوێ شیوەکە. هەژاران لە تاو برسێتی پەلاماری یەکتریان دەدا، بۆ ئەمەی بتوانن هەریەکەیان بەشی خۆی لە گۆشتەکانیان بکاتەوە! هەروەها لەبیرمە سەربازەکان گالیسکەیان بەزەلام ڕادەکێشا بارگیریان نەمابوو پێی ڕابکێشن! کە گرانی زۆری سەند، چایان بەکشمیش و مێوژەوە دەخواردەوە، باوکم شەکری بۆ نەدەکڕا!

## دایەنەکەمم لە دایکم خۆشتر دەویست!

دایەنەکەم «پیرۆز»م زۆر خۆش دەویست[1]. لەگەڵ دایکمدا تێکچوون. لێمان جیابووەوە. لە ماڵە دراوسێیەکدا بوو بەنیشتەجێ. برسێتی زەبفی لێ سەندبوو. لە ترسی دایکم، هەموو ڕۆژ بەدزییەوە نانم بۆ دەبرد! ئەم دایەنەم لە دێی (زڕگوێز)[2]ەوە هاتبوو. جاروبار دەیبردمە (زڕگوێز) لە باوەشیدا دایدەنام و، بەسواری گوێدرێژ دەیبردم بۆ ئەوێ. لە لادێ کە هەرچەندە خواردنی باشم دەست نەدەکەوت بیخۆم، بەڵام ژینەکەیم زۆر پێ خۆش بوو. چونکە سەربەستی و خۆشەویستی و گوزرانێکی ژینم تێدا دەدی. لەوێوە خۆشەویستی سروشت و ژینی ساکار و ئازایانەی لادێییەکان چووە دڵمەوە. لەوێوە خۆشەویستی دایەنەکەم چووە دڵمەوە. تەنانەت لە دایکم خۆشتر دەویست! لەبەر ئەوە بەزەییم زۆر پێیدا دەهاتەوە، کە دایکم لەو گرانییەدا دەری کرد. هەر هەلێکم بۆ هەڵبکەوتایە، بەدزیی دایکمەوە دەچوومە لای، ئەوەندەی پێم دەکرا خواردنم بۆ دەبرد. جاروبار کە دڵڕەقی دایکم، دەربارەی دایەنەکەم دەهاتەوە بیر بەزەییم پێیدا دەهاتەوە، دڵم تەنگ دەبوو، بۆی دەگریام. لام وایە ئێستاش کە هەر ئاوارە و کلۆڵ و بێچارەیەک دەبینم و بەزەییم پێیدا دێتەوە و، حەز دەکەم دەستی یارمەتیی بۆ درێژ بکەم، لە کارەساتی دایەنەکەمەوەیە، کە لە لادێ دەبووم، کەسوکاری دایەنەکەم لام کۆدەبوونەوە، دەیانلاواندمەوە. مریشک و کەڵەشێر و بەرخ و گیسکیان بەدیاری دەدامێ. لەبەر ئەوەی ئەو خۆشەویستییەم لێ دەدین، منیش ئەوانم خۆش دەویست باوکم و دایکیشم تۆڵەیان بۆ دەکردنەوە. لام وایە، زۆرتر، هەرلەمەوە بوو، کە لە ژیانی فەرمانبەریمدا، توانیم نزیکەی بیست ساڵ لە گوندەکاندا فەرمان ببینم و، حەزم دەکرد یارمەتییان بدەم لە پێشکەوتنیاندا. تا گرانی بەسەرچوو، دایەنەکەم سەروشوێنی نەما! داخەکەم ئێستاش و ئەوسایش نەمزانی چۆن ڕۆیی و چۆن لەناوچوو! گەلێ جار بیرم دەکرد و بۆی دەگریام تەنانەت ئێستایش کە بیرم دەکەوێتەوە، کپە لە جەرگمەوە دێت. زۆر جاری وایش هەیە بۆی دەگریم. چونکە بیری ئەوەم دەکەوێتەوە کە هەزارانی وەک ئەو کلۆڵە، سەرگەردانی دەستی زۆرداریی و هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواریی بوون لەو گرانییەدا... هەموو مردن.. هەموو لەناوچوون!

(١) وەک جەمیلەخانی هاوسەری مامۆستا دەیگێڕێتەوە: حەبەخانی دایکی مامۆستا منداڵیان بۆ نەدەما، بەر لە شاکر لە ڕۆژێکدا دوو کوڕی بەسوورێژە دەمرێ. جا نەنکیان (دایکی میرزا فەتاح) دەنێرێ لە زڕگوێزەوە ئەم (پیرۆز)ە دێنێ تا ببێتە دایەنی شاکری کوڕەزای. ئەویش بەگیان و دڵ خزمەتی ئەو منداڵەی دەکرد. هەتا شاکر پێی دەوت: دایە پیرۆز.

(٢) زڕگوێز: گوندێکە لە باشووری سلێمانی بەدامێنی زنجیرەی گڵەزەردەوە نزیک ڕێگای قەرەداغ.

## خانووەکەمان خۆش بوو

خانووەکەمان گەورە بوو. خۆش بوو. باوکم باخچەیەکی پڕ لە گوڵ و دار و درەختی نایاب و ناوازەی لێ هێنابووە بوون. پڕ بەدڵی خۆمان ترێ و هەنجیر و هەنار و گوێز و توو و، سەوزەمان لێ دەچنیەوە. بەشی خۆمانی دەکرد. جاروبار بەسەر خزم و دۆست و دراوسێیشدا دەمانبەشیەوە. بێجگە لە بینینی چاوئەندازە جوانەکانی و، خواردنی میوە و سەوزە خۆشەکانی، باخچەکە، جێگای یاریی و گەمە و مەڵبەندی سەروتم بوو. لەگەڵ هاوڕێکانمدا گەلێک جار بەسەر دارگوێز و دار هەنجیرەکاندا هەڵدەگەڕام. خۆ لە هاویندا، نانخواردن و نووستنی ڕۆژیشمان، بەزۆری هەر لەناو باخچەکەدابوو. هەروەک هەموو دەم لە سەیراندا بین وابوو. ئێستەیش کە هاوینان حەز بەگەشتی هاوینە هەوارەکانی (کوردستان) دەکەم، ئەنجامی ژیانی ناو ئەو خانووەیە.

##ماڵێکی پڕ لە ئازوە و خێزانێکی سەرگەردان

باوکم سێ ساڵەکەی دوایی تەمەنی لەو خانووەدا ڕابوارد[1]. وازی لە بازرگانی و هەموو شتێک هێنابوو. خووی دابووە، ئەم باخچەیە و خواپەرستی. زۆر کەم دەچووە دەرەوە چەند هاوڕێیەکی کۆنی هەبوون، ئێواران دەهاتنە لای. بەدەستی خۆی چایی و قاوەی بۆ تێدەکردن. میوەی بۆ دەکردنەوە و پێشکەشی دەکردن. بەگفتوگۆی خۆش خۆشەوە ڕایاندەبوارد باوکم لە بازرگانییەکەیدا نابووت بووبوو. تەنانەت خانووەکەیشمان لەسەر ناوی خاڵێکم مابووەوە، هێشتا لەگەڵیدا نەیپەڕیبووەوە. خاڵم و باوکم، هەرکەسەیان بەلای خۆیدا دایدەتاشی. نەمدەزانی قسەی کامیان ڕاستە. کەسێکیش نەبوو، لە خزمان، دڵسۆزان ناوبژیان بکات. هیچ کامێکیشیان ڕووی نەدەهات داد بکەیێنێتە دادگا. تا مردیش باوکم نەیهێشت من بیبرمەوە. پاش مردنی بەچەند ڕۆژێک براندمەوە. بەڵام خاڵم (٦٠٠) شەش سەد دیناری لێ سەندم! دایکم و هەندێ خزمان ئەم کردەوەیەی خاڵمیان بەناڕەوا دایە قەڵەم. بەڵام من چونکە چاکەی ئەو خاڵەم بەسەرەوە بوو، بەشیرینییەکەوە لەگەڵمدا براندەوە، نەمهێشت دڵی لێمان بیەشێ!

لە دێی (خێوەتە)[2] چەند پارچە زەوی و باخی باپیرە گەورەم بۆ باوکم مابووەوە باوکم لەوێش وازی هێنابوو. دابوویە دەست ئامۆزاکانی، بۆی بەرهەم بهێنن لەبەر ئەوە تا دەهاتین دەست کورتتر دەبووین،

(١) باوکی: میرزا فەتاحی ئەحمەدی حاجی مستەفای حاجی قوربانی سێتە بەسەری هەمەوەند. لە بنەڕەتدا لە گوندی خێوەتەی لای بازیان بوون، دوایی لە گەڕەکی دەرگەزێن لە سلێمانی نیشتەجێ دەبن و باوکی بەکاروباری بازرگانییەوە خەریک دەبێ، هاتوچۆی ئێران دەکات. حەبیبەخانی دایکیشی کچی مارفاغا بووە کە ئەویش هەر لە هەمەوەندەکانە، لەناو خزم و کەسدا بە(حەبەخان) ناسراو بووە.. میرزا فەتاح لە ١٩٥٤ و حەبەخانیش لە ١٩٦١دا کۆچی دوایی دەکەن.

(٢) خێوەتە: دوو گوند هەر بەم ناوەوە لە دوو جێی جیاواز هەیە، لەوانەیە سیانیش: یەکیان لە شارباژێڕ نێزیک بەمۆکەبە و کونەماسی سەر بەناحیەی ماوەت، دووەم لە ناوچەی بازیان، کە ڕاستتر ئەمەیانە، بەو مەزندەیەی=

هەژارتر دەبووین. ئەگەر مزی چەند دووکانێکی دایکم نەبووایە کە لە باوکییەوە بۆی مابووەوە، زۆر بەپەرێشانییەوە دەژیاین. ماڵەکەمان وردە وردە چۆڵ و هۆڵ بوو. وامان لێ هات نە ڕەنجبەر، نە کارەکەر، کەسمان پێوە دانەدەنیشت. من و دایکم سەرمان کردبووە سەر باوکم کە کرد و کۆشی بکات، کە نانمان بۆ پەیدا بکات تا باش بژین، تا هەست بسەرگەردانی و نوشستی نەکەین. بەڵام باوکم بەگوێی نەدەکردین جیهان و خێزانی بەردابوو، تەنیا بۆ باخچەکەی و، بۆ ئەو چەند دۆستەی دەژیا. نوێژ و ڕۆژوو و قورئان خوێندنێکی زۆری دەکرد. بەڵام خەمی ژیاندنی ئێمە و سەربەرزی ئێمەی نەدەخوارد. من و دایکم ئەممان زۆر پێ ناخۆش بوو. هەستمان بەکەمکوڕی خۆمان زۆر دەکرد. کە دەوڵەمەندەکانی خزمان دەدی شەرمان دەکرد لە خۆمان. لەبەر ئەوە زۆر جار ڕقمان لە باوکم هەڵدەسا. لەم دواییەدا دایکم هەموو دەم، لەگەڵیدا تێکدەچوو! ماڵ پڕ بووبوو لە ئاژاوە پڕ بووبوو لە شەڕ و شۆڕ و دوژمنایەتی! ترووسکەی خۆشی بۆ کەسمان تێدا نەمابوو! لێمان بووبووە دۆزەخ. بەڕاستی باشیان گوتووە: «نە پێڵاوی تەنگ، نە خانەی بەجەنگ». هەروەها (کوردەواری) باش لە ژیان تێگەیشتوون کە گوتوویانە: «کاسەی پڕ ئاشتیی ماڵە»!

باوکم لەو دەمەدا تەمەنی لە شەست ساڵ تێپەڕی بوو. هەرچەندە لە لەشدا لاواز بوو، بەڵام زۆر بەهێز و هەڕەت بوو. هێشتا بەرگەی ئەوەی پێوە مابوو کە تا سی ساڵی تریش کرد و کۆشی بکات بۆ بەختیوکردنی خێزانەکەی. بەڵام داخەکەم نە هێز و هەڕەتەکەی بەکارهێنا، نە خوێندەوارییەکەی، نە شارەزایی و ڕەوشت و خووە بڵند و پەسندەکانی. وا دیاربوو زڵلەی ڕۆژگار کاسی کردبوو، لە ژینیش وەڕسی کردبوو!

ئەو پیاوەی کە جاران نەیدەویست دڵی مێروولەیەک بشکێنێ، یان زیان بەکەسێک بگەیێنێ... ئەو پیاوەی کە هەموو منداڵانی گەڕەکەکەی دەلاواندەوە و، دۆستایەتی لەگەڵ دەگرتن، هەموو جارێک میوە و گوڵی باخچەکەی بەسەردا دابەش دەکردن.. بەڵێ ئەو پیاوە، باوکم، ئازاری دڵی من و دایکمی زۆر دەدا. نەک هەر خەمی ئێمە، بەڵکو خەمی خۆشی نەدەخوارد!

باوکم بڕوای نەمابوو بەکەس. بڕوای نەمابوو بەکۆشش و تەقەلای خۆی! حەزی لە گۆشەگیریی دەکرد! هەوڵی دەدا بەهۆی خواناسی و باخچە بەختیوکردنەوە، خەم و خەفەتی کارەساتی ڕۆژگار لە دڵی خۆی بکاتە دەرەوە! دە بە لای من و دایکمەوە، باوکم بەهەڵەدا چوو بوو! ئێمە بڕوامان وابوو، کە دەیتوانی زۆر بەئاسانی خەم و خەفەت لە کۆڵ خۆی و ئێمەیش بکاتەوە... ماڵەکەیش بخاتەوە سەر دۆخی جاران: پڕی بکاتەوە لە گەشی و ڕووخۆشی و بگرە و بەردە و میوانداری: تەنیا دووکانێکی بچووکی بکردایەوە لە

= کە باوکی مامۆستا بمنەسڵ خەڵکی ئەو ناوەیە و لە تیرەی هەمەوەندە هۆزی (سێتە بسەر) کە بەپێی (العشائر الکردیة) ئەم هۆزە لە هەمەوەند نین بەڵکو دوایان کەوتوون و لەگەڵیاندا ژیاون. ئەمەی لە ڕای ئەدمۆندزەوە وەرگرتووە کە لە (کرد و تورک و عەرەب)دا باسی دەکات. بەڵام ئەمین زەکی بەیەکێک لە پێنج فیرقەی هەمەوەندیان دادەنێ کە لە ۱۷۰۰ەوە لە تەرەفی سنەوە هاتوونە بازیان. بۆ زیاتر بڕوانە: (تاریخ سلیمانی و ولاتی، چاپخانەی، النجاح، بەغدا ۱۹۳۹) وە (العشائر الکردیة، ترجمة فؤاد حمة خورشید، مطبعة الحوادث، بغداد ۱۹۷۹).

بازاڕدا، سەری خۆشی و سەری ئێمەیشی بڵند دەکردەوە. خۆیشی و ئێمەیشی دەخستە خۆش گوزەرانییەوە! ئەو باوکەی کە جاران زۆرانبازی لەگەڵ دەکردە و، فێری مەلەکردن و سواری و تفەنگ بەکارهێنانی دەکردم، ئەو باوکەی جاران فێری قسەی نەستەق و هۆنراوەی دەکردم و، گۆرانی بەخۆم و هاوڕێکانم دەگوت... ئەو باوکەی کە جاران دەیبردم بۆ گەشتوگوزار[1]... وا توندوتیژ و تووڕەی لێ هاتبوو، وەها گرژ و مۆن بووبوو، وەها شەڕانی بووبوو، هەمووومانی کردبووە کونەوە... هەموومانی خستبووە زیندانەوە! بەڕاستی من و دایکم ڕقمان زۆر لێی دەبووەوە... لە دەستی وەڕس بووبووین... خوداخودامان بوو لە دەستی ڕزگار بین! وای لێ هاتبوو، دایکم هەموو دەم لەگەڵیدا لە شەڕ دابوو! منیش وام لێ هات ژوورێکی بچکۆلەم بۆ خۆم جیاکردەوە، بۆ ئەوەی لەو هەرا و بگرە خۆم دوور بخەمەوە! کاتی خۆم، بەتەنیایی، لەو ژوورەدا ڕادەبوارد. یان بەخوێندنەوە، یان بەدەستکردی دارتاشی و ئاستەنگەیی و نووسین و وردەکارییەوە کاتی خۆم بەخت دەکرد... بۆ نان خواردن نەبووایە، نەدەچوومە لایان.. وام لێ هاتبوو کە بڕوا بکەم: هەموو خێزانێک وەک خێزانی ئێمە ژیانی پڕە لە تەنگ و چەڵەمە و ئاژاوە و ناخۆشی و دوژمنایەتی! لەبەر ئەوە کە لە ساڵی ١٩٢٤دا ئینگلیزەکان بۆمبابارانی (سلێمانی)یان کرد، بەهەلم زانی نە لەگەڵ باوکمدا مامەوە لە شارەکەدا، نە لەگەڵ دایکمدا چووم بۆ (نەمەڵ)! بەتەنیا چووم بۆماڵی خزمێکمان کە کوڕی پووری باوکم بوو، لە دێی (دڕەڵە)[2] لە ناوچەی شارباژێڕدا. یەکەم شەوی لێ دەربچێ، بێ دایکیم پێوە دیاربوو، گریام، ئیتر ئەو چەند مانگەی لەوێ بووم زۆر بەدڵخۆشییەوە ڕام بوارد، چونکە لەوێ بێ دەنگ و سەنگ بەسەربەستی و ئازادییەوە لەگەڵ منداڵەکانی هاوڕێمدا بەگەشتوگوزار و گەمە و پێکەنینەوە ڕام دەبوارد. ژیانی ناو دێ و شاخ و کێو و سروشت، ئەوەندەی تر لەناو دڵمدا خۆشەویست بوو.

کە گەڕامەوە (سلێمانی) لەگەڵ باوکمدا چەند ڕۆژێکی خۆش و ئاسوودەم ڕابوارد، بەڵام باوکم لەسەر پاڕانەوەی دایکم بەزۆر و بەخواهیش ڕەوانەی لای دایکمی کردم، بۆ دێی (نەمەڵ) لە ناوچەی شارەزووردا، کە لەگەڵ ماڵی خاڵمدا ڕۆیشتبوو پێی لێ دەنێم: ئەوێم زۆر پێ ناخۆش بوو! هەرچەندە خزم بوون هەرچەندە لە میوانداریدا کەموکوڕییان نەبوو، بەڵام من لە دڵدا ئەوێم زۆر پێ ناخۆش بوو

(١) لەم ڕووەوە مامۆستا عومەر مەحوی (سۆزان مەحوی) بۆی باس کردم کە مەلا ئەسعەدی مەحوی بۆی گێڕاوەتەوە چۆن میرزا فەتاحی باوکی مامۆستا شاکر هەموو دەم سەری خانەقای مەحوی دەدا و دۆستێکی خۆشەویستی مەلا خالیدی مەحوی بووە، باس و خواسی ئایینی و شیعری شاعیران و دەمەتەقێی ناو مەجلیسی خانەقاکە زۆربەی جار ئەوی تیادا بەشداربووە، هەر ئەم دۆستایەتییەش بوو کە وای کرد مامۆستا شاکریش دوای کۆچی دوایی باوکی بێ لە سەردانی خانەقا نەبڕێ و جارەها لەگەڵ مەلا ئەسعەدی مەلا خالیدا بەشداری کۆڕ و مەجلیسەکانی ئەو خانەقایە بکەن و وەک باوکی تێکەڵاوی پیاوانی ئایینی بێ و لێیانەوە نزیک بێ. (لە پێنج شەممەی ٢٠٠٢/٦/٦ لە سلێمانی).

(٢) دڕەڵە و هەیاس چەقەڵ: دوو گوندی بچووکی نزیک بەکارێزەن لەلای ناوی قەڵاچۆلانی خواروی ڕۆژئاوای چوارتا. لە گەشتەکەی شارباژێڕیشیدا ساڵی ١٩٢٩ باسی دەکا و ماڵی خزمی لەوێ بووە.

نەمدەویست دەستیاوی کەسمان بەسەرەوە بێ! نەمدەویست بارین بەسەر کەسەوە! تکام لە دایکم کرد بگەڕێینەوە سلێمانی بەقسەی نەکردم! لە داخاندا نەخۆش کەوتم! بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا تێگەیشتم کە (ئازادی) نەک هەر ڕێگایەکە تەنیا بۆ (کامەرانی) بەڵکو ڕێگایەکیشە بۆ (تەندروستی) و (سەربەرزی)! هەروەها تێگەیشتم کە (کامەرانی) لەناو دوو هاوڕێی وەک یەکدا پەیدا دەبێ. نەک لە ناوەند هاوڕێیەکی دەوڵەمەند و هاوڕێیەکی هەژاردا. یاخود لە ناوەند هاوڕێیەکی دەسەڵاتدار و هاوڕێیەکی بێ دەسەڵاتدا!

## شێخ مەحمود و ئینگلیز[1]

لەم کاتەدا لەشکری عێراق و ئینگلیز ڕژانە ناو شارەوە. فەرمانڕەوایی (شێخ مەحمودی مەزن) دوایی هات. ئێمەیش گەڕاینەوە سلێمانی. هەرچەندە ژیانی ناو ماڵی خۆمانم لەو ژیانەی (نەمەل) زۆر خۆشتر دەهاتە پێش چاو، بەڵام کە بەناو بازاڕدا دەگەڕام هەستم بەسەرنوشوستییەکی گشتی دەکرد. شار بەدەست دوژمنەوە بووبوو بەکەلاوە و وێران بووبوو. بازاڕ کەوتبووە کزییەکی تەواوەوە. دەرامەت نەمابوو. ئاسایش لە دەرەوە و ناوەوەی شار تێکچووبوو. گرانی، هەژاری، نەخۆشی، نەخوێندەواری پەرەیان سەندبووەوە ئێستا ئەو سایەم بیر دەکەوێتەوە، کە چۆن لە پاش ڕاکردنی تورکەکانی عوسمانی و هاتنی لەشکری ئینگلیز (سلێمانی) و ناوچەکانی کەوتنە حەسانەوە و، بووژانەوە و، ئاوەدانییەوە! پاشان کە فەرمانڕەوایی (شێخ مەحمود) دامەزرا، چۆن سلێمانی باشتر پێشکەوت لە ڕووی ئابووری و ئاسایش و خوێندەوارییەوە. چۆن دڵی هەموو لایەکمان خۆش بووبوو بەو ئازادی و سەربەستییەوە کە دەست (نەتەوەی کورد) کەوتبوو. چۆن هەر ڕۆژە بازێکمان دەدا بەرەو سەربەرزی و تێگەیشتن و کامەرانی.

(١) شێخ مەحمودی حەفید (١٨٨١ - ٩/١٠/١٩٥٦) لە نەوەی کاک ئەحمەدی شێخە، کەسایەتییەکی ئایینی و سیاسی و عەشایری بەهێز بوو، کە ئینگلیزەکان عێراقیان گرت لە ١٩١٩دا کردیانە (حوکمدار)ی ناوچەی سلێمانی، بەڵام ئەو تێڕوانینێکی گەلێ لەمە بەرزتر و فراوانتری هەبوو، بۆیە زۆری نەبرد ئینگلیزەکانی لە سلێمانی دەرکرد و خۆی کردە (مەلیک) لە ٩/٦/١٩١٩ گیرا و دوورخرایەوە بۆ هیندستان، ناوچەکە دیسان کەوتەوە ژێر چنگی ئینگلیزەکان، لە ١٩٢٢دا هێنرایەوە و حاکمیەتی سلێمانی پێ درایەوە، بەڵام شێخ هەر لە هەوڵدانی حوکمەتێکی کوردیدا بوو، کەچی ئینگلیزەکان (بەپێی ئەو بەندانەی ڕێکەوتنامەی سایکس - بیکۆ، ئەیلوولی ١٩١٦) لە نەخشە و پلانیاندا نەبوو کە جۆرە مافێکی وا بەکوردی باشوور ڕەوا ببینن، بەڵکو یەگورجی حوکمەتێکیان لە بەغدا بۆ عێراق دامەزراند و باشووریشیان بەزۆر پێ وەلکاند، لە ٢٩ی مایسی ١٩٢٣ شاندێکی دەسەڵاتی ئینگلیز و عەبدولموحسین سەعدون سەرۆک وەزیرانی عێراق و کەسانی تر هاتنە سلێمانی بۆ ڕێگە پاکردنەوەی هێنانی دەسەڵاتی بەغدا، لە ئەنجامی زنجیرەیە ململانێی سیاسی و عەسکەری، دواجار لە ٣ی مارتی ١٩٢٣دا هێزی ئاسمانی بەریتانی بۆمبابارانی سلێمانی کرد و شێخ و لەشکرەکەی خۆیان کوتایە شاخەکانی جاسەنە، دیسانەوە شار ئینگلیز و لەشکری حکوومەتەکەی بەغدا دەستیان بەسەردا گرتەوە و بۆ یەکەم جار سلێمانی بووە چواردەهەمین لیوای عێراق. بەم جۆرە شێخ مەحمود هەتا ٩/١٠/١٩٥٦ بیووە سومبولی ڕزگاری نەتەوەیی لە باشووردا.

پاشان چۆن بەهۆی دوژمنایەتی نێوان (شێخ مەحموود) و ئینگلیزەوە هەموو شتێکمان لە دەست چوو!؟ تا لە خوێندنگاکانی سەردەمی داگیرکردنی ئینگلیزەکاندا دەمانخوێند، هەستمان نەدەکرد بەبوونی خۆمان[١].

بەڵام لە کاتی فەرمانڕەوایی (شێخ مەحموودی مەزن)دا هەستمان بەسەربەرزی و کامەرانی دەکرد. لە دوو خوێندنگای شڕ و پڕی سەردەمی ئینگلیزەکانەوە، خوێندنگاکان لە سەردەمی (شێخ مەحموود)دا بوون بەچوار خوێندنگای ڕێکوپێک و پۆشتە و پەرداخ و شۆخ و شەنگ[٢] (شێخ مەحموودی مەزن)، خۆی وەک باوکێکی ڕاستەقینە چاودێری دەکردین لەو خوێندنگایانەدا. جلوبەرگی لەسەر ئەرکی (شێخ مەحموود)، بۆ هەموو شاگردان دروست کرا. هەموو ڕۆژ ئەفسەرەکانی لەشکری کورد، دەهاتن مەشقی سەربازییان پێ دەکردین. هەموو ڕۆژ سڵاومان دەکرد، بۆ (ئاڵای کوردستان). (هەر بژی)مان دەکرد بۆ (خونکاری کوردستان)[٣] گۆرانیمان دەگوت بۆ (ئاڵای کوردستان). ئەفسەرەکان خەریک بوون دەستەیەکمان فێری تفەنگ بەکارهێنان بکەن، دەستەیەکیشمان فێری سواری بکەن، تا شاگردەکان ئامادەبن بۆ (پێشمەرگەی سوپای کوردستان). هەروەها خەریک بوون ژمارەیەکی زۆریش لە ئامێرەکانی ساز و ئاوازی سەربازی بکڕن بۆ (سوپای کوردستان). تەنانەت پوولی پۆستەیشیان لەبیر نەچوو کە بەناوی (فەرمانڕەوایی کوردستانی خواروو)وە دەریان هێنا[٤].

زمانی خوێندنمان (کوردی) بوو. لەو دەمەدا کە تەمەنم لە دە ساڵان تێپەڕی کردبوو، لە شاگردێکی گێژ و وێژ و ترسنۆک لە خوێندن و خوێندنگاوە بووبوومە شاگردێکی دڵ پڕ لە خۆشەویستی بۆ خوێندەواری و خوێندنگا. لەگەڵ سێ شاگردی تردا کرام بەچاوەش. دوای خوێندن دەگەڕاین بەناو شاردا بۆ ئەوەی کردەوە و ڕەوشتی شاگردەکان تەماشا بکەین و، ئاراستەیان بکەین بۆ چاکی. هەموو هەفتەیەک شاگردی بەدخوو سزا دەدرا. شاگردی چاکیش پاداشتی پێ دەدرا. ئەمەیش بەئاشکرا لەبەردەم هەموو مامۆستا و شاگردەکاندا دەکرا.

(١) مەبەست لە قۆناغی یەکەمی حوکمی ڕاستەوخۆی ئینگلیزە لە سلێمانی ١٩١٩ - ١٩٢٢ کە دوای شەڕی دەربەندی بازیان شێخ گیرا و ئینگلیز شاری داگیرکرد و حاکمی سیاسی سلێمانیش (ئیلی بانستەرسۆن ١٨٨١ - ١٩٢٣) کە بەمێجەرسۆن ناسراوە حوکمێکی دڵڕەقانەی شارەکەی دەکرد. بەلووتبەرزی و لە خۆزلزانییەکی تەواوەوە مامەڵەی دەکرد.

(٢) ئەو قوتابخانانە: ئەعدادی مەحموودی، ڕوشدیەی قادری، ڕەشوفیە، لەتیفیە.

(٣) واتە بۆ: سەرۆکی کوردستان، مەلیکی کوردستان

(٤) لە ڕاستیدا ئەو پوولی پۆستەیە هەر لە چاپخانەکەی شارەوانی سلێمانی لە چاپ درابوو، لەسەر کاغەزێکی ساکار. لە لای ڕاستییەوە نووسراوە (حکوومەت) لە سەرەوە (کوردستان) و لە لای چەپیەوە (جنوبی) لە خوارێشەوە (٨ آنە) کە نرخی پەپوولەکەیە و لە نێوەڕاستیشیدا وێنەی دوو خەنجەری ڕاست و چەپ هەیە. قەراغێکی کرنج نییە، ڕەنگی کاغەزەکە سەوزێکی کاڵە و وێنە و نووسینەکان ڕەشن. قەبارەکەی ٣ × ٤سم.. زیاتر بەمەبەستی باج وەرگرتن لە معامەلاتی ڕەسمی خەڵکی دەرکرابوو و بەکاردەهات.

## لە ئاغییەتیدا زۆرداریم دی!

بیرمە هەر لە سایەی ئەم بەرگی سەربازی و مەشقی سەربازی و پەروەردەکردنی سەربازییانەوە، ئارەزووم چووە سەر چەک هەڵگرتن و بەکارهێنانی لە پارەی ڕۆژانەکانم کە کۆم دەکردنەوە، بەدزی باوکمەوە دەمانچەیەکی بچکۆلانەم کڕی. پاشان خەنجەرێکی دەبانیشم کڕی. دوای ئەوانە لە ژوورێکی ماڵی خۆماندا، دەستم دایە چەخماخسازی. دایک و باوکم لە ڕووی دڵسۆزییەوە حەزیان نەدەکرد، ترخنی ئەو شتانە بکەوم. بەڵام منداڵییەکەی من بەهێزتر بوو لە شیرەی ئەوان و، لە هەڕەشەی ئەوان! گوێم نەدایە قسەیان! جارێکیان دەمانچەیەکم لە دەست دەرچوو. جارێکی تریش بۆمبایەکی دەستکردی خۆمم لە دەست دەرچوو! زۆری نەمابوو لە هەردوو جارەکەدا بریندارم!

لە ماڵە ئاغایەکی گەورە خەنجەرێکی نایابیان لێ دزیم! چونکە ئاغاکە دادی نەدەپرسیم و تۆڵەی بۆ نەدەکردمەوە، ڕقم لێی دەبووەوە و بەچاوی سووکەوە سەیرم دەکرد! لام وابوو خەنجەرەکە بۆ خۆی دزرابوو، بۆیەکا دادی نەدەپرسیم!؟ ئاغایەکی گەورەی تریش کە زۆر دۆستی باوکم بوو، بەڵێنی دامێ کە دەمانچەیەکم پێشکەش بکات. لەبەر ئەوەی درۆی لەگەڵ کردم، ئەویشم لەبەر چاوکەوت! ئەم دووکارەساتە وایان لێ کردم ڕقم لە ئاغایەتی ببێتەوە. لە هەموو ئاغایەکیش بسڵەمێمەوە! تا زۆر زۆریش تاقییان نەکەمەوە، بڕوایان پێ نەکەم!؟ کە بووم بەفەرمانبەر، کردەوە و ڕەوشتی ئاغاکانم بەبەد و ستەمکارانە دەهاتە پێش چاو. لەبەر ئەوە تا پێم بکرایە بەرەنگاری دەسەڵاتی ناڕەوایانم دەکرد! هەرچەندە (کوردەواری) ئەو ناوچانە، بەتایبەتیش زۆر لێکراوەکانیان ئەمەیان پێ خۆش بوو، بەڵام ئاغاکان زۆر جار بەدگۆییان لێ دەکردم، لای فەرمانڕەوایی بە(کۆمۆنیست)یان دەدامە قەڵەم!

## بەچکە دەوڵەمەندەکانم خراپ هاتە پێش چاو!

لە گەڕەکەکەماندا زۆربەی منداڵەکان کوڕە هەژاربوون. بەڵام هەندێک لەمانە، ئایا لەبەر ترس بووبێ، یان لەبەر تێنەگەیشتن، یاخود لەبەر چنۆکی و چاوبرسێتی، دوای قسەی زۆردارانە و خۆپەرستانەی دوو سێ بەچکە دەوڵەمەند دەکەوتن!؟ ئەو بەچکە دەوڵەمەندانە کوڕە ئاغایش بوون! چەند جارێک ئەو منداڵانە بەسەرۆکایەتی ئەو بەچکە دەوڵەمەندانەوە، لە باخچەی ماڵی ئێمە و لە باخچەی ماڵی گەلێک کەسانی تر، میوە و سەوزەیان دەکردەوە و دەدزی و دەفڕاند. هەموو جارێک لە خۆمم دەپرسی: ئەگەر منداڵە هەژارەکان میوە و سەوزە بدزن، دەڵێن لەبەر ئەوەیە کە لە ماڵی خۆیاندا میوە و سەوزەیان نییە بیخۆن بۆیەکا دەیدزن! ئەی بەچکە دەوڵەمەندەکان کە لە ماڵی خۆیاندا هەموو جۆرە سەوزەیەکیان هەیە، بۆ چ دەیدزن؟! ئێستەیش سوپاسگوزاری باوکمم کە لە منداڵیدا وەهای پەروەردە کردم کە هەرگیز حەز لە دزی کردن نەکەم و بێ ڕێدانی خاوەنی لە باخ و بێستانی کەسیش میوە نەکەمەوە و میوە نەڕنم.

کوڕە دەوڵەمەندێک دەناسم: هەموو ئێواران ئەوانەی لەبەر هەژاری خۆیان دەهاتنە بەرماڵەکەیان بۆ پارچە نانێک بیاندەنێ، هەموویان ئاگادار دەکرد وەک سەرباز بۆی ڕیزبن و مەشقی بۆ بکەن، بۆ ئەمەی دەمێکی تەواو بۆ بەزم و پێکەنینی خۆی خۆشی لە دیلی ژێر دەستییان ببینێ! ئەو هەژارەی لەژێر

فەرماندەیی ئەودا مەشقی سەربازانەی نەکردایە، نانی نەدەدایە!؟

جا ئەم کارمساتانەی لەو ئاغا و کوڕە ئاغا و بەچکە دەوڵەمەندانە چاوم پێ دەکەوت لەگەڵ فیز و لووت بەرزی و خۆپەرستییەکەیان.. ئەمانە هەموویان منیان خستە سەر بیرکردنەوە لە چینی دەوڵەمەند و ئاغاکان.. لە خۆم دەپرسی: لەبەر چی وان؟! بۆچ وا دەکەن؟! بەڵام تا گەلێکساڵ تێنەپەڕی تێیان نەگەیشتم! نایشارمەوە لە دڵدا ڕقم لێیان دەبووەوە! حەزم دەکرد لە هەژارە باشەکان نزیک ببمەوە نەک لەوان! گەلێک جار شەڕ و شۆڕم تووش دەبوو لەگەڵ ئەو بەچکە دەوڵەمەند و ئاغایانەدا!

جارێکیان بوومە سەرکردەی گەلەیەک لەو منداڵە هەژارانە ڕاوێژی هەوروژمان کرد و بڕیارمان لەسەر دا و، دارم بۆ هەموویان پەیدا کرد. لە تەنگی بانگی شێواندا بەرەنگاری بەچکە دەوڵەمەند و کوڕە ئاغاکان و نۆکەرەکانیان بووین. خۆشبەختانە شکاندمانن و، ڕاومان نان و، ناچارمان کردن بەڕێزگرتنمان! لەمەوە هەستمان بەسەربلندییەک کرد، بەدڵخۆشییەک. ئێمە منداڵە هەژارەکان زۆرتر هۆگری یەکتری بووین. ئیتر لەوە بەولاوە، تەنیا لەگەڵ خۆماندا یاریمان دەکرد. نزیکی ئەو بەچکە دەوڵەمەند و کوڕە ئاغا خۆپەرستانە و خاوەن فیزانە نەدەبووینەوە! لام وایە ئەم سەرچاوەیە و هەندێک شتی ترەوە بوو، کە لە دواڕۆژدا، بوومە دۆستی هەژار و کلۆڵ و بێچاران. پڕ بەدڵیش بەرەنگاری (زۆرداری)ی هەموو خاوەن دەسەڵاتێکم دەکرد، لەسەر ئەوان. هەر لەسەر ئەم کردەوانەیشم بوو کە دوژمنانێکی زۆر بەچنگم لە دواڕۆژدا بۆ پەیدا بوو، لە زۆردارانی خاوەن سایە و مایە و دەسەڵات. لەسەر دەستی ئەوانیشدابوو، کە زۆر تەنگ و چەڵەمە و گیروگرفتم هاتە بەر و، زۆر پەند و شیرەتم لە ڕۆژگار وەرگرت.

## لە ناو ئاژاوەدا گەورە کرام

دایکم و باوکم، هەردووکیان خودا پەرست بوون. نوێژیان دەکرد و، ڕۆژوویان دەگرت و قورئانیان دەخوێند. بەڵام هەردووکیان لەشیان کز و لاواز، کەللەیان پڕ لە ئاشووب، دڵیان پڕ لە خەم و خەفەت بوو. هەردووکیان گرژ و نەکڵۆک بوون. بەڵام لە تەمەندا لە تێگەیشتندا لە بیروباوەڕا لە ڕەوشت و کرداردا زۆر لەیەک جیاوازبوون. دایکم ڕێزی لە داماو و هەژار و سەرگەردان زۆر دەگرت. بەدڵ خۆشی دەویستن، یارمەتی دەدان. باوکم ڕێزی لە خوێندەوار و، خوداناس و ڕەوشت بڵند زۆر دەگرت. دایکم ئەوپەڕی نازی دەکێشام باوکم بەپێچەوانەوە نازی نەدەکێشام. دایکم لەگەڵمدا ڕووخۆش و قسەخۆش و، کردەوە ڕەندین بوو، بۆ خۆشی دڵی من هەموو سامان و گیانی خۆی بەخت بکردایە، بەلایەوە کەم بوو... بەڵام باوکم وشک و برنگ توندوتیژ و تووڕە بوو لەگەڵمدا. بەکورتی هەردوولایان ئەم پەڕ و ئەوپەڕیان لێ گرتبووم! جا پەروەردەکردنی کەوتبووە ناوەند (ساردی) و (گەرمی)ی ڕەوشت و خووی هەردووکیانەوە! لەبەر ئەوە (کەلەپوور)[1]ی لەش و ئەنجامی کردەوەکانیان، کەلکێکی کەم و زیانێکی زۆری بەمن بەخشی! ئەم

(١) ڕێی تێدەچێ مەبەستی لەمە (بۆماوە - وراثة) بێ کە لە جۆری پێکهاتە و جۆرمی لەش و لاری باوک و دایکیدا پێی براوە و خۆشی لە سەرەوە نیشاری بێ داوە. هەروا ئەم ڕاستگۆییە لە باری دەروونی و هەڵسوکەوتییەوە ئاستی یادداشتەکانی مامۆستا گەلێ بەرزتر دەکاتەوە و بەها و نرخیان زیاد دەکات.

جۆرە پەروەردەکردنە وای لێ کردبووم، لە (لەش)دا: لەڕ و لاواز و، زۆر جار نەخۆش لە (گیان)دا کز و بێ هێز و ترسنۆک لە (هۆش)دا سەرلێشێواو و هەڵەدار بیم! داخەکەم منیش گرژ و نەکڵۆک و قسە ڕەق و توند و تیژ بووبووم! وام لێ هاتبوو، نەک جیهان نەک ژیان خۆشم لەبەر چاو بکەوێ!؟

## خوێندنم پێ خۆش نەبوو، لێی دەترسام!

دوو سێ جار ناردمیانە حوجرە لای مەلاکان بخوێنم، لە ناو نوقورچی کچێکی شاگرد کە پێی دەخوێندم، لە ترسی ئازاری داری مامۆستا مەلاکان یەک لەدوای یەک حوجرەکانم بەجێ هێشت بێ ئەوەی هیچیان تێدا فێربیم! باوکم ناچار ما خۆی لە ماڵەوە قورئان و نووسین و نووسراوە فارسییەکانی پێ دەخوێندم، لێرەدا لە ترسدا فێر دەبووم! بەڵام دڵم نەدەچوو بەخوێندنەکاندا. چونکە تێیان نەدەگەیشتم لەوانەش نەبوون کە دڵم پێیان بگەشێتەوە! پاشان باوک چوو بۆ (ئێران) بۆ کڕین و فرۆشتنی ئەو کاتە دەسەڵات بەدەست ئینگلیزەکانەوە بوو، ئامۆزایەکی باوکم، ناردمیە بەر خوێندن لە خوێندنگا. لە هیچە ختمیانە پۆلی سێهەمەوە لەوێشدا گێژ و وێژ بووم، تەقەی سەرم دەهات. حەزم لە خوێندنەکان نەدەکرد. تێیان نەدەگەیشتم لە داری مامۆستاکان دەترسام قینم لە خوێندنگا دەبووەوە کەچی بەشەو پڕ بەدڵ گوێم لە چیرۆک و بەسەرهاتی پاڵەوانان دەگرت، کە چیرۆک خوانێکی ناسیاوی دراوسێمان دەیکرد. جار بەجارێک خوێندنگام بیر دەکەوتەوە.

هەناسەیەکی ساردم هەڵدەکێشا بۆ خۆم چونکە وەک شاگردەکانی تر خوێندنەکان فێر نەدەبووم تا وەرامی باش بدەمەوە هەموو جارێکیش بەشەرمەوە یاخود بەلێدانەوە لە پۆلەکەمدا دەگەڕامەوە جێی خۆم! چەند ساڵێک لەناو ئەم ئازاری دەروونییەدا تلامەوە، چەند جارێک تێیدا نەخۆش کەوتم پاشان بۆم دەرکەوت کە هۆی ناشێتییەکەم لە خوێندنەکاندا ئەوە بوو کە وەک شاگردەکانی تر منیان لە پۆلی یەکەمدا دانەمەزراندبوو. بۆیەکا بنچینەی خوێندەوارییەکەم وا چرووک بوو. بەدڵ حەزم دەکرد لە پۆلی سێهەمەوە بمگێڕنەوە بۆ پۆلی یەکەم، تا بتوانم منیش ڕوو سوور و سەر نەفرازیم لە بەردەم مامۆستاکان و شاگردەکاندا. هەرچەندە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (شێخ مەحموودی مەزن)دا گوێزرامەوە بۆ خوێندنگایەکی تر کە لەوێدا کەمێک حەزم لە خوێندن و هەستم بەبوونی خۆم دەکرد، بەڵام داخەکەم ئەم ساڵە و ساڵێکی تریشم، بێجگە لە دوو ساڵەکەی پێشوو بەفیڕۆ لەدەست چوو! کە زانیم بنچینەی خوێندنەکەم چرووکە پڕ بەدڵ ئامۆژگاری خۆم بەجێ هێنا و، لە پۆلی شەشەمەوە گەڕامەوە بۆ پۆلی پێنجەم! لێرەدا کارەساتێک ڕووی دا، کە بووە بەهۆی گۆڕانی بیروباوەڕم دەربارەی خوێندنگا و خوێندەواری. یەکەمی پۆلەکەمان ڕۆیی بەپێی ڕستەی ناوەکان نەک بەپێی پلەی خوێندەواریم وا ڕێککەوت ناوی من لە دوای ناوی ئەوە دەهات. هەرچەندە لە بارستایی خوێندەواریدا زۆر لەدوا بووم، بەڵام بەو ڕێکەوتە کە بووم بەیەکەمی پۆلی پێنجەم دڵم یەجگار خۆش بوو! سەرم یەجگار بڵند بووەوە! لە خۆم دەپرسی: بۆ چ زۆرتر تێنەکۆشم؟ بۆ چ زۆرتر خۆم ماندوو نەکەم؟ بەڵکو سەربکەوم! بەڵکو پێش بکەوم! کێ دەڵێ: ئەم یەکەمینییە درۆزنەی خۆم ناکەم بەیەکەمینییەکی ڕاستەقینە؟ باش بوو لەو دەمەدا خوداوراستان چەند مامۆستایەکی نوێ و شارەزا و وریا و، کارگوزار لە خوێندنگاکەماندا دامەزران بەهۆی ئەوانەوە بۆ یەکەم



جار بەڕاستی لە ژیانمدا خوێندنگا و خوێندەواری و مامۆستایانم بەدڵداچوو. تێکۆشینەکانم سەریان گرت. لە تاقیکردنەوەکاندا، یەک لە دوای یەک بەباشی دەردەچووم. ڕۆژ بەڕۆژ باشتر دەبووم پاش یەک دوو مانگێک تێکۆشانی تەواو، وام لێ هات بووم بەیەکەمی ڕاستەقینەی پۆلەکەم! ئای لەم خۆشییە!

ئیتر لەو ڕۆژەوە بەتێکۆشین و خوێندن دڵم خۆش دەبوو و، کامەران دەبووم ئەمەندە هۆگری خوێندن بووم لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا یەکەمم بەرنەدەدا. تەنانەت لە پۆلی شەشەمدا کە دەرچووم، بووە بەیەکەمی خاک (لوا)ی سلێمانی. لەناو یەکەمەکانی خوێندنگاکانی سەرەتایی عێراقیشدا جێگایەکی باشم گرت. لە سەرەکی[1] خوێندنگاکەمانەوە لە ئاهەنگێکی گەرم و گوڕدا پیرۆزباییم لێ کرا و، ئافەرین کرام... لە زۆر لای تریشەوە پیرۆزباییم لێ کرا. جا ئەم سەرکەوتنانەم بوو کە گیان و دڵمیان بووژاندەوە. هەستیشیان پێ کردم بەبوونی خۆم و، بەسەربەرزی و کامەرانی وایشیان لێ کردم کە بروام بە(خۆ)م بێ، کە دەتوانم لە هەموو شتێکدا لە هەموو کاروبارێکدا بەهۆی هەوڵ و تێکۆشانەوە سەربکەوم، بەڵکو دەتوانم ببم بەیەکەم لە هەموو سەرکەوتنێکمدا! بەڵێ، ئەم سەرکەوتنانەم بوون کە پاڵیان پێوەنام ببم بەمامۆستای خۆم کە ئاراستەیان کردم بۆ دۆستایەتی بۆ پیاوەتی بۆ نیشتمانپەروەری بۆ ژیانێکی پاک و پوختە و سەربەرزانەی پڕ لە کامەرانی. بەڵێ وابوو... ژیان چوو بەدڵمدا لەبەر ئەوە ترسم لێی نەما!

## ئەخۆشی باوک و دایکم کاری تێ کردم

لە پشووی هاوین پاش تاقیکردنەوەی پۆلی پێنجەمدا، باوکم و دایکم هەردووکیان نەخۆش کەوتن. تەنانەت منیان بەدیارەوە مابووم بەکەڵکیان بێم. نەخۆشییەکەی دایکم کوشندە بوو. لەوە دەترسام بیکوژێ. شپرزەییەکی زۆر و دڵتەنگییەکی بەهێز ڕوویان تێ کردبووم. دایکم زۆر خۆشدەویست. بەزەییم پێیدا دەهاتەوە کە بەتەنیا دەبووم بۆی دەگریام. بەڵام لەبەردەم خزمەکاندا خۆم کز پیشان نەدەدا. باش بوو لە سایەی خوداوە لە پاش چەند ڕۆژێک دەرمان خواردن هەردووکیان چاک بوونەوە.

## کوردایەتی لە مامۆستایەکەوە فێر بووم

هەرچی باوکم بوو هۆگری بیروباوەڕی ئیسلامەتی بوو. ئەو حەزی وا دەکرد فەرمانڕەواییەکی ئیسلامی وەها هەڵبکەوێ کە هەموو ئیسلامەکان بەیەک چاو تەماشا بکات و، هەموو نەتەوەیەکیش مافی خۆی لەژێر سێبەری ئەودا بەتەواوەتی دەست بکەوێ. حەزی لە زۆرداری نەدەکرد. بەرەنگاری دەکرد. منیش تا

(١) سەرەکی: بەڕێوەبەرایەتی.

ماوەیەک لەسەر بیروباوەڕی باوکم بووم. بەڵام ڕۆژێکیان مامۆستایەکی نوێ کە ناوی (عەبدولواحید نوری)[1] بوو، وتارێکی نیشتمانپەروەرانەی دا بۆ شاگردەکان، کە منیش یەکێک بووم لەوان، لە بابەت یەکێک لە شۆڕشەکانی کوردەوە. چونکە وتارەکە پڕ لە ڕاستی و دڵسۆزی بوو، چونکە زۆر لێکراوی و داماویی و لێقەوماویی کوردەواری پیشان دەدا، زۆر کاری تێکردم بیروباوەڕم هاتە سەر کوردایەتی و، دڵم چوو بەنەتەوەی کورددا. ئەم خۆشویستنە لە دڵمدا گڕی گرت. تا دەشهات گڕەکەی بڵێسەی دەسەند، بەتایبەتی لە پاش ئەوەی کۆمەڵە هۆنراوەکانی (حاجی قادری کۆیی)م خوێندەوە کە لە ساڵی ۱۹۲۵دا چاپ کرابوو. پاشان وام لێ هات لە دوایی (خودا)، کەسی ترم لە (نەتەوەی کورد) خۆشتر نەدەویست لە ڕاستیدا (کوردایەتی)م دەپەرست! بڕیاریشم دا: «هەتا دەمێنم سامان و گیانم لە پێناو کامەرانی و پێشکەوتن و سەربەرزی (کورد)دا بەخت بکەم». ئیتر لەوساوە هاتمە کۆڕی (نیشتمانپەروەری) و (گەلپەروەری)یەوە. ئەوەندەی هۆشم بڕی کردبێ و لە توانامدا بووبێ. بەپێی کات و جێگا و مرۆڤ، لە کۆششکردن دوا نەکەوتووم! بۆ گەیشتن بەم ئامانجە پیرۆزەیش لە سەرێکەوە بڕیارم دا: «ببمە مامۆستای خۆم و، خۆم پێ بگەیێنم». لە سەرێکی تریشەوە بڕیارم دا: (لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی خوێندەوارییەوە، «نەتەوەی نەژادی کورد» وریا بکەمەوە و بیخەمە سەر ڕێگای پێشکەوتن و سەربەرزی و کامەرانی). لەم کاتەدا کە ساڵی ۱۹۲۷ بوو[2]، تەمەنم لە چواردە ساڵیدا بوو[3]... لە تاقیکردنەوەی پۆلی شەشەمدا بەیەکەم دەرچووبووم. ئیتر لەو ڕۆژەوە تەمەنی منداڵیم بڕایەوە. پێم نایە تەمەنی کوڕێتییەوە. سەرە هەڵبڕی ڕاست بوومەوە. گورم بەستەوە. خۆم گورجوگۆڵ کردەوە. بۆ ئەوەی منیش لە «ژیان»دا ڕێگایەکی تەخت و فراوان بۆ خۆم بکەمەوە!

(۱) عەبدولواحید نوری: (۱۹۰٤ - ۱۹٤٤/۷/۵) هەر زوو باوکی کۆچی دوایی کردووە، جا لای خاڵی کە نوری عەلی ئەجزاچی بوو پەروەردە و گەورە بووە، بۆیە هەر ناوی ئەویشی وەرگرتووە لە قوتابخانەی نموونەی سەعادەتی سلێمانی خوێندوویە، لە ۱۹۲۷ (دار المعلمین)ی بەغدای تەوا کردووە لە هەڵەبجە و سلێمانی و شەقڵاوە و چوارتا مامۆستا بووە، خاوەنی دەست و قەڵەمێکی ڕەنگین بووە، دەڵێن لە بواری ڕۆژنامەگەریدا کاری کردووە، نووسینەکانی بەبیری پێشکەوتوو و زانستی سەردەمەکە ناو دەدا، کوردپەروەرێکی ڕاستەقینە بووە، زمانەکانی تورکی و عەرەبی و فارسی باش زانیوە، کۆمەڵێ وتار و کتێبی وەرگێڕراوی هەیە، لەگەڵ چەند شیعر و سروودێکی نیشتمانی و نەتەوەیی کە مێشکی قوتابیەکانی پێ ئاو دەدا! لە کتێبەکانی: لە وڵاتی ئادەمیزادە سەربەستەکاندا ۱۹۳۹، پیرۆزی منداڵ ۱۹٤۰، بەرەو ڕووناکی ۱۹٤۲، لە ڕێی سەرکەوتنی ئینسانا ۱۹٤۳. هەروا کۆمەڵێ کتێبی بۆ خوێندنی قوتابخانە لە عەرەبییەوە گۆڕیوە.

(۲) ئەو دەمە تازە لە پۆلی دووەمی خوێندنگای دووەمی دەرچووبووم.

(۳) بەسەرجێک لەم کاتەدا بووە ۱۹۲۷/٦/۱۵ کە شێخ مەحموود (ڕێکەوتننامەی پێنجوین)ی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا مۆر کرد بۆ کۆتایی هێنان بەشۆڕشەکەی و وازهێنان لە سیاسەت. دیارە ئەمەش بەهۆی نابڵوقەدانێکی دەوڵەتانی چواردەور و فیتی بەریتانیاوە بوو. لەو ڕۆژانەدا خەڵکەکەی سلێمانی دووچاری نائومێدی و دڵشکاوییەک ببوو، ئەم کلپەسەندنی گیانی کوردایەتییە لە دەروونی مامۆستا و قوتابیاندا لەو ڕۆژە ڕەشەدا شتێکی دڵخۆشکەر بووە، گۆڕانێکی بەرچاویش بووە لە شێوازی خەباتی ڕزگاری نەتەوەییدا.

# گەشتی شارباژێر
# ١٩٢٩




سالی ١٩٢٩ لە ڕۆژی ٢٠ی مانگی گەلاوێژدا ئاواتم هاتە دی. دووشەممە بەیانەکی، سێ سوارە. من و باوکم و کوێخای (دڕەڵە - حاجی ڕەشید)، ڕوو بەکەلی (ئەزمڕ) دەستمان کرد بەڕۆیشتن. هەتاکو سەر پلەکان بەناسوودەیی لێمان خوری، کە لەوەدوا تووشی بەردەلانی و ڕەشەبایەکی بێ هاوتای شاخەکە بووین، تا گەیشتینە چایخانەکەی ئەزمڕ دابەزین. ئەو پێخۆرەی پێمان بوو خواردمان. دوای سات و نیوێک بەرەو (دڕەڵە) دەستمان کرد بەڕۆیین، بەناو ئەم کێو و کەژ و شیو و دۆڵەدا. کزەبایەکی شەماڵیش بەلار و لەنجە دەهات. خۆی ئەدا لە یاڵی ئەسپ و ماینەکانمان، پەخشانی ئەکردن و، ئەیخستنە بەر تیشکی پرشنگداری ڕۆژ. وەکو ئاوریشمێکی ڕەنگ خورمایی دەیدرەوشاندەوە. لەلایەکی تریشەوە دار و دەوەنی ئەو چیایەی کە بووبوونە خاڵی سەر گۆنای خۆی، بەخۆشی هاتنی شەماڵی شاخەکانی ژووروورەوە شنەیان ئەکرد. دڵ چ دڵێکە کە هەموو دەم ئاخ نەخوازێ کە لەناو ئەو نزارە و ئەو مێرگ و مێرغوزارەدا تەمەنی شیرینی خۆی ڕابوێرێ. ڕۆژ نەگەیشتبووە نیوەڕۆ گەیشتینە سەر (باسکی دڕەڵە)، دابەزین. بەچاو تەماشای ئەو چاوئەندازە جوانەی گوێ چەمەمان ئەکرد. سنگیشمان بەهەڵمژینی ئەو شەماڵە بۆنخۆشە ئەبووژاندەوە لەسەر قاڵی و ڕایەخی دەستکردی کوردستان دانیشتین. حەساینەوە. تاوێک خەریکی ئاوە سەهۆڵاوەکەی (دڕەڵە) بووین. تاوێکیش لە کونی دووربینەوە تەماشای گوندەکانی بن ئەو چیا گەورانەمان ئەکرد. نان خورا. نوستین، لە نوستن بووینەوە. ئینجا نۆرەی ڕاو بوو.

## ڕاوەکەوێکی سەیر ١٩٢٩/٨/٢٠

من و (حاجی ڕەشید) کە گەورەی دێیەکە بوو، شان بەتفەنگ و کەمەر بەکێلانە خەنجەر، هەموو کەلوپەلێکی ڕاوە کەومان لەگەڵ خۆماندا برد. چووینە ناو ئەو حاشارەوە کە لەولای (دێ کۆن) یاخود (ڕەز)ەکەوە بوو. لەو حەلەوە تاکو نزیکی ئێوارە بێ سرپە و خشپە لەناو حاشارەکەدا خۆمان مات کرد. چاومان بەو کونەوە بوو کە لوولەی تفەنگەکەی تێ دەخرێ بۆ کوشتنی ئەو مەلانە. کە لەپاش تاوێک پەیتا، پەیتا، دەستەیەک فیژاڵک، پۆلێک کۆترە باریکە. قۆلێک سوێسکە، لەگەڵ تاک و تەرایەک کەو دەهاتنە سەر ئەو ئەستێرکە گچکەیە کە لە چۆڕە ئاوی چیاکە بەچۆڕە چۆڕ پڕ بووبوو. وەڵێ چونکو مەبەسی

(حاجی ڕەشید) هەر کەو کوشتن بوو، لەوانی کەی تەقە نەدەکرد. کاتێکمان زانی سێ کەو شان بەشانی یەک هاتنە گوێ ئاوەکە. پڕ کەیف و شادی و مەستی ئازادی ئاویان نۆش کرد. بەدەنگی سازئاساییشیان دڵیان خۆش نەکرد. حاجی لەو کاتەدا، دەستی نا بەپەلەپیتکەی تفەنگدا، بەختی ناپوختم چووە جێگەی سەخت، تفەنگی بێ کارە لێمان بوو بەمار!... هەرچەند پەنجەی پیادەنا و دەی تڕووکاند، بایی جریوەی چۆلەکەیەک هاڕەی نەکرد. لێمان یاخی بوو، هەر تەقەی نەکرد. کاتێکمان زانی کەوەکانیش بەم کەینە و بەینەیان زانی و سێ بەسێ دایان لە شەقەی باڵ و ڕوومو هەورازی چیاکە دەستیان کرد بەفڕین. ئێمەیش بەدڵێکی پڕ ئێشەوە هاتینەوە ناو دێ، تاکو بۆ سۆزی (حاجی ڕەشید) بەتفەنگەکەیەوە جارێکی تر چووەوە ناو حەشارگەوە. کات نەگەیشتە چێشتەنگاو بەچوار کەوی ناسک و باسک و قۆڵ قەوییەوە هاتەوە ماڵەوە. لە بانگی شێواندا هەر چواریانمان بەسوورکراوی، لەسەر سینی هاتە بەردەم. بێ ئێوە ناخۆش بەخواردنیان شادمان بووین. بەم ڕەنگە ڕۆژی سێ شەممەیشمان دوایی پێ هێنا.

## ڕاوە ماسی ١٩٢٩/٨/٢٢

هێشتا ڕۆژ نەبوو بووەوە، لە خۆشی بینینی ڕاوە ماسی، لەپڕ، ناو بەناو خەبەرم نەبووەوە، چونکە ئەو جۆرە ڕاوە ماسییەم هێشتا نەدیبوو. بۆ بەری بەیان زۆری نەمابوو. جریوەی چۆلەکە و شەو سروەی گزەبای بەیان لە پێخەف سەری بەرز کردمەوە. چاونەندازەکەی یەجگار دڵگیر بوو. لەلایەکەوە شەماڵ خۆی ئەدا لە پرچی ڕەنگینی چنار و عەرعەر بەجارێ نەشئە پەخشانی نەکرد، لەلایەکی تریشەوە ڕۆژ چەشنی کیژێکی چواردە ساڵە بەلار و لەنجە و نازێکی بێ ئەندازەوە دەم و چاوی، بەسەرە تاتکێ، لە قوتکەی کەلەوە دەرنەخست. دەمی وەک شکۆفەیەکی بەری بەیانیانی بەهاران بەئاستەم دەپشکووتەوە، بەپرشنگی تیشکی ڕوومەتی یاقیینیشی گەڵای ئەو دار و دەوەنانە، ئەو چیمەن و لالەزارەی وەک تارایەکی ئاڵ دەڕازاندەوە. هەرچەند ئەو تیشکە گەوهەرینەیش ئەیدا لە ڕووی ئەو ئاوچەمە، ئاوی چەمەکەیش وەک ئاوێنەیەک بەرامبەر بەڕۆژ و ڕوو بەئاسمانی بێ پایان، تیشکی ئەڵماسینی خۆی ڕەوانە ئەکردەوە.

منیش لە خۆشی ئەم دیمەنە جوانانە، جوولە کەوتە لەشمەوە و وەکو تیزگەی تفەنگ لە پێخەفەکەم ڕاپەڕیم و گورج و گۆڵانە خۆم کۆ کردەوە و، چست و چالاکانە تروتفاقی چا لێنان و ڕاوە ماسیم ئامادە کرد. هەندێکم بەپاشکۆی ئەسپەکەمدا قایم کرد و لێم خوڕی ڕوو بەچەم، هەتا گەیشتینە گزمێکی گەورە، لە گوێ گزمەکە هەوارمان لادا و چاییمان ساز کرد و، دۆشەکمان ڕاخست و دەستمان کرد بەماندوو حەسانەوە. چای دەمی کێشا و لە پێخۆر خواردندا بووین و (حاجی محەممەدی برای حاجی ڕەشید) لەتەک مندالەکانیا، بەپەلە هاتن و دەسیان کرد بەقرژاڵ کوشتن لەبن بەردە بچکۆلەکانی گوێ چەمەکەدا. ڕاست و چەپ، دەستێک و قاچێکیان نەبێ، هەموو پەل و پۆیان لێ دەکردنەوە. لە پێش ئەوەیشا بەڕۆژێک، بەدیارەوە بووە، هەندێ (ژاری ماسی)یان هێنا و تا دەمێک کوتایان. لەگەڵ هەندێ ئەسپۆن و تۆزێ سرێشدا تێکەڵیان کرد. بڕێک شێلایان، تا وەک هەویری لێ هات. ئینجا لە چەشنی دەنکە دەمەر قاچاندا، پلیت، پلیتە، دەیانبڕی و دەیانخستە بەر خۆر، تا وشک ئەبوونەوە. جا بەم دەرمانەیان دەگوت:

«ژار ماسی». ئینجا حاجی ئەو پلیتانەی دەخستە ناو دەنکە ترێ و قاشە کاڵەکەوە، یاخود دەیخستە ناو کونێکی تەپڵەکداری زۆر بەهێز و تینەوە کە لەژێر سکی بەچکە قرژاڵەکەدا بوو.

(حاجی موحەممەد) بەکۆمەڵ ئەم خۆرشتە ماسیانەی دەخستە ناو چەم و گۆمەکەوە، ماسیەکانیش قووتیان ئەدا.

کاتمان نەکرد بەنیو سات چەند ماسیەک بەحۆلی و گێژییەوە سەر ناو کەوتن و هاتنە قەراغ گۆمەکەوە. ئێمەیش بەسووکییەکەوە دەستمان کرد بەگرتنیان. بەڵام هەر ئەوەبوو. ئیکە هەرچەند چاوەڕوانیمان کرد یەک ماسیەکمان بەدی نەکرد. ئەمەیش لە بێ بەختیمان بوو. چونکو هەموو جارێ (حاجی موحەممەد) ئەیگوت: «هیچ جارێ نەبووە، بەنیوەی ئەو دەرمانە سی ماسی و چل ماسی نەکوژین!...».

دەی بام وابێ... قەی ناکا!...

هەرچی چۆنێک بێ، ڕابواردنێکی خۆشمان ڕابوارد، کاتێکی شیرین بوو لە ژیانماندا. خۆزگە بەڕۆژی وا دەگەیشتینەوە.

بەڕاستی زۆرم پێ خۆش بوو کە بەدڵێکی بێ ئەندێشەوە کۆچمان کردە گوێ (گۆمی کچان). ئینجا دەستمان کرد بەئاگرکردنەوە و چایی سازکردن و ماسی برژاندن. هەر لەو کاتەیشدا بەوێنەگر (فۆتۆگراف)ەکەم وێنەیەکی ئەو دیمەنەم کێشا.

خوا تەم و خەمی لە دڵمان ڕەواندەوە. ئەو ڕۆژە خۆشەویستەیشمان بەم دڵە خۆش و ڕۆشنەوە ڕابوارد. تا قرچەی نیوەڕۆ لەوێ بووین. ئینجا هاتینەوە ماڵێ. نوستین. پاش نوستن، هەر بەشێوەی جاران ڕوو بە(ناو ڕەزان) سواری ئەسپ بووین. تا زەردەپەڕ لەوێ بووین. ئینجا هاتینەوە.

## قەڵاچوالان ۱۹۲۹/۸/۲۳

بەیانەکی کە لەچای خواردن بووینەوە، چوونی (قەڵا چوالان) هەر لە مێشکمابوو، نەجوولایەوە. چونکو لەم چەند سەدەی دواییەدا، یەکە فەرمانڕەوایی کورد کە هەڵکەوتبێ لە شارباژێر و شارەزووردا، لە بنچینەدا لەوێدا دامەزراوە. بەئارەزوویەکی گەرمەوە ڕووم لە (حاجی موحەممەد) نا. ئەسپمان زین کرد. بەجووتە سوارە لە سوێی تەلارەکەی (دەڕەڵە)وە لووت بەسەرەو ژێر ملمان نا بۆ گوێ چەمەکە. لەوە بەولاوە ڕێگا خۆش بوو. هەتا نیوەی ڕێ بەشی زۆری ڕێگاکەمان هەر بەغار و ڕمبازێ، بەگورگە لۆقە و چوار ناڵە کردن بەئەسپەکان ڕانەبوارد. ئینجا لەبەر ڕێ سەختی، بەپوختی لە تەنگەی کەژ و چەمەکە لاماندا. کەوتینە هەوراز. بەسەر باڵی شاخەکەدا ڕێگامان بڕی، تا گەیشتینە نزیک دێیەکە.

لە ڕێگادا (حاجی موحەممەد) هەر باسی چلۆنی ئەو دێیەی بۆ دەکردم و جێ ڕاو و سەیرانی پیشان ئەدام. کاتێ کە لەم قسانەدا بووین بە(گۆڕ)ێک گەیشتین. چەشنی سنووق، هەر چوارلای بەتەلەبەردی خشت و لووس گیرابوو. لەسەر (کێل)ەکەی گەلێک نووسین و نەخش و نیگار هەڵکەندرابوو. کە بەڵگە بوون بۆ ئەوەی (بەردتاشی) لەو دەمەدا چەند لەپێش بووە. ئەمە چونکە بابەتێکی مێژوویی بوو. وام بەجوان زانی کە وێنەیەکی بگرم. هەر تۆزێکی کە چووین بەولاوە، لەسەر شاخەکە تووشی (گومەزێکی

کەلاوە) هاتین. بەبەرد دروست کرابوو ناوەکەی پڕ بوو لە تاق و دەرگا کە ئەیروانی بەسەر هەموو (قەلاچوالان)دا. گومەزی (شێخ حەمە وەسیم)[1]یان پێ دەگوت کە پڕ بوو لە گۆڕی (پاشا) و (مەلا) و (پیر)ە گەورەکانی فەرمانڕەوایی (بابان). کوڕێ لە ئەسپەکەم هاتە خوارەوە وە ئەسپەکەم دایە دەست (حاجی) و بەسەڵتی چوومە ناوەوە. تەماشام کرد: هەرچی گۆڕێکی تیابوو، بەتەلە بەردی جوان و خشت، تەنشت درابوو. هەر گۆڕەی کێلێکی بالا بلند و سپیکە لەو خشت و خۆڵی تیا دانرابوو، کە بە نووسین و نەخش و نیگارەوە ڕازێنرابووەوە.

بەڕاستی دیمەنی ئەو کێل و گۆڕانە باوەڕی تەواوی پێ پەیدا کردم کە لەو دەمەدا چەند (بەردتاشین) و (هەڵکەندن) پەسەند و پێشکەوتوو بووە. چونکە ئێستایش بەگران شتی وا لەو چەشنە لەلای ئێمە دروست ئەکرێ. خۆ گۆڕی (شێخ حەمە وەسیم)یان لە هەموویان ڕێکوپێک تر بوو. چونکە لە زانا هەرە گەورەکان و خواناسەکانی ئەو سەردەمە بووە. تەنانەت ئەڵێن توانیویتی چی لە دڵی پیاودایە دەری بخات. کە ئەمە نیشانەی ئەوەیە لە زانستی دەروونی و لە ڕازی دەروونیدا زۆر شارەزا بووە. خۆی چامە (قصیدە)یەکی فارسی هەڵبەستووە، کە لە گۆڕەکەی خۆی، بەنووسینێکی جوان هەڵکەندراوە. باسی ڕابواردنی تەمەنی خۆی ئەکا و لە خوایش ئەپاڕێتەوە. ئێستایش بەئاسانی دەخوێندرێتەوە. بەڵام لە پەلەپەلیدا هەر ماوەی ئەمەندەم بوو کە لێی بخوێنمەوە: «آنكه كردم از دهر برفت».

هەروەها چوار گۆڕی تریشم بەرچاو کەوت، بەڵام نووسینەکانیان قرتا بوون، خوێندمەوە، یەکێکیان هی (مستەفا پاشای بابان) بووە، بۆ ئەوانی تریش لە لادێییەکانم پرسی، گوتیان گۆڕی (عەبدوڵڵا پاشا) و (سلێمان پاشا)ی بابان بوون، لە خۆشی بینینی ئەم هەموو کەلەپوورانەمان سەرخۆش بووم، وێنەیەکی تێکڕاییم گرتن و سواری ئەسپەکەم بوومەوە.

(١) شێخ محەمەد وەسیم: شێخ محەمەد وەسیمی گەورە: هەروەک مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دەڵێ: «لە دەوروبەری ١٠٤٠ک-دا لەدایک بووە»، زانایەکی گەورە و پایەیەکی بەرزی بووە لە زانستە ئایینییەکاندا، لە ڕۆژانی حوکمی بەکر بەگی کوڕی سلێمان پاشادا کە ١٢ ساڵ حوکمی کردووە، لە قەڵاچواڵان مودەڕیس بووە، مامۆستای زانای گەورە شێخ حەسەنی گڵەزەردە و سلێمان پاشای گەورە بووە کە لە ١٧٦١ز-دا فەرمانڕەوایی کردووە -دیارە ئەمە لەگەڵ مەزەندەکەی مامۆستا عەبدولکەریمدا ڕێ ناکەون کە بۆ ساڵی هاتنە دنیای دایناوە- بۆیە هەر خۆی دەڵێ: «بەداخەوە هەروەک مێژووی لەدایکبوونی بەتەواوی نەزانراوە مێژووی وەفاتیشی نازانرێ. ل ١٣١». لە سەردەمیدا چەند زانایەکی پایەدار لە قەڵاچواڵان مامۆستا بوون: مەلا محەمەدی غەزایی و مەلا جامی چۆڕی. گەلێ بەرهەمی ئایینی بەنرخی بووە، لەوانە (سنن الصلاة) بەڵام فەوتان.

مامۆستا (مەحموود ئەحمەد محەمەد) لە باسێکیدا ساڵی وەفاتی بە ١١٧١ک دادەنێ. بۆ زیاتر بڕوانە:
١- مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس: بنەماڵەی زانیاران، چ١، چاپخانەی شەفیق بەغدا ١٩٨٤.
٢- ڕۆشنبیری نوێ، گۆڤار، ژمارە (١٠٢) ساڵی ١٩٨٤، مەحموود ئەحمەد محەمەد، بایەخدانی بابانییەکان بەزانست و ڕۆشنبیری.

لێمان دا ڕۆیشتین. تووشی گۆمێک بووین. حاجی گوتی: «ئەمە لەو دەمەدا ئاش بووە. ئاویان لە کانییەکی دوورەوە بەسەر ئەم شاخەدا بۆ هێناوە. ئەم چەمی بەردەم شارەیش لەو دەمەدا لەو بەرەوە ڕۆیشتووە».

ئینجا تۆزێک ڕۆیشتین گەیشتینە بەردێ. کەلاوەکانی شاری (قەلاچوالان) بەردەکانیان دیاربوون. لە بن دار توویەکا وێنەیەکی دییەکەم گرت. تۆزێ ئاومان خواردەوە و ڕوو بەدڕەڵە گەڕاینەوە. دێی (قەلاچوالان) ئێستە کە چوار پێنج ماڵێکە. کاتی خۆی ئەوەندە و نیوەی ئێستای شاری (سلێمانی) گەورە بووە. (قەلاچوالان) دەکەوێتە سەر ئەو چوار شاخەی کە چوار لای دەشتەکەی قەلاچوالانی گرتووە. کاتی خۆی ئەو دەشتە هەمووی باخ و باخات بووە، کە پڕ بووە لە میوەی هەموو ڕەنگە و دار و درەخت. کە گەڕاینەوە نزیکی گوێ چەمەکەی پێشوو بووبووینەوە. چەند هەنگاوێک ڕۆیشتین، تووشی ئەستێرک (حوض)ی (سلێمان پاشای بابان) بووین. ئەستێرکێکی پان و گەورە بوو. هەمووی بەبەردی شاخەکە کرابوو لەم لاو لەو لایشەوە دار گوێزێک و دار توویەکی گەورە هەبوو. ئێستە تێکچووە، قسڵ و گەچی پێوە نەماوە، لە پشتیشیەوە (ڕەزی خانم) بووە کە ئێستە تۆزێ ڕێ و شوێنی ماوە. لە خوارەوەیش باخچە و باخ بووە. کە لەوبەریەوە گردێکی لێیە، ئێستەیش دار و پەردووی خانووەکانی ماون. بەگردی (تەپڵچیان) بەناوبانگە. تەپڵ لێدەر و دەهۆڵ ژەنی لەشکری بابانەکانی تیا بووە. ئەو حەلە بیست هەزار کەسی پتر تیا بووە. شارێکی گەورەتر و پانتر بووە لە سلێمانی ئێستا، کە پاشە جار کردیان بەپایتەختی دوومی فەرمانڕەواییەکەیان.

لە زانایان، لە وێژەوانان، لە ئایین ناسان، لە پیشەوەران، لە هەموو ڕەنگێکی تیا هەڵکەوتووە، (مەلای بێوەران - شێخ حەمە وەسیم) مەلای بەناوبانگیان بووە، کەچی ئێستەیش بەجۆرێکی وا سروشتی لێ ئاڵۆزاوە، کە کەس تیا ناحەوێتەوە!

## سیوەیل ١٩٢٩/٨/٢٦

لە دوای (قەلاچوالان) هەتا ڕۆژی یەکشەممە کە ئیمڕۆیە هەر بەمەلەکردن و چوونە (دڕەڵە کۆن) و سواربوون ڕام بوارد، (حەمە پاشای ئەوڕەحمان ئاغا) لە شار بەڵێنی دابوومێ کە بێتە لام و پێکەوە بچین بۆ دەرەوە، بەلام بەڵێنەکەی خۆی بەجێ نەهێنا!. کە ڕۆژ خۆی لە کەلەوە دەرخست ئێمە لە چای خواردنەوەدا بووین. پاشان من و (حاجی موحەممەد) ڕوو بەدێی (وەڕاز) کە لە بەشی (سیوەیل) دایە لێمان خوڕی. لە ساتی سێدا گەیشتینە ئەوێ. لە ڕێگادا بەناو چەم و چوغورد و دار و دەوەن و هەڵگێر و گرد و دۆڵیشدا تێپەڕمان کرد. لە هەندێ پلە و سەختەلانیش دەرباز بووین. لە ماڵی پوورە (حەبێ) کە پوورزایەکی (حاجی محەممەد) بوو لامان دا. خانەخوێکەمان ژنێکی ئازا و وریا و نان بدە و بەکاربوو. خزم دۆست و شیرین کار بوو. لە تەمەنی خۆمدا، ئافرەتی وام لە کورددا نەدیبوو. هەر سێ منداڵەکەی لە ژێر سەرپەرشتی خۆیدا میوانداریان ئەکردین و فەرمانیان هەڵ ئەسووڕاند. حەزم ئەکرد بەوێنەیەکی (پوورە حەبێ) ئەم گەشتنامەیەم برازاندایەوە، بەلام ڕەوشتی کۆمەلایەتیمان ڕێی ئەوەی نەدام!

لەناو بەدەورهاتن و نازگرتنی ئەم ماڵە یەک باڵەدا هەتا کاتی هەشت لە تەک کوڕێکی قسەخۆش و دڵشادکار دانیشتم. چوومە نوێژی. دیمەنی دار و دەوار و چیمەن و مێرغوزاری (وەراز)ی بێ ڕازیش، لە هەر چوارلاوە چاوەکانیان ئەگەشاندەوە، دڵمیان ئەبووژاندەوە. ڕێگاکە: بەم بەر و بەو بەریا درەختی گەورە گەورە ڕیزی بەستبوو. چڵە مێو و چووزەرە گەڵا سەر و پۆتەڵاکی لق و پۆپەکانی دارەکانی وەک پووشینی ژن داپۆشیبوو. هێشووە ترێکانیش، ڕەشەکە و سپێکە، وەک لە ئاهەنگ و زەماوەندی مندالاندا ئەبینرێن. بەدامێنی دارەکاندا شۆڕبووبوونەوە، دارەکانیان ڕازاندبوودوە. چوومە بن دارێکەوە وێنەگرەکەم ئامادە کرد. (حاجی موحەممەد) و (فەرەجی جۆلا)یش کە لە تەنشت ئەو کەڵە مێو و دارانەوە وەستابوون، لەناو وێنەی دێی (وەراز) و جەنگەڵستانەکەدا دەرچوون. هاتینەوە هەوار بۆ لای کۆڕی پیاوەکان. (کاک ئەمین)ی برای (ڕەشید ئاغای عەبدوڵڵائاغا)ی پشدەریش کە هاتبوو بۆ بینینی ئێمە لەوێ بوو. باسی سەرگوزشتە و ڕەوشتی پشدەری بۆ ئەکردین، بەڕووخۆشییەکەوە لەوێ جیابووینەوە بەرەو لالەزاری (ساوەپان) و (کەندەسوور) کە لە پشت دێوە بوون جوولاین، (حەمە شیرین)ی کوڕی (پوورە حەبێ) و (وەستا فەرەجی جۆلا)ی هەورامیش لە گەڵمان بوون، ئەمیان لە بابەت هەورامییەکانەوە قسەی بۆ ئەکردم.

بەناو چەمێکا ڕۆیشتین. (دارمازوو) و (دارخرنووک) سەری شاخەکەیان لێ گرتبووین. (چرە چنار) و (دار عەرعەر)یش سەریان دابووە یەک، ڕۆژیان لێ شاردبووینەوە. (کۆترە باریکە)یش بەقۆڵ و بەپۆل بەسەر چرۆی قوونارێ چڵە گوێزەکانەوە، بەسەرماندا فڕکەیان ئەکرد. ئاوە زیوینەکەیش بەسەر بەردەبلوورینەکاندا تافە تافیان ئەکرد و ئەڕژانە خوارەوە. ئەم تەنشت و ئەو تەنیشتمان بەڕەز و بەرزەمێو و، بەدار بەهێ و ناسکە هەرمێ، بەدار قۆخ و قەزوان و، بەدار هەڵووژە و دارەوەن بەچڕی داگیر کرابوون. لە پاش ڕۆیشتنێکی چارەکە ساتێ، (ساوەپان)مان تەواو کرد. لە پەزەکانی (کەندە سوور)یش تێپەڕمان کرد. چووینە ناو دارگوێز و گەڵوازەکەیەوە. هەندێ ترێی مام برایمەیشمان لەگەڵ بڕێ ترێی تر لە چووزەرە مێوێک پچڕاندبوو. بردمان لەگەڵ خۆمان و خستمانە ناو ئاوە ساردەکەی ناو چوغوردەکەوە. بەگفتوگۆی خۆشەوە هەندێک دانیشتین و ترێکەمان خوارد و ئاوەکەیشمان نۆش کرد. ئینجا هێواش هێواش، ڕوو بەهەوراز، بەسواری چووینەوە بۆ ماڵ. نوێژی پاش نیوەڕۆ ( عصر)م کرد. هەندێک بەناو باخەکانی ئەم لایەیشدا گەڕام. چوومەوە ماڵەوە.

لەگەڵ (ئەمین ئاغا)دا شێومان کرد. کوتوپڕ گوێم بەگۆرانییەکی کوردی زرنگایەوە. کە گوێم گرت لەو بەرمانەوە دەستەیەک کوڕە هەرزەکار بوون گۆرانیان دەگوت. ڕێم لێ خواستن. لە تەک (حەمە شیرین) و (فەرەج)دا چوومە لایان. بەئاوازی بەنازیانەوە شانازیم کرد. پاشان داوای هەڵپەڕینێکم لێ کردن. دڵیان نەشکاندم، بەشادمانییەکەوە دەستیان کرد بەهەڵپەڕین، لێمدا هاتمەوە. لە نوستندا بووم (فەرەج) دەستی کرد بەئاوازی شێوەی شاربازێڕی، لە خۆشیدا خەوم لێ کەوت. بەیانی پاش چای خواردنەوە لەگەڵ (فەرەج)دا گەلێک جێگای تر گەڕام. ئەویش لە ڕێدا لەبابەت ڕابواردنی دێیەکەوە قسەی بۆ ئەکردم، دەیگوت:

دار مازوو

سالی نۆ بەر دەگرێ:

١- مازوو: کە بۆ بیدە و بستێن «تجارەت» دەست ئەدات.

٢- جەوت: کە بەکاری تاڵدانی مەشکە دێ. بەڵام ئەم بەرە هی دار مازوو نییە، هی داربەرووە.

٣- بەڕوو: کە بۆ نانی مرۆڤ و گیانلەبەریش دەست ئەدات.

٤- گزگل: ئەمە بۆ تاڵدان بەکار ئەهێنرێ.

٥- خڕنووک: بۆ بیدە و بستێن، بۆ تاڵدانی مەشکە بەکارئەهێنرێ.

٦- سیچکە: ئەمیش لەگەڵ مازوو هەر بۆ تاڵدانی مەشکە بەکارئەهێنرێ.

٧- دەمرکانە: بۆ چاکردنەوەی برین بەکارئەهێنرێ.

٨- قشکە: ئەمە گەزۆی لەسەر دەبارێ، بۆ تاڵدانی مەشکەیش بەکارئەهێنرێ.

٩- گەڵا: لە نزیک پاییزەوە گەڵاکەی لێ دەکەنەوە بەچڵەکەیەوە دەیخەنە ناو لق و پۆپی دارەکەی خۆیەوە، هەتا زستانێ. لای خۆیان «گەڵی»ی پێ ئەڵێن، ئەمە بۆ خواردنی زیندەوەر (حیوانات) بەکارئەهێنرێ.

دارەبەن

ئینجا (حەمە فەرەج) لە بابەت (دارەبەن) یاخود (دارقەزوان)ەوە قسەی کرد، گوتی:

«دیسانەوە (دارەبەن) یان (دارقەزوان) کە بەرەکەی بریتییە لە قەزوانە شینە، لە دەمەو پاییزدا قەدەکەی لە زۆر لاوە بریندار ئەکرێ، کوجەڵەی قوڕی پێوە دەنێن. بنێشتی لێ دەردێن، دارەکەیشی بۆ سووتاندن بەکەڵک دێ، وەک (بوخور) بۆنی خۆشە».

## گوزەرانی وەڕاز

جێگاکە بەردەڵانی بوو، دەشتی کەم بوو، چەم و چوغوردێک بوو کە پڕ بوو لە ڕەز و هەرمێ و بەهێ، ئەو تەرحە دارانەی کە لەمەو پێش ناوم بردوون، دانیشتوانی گوندی «وەڕاز» لەسەر ئەوانە ئەژین، هەرچی دەغڵ و دانە لە شارباژێری دەکڕن، «وەڕاز» بەهەرمێ و ترێ و مازوو و بەڕوو بەناوبانگە، باخاتەکانی سێ هەزار گەزێک درێژ دەبنەوە، سی ماڵێک لە گوندەکەدا دانیشتوون، ژمارە سەریان ئەگاتە (١٥٠) سەد و پەنجا کەسێک.

(ڕەشید ئاغا) سەردارییانە، ئەو دەیەک «زەکات»یان لێ کۆ ئەکاتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا پتریان لێ ئەسێنێ، خۆیشی هەندێکی لێ ئەدات بەفەرمانڕەوایی، هەندێک لە لادێییەکان ڕێک کەوتبوون کە ئیتر لەمەودوا فەرمانی بەبێگاری بۆ نەکەن، زۆر لێی دڵشکاو بوون. بەڵام (حاجی موحەممەد) ئامۆژگاری (پوورە حەبێ)ی کرد، گوتی: «تۆ جاران چەندت بەندەیی بۆ کردوون، ئێستە دوو ئەوەندە بەندەییان بۆ بکە، چونکە ئێستە کە دەستیان کورتە بەسەرتانا، ئەوە بۆ تۆ هونەرە کە بەندەییان زۆرتر بۆ بکەیت!؟» ئەویش ژیر بوو، گوتی: «بەگوێت نەکەم!؟». (ڕەشید ئاغا) کەپر و ساباتی لەوێ کردبوو، ژنەکەیشی

لەوێ بوو، «ئەمین ئاغا»ی برای دایکی، ئێستە نامەنووسین و ژمێرکاری بۆ ئەکات، ساڵی بەسی لیرە و هەندێ گەنم و جۆ، خۆیشی کردوکۆشی دەکا، لادێییەکان (ئەمین ئاغا)یان زۆر خۆش ئەوێ، چونکە بێ وەیە. هەروەک بەسەریاندا دێ، شیرەتی براکەیشی دەکات کە زۆریان لێ نەکات.

## ڕەوشتی پشدەری

(ئەمین ئاغا) لە بابەت ڕەوشتی پشدەرییەوە گوتی: «خاکی پشدەر لە پردێ (تەیەت) بەولاوە، بەگشتی زەوی ئاغایانی (میراودەلی)یە. هەموویشیان ئامۆزا و خزم و خوارزای یەکترن. هەریەکە هەشت نۆ دە گوندێکی لەژێر دەستدایە، لە شەڕدا یەک ئەگرن و وەک برا بەگژ دوژمندا دەچن. لە خۆشیشدا وەک یەک خێزان گەورە و بچووکی خۆیان ئەخوێننەوە. ئاغاکان زۆریان ژیر و خوێندەوارن، چاک کردەوە و ڕەفتارن. هەموو کۆچک (دیواخان)یان هەیە. ڕۆژ هەتا ئێوارێ ڕێبوار، خزم و خوا، بەسزمان و لات و هەژار لەو کۆچکەدا بەنەرمی و شیرینییەکەوە چێشت و نانیان (بەخۆرایی) دەرخوارد ئەدرێ. تا میوانیان بێ، دڵیان خۆشتری لێ دێ. زۆر ڕووخۆشن لە تەک ژێر دەستەکانیاندا. پیاویان هەیە گوندەکانیان بۆ بەڕێوە دەبەن. زۆر بێ فێزن لەگەڵ گوندییەکانیاندا. ڕێزێکی زۆریش لە سەیدا (مەلا) و پیر و مامۆستا و ڕیش سپی و پیاوی زرنگیان دەگرن. ئەگەر بێتو ئاغایەک لەناویاندا ناپیاوەتییەکیان لەگەڵ بکات، یاخود کەتنێکی لێ ڕووبدات، ئاغاکانی تر لەبەر خزمایەتی چاوترسێنی ناکەن و سەرزەنشتی ناکەن و جەزرەبەی پێ ناگەیێنن. لە جیاتی ئەوە لەهەر دێیە تێگەیشتوویەک هەڵدەبژێرن و کۆیان دەکەنەوە تا ژمارەیان دەگاتە پەنجا شەست کەسێک. لەوانە کۆڕێک پێک ئەهێنن، ناپیاوەتی ئاغاکە ئەخەنە بەردەمی ئەو کۆڕە، ئاغاکان خۆیان لەو کەتنە ناگەیێنن، بەڵام پیاوە ژیرەکان لەو کارەساتە ئەکۆڵنەوە و بیریشی لێ ئەکەنەوە، ئەیکەنە ڕاوێژ و گفتوگۆ لەسەری، ئەگەر لە ڕاستیدا (ئاغاکە) ئەو کردەوە ناپەسندەی کردبوو، ئەوا فەرمانی بەسەردا ئەدەن، لەسەر بڕیاری هەموویان. ئینجا لەشکرێکی پشدەری جەنگاوەر دەدەنە پشت خۆیان و ڕووەو ماڵی (ئاغاکە) مل ئەنێن، فەرمانی کۆڕەکەی پێ جێبەجێ دەکەن، زۆری لێ دەکەن ماڵەکەی بار بکات و بچێتە ئەودیو سنووری پشدەرەوە.

هەندێک جار تالانیشی دەکەن، نایانەوێ بێتەوە. زەوییەکانی دابەش دەکەن، مەگەر لە پاش ساڵێک یاخود زۆرتر، بەهۆی ئاغاکانەوە تکایان لێ بکات و بێتە گوندەکەی خۆی. (ئەمین بەگی قامیش) کە ئاغایەکی پشدەری بووە، سێ جار بەم چەشنەی لێ هاتووە!».

## پشدەر کۆمارێکە بۆ خۆی

ئەمە دیارە کە ئەم شێوە کاروبار هەڵسووڕاندنە گەلێک کەڵکی هەیە. هەروەک لە کۆمارێکی دیمۆکراتی بچێ وایە! چونکە هێزی فەرمانداری بەدەست گەلەوەیە، سەربەستی و مافێکی زۆرە کە دراوە بەدانیشتووانی ناوچەکە. لەمەوە کردەوە و ڕەفتاری شیرین، خۆشەویستی، کاری ناپیاوانە نەکردن، زۆر لە ژێردەست و گەل نەکردن، ژیری، ڕاوێژکاری پەیدا دەبێ. بەڕاستی ئەمە کردەوە و کارێکی شیرینە و

دەستووریکی ڕەندینە، بۆیە «میراودەلی»یەکان هەتا ئێستا هیچ کەسێک سەرنەکەوتووە بەسەریاندا و کز و بێ دەسەلاتی نەکردوون. زۆر جاری وا هەبووە لەسەر خاکەکەی خۆیان کردۆتەوە و خۆشیان داوە بەکوشت، تۆپ و تفەنگی ڕۆم و عەجەمیان گرتووە و لەشکرەکانیان تەفر و توونا کردوون. هەرچی هەرای ناو مەکێنەکانیشە هەر ئاغای گوند خۆی ئەیانکوژێنێتەوە و ئەیان بڕێتەوە، لەبەر ئەوە (پشدەر) لە هەموو جێیەکی تری کوردستان بێ ترسترە.

لەم چەندانەدا پشدەرییەکان بیستبوویان کە فەرمانڕەوایی عێراق نیازی وایە، کە (قەلادزێ) بکات بەبنکەیەکی فەرمانڕەوایی. جا بۆ ئەوەی چنگالی بێگانە لە خاکیاندا گیر نەبێ، کەوتنە فریای خۆیان. کاربەدەستانیان دی و هەلیان وەشاندەوە، هەرچەندە (ناوچەی پشدەر) خۆی هەروەک فەرمانڕەواییەکی کۆمار (جمهوریەت)ی وایە. بەلام وەک خەریکی ئەوەبن فەرمانڕەواییەکی کوردی دابمەزرێنن وەهایە!



لە (پردی تەیەت) بەم لاوە کە (سیوەیل)ە هەندێ ئاغا بەزۆر فەرمان ئەدەن بەسەر مەکێندا. لەبەر ئەوە مەکێنەکان خۆشیان ناوێن. (ڕەشید ئاغا) تۆزێک زۆردارە، کەچی مەکێنەکان لە (ڕەزابەگی قایمقام) زۆر بێ گلەیین. مەکێنەکان پێیان خۆشە کە (ڕەزابەگ) بەرتیل ناخوات، دیاری وەرناگرێ. زۆرداریان لێ ناکات، بەجوانیش هەلێ ئەکات لەگەلیاندا. هیچ پیاوێکی (ڕەزابەگ) ناتوانێ بێ پارە پووشکەیەک لە مەکێن بستێنێ.

پشدەرییەکان ئازان، خاوەن قسەی خۆیانن، چاکەیشیان لەبەر چاوە، ئەیدەنەوە، هەموویان یەک دلێ و یەک زمانن، تەنیا (هەباسی مەحموود ئاغا)یان تیایە کە خۆی و پشدەرییەکانی لەمەڕ خۆی تۆزێک ناکۆکن لەگەل دەستەی (بابەکری سەلیم ئاغا)دا. لەگەل ئەمەیشدا هیچ شەڕ و هەرایەک لەناویاندا نییە.



شتێکی سەیریان بۆ گێڕامەوە. گوتیان: لە (مەرگە) بەسەر شاخەوکەوە سوارێک بەخۆی و ئەسپەکەیەوە بووە بەبەرد!. بێگومان شتی وا ڕوونادات. هەر ئەبێ جێماوێکی کوردانەبێ، کە لە سەردەمی زۆر کۆنەوە بۆمان بەجێ مابێ.

## سینگێ ١٩٢٩/٨/٢٧

بەیانی دووشەممە لە تەک (حاجی محەممەد)دا لە (پوورە حەبێ)مالئاواییمان کرد. گەلێ تکای لێ کردین کە بمێنینەوە، بەند نەبووین. بەسوپاسێکی زۆرەوە لێی جیابووینەوە. بەدوو سات گەیشتینە گوندی (سینگێ) کە لەناو جەرگەی (شاربازێڕ) دایە. حاجی موحەممەد لە ڕێدا سەرگوزشتە و قسەی خۆشی بۆ دەگێڕامەوە. لەبەر دەم چەمەکەدا چاوئەندازێکی لالەزارەکەم بەوێنەگرەکەم گرت. ئەسپەکەم بەربوو. چووە سەر مایەنەکەی حاجی. گەلێک هاروجاجی کرد. وزەی لێ تێک داین، کردمان بەدێیەکەدا. لەوێ بەستمانەوە. لە مالی ئاشنایەکی حاجی موحەممەد کە ناوی «حەمە سلێمان» بوو لامان دا. نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد. چایمان خواردەوە. پاش نوێژکردن. وێنەیەکی تری دێیەکەم کێشا، تۆزێ لەسەر

گردی (پیر هۆری) حەسایەوە. بەتەماشاکردنی چاوئەندازی ئەم چەم و چوغوردە و چیمەن و لالەزار و نزارە خۆم شادمان کرد، ئینجا بەناو باخاتدا ڕۆیشتین. لەپاش گەڕانێکی بیست وردیلە (دەقیقە)یی هێشتا نیوەیانمان نەبڕیبوو، بەناو چنار و عەرعەردا ڕۆیشتین. لەم بەر و لەوبەری (قولەکەی سیوەیل)ەوە دار قۆخی شەنگ و شۆخ هەبوون. لەوپەڕ ئەوانەوە هەندێ قۆخمان خوارد. بەکۆمەڵە کەلەمێوێک گەیشتین بەچرە دارستانێکی بەهێی ناوازەی سینکێدا تێپەڕ بووین. بەهێی سینکێ لە هەموو شوێنێکی ناوچەی سلێمانیدا بەناوبانگە. بەڵام نە ئەمساڵ، نە پار، لەبەر کوللە بەری نەگرتبوو. پاش ئەوە بەناو کۆمەڵە دار سێو و هەڵووژە و قەیسیدا ڕۆیشتین. ئینجا بەژێر سێبەری شەنگە تووداا. دوای ئەوە بەناو ئاو و نەرمە دەشتی مەردەزەی شێخاندا ڕێگامان بڕی. بەڕاستی ئەم شوێنە خۆشانە و ئەم چاوئەندازە جوانانە منیان گەشکەدار کردبوو. لە ڕێ لامان دا. نوێژمان کرد. چووینە ماڵەوە. ئەسپمان هێنایە دەرەوە. لە تەک حاجیدا ڕوو بەدەشت و دەر ڕێگامان گرتەبەر. لەواژە تێپەڕمان کرد، بەغار بەناو ئەو هەموو دارمازوو و دار بەڕووی کێو و کەژەدا ڕابوردین، لەگەڵ زەردەپەڕدا گەیشتینە ماڵەوە، دابەزین.

پێویستە ئەوەیش بڵێم کە لە کاتی جیابوونەوەماندا لە دێی (سینکێ)، (حەمە سلێمان)ی خانەخوێمان زۆر لەگەڵمان خەریک بوو کە بمێنینەوە، بەڵام نەماینەوە، بەڕێزێکی زۆرەوە ڕەوانەی کردین. کە سەرنجم دا ماڵی (حەمە سلێمان) سیانزە پوورە هەنگیان هەبوو. کە هەموو لە پوورە هەنگی چیاوە هاتبوونە ئەوێ. بەڵێ، لە (سینکێ)یشدا بەم جۆرە خۆشییەوە ڕامان بوارد. (سینکێ) بیست ماڵێکی تیابوو کە ژمارە سەریان خۆی ئەدا لە سەد کەسێک. (ڕەزابەگ)یان خۆش ئەوێ. فەرمانبەری خەڵکی خاکی خۆمانیان پێ چاکە. ڕقیان لە بێگانە زۆر ئەبێتەوە. زۆر حەزیان ئەکرد و ئاواتیان ئەخواست کە (ئیبراهیم ئەفەندی)ی دادگەر (قاضی)ی شارباژێڕ ئەگوێزرێتەوە بۆ جێگایەکی تر، ئەوەک بێگانەیەکی بخەنە جێ و خراپی لەگەڵ لادێییەکاندا بکات.

دانیشتووانی ئەم گوندە گوزەرانیان لەسەر فرۆشتنی ئەم بەرهەمانەیە: ترێ، بەهێ. دەغڵ و دان، داری سووتاندن، هەنگوین. (سینکێ) ترێ و هەنجیرێکی جوانی هەیە.

## چوارتا ١٩٢٩/٨/٣٠

بەیانی ڕۆژی پێنج شەممە هێشتا خۆر نەکەوتبوو، لەگەڵ (حاجی ڕەشید)دا بەناو دار و دەوەنی چیا و چەم و چوغوردی (قەڵا چوالان)دا ڕۆیشتین و ڕوومان کردە چوارتا. گزەبای بەیانیش کە لە باڵی ئەسپەکەمی ئەدا شەنگ و شۆخی کردبوو لەو کاتەدا ڕۆژ دەە بەپێکەنینەوە لە کەلەوە خۆی دەرخست پرشنگیدا. شەوی دەرپەڕاند و بەسەر هەموو زیندەوەر و دار و درەختی جیهاندا خۆشەویستی پەخشان کرد. کۆترەکان کە بەسەر چڵی درەختەکانەوە بوون، دەرکەوتن و بەرسینگیان بەتیشکی زێڕینی ڕۆژەکە ڕازایەوە. کاتێکمان زانی لە نزیک باخەکانی چوارتاوە پۆلێکی بێ شومار. لە کەو و کۆتر و کۆتربارێکە لە ترسی ئێمە دایان لە شەققەی باڵ و ڕوو بەهەورازی چیاکە دەستیان کرد بەفڕین.

بەناو چیمەن و لالەزاری (چوارتا)یشدا لە ڕێگایەکەوە کە ئەم بەر و ئەوبەری بەپەرژینی گوڵی ڕەنگین

تەنیشت گیرابوو، تێپەڕمان کرد. ئەسپەکانمان لە دێیەکە بەستەوە و، ڕوو بەچاپخانەکە ڕۆیشتین. پێنج شەش هەنگاوێکمان مابوو بگەینە چاپخانەکە هاوڕێیەکی خۆشەویست، (شێخ ڕەئووفی سەید نووری نەقیب)م پێ گەیشت. بەڕوویەکی خۆشەوە ماندوونەبوونی لێ کردین و بردینیە ناو چاپخانەکەوە، داینایین و خواردنی ناشتای دەرخوارد داین. پاش ئەوە بردینیە سەر کانی، سووره چنارێکی پیشان دام. ئەمەندە ئەستوور و زەلام بوو، بەپشتێنێکی هەشت گەزی تەنگەی نە ئەهاتەوە یەک!. دارەکە ئەمەندە گەورە بوو، لەناو لەپی سەروویدا پیاو دەیتوانی بەتەواوەتی تیا ڕابکشێ. شوێنەکەی تەخت بوو، وەکو تەخت. هەنگێکی باشیش لەناو دارەکەدا حەوابووەوە. چوارتایییەکان باوەڕیان وا بوو کە ئەم دارە لەسەر گۆڕی پیاوچاکێک نێژرابوو. لەبەر ئەوە نابێ دەست لە هەنگوینەکەی ناوی بدرێ. دە ساڵ بوو ئەو هەنگوینە مابووەوە، کەس دەستی لێ نەدابوو. هەنگوینەکە ڕۆچوو بوو، تا گەیشتبووە بنی دارەکە!.

لەگەڵ (حاجی ڕەشید)دا چووینە لای (ئیبراهیم ئەفەندی دادگەر)، گەلێک میوان نەوازی و قسەی خۆشی بۆ کردین، زۆری پێ نەچوو، (شێخ ڕەئووف) هات بەدواما، بۆ ناوبانخ و چەرەس. لێرە (چەرەس) بەو جێیە ئەڵێن کە لە ناو ڕەزا بێ و مێوژ و دۆشاو و باسوقی تیا دروست بکەن. لە ڕێ دوو سێ وێنەمان گرت، هی خۆم لەگەڵ سەراکەدا، لە ڕەزەکەیدا هەندێ ترێی ناوازەی دەرخوارد داین. بەلای درەختی هەرمێ و قۆخ و قەیسیدا ڕوو بەهەوراز ڕۆیشتین. لقی دارەکان ئەشنانەوە. بەکزەبای چیاکە ئەشەکانەوە. لەوێدا وێنەیەکی (شێخ ڕەئووف)م گرت. بەدارتاشێک گەیشتین کاسەی داری دروست ئەکرد. تاوێک سەیری دەستیمان کرد. پاشان چووین بۆ سەیری مزگەوت و ساباتەکەی (ڕەزابەگ). ئینجا بۆ ماڵی (شێخ ڕەئووف) کە لەوێ نانێکی ناوازەی بۆ ئامادە کردبووین.

سات نزیکی حەوت بوو. چووینە نوێژی. لەسەر سەربانی مزگەوتەکە نوستین تا ساتی هەشت و نیو، لە چاپخانە خۆشەکەدا چایەکی ڕەنگینمان نۆش کرد. چووینەوە بۆ لای دادگەر. ماڵئاواییمان لێ کرد. چووینە سەراکەوە، تازە فەرمانڕەوایی دروستی کردبوو. لەناو حەوشەکەیا هەموو جۆرە گوڵێک ڕوێنرابوو، پەنجەرە و دەرگاکانی ڕەنگ کرابوون. دوو قولەی تیاکرابوو، بۆ شەڕە تفەنگ. تازە چشتیرەکەی تیا دروست ئەکرا بۆ ئەسپەکانی باڵبازەکان. وەستاکان ئەبێ (ئەرمەنی) بوون، هەموو کرێکارەکان کوردبوون. داخەکەم گەلێک چاوەڕوانی (شێخ ڕەئووف)مان کرد و گەڕاین بەدوایدا، ئەمان دۆزییەوە ئەمانویست ماڵئاوایی لێ بکەین. کە سات خۆی دا لە دەی ئێوارە، ناچار بووین ملمان نا بەڕێگاوە، لە خوار دێیەکەوە وێنەیەکی چاوئەندازەی چوارتام گرت.

ئیستر هەر بەدەم ڕێوە گۆرانی خۆش خۆش و قسەی بەجۆشم بۆ (حاجی ڕەشید) ئەکرد. ئەم (حاجی ڕەشید)، و براکەیشی (حاجی موحەممەد)، هەردووکیان خزم دۆست و پیاوی چاک بوون. هەردوو خێزان لە ماڵێکدا بوون. بەهەموو (دڕەڵە) هەر چوار خێزانی تیا بوو. بەلای منەوە (حاجی موحەممەد) باشتر بوو لە (حاجی ڕەشید). چونکە سەر و زمانی خۆشتر و ڕووی شیرینتر و نەرمتر بوو. پێش ئەوەی ببێ بەشێوان لەولای دێی (شەمس ئاوا)وە لەگوێ چەمەکە نوێژمان کرد. نیوساتێک بوو تاریکی داهاتبوو، گەیشتینەوە (دڕەڵە) و بەکەسوکارمان شادبووینەوە.

بێش ئەوەی قسەکەم تەواو بکەم، ئەڵێم: چوارتا هەر سی ماڵێک ئەبوو. چل ماڵی باڵبازیشی تیابوو. سێ سەد کەس سەربازیشی تیا بوو. دێیەکی ئاودار و ڕەز و سەوزەدار و. پڕ لە درەخت و دار و. چاوئەندازی جوان بوو. بنکەی ناوچە (قضا)ی شارباژێڕیش بوو.

## دوا قسە ١٩٢٩/٩/٢

سیانزە ڕۆژمان لە (شارباژێڕ)دا ڕابوارد. سوپاس بۆ خوا، بێ وەی بەخۆشییەوە گەڕاینەوە. جێ و شوێنی خۆمان لە دێهاتی: (سیرمێرگ) و (گەنکاوا) و (دەرەلە) و (قەڵا چوالان) و (وەراز) و (سینکێ) و (واژە) و (چوارتا)دا خۆش کرد و بەخۆشییەوە ڕامان بوارد. لە ماڵی هەموو لایەکیاندا میوانداریەکی ئاوازەمان کرا، کە هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە و خوایش یاریێ هەوڵ ئەدەم تۆڵەیان بۆ بکەمەوە. کە هاتینەوە بۆ (سلێمانی) لە ئاوە سازگارە ساردەکەی شاخە ڕەنگینەکەی (ئەزمڕ) تینوێتیمان شکا.

لەم گەشتەمدا لە گەلێک ڕووەوە زانیم دەستکەوت و چاوم کرایەوە. لە پاش سوپاسی خوا، سوپاسی (حاجی ڕەشید) و (حاجی موحەممەد) و (پوورە حەبێ) و (شێخ ڕەئووف) و ئەو کەسانە ئەکەم کە میوانداریان کردم و. بەهۆی ئەوانیشەوە لە زۆر ڕووەوە لە نیشتمانە نازدارەکەم و گەلە خۆشەویستەکەم شارەزا بووم و نزیکیش بوومەوە.

# پەزیشک[1] پێی گوتم: بخوێنیت دەمریت!



تا توانیم لە (سلێمانی) جیا ببمەوە و بگەمە خوێندنگای دووەمین (ثانوي) لە بەغدا، زۆر گیروگرفتم هاتەبەر. باوکم حەزی دەکرد بچمە بەغداد، بۆ ئەوەی تێبگەم و پێبگەم و شارەزابیم. بەلام دایکم دەپاڕایەوە و هەولی دەدا کە نەچمە بەغدا. هەندێک خزمی خراپیش چاویان بەرایی نەدەدا[2] کە من پێش کوڕەکانیان بکەوم، ئەوانیش فروفێلیان دەکرد بۆ ئەوەی نەچمە بەغدا بۆ خوێندن. بەلام من، بڕیارم دا بچمە بەغدا و، چوویشم! ئەو دەمە کز و لاواز و کورتەبنە بووم. کێشانەم بەجلوبەرگیشەوە (٣٦)سی و شەش کیلۆ گرام بوو! حەزم دەکرد منیش وەک هاوڕێکانم کەلەگەت و بەهێز و قەلەو بیم! بەو بیرەی کە پەزیشکێکی شارەزا ڕێگام پیشان بدات بۆ تەندروستی و قەلەوی و کەلەگەت بوون، چوومە لای یەکێکیان. پێی گوتم: «تۆ بەرگەی خوێندن ناگریت. ئەگەر بخوێنی تا سالێکی تر دەمریت! ئەگەر دەتەوێ تەندروست و قەلەو و کەلەگەت بیت، پێویستە واز لە خوێندن بهێنیت!»

ویستم لە بەغدا بچمە (خانووی مامۆستایان: دار المعلمين)ەوە. گوتیان: «تەمەنت لە شانزە سال کەمترە ناتوانین وەرتبگرین!» گەلێک هەولم دا بچمە ئەوێ. بەلام سەری نەگرت. بەتەنیشت ئەویشەوە خزمەکانی بەغدا، سەریان کردە سەرم، نەیانهێشت بچمە ئەوێ، خستمیانە (خوێندگای دووەمینی بنکەیی: الثانوية المركزية)وە. لە مالی خالێکمدا دەمخوارد و دەنوستم. لەگەل ئەوەیشدا کە مالی خالم و خزمەکانی ترم لە مالی خۆمان زۆرتر دلیان ڕادەگرتم و، بەکەلکم دەهاتن، کە تا دەمێنم چاکەیان لەبیر ناچێتەوە، بەلام من ئەم ئەنجامەم پێ خۆش نەبوو! بێجگە لەوەی کە شەرمن بووم، هەستیشم بەگرانی باری چاکەی ئەوان دەکرد. دەترسام لەوەی ئەو چاکەیەم پێ نەدرێتەوە. هەروەها هەستم بەکزی و هەژاری و بێ دەسەلاتی خۆیشمان دەکرد. خۆم لە بەندیخانەیەکی ڕۆژگاردا دەدی! کە شەوێ نوستم لێفەکەم کێشا بەسەر خۆمدا و بەدزییەوە دەگریام، تا خەو بردمیەوە بۆ بەیانی!...

(١) پەزیشک: پزیشک

(٢) بەرایی نەدەهات.

# گەشتی پێنجوین
# لە ساڵی ١٩٣٠دا

## ڕێککەوتن ١٩٣٠/٧/٢٥

دەمێک بوو، بەئاواتی گەشتی پێنجوینەوە بووم. چونکە «پێنجوین» پارچەیەکە لە (کوردستان)ی خۆشەویست. نیشتمانە وەکو سلێمانی. ئاو و با و چاوئەنداز و باخ و باخاتێکی هەیە. لەهی هەرە شوێنە ئاودارەکانی کوردستان ئەژمێرێ. چونکە کوردی تیایە و، هەموویش بەزمانی (کوردی) قسە ئەکەن.

جا من چۆن نەدەچوومە (پێنجوین) کە ئەم هەموو شتانەی هەبێ و، جێگایەکیش بێ، شێری گەورە، (شێخ مەحموود)، دامەزرێنەری (فەرمانڕەوایی کوردستانی خواروو)ی تێدابێ. وایش هەڵکەوتبێ کە هەموو فەرمانڕەوا دوژمنەکان بەکورد، بەپەرۆشەوە بێ بۆی... بەڵێ دەبوو بچوومایە (پێنجوین). چونکە خوێندنگا داخرابوو. تۆرەی پشوو بوو. لەشیشم لاواز بووبوو. دەبوو گیانم بپووژێنمەوە و، لەشیشم بەتین بکەمەوە، تا بتوانم لە پێناو پێشکەوتنی نیشتمانەکەما بەختیان بکەم.

لەگەڵ هاوڕێ و خزمێکما (نووری ئەفەندی حاجی ساڵح ئاغا)، کەمەری ڕۆیشتنمان بەست. بەپیاوەتی ئەوەوە دوو ئەسپی کرێ گرتەمان دەستکەوت. ئەسپەکان هەرچەند تروتفاقەکانیان ئەختێ شڕوپڕ بوون، بەڵام لە ڕەوتا خۆشڕەو بوون. دەستێ جلی کوردی جوانم هەبوو، لەبەرم کرد، کاڵەیەکی نایابیشم لە هاوڕێیەکی خۆشەویستی کۆییەوە بەدیاری بۆ هاتبوو، لەپێم کرد. وێنەگر (فۆتۆگراف)ێکی باشیشم هەبوو هەندێ کەلوپەلم بۆ کڕی و هەڵم گرت. چەقۆیەکی هەورامیشم هەبوو خستمە گیرفانمەوە. هەگبەکەیشم دابەست بەپاشکۆی ئەسپەکەمدا. لە پاش ئەمەی لە نان و چای خواردنی بەیانی بوومەوە، هەردوو دەستی سەروەرانی خۆم، باوکم و دایکم ماچ کرد و، سواری بارگیرەکەم بووم و کەوتمە ڕێگا. هەر بەغار ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە بەرماڵی (نووری ئەفەندی)ی هاوڕێم.

(نووری ئەفەندی)یش لەخۆ کۆکردنەوەدا بوو. دەمێک بوو کاروانەکە بەجێی هێشتبووین. دامان لە ئاوزەنگی و غارمان کرد بەڕێگای گۆیژەدا. ئەومستاینەوە تا لەوانیشمان تێپەڕکرد. گەیشتینە چایخانەکەی شاخی (گۆیژە). لەوێ دابەزین. کە تەماشامان کرد کاروانێکی تریش لەوێ دابەزیبوو. ئەسپەکانمان بەگوێسوانەی چایخانەکەوە بەستەوە. هاتینە ناوەوە، دانیشتین. بەڵام چیمان دی؟... دیمان دوو سێ کوپەی گەورە کە لە گڵی سوور دروست کرابوون، دانرابوون لە ناوەڕاستی چایخانەکەدا. یەکێکیان هەر بۆ ئەوە دانرابوو، کە لە تەنەکەی پاک و خاوێندا ئاوی لەو کانییە دوورەوە بۆ بهێنن کە کەوتووەتە دامێنی شاخەکەوە. لەو چایخانە چۆڵەوانییەدا. تەختی دانیشتنی وەها دانرابوو، کە لە هی چایخانە ناوەنجییەکانی سلێمانی کەمتر نەبوون. لە کاتێکا چای هێنەرەکە، چایەکەی بۆ دەخستینە سەر مێزێکی بالا بەرز، شنەی بای بەیان دەهات و گیانی دەکردینەوە بەبەردا. شاری «سلێمانی»یش وەکو

تاقە سێوێک، لە دوورەوە دەرکەوت، کە بەمێخەک نیگارڕێژ کرابێ. تا رایەکی زێڕینی تیشکی ڕۆژیش تەوقە سەر و لق و پۆپی دارەکانی چیاکە و مێرگ و مێرغوزارەکانی سەر شاخەکەی داپۆشیبوو. بەرچاییمان خوارد و بەسەر شاخەکەدا بەئەسپەکانمانەوە هەڵگەڕاین. لە پاشا کەوتینە خواری و لێژاییەکەوە، بەباریکە ڕێیەکدا تێپەڕمان کرد. پاشان کەوتینە کۆسپاییەکەوە، بەئاسانی پیادا ڕابووردین. دیسانەوە هەڵگەڕاینەوە بەناو ئەو هەموو بەردەڵانییەدا، کە ئیتر شاخەکە بەتەرحێکی وای لێ هات بەگران دەمانتوانی بچین بەڕێوە، لەسەر ئامۆژگاری باوکم، هەتا لەوسەر بەرەو خوارییە بووینەوە سواری ئەسپ نەبووم. ئەسپەکەم بەدەسمەوە ڕاکێشا. منیش گیرفانم پڕ کردبوو لە نوقوڵ و دەنکە کوولەکە. هەر بەڕێگاوە قسەمان دەکرد و، دەنک دەنک، لەگەڵ هاوڕێکەما لێمان دەخواردن. کەوتینەوە دەشتایی. لە دوورەوە بێستانێکمان دی. بەغار چووینە ناوەوە کە پرسیارمان کرد هیچ شتێکی پێ نەگەیشتبوو. ئیتر بەشاخەکەدا هەڵگەڕاین، تا چووینە سەر کانییەک. ئاوەکەی گەلێ ساردبوو. خۆمان و ئەسپەکانمان تێر و پڕ ئاومان خواردەوە. کەچی لەپێش ئەمەیشدا، لە چایخانەکەی (بناویلە) لامان دابوو و، ئاویشمان خواردبووەوە. لە پاش ئەمەی چەند خوار و ژوورێکمان کرد هەستمان بەماندووبوونێکی تەواو کرد. هەر خوا خوای ئەوەمان بوو، بگەینە جێیەک و لابدەین، تا تێر ئاو بخۆینەوە و بحەسێینەوە. هەر ئەوەندەمان زانی لەسەر تەوقە سەری شاخێک چایخانەیەکمان بەدی کرد. گەیشتینێ و لامان دا. بەرکوڵێکمان بۆ کرد. لەوێ گەلێک خەڵکی سلێمانی لێ بوو. هەمووومان دەناسین. تەنانەت (نوری ئەفەندی) لادێیەکانیش ئەناسی. چایی بۆ یەکێکیان کڕی. دەستیان کرد بەقسەکردن و ڕابواردن. کابرا دەستی کرد بەپیاهەڵدان (مدح) بەباپیری (نوری)دا ئیتر هیچ قسەی پێ نەما بیکا، ئەمە نەبێ، کە هەموومانی پێ هێنایە پێکەنین. گوتی: «بەخوا باپیری خوالێخۆشبووی نێرگەلەکێشێکی باش بوو!» ڕۆیشتین ئەوەندەمان پێ نەچوو کەوتینە سەر تەوقە سەری شاخێک کە پان و فراوان بوو. ئۆتۆمبیل بەئاسانی پیا دەڕۆیشت. (نوری ئەفەندی) پەنجەی درێژ کرد. لە دامێنی شاخەکە، لەناو دۆڵ و چاڵاییەکی قووڵدا دێیەکی جوانکیلانەی پیشان دام. هەر چوار لای بەباخ و ڕەز و داری چنار و شۆڕەبی تەنرابوو. گوتی ئەمە دێی (نۆدێ)یە. دێی (شێخ مارف). باوکی (کاک ئەحمەدی شێخ)ی ناودار، کە بەرەنجدانی لە پێناو چاکەی (کوردەواری)دا بەناوبانگە. گەلێ باسی ئەوێی بۆ گێرامەوە. لە پاشا بایەکی فێنک بەسەرماندا کشەی کرد. منیش دەستم کرد بەگۆرانی گوتن. دڵی هاوڕێکەمم بەوە خۆش کرد. ئێمە لە کاروانەکە گەلێک پێشکەوتبووین. تینوێتییش زۆری لێ سەندبووین. جڵەوی ئەسپەکانمان کێشایەوە و جگەرەکێشێک وەستاین، هەتا ئەوانیش هاتن. ئاومان لێ سەندن. خواردمانەوە. ئینجا هەر چوارمان بەناو ئەو دۆڵ و شاخە بەردەڵانییەدا بەگۆرانی وتن و قسەکردن و ترێ و ترۆزی خواردن کاتمان ڕابوارد. دێی (چنگیان)یشمان لەوبەری شاخەکەوە، لە دوورەوە بەدی کرد: ئیتر هەر ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەر چەم و ئاوێکی گەورە. بایەکی گەرمی ناخۆش بەسەرماندا تێپەڕی. چەند ماڵ و کۆچێکمان لەژێر دارە بەڕووەکاندا چاو پێ کەوت. لای ئەوان لامان دا. هەتا بەری بەیان ماینەوە. کە یەکسەر ڕوومان کردە (پێنجوێن).

## چەمی ولیاوا

گەیشتینە ناو چەمەکە. لە پڕ کابرایەکی لادێییمان پێ گەیشت. ڕێ بەستی چەمەکەی کردبوو. خەریکی ماسی گرتن بوو. سەبەتەیەک و ساجێکی بەدەستەوە بوو. کە ئێمەی دی هەردووکیانی فڕێ دا و هەرای کردە ناو ئاوەکەوە، دەستم ماچ بکات. وای دەزانی من (شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحموود)م. بەڵام، من بەگاڵتەوە پێم گوت: «شێخ لەتیف نیم. بەڵام خزمی شێخ مەحموودم». هەتا هاتە نزیکی ئەسپەکەمەوە ورتەم نەکرد. بەڵام خۆم بۆ نەگیرا، ئەو بەندەکی و ڕەنجبەرتییەی لێ پەسەند بکەم، لە پڕ دەرم بڕی، گوتم: «شێخ نیم مامەگیان». ئیتر ئەویش بەپێکەنینێکەوە گەڕایەوە.

چووین لە بن دارەکەدا، ئەسپەکانمان بەستەوە. چاییمان سازکرد. هەندێ ئاوی ساردمان نۆشی. دەستمان کرد بەخواردنی خۆش خواردن... ڕاکشاین، بنووین. هێشتا تەواو چاومان گەرم نەکردبوو، لە دەنگە دەنگی کاروانەکان و زرنگە زرنگی زەنگوڵەی ئێستر و بارگیرەکان خەبەرمان بووەوە. کە تەماشامان کرد، ئەوا کۆمەڵێکی گەورەی کاروانەکان و خەڵکی سلێمانی چاییان لێ دەم کردووە و، بەئارەزوویەکی تەواوەوە نانی پێوە دەخۆن، بەدەم ئەویشەوە قسە ئەکەن.

من وام ئەهاتە پێش چاو، کە لە سایەی ئەم کاروانانە گەلێ بەکەیف و خۆشییەوە ڕادەبوێرین. چونکە لە ژمارە نەدەهاتن. کەچی ماندوێتی ڕێگا بەتەرحێکی لێ کردبوون ئێمەیشیان بڕست براوکرد، ئەمان دەزانی چۆن ڕابوێرین... کات بووە ساتی نۆهەم[1].

من و نووری هاوڕێم، بەرگی مەلەکردنمان پۆشی و لە ناو هاڵاوی گەرما، تێر و پڕ لەناو ئەو چەمە خۆشەدا مەلەمان کرد. ئینجا خۆمان پۆشتە کردەوە و ڕووبەڕووی کانی و مەرەزەیەکی دوور ڕۆیشتین. بەناو دەشتێکی فراواندا ڕێگامان بڕی. گەیشتینە بەرمەرەزەیەک، کە لە کاتی گەشیدا بوو. تیشکی ڕۆژ دوو هێندەی جوان کردبوو. لەوبەری ڕێگاکەیشەوە زەوییەکی پان و درێژ بە توتن چێنرابوو. ڕەنگە ئەتڵەسییەکەی لەبەر تیشکی ڕۆژ دەبریسکایەوە. هەروەکو دەسکەگوڵێ کە بەگەڵای ترنجۆک پێچرابێ، کۆمەڵێ کیژ و ئافرەتی جلک ئاڵ، لەگەڵ مێرد و باوکیاندا خەریکی بژار بوون، ناو دووکانە توتنەکانیان ڕازاندبووەوە. بەڵێ وابوو: ژن و پیاو، بەیەکەوە تێدەکۆشان، ماڵەکەیان ئاوا بکەنەوە، منداڵەکانیان، واتا کوڕ و کچەکانیان بحەسێننەوە.

ئای ئەوە چ تەماشاگاهێکی جوان بوو!؟. بەڵام چیمان بکردایە؟ تینوێتی زمانی شکاندبووین. بەناچاری لەگەڵ هاوڕێکەمدا ڕوومان کردە شاخەکە، کە لادێییەکان ناردیانین بۆ کن کانییەکی سازگار. لێمان دا ڕۆیشتین گەیشتینە کن کابرایەکی توتنەوان. پرسیارمان لێ کرد. وتی: لێرە نییە، لەو لاوەیە. ئێمەیش هەر ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە ناو دۆڵێکی تەسک لەناو دوو شاخدا. بەڕێگایەکی باریکەڵەی سەختەڵانی و، سەر بەرەو ژوور و سەر بەرەوخوارەدا، چەند سەد هەنگاوێکمان بەو قەد پاڵەدا بڕی. وامان لێ هات بڕستمان بڕا و هێرامان نەما. ئەوەندەی نەمابوو زمانمان بشکێ، لە پڕ جۆگەلەکی

(١) لێرەدا مەبەس کاتی کوردییە، نەک فەرەنگی.

تەسکەلانەمان هاتە پێش چاو. وەک درزێک وا بوو، بەڕووی شاخەکەوە. کە سەرنجمان دا ئەو کانییە بوو کە سێ چارەکە سات بوو، دوو بەدوو بۆی دەڕۆشتین. چیمان دی؟! کانییەکمان دی، ئەوەندە سارد، ئەوەندە سازگار، هەموو ئێش و ئازارێک، هەموو ناخۆشییەکی ڕابواردنی سەر چەم و ماندوێتی ڕێگاکەی لەبیر بردینەوە. هەرچەندە کانییەکە یەجگار تەسک و سەربەرەوخوار و لێژ بوو، هەرچەندە ئەوەندە جێی دانیشتنمان نەبوو، کە بەئاسانی تیا، دابنیشین، بەڵام ئەو چیمەن و نزارە، ئەو سێبەری لالەزارە، ئەو شنەی شەماڵە، ئاوە ساردەکەیشی کە بەلاوە بوو، وای لێ کردبووین، دەستمان بەئەژنۆدا ئەدا، هەناسەمان هەڵدەکێشا، کە لە بەیانییەوە لەوێدا نەبووین، تا زۆرتر شادمان بین.. هەندێ ئاومان خواردەوە، بەڵام لە ئەندازەی خۆمان زۆرتر بوو... پشوویەکی شادمانیمان دا. هەرچی وردە شیرینییەکمان پێ هەبوو، بەکەیفەوە دامان کرماند. ئەوەندەمان پێ خۆش بوو، بەخۆمان نەزانی، کاتێکمان زانی ئێوارە داهات!... ڕۆژ کەوتە کێوان، لە کەلەوە نزا خوازی لێ کردین.

وە نەبوو بێ تاریکی بگەیشتیناینەوە هەوار. بەڵام ڕۆژی ڕووخۆش نەیهێشت بکەوینە بێ ڕۆژییەوە، خۆی لە پشت کێوانە، چرایەکی سووری بۆ هەڵ کردین. تیشکی دەهاوێشت. پەڵە هەورەکانی بەڕەنگاوڕەنگ، زەرد و سوور زێڕین کردبوو، لەلایەکەوە بەڕیز هەموو تەرحە گیاندار و دڕندەیەکی لێ دروست کردبوو، لەلایەکی تریشەوە دەتگوت بەهارە و شاییە، بەگەردنی یاقیقین و سەر و پۆتەڵاکی زێڕینەوە، کیژە کوردن و ڕەشبەڵەک و هەڵپەڕکێ دەکەن، لە خۆشی هاتنی جەژنی نەورۆزی پیرۆز.

گەیشتینەوە هەوار، لەناو ئەو هەموو چیمەن و لالەزارەدا، لەناو ئەو بای شەماڵەدا، ئاوێکمان هاتەبەر. چەمەکە بوو، کە بەناوی دەربەندەکەی (وڵیاوا)دا دەهاتە دەرەوە، بەسەر ئەو بەردانەدا تافە تافی ئەکرد، بەناو ئەو دارانەدا هاژە هاژی ئەکرد. ئەویش وەک ئاوێنە، وێنەی ئەو پەڵە هەورە ڕەنگارانە و ئەو ئاسمانە گەورەیەی، بەڕەنگە شینەکەیەوە، هەروەها وێنەی ئەو گەڵا و ئەو دار و درەختانەی ئەنواند. دەتگوت ئاوێنەیە و وێنەی ئەو چاوئەندازانەمان بۆ ئەنوێنێ، کە تۆزێ لەوەپێش پێی شاد و دڵگوشاد بووبووین. پەڕینەوە. هێشتا نەگەیشتبووینە سەر هەوارەکە، کابرایەک هات، سێ ماسی بۆ هێنابووین. لێمان وەرگرت. بەدڵێکی خۆشەوە برژاندمان. ئۆخەی! چەندە بەچێژبوو! هەرگیز ئەو خۆشییەم لەبیر ناچێتەوە، کە نانمان خوارد. بێجگە لە ماسییەکان شفتەیشمان پێ بوو، چایشمان لێ نابوو. بێ تۆ ناخۆش، خۆشییەکی زۆرمان لێ چێشتن. ئێستەش چێشکەیان لە ژێر دائەنایە!... کە نان خورا، بێدەنگی هەموو لایەکی داگیر کرد. چونکە ماندووبوون و ئەیان ویست بەیانی، لە خەو زوو هەڵسن، زۆری پێ نەچوو خەویان لێ کەوت. کەس ئەو بێدەنگییەی تێک نەئەدا من و (نوری ئەفەندی) و کاروانەوانەکمان نەبێ. لە پڕ وتم: «ئۆخەی! ئێستا من خۆم لە خۆشییەکی بێ ئەندازەدا ئەبینم. کاشکی هەر وام ڕابواردایە. بەڵا خۆزگە، لەسەری ئەو کەلەوە -دەستم بۆیان درێژکرد، کەلی ڕۆژئاوای (وڵیاوا)م پیشان دان- ئەلەکتریکێک دەبوو، ئەوەندەی تر ئێرەی نەشئە پەخشان بکردایە!... ئاخ، ئێرە، چ جێگەیەکی خۆش دەبوو ئەو حەلە...!؟». کاروانەوانەکمان پێکەنی. (نوری ئەفەندی)یش بەتەوسێکەوە گوتی: «بۆچی. دەشێ، ڕاست دەکەی بەخوا زۆر جوان دەبوو!»... بەڵام ئەو ئەم قسەیەی هێشتا تەواو نەکردبوو، هەر ڕووم لە کەلەکە بوو، بەقاییم دەستم کێشا بەسەر شانی (نوری)دا و ڕوویشم وەرگێڕا بۆ

سەر شاخەکە!... بەڵێ ڕاستە، ئەم ئەو ئەلەکتریکەی من دەمویست بیبینم، ئەی دی... بەڵام ئەلەکتریکێکی وای دی کە بێ کۆڵەکە وەستابوو. بەبێ تەل و دەرمان ئەچریسکایەوە. بێ تەقە و چرکە، دەجریوایەوە. ئەویش شتێک بوو خوا نەبێ کەس نەیناردبوو. یەزدانیش نەبێ لە دەستی کەس نەدەهات بینێرێ. ئەویش ئەستێرە گەشەیەک بوو، هەر وەک خوای گەورە بۆ دەرخستنی ڕاستی قسەکەی من، یاخود بۆ هێنانە دی ئاواتەکەی من ناردبێتی وا بوو. ئەستێرەکە لەو دیو شاخەکەوە بەناز و جیازێکەوە هەڵدەهات. بەرە بەرە سەرکەوت، تا هاتە ئەو شوێنەی، کە بەئارەزووی دڵی من هەزار ئەوەندە زۆرتر چاوئەندازەکەی ڕەنگین کرد!. شەوی پێشوو کەم نووستبووین. لەبەر ئەوە پێخەفمان لێ ڕاکێشا و خۆمان بێدەنگکرد، نوستین، تا ساتی هەشت و نیوی شەو.

## بۆ پێنجوین ١٩٣٠/٧/٢٦

هەرچەندە ئەو شەوە هەموو لایەکمان، بەئاخوڕی بارگیر چوار لامان گیرابوو، نە سەرین هەبوو، نە دۆشەک لەسەری بنووین. تەنیا لەسەر مەوجێک و، بەمەوجێک، بەجلەکانمانەوە نوستین. بەڵام لەبەر ماندوویتی ڕێگا و خۆشکردنی بایەکە خەوێکی خۆش و ئاسانمان لێ کەوت. بەخۆمان نەزانی، تا بەیانی بەزۆر خەبەریان کردینەوە. کە هەستاین، ئەسپەکان ئامادەکرابوون... باریش ڕێک خرابوو... هێشتا تاریک و ڕوون بوو، دەستمان کرد بەڕۆیین. بەسەر شاخەکەدا سەرکەوتین. کەوتینە ناو بەردەڵانییەکەوە. لەبەر تاریکیش، گەلێک جار ئەسپەکانمان هەڵئەنگوتن. نزیکی سات و نیوێک بەو تەرحە ڕۆیشتین هەتا دەمە و هەتاو کەوتێ کەوتینە ناو دەشتاییەکەوە کە کانییەکی ساردی لە ناوەڕاست بوو.

چەند بەردە نوێژێک بەلایا چەسپ کرابوو، بۆ نوێژکردن. بەهەر چوارلای کانییەکەیشدا بێستانی کاڵەک و تروزی بەرهەم هێنرابوو. لە دوور کانییەکەیشەوە، چایخانەیەکی بچووک هەبوو. بەسەر چەمێکی قووڵدا ئەیڕوانی کە ئاوێکی جوانی بەناودا دەڕۆیشت. لەوبەریشەوە، لە دوور لە سەربانێک دێیەکی بچووک هەبوو. (زەڵان)یان پێ ئەگوت. ئەمە ئەو (زەڵان)ە بوو، کە بەناروو (خەیار) بەناوبانگە. لەوێ لامان دا. دەستمان کرد بەدەم و چاو شتن. ئینجا دەستمان کرد بەچای خواردنەوە. بەڵام ئەوەندە زۆربووین، چایمان بەئاسانی بەرنەکەوت. ناچار خۆرشتەکەمان بەکاڵەک و تروزییەوە خوارد!... کاتێ ئێمە لەوە دابووین، جار بەجارێ ئاوڕم ئەدایەوە. چاوم بەچاوئەندازی شاخەکە ئەکەوت، کە تەوقە سەرەکەی زێڕپەندی تیشکی ڕۆژ بووبوو. تیشکەکەی لەناو ئاوەکەی ئەدا. شنەشنی دار و درەختەکەی لەناودا دیاربوو. کزەبایەکی خۆشیش وەک سۆزی بەهاران، جار بەجارێک ئەهات بەسەرما، کەیفی پێ ئەسەندم، ئەشەی پێ پەیدا ئەکردم...

لێمان دا ڕۆیشتین، ڕێگامان کەوتە خۆشانی. بەم لاو بەولاماندا وەکو شەقامەکانی شارە پێشکەوتووەکان، دارودرەخت ڕوابوو، هەتاو بەئاستەم لێی ئەدایی. هیچ ئازارێکمان لەم ڕێگایە نەچێشت هەتا گەیشتینە ناو چڕە دارستانێکەوە، کە ئەو دەمە هەشت سات بوو بەڕێگاوە بووین. سەرەوەی سەرگردەکە بوو، کە ئێمەی پیا دەڕۆیشتین. خوارەوەیشی پڕبوو لە هەزاران جۆر داری زلە، زلە، تووترک، داری بەردار، کە جێگای دڕندەی کێوان بوو، وەک ورچ و پڵنگ. ئەوە شاخی (تارییەر) بوو،

کە بەسەختی و بڵندی بەناوبانگە... بەسەر بەرەو ژوورەیەکی یەجگار ناخۆش و پێچ پێچۆکەدا سەرکەوتین، تا وامان لێ هات لە تەوقە سەری شاخەکەدا پەکمان کەوت. ئینجا بەزەییمان بەبارگیرەکانماندا هاتەوە. تۆزێ دابەزین. لەژێر داری دار بەڕوودا پشوویەکمان دا. ئیتر بایەکی شەماڵی فێنکمان هەناسە دا. هەر ئەوەندەمان زانی کورە کاروانەوانێکی پێنجوێنی پەیدابوو. چەمچە (شقارتە)یەکی لێ سەندین و بەڕاکردنێکەوە، بەپێ، بەو شاخە سەر بەرەو لێژەدا داگەڕایە خوارەوە، هەر بۆ ئەمەی چایەک بۆ ئێمە ساز بکات. ئێمەیش لەدوایەوە ڕۆیشتین. وامان دەزانی لە دامێنی شاخەکەوە کانی هەیە. کەچی هەر دەڕۆیشتین و نەی دەگەیشتینێ، هەتا هێزمان لێ برا. لە ئەسپەکان دابەزین بەپێ ڕۆیشتین. ئینجا بەپێیش ماندوو بووین. دووبارە سوار بووینەوە. کەوتینە ناو دەشتێکی گەرمەوە خەرمانێکی لێ بوو. دوو پیاو و ژنێک و کچێکی یەجگار جوان خەلەیان کۆ دەکردەوە. بەدەستی کچەکە دۆیەکی خۆشمان بۆ هات و خواردمانەوە. سێ چارەکە ساتێکی تریشمان بەسواری ڕابوارد. ئینجا گەیشتینە کانی (ئەمین بەگ)، کە لە کانییە هەرە سارد و سازگارەکانی پێنجوین دەژمێررێ. لەوێ دابەزین. پشوویەکمان دا. خۆرشتمان خوارد. چایی کورەکەمان نۆش کرد. ئینجا بەناو دەشتی کاکی بەکاکی (قزڵجە)دا ڕێمان بڕی. لە پاش ساتێک و چارەکێک گەیشتینە (پێنجوین) لە جێی سەربازەکان تێپەڕمان کرد. چووینە ماڵێکەوە کە بەرامبەر شاخەکە بوو. جێیەکی فێنک و خۆش و پڕ سەربەستی بوو.

## پێنجوین ١٩٣٠/٧/٢٦

دێیەک بوو، بەڵکو شارێک، جوانکیلانە بوو. لە هەر چوار لاوە بەباخ و باخچەی ڕەنگین تەنرابوو. جێیەک بوو جگە لە جوانی، جگە لە ئاو و با خۆشی، جگە لە ڕازێنراوەیی بەچاوئەندازی جوان، بەگەورەیی شوێنی لە بەرچاو فەرمانڕەوایدا، بەشوێن سەختی بەو سێ شاخەوە کە دەورەیان دابوو: (کێوی ئەحمەد هاجەر، کێوی بەرکێو، گردی بلکیان)، وەک کلیلێک وا بوو کە کڵۆمی (ئێران)ی پێ بکرێتەوە. بێجگە لەوە ئەگەر (پێنجوین) قایم نەبوایە، چۆن (شێخ مەحموودی گەورە)، ئەو دەورووپشتەی ئەوی ئەکردە نیشتەجێی خۆی[1]؟!

(پێنجوین) پڕ بوو، لە کانی گەورە گەورەی ئاو سارد، بەڵام کاشکی ئاوەکەیان قورس نەبوایە. تەنانەت، کانییەکی تیا بوو، لەبەر قورسی ئاوەکەی، بەئاوەکەیان ئەگوت: (ئاوئاسن). بەڵام کانی

(١) کە لە سەرەتای ١٩٢٣ وە شێخ مەحموود نیازی پیسی ئینگلیزی بۆ دەرکەوت لە بەزۆر بەستنەوەی باشووری کوردستانەوە بەحکوومەتە عەرەبییەکەی بەغداوە و لە ٣ی مارتی ١٩٢٣ سلێمانی بۆردومان کرا. شێخ بەلەشکرەکەیەوە لە قەمچوغە و جاسەنەوە بەرەو شارباژێڕ و پێنجوین ڕۆیی تا دوایی لە ناوچەی پێنجوین جێگیربوو و کردیە بنکەی سەرەکی شۆڕشەکەی. دواجاریش ناچارکرا ڕێککەوتنەکەی پێنجوین لەگەڵ نوێنەرانی حکوومەتی بەغدا و بەچاودێری ئینگلیزەکان لە ١٩٢٧/٦/١٥ مۆر بکا. بەپێی ڕێککەوتنەکە چووە دێی (دۆڵەژێر) لە ئێران دانیشت. ئەو کاتەی مامۆستا ئەم گەشتەی کردووە شێخ لەو گوندەی سەر سنوور بووە و حکوومەت بۆ پێشگرتن لە هەر جموجۆڵێکی تازە هێزی سەربازی لە چوارتا و پێنجوین دانابوو.

(ئاوی حەیات) لە هەموویان ساردتر و شیرینتر بوو. لەم بەری دێیەکەوە کە گەڕەکی (بەرکێوان)یان پێ ئەگوت: کانی کەم هەبوو لەبەر ئەوە بەسەر شێوەکەدا جۆگەلەی داریان ڕایەڵ کردبوو، ئاویان پیا هێنابووە ئەم بەر. ئەو شاخەی کە یەجگار ئاوی هەبوو، (ئەحمەد هاجەر) بوو، کە کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی (پێنجوین)ەوە، تەنانەت لە چەمێکی دوورەوە، لەبەر چاندن. بەم کردە بەرزەی شاخی (ئەحمەد هاجەر)دا، ئاویان ڕاپێچ کردبوو، جا هەر ئەو ئاوە زۆرە بوو کە (تافاو)ێکی گەورەی لە ناوەڕاستی شاخەکەدا دروست کردبوو، کە بەهۆی ئەوەوە تەماشاگاهی شاخەکە جوانتری لێ هاتبوو. هەروەها هەر ئەو ئاوەیش بوو، کە دەهاتە بەری (بەرکێوان) بۆ شینایی و بۆ با خەبەردارەکان. کە هەموو تەرحە درەختێک و سەوزایییەکی لێ کرابوو. لە دەستە ڕاستی (پێنجوین)یشەوە چەند گردێک هەبوون، سەر و خواریان باخ و باخچە بوو. بەئاوی سازگاری کانییەکان ئاو ئەدران. پڕ بوون لە میوە و سەوزەوات، وەک: هەڵووژە، سێو، هەرمێ، ترێ، قۆخ، قەیسی، شاتوو، توو، ئاروو، ترۆزی، شووتی و کاڵەک. پێنجوین دوو باخی زۆر گەورەی تیابوو: یەکێکیان (چوارباخ)، ئەوی تریشیان (بلکیان)یان پێ ئەگوت. ئاوی (بلکیان)یش ئەوەندە ساردبوو پیاو نەی ئەتوانی دەستی زۆر تیا ڕابگرێ. لە دوای ئەمانەیشەوە شاخێکی بڵند هەبوو. شاخی (کانی شەوقەت)یان پێ دەگوت. ئیتر ئەگەر تەماشای (پێنجوین) بکرایە، هیچ دەستە ڕاست و دەستە چەپی ماڵێکی نەئەبینرا کە بێ باخ و باخچە بووایە.

ئەگەر یەکێ لە دوورەوە بهاتایە (پێنجوین)، کوتوپڕ پێی دەگوت: گوندە. بەڵام کە ئەچووە ناوەوە و ڕێکوپێکی ماڵەکانی و، زۆری دانیشتووەکانی و، بازاڕ و دووکانەکانی و، سەرشۆرک و مزگەوتەکانی و، شێوەی ئاش و ئاودانی زەویەکانیانی ئەکەوتە بەرچاو، بەشارێکی زۆر ڕێکوپێکی دائەنا.

نزیکی پەنجا دووکان، کە هەموویان لە هاویندا وەک ساباتە وان، چوار چایخانە، قەیسەرییەک، سەرشۆرکێک کە ئێستە ڕووخاوە، چوار مزگەوتی گەورە کە لە هینەکانی سلێمانی کەمتر نەبوون، دووسەد و پەنجا خانووی دوو نهۆمی تیابوو. جا بەپێی ئەمانە، وا دیاربوو، کە (پێنجوین) حەلی خۆی لە ئێستا زۆرتر خەڵکی تیا بووە. چونکە وەک دانیشتوانی (پێنجوین) خۆیان ئەیانگێڕایەوە، ڕووسەکان لە شەڕی گەورەی جیهانی یەکەمدا وێرانیان کردبوو. ئێستا ژمارەی دانیشتوانی (١٢٠٠) کەس کەمتر نییە. هەموویان خاوەنی باخ و باخچە، یاخود کاروانن. یان بەبازرگانییەوە لەگەڵ ئێراندا خەریکن. مانگاکانی (پێنجوین) ڕەنگێکی زۆر سەیریان هەبوو. ناوەڕاستی پشتیان سپی، یاخود پەڵەی سپی تیابوو. لە ناوچەوانیشیاندا سێ سووچێکی سپی جوان هەبوو. هەر ئەتگوت ئەو مانگایانەن کە (مصری)یەکانی کۆن ئەیانپەرستن. هەروەها مەڕومالاتێکی بێ شوماریان هەبوو. قەڵەوبوون. گۆشتی سلێمانی، بەشی زۆری لە پێنجوینەوە دێ. چونکە پێنجوین لە کوێستانەکان ئەژمێرێ.

(حامد بەگی مەجید بەگی جاف) کە قائمقام بوو و لە هەڵەبجە دائەنیشت، خەریک بوو خانوو لە پێنجویندا دروست بکات. لەگەڵ (ئەحمەد بەگی عوسمان پاشای جاف)ی خزمیشیان خەریک بوون هەموو بازاڕی پێنجوین، کە لە ساڵی هورووژمی ڕووسەکانەوە ڕووخێنرابوو، لەگەڵ قەیسەرییەک و سەرشۆرکێکدا دروست بکەنەوە.

پێنجوین جێیەکی زۆر گەورەیە. دەشێ ڕێک بخرێ خوێندنگای بۆ بکرێتەوە. ئەوا ئەمساڵ خەریکن بۆی بکەنەوە ئێستاکە مەلایەک حوجرەی کردۆتەوە. (٢٢) شاگردی هەیە. وانە (درس)یان پێ ئەڵێ. بەلاّم لەسەر شێوەی تازە نییە. لە شوێنێکی تردا لێی ئەدوێم.

(پێنجوین) بەچاوئەندازی جوان، کەم شوێن ئەیگاتێ. بەشێوەیەکی تێکڕایی ئاو و بایەکی باشیشی هەیە. پاشەڕۆژ، دەبێ بەهاوینگاه.چونکە ئەویش (لوبنان)ێکە بۆ خۆی و لەویش کەمتر نییە. ئێستە بنکەی لادێ (ناحیە)یە. سەرایەکی باشی تیا دروست کراوە. بە(١٥٠٠٠٠) ڕوپیە تەواو بووە. لەسەر گردەکانیشی دوو بنکەی باڵباز دامەزرێنراوە.



جێگایەکی خۆشمان دەست کەوت. هەر ئەوەندەمان زانی (محەمەد عەلی ئەفەندی)ی برای هاوڕێکەم، هات، گەلێ قسەی خۆشمان کرد. نانمان خوارد، کەچی لە کانی (ئەمین بەگ)یش گەلێکمان خواردبوو. لە پاشا (میرزا مارف)، ژیرە پیاوی بەناوبانگیش هاتە لامان. لە دواییدا ئەوان ڕۆیشتن. ئێمەیش تۆزێ نوستین، چاوێکمان گەرم کرد و لەخەو هەڵساین. چووینە مزگەوتێ کە لە لای ماڵەکانەوە بوو. ڕێکوپێک و پاک و خاوێنمان هاتە پێش چاو. ئینجا ڕاستەوخۆ چووینە لای (نوری ئەفەندی عەزیز)، کە ئەو دەمە بەڵێندەرێک بوو لەوێ. لە دانیشتووانی سلێمانی بوو. گەلێ نازی گرتین. هەموو ناو بازاڕی گێڕاین. دێیەکەیشی تەواو پیشان داین. بردینیە ناو باخێکەوە. لەوێ هەندێ هەڵووژە و هاروو و ترۆزی و شووتیان بۆ هێناین. خواردمان. گەڕاینەوە. لە پاش نانخواردنی ئێواریّ چووینە چایخانەکانی پێنجوین. بەجگار جوانم هاتنە پێش چاو. بەلۆکس و تەخت و ئاوازە (گرامەفۆن) ڕازێنرابوونەوە. هەموو چایچییەکان خەڵکی سلێمانی بوون. هەموویانم ناسییەوە. پاشان بەسایەی (نوری ئەفەندی)یەوە چووینە ناو (تەلخانە)[1]کەی پێنجوینەوە. لەوێ گوێمان لە ڕادیۆ گرت. هەرچەندە، هێشتا زوو بوو، بەلاّم ساز و ئاوازی ڕووسیا و ئێران و هی هەڵپەرکێی لەندەنمان بەپیانۆوە گوێ لێ بوو. حەزمان لە ساز و ئاوازی تورک ئەکرد. کەچی گوێمان کەوتە بەر وتار (خطبة)ێک لە بابەت بڕانەوەی شۆڕشی کوردەوە،[2] کە ئەو دەمە کوردەکانی تورکیا بۆ ئازادی کوردستان هەوڵیان ئەدا. ئیکە ئەوەندەی پێ ئەچوو هاتینەوە ماڵەوە. نوستنێکی بێ ئەندێشە نوستین.

## پێنجوین ١٩٣٠/٧/٢٧

ئەو ئێوارەیەی پێشوو بازاڕەکەمان باش ئەدی. چونکە هەموو دووکانەکان داخرابوون. بەلاّم کە بەیانی بەناویا گەڕاین، لە هەموو تەرحە کارگەرێکمان هاتە پێش چاو: ئاسنگەر، چەقۆ دروستکەر، ناڵبەند،

(١) تەلخانە: پۆستە و گەیاندن - دائرة البريد.

(٢) دیارە لە کاتی ئسکۆی شۆڕشەکەی (ئاگری داغ) بووە کە کۆمەڵەی خۆیبوون ڕێکی خست و ڕابەرایەتییەکەی سپاردبوو بەژەنراڵ ئیحسان نوری پاشا (١٨٩٣- ١٩٦٧). ئەم شۆڕشە زۆر جار بە(شۆڕشی ئارارات)یش ناودەبرێ ١٩٢٧ - ١٩٣١.

مسگەر، مەڕ سەربڕ، کەبابچی، سەوزەفرۆش، چایچی، سەرتاش، وردەواڵە فرۆش، جگەرە فرۆش، هەر جۆرە دووکانێک کە لە شاردا هەبووبێ، دیان. ئینجا چووینە ناو سەراکەوە. تێ وردبووینەوە. سەرایەکی زۆر ڕێکوپێک بوو. لەسەر شێوەیەکی تازە دروست کرابوو. چیمەنتۆ و تەرحە خشتێکی سووری تیا بەکارهێنرابوو، کە لە گڵی پێنجوێن و لە کوورەخانەی پێنجوێنا دروست کرابوو، خشتەکان کۆشکەکەیان یەجگار ڕازاندبووەوە. سەراکە، دوو حەوشەی هەبوو. بەهەر چوارلایدا هەیوانی هەبوو. ژوورەکانی لە چەشنی هی قەڵا دروست کرابوون. پەنجەرەکانیان زۆر بەبەرزییەوە بوون. خانوویەکی بچووکیشی تیابوو. بۆ کارگێڕی لادێی پێنجوێن دروست کرابوو. لەسەر شێوەی ڕۆژئاوایی بوو هەموو فەرمانبەر (موظف)ەکان لەم سەرایەدا دائەنیشتن. بەباڵباز (پۆلیس)ەکانیشەوە. سەرێکمان لە کارگێڕی لادێیەکە (ڕەشید ئەفەندی غەفور) دا. گەلێ میوان نەوازی کردین ئەم پیاوە هەرچەندە بۆرە خزمێکم بوو، بەڵام ئەمە یەکەم جار بوو گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم. بەڕاستی کاروباری لادێیەکەی بەپەنجە هەڵدەسووڕاند. بەکاربوو. بەجەرگ بوو. دڵ تەڕیش بوو. لە قسەکردن و ڕازاندنەوەیا دەستێکی درێژی هەبوو. دەمی لە هۆنراوە گوتنیشەوە نەدا. بەڵام تیا قاڵ نەبوو بوو. کەچی هەندێک لە فەرمانبەرەکانی ژێردەستی بەخراپ لێی ئەدوان. لەوێ هاتینە دەرێ، چووینە لای (میرزا مارف)، کە لەوێ بنووس (کاتب)ی لادێیەکە بوو. کوردپەروەرێکی ڕاستەقینەم هاتە پێش چاو. کاتی خۆی شاگردێکی ئایینی بووە. بەڵام بەپیاوانی ئایین و ئایین کەم باوەڕ بووە. بۆ ئەمەی خۆی ئازاد بکات لە مزگەوت، خۆی دەرباز کردووە بۆ ناو ژیانی فەرمانبەرایەتییەوە. لە تورکیا و عێراق و سوریا و کوردستاندا کاری کردووە. ئەم پیاوە، وەک بۆیان گێڕامەوە، لەو دەمەدا کە ئینگلیز و کورد نارێک بوون، لەلایەن (ئەدمۆنس)ەوە کە ئەوساکە ڕاوێژکاری کاربەدەستی ناوخۆی عێراق، واتا (مستەشاری وەزارەتی داخلیە) بوو لێی داواکرا کە بچێ بەنووسیاری و هەرچی کەینە و بەینەیەکی (شێخ مەحموودی گەورە) هەیە، پەیتا، پەیتا بینێرێ بۆ ئینگلیزەکان. ئەویش، چونکە ناپاکی پێ جوان نەبووە بیکات لەگەڵ گەلی خۆیدا، خواستەکەی (ئەدمۆنس)ی پەسند نەکردووە و بەهەموو هێزێکەوە بەرپەرچی داوەتەوە. لەسەر ئەوە (ئەدمۆنس) بەڵێنی لێ سەندەوە کە هەتا زیندووە لە سەردەمی ئینگلیزدا کاری فەرمانڕەوایی داوا نەکات و وەریشی نەگرێ!... بەڵام لەپاش چەند ساڵێک چاویان لێ پۆشیوە و کردوویانەتەوە بەفەرمانبەر.

(میرزا مارف)، وەنەبێ، بێ ئایینێکی هەرزەکارانە بووبێ، ئەو تەنیا ئەوەی بەرپەرچ ئەدایەوە، کە بەمێشکیا نەئەچوو. بەڵام ڕاستت ئەوێ مەی خۆر بوو. لە شێوەیەکی ڕێکوپێکدا مەی ئەخواردەوە. زۆر سەربەستم ئەهاتە پێش چاو. هەرگیز لە قسەی ڕاستیش لای نەئەدا. زیانیشی پێ بگەیشتایە، قسەی ڕاستی خۆی هەر ئەکرد. تەنانەت لە کاروباری ئایینیشدا، لەناو ئەم گەلە ئایین گیردا لە قسەی سەربەستانەی خۆی نەئەکەوت.

لەناو ڕۆژنامە کوردییەکاندا قسەی جوانی بڵاو ئەکردەوە. نووسەرێکی یەجگار بەهێز بوو. قسەکانی خۆی، هەمووی دەختە مێشکی گوێگرەوە. تا بەتەواوی تیا ئەچەسپاند. لە بابەت کوردەوە. هەموو دەم لەلایەن دۆستە کوردەکانیەوە هەواڵی کوردستانی بۆ ئەهات. لەناو دێیەکەدا (مەلا مەحموود) ناوێک

هەبوو، لە وزە بەدەر ناپیندار بوو. کەچی ئەمی لە هەموو کەس خۆشتر دەویست. هەردووکیان گەیشتبوونە پلەی ڕاستی پەرستی (فەیلەسووفی).

ئێواری (محەمەد عەلی ئەفەندی) هاتە لامان. گەلێ قسەمان کرد. لە پاشا چووینە (قەلادێ)، کە چایخانەیەکی لێ بوو. کەوتبووە ڕۆژهەلاتی خوارووی پێنجوینەوە. لە پاشا چووینە (چوار باخ). دەم و چاومان شت. ئاومان خواردەوە. ئاروو و سێو و ترۆزێمان خستە ناو ئاوەکەوە، وەک تەرزەی لێ هات. ئینجا دەستمان کرد بەخواردنیان. بێ تۆ ناخۆش یەجگار خۆش بوو. پاشان بەناو ئەو هەموو دار و درەختەدا، ڕێگامان بڕی. کاتێکمان زانی بانگی شێوانی دا، چووینە مالێ.

## پێنجوین ١٩٣٠/٧/٢٨

ئەو شەو، بەدلێکی خۆشەوە نوستم، چونکە لەگەل ئێمەیشدا، لە خانووەکەدا، (مستەفا ئەفەندی)[١] ئاوێک دانیشتبوو، بەبرای بوێژی بەناوبانگ (زێوەر ئەفەندی) دەرچوو. ئەو لە ئێمە زۆرتر حەزی لە بەزم و ڕەزم و زەماوەند ئەکرد. هەر یەکەم شەومان بەبێ دەنگی ڕابوارد. ئیتر لەو شەوە بەدواوە بەگۆرانی و بەستە و قسەی پێکەنینەوە ڕامان ئەبوارد. لە بەیانیدا خەبەرم بووەوە. بەلام هێشتا هەتاو بەتەواوەتی نەکەوتبوو. کە سەرم بەرز کردەوە، شاخە ڕەنگینەکەی (ئەحمەد هاجەر)م هاتە پێش چاو، کە بەتارایەکی ئەتلەسین سەرپۆش کرابوو. بای بەری بەیان بەو فێنکییەیەوە کە هەیبوو، دەهات بەسەرما و قژمی پەخشان ئەکرد، هەر بەو چەشنەیش لە لق و گەلای چنارە بالا بەرزەکان و، شۆڕەبییەکانی ئەدا دەی لەراندەوە و، شنەی پێ ئەکردن و، باوەشێنی دێیەکەیشی پێ ئەکردن. لەناو قەدی کێوەکەیشەوە ئەو ئاوە سەهۆلاوییە بەتافە تاف، بەسەر بەردی شاخەکەدا، دەهاتە خوارەوە. کە ئەیدا لە بەردەکان، هاژە هاژی دەکرد و، بەو هاژەیە پیاوی خەبەر ئەکردەوە. ئەمە لەوێ بومستێ. لەم لایشەوە کەلەشێرەکان بەسەر بانە بەرزەکانی پێنجوینەوە ئەیان قووقاند. لەلایەکی تریشەوە لە بۆڕە بۆڕی مانگا و، لەبارە باڕی مەڕان و، لە قیژە قیژی گاجووت، گوێی پیاو کەڕ دەبوو، هەر دەتگوت، خۆشخوانی (شیعر)یە بەهارییەکەی (حاجی قادری کۆیی)یە و پەردە بەپەردە بەبەرجەستەیی دووبارە ئەبێتەوە. کە ئەمانەم دی، نە گرانی لە لەشما ما و، نە خەوالوویی لە ناو چاوما ما. خۆم ئەگرت، بۆ ئەوەی سەیری دەشتی (قزلجە) و هەلهاتنی تەواوی ڕۆژی پرشنگدار بکەم، بەگورجی جلەکانم لەبەر کرد. (نوری ئەفەندی)یشم لەگەل هات. هێواش ئەڕۆیشتین. خۆمان پێ ئەگیرا، هەر بەهەڕاکردن چووین تا خۆمان گەیاندە تافاوەکە. تێر دەستمان تیا ڕاگرت. بەو چاوئەنداز و دەشتە ڕەنگینانەی کە خوا بەکوردی بەخشیوە تەواو دلی خۆمان خۆش کرد و، چاوی خۆمان گەشاندەوە. ئێواردیش چووینە هەواری لەشکری عێراق، لای (عەلی ئەفەندی) چاوئەندازێکی جوانمان هاتە پێش چاو... چادرە سپییەکان بوو بوونە ئەخش بەڕرووی شاخ و دەشتە سەوزەکەوە. تا ئێواری لەوێ بووین. گەڕاینەوە. لە ڕێ باسی بەخشندەیی یەزدانمان ئەکرد کە چیی داوە

(١) مامۆستا زێوەری شاعیر چوار برای هەبووە: ڕەشید، سەعید ئەحمەد کە بەگەنجی لە ناوی زەلمدا خنکا، وە مستەفا کە ئەو کاتە لە دائیرەی (گومرگ) قۆلچی بوود، ئەمیان باوکی (عەریب و مەجید و سەلاح)ە.

بەکورد. کاتێ کە بەسەر گردەکەدا هەڵئەکشاین، (عەلی ئەفەندی)، بنجە گیایەکی پیشان دام (گەوون)یان پێ ئەگوت. چڵەکانیان بڕیبوو، هێشتا نەبووبوو بەدوو ڕۆژ کە لە جێگا برینەکەیەوە (کەتیرە)ی دەرکردبوو. ئەویش ئەو بەرهەمەیە کە (کوردستان) بەهەموو شوێنێکی ئەفرۆشێ. زۆر لە دانیشتووانی (پێنجوێن) بەفرۆشتنی ئەم گیایەوە دەژین و گوزەران دەکەن.

## پێنجوێن ١٩٣٠/٧/٣٠

زۆر گرفتاری جوانی شاخی (ئەحمەد هاجەر) بوو بووم. لە دواییدا خۆم ڕاتەگرت، بەیانی هێشتا هەتاو سەرپۆشی زێڕینی بەسەر کێوەکەدا نەدابوو، من و (نوری) و برازایەکی کارگێری لادێی پێنجوین و (مستەفا ئەفەندی)ی خۆمان بەدڵێکی خۆشەوە بەسەر گردەکەدا هەڵگەڕاین تا چووینە کن (تافاو)ەکە. لەوێ لەسەر بەردی تافاوەکە هەرسێکیانم بەدانیشتنی خۆمانییەوە دانا. چنار و بییەکانیش بەسەریانەوە سێبەریان کردبوو. وێنەیەکم گرتن. پاشان وێنەگرەکەم دا بە(نوری)، ئینجا خۆم چووم، بەدانیشتنەوە لای تافاوەکەوە وێنەیەکی خۆیشمیان گرت. ئینجا کە لەوێ گەڕاینەوە تووشی هەندێ ژنە پێنجوێنی بووین. هەر یەکە دەتگوت فریشتەیەکە بۆ خۆی. بێ سەرپۆش و بێ باڵا پۆش، لە کانییەکەوە دەگەڕانەوە. هەر ئافرەتەیان گۆزەیەکی ڕەنگ سووری لە گڵی پێنجوێنی بەبن باخەڵەوە بوو، بنەکەی نابووە سەر کەلەکەی خۆی، بەلار و لەنجە و ناز و فیزەوە بەناو ئەو دار و درەختانەدا دەڕۆیشتن. منیش بەڕاستی وام پێ خۆش بوو کە بۆ یادگار شێوەیەکی ئافرەتی پێنجوێنی بخەمە ناو گەشتنامەکەمەوە. وێنەگرەکەم هێنایە سەر پێ. بەڵام دەترسام جوان دەرنەچێ، پێم وتن ڕاوەستن وێنەتان بگرم. کەچی چونکە جوولەکە بوون لە بریتی ڕاوەستان بەگورجی تێیەڕیان کرد، لەباتی وێنەگرتنیان، تەریقیان کردینەوە!... بەڵام لەلایەکی کەوە، سێ چوار ئافرەتمان دی نانیان ئەکرد. بەئاسانی خۆیان ڕاگرت، تا وێنەمان گرتن. گەلێکیشیان پێ خۆش بوو. لە دواییدا چووینە چایخانەیەکەوە لەو نزیکانە. ئەم ئێوارەیەیش لەناو باخدا ڕامان بووارد.

## پێنجوێن ١٩٣٠/٧/٣١

ئێوارێ سات نزیکی (١٠) من و (نوری) و (ئەمینی یارە)ی ناسیاو لەگەڵ (حوسێن سالح غەفور)دا، چوار بەچوار ڕوومان کردە باخەکەی (بلیکان). گەلێ گرد و شیومان بڕی. ئینجا گەیشتینە ناو باخێکی گەورەوە کە هەموو تەرحە دار و درەختێک بەتایبەتی (دارمێو)ی تیابوو. بەقەد کێوەکەوە ساباتێکی گەورەیان کردبوو. لە ناوەکەیا کانییەکی زلی تیا بوو. لەناو ناوەکەیا دەست ڕاگیر نەدەکرا. هێشووە ترێش بەسەریا هاتبووە خوارێ. لەگەڵ ئەو خۆشییەیشدا شوێنەکەی زۆر پەنا و سەخت بوو. جێی دز و ڕێگر بوو. وەکو ئەیانگوت ورچێکی زۆری تیابوو. گەلێ نارمان لەو کانییە ساردە خواردەوە. نزیکی بانگی شێوان بوو گەڕاینەوە ماڵەوە. هێشتا لە ڕێگادا بووین (ئەمین)یان گوتی: ئایا بیستووتانە لە (١٦) سەربازی عەرەب دوانی لای شاخی (تەڕە تەوەن)ەوە کوژراوە. ئەوەی ماویشە ڕای کردووە، (کورد)ێک نەبێ کە ئەویش لەبەر ئازایەتی خۆی ڕای نەکردووە؟!. ئێمەیش ئەمەمان نەبیستبوو، تا

قسەی لێ بکەین بەڵام بیستبوومان کە تەنیا شوانێک، لە پێش هاتنماندا بۆ پێنجوێن (١٧) سەربازی ڕووت کردبووەوە. ئێستەیش گیراوە! ؟...

ئەمەمان لەناو دێدا سۆراخ کرد. گوتیان بەم تەرحە ڕووی دابوو: میری، چەند سوارێکی دڕی (سۆفیەوەند)، لە هەمەوەندە نازاکان دڵ نەشکێنێ. ئەمانیش پەیمان بەیەکتر ئەدەن: هەتا بێێن زیانی پێ بگەێنین. لەسەر ئەوە لە لای (کفری)یەوە کۆچیان کردۆتە ئێرە. کە هەموو جارێ میری هەواڵیانی بێرە داوە. ئێستەیش دوو سەربازیان لەو (١٥) کەسە کوشتووە. ئەوانی کە هەڵاتوون، سەربازێکی (کورد) ئەبێ، هەرای نەکردووە، بەسەریا گەیشتوون بیکوژن، هاواری کردووە: «نەکەن. لە ئێوەم. کوردم» ئەوانیش وازیان لێ هێناوە. هەر بەبرینداری ماوەتەوە. هەتا باڵبازە کوردەکانی ئێرە دۆزیویانەتەوە...

لەپاش ئەوە (ڕەشید ئەفەندی)ی کارگێڕی لادێی پێنجوێن و سێ باڵباز چووبوون بەدوای ئەو ڕێگرانەدا. هەتا لە دێی (بەردەبەل) دیبوویانن. لە پاش چەند تەقەیەک رایان ڕفاندبوون. سەربازەکانی ئێرەیش هەر خراخوای ئەوەیانە بڕۆنەوە. تا بەر ئەم هەرایە نەکەون. چونکە زۆریان وایان دەزانی ئەمە لە (شێخ مەحموود)ەوەیە و، لەسەر مافی کوردەواری وا ئەکات. تەنانەت، ئەوانە، بەتەرحێکی وا لە (کورد) دەترسن، کە (٧٠) سواریان لە دوای باڵبازەکانەوە ئەبن. کە تەقەکانیان دەبیەن لە بریتی ئەمەی یارمەتی باڵبازەکانی بدەن، ئەچن ڕا ئەکەنەوە ناو لەشکرەکەیان! ؟...

## پێنجوێن ١٩٣٠/٨/١

بەیانی وێنەگرەکەم لەگەڵ خۆمدا بردە سەراکەوە، چووینە لای (میرزا مارف) وێنەمان گرت. لە پاشا چووینە لای کارگێڕیش، وێنەیەکی ئەویشمان گرت. کە لەلای (میرزا مارف) بووین باسی (مەلا مەحموود) هاتە پێشەوە: ئێمەیش هەموو جارێ کابرایەکی پرچ درێژی سەر قژمان ئەدی. لە دەمەر قۆپانێ بەولاوە کە لە پێی نەکرد، هەموو لەشی ڕووت بوو. پێ خاووس بوو. جا لە (میرزا مارف)ەوە بوو کە بەتەواوی لە بنچینەی ئەم کابرایە تێگەیشتین. گوتی:

«شەش ساڵ لەمەوپێش (شێخ قادری شێخ کەریم)، دەروێشداری بەناوبانگ دێتە ئەم ناوە. گوایە ئەم (مەلا مەحموود)ە، کە لەوە پێش شاگردێکی ئایینی خۆشەویستی خەڵکی پێنجوێن ئەبێ، گاڵتەی پێ دێ. لەلایەن ئەو (شێخ قادر)ەوە شێت دەکرێ. پاشان هەرچەند (مەلا مەحموود) دەچێ و لەسەر دەستیا پەشیمان ئەبێتەوە کەڵکی نابێ. دەداتە ئەم کێوانەی پێنجوێن و، بەفر بێ و باران بێ و، قرچە قرچی هەتاوی هاوین بێ، یاخود ڕەشەبا و کرێوە بێ، ئەو پیاوە بەم ڕووتییەوە دەسووڕێتەوە. کە شەویش دێ لەسەر سیپاڵێک دەنوێ. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا هیچی لێ نایەت.

بەڵام خەڵکی پێنجوێن (مەلا مەحموود) بە (پیاوچاک) دائەنێن. یەجگار نازی ئەگرن. تەنانەت هەتا سێ ساڵ لەمەوپێشیش، هەرچی کەو و مریشکێکی (مەلا مەحموود) بووە لەسەر ئەوان بووە. کابرا زۆر ژیر بوو. چونکە ئەگەر ژیر نەبوایە، ئەم هەموو خەڵکی پێنجوێنەی کێش نەدەکرد. (شێخ مەحموودی گەورە) زۆر خۆشی دەوێ. هەموو جارێ دیاری بۆ دەنێرێ». (میرزا مارف) دەیگوت لێم پرسیوە: «ئایا

ئەگەر ئەم جارە، (شێخ مەحموودی گەورە) بێتەوە بە(شاهی کوردستان)، دەست ئەداتەوە لە ئایینی ئەم و ئەو؟!». (مەلا مەحموود)یش گوتبووی: «نە». بەڵام کوردپەروەری و نیشتمانپەروەری ئەهێنێتە پێشەوە». (میرزا مارف) ئەیگوت: «لێم پرسیوە: بۆچی نوێژ ناکەیت؟» (مەلا مەحموود)یش وەرامی داوەتەوە: «لەبەر ئەوەی شێتم!».

ئیتر ئەو ڕۆژە لەگەڵ (محەممەد عەلی ئەفەندی)دا ڕۆیشتینە ناو لەشکرەکەوە. ئەفسەرە کوردەکان زۆر بەدەورووپشتماندا هاتن. لەلایان ماینەوە تا ڕەوانەمان کردن بۆ سلێمانی.

## ڕەعناخان ١٩٣٠/٨/٢

ماڵەکانی پێنجوێن، لەسەر شێوەی پلیکانە، بەقەد شاخەکەدا هەڵچووبوون. کە لە پردەکە دەپەڕینەوە، چاومان بەتەلارێک دەکەوت، کە (خانوویش بوو)، ساباتێکی بەسەرەوە بوو. بەیانیان کە دەچووینە کن تافاوەکە، پەردەیەکی سپیمان دەدی، دەدرا بەبەر ساباتەکەدا. لەبەربەستکردنی هەتاوەکە لە هاتنە ناوەوە. لەوێدا ژنێک دەنوست. هەموو دەم لەبەردەم و دەورووپشتیا کارەکەر و نۆکەر دانیشتبوون. چاوەڕوانی فەرمانێکی بوون. ئەم ژنە کە ئێواران لەسەر ئەم سەریانە، لەسەر تەختێکی دۆشەک قەدیفەی مۆر دادەنیشت، وای لێ کردبووین، لە دەنگوباسی بپرسین و بنچینەیشی دەربخەین.

دوایی زانیمان ناوی (ڕەعناخان)ە و کچی (حاجی فەتاحی هەڵەبجەیی)یە، کە لە شاری (سلێمانی)یەوە هاتووە بۆ ئەوێ. ئێستە ژنی (ئەحمەد بەگی پاشا)یە کە برای (عزەت بەگی وەسمان پاشای جاف)ە. لە (هەڵەبجە)وە هاتۆتە (پێنجوین)، بۆ سەردان لە زەوی و زارەکانی و سەرپەرشتی کردنیان. خۆمان ڕانەگرت، چووینە کنی. بەنەوازشێکی زۆرەوە لەبەرمان هەستا، بەڕاستی ژنێک بوو، هەروەک لە بەرگا سەربەست بوو، لە قسەکردنیشدا سەربەست بوو، ئافرەتێکی ژیر و زرنگ بوو. هەرچی قسەیەکی دەکرد، لە مێشکێکی تەواوەوە دەهاتە دەرەوە. کچێکی هەبوو ناوی (شەمسەخان) بوو، لە تەمەنی دە سالیدا بوو. لەبەر نەبوونی خوێندنگای کچان خستبوویە خوێندنگای کوڕانی هەڵەبجەوە. لە ئەندازە بەدەر سەربەست و ئازا بوو. خانمیش، بەبۆنەی ئەوەوە گەلێ باسی خوێندنگای لە گەڵا کردین...

## هەرای کورد ١٩٣٠/٨/٣

چووینە لای (میرزا مارف). وەک کۆنە هەواڵی لابووین وا بوو. لە هەموو لایەکەوە هەواڵی کوردی بۆ هاتبوو. وتی: «بیستووتانە لەم چەند ڕۆژەدا لە کوردستاندا چی ڕووی داوە؟». گوتمان: نە». بۆمان بگێڕەوە. گوتی: «لە ڕۆژنامەدا دیومە: ئێرانییەکان بە (نامەردی) سیانزە ئاغا و سەرداری کوردەکانی شکاک و ڕەواندزیان بانگ کردۆتە سەر نانخواردن. لەو کاتەدا کە دەست دەکەن بەنانخواردن، بەفەرمانێک شەست تیریان لێ دائەبەستن. بە(سمایل خانی سمکۆ) و ئەوانی تردەوە دەیانگەیێنن بەبەهەشت. تورکەکان (٣٠.٠٠٠) کەسیان ناردۆتە (وان) بۆ کوژاندنەوەی هەرای کوردەکانی (تورکیا) کە داوای (سەربەخۆیی کوردستان) ئەکەن.

مارف بەگ جیاووک، کوردپەروەری بەناوبانگ، ئەو خواستنامەیەی کە کوردپەروەرەکانی هەولێر نووسیویانەتەوە بۆ «سەربەخۆیی (لا مرکزی)ی کورد، لە (ئەحمەد ئەفەندی)ی گەورەی ئاغاکانی (هەولێر)ی سەندووە، بەهەڕەشە: کە ئەگەر نەیدا گیانی دەردەهێنێ پاشان داویەتی بەڕاسپێرراوی هەرە گەورەی ئینگلیز. لە (ژیان)ی سلێمانیشدا خوێندمانەوە، کە ئافرەتە کوردەکان (تەلگوراف)یان بۆ کۆمەڵی گەلان (عصبة الامم) لێ داوە، ئەوانیش داوای مافەکانی کورد ئەکەن. ئافرەتەکانی سلێمانی کۆمەڵێکیان دامەزراندووە، پارەیان گرد کردۆتەوە. (۷۸۰) ڕوپیە، (کۆمەڵی زانستیی ئافرەتان)ی پێ ئەکەنەوە، تا بەئافرەتانی کورد بخوێنن!»...



ئێوارێ چەند باڵبازێکمان دی، لە باخەکانی پێنجوێنەوە بەتاو دەهاتنە خوارەوە، کە لێم پرسین، تێگەیشتم کە دوای دوو سەربازی (عەرەب) کەوتبوون، کە بەتێ و تفاقیانەوە هەڵاتبوون!... تا ئێستایش. گەلێک کەسی تر، بەتایبەتی (کوردەکان) ڕایان کردۆتە لای (شێخ مەحموود)... هەتا سبەینێش، هەروەها باڵبازەکان دوایان کەوتبوون، ئەیان دۆزیبوونەوە...

## مەلا محەممەد ئەمین

ئەو مزگەوتەی لە تەنیشت ماڵەکەمانەوە بوو، لە هەموو مزگەوتەکان خۆشتربوو. ئەمە ئەو مزگەوتەبوو کە (۲۲) شاگردەکەی تیابوو. ئەمانە لەژێر دەستی مەلایەکی باریکەلەی لاوازدا دەیانخوێند، ناوی (مەلا محەمەد ئەمین) بوو. چوومە لای، باسی خوێندنگامان هێنایە پێشەوە، مەلا، کە سەرنجم دا گەلێک قسەی نارێکی دەکرد. ئەیگوت: «منداڵ دەشێ لە پێشەوە خوێندنەوە فێرببێ، ئینجا نووسین...»، منیش پێم ڕادەگەیاند و تێم دەگەیاند کە ئەمە بیرێکی چەوتە. خۆ خۆیشی ئەوەی ئەزانی. بەڵام بۆ ئەمەی شاگردەکانی زۆرتر لای بمێننەوە و درەنگتر لای بڕۆن، بۆ کەڵکی ناپوختەی خۆی، ئەمەی دەگوت و دەیخستە مێشکەوە!... بەڵام مەلا بەوەی باش بوو پیاوێکی ژیر بوو. هەچ قسەیەکم بەلایەوە جوان بوایە، پەسەندی دەکرد و، وەری دەگرت... زمانی (فارسی)ی پێ دەگوتن... پێم گوت: «کە چوومەوە سلێمانی (ئەلف و بێ)یەکی کوردی و هەندێ نووسراوی ترت بۆ ئەنێرم وەک (مێژوو) و (ژمێر)، تا بەم منداڵانەی بخوێنی...»، مەلا قسەکەمی زۆر پێ خۆش بوو... بەڵام لەبەر ئەوەی حەزی لە نووسینی کوردی تازە، نەئەکرد کە بۆمان قورس ئەهاتە پێش چاوی، ڕێی نەدام «ئەلف و بێ» کوردییەکەی بۆ بنێرم!؟.

بۆ هەندێ نووسراوی کوردیم لێ پرسی، لە گەلێ شوێن بۆی پرسیار کردم، هیچی دەست نەخستم... پاشان نووسراوێکی دەستنووسی (خورشیدی خاوەر) و چەند نووسراوێکی کوردی ترە لە مەلایەکی کوڵ هەڵگر (حەمال) کە لای (نووری عەزیز)ی بەڵێندەر بوو دۆزییەوە... بۆ (مەلا محەممەد ئەمین)م هێنا بۆم بنووسێتەوە... نەیتوانی... بەڵام بەڵێنی پێ دام بنێرێ بۆ (مەریوان) کە ناوچەیەکە بۆ سەرگوزەشتە و نووسراوانی ناوازەی کوردی، لەوێ بۆم پەیدا بکات و، بۆم بنێرێ بۆ (سلێمانی)... جا نازانم چۆن سەرئەگرێ؟... هەروەها گفتیشی پێ دام، بەهۆی خزمێکیەوە، هەموو دە نامە نووسیم لە تەکا بکات. لە بابەت ئەم شتانەوە...

## حاجی عەلی ١٩٣٠/٨/٦

دەمێک بوو لە پێنجوێندا بووین. تەواو وەڕس بوو بووین. هەر خواخوامان بوو، ڕزگارمان بێ و بڕۆینەوە. لەو ڕۆژەدا کاروانی (سلێمانی) هات. دوو بارگیری باشمان بەکرێ گرت و بەخاوەن بارگیرەکانمان گوت کە شەوێ بێتەوە بەدواماندا. (حاجی عەلی)، کە پوورزای باوکم بوو هاتەوە. یەکی هەموو شتێکی خستین. بەتەواوی دڵم تاریک بوو. بەڵام بەتیشکی هیوایەک کە (حاجی عەلی) دایێ - لە بابەت چوونمانەوە بۆ دێهاتەکانی نزیک پێنجوین- دڵم ڕۆشن بووەوە. ئیتر وازم لە گەڕانەوە بۆ (سلێمانی) هێنا.

## سەیرانی چوارباخ ١٩٣٠/٨/٨

ئاخ چەند خۆشە ژیانی دیدەوانی (کشافە). دەمێک بوو بەئاواتی ئەوەوە بووم و لە (نوری ئەفەندی)ی هاوڕێم ئەپاڕامەوە کە بچین بۆ (چوارباخ)، تا لەوێ بەدەستی خۆمان خۆرشتی خۆمان دروست بکەین...

هاوڕێیەکم تازە لە سلێمانییەوە هاتبووە پێنجوین بۆ گەشتوگوزار بەو بۆنەیەوە کۆمەڵێکم ڕێک خست لە ساتی دووی ڕۆژەوە شتومەکمان بردە چوارباخ لەوێ بەدەستی خۆمان گۆشتەکەمان برژاند چاییمان لێنا نانمان خوارد. ئەوەندەیش شیرین گۆمان تیابوو، سەد ئەوەندە سەیرانەکە گەشەی سەندبوو. هەتا ساتی هەشت و نیو، لەنێو ئەو باخ و نزارەدا، بەژیانێکی کوردەوارییانەوە ڕامان بوارد، ئینجا هاتینەوە.

## کێلوو ١٩٣٠/٨/٨

کە لە (چوارباخ) هاتینەوە ماڵەوە. (حاجی عەلی)مان پێ گەیشت، لادێییەکی باڵابەرزی لە تەنیشتەوە بوو. (شێخ ڕەشید کوڕی شێخ عەزیز)ی ناوبوو. باوکی بە سێ بارگیرەوە ناردبوویە لامان کە بچینە لای. سات ئەبوو بە نۆ، سواریان بووین. بەناو دەشتی (قزڵجە)دا، کە ئەسپە ئاسنینەیش بەئاسانی پیا ئەڕوا ڕێگامان بڕی. لە ساتی دەدا گەیشتینە دێیەکی بچووک. گەلێک توتن و بێستانی لەبەرەوە بوو. چووینە ناو دێوە تا گەیشتینە بەر ماڵی (شێخ عەزیز)، کە گەورەی دێی (کێلوو) بوو... میوانداریيەکی جوانی کردین...

کوڕەکەمان خۆش بوو. چاوئەندازی دەشتە گەورەکان و شاخ و نزارەکەیش خۆشتری کردبوو. هەتا زەردەپەڕ، لەسەر ئەو سەربانە بەرزە دانیشتین. ئینجا چووین بۆ گەڕان. چووینە ناو بێستانەکانەوە. لەگەڵ توتنەکەدا گەلێک شتمان هاتە پێش چاو. هەندێ تروزیمان کردەوە و گەڕاینەوە ماڵەوە بۆ نانخواردن.

بەڕاستی (قوبولی و مریشک)یکیان لێ نابوو، لە شاریشدا هاوتای نەبوو. بێ ئێوە ناخۆش تێر و پڕمان خوارد. ئینجا کەوتینە باسی ڕاوەماسی و پەلەوەر (طیر)ەوە کە بەشەوی تۆف و باران، بەتاریکی، بەچرا ڕاو دەکرێن. پاشان قسەمان خستە سەر ورچ، کە خۆی دەگۆڕێتە شێوەی شوانی بزن و مەڕەوە، بۆ ئەوەی مەڕ و بزنەکان چەواشە بکات و بیانخوات!... شەوێ بەتەرحێکی وا ساردی کرد، بەو هەموو بەرگەوە کە لە بەرمان دابوو، لێفەیشمان دابوو بەخۆماندا، کەچی هێشتا هەر سەرمامان بوو!...

بەیانی لە گەرمی تیشکی رۆژ خەبەرم بووەوە. گەلێک سەیری ئەو دەشت و کێوەم کرد. ئینجا چوومە سەر کانی. ئاوەکەیان کزبوو. کەموکورییەکی زۆریشم لە جێگای خۆپاککردنەوە و دەستنوێژ شتنەکەیدا دی. لەوێوە بەڕاکردن چووینە سەر گردێکی بەرز کە پڕ بوو لە (گەوون) یاخود (گیا کەتیرە). ئینجا هاتینە خوارەوە چاییمان خواردەوە و دەستمان کردەوە بەقسەکردن تا حەلی ڕۆیشتن.

## مەسۆ ١٩٣٠/٨/٩

هەر لە چایی خواردنەوە بووینەوە، ئەوەندە نەمابینەوە. گورج بارگیرەکانیان بۆ زین کردین. سواربووین. ڕوومان کردە دێی (مەسۆ)، کە برای شێخ عەزیز، (شێخ سەعید) گەورە و خاوەنی بوو. ئەو دەشتی (قزلجە)یەمان بری. بەڵام بەداکێر و هەڵگێرێکدا ڕۆیشتین و بەناو زەوییەکدا بوو، کە هەموو لە بەردە سپی دروست بووبوو. کاتمان نەکرد بە ساتێ نزیکی دێیەکی سێ ماڵە بووینەوە. ڕۆیشتین هەتا سەرمان کرد بەماڵی (شێخ سەعید)، گەورەی دێی (مەسۆ)دا. جێگاکەی بڵندبوو. لەژێر ساباتێکدا دانیشتین کە بەسەر هەموو دێیەکەدا دەینواڕی. ئەم لە کاکی قسە خۆشتر بوو. بەبەزم و پێکەنین بوو. لە پڕ باسی (نووسراوە کوردییەکان) هاتە پێشەوە. گوتی: «من نەخوێندەوارم. بەڵام چیرۆک و سەرگوزشتەی (فارسی)م هەیە کە گەلێ گەورەن. بەشەو بەشاگردێکی خوێندنگای دەخوێنمەوە. کاتی خۆمی پێ ڕادەبوێرم». هەر ئەوەندەم زانی ناردی نووسراوەکانیان هێنا. مێژوو و جوغرافیای هەموو سەر زەوی بوو. هەموو تەرحە قسەیەکی شیرین و سەیری تیابوو. تەنانەت باسی مێژووی کوردستانی تیابوو. سەیر ئەوەیە (نادر شاهی ئێران)یشی بە(کورد) دانابوو. هەروەها (کەلیلە و دیمنە)یشی تیابوو...

منیش لێم پرسی: «ئەی نووسراوی کوردیت نییە؟» گوتی: «هەمە. بەڵام لێرە نین. لە دێی (باشماخ)ن. لای شاگردێکن. دەیانخوێنێتەوە». منیش ئارەزووی دڵی خۆم پێ گوت. کە چەندە هەوڵ ئەدەم بۆ ئەوانە. پاشە جار هەر سێ نووسراوەکەی پێ بەخشیم: (حەوت ڕەزم)، (یانزە ڕەزم)، (خورشیدی خاوەر). بەڵێنیشی دامێ کە پیاو بنێرێ و بیهێنێتەوە. لەوێشەوە بۆم بنێرێتە پێنجوێن.

***

ئەم دێیە ئاوەکەی لە ئاوی (کێلوو) گەرمتر و سازگارتر بوو. بەڵام دێیەکی گەرمی کەم ئاو بوو. ئاوەکانی بەگران زەوییەکانی دێیەکە ئاو ئەدەن. هیچ باخیان نەبوو. هەرچی تیا ڕوێنرابوو بریتی بوو لە چەند پارچە توتنێک و بێستانێک.

کە لە (کێلوو) بووین، لەبەر ئاو کەمی، ئاویان بەناو داری کلۆر یاخود کوڵراودا کێشابوو، بەبەردەم شوێنی دەستشۆرەکانی سەر کانیدا. بەڵام لێرە بۆ ئاوخواردنەوە لە کانییەکە پارچە دارێکی ئاو کوڵراوی دەسک دار بەکارئەهێنن. دارەکە داری بی بوو.

ساتی نۆهەمی ڕۆژ، دەستمان کرد بەجووڵان. ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە کانییە ئاوێکی سارد. (شابە)یان پێ ئەگوت. ئاوەکەی گەلێک خۆش بوو. لێمان خواردەوە. چووینە سەر بێستان لەوێش هەندێ شتمان خوارد. پاشان (شێخ سەعید) گەڕایەوە دێ. پەیمانەکەیم بیرخستەوە. وتی: «لە بیرم ناچێ».

ئینجا ڕۆیشتین تا گەیشتینە گوێ ئەو چەمەی کە بەدەشتە گەورەکەی (قزلجە)دا دەڕوا. لەو بەریەوە (گاڵ)یکی زۆر چێنرابوو. ئەمەم هێشتا نەدیبوو. لە (حاجی عەلی)م پرسی. گوتی: «ئەمە لێرە نەکری بەنانە». پاشان لە بابەت کەڵکی (بەلەک)ەوە پرسیارم لێ کرد. گوتی: «ئەمەیش ڕەگەکەی دەهێنن، دەی کوڵێنن، تا دەبێ بەدۆشاو. ئینجا هەچ کەسێ بارگیرەکەی زامدار بێ بەو دۆشاوە چاکی دەکاتەوە».

بێجگە لەوە، گوتی: «ئەم دەشتە، لەگیا و دار و دەوەندا، جیاوازی لەگەڵ دەشتی پێنجوێندا نییە. ئەمیش وەک ئەو: (کەتیرە) و (سەعلەب) و (بەلەک) و (دارمازوو)ی هەیە. کە نیشتەنی ئەم ناوە لەسەر ئەو بەرهەمانە ئەژین...».

ئینجا هەر بەم تەرحە لە بابەت (سەعلەب)یشەوە دەستی کرد بەقسەکردن. گوتی: «سەعلەبیش گیایەکە وەکو (گەوون). دێن وەکو (بن گۆزروان) بنکەکەی هەڵدەکەنن، کە وەک (توور) وایە، لە ناویا دەنک هەیە. لێی دەردەهێنن. دەی کوڵێنن. هەتا ئەو چڵک و توێکڵەی پێیەوەیە لێی دەبێتەوە. ئینجا هەڵی دەخەن. هەتا وشک دەبێتەوە. ئەوسا بەناوی (سەعلەب)ەوە دەیبەن بۆ شار کە خەڵکی بۆ (هەلامەت) و بۆ (بەستەنی) و بۆ گەلێ شتی تر بەکاری دەهێنن». (حاجی عەلی) هێشتا ئەم قسانەی تەواو نەکردبوو، گەیشتینە پاڵەکەی (پێنجوێن). ئیتر داگەڕاینە خوارەوە بۆ ماڵەوە.

## پێنجوێنی ڕەنگین

پێنجوێن ڕەنگینە. بەڵام هەر بەبا و ئاوە خۆشەکەی نا. هەر بەباخ و باخاتە جوانەکانی نا. بەڵکو بێجگە لە ڕێکوپێکیشی شتێکی تری هەیە، کە خوا لەو حەلەدا بەهەموو شوێنێک ئەو ڕەنگینییە نابەخشێ، کە ئەویش کەشی (بەهار)ە. بەڵام لە هەمووان زۆرتر ئەو جوانییە بەپێنجوێن ئەبەخشێ.

بێجگە لەم هەموو دار و درەخت و نزار و مێرخوزارە، چەمەن و لالەزارێکی هەیە، لە نیگاری ڕووی یار ئەکا، کە ئەویش هەر لە بەهاردایە، کە خۆی ئەڕازێنێتەوە. دەبینی ئەم شاخانە بەڕەنگی سەوز و سوور و، شین و ئاڵ و زەرد و بەنەوشەیی ڕازاونەتەوە. ئەم ئاوانەیش بەقەد و بەدامێنی ئەو شاخانەدا تاف تاف ئەکەن. (بلبل) لە تاو پێکەنینی (خونچە) دەناڵێنێ. کەو قاسپە قاسپ ئەکا، شەهێن چریکە ئەکا، چیاکەیش وەک ( حاجی قادری کۆیی) فەرموویەتی وایە:

«چیایە شێخ و کەوا سەوز و مێزەری بەفرە
سیواکی چووزەرە ڕێواسە تەیلەسانی گەڵا»

لەناو ئەم گوڵانەدا، گوڵێک هەیە باڵا بەرز، گوڵێکی زۆر بچووکی هەیە، ئەمەندە سووتاوی پێکەنینە، کە پێ دەکەنن، بەسەر تەوقی سەردا، لەو لێ و پۆیە بەرزەیەوە ئەکەوێتە خوارەوە، دەبێتە خۆراکی مار و مێروو...

گوڵێکی تریشی هەیە ڕەنگ زەردی زێڕین، دەڵێی لیرەی سەری یارە. قەدی کێوەکان و ناوەڕاستی باخەکانی ڕازاندۆتەوە. پیاو کە بەلایدا دەڕوا، خۆی پێ ڕاناگیرێ، هەر دەبێ گوڵێکی لێ بکاتەوە و لە هەموو بۆنێکی خۆشی بێگانەیش دەست بەردات. تەنانەت ئەمەندە گوڵێکی ناسک و بۆن خۆشە،

ئەمەندە گوڵێکی ڕووخۆش و بەسەزمانە، هەنگیش بۆی جگەر سووتاو بووە، بەتەرحێکی وایش هەراسی پێ سەندووە، هەر بەناوی ئەوەوە ناویان ناوە (گوڵە هەنگ).

لە ناوەند ئەم دوو گوڵە زەردەیشدا، گوڵێک هەیە، وەک چناری باڵا بەرز چووە بەئاسماندا ڕەنگێکی ئەرخەوانی هەیە. هەرچەندە بۆنی نییە. بەڵام ڕەنگە شەنگەکەی و قەد و باڵاکەی لە هەموو گوڵەکانی کەی نازدارتر کردووە. بەیانیانی بەهارانیش، بلبلی جگەر سووتاو، بەسەر چڵی گوڵێکی شۆخ و شەنگەوە دەناڵێنێ، دەچریکێنێ، لە پڕ لە بەیانیدا دەفڕێ. چونکە دۆستە دڵ ڕەقەکەی، لایەکی لێ ناکاتەوە، زەردەخەنەیەکیشی بۆ ناکات. کەچی ئەو هێشتا ناگاتە سەر چڵە گوڵێکی تر، بەهەڵاتنی پێ دەکەنێ!... ئەو بۆنە خۆشە دەدا بەبای بەیاندا. کوشتە بێ بەش ئەکات، ئەکوژراویش بەشدار ئەکات. ئەمەیش گوڵە باخێکە لە قەد شاخەکانی (پێنجوین)دا دەردێ. نیوەی ڕەنگی سوورە. نیوەیشی سپی.

ئەمەندە و لە گوڵە باخە زەردە بۆن خۆشەکەیشی پێویست ناکات زۆر بدوێم. چونکە ئەوەندە نازەنین و خۆشەویستە، پێنجوینییەکان لێی دەنێن و ئەیکەن بەشیرینییەک بۆ سەر خوانێکی ناوازە دەست بدا.

## کوڕەکانی حامد بەگ

لەم ناوەدا کە من گەشتم دەکرد، کوڕەکانی (حامد بەگی مەجید بەگی هەڵەبجەیی)ی بەناوبانگیش بەناوی گەشتەوە هاتبوونە (پێنجوین). لەگەڵ وردی و منداڵیشیاندا، پیاو دیسانەوە حەزی ئەکرد لەگەڵیاندا بسوورێتەوە. برا گەورەیەکیان هەبوو، ناوی (ئەنوەر بەگ) بوو. ئەوەندەی ئێسک سووک بوو، ئەوەندەیش شیرین گوفتار و نازەنین کرداربوو. جا لەبەر ئەو خووانەی بوو، کە من چاوم لە تەمەنی منداڵی پۆشیبوو... ئەم کوڕە بەتەرحێکی وا نازی دەگرتم و، بەشێوەیەکی وا قسەی لەگەڵ دەکردم، چارەم نەمابوو ئەوە نەبێ، کە هەموو دەم کاتی خۆمی لەتەکا بەخت بکەم. بێجگە لەوە دڵی خۆیشم بەرمە دڵیەوە. منیش بەتەرحێکی وا چووبوومە دڵیەوە، کە ڕۆیشتمەوە بۆ (سلێمانی)، نیشانەی خەفەت و نازارم لە دەموچاویا بەدی کرد. تەنانەت گەلێک لێم پاڕایەوە، بەڵام خۆشەویستانە و برایانە، کە چوومە (سلێمانی) سەری (هەڵەبجە) بدەم. تا بە ئارەزووی خۆی تێر لەگەڵما ڕابیوێرێ و دێهات و باخاتی ئەو ناوچەیەشم پیشان بدات. بەوەیش وازی نەهێنا، ناوونیشانمان لەگەڵ یەکتردا گۆڕییەوە، کە هەموو دەم نامەکاری لەگەڵ یەکتردا بکەین. بەڕاستی ئێستاکە زۆر بیری ئەکەم، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە پەیمانی دامێ هەوڵم بۆ بدات و (نووسراوانی کوردی)م بۆ پەیدا بکات و بۆیشم ڕەوانە بکات بۆ (سلێمانی).

## چیم چنگ کەوت؟!

هێشتا بەتەنیا، (کەسی خۆمم لەگەڵ نەبووبێ)، وا نەچووبوومە دەرەوە. بەم جۆرەیش نازاری ڕێگا و ناخۆشیی گەرمام نەچێشتبوو. کەسیانم نەدەناسی، (نوری ئەفەندی) نەبێ، کە ئەویش هەم خزم بوو، هەم هاوڕێ. لەگەڵ ئەمانەیشدا ڕۆژەکە وای لێ کردم، ڕێیەکم دۆزییەوە. هاوڕێم پەیدا کرد. بەرگەی هەموو ناخۆشییەکم گرت و بەدەمیەوە پێکەنیم. توانیشم خۆم لە گەرما ڕزگار بکەم. کە گەیشتینە (پێنجوین)،

خۆمان خەمی خۆمان دەخوارد. لەبەر ئەوە ناچاربووین، قسەی خۆش و جوانمان کردە خووی زمانمان و، دڵی خەڵکمان ڕاکێشا. زۆربامان کردە خۆشەویست و دۆستمان کە هەموو دەم بەدوامانەوە بوون و، لە خۆش ڕابواردندا یاریدەیان ئەدایین. بەدەستی خۆمان چایی و پێخۆرمان ئامادە ئەکرد. هەروەها ڕێکوپێکی ماڵمان پێک دەهێنا. دەستمان دایە نانداں و بەخشین. لەمەدا بەجۆرێکی وا سەرکەوتین، کە هەموو هاوڕێ و ئاشناکانمان کردبووە نزاگۆ و خۆشخوان بۆ خۆمان، لە یارمەتیدان و پیاوەتی دریغیان لێ نەدەکردین.. جا لەمانەوە فێری پێڕەوی کۆچکردن و ژیان لەناو بێگانانەدا، پشت بەخۆ بەستن، شێوەی قسەکردن، دڵی خەڵک ڕاپێچ کردن بووین. کە هەر لەو کاتەیشدا بیر و لەشمان دەحەسانەوە و گەشەیشیان دەکرد.

لەو تەرحە پیاوانە، لەو شوێن و جێگایانە، لەو ڕەوشت و خووانەی کە لە پێنجوێندا دیمان، بەسەرنج لێدانیان و بەراوردکردنیان لەگەڵ هی سلێمانیدا، مێشکمان بەهێزتری لێ هات. هێزی بیرکردنەوەمان گەورەتری لێ هات. بەمە خووەکانی خۆمان لە بێژنگ دا و خاوێنیشمان کردنەوە.

کە بێینە سەر باسی خوێندەواری: گەلێ زانیاریم لە بابەت (نووسەرانی کوردی)یەوە دەست کەوت. تێیش گەیشتم کە (نەتەوەی کورد) تا چ ئەندازەیەک بۆ زمانەکەی خۆیان بەپەرۆش بوون و چ ڕەنجێکیشیان لە پێناو پێشکەوتنیا داوە. کەچی لەوەپێش وام دەزانی، کە (کورد) لە هەموو گەلەکانی پاڵ خۆی کەم تەرخەمترە لەگەڵ زمانەکەی خۆیدا!... ئەگەر لە (مەریوان)ی و (کوردی ئێران) بپرسیت ئەوسا دەزانیت کە (کوردەواری) چیرۆک و سەرگوزشتەی چۆنی هەیە و چەندی هەیە. ئەمانە: (حەوت ڕەزم، یانزە ڕەزم، حەوت لەشکر، خورشیدی خاوەر، حەوت دەروێش، شانامە، دیوانی ماهشەرەفخانی ئەردەلانی، دیوانی بابە تاهیری هەمەدانی...هتد)، هی وایان تیایە بۆ لێ وردبوونەوە، بۆ خۆش ڕابواردن، بۆ فێربوونی شێوەی ژیان، لە چیرۆکەکانی (ئەوروپا)ییەکان چاکتر نەبێ، کەمتر نییە!...

## گەڕانەوە ١٩٣٠/٨/١٠

ئەو شەوەی دەڕۆیشتم، چوومە لای هەموویان. ماڵئاواییم لێ کردن. لە هەموویان زۆرتر لای کارگێڕ مامەوە. چونکە سێ نامەی نووسی بۆ سەرداری سلێمانی و خزمەکانی. دەسی کرد بەخوێندنەوەی ڕۆژنامەی (ژیان) کە دوور و درێژ باسی (هەرای کوردستانی ژوورروو)ی دەکرد: سەرکردەیەکی گەورەیان هەیە، ناوی (جەنەراڵ ئیحسان نوری)یە. هەموو سەربازەکانی لەسەر شێوەی سەربازی تازە تیپ، تیپ کردووە. دەستەی تۆپ و شەستیر و قسەکردنی بۆ داناون، بەجۆرێکی وا کە لە هی سەربازی (تورک) کەمتر نەبن. دوو فڕۆکەیشی لە (تورک) داگیر کردووە... ئەو شەوە بەدڵێکی پەشێواو نوستین تا بەیانی. لە ساتی یانزەهەمدا، خاوەن بارگیرەکان هات. لەگەڵیا سواربووین. دەستمان کرد بەغارکردن. هەتا سێ چارەکە ساتی تەواو غارمان کرد، ئینجا گەیشتینە هاوڕێکانمان کە بەجێیان هێشتبووین. ئێمە (٢٤) کەس بووین. سوارە کاروانەوانەکان نەبێ، هەموومان، بەسەر ئەو شاخە درێژ و بڵندەی (تاریبەر)ەدا سەرکەوتین. لە تەوقە سەرەکەیەوە ئەو هەموو دەشتی (قزڵجە)یەمان هاتە پێش چاو. چەمەکە لەناویا، هەر لە ئاوێنە دەچوو. چونکە تیشکی ڕۆژەکەی ئەدایەوە... داگەڕاینە خوارەوە، هەتا گەیشتینە

چایخانەکەی (بادانە). دەمە ساتێک خۆمان لەوێ حەساندەوە. دەسمان کردەوە بەڕێین تا گەیشتینە چایخانەکەی (زەلان) کە ئەو حەلە سات خۆی لە پێنج ئەدا. لەوێ نانی چێشتەنگاومان خوارد و هاتین بەڕێوە. گەرما و با گەرمەکەی (چەمی ولیاوا)مان چێشت. ئەسپەکانمان لە تاو ماندوویتی و گەرما دەمە داچەقێیان پێ کەوتبوو. هەرچەند لێمان دەخوڕین، بەسزمانانە گوێیان نەئەداینێ!. دوایی خۆیان فڕێدایە ناو چەمەکەوە تا فێنک بوونەوە و حەسانەوە... ئینجا دەسمان کردەوە بەڕێین، تا کاتی هەشت و نیو لە دەست قرچە قرچی گەرمای مانگی گەلاوێژ (ئاب)، لە نیوەڕۆدا، ڕزگارمان بوو. خۆمان کرد بەچایخانەکەی (قەمیاسە)دا. بەلام تەواو پەشۆکا بووین. هەر ئەوەندەمان پێ کرا خۆمان ڕووت کەینەوە و، بەبەفراوەکەی شاخی (کەتوو) هەناومان فێنک بکەینەوە. چەند جگەرە کێشێک لە پێش هاوڕێکانماندا گەیشتبوونە ئەوێ. لەبەر ئەوە بەتەواوەتی حەسابوونەوە، چاییمان خواردبووەوە ئینجا گەیشتن بەسەرماندا.

لە تاو خەو جێم بەخۆم نەدەگرت. وەنەوزێکم بۆ دا. سەرم نایەوە. دوایی زرەی زەنگولەی بارگیرەکان و دەنگە دەنگی کاروانەوانەکان خەبەریان کردمەوە. کە تەماشای کاتژمێرەکەمم کرد، سات خۆی دابوو لە دە و نیو. بەگورجی هەلسام و دەموچاوم شۆری و دەسی (نوری ئەفەندی)م گرت بەزۆر ڕام ڕفاند، هەستا بە(٢٥) وردیلە ڕۆیشتن گەیاندمە یەکەم (ڕەزی چنگیان). کە تەماشامان کرد بەدەمیەوە نەمابوو بچینە ناو دێیەکەوە. چونکە چەند هاتبووین ئەوەندەمان دەویست بیگەین. لەوێ پشوویەکمان دا. لەژێر کەپرێکی بچووکدا دانیشتین. مندالە ڕەزەوانەکە هاتەوە. باوشێکی گەورە تریی ڕەنگاوڕەنگی هەلگرتبوو. کە بەدەستە ڕاستا ناوڕێکم دایەوە، لە پڕ ئەو شاخە گەورە و فراوانەی (چنگیان)م هاتە پێش چاو، کە بستێکی نەمابووەوە نەکرابێ بەڕەز... لە ناوەڕاستیشیا دێیەکی شەست مالی بەقەد پالەکەوە خنجیلانە هەلکەوتبوو، ئەویش (دێی چنگیان) بوو. لە پرسیارێ کە کردم، پێیان گوتم: ئەو دێیە هەتا سێ چارەکە ساتیش بەهەر چوار لایدا بڕۆی، هەر ڕەز دەبینی، کە یەکەم دێیە و بۆ ترێ زۆری لە هەموو شارباژێردا... بێجگە لەوەیش: هەنجیر و هەلووژە و هەرمێیش لە پێش هەموو دێیەکدا دەبێتە خۆراکی دێهاتانی تر و شاری سلێمانی... لە شارەوە بۆ دێیەکە ڕێیەکی پان دەچوو، ئەویش بۆ ئۆتۆمبێل کرابوو. ئەم دێیەش بەشی (شێخ مەحموودی گەورە)ی تێدابوو. هەر جارێکیش شتێکی ناوەند خۆی و ئینگلیز ڕوو بدات، (شێخ) دێتە (چنگیان)... ڕۆژ ئەوەندەی نەمابوو ئاوا بێ. گەڕاینەوە. هەندێ ترێشمان بۆ هاوڕێکانمان برد. لە ڕێ گۆرانیمان گوت. لە خۆشیدا هەرامان ئەکرد دەستارێکی زلم بەدی کرد. لە هەموو گۆرانی و هەراکردنێکی خستین. لە (نوری ئەفەندی)م پرسی گوتی: «ئەمە شاخی (کەوتوو)ی پێ دەلێن. هەرچی دەستار و بەرداشی ئاش هەیە لێرە دروست ئەکرێ».



ئێوارێ نانمان خوارد و هەر ئەوەندەمان زانی دەنگی دوور سێ پیاو دەهات، کە بەدەنگێکی بەرز چاکەی شاگردانی خوێندنگاکانیان دەگێڕایەوە، کە لە سلێمانیدا، لە پێناوی (سەربەرزی کورد و کوردستان)دا چۆن خەباتیان کردووە. هەلسام، چوومە خوارەوە. کابرا هەر لەسەری دەڕۆیشت. دەیگوت:

«ئیمرۆ هەموو خەڵک لە سەرادا کۆبووبوونەوە. داوای مافی کوردیان لە ڕاسپێراوی هەرە بڵندی ئینگلیز کردبوو. (فائق بەگی تاپۆ)یان هێلکە باران کردبوو. چونکە خەریکی چاوڕاوێک بووە، کە بێگانە حەزی پێ کردووە!...» شەو ساتی شەشەم بوو، لێمان دا ڕۆیشتین. مانگە شەویش تریفەی دەهات. ئەو دەشت و شاخە کاکی بەکاکییە، بێدەنگی داگیری کردبوو. سرەوی بایش نەدەهات. هەر دەنگی ئێمە و زرەی زەنگوڵەی بارگیرەکان نەبیسترا. کەوتینە سەر تەوقەسەری کێوێک. کانییەکی لێ بوو. (کانی سازندە)یان پێ نەگوت. لەوێش تێپەڕبووین. بەدەشتی ( مامە سوبحان)دا هاتینە خوارەوە تا گەیشتینە چایخانەیەکی خۆش... نان و ماست و چاییمان خوارد. لەوێ وەستاین تا گەیشتینە شاخی ڕەنگینی گۆیژە. بەڵام چیمان دی؟! دیم لە دوورەوە، لەناو دۆڵێکی فراواندا، کۆمەڵێک گەوهەر ئەدرەوشانەوە. وەک ئەستێرە جریوەیان لێ ئەهات. شێوەی دەمانچەیەکی جوانیان دروست کردبوو. سەد ئاخم خوارد کە وێنەگرەکەم بەدەرەوە نەبوو، تا ئەو چاوئەندازە گەوهەرینەی پێ بگرم. لەناو ئەو تاریکاییەدا. چونکە هەر وەک بەڕەنگ گەوهەرینە، لە ناویشا و لە دەریشا کانی گەوهەر و بەردی بەنرخە. چونکە (سلێمانی) پایتەختی فەرمانڕەوایی (بابان) بووە. ئەو فەرمانڕەواییەی کە نزیکەی دوو ملیۆن کوردی لەژێر دەستا بووە. گەلێک جاری وا بووە (کوردستان)ی لە دەست (تورک) و (عەجەم) سەندۆتەوە. چونکە (سلێمانی) ئەو شارەیە، کە (گیانی کوردایەتی)ی وەک کانی بەهاران هەڵئەقوڵێ. مامۆستای (کوردایەتی)ی زۆربەی (کوردان)ە لە (کوردستان)دا. ئێستاش وا (کوردایەتی) خەریکە هەر لەم شارەوە، پرشنگ پەخشان بکات بەناو هەموو کوردستانی گەورەدا و ڕێگای ئازادی و سەربەرزی ڕۆشن بکاتەوە بۆ کوردەواری.

***

تا لە چایخانەکەدا ماندوومان حەسایەوە، شەو هەڵات و لە جێی ئەویش ڕۆژ هەڵ هات. ئۆخشەبێ لە کوردستانیش ئاوا ڕۆژی کامەرانی و ئازادی تیا هەڵبێ. هاوڕێکانم سپارد بەخوا و لێیان جیابوومەوە. ئیتر هەر بەغار ڕۆیشتم تا بەدیاری (شارە خۆشەویستەکەم) و دایکم و باوکم و دۆست و برادەران شادبوومەوە... ئۆخەی!...

شاکر فەتاح/ سلێمانی

«شاگردی پۆلی سێهەمی خوێندنگای دووەمینی بەغدا»

١٩٣٠/٨/١٢

## سەیرانی فەللوجە[1] .بەبۆنەی هاتنی ساڵی تازەوە. ١٩٣١/١/٢

بەری بەیان بووەوە، تازە چۆلەکە جریوە جریوی دەست پێ کردبوو، سەعات شەشی لێدا، لە خەو هەڵسام... کاە جلم جوان بوو خۆمم پێ ڕازاندەوە، کە گەیشتینە بەر قوتابخانە مامۆستاکەمانم بەخۆی و چەند قوتابیەکەوە بەسواری ئۆتۆمبێلەوە دی، ئێمەش سوار بووین، لێمان دا ڕۆیشتین.

هەر چارەکێک بوو لە پردی (خر) تێپەڕبووین لەولاوە وەستاین و دابەزین، لەو مێوژ و گوێزەی لە کوردستانەوە (سلێمانی) بۆم هاتبوو بەشی هەر چواردەیانم دا... ئیتر هەر باسی خواردەمەنی سلێمانی کرا هەتا گەیشتینە پردی (سرکر)؛ ئێرەش پردێکە ئەو ئاوە جوانەی بەژێردا تافە تاف دەکا و وەکو قەڵبەز دێتە خوارەوە بەسەر پلیکانەکاندا کەف و کوڵ دەکا، کاتێ پیاو گوێی لە هاژەی کەر بێ قسەی کەسی گوێ لێ نابێ[2]!... کاتەکەی دوایی پاییز بوو، با سارد، بەری ئاسمان بەپەڵە هەوری ژەنگار بەتیشکی ڕۆژ گیراوە، درەختەکانی گوێ چەمەکە لەبەر بێ بەرگی سەرما دەچێژن، چۆلەکە و پۆڕ بەتاق تاق بەسەریانەوە دەبینرێن؛ هەندێکیشیان لە تاوا بەکزۆڵەیی سەریان ناوەتە ژێر باڵیانەوە، لەناو چڵەدار و وشکەپووش و گەڵای دارەکاندا لە ترسی سەرما و ئەم و ئەو خۆیان شاردۆتەوە!!...

(١) ئەم دەفتەری یادنامەیەی مامۆستا کە لە ١٩٣١/١/٢وە دەست پێ دەکات و لە ١٩٣١/٧/٩دا دوایی دێ، لە ساڵی ١٩٨٤دا بەشێکی لە ژمارەی نامیلکەیەکدا بەناوی (خەباتی ڕۆشنبیران)ەوە لە چاپ داوە: (بڕوانە - شاکر فەتاح: خەباتی ڕۆشنبیران، چاپخانەی، الحوادث، بەغدا ١٩٨٤). ئەوەی جێی سەرنجە لێرەدا ئەوەیە:

ا- لەسەر لاپەڕەیەکی پێشەوەی دەستنووسەکە، بەقەڵەمێکی سوور، لە سووچی سەرەوەی نووسیویە: (لێی چاپ کراوە بەناوی خەباتی ڕۆشنبیرانەوە)، کە دیارە ئاماژەکردنە بۆ ئەوەی کە (هەموو) بابەتەکانی دەستنووسەکە چاپ نەکراوە.

ب- دەتوانم بڵێم کە تەنیا لە سەدا چلی دەستنووسەکەی خستۆتە ناو (خەباتی ڕۆشنبیران)ەوە، ئەوانی دی لەبەر هەر هۆیە کبێ پشتگوێی خستوون و لەلای ناونیشانەکانیانەوە نیشانەیەکی(×) داناوە.

ج- دەستکاری ناونیشانی هەندێ بابەتی کردووە، لە جێی خۆیاندا ئیشارەتیان پێ دەدەم، یەک دوو باسی خستوونەتە سەر کە من لە ئەسڵی دەستنووسەکەدا نەمدیون.

د- دەستنووسەکە (١٥) وێنەی فۆتۆگراف و چاپکراوی تێدابووە، لەوانە حەوتیان فەوتابوون؛ جێگاکانیان دیاربوو، هەندێکی کەشیان بۆ چاپکردنەوە دەس نادەن: چونکە بەشێوەیەکی کۆن و بەئامێری باش نەگیراون.. نادیارن.

هـ- وام بەچاکتر زانی دەستنووسەکە (هەمووی) تێهەڵکێشی (ناوێنەی ژینم) بکەم و وەک بەشێکی گرنگ لەو قۆناغەی ژیانی.

و- لە پەراوێزەکاندا وشەی (نامیلەکەکە) مەبەستم (خەباتی ڕۆشنبیران)ە.

ز- ساڵی ١٩٣٠-١٩٣١ ساڵی کۆتایی خوێندنی مامۆستا بووە لە (ئامادەیی مەرکەزی) لە بەغدا، چونکە بەپێی دەستووسی (یادنامەکانی ١٩٣٢) مامۆستا دەچێتە (بڕومانا - لوبنان) بۆ خوێندن.

(٢) مامۆستا ئەم ڕستەیەی دوایی وەک تواڵجێ گرتۆتە ناوی پردەکە، چونکە بەکوردی (سەرکەر)ی نووسیوە.

وێنەی گەشتی «فەللوجە»

ڕۆژەکەی سەیران؛ دڵ حەزی لە گەشت، لەش ئارەزووی بزووتنی هەبوو. هەر ئەوەندەم زانی مامۆستاکەمان تفەنگەکەی کردە شانی بەگەلەیەک قوتابییەوە ڕووی کردە دەشتەکە، ڕاوی ئەو مەلە بەسەزمانانە بکا! منیش ئارەزووم لەوان کەمتر نەبوو بۆ ڕاو، باوجود ڕۆڵەی ولاتێک نەبووم هەمیشە ڕاوی تیانەبێ؛ بەهەڵەداوان خۆم گەیاندنێ، نزیکیان نەبوومەوە بەتەواوەتی، تەقەیەک هەڵسا، مەلێکی ڕەنگاوڕەنگ (پۆڕێک) لە حەواوە سەر نەنگرێ بوو، کەوتە سەر زەوی و هەرام کرد، سەرم بڕی و گرتم بەدەستمەوە؛ مامۆستاکە ڕووی تێ کردم:

- ئەوا ئەم مەلە لەبەر تۆ دەکوژم.

هەر ئەوەندەم زانی تفەنگ تەقی و لەولاوە پەلەوەر کەوت، گەیشتم بەسەریا کە دەبینم مەلێکە ڕەنگین، لە هەر تەرحێک دەنوێنێ، وەک بووک ڕازاوەتەوە، بۆیە پێی دەڵێن: «بووکی ناوباخ»[1] ئەمە وا، ئینجا هاتینەوە هەوار، بەئارەزوویێکی بێ شومارەوە لە گوێ ئەو ئاوە ئاوێنەییە دەستمان کردە نانخواردنی، وەکو هەزاران ڕۆژ پێکەوە نانمان خواردبێ، بەکەیف و پێکەنینەوە سکمان تێرکرد... ئینجا سوار بووین، بڕۆ، هەتا گەیشتینە (فەللوجە).

ئێرەش دێیەکە بەڵام گەورە، لە شێوەی لادێدا پیس و پۆخڵ، ناڕێک و پێکی بەئاشکرا تیا دەردەکەوت... کەچی ئۆتۆمبیل، ئەلەکتریک، قوتابخانەی ڕێکوپێک لەسەر شێوەی تازە، پردی ئاسنین بۆ هاتوچۆی ئۆتۆمبیلە گەورەکانی ناو شام و بەغدا... ئەم هەموو شتە سەیرانە لەو دێیەدا دەبینران!!

(١) ئەو مەلە بەعەرەبی (عروس البستان)ە.

بێگومان لەمەو دوا دەبێتە شارێکی زۆر پاک و خاوێن، جوان، گەورە، ڕێکوپێک؛ چونکو لەسەر ڕێگای کڕین و فرۆشتنی عێراق و سوریەیە... هەموو شتێ کە لە شامەوە بێت دەشێ بەسەر فوراتدا، بەسەر ئەو پردەی فەللوجەدا بڕوا. ئێرە وا و کەچی سلێمانیش هێشتا قوتابخانەیەکی تازەی تێدا نییە کە لەسەر شێوەی جوانی، پاکی، ڕێکی شێوەی ڕۆژئاوایی بێت.

فەللوجە دێیەکە قایمقامی تیادەنیشێ، سولەیمانیش شارە، موتەسەریفی تیا دادەنیشێ؛ حەلی خۆی پایتەختی بابان، هەواری زانین و زانستان بووە. بۆنەی دیارە[1]، ئیستیعمارە، خوا موستەعمیرین بکا بەپارە پارە؟!، ئەمەش باسمان نییە، لەوەپاش گەڕاینەوە و گەلێ وێنەمان گرت، بە تەواوەتی لەشمان، هۆشمان حەسایەوە، دڵمان کرایەوە، کەڵکەوەر بووین... تێشکەیشتین!...[2]

## هەواڵی سلێمانی لەم مەنگەدا

هاتنەوەی سەر کۆمارەکان:[3] مەحموود جەودەت و حامیدی برای[4] لەلای شێخ مەحموود ڕەنجەڕۆ

(١) وشەی (بۆنە) بەمانای (هێز)ی بەکارهێناوە.

(٢) فەللوجە: شارۆچکەیەکە (ئێستا بۆتە شار أ.ب) کەوتۆتە بەری ڕۆژهەڵاتی فوراتەوە، بەرۆخانەی ڕووبارەکەدا، مەرکەزی قەزایە و سەر بەپارێزگای (ڕومادیە - الانبار)ە، پردێکی ناسنی تێدایە. لە بەغداوە بە ٥٨ کیلۆمەتر دوورە، ڕێگایەکی قیر پێکیانەوە دەبەستێ، هەر لێرەوە لقێکی لێ دەبێتەوە بەرەو ئەبوغرێب و کەلاوەکانی عەقەرقوف.

دەشێ ناوی (فەللوجە) لە عەرەبیدا لە ناوی جێگایەکی کۆنەوە هاتبێ کە لە سەرچاوە بزماریەکاندا بە(بلوکتو) و ئارامییەکاندا بە(بلوکتا) هاتووە. (طەبەری)ش لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢ک-دا ناوی هێناوە، هەروا (یاقووت) بە(فلا لیبع السواد) ناوی بردووە؛ بەتایبەت ناوی دوو فەللوجەی بردووە: گەورە و بچووک... دیسان (حاجی خەلیفە)ش لە (جیهاننامە)ی ١٦٠٠ز ناوی هێناوە کە: دوو ڕۆژە ڕێگایەک دەبێ، لە (حیللە)وە.

هەندێ بازرگانی ئینگلیزیش لە سەردەمی شاژنە (ئەلیزابێس)دا ١٥٥٨ - ١٦٠٣ز ناویان بردووە؛ لەوانە (سیزار فردریک)ە کە بە(فلوگیا، فلوجیا) ناوی هێناوە.

بڕوانە: (طه باقر و فؤاد: المرشد الى مواطن الأثار والحضارة، الرحلة الأولى، مديرية الفنون والثقافة الشعبية، وزارة الأرشاد ١٩٦٣ بغداد).

(٣) ئەم وشەیەی بەرامبەر بە(ئەفسەر)ی ئێستا داناوە.

(٤) مەحموود جەودەت: کوڕی ئاغا بچکۆلەیە لە تیرەی زەنگەنە. لە ١٨٨٩ لە سلێمانی هاتۆتە دنیاوە، خوێندنی ئاینی و ڕوشدیەی لە سلێمانی بووە، لە ١٩٠٧ لە ئەستەمۆڵ حەربیەی شاهانەی خوێندووە و لە ١٩١١ بەئەفسەر دەرچووە، لە ١٩١٤ بەشداری شەڕی جیهانی یەکەمی کردووە، لە ١٩١٩ هاتۆتەوە سلێمانی چۆتە لەشکری شێخ مەحموودەوە، لە ١٩٢٤ چۆتە سوپای عێراقەوە تا پلەی -رئیس اول- چووە، لە ١٩٣٠ دیسان چۆتەوە پاڵ شێخ مەحموود لە پیران و لە ١٩٣١ هاتۆتەوە لای حوکمەت و لە ١٩٣٧ بۆتە ئەندازیار لە=

بوون، که ڕەنگە لەسەر سەندنی پارە بووبێ لە لادێیەکان، هاتنەوە بەغدا، خۆیان دایە دەس (ع ە ر د ب)[1].

دەربازبوونی قوتابی، چوار قوتابی سلێمانی: غەفور سەعید، باقی نوری، ڕەئوف ساڵح، ڕەگی کوردایەتیان هەڵسا، وازیان لە قوتابخانە و باوک و دایک خۆشی شار هێنا، بەو زستانە بەناوی ڕاوەوە چوونە کن شێخ مەحموود بۆ ڕەنجدانی لە پێناوی کوردایەتی[2]... لەسەر ئەوە چەند قوتابییەکیان بەو ناوەوە لە سولەیان خستە بەندیخانەوە.

سەرما: ئەمساڵ بەفرێکی زۆر، سەرمایەکی بێ شومار لەو ناوەدا دیاری داوە، کە لەو عەسکەرانەی چوونە بەرامبەری لەشکری شێخ مەحموود، پانزە کەسیان بەر قینی سەرما کەوتوون، ڕەق بوونەتەوە.

عەسکەر: وا دەزانم لە هەموو عێراقدا (١٠٠٠) عەسکەری لێ دەرچێ هیچ کەس نەماوە نەنێرابێ بۆ سلێمانی بۆ بەرامبەری شێخ مەحموود. بەڵام لە لای هەڵەبجە تووشی کوردەکان دەبن، هەرایەکی گەورەیان دەبێ؛ کوردەکان لە دوو لاوە کوشتارێکی زۆریان لێ دەکەن.. ئینجا وازیان لێ دەهێنن.

## ژیانی تایبەتی ١٩٣١/١٢/١٥

وێنە: هەرچی کوردێک لە کووزی[3] چوارەمدا هەبوو گردبووینەوە. چووینە لای وێنەگر، وێنەیەکی گەورەی جوانمان گرت، کە ببێتە یادگاری ژیانمان، چونکو ئەمساڵ بەناوی خوا لەم قوتابخانەیە دەردەچین، ئەوەکی ئیتر یەک نەکەوینەوە لە قوتابخانەیەکی تردا... ئەگەر بڵێم هەموومان حەوت کەس بووین سەرت سوڕدەمێنێ، بەڵام بەڕاستی بزانە، لە نزیکی پانزە قوتابی کوردی ئەم کووزە ئەمەندەی تێدابووە کە هەموو یەک دڵ و یەک زوبان بەڕاستی کوردیان خۆش بوێ، بۆ کورد بکۆشن. واشبزانە کە لەو حەوت کەسە یەکێکی کەرکووکی تێدابوو، ماوەکەی خەڵکی سلێمانی بووە!.

=(إشغال)... لەگەڵ سەلامی شاعیردا لێرە پێکەوە بوون.
شێخ سەلام لە نامەیەکیدا بۆ د. مارف دەڵێ: لەسەر واقیعەی ٦ی ئەیلول دیسان لە بەغدا لەگەڵ مەحموود جەودەت و حەمید جەودەت و کامیل حەسەن کە زابت بوون لە جەیشی عێراقدا فیرارم کرد، لە پیران چووینە لای شێخ مەحموود. (هاوکاری، ژمارە ١٥٥٠، ١٩٩٠/٢/٥) لە ڕووداوێکی نادیار و تەمومژاویدا لە بەغدا دەستگیر دەکرێ و لە ١٩٣٧/١١/٢٠ ئیعدام دەکرێ. مەحموود جەودەت کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیر بووە، لە دامەزرێنەرانی یانەی سەرکەوتن بووە لە بەغدا، جگە لەوە وتار و هەڵبەستی زۆری لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو کردۆتەوە، هەروا لە ١٩٣٠ کتێبی (بەهانوڵڵا و دەوری نوێ)ی کردە کوردی و بڵاوی کردەوە، (پۆلۆنیا پۆلەندە یا لەهەستان) لە ١٩٤٠ (دار المعارف) چاپی کردووە.

(١) نووسەر وشەکەی بەم شێوەیە نووسیوە، کە پەستی و بێزاری خۆی دەردەخات.

(٢) لێرەدا مەبەستی ڕاپەڕینەکەی شێخی ئەمرە کە دوای شەڕی بەردەرکی سەرای سلێمانی (٦ی ئەیلولی ١٩٣٠) بەرپای کرد، وەک کاردانەوەیەک بەرامبەر ئەو زەبر و توندییەی حوکمەت دژی خەڵکی شار نواندی.

(٣) کووز: پۆل، قۆناغ، مرحلة.

رۆژنامە: لەم ساڵەدا وریاییەکی باشم تیا پەیدا بووە، لەمەوپێش هەر بەڕەنگ زەردی و لاوازی و شت ساز (هەزم) نەکردنەوە دەمناڵاند، ئێستە قورساییم زۆر بووە. ڕەنگی خوایی خۆم وەرگرتۆتەوە، هەر شتێ دەیخۆم بەئاسانی دەیسازێنم؛ ئەمەش بۆنەی هیچ نییە ئەوە نەبێ لەسەر ڕێگای خوایی دەڕۆم، مەبەس ئەوەیە خوا چۆنی بۆ داناوم بەو پێیە دەڕۆم: لە خواردنا ناوبجیێتی، هەموو شەوێک پەلوپۆم بەیارییەکی تایبەتی کە لە میسرەوە بۆە هاتووە، دەبزوێنم، ماسوولکەکانم پڕ و توند بووە، هەتایەم بەرە بەرە لەشم چاک دەبێ، ڕەنگ زەردیم دەڕوا، قەڵەو دەبم.

هەموو پاش نانی شێوانێک و بەیانیانێک بەفرچە و دەرمان دەم و ددانم دەشۆم. سەرم پاک پاک دەشۆم، پاشان بەر باوتیشکی ڕۆژی دەدەم... هەمیشە ڕووم خۆش و بەهیچ دڵتەنگ نابم، هەفتەی جارێک پاک پاک خۆم بەئاوی گەرم دەشۆم، ئێواران تا ماندوو دەبم دەگەڕێم.. بەکورتی، کەیف، گەڕان، بزووتن، خواردنی باش، پاک و تەمیزی. ئەمانە هەموو ڕۆژ بەجێ دەهێنم، لەبەر ئەوە هەتا دێم لاوازیم لادەچێ، گۆشت و بەهێزی و وریایی دەچێتە جێگای کە بەمە چاکی بەخۆم وەچاکی بەکورد و کوردستان دەگەیێنم چونکو کار بەپیاوی بەهێز و مێشک تەواو دەکرێ، نەک بەپیاوی لاواز و کەمهۆش.

ئەمەش هەمووی دەگەڕێتەوە سەر پیاوەتی (موحەممەد فائیقی جەوهەری) کە قوتابییەکی میسری بووە وەکو من لاواز، پاشان بەبزووتن و بەپاک و خاوێنی چاک بووە. ئینجا خۆی قوتابخانەیەکی گەورەی لە قاهیرەدا کردۆتەوە.

ئەخۆشی بەبزووتن چاک دەکاتەوە، نەک بەدەرمان و تەمەڵی!... لەبەر ئەوەی بەتەواوەتی لە ژیان بگەم، بووم بەکڕیاری ڕۆژنامەی (الرياضة البدنية) کە هی ئەوە: باس لە لەشچاکی و ژنهێنان و بزووتن دەکا کە پیاو، کردەوە و لەشی، پێکەوە پێی چاک دەبێ!.

## بزووتنی کورد بەلای کوردێکی دانیشتووی ئەمریکاوە

دوو سێ مانگ لەمەو پێش لە یادگارنامەکەی پارەمدا وتەیەکم گوێزییە سەر کوردی، کە هەر هی ئەم دوکتۆرە بوو؛ بەسایەی ڕۆژنامەیەکی ئەمریکاوە نووسرابوو، ئەوا ئێستا وتەیەکی تری دەکەمە کوردی کە ڕۆژنامەیەکی تری ئەمریکا لێی وەرگرتووە...

***

ڕۆژنامەی (فیلادەلفیا بۆلیتین)ی ئەمریکایی لە بابەت ئەم هەرایەی کوردستانی ژووروەوە چەند پیتێکی[1] نووسیوە کە لەناویدا بیروڕای کوردێکی حەکیمی نیشان دابوو کە لە ئەمریکادا دانیشتووە، ئێمەش گوێزیانە سەر عەرەبی[2]:

(١) لێرەدا مەبەستی (وتە یا قسە)یە، نەک (پیت) بەواتای ئێستا کە (حرف)ە.
(٢) باسەکەی لە ڕۆژنامەی (نداء الشعب)ی بەغداییەوە وەرگرتووە کە ئەویش لە ئینگلیزییەوە وەری گێڕاوە. (نداء الشعب جريدة - العدد ٣٦٦، الاثنين ١٩٣١/١/٢٦ ص ١-٢)

ئەو بەفروبارانە زۆرەی لە زستانی ئەمساڵدا لە کوردستاندا، بەتایبەتی لە شاخەکانی ئاراراتدا باری، بووە بۆنەی وەستانی ئەو بزووتنەی کوردەکان بەرامبەر زۆردارەکانیان (تورکەکان) کە دەستیان دایە.

وەلێ ئەم بەفر و بارانە هێندە نامێنێتەوە، هەر ئەوەندە دەزانی بەهاتنی بەهار هەمووی دەتوێتەوە. ئینجا ڕێ دەکرێتەوە، دووبارە کۆڕی شەڕ و هەڵلا لەناو هەردوولادا دەگیرێتەوە. لەو شاخە بڵندە سەختانەدا کورد خۆیان ئامادە دەکەن. شیر لە کالان دەردەهێنن دێنەوە بەرامبەری زۆردارەکانیان: بۆ داوای سەربەستی و خۆیبوون دێن بەگژیاندا. بۆ ئەوەی بگەنە ئاواتی خۆشەویستیان، بەمە هەڵلای خۆیان، کە لە پێنج ساڵ لەمەو پێشەوە پێیەوە خەریکن، هەڵدەگیرسێننەوە.

ئێستاش لە هەواڵی نهێنی لە بابەت خۆئامادەکردنیانەوە بۆ بزووتن و بەگژاچوونی کە بۆ ئەم بەهارە خەریکن بیکەن بێ بەش نەماوینەوە: هەمیشە بەسایەی لقێکی (کۆمەڵی خۆیبوون)[1]ەوە کە لە ئەمریکا لە شاری فیلادەلفیادا دامەزراوە: لە هەواڵی ئەوێ شارەزایی پەیدا دەکەین، کە ئەم لقەش پەیتا پەیتا

(١) گرنگترین ڕێکخراوێکی سیاسی کوردی باکوور بووە لە سەرەتای سەدەی بیستدا کە بەکۆمەڵێ نەخشە و پلانی ڕێکخستن و کارکردنی تازەوە خۆی نواند، وەک دەردەکەوێ ئەمەش سەرەنجامی تەجرەبەی ئەو هەموو سەرهەڵدان و شۆڕشانە بوو کە لەو بەشەی کوردستاندا لەوە پێش بەرپابوون و تووشی نسکۆ هاتن، دواییەکەیان شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران بوو کە لە ١٩٢٥/٤/١٤دا دەسگیرکران. لە ١٩٢٧/١٠/٢٨ لە شاری (بەحمدون)ی لوبنان کۆنگرەی دامەزراندنی ڕێکخراوی خۆیبوون گیرا و گەلێ کەسایەتی تێکۆشەر و بەناوی کوردی باکوور تیایدا بەشداریان کرد، لەوانە: (مەمدوح سەلیم ١٨٨٠-١٩٧٦، د. محەمەد شوکری سەگبان، ئیحسان نوری پاشا، عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سەعید، مستەفا شاهین، شەریف پاشای خەندان، جەلادەت بەدرخان و... گەلێکی دی). یەکەم کۆمیتەی ناوەندی ئەم زاتانە بوون: (جەلادەت بەدرخان یەکەم سەرۆکی خۆیبوون، مەمدوح سەلیم، د. محەممەد شکری سەگبان، حاجۆ ئاغا، ئەمین ڕامانی، عەلی ڕەزا، مستەفا شاهین و...هتد) جگە لە دانانی پلانی کارکردن و بەڕێوەچوونی سیاسەتی ڕێکخراوەکە، کۆنگرە پێشنیاری تەشکیلاتی عەسکەری و چەتە ڕێکخستنی سەربازیشی کرد، هەروا بڕیاری دا کە خەبات و تێکۆشانی تەنیا لە کوردستانی تورکیا بێت، شێوەی چارەسەریشی بۆ ئەم خەباتە تەنیا سەربەخۆیی و ئیستیقلالی کوردستان بێ. جگە لەمانە خۆیبوون گرنگی و بایەخێکی سەرەکی بەلایەنی ڕاگەیاندن و وشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستان دەدا، هەر لەمەوە بوو کە دەیان بڵاڵۆک و نەشریاتی جیاجیای بەزمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و تورکی و کوردی و عەرەبی لە وڵاتی شام و لوبنان و فەرەنسە و ئەمریکا و میسردا پەخش کرد، بەمەش توانی دەنگی خۆی بەجیهانی دەرەوە ڕابگەیەنێ. لە نێوان ١٩٢٧-١٩٣٠ سەرکردایەتی شۆڕشی ئاگری کرد و بۆ ئەمەش ئیحسان نوری پاشای دانا بەسەرکردەی گشتی هێزەکانی شۆڕشگێران و مۆرک و شەقڵی خۆی لەم خەباتەدا چەسپاند. لەکاری ڕێکخراوەیی و ناساندنی دۆزی کوردی باکووردا: جەلادەت و کامەران و سورەییا بەدرخان لە شام و بەیروت و پاریس و میسر بەناوی خۆیبوونەوە هەوڵێکی بێ پەروایان دەدا. ئەم ڕێکخراوە بەدرێژایی ٤٠ ساڵ دوای خۆی لەلایەن کوردی باکوورەوە هیچ گروپ و ڕێکخراوێکی سیاسی دی نەیتوانی میراتگریی بکا. لە ١٩٤٦دا کارەکانی گەیشتە وەستاندن.

هەموو هەفتەیەک لە ناوچەی کۆمەڵەکەوە کە لە کوردستان دامەزراوە، نامەی لە چاپدراوی دێتەکن، بەزیانی عەرەبی نووسراون، کە کەم لە پەلی ئەم کۆمەڵە دەتوانێ تەماشای بکا.

ئەم کۆمەڵەیش یەکێک بەڕێوەی دەبا ناوی (دکتۆر نەجیب موستەفا بەکری) کوردە کە لە شەقامی (٦٠٥) دادەنیشێ. لە خەستەخانەی (سانت ماری خۆرایی)شدا فەرماندەرە.

ئەم حەکیمە گەنم ڕەنگەی ماسوولکە بەتینە لە کوردستانی تورکدا لە دایک بووە. بەشێکی زۆری ژیانی لەسەر ئەو شاخە بەرزانە ڕابواردووە کە باو و باپیری بەهەزاران ساڵ لەمەو پێشەوە تیادا ژیاون. ئەو شاخانەی لەناو (تەورات)دا ناویراون کە لە دەنگی کەشتی نووحدایە، کەلاوەکانی ئەینەواش (ئەینەوای کۆن) دەکەوێتە بناری ئەم شاخە بەرزانەوە. لەوێشدا لە ئاسمانەوە (خوان) هاتۆتە خوارێ: وەکو نووسراوە نازدارەکان (کتێبی موقەددەس) باسیان دەکا. ڕۆژنامەکەی گوتمان بەم ڕەنگە لە کوردستان دوا بوو، بۆ بوونە سەرەتایەک بۆ قسەکانی حەکیمەکە کە نووسیبووی. قسەی حەکیمەکە: گەلی ئێمە (کورد) گەلێ شەڕی لەگەڵ گەلی قەفقازیدا کردووە، چونکو کورد یەکەم گەلێ بوون پێیان کەوتە ئەم زەوییەوە، بەخۆی و دراوسێکانیەوە داگیریان کرد، ئینجا تیادا ژیان، بەبێ ئەمەی کەسێ بەربەرەکانیان لە تەکدا بکا.

تورکیش هیچ نین، ڕەگەزێک نەبن لە ڕەگەزی توران یان مەغۆل، لە پێش پێنج پشت (قرن) و نیودا.

ڕووبەڕوی ئایینی کورد و تورک زۆر لەیەک دەچن، هەردوو تیرەکە ڕێکەوتوون، بەڵام گەردوون بۆ لای ئەوان (تورک) سووڕاوەتەوە، تورکەکان دەستدرێژکەر بوون و کوردەکانیان خستۆتە ژێر چنگی خۆیانەوە، هەرچی هەست و نەست هەبووە بۆیان جێبەجێ بووە، ئینجا لە کوردەکان ناوەڕۆر وەستاون، هەرچی لە توانایاندا بووە لە دیلێتی ئەواندا بەکاریان هێناوە... بەڵام کورد ئەمەندە سەرشۆڕ و بێ هێز نەبوون، لە کاریان بێدەنگ بن، هەستان، وروژان، دەستیان دایە دەستییەک، بەیەک دەنگ هاواری داواکردنی بەشی خوارووی خۆیان کردا. ئەوا ئێستا داوای پایەی پێشوویان دەکەنەوە، دەیانەوێ تورک لە خاکی باوباپیریان بکەنە دەرەوە، لەبەر ئەوە خەنجەریان هەڵکێشا، هەڵستان، بەرامبەر بەتورک ڕاوەستان. کۆمەڵی زۆریان دامەزراند، دوا کۆمەڵیان کۆمەڵی (خۆیبوون) بوو کە لە ساڵی ١٩٢٧ دایان مەزراند.

ڕۆژنامەکە لە پاش ئەم قسانەی دوکتۆر نەجیبەوە چەند قسەیەکی خۆی پێوە نابوو:

لە بەناوبانگترین پەلی ئەم کۆمەڵە لە ئەمریکا: (ئەمیر سوورەییا بەدرخان بەگ)ە، شازادەی شاری جەزیرەی کوردی و کوڕی (بەدرخان)ی ناودار کە دوا والی ئەم شارە و دەورووپشتی بووە. ئەو شارەی کە بەنیوە سەربەخۆییەکی ناوەوە ڕایدەبوارد، لە پێش ئەمەی تورک لە ساڵی ١٨٤٢م دا بیگرێ. لەو حەلەدا کە هەرا لەناو بەدرخان بەگ و تورکەکاندا پەیدا بوو، کە ئیتر دواڕۆژی بەدرخان بوو لە سەردارێتیدا. بەڵام ئەمیر سوورەییا نزیکەی دوو ساڵ دەبێ هاتە ئەمریکا، لێرە لای دکتۆر نەجیب بوو بەمیوان. پاشان ڕێکەوتن پێکەوە لقێک بۆ (کۆمەڵەی خۆیبوون) لە شاری دیترۆیتدا بکەنەوە، چونکی لەم شارەدا ژمارەیەکی گەورەی کورد گوزەران دەکا.

ئەم بیرە (بیری سەربەخۆیی کوردستان) بێچووی ئیمڕۆ نەبووە بەڵکو لە دەمێکەوە ئەم بیرە هەیە،

چونکی (شازاده ئەمین بەدرخان) باوکی شازادە سورەییا، مردووی حەوت هەشت ساڵ لەمەو پێش، لەم ڕێیەدا کۆششێکی بێشوماری کرد. یەکێ لەو کۆششانە دامەزراندنی (کۆمەڵی پێشکەوتنی کوردستان) بوو لە ساڵی ۱۹۰۸، بۆ ئەوەی پرش و بڵاوی کورد گرد بکاتەوە، قسەیان پێ بکا بەیەک، داوای ئەمەکیان بکەن، وە بۆ ئەمەی گەلێتی و ڕەگەزێتیان بژێنێتەوە. (دوکتۆر ئەجیب بەکر)یش لە ئەستەمۆڵدا خوێندوویەتی تا لە قوتابخانەی حەکیمی دەرچووە، ئینجا لە ساڵی ۱۹۲۱دا هاتۆتە ئەمریکا، لێرەشدا دەمێک لەسەر پوولی خۆی لە دوقتۆریدا بەسەری بردووە، هەتا لەم دواییەدا کردیانە (دوقتۆری منداڵان) لەو خەستەخانەیەی لە سەرەوە ناومان برد کە لە شاری دیترۆیتدایە.

لەگەڵ ئەوەش فرمانەکەی لەوانە نییە بتوانێ بەکاری سیاسەتەوە خەریک بێ، کەچی دەمێکی زۆری خۆی لە پێناوی سەربەخۆیی وڵاتەکەیدا (کوردستان) بەخت دەکا. هەمیشەش هەڵمەتی گەورە دەباتە سەر حوکمەتی تورک، کە بەرامبەریی هاوخوێنەکانی دەکات... خۆ قینێکی خراپی هەڵدەستێ کە دەبینێ حکومەتی تورک دەڵێ: من ئەو هەرایە دەکوژێنمەوە، کە هەندێ لە کەللە شەقەکانی کورد هەڵیان گیرساندووە یاخود دەبینێ کە تورک خەریکە بەتەواوەتی ڕەگەزی کورد بنەبڕ بکا، ئەو ڕەگەزەی کە ۵۵۰ ساڵ بۆنەی ژیانی تورکیا بوو.

ئینجا دوقتۆر دەڵێ: ئەمیش دیسانەوە ڕێژگاویەکە تورک دەیەوێ چاوی خەڵکی پێ ببەستێ، هەتا چاوی ئەوانەش کە بەم کارەوە خەریکن. هیچ نەبوو بەبۆنەی هەڵسانی ئێمە بەرامبەر بەتورک، ڕزگاریان دەبێ لە دەست زۆرداریيان، بەدکاریيان کە هەمیشە بەدەستیەوە ناڵاندومانە.

وەنەبێ گەلی کورد ئەو گەلەبێ تورک بتوانێ بەم تەرحەیان بەسەربێنێ و ئەبزوونەوە، هەرچی کوردە، لە لەدایکبوونیانەوە تا مردنیان، تفەنگ و ڕم و شیر و ئەسپ نەبێ هیچ لەبەر دەمیاندا نابینێ.

نە تورک وە نە کەسی تر، وە نەبێ نەشارەزابێ کە هەتا ئێستا خواردنەوەیان خوێنی کوردەکان بووە کە هەمیشە بەسایەی جەردەیی و شەڕ و هەڵلاوە ڕشتوویانە، لەبەر ئەوە هێشتا تورک نەهاتبوونە سەر کوشتاریان، ئەوان (کوردەکان) هەڵسان، ڕیزیان بەست، بۆ سەر حکومەتی تورک هێرشیان هێنا، لەبەر پاراستنی ئەمەکیان و پیشاندانی خۆیان.

ئەو هەرایانەی کە لەم دواییەدا کوردەکان کردیان، لە ساڵی ۱۹۲۵م وە دەست پێ دەکا، کە (شێخ سەعیدی کورد) پێکی هێنا لە هەڵسانی یەکەم جاریدا، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێ فێڵ و فەرەج لە ژێرەوە کوردەکانی خستە سەر ئەوەی بەناچاری هەراکەیان لە ناکاتدا هەڵگیرسێنن، بەڵام زیانێکی بێ شوماریان لە تورک دا، گیانداریکی زۆریان لێ خستنە گۆڕەوە کە دەگاتە (۵۰۰۰) پاشان کە تورکەکان دیان کە هێزی کورد بەو تەرحەیە ئینجا ڕاستی بۆیان هاتە پێشەوە، بەئاشکرا دەستیان کردە کوشتار.

لەو هەواڵانەی لەوێوە دەمگاتێ، بۆم دەرکەوتووە کە هەرا خراپ قەوماوە، لەناو هەردوو لادا لە هاوینی پاردا لەناو شاخەکانی ئاراراتدا کوردەکان هەڵمەتیان بردبووە سەر قەڵا و شوێنە بەهێزەکانی تورکەکان، گڕیان تێ بەردابوو، هەتا تەنگەتاویان پێ سەندبوون و لەوێ ڕاوە و دویان نابوون.

کوردێک ئەگەر موسوڵمان بێ یا گاور یاخود زەردەشتی، هەمیشە بەچەکەوەیە، قەت لێی جیا

نابێتەوە: لای ئەو کاتی شەڕکردن و نەکردن یەکە، لە شاردابێ، لە دێدابێ، لە دەشتدابێ لە لەوەڕدابێ، لە شاخەکاندا... بێ چەک ناسوورێتەوە.

کوردستان پێنج کەرتە: بەشێکی لەژێر دەستی تورکدایە، دووەمیان رووس، سێیەم فەرەنسە (ئەو بەشەی بەسوریەوە نووساوە) چوارەم ئێران، پێنجەمیش بەعێراقەوە نووساوە: بەڵام لەژێر چاودێری بەریتانیای گەورەدایە. لەم پێنج بەشە هیچیان لە زۆردارەکانیان ڕاست نەبوونەتەوە، ئەو بەشە نەبێ کە لەژێر چنگی تورکدایە، ئەو بەشەی ئێستا لێی دواین[1]. ئەمە ئەوەیە کە دوکتۆر نەجیب موستەفای کورد قسەی بۆ کردین، لە بابەت بزنەی هەڵسانی کوردەوە بەرامبەر تورک لە هاوینی ڕابوردوودا؛ ئەوەش کە کورد چۆن خەریکە لەژێرەوە خۆی ئامادە دەکا بۆ هەرایەکی تازەی کە لەم بەهارەدا!!ە

نیداء الشعب/ بەغداد
ژمارە ٣٦٦-٢٦ کانوونی دووەم ١٩٣١

## سینەما ١٩٣١/٢/١

ڕەنگە کە ناوی سینەما لەسەر ئەم لاپەڕەیە ببینی وا بیربکەیتەوە شەوێک لە شەوان چوومەتە سینەمای هەمووان، چیرۆکێکی جوانم لەسەر پەردەی زیوین بەدی کردووە: زۆر کاری لە دڵم کردووە، لەبەر ئەو کچە جوانانەی ئەو دەوروەشتە جوانەی، یاخود ئەو شەڕ و هەڵڵایەی پاڵەوانێکی بەهێز کردوویەتی، لەبەر ئەمانە دڵخۆش و شادمان بووم، وا خۆم ڕانەگرتووە خستوومەتە سەر ئەم پەڕەیە تا ببێتە یادگارێک!...

ڕەنگە تۆ ئەمانەت هەموو بەبیردا بێت!... بەڵام کە ئەم دێڕانەی خوارەوەت خوێندەوە ئینجا هاوار دەکەی کە ئەم ناوە (سینەما) نەدەبوو بکرایە بەسەرباس، بەڵکو (وریابوونەوە، چاوکردنەوە) لە بریتی ئەوە لە سەرەوە نەخش کرایە. لە قوتابخانەی خۆمان، شەوێک بوو، هەموومان کۆبووبووینەوە، چاومان بڕیبووە پەردەکە، لە پڕ نووسینێکی ئینگلیزیمان هاتە پێش چاو: (لە دانراوەی -لە ڕەنجدانی پیاوەتیی- ڕۆکفیلەر) لە هەرە دەوڵەمەندەکانی ئەمریکا، بەڵکو دنیا... ئینجا بیرکەرەوە، ئەم پیاوە لە پێناوی پیاوەتیدا چۆن کەللە[2]، لەشی قوتابیان، خوێندەواران، پیاوانی دونیا پەروەردە دەکا: بۆ ئەمەی پیاو لە

(١) دیارە ئەم بۆچوونە دوورە لە ڕاستییەوە، چونکە لە پارچەکانی دی کوردستاندا هەر لایە و بەشی خۆی و بەپێی بواری ڕەخساو و (هەتا نەرەخساویش) بەرامبەر هێزە داگیرکەرەکانیان وەستاونەوە و خەباتی سەختی خوێناویان پیادە کردووە بۆ بەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی.
شۆڕشەکانی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری و سمکۆی شکاک لە کوردستانی ئێران، شێخ عەبدولسەلامی بارزانی ١٨٢٦-١٩١٤ کە دژی عوسمانییان لە سەرەتای چەرخی بیستەمدا ڕاپەڕی و داوا ڕەواکانی کوردی دەڤەرەکەی خستە پێش چاوی ئەستانە و هەروا شۆڕشی شێخ مەحموودی نەمر لە سلێمانی دژی دەسەڵاتی داگیرکەران لە کوردستانی گەورەدا. گەواهی قسەمانە
(٢) کەللە: دیارە مەبەستی (مێشک) یا ڕادەی تێگەیشتن و فێربوونە.

نەخۆشییە پیسەکانی بکەن وەکو (لەرزوتا، گرانەتی، سیل و دیق، سوورژەنک، ئاتەشەک... هتد) لەسەر شێوەی سینەما بەچەندان باخ و باخات، زەوییوزار، ئاو، شیو، کارێز و گۆمی لەسەر پەردەکە پیشان دەدا. لەلایەکی کەوە بەچەندان منداڵان و پیاوانی دەردەخست کە بەقاچی ڕووتی بەو ئاو سەوزاییەدا دەڕۆن، بەلەشی ڕووتی لەناو ئەو ئاوە خۆراوە (میکرۆباویە)دا مەلە دەکەن، بەبێ پەردە و کوللە بەشەو لەناو ئەو زەوییوزارەدا دەنوون کە پڕە لە مێشوولە، بەگەزین خۆرەی زۆر لەو نەخۆشییانە دەخەنە لەشی پیاوەوە، ئینجا چۆن ئەو خۆرانە دەبنە کرم لەسەر ڕیخۆڵە و ماسوولکەی پیاو دەژین[1]؛ لەتوپەتی دەکەن، تووشی کوشتنی دەکەن.

یاخود خۆرەی مەلاریا چۆن وردەواڵای[2] خوێن شەقار شەقار دەکەن، ئەم خۆرانە چۆن، لە چە لایەکەوە دەچنە لەشی پیاوەوە؟ ئینجا ئەو پیاوە چی بەسەردێ؟ لە ئازار و ئێشی ئەو نەخۆشییە پیسانەدا کە تووشی دەبێ، پاشان کە دەچنە لای حەکیم بەسایەی چەن دەرمانێکەوە چاکیان دەکاتەوە، ئینجا ئەو دەرمانە چۆن ئەم خواردنە پاک دەکاتەوە. پاش ئەوە چاک کەرەوە (دوقتۆر) کە چۆن ئەوانەی لەشیان هیچی نییە، چۆن بەسایەی ئامۆژگارییەوە لەو هەموو نەخۆشییە ڕزگاری دەکا کە پاک بن، خۆیان لە هەندێ خواردن و خواردنەوە پارێز بکەن -ئەمانە هەموو لەسەر کۆمەڵێک زۆر چاک لەسەر پەردەکە پیشان دەدا، ئەو شتانەی کە قەت نابینرێن، کە کەس بەچاو نەیدیون[3] زۆر بەگەورەیی لەسەر پەردەکە پیشانی دەدان-. لەمانە لە هەمووی خۆشتر پەردەی پێکەنینی بوو: کە خۆرەی نەخۆشییەکانی لە وێنەی قولەڕەشە بەدخووەکاندا پیشان دابوو بەکۆمەڵ سواری فڕۆک (تەیارە) -مێشوولە- بووبوون، ڕوویان دەکردە ماڵێک دابەزن و لە کوچەکەیان ماندوویان بحەسێتەوە، یەکێک بەشێوەیەکی سەیر لە فڕۆکەکەیان یاخود تەختە ڕەوانەکەیان دادەبەزی، گۆچانێ بەدەستەوە، چاکەت و پانتۆڵ لەبەردا، دەهات سەیرێکی خانووەکەی دەکرد، ئەگەر پاک بووایە بەسەرکزی دەگەڕایەوە کن هاوڕێکانی، پێی دەوتن: ئەم خانووە ناخۆشە، بۆ ئێمە دەست نادا. ئینجا هەموو سوار دەبوونەوە و ڕوویان کردە یانەیەکی تر کە بەپیسی بیاندیایە ڕایان دەکردە ناوەوە؛ کابرایەک شتی پیسی دەخوارد بەجارێ دەچوونە قوڕگیەوە و لەوێ لە سکیا، لە لەشیا خانوویان دروست دەکرد، کەچی کە کابرا دەرمانێکی دەخوارد یاخود تۆزێ دەستی دەدایە پاک و خاوێنییەکی ناوەنجی و دەستی دەکرد بەخواردن و هەڵسان و دانیشتن، هەموو هەڵدەهاتن، ڕایان دەکردەوە ناو تەختە ڕەوانەکەیان... بۆ شوێنێکی تر کۆچیان دەکرد. ڕۆژئاوایی بەم تەرحە خوێندن دەخەنە مێشکی منداڵانیانەوە، ئێمەش هەر تێی ئەناخنین لە مێشکمان، هەر بخوێنین هەر بنووسین، کە هاتینە دەرەوە لەو گوێچکەمانەوە بچێتە دەرەوە.[4]

(١) مەبەستی: لەسەر ڕیخۆڵە و ماسوولکەی (مرۆڤ) دەژین.

(٢) وردەواڵای خوێن: خڕۆکە سپی و سوورەکانی خوێن. وەیا (کائنات مجهریە).

(٣) میکرۆب و ڤایرۆس و خڕۆکەکان.

(٤) نووسەر بەمە دەیەوێ بەراوردێک بکات لە نێوان شێوازی خوێندن و فێرکردنی وڵاتانی پێشکەوتوو لەگەڵ لای خۆمان. وە ڕادەی کاریگەری ئەو شێوازە بۆ سەر تێگەیاندن و فێربوونی قوتابی... ئەوەی لەو فلیمەدا=

خۆم لەرزوتا و زۆر لەو نەخۆشییانەم خوێندووە، بەم تەرحە بووم، هەر بۆ تاقیکردنەوە توانیومە بەبیرمابێ، لەوە دوا هیچ... ئێستە ئەوا چووە مێشکمەوە، نەقشی بەست، تیا جێگەی بووەوە، ئیتر هەر لە بیرمە و لەبەر چاومە... کاشکی هەموو شتێکمان وای لێ هاتایە... خودا کەی بێ، خودا کەی بێ، خودا کەی؟؟

## وێنەی کوردستان ١٩٣١/٢/٧

(موستەفا زەکی سائیب)[١] لەو لاوە کوردانەیە پێتوەی بنازرێ، کوڕێکە بەناوەڕۆوی گەلێک لە لاوە کوردەکانی تر. ئەوان هەتا لە قوتابخانەدان خوێن گەرم، دەم چابوک، باس لە ڕەنجدان بۆ کورد دەکەن، لەسەر هەموو شتێ سنگ بۆ دوژمن دەبەنە پێشەوە، کەچی کە دەکەونە ناو فرمانێکی حکومەتییەوە سارد دەبنەوە، وەک خۆیان بەکورد نەزانن وانە، دەست لە هەموو کاروبارێکی باش بۆ کورد دەکێشنەوە!... بەلام ئەم هەروەکو چەندێکی تریش هەن، لە قوتابخانەدا لەگەڵ هیچ لەمانەدا نەدواون. هەتا ئەو

=دیویە وانەیەک بووە لە بابەتی، زیندەوەرزانی، لە فلیمێکی (تعلیمی)دا بەشێوەیەکی ناسانی سەرنج ڕاکێش لە وڵاتی ئەمریکا ئامادە کراوە و پیشانی خەڵکی دەدرێ بەمەبەستی وشیارکردنەوە و فێرکردن لە چۆنێتی خۆپاراستن و چارەسەرکردن. دیارە مامۆستاش وەک خەمخۆرێکی نەتەوەکەی حەسرەت هەڵدەکێشێ بۆ ئەو ڕادە پێشکەوتنەی کە خۆی و گەلەکەی لێی بێ بەشن.

(١) مستەفا سائیب: (١٩٠٤ - ١٩٨٠/١٢/٩) کوڕی مەلا ئەحمەدی سائیبە، خوشکەزای پیرەمێردی شاعیرە، لە سلێمانی و کەرکووک خوێندوویە، دوایی قوتابخانەی هەندەسەی لە بەغدا تەواوکردووە و لە ١٩٢٦دا لە ئەشغالی سلێمانی دامەزراوە، لە مووسڵ و بەسرە و حیللە و بەغدا کاری کردووە. لە ١٩٣٢ گوێزراوەتەوە بۆ سلێمانی لە ١٩٣٦ دیسان گواستراوەتەوە بۆ بەغدا لە کۆتایی سییەکاندا خانەنشین کراوە و هەر لە بەغدا ماوەتەوە بێ ئەوەی ژنی هێنابێ. لەم دواییەی ژیانیدا (ناوەڕاستی حەفتاکان) شەوێک لەگەڵ سیروانی ئەحمەد هۆشیار کە شێوەکارێک بوو لە گۆڤاری (مجلتي) منداڵان کاری دەکرد، بردمی بۆ لای، لە ژوورێکی نیمچە تاریکی حەوشەیەکی پشت (الشركة العامة للسيارات) سەروی (ساحة الأندلس) لە بەغدا، سەد مەخابن: پیر و پەککەوتە، باری ژیانی ناخۆش، بێ خزمەت. دوای حەفتاکان هانەوە سلێمانی و لە ماڵی ئازادی جەمیل سائیب دوارۆژەکانی ژیانی بردە سەر، لە گردی سەیوان سپێردرا. مستەفا سائیب گەنجێکی دڵسۆزی لەخۆبوردوو خاوەن هەستێکی خاوێنی نەتەوەیی بووە، قەڵەمێکی بەهێزی بووە لە نووسینی پەخشان و چیرۆکدا، لەگەڵ زۆربەی ڕۆشنبیران و پیاوانی تێکۆشەری ئەو سەردەمەی ١٩٢٦-١٩٣٨ پەیوەندی تووڵی هەبووە، هەر بۆ بەدیارخستنی ناوی نەتەوەکەی و بەدەستخستنی مافەکانی؛ بەشداری لە زۆر کۆڕ و کۆمەڵی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا کردووە (کۆمەڵی لاوان، زەردەشت، زانستی، یانەی سەرکەوتن، خۆیبوون...)، بەبیری من ئەم نووسەرە ئەگەر خولیا ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکەی بەسەر لایەنی سیاسی و کاری سیاسیدا زاڵ بوایە و خۆی بۆ نووسین تەرخان کردایە، بێگومان چیرۆکنووس و ئەدیبێکی بەرز و چاکی لێ دەردەچوو. برادەرایەتی لەگەڵ مامۆستادا بەهێز بووە، خەمخۆری نەتەوەکەیان یەکی خستوون، لە یادنامەکانیدا زۆر جار بەپەرۆشەوە باسی لێوە دەکات و ناوی دێنێ.

هاوڕێیانەی گاڵتەیان پێ کردووە لەبەر ساردیتی!... بەڵام لەودتی بوودتە (موهەندیس)، خوێنگەرمێکە، وڵات پەروەرێکە بێ هاوتا، لەو ڕۆژەوە کە دەستی کردووە بەکارکردن بۆ عەرەب[1] (دوژمنی کورد) خەریکی کاری کوردەوارییە، لە خۆیم دیوە و لێیم بیستووە هەتا ئێستا چەندان ڕۆژنامەی کۆن و تازەی کوردی کۆکردۆتەوە، هاوڕێکانی کەی هێشتا ناویان نەبیستووە. لە هەموو ڕەنگ نووسراوە، خۆشخوانی کوردی، وێنەی مێژوویی کوردستان لەمانە هەرە جوانتر، باشتر، بەفەڕتریانی پەیدا کردووە، سا بەپارە بەشت یاخود بەخواهیشت بوویێ...

لەم ڕۆژانەدا هاتە ئێرە (بەغدا) هەرچی وێنەی مێژوویی بێ لە کوردستاندا وەک عەسکەری کورد، هی پیاوە گەورەکانی، هی بۆمبابارانەکەی مام ئینگلیز[2]، هی کوشتنی سمایل ئاغای سمکۆ، هی نومایشەکانی سلێمانی[3]، وێنەی چاوەندازە جوانەکانی کوردستانی خوارووش... هتد، هەمووی لێ سەندین، ڕەوانەی ئەمریکای کرد کە لە یەکێ مانگی مارتدا لەلایەن کۆمەڵی (خۆیبوون)ەوە بەئینگلیزی لە چاپ درێ و لەژێرەوە تۆزێ باسیان بنووسرێ، خۆی یەکێکە لە پەلی ئەم کۆمەڵە کوردییە سیاسییە، کە چەند مانگێک لەمەو پێش زۆر نووسراویان بۆ ناردبوو کە باسی هەراکەی کوردستانی ژووری تێدابوو، هەمووی لەژێرەوە بڵاوکردەوە. هەر مانگێ لەوە پێش نامەیەکی زۆری بەپەنهانی بەناو هەموو کورددا بڵاو کردەوە، هەرچی ناوی کچ و کوڕی کوردی هەیە تێدا نووسرابوو بۆ ئەمەی ئیتر کەس ناوی کوڕ و کچی بەزیانی کە ناو نەنێ.

ئەو نووسراوەیەی سەرەوەش بۆ ئەوەیە ناوی کورد و کوردستان بەناو دنیادا بڵاودەبێتەوە وە هەموو کەس کورد باش بناسێ تا لەو بەدناوییەی کە دوژمن و بێگانە پێیانەوە لکاندووە ڕزگاری بێ.

بەناوی خوا ئەو ناوە کوردییانەش لێرەدات دەنووسین.

## ئێوارێکی پەشەوە ۱۹۳۱/۲/۹

ئیمڕۆ لە پۆستە نووسراوەیەکی جوانم بەکوردی بۆ هات، باسی لە مێژووی کوردی شارەزوور دەکرد، زۆر ڕێکوێکم هاتە پێش چاو. هی (سەید حوسەینی موکریانی)[4]یە خێوی چاپی زاری کرمانجی لە ڕەواندز.

ئەم پیاوە زۆر بێدەستە لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەرێوەی دەبا، هەمیشە خەریکی دانانی نووسراوانی

(١) (کارکردن بۆ عەرەب) بەو مانایەی: لەو ڕۆژەوەی کە بۆتە فەرمانبەرێکی حکوومەت.

(٢) ئەو بۆمبابارانەی لە ١٩٢٤دا کردی لە سلێمانی، دژی شێخ مەحموود.

(٣) خۆپیشاندانەکانی سلێمانی لە ٦ ئەیلوولی ١٩٣٠ و ئەو هەرایەی لێی کەوتەوە.

(٤) ئێوی حوسەین کوڕی سەید عەبدوللەتیف کوڕی شێخ ئیسماعیل لە هۆزی غەزاییە، بە(حوزنی یا داماو) ناسراوە. لە ١٨٩٠ لە مەهاباد لەدایک بووە لە ١٩٤٧/٩/٢٠ لە بەغدا کۆچی کردووە، لە دوانزە ساڵییەوە مەهابادی حێ هێشتووە و بەرەو ئەستەمبوڵ و شام و عێراق بۆتەوە، لە پاڵ خوێندنیدا فێری خۆشنووسی و مۆرهەڵکەندن و وێنەگرتن بووە. لە حەلەب چاپخانەیەکی دامەزراندووە، لە ١٩٢٥ هاتۆتە بەغدا و کارگەی زەنگۆگرافی داناوە، لە ١٩٢٦ بەچاپخانەکەوە چۆتە ڕەواندز و لە پاڵ چاپکردنی دەیان نامیلکە و نووسراوی=

کوردییە. هەتا ئێستا (١٣) نووسراوی لە کوردیدا بلاوکردۆتەوە، هێشتا خەریکی هی ترە وەک: مێژووی سمایل خانی سمکۆ، مێژووی شێخ مەحموود، وە گەلێ نووسراوەی تر لە زانین و کاری ڕەنگیندا، وەک: وێنەگرتن و کەلوپەل دروستکردن، زینکۆگرافی... هتد. ڕۆژنامەیەکیشی هەیە هەموو مانگێ دەری دەکا، ناوی (زاری کرمانجی)[1]یە، بەڵام داخی گرانم، بەنانەسکی دەژی، بەهەزار حاڵ ئەمانەی پێ بەجێ دێنێ، خۆ ئەگەر هەتا ئێستا وڵاتپەروەرە کوردەکان یارمەتیان ندایە هیچی بۆ نەدەکرا و لەمەو دواش هیچی بۆ ناکرێ.

ئەم نووسراوەیە (ئاورێکی پاشەوە) بەرگی چوارەمینە بۆ مێژووی شارەزوور کە بەهەمووی (گەوهەری یەکانە)ی ناونابوو. ئەم پیاوە مەلایەکە، خۆ یارمەتی بدا بۆ کوردی هەژار...

## بۆ سلێمانی ١٩٣١/٢/١٨

ڕۆژێ لە پێش جەژنی مانگی ڕۆژوودا لە تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵ بووینەوە، ئیتر قوتابخانە داخرا، ئێمەش تا (٢٠) ڕۆژ بەرەڵڵا بووین، لەبەر ماندوو و حەسانەوەی لەش و هۆش، بەگەلە، هەموو قوتابییە کوردەکان هاتینەوە وڵاتی خۆمان، لەناو شەمەندەفەردا لەناو ئۆتۆمبێلدا، هەر بەگۆرانی کوردی و قسەی خۆش ڕامان بواردووە، لە چەشنی ئەو شمشاڵ (فیفرە)، سینە و کەمانمان لێ دەدا.

هاتینە کەرکووک جەژن بوو، ڕۆژەکەی خۆش بوو بەکەیفەوە نزیکی ڕۆژئاوا بەدایک و باوکمان و وڵاتە نازدارەکەمان شادبووینەوە

***

= مێژوویی و کۆمەڵایەتی و زمان و ئەدەبیات و ئایندا توانیویە گۆڤاری (زاری کرمانجی) لە ١٩٢٦-١٩٣٢ دەربکات، کە بۆ خۆی ئەستێرەیەکی درەوشاوەی ئاسمانی سافی ڕۆژنامەگەری کوردییە، لە ١٩٣٤ دێتە سلێمانی بەمەبەستی کاری ڕۆژنامەنووسی و ماوەیە دەمێنێتەوە... لەم ماوەیەدا بەکامێرای خۆی وێنەی زۆربەی زۆری کەسایەتییە دیارەکانی سلێمانی دەگرێ لەگەڵ شاعیران و نووسەراندا. لە ١٩٣٤-١٩٣٥ لەگەڵ پارێزەر شێت مستەفا (١٩١٣-١٩٧٣) گۆڤاری ڕووناکی لە هەولێر دەردەکەن، لە ١٩٤٣/١١/٨ دەچێتە بەغدا و لەگەڵ مامۆستا تەوفیق وەهبیدا سەرپەرشتی دەرچوونی (دەنگی گێتی تازە) دەکەن. ئەگەر لە سلێمانی پیرەمێردی شاعیر ترووسکەی زانین و زانیاری بووبێ، ئەوا مام حوزنی لە ڕەواندز و هەولێردا هەمان ترووسکەی ئەو زانین و زانیارییە کوردییەن کە لەو شەوە دەیجوورەی وڵاتدا ڕێگایان دیاری دەکرد.

(١) حوزنی موکریانی خۆی خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەر و خاوەن چاپخانەکە بووە، ئەم گۆڤارە ژمارەیەکی لە ٢٥ی ئاياری ١٩٢٦دا دەرچووە، دوایین ژمارەشی لە ٢٣ی تەمووزی ١٩٣٢دا دەرچووە، تێکڕا (٢٤) ژمارەی دەرچووە، بەناو مانگانە بووە بەڵام کەم جار توانیویە ناوا دەری بکات، گۆڤارەکە (اجتماعی، تأريخي، فني، أدبي) بوو بەڵام نەدەبوو بەلای سیاسەتدا بچێ!!... کۆمەڵێکی باش لە وتار و نووسینی بەنرخی تێدایە جگە لە دەنگوباس و شیعر و لێکۆڵینەوە، ژێدەرێکە بۆ بزاڤی ڕۆشنبیری و مێژوویی و ڕۆژنامەگەری کوردی. (بۆ زیاتر بڕوانە: د. کوردستان موکریانی، زاری کرمانجی، دەزگەی چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان - هەولێر، ٢٠٠٢).



لەم چەند ڕۆژەدا گەلێ شتم دی، بەلام زۆری خۆش بوون، هەمووی لێرەدا یەک بەیەک دەنووسم با کوردانی هاوخوێنانم لێی کەلکەوەر بن.

***

ئیتر هەرچی لە دوای ئەم دێرانەوە دەنووسرێ هەموو لە سلێمانیدا بووە و نووسراوە...

## وردە هەواڵ لەم (١٨) ڕۆژەدا

بیری ئەهالی: هەرچی بیدەوبستێنەرەکان بوو، لەبەر بێ پووڵی خوێن ڕشتن، سا هی پار بێ یا هی ئەمساڵ[1] بەگشتی لە خوایان دەخواست زوو ئەم دەمە بەسەربچێ، بەلایەکدا ڕاست بێتەوە؛ یان شێخ مەحموود یان ئەمان:

بەکۆمەڵ جنێویان بەئینگلیز دەدا، لام وایە لە خۆیانیش بەگلەیی بوون... دەستەی خوێندەوارەکانیش حەزیان بەسەرکەوتنی شێخ مەحموود دەکرد، هێشتا لەسەر کوردایەتیان مابوون، خۆ ئەوانەی کە لە بەندیخانەدا ببوون[2] هەریەکە ئاگرکەرەوەیەک بوون بۆ عەرەب و ئینگلیز؛ نوێژکەرێک بوون بۆ سەرکەوتنی شێخ!... ئەوانەی کە زۆر دڵ ئازاردراو ببوون، دڵی ناسکیان ببوو بەکەباب، (بوێژ)ەکان بوون، خۆشخوانی (ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ، حاجی تەوفیق، فایەق بێکەس)م دەسکەوت کە ئەو ڕۆژە ڕەشەی پاریان خستبووە سەر لاپەڕەی مێژووی کورد.

(شێخ سەلام)یش بەدیی عوبەیتولڵرەممی دەرخستبوو، لێرەدا یەک بەیەک دەنووسرێن...

لە کۆمەڵەکەی پار کە لە هەراکەدا دەستدار بوون، ئێستاش لەسەر قسە و کۆششی خۆیان دەڕۆن. بیری کوردایەتی لە وزە بەدەر بلاو بۆتەوە، لە هەموو کەللەی کوردێکدا تەقیوەتەوە،؛ توور فرۆش، سەوزە فرۆش، مەلا، پشت کۆماوان، پۆلیس، هەتا لادێییە نەزانەکانیش ئێستە کورد پەرستن، کۆشش و هەوڵ بۆ کوردایەتی دەدەن. هەوڵ بۆ کوردایەتی دەدەن، حەز بەهیچ بێگانەیەک ناکەن... هەمیشە لە عەرەب و ئینگلیز دەدوێن.

(١) بیدەوبستێنەر: بازرگان. ئەوەی مەبەستێتی لێرەدا و دەیڵێ: هەرچی بازرگان و دەوڵەمەندەکانە کە نە پار (لە شەشی ئەیلولدا) و نە ئەمساڵ (کە ڕاپەڕینەکەی شێخ لە ئارادایە) کە بایی پوولێ خوێنیان نەڕشتووە، بەگشتی ئاواتخوازی ئەوەبوون ئەو ڕەوشە ئالۆزە بەمبارێکدا بکەوێ و ئاسوودەیی بەرپابێتەوە. وەنەبێ ئەم چینە هەر لەو ڕۆژەدا وابووبن، هەمیشە بارێکی وایان دەویست کە کاروکاسبیەکەیان دووربێ لە مەترسییەوە، لە ٢٩ی مایسی ١٩٢٣دا کە شاندێکی حکوومەتە عەرەبییەکەی بەغدا بەسەرۆکایەتی (عبدالمحسن السعدون)ی سەرەک وەزیران و (صبیح بگ افندی) ئەمینی پایتەخت و (کۆلن والیس)ی ڕاوێژکاری ناوخۆ هاتە سلێمانی، تەنیا چینی بازرگانەکان بوو کە شەیدای بەستنەوەی دەڤەرەکە بوون بەبەغداوە، ئەویش بەمەبەستی خۆشڕەوی کاری بازرگانییەکەیان.

(٢) لە دوای شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ ڕۆژانی دوایی، حکوومەت ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی شاری دەسگیرکرد و ڕەوانەی بەندیخانەکانی کەرکووک و بەغدای کردن.

شێخ مەحموود: شێخ مەحموود هەمیشە لە تەقەللادایە، فەرمانی داوە بەهیچ ڕەنگێک چەتەکانی دەست لە کورد نەدەن، ئەگەر عەسکەری عەرەبیش بێ[1]، زیان لە ئەهالی نەدەن. بەڵام بەهیچ کلۆجێ ڕێی عەرەبێک یاخود دوژمنێکیان نەدەن بێنێ لە ژیاندا، ڕووتیان بکەنەوە!...

بەبێ ترس مەڕانە و بزنانە دەستێنێ، لە هەموو لایەک بۆتەوە ناو سلێمانی و ڕۆژئاوای ئەبێ: چونکو بەزدوی خۆی دادەنێ، هەموو کاغەزیان دەداتێ بۆ دانی بزنانەکەیان. لەبەر ئەوە لام وایە حکوومەت لە بزنانە و مەڕانە چاوی لێ پۆشیون.

بێ باک ئەم جەژنەی لە (بەرزنجە) ڕابوارد، کە هاتەوە لە دێی (قولڕخ)[2] بوو، بەردەستێکی زۆری هەیە، وەکو دوژمن دەڵێن جەردە نین؛ چونکو لە کورد ناخۆن لە دوژمن ئەبێ.

بۆ جەژنێ نامەی بەهەمولایەکدا بڵاوکردەوە: «ئێوەی کورد جەژنتان نییە، شێتانە، لەبەر ئەوە سەرخۆشی کوژراوەکانی هاوینێ و ئیستاتان لەیەکتری بکەن»...

لەم ڕۆژانەدا، ١٩٣١/٣/٤، چوار پێنج ئۆتۆمبیلی عەسکەری بە(١٦) هەزار ڕوپیەوە، بەچەند مەترەلۆزەوە چووبوون بۆ هەڵەبجە، یەک ئۆتۆمبیلی خۆمانیان پێ بووبوو، لەناو (سەی سادق و گوریزە)[3]دا، چەتە -١٨ کەس- ڕێیان پێ دەگرن، ئۆتۆمبیلێکی ئەهالی دێت دەستی لێ نادەن، دەڕوات. پاشان یەکە ئۆتۆمبیلی عەسکەر دێ، تەقەی لێ دەکەن، کوردێک مەترەلێوزەکەی دەوەستێ، دوایی لەسەر ئازایەتی خۆی دەکوژرێ، بەڵام هەموو ئۆتۆمبیلەکانی تر کە عەرەبیان سواردەبێ دەگەڕێنەوە شار، لەم ناوەدا ئەم کوردە عەسکەرەی تیادەچێ، لە چەتەش چوار دەکوژرێ.

عەرەبەکان، بەعەسکەر و سەرکۆماردەوە لە شار کوردەکەیان بەسەر ئۆتۆمبیلەوە برد بۆ سەر قەبران، لەوێ بەساز و تەقاندنی تفەنگ و وتەوە دەینێژن. بەڵام بەمە قینی ئەهالیان زۆرتر کرد، ئابرووی خۆشیان برد!...

بەڵام ئۆتۆمبیلەکەی پێشوو لە دێی مەستەکان[4] ڕووت دەکرێتەوە، لەوێ دەچنە کن (شێخ مەحموود) هەموو شتەکانیان بۆ دەسێنێتەوە؛ چونکو کورد دەبن، بەڵام یەکێکیان پیاوی (شێخ عەلادین) دەبێ، یاخود دەرویشی دەبێ، شێخ بۆی ناسێنێتەوە، پێی دەڵێ: (بچۆ لای شێخ عەلا نوێژ بکە، ڕەنج بۆ بێگانە بدەن! خوا هەر واتان بەسەربێنێ).

هەرای هەڵەبجە: لەوێ وەکو دەڵێن عەسکەر دەستی لە دوو سێ ئافرەتی هەڵەبجەیی کردۆتەوە، بەڵام خۆیان پێ ڕزگارکراوە، بۆیان داگیر نەکراون!.

ئافرەتەکان ئەمە بەهەڵەبجەیی دەگەیەنن، پۆلیسی هەڵەبجەیی لەلایەکەوە، عەسکەریش لەلایەکی

(١) مەبەستی ئەوەیە: ئەگەر عەسکەریش بۆ حکوومەتی (عەرەب) بکات.
(٢) قولڕخ یا قلرخ: گوندێکە لە نێوان سەرای سوبحان ئاغا و سەی سابەقە لە خوار شەقامە گشتییەکەوەیە.
(٣) گوریزە، گرێزە: گوندێکە لە نێوان عەربەت و سەی سابەق نزیک بە(موان) و سەراوی سوبحان ئاغا.
(٤) مەستەکان: دەبێ ناوەکە بەهەڵە نووسرابێ، ئەگینا ئەم ناوە نییە.

ترەوە تێک بەردەبن، لەهەردوولا دەکوژرێ، هەر لەسەر ئەوە عەسکەری هەورامیش هەڵدەکوتنە سەر شەڕەکە و لەگەڵ عەسکەر بەشەڕ دێن.. جا بۆنەی ڕوونکردنەوی ئەو ئۆتۆمبیلانە لە ڕێی هەڵەبجەدا لەوەوەیە... قوتابخانەکەش داخراوە، پۆلیسی تێ چووە، لە قوتابیان (نووری) ناوێک ڕایکردۆتە لای شێخ مەحموود.

زانستی: لەسەر هەوڵ و تەقەللادانی (کەریم سەعید)[1] بەسایەی تکای چەند پیاوێکەوە لە موتەسەریف سێنرا[2]، زانستی کرایەوە، ١٩٣١/٢/٢٥ دەست کرایەوە بەیاریدەدانی لەلایەن (دارۆغا - بەلەدیە)وە.

وام دەزانی، لە زانستیدا قوتابی کەم نایێتەوە چونکو تەقە و پلاری یارەکانی حکوومەت گوێی هەموومانی پڕ کردبوو، کە هەراکە لە زانستییەوە بووە و بەو پێکهاتووە. بەڵام دووەم شەو بوو، سەد و دە قوتابی کۆبوونەوە، سێ مامۆستاش (کەریم سەعید، فائیق بێکەس، ئەولا سامی) بەخۆڕایی پێیان دەخوێنن.. خوێندەواریش بەپۆل و بەتاقە تاقە ڕوویان دەکردە خوێندنەوە خوانکەی تا ڕۆژنامە و نووسراوان بخوێننەوە!!

سلێمانی: هەرچەندە لەم (١٨) ڕۆژە پێنج شەش ڕۆژی لێ دەرچێ هەر لەناو بەفر و باران و ڕەشەبادا رامان بواردووە، بەڵام چاوئەندازەکانی، فراوانییەکەی، با پاکەکەی هەموو خەمێکی لە دڵما پاک کردبووەوە، هەموو ئێشێکی لەشمی تەفروتوونا کردبوو.

بەیانی هەڵسام، ڕۆژ خۆش بوو... هەتا هێزم بێ چاوم دەبینێ، شاخی دارمازەڵە لە دوورەوە دیارە، شین دەکاتەوە، تەوقە سەرەکەی ئەبێ کە بەقەیتانێکی پەمەیی تیشکی ڕۆژ ڕەنگین بووە، بایەکی پاک و خۆش دێ بەسەر ئەو چلەدارانەدا. خۆم پۆشتە کردەوە، چوومە دەرێ، کە دەبینم ئەوا شار لە هەموو لایەکەوە ڕازاوەتەوە. بەردەرکی سەرا لەبەر کورد و منداڵی کەوا سەوز و سوور، ئۆتۆمبیل، دەرگەزێن لەبەر چەرخوفەلەکی ڕازاوە بەدەستە کچی ئالووالا لەبەر، ڕێ بەر کەس ناکەوێ.

سبەی کە خەبەرم بووەوە دەبینم شاخەکە هەڵمی لێهەڵدەستێ لەبەر هەڵم سپی بووە، ئاسمان هەور داگیری کردووە، ڕەشەبایە، تاریکە، بەفر وەکو لۆکەی شیکراوە لە وێنەی ئەستێرەدا وەک گوڵە مێخەک دەهاتە خوارەوە، سەیرێکی هەزار سینەما و شتی تری بەغدای دەهێنا.

(١) کەریم سەعید: کەریم سەعید زانستی (١٩٠٧ - ١٩٩٦/١/١٤) مامۆستا و ڕۆشنبیر و دڵسۆزی ئەو ڕۆژگارە. کوڕی (سەعید بەگی سلێمان بەگی غەراس)ە لە حوجرەی خواجە فەندی و مەکتەبی ئەشوێقیە خوێندوویە و دوایی لەگەڵ مستەفا سائیب و فوئاد ڕەشید لە مەکتەبی (صنایع)ی کەرکووک خوێندوویانە و چوونەتە بەغدا و لە مەکتەبی هەندەسە خوێندوویە. لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵی زانستی بووە و ڕەنجێکی زۆری بۆ داوە، لە ١٩٣٢/٣/٢٧ لە ئەشغالی سلێمانی وەک ئەندازیار دامەزراوە. لە ١٩١٠ ژنی هێناوە، سێ کچی هەیە، لەو کتێبانەی چاپی کردوون: ڕەوشت و خوو، گۆرانی کوردی، شیعری بڵاوکراوەی هەیە و هەندێکیشی بڵاونەکراونەتەوە.

(٢) لەو ڕۆژەدا ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ ١٨٩٨؟-١٩٦٣ بۆ جاری دووەم موتەسەریف بووە.

ئینجا سەرما، ئینجا باران، قوڕ و چڵپاو، نەیدەهێشت کەس سەر لە کون بکاتە دەرەوە... بەڵام هەرخۆشبوو چونکو بەردەمم تەگیرابوو، ڕۆژ و شاخ و داخ، درەختم لە دەشتێکی پان و فراواندا دەدی، نەبووم بەکەوی ناو قەفەز!...

ئەویش دەمێ بوو، لاچوو ئینجا دەمی خۆشی هاتە پێشەوە، دەتبینی ڕۆژ لە خۆشیدا پێدەکەنی، ئەمەندە جوانە، نازەنینە، ئەمەندە با سازگارە پیاو لە ماڵدا خۆی ڕانەدەگرت، بەیانیان، ئێواران، هەموو حەلێک بۆ دەرودەشت بێقەرار بوو.

ئەوەندە شەماڵەکەی بێوێ بوو، ئەمەندە ڕۆژەکەی گەرم بوو لەگەڵ ئەوەشدا کە بەفر شاخ و کێو و دەرودەشت و ناو شاری داپۆشی بوو، نازی زستانی دەکرد بەسەرمانا، کەچی لەبەر خۆشی پیاو بە بەهارێکی ڕەنگینی دەهاتە پێشچاو.

بۆ سەیری چاوئەندازی خوایی خۆی پێ ڕاگیرنەدەکرا، لە ڕۆژان زیاتر، دەگەڕا، خۆ ئەگەر هەموو شتێکی ئەم کۆ چەم لەبیر بچێتەوە کە لە سلێمانیدا، ڕامبواردووە، قەت ئەوەم لەبیر ناچێتەوە کە ئێواران بەکۆمەڵ لەگەڵ هاوڕێ دڵسۆزەکانمدا لە دەشتی گوێژە لە سوچێکی شەقامەکەوە بەڕێز ڕاوەوەستاین، بیرمان لەو زار و نزار و مێرغوازە دەکردەوە، بایەکی خاوێنمان هەڵدەمژی و سەیری شاخی گوێژەمان دەکرد؛ لە تەوقە سەریەوە تاکەمەری بەبەفر داپۆشراوە، تەوقە سەرە سپیەکەی وەکو مێزەری مەلا، لەبەر تیشکی یاقیقینی ڕۆژ دەبریسکایەوە، دامێنی گوێژەش گڵی سوور، خوارەوەش دەشتێکی سەوز دەتوت پەڕی تاوسە؛ بەتیشکی ڕۆژەکە ڕەنگین ببوو، لەناو ئەو سەوزاییەشدا کار و بەرخی ڕەش و سپی بوو بوونە خاڵی سەرگۆنا بەلای ئەو چیمەنەوە.

هەر ئەمەبوو وایلێکردبووم ئێواران تا حەلێکی درەنگ نەدەچوومەوە ماڵێ، هەتا مەڕگەل و مانگا لە کەژەوە هوروژمی دەهێنایە شارەوە تۆزێکیش بەسەیر ئۆحە ئۆحەی گاوان و قیرەقیری شوان ڕام دەبوارد، ئینجا دەهاتمەوە!!

سەیران: بەڕاستی مانەوەی ئەو چەند ڕۆژەم لە ماڵدا بەتەرحێکی وایلێکردبووم کە هاتمە دەرێ بەجارێ تۆڵەی هەموو ڕۆژەکان لە زستان بستێنم، ئیتر هەر ڕۆژێ ۱۹۳۱/۲/۲۵ بوو کە ڕۆژ خۆشی کرد، ئێمەش شەش کەس ڕێککەوتین چووینە سەیران. ڕاوێشمان کرد... هەندێ نان و هێلکەمان پێکهێنا، بەکێکی ترمان چادانەکەی هەڵگرت، ئەوی تریان وێنەگرەکەم، خۆشم تفەنگێکی ڕاوم بەشەش فیشەکەوە کردبووە شان.

کەوتینە دەشت، کزەبایەکی فێنک، زەویەکی سەوز، ئاسمانێکی شین چەند پەڵە هەورێک ڕازاندبوویەوە، لە هەر کوچەوە دەنگ دەهات: دەهۆڵ لە لایەکەوە، بۆڕە بۆڕی مانگا و قیرە قیری شوان، بارە باری مەڕ و بزن مەل و بولبولان، قرتە قرتی حاجی لەقلەق لە هەموو لاوە، ئەمانە پیاوی بەتەرحێک لێ کردبوو زامی سەرمای ئەو دە دوانزە شەوەی سارێژ ببێ، ئینجا بێتە جۆش، بێتە گۆرانی وتن، هەرا کات... یاری بکات!... کاتێکمان زانی کەوتینە ناو وەردە سوورەکەی بەسەر قەبرانەوە لە دوور خاڵ خاڵی

ڕەشمان لە گوێ شیوەکەی بەر هۆمەرمەندان[1] بەدی دەکرد، پێیان وتم: ڕیشۆڵەیە. منیش بەخۆم و تفەنگەکەوە بەماتە ماتە لە قەراغ شیوەکەوە خۆم گەیاندێ. فڕین. تۆزێکی تر چوومە ئەولاترەوە پۆلێکی گەورەم لە گوێ ئاوەکەدا بەدی کرد، بەناو شیوەکەدا وەک دز بەبێ خشپە خۆم گەیاندە بن کەندێک[2]، لەوێوە تفەنگەکەم ئاراستەکردن، مشتم لێ گرت، کاتێکم زانی گرمە هەڵسا بەسەرا گەیشتم کە نواڕیم دووانیان بەجێمابوون!... ئەمە یەکەم جارم بوو ڕاو بەتفەنگ بکەم... ئیتر هەر ڕۆیشتین تا سێ، ڕیشۆڵەی تریشمان کوشت!، ئینجا کەوتینە خوار شیوەکانی جوولەکانە[3]وە، لەوێدا پۆلێ مراویان پێ گەیشت، بەڵام شوێنەکەی دەشتانی بوو کە ئێمەیان دەدی دەیاندا لە شەقەقەی باڵ.. بۆمان نەدەکوژران... لەوێدا لەسەر گردۆڵکەیەک بەگشتی قنەڵفسێکمان دایەوە[4]، دەستمان کرد بەوتنی گۆرانی کوردی.

ئینجا بەقسە و گاڵەی خۆش... ئینجا من و تاهیر بەگی[5] هاوڕێم بەردێکمان نایەوە بەنیشانە، (١٥) هەنگاو دوور، بەردەکەش بچووک بوو، هێشتا نیشانم نەنابووەوە کە بەر دەمانچە ئینگلیزیە یەکەم فیشەکم نەتەقاند کە بەردە بەپشتا کەوت. کەچی تاهیر بەگ کە بەسەدانی لەوانە تەقاندووە دووانی تەقاند، نەیپێکاوت... ئیتر وازی هێنا!... کە ئاورمان دایەوە لەبەر (وڵووبە)[6] داین، ئیتر ڕاستەوخۆ ڕوومان کردە ئەوێ، لەوێ لەسەر شیوەی دیدەوانی لەسەر کانی و ئاوێ سفرەمان ڕاخست، ناردمان ماستمان کڕی، بەپێکەنینەوە چێشتەنگاومان کرد، چایەکەمان دەرهێنا، دەتوت ئێستا تێت کردووە، ئەویشمان نۆشی.

ئینجا تێر بەناو دێیەکەدا گەڕاین، ڕوو سووری و ئازایی ژنی کوردمان بینی کە چۆن یارمەتی مێردەکانیان دەدا... ئیتر هەر بەگۆرانی وتن بەناو (............)[7] تا گەیشتینە باخی مەولانا[8].

سڵاومان لە کابرای جووتیار کرد، بەڵام ئەو بەسەندنەوەی سڵاو وازی نەهێنا، بەدەنگێکی بەرز تێی

(١) هۆمەرمەندان: گەڕەکێکە دەکەوێتە خوارووی شارەوە، زۆربەی دانیشتووەکانی هەژار و زەحمەتکێش بوون، دۆمیشیان تێدابوو کە کڵاش و بێژنگ و جۆرە چەقۆیەکیان دروست دەکرد، خانووەکانیان لە قوڕ و تەنە کۆڵانەکانی تەنگەبەر و تارێک.

(٢) کەند: ئەو لایە کە ئاو دایدڕیوە لە شیوەکە، (جرف).

(٣) جوولەکان: گەڕەکێکە بەلای ڕۆژئاوای هۆمەرمەنداندا لە خوارووی شارەوەیە، زۆربەی دانیشتووەکانی جوولەکە بوون، لە کۆتایی چلەکاندا بەرەو وڵاتی خۆیان ئیسرائیل ڕەویان کرد. لەو گەڕەکەدا بازاڕ و کەنیشت و هەتا دەلاکی تایبەتی خۆیانی تێدابووە.

(٤) بەمانای: کەمێ دانیشتین و پشوویەکی کەممان دا.

(٥) تاهیر بەگی یەحیا بەگ ١٩١١-١٩٧٩ مامۆستا و کەسایەتی شاری سلێمانی، باوکی وشیار بابانی بەهەشتی کە ماوەیە سەرۆکی شارەوانی بوو، هەروا ڕزگار و بەختیار و ڕۆژگار.

(٦) وڵووبە، ئوڵوبە: لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی سلێمانییەوە، نێزیک بەرێگاکەی تانجەرۆی جاران، دەڵێن گوایە ئەم ناوە لە (لۆلۆ)بیەوە هاتووە. (وڵووبە و شێخ عەباس) ئێستا بوونەتە دوو گەڕەکی شار.

(٧) پەڕەی دەستووسەکە لێرەدا دڕاوە و چەند وشەیەکی نەماوە.

(٨) باخ و کارێزی مەولانا: لە خوار گەڕەکی جوولەکانی خوار سلێمانی بووە.

خورین!: «یاخوا بەرخورداربن، یاخوا پێبگەن بۆ کورد تا لەم بێ دەرپێیانە رزگارمان بکەن!؟

ئینجا تێبگە چۆن بیری کوردایەتی لە مێشکی هەموو کورددا تەقیوەتەوە... جا سەیر ئەوەیە کە بۆ باوکم دەگێڕایەوە کە نیشانەکەم وا شکاندووە پێی وتم: «رۆڵە ئەگەر کوری من بیت دەبێ سواری، تفەنگچێتی، هەموو شتێ کە لە دەست کوڕێک بێ بیزانیت، چونکە تۆ لە تیرەی هەمەوەندیت، لەبەر ئەوە ئەم هاوینە نابێ بێیتەوە تا فێری مەلەکردن دەبیت، تفەنگێکی ڕاو بەخاڵت دەکرێت کە لێرە فێری ڕاوت بکەم، فێری سواریت بکەم، ئینجا ببیتە بێچووە هەمەوەند بێچووە کورد!».

***

لەوەبەر، ١٩٣١/٢/٤، بەهۆی هاوڕێتی خۆشەویستمەوە مامۆستا (نوری ئەفەندی حاجی ساڵح ئاغا) گەشتێکی تری وام کرد، سەیران بوو، نزیکی بیست قوتابی لەگەڵ سەر مامۆستا (عەلی کوردی)[1]دا

چووبووینە (قۆریە شکاو[2]... بەبەرگی دیدەوانیەوە بەخۆم و تفەنگەکەم و وێنەگرەکەمەوە چوومە... بەرەیان لە دەوری کانیەکەی قۆریەشکاودا ڕاخستبوو... بێ، ڕەنگێن بەهارێکی سەیر بوو: سەماوەر و قوری... مەڕ و ماڵات لە دوور دەلەوەڕان، چار... یەجگار جوان بوو:

جێ هەر قۆریە شکاوە: وێنەی خۆنەبیزراوە: مەشهور و زۆر بەناوە

بروانی لە هەر لاوە: دەستەی کچان و لاوە: وەک چنار و لاولاوە

پاشان لەوێ ئەوەستاین، چووینە (موشیرئاوا). لەوێ هەوارمان داکوتا. چاییمان دەمکرد، بەرەمان راخست، گۆرانیمان وت، دەستمان کرد بەقسەی خۆش ... ئینجا چووینە ڕاو. پاشان دەستمان کرد بەنیشانانەوە و دەمانچە تەقاندن .... ئینجا بەگردبوونەوە و گوێگرتن لە گۆرانی قەتار و نیوەشەوی لادێیەکان. دوایی یاری سێ باز و کەوشەک، بوخچە بەگەردانی، ڕاکردنی ..... ئیتر (شێخ سەلامی بوێژ)[3] هات، ئەویش گەلێ خۆشخوانی خۆی بۆ خوێندینەوە، پاشان نان خورا، بەڵام چەند بەخۆشییەوە دەمانخوارد، پەردە پلاوی تێدابوو، کە هەر کوردە دەیزانێت.

(١) عەلی کوردی: عەلیەفەنی: کاکە عەلی: دەربارەی ئەم مامۆستا بەڕێزە زانیاری کەمە، ئەوەی هەیە: لە سەردەمی عوسمانیدا ئەفسەری سوپا بووە، نازانێن ڕوتبەی چی بووە، برادەری نوری سەعید بووە، هاتۆتە سلێمانی بەمامۆستایی، لە زۆربەی قوتابخانەکانی ئەوسادا مامۆستایی کردووە، ڕووخۆش و قسە ئەستەق، چووبووە دڵی هەموانەوە، لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا بەبەهەشت شادبوو، دەڵێن بەئەسڵ تورک بووە.

(٢) بەرای مامۆستا جەمال بابان: دەکەوێتە شوێنی گەردکی مامۆستایانی ئێستا، ئەوسا قۆریە شکاو ناوی هەبوو، یا بەهاران ناوی تیا دەژیایەوە، سەیرانکەر بۆی دەچوو بەڵام دار و درەختی نەبوو... ناوەکەشی دەبێ لەوەوە هاتبێ کە قۆری سەیرانکەری لێ شکاوە. (بڕوانە: جەمال بابان، سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەشی دوو، دەزگای ڕۆشنبیری بلاوکردنەوەی کوردی بەغدا، ١٩٩٨ ل: ٢٦٣).

(٣) سەلام: (١٨٩٢ - ١٩٥٩/٣/٣) شێخ سەلامی شێخ ئەحمەدی عازەبانی، شاعیر و کەسایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی ناسراو، باوکی ناهیدە شێخ سەلامە، تێکۆشەر و کەسایەتی ناو بزاڤی ڕزگاری نەتەوەیی و جووڵانەوەی ئافرەتانی کوردستان.

ئیتر لە پاش کەیفێکی زۆر و تەواو، باران بارین کۆچمان کردەوە ناو شار، لە ڕێ وێنەیەکی قوتابییەکانم بەمەڕ و بزنی شوانێکەوە لەناو ئەو دەشتە سەوزەدا، لە گەڕەکی کانی ئاسکان، گرت:





## کۆشش بۆ نووسراوانی کوردی

ڕەنگە من لە هاوڕێکانم سا کوردبێ یان بێگانە کەس نەمابێ لەلای نەمدرکاندبێ کە نیازی من، پێکهێنانی (نووسراوخانەیەکی) گەورەی کوردییە، زۆر کەس هەن بەکۆکردنەوەی پوولەوە خەریکن، هەن بۆ وێنە کۆکردنەوە هەوڵ دەدەن، هەن بۆ شتی تر دەسووڕێنەوە، بەڵام من ئارەزووی ئەوانە هیچیانم نییە، بۆ هیچیان ناگەڕێم بۆ نووسراوی کوردی نەبێ. ئەم بیرەش کوڕی ئیمڕۆی کەللەم نییە[1]، لە ساڵی ١٩٢٦م ەوە من تەقەللا دەدەم تا ئیمڕۆ، ئەمەش لەوەوەیە کە دڵم بۆ کورد بووەتە کەباب. دەبینم لە هیچ شوێنێکەوە ناوی نووسراوەی کوردی نییە، کەچی نووسراوەی بێگانە لەناو خانووی کوردیشدا وەک لیژنەدار کەڵەکە بووە... دیارە ئەمەش لە زۆری بێگانەوە بووە کە کورد و ئەیارانیشی لە زمانی کوردی شارەزا نین بەڵکو زۆر بێگانە هەن دەڵێن کورد زوبانیش و نووسراوشی نییە... منیش یەکێ بووم لەو بیردارانە، بەڵام کە بینیم پێش خواردنەوە کەڵکی کورد ناگرێ، لەلایەکی تریشەوە دەمزانی کە زوبانی کوردی هیچ لەم زوبانە زیندووانەی ئێستا کەمتر نییە بەڵام ناسەربەخۆیی وای بەسەردا هانیوە، لەولاشەوە کە دەمبیست بێگانە خەریکن هەرچی نووسراوانی کوردستان هەیە بیکڕن، هیچمان لەناودا نەهێڵن لەبەر ئەم شتانە کەمەری پەروەردەکردنی زمانی کوردیم بەست. گفتم بەخۆم دا هەتا لە توانامدا بێ نووسراوەی کوردی کۆبکەمەوە کە گەورەترین نووسراوخانەی کورد لە دونیادا بهێنمە بوون!! تا ئێستا کۆمەڵێکی بێ شومارم لە چاپدراوانی کوردی (کۆن و تازە) کۆکردۆتەوە. لە دەستنووسیشم دەستکەوتووە. بەڕاستی ئەمجارە تەقەللایەکی یەجگار گەورەم دا، کۆششێکی زۆرم کرد، سەرێکم هەبوو و هەزار سەودا، بەهەر چوارلادا، سلێمانی و دەوروپشتیم دەپشکنی، ئەمەش بەکورتی ناوی ئەو شتانەیە کە هەوڵم بۆ داوە و دەستم کەوتووە یاخود بەڵێنیان پێ داوم دەستم بخەن.

پێشکەوتن[2]: یەکەم ڕۆژنامەیە کە بەکوردی لە سلێمانی دەرچووە، پڕە لە شتی زۆر ناوازە کە بۆ کوردستان بەکەڵک دێ، نووسینێکی زۆر جوانی تێدایە. نۆ ژمارەی نەبێ هەر (١١٨) ژمارەکەیم لە خزمێکم چنگ کەوت.

(١) ئەم ڕستەیە دەقاودەق بەعەرەبی ئەمە دەگرێتەوە: «... وهذه الفكرة لست بنات أفكاري اليوم»... زۆر جار ئێمەی نووسەرانی باشووری کوردستان بەعەرەبی بیر دەکەینەوە و بەکوردی دەینووسین. ئەمەش خەوشێکی بەرچاوی نووسینە.

(٢) پێشکەوتن: هەفتەنامەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی بووە، خاوەن و سەرنووسەری مستەفا پاشای یاملکی بووە. لە ٢٩ نیسانی ١٩٢٠ ژمارەیەکی دەرچووە، لە ٢٧ی تەمووزی ١٩٢٢ دوا ژمارەی دەرچووە، بەهەمووی ١١٨ ژمارەی لێ دەرچووە... میجەرسۆن دامەزرێنەری بووە، لەسەر ناوی ڕۆژنامەکەوە وشەی (سلێمانی) نووسراوە، کە شێخ مەحموود گەڕایەوە سلێمانی دەستبەجێ ئەم لە دەرچوون کەوت و (بانگی کوردستان) جێی گرتەوە. لە ١٩٩٨دا وەزارەتی ڕۆشنبیری بەبۆنەی ١٠٠ ساڵەی ڕۆژنامەگەری کوردییەوە هەموو ژمارەکانی ئەم هەفتەنامەیەی بەجوانی بەچاپ گەیاندەوە، ئەو کارە لە کۆکردنەوە و ئامادەکردنی عەلی ناجی عەتتار و سیروان بەکر سامی بوو. بۆ زیاتر بڕوانە: پێشکەوتن یەکەمین ڕۆژنامەی سلێمانی، پێشەکی د. مارف خەزنەدار ١٩٩٨ هەولێر، وەزارەتی ڕۆشنبیری.

ڕۆژی کـوردسـتـان[1]: ژمـارەی ئەم ڕۆژنامـەیشم تەواوکـرد، دوو سێ ژمـارەی ڕۆژنامـەی (بانگی کـوردسـتـان)[2]یشم دەست کەوت کـە بەم پێیـە (بانگی حەق)[3]ی لێ دەرچێ هەمـوو ڕۆژنامـەکـانی سلێمانیم هەیە.

ژیان[4]: ئەم ڕۆژنامەیە ئێستاش لە دەرچووندایە، بۆ (٢٦٠) ژمارە (٤٠) دانەم دەویست، ئەویش هاوڕێیەکم بەڵێنی داوە لە چاپخانە بۆم بدۆزێتەوە.

کەوابوو لەگەڵ ئەم چەند ژمارەیەم نزیکی (٥٣) ژمارەم دەستکەوێ هەرچی ڕۆژنامەی سلێمانی هەیە: (پێشکەوتن، بانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان، ئومێدی ئیستیقلال[5]، بانگی هەق، ژیانەوە[6]، ژیان) کە بەکۆمەڵ (٤٨٩) ڕۆژنامەم دەبێ.

(١) ڕۆژی کوردستان: ڕۆژنامەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی بوو، ئۆرگانی حکومەتەکەی شێخ مەحموود بووە لە سلێمانی، خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری م. نوری بوو، لە ١٩٢٢/١١/١٥دا ژمارەیەکی دەرچوو، لە ٣ی مارتی ١٩٢٣ دوا ژمارەی دەرچووە، تێکڕا (١٥) ژمارەی لێ دەرچووە. مامۆستا جەمال خەزنەدار لە ساڵی ١٩٧٣دا هەموو ژمارەکانی بەپێشەکییەکەوە ئامادەکرد و کارگێڕی گشتی ڕۆشنبیری کوردی - وەزارەتی ڕاگەیاندن لە بەغدا لە چاپێکی جواندا بڵاوی کردەوە.

(٢) بانگی کوردستان: ڕۆژنامەیەکی زانستی، کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، سەربەخۆ و سەربەست و میللی هەفتەیی بووە، خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری مستەفا پاشای یاموڵکی بووە، لە ٢ی ئەیلوولی ١٩٢٤ ژمارەیەکی دەرچووە، لە ٨ی حوزەیرانی ١٩٢٣ ژمارە (١٤)ی لە سلێمانی دەرچووە، هەروا سێ ژمارەی تریشی لە بەغدا دەرچووە، لە ١٩٢٦دا، ئەم ڕۆژنامەیە ئۆرگانی (کۆمەڵەی کوردستان) بوو کە یاموڵکی لە سلێمانی ڕۆژی هەینی ١٩٢٢/٧/٢١ دایمەزراند. مامۆستا جەمال خەزنەدار ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیەشی بەپێشەکییەوە ئامادەکرد و بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری کوردی - وەزارەتی ڕاگەیاندن لە بەغدا بەچاپێکی جوان بڵاوی کردەوە.

(٣) سیاسی هەفتانە بوو، لە ١٩٢٣ لە سلێمانی وەک ئۆرگانی حوکمی شێخ مەحموود دەرچووە، ژمارە سێی بەرواری ڕۆژی شەممە ١٢ی نیسانی ١٣٣٩ی ڕۆمی پێوەیە، ئەدمۆنس لە ئەشکەوتی جاسەنەدا بەدەستنووسی بابەتەکانی چنگ کەوت، چاپ نەکراو بڵاونەکرایەوە.

(٤) ژیان: سیاسی ئەدەبی کۆمەڵایەتی بووە، هەفتانە بووە، لە ١٩٢٦/١/٢١ ژمارەیەکی لە سلێمانی دەرچووە، لە ژمارە (٤٠٦)ەوە پیرەمێرد بووە خاوەنی هەتا ساڵی ١٩٣٨ بەردەوام بوو و تێکڕا ٥٥٣ ژمارەی لێ دەرچوو. «بڕوانە: جەمال خەزنەدار ڕابەری ڕۆژنامەگەری کوردی - بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری کوردی - وەزارەتی ڕاگەیاندن بەغدا ١٩٧٣ - بەبۆنەی یوبیلی ٧٥ ساڵەی ڕۆژنامەی (کوردستان)ەوە چاپ کراوە».

(٥) ئومێدی ئیستیقلال: ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و ئابووری ڕەسمی بوو، حەفتانە بووە، تێکڕا (٢٥) ژمارەی لێ دەرچووە، بەڕێوەبەر و سەرنووسەری ڕەفیق حیلمی بووە، لە ٢٠ ئەیلوولی ١٣٣٩ی ڕۆمیدا یەکەم ژمارەی لە سلێمانی دەرچووە. «بۆ زیاتر بڕوانە ژێدەری پەراوێزی ژمارە (٤)».

(٦) ژیانەوە: هەفتەیی ڕەسمی بووە، لە ١٨ی ئەیلوولی ١٩٢٤ ژمارە یەکی لە سلێمانی دەرچووە، تێکڕا (٥٦) ژمارەی لێ دەرچووە، دوای ڕووخاندنی حوکمی شێخ مەحموود ئەم ڕۆژنامەیە ئۆرگانی داگیرکەرانبووە. «بۆ زیاتر بڕوانە ژێدەری پەراوێزی ژمارە (٤)».

ژمێر ٢/٣/١٩٣١: نووسراوەیەکە بەنووسین شکستەی فارسی نووسراوە، پڕە لە نامەی ڕەنگاوڕەنگ بەفارسی بۆ فێربوونی پیاو، ژمێری کوردی لە هاوڕێیەکم سەند. ئەمەندە کۆنە لە ڕزیندایە. (٢١٥) ساڵە نووسراوەتەوە کە لە ساڵی ١١٣٥هـ دا نووسراوە. نووسینەکەی یەجگار جوانە. ناوەکەی نازانم.

........[1]: ئەممش چیرۆکێکە (تۆفیق ئەفەندی حاجی ئاغا فەتحوڵلا)[2] لە تورکییەوە کردوێتی بەکوردی. (٢١٦) لاپەڕەیە. چیرۆکی ئینگلیزیە باس لە ژن و پیاو دەکا. یەجگار خۆشە.

شێخی سەنعان: ئەمیش نووسراوەیەکی کوردییە، دوو سێ شتی تری تێدایە، نامەم نارده کن (مامۆستا زێوەر) بوێژی ناودار کە بۆم ڕەوانە کا.

گوڵ دەستە: ئەممش نووسراوەیەکی جوانە. لە (داریکەلی)یەوە فەقێیەک گفتی دابوو بەهاوڕێیەکم کە بۆم بنێرێ.

عەبە پینەچی: ئەم کابرایە پینەچییەکی پێنجوێنییە، هەرچی شەوی زستانە بەم تەرحە ڕایدەبوێرێ: هاوڕێکان و دراوسێکانی لە ژوورەکەیدا گرد دەکاتەوە، تا حەلێکی درەنگ نووسراوی کوردی دەخوێنێتەوە... ڕەنگە هەشت نۆ نووسراوەی ببێ، هەموو بەخۆشخوانی چیرۆکن و نووسراونەتەوە، بەتەقەللایەکی یەجگار چنگ دەکەون، زۆریان لە ٣٠٠ لاپەڕە زیاترن، هەموو چیرۆکی کوردین، دوو سێیەکیانی پیشان دام: (بەدیعولمولک، موختارولمولک، داستانی ڕۆستەم و جیهانگیر) یەجگار مەراقدەر بوون. بەڵێنی دامێ یەکێکم بۆ بنێرێ ئەوانی تریشم لە هاویندا بۆ بدا بەنووسینەوە...

مردنی پێغەمبەری: ئەمیش نووسراوەیە بەخۆشخوانی مردنی پێغەمبەری بەزمانی کوردی هەورامی پیشان دەدا، ٤٠ لاپەڕەیەک دەبێ، عەلی عارف ئاغای هاوڕێم دامێ...

جگە لەمانە زۆر کەس لەوێ گفتی دامێ کە ئەم تەرحە نووسراوانەم دەست بخا، ئەوانەش بەشێکیان مەلان، ئەوانی تریان هاوڕێی خۆمن... هاوڕێیەکی تریشم بەڵێنی ئەوەی دامێ کە کۆمەڵێکی گەورە خۆشخوانی بوێژەکانی کورد (لە کۆن و تازە)م بۆ ڕەوانە بکا.

«ئاخ ئەم گفتانە بەجێ هێنرانایە!»

(١) لە دەستنووسەکەدا ئەم جێگایە ناوا بەجێ هێڵراوە، بەڵام لە نامیلکەی (خەباتی ڕۆشنبیران)دا ناونیشانی (چیرۆکێکی پەرچڤەکراو)ی بۆ داناوە.

(٢) تۆفیقە فەندی ئاغا فەتحوڵلا: کەسایەتییەکی شاری سلێمانی بوو، کوڕی ئاغا فەتحوڵلایە لە سەردەمی عوسمانیدا سەرۆکی شارەوانی سلێمانی بووە، دوای سەید ئەحمەدی بابەڕەسوڵ. هەروا بازرگان و خاوەن موڵک بووە، دوای خۆی تۆفیقە فەندی ئەو خانەی کەوتبووە لای سەرووی جێی بازاڕی دۆلارەکەی ئەمڕۆ، تێکی دا و سەرلەنوێ تازەی کردەوە،ماڵیان بەدیوی ماڵی تۆفیق قەزاز بوو لە پشت حەمامی گازێ. ناوبراو باوکی شەهید (دارا تۆفیق)ە ئەندامی مەکتەبی سیاسی پ.د.ک و سەرنووسەری ڕۆژنامەی (التآخي) لە دوای ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠.

## بەغدا ١٩٣١/٣/٧

ئیتر لە پاش ئەمەی لەشمان هێزدار، بیرمان هۆشیار بووەوە، بەکۆمەڵ لە رۆژی ٧ی مارتدا ١٩٣١ـ گەڕاینەوە بەغدا، گەلێ لەوێ خۆشمان ڕابوارد، بەڵام جیابوونەوە زۆر کاری کردە دڵمان. لە نوستن و دانیشتن و هەڵسان و خواردنا لای خۆمان دەهاتەوە یاد، جێگە و بانێکی ترمان دەهاتە پێش چاو، بەتەواوەتی ئاگرستان بوو لە چاو وڵاتی خۆماندا... بەڵام چونکی لە پێناوی بەرزی وڵاتدا ئەم کەشمەکەشە دەکەی، هەر خۆشە، هەر سەربەرزییە... ئیتر بژی وڵات!...

## کورد و کۆمەڵی گەلان ١٩٣١/٣/٧

ئیمرۆ بەتەواوەتی بۆم دەرکەوت کە کۆمەڵی گەلان بۆ حکومەتی ئینگلیزی نووسیوە کە ئەو ئەمەکەی لە حەلی خۆیدا بەکورد دراوە دەستبەجێ بەجێی بهێنن. لێرەشەوە چەشنی تەلغرافەکە نێررایە سلێمانی بۆ کۆمەڵەکە؛ بیستم لەوێ (تەوفیق قەزاز)[1] لە ناوەڕاستی چاپخانەدا ئەو قسانەی بەرامبەر بەکوردەکان خوێندبوەوە. واش دەڵێن کە گوایا بۆ (حوزەیران) چەند کەسێک لەلایەن (کۆمەڵی گەلان)ەوە لە جنێڤەوە ڕووەو عێراق دەجوولێن بەکوردستانی خواروودا دەگەڕێن بۆ ئەمەی ڕاستی کارەکە بەتەواوەتی تێبگەن... هەر واشم بیستووە کە هەر لەو حەلەدا دەست دەکرێ بەپێکهێنانی ئەو شتومەکانە بۆ کورد. کە گۆیا بەهەموو کوردەکانی ژووروی عێراق (سەردارێکی کورد)یان دەبێ، کۆمەڵێکیش یاریدەی ئەو سەردارە دەدا، هەرچی دراوی کوردستان هەیە لە خۆیدا بەخت دەکرێ وەک جاران نایێرنە پایتەخت!...
ئیتر بزانین خوا چیان بەسەر دێنێ، بۆ ئەو حەلەی کە ڕۆژی ڕاستی دەرکەوێ... دەمێکی دوور نییە!!.

## هەواڵی سلێمانی

هەر لەم ڕۆژانەدا گەلێ ئۆتۆمبیلی کە چووبوونە هەڵەبجە دیسانەوە لە ڕێی (ئالان)دا بەر گولله و ڕووتکردنەوەی چەتەی شێخ مەحموود کەوتبوون. موهەندیسێکی ئینگلیز و حەمە کاکەی یاریدەدەریان

(١) تەوفیق قەزاز، تەوفیق حاجی ئەحمەد قەزاز (١٨٩٨-١٩٥٥) کەسایەتییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و خاوەن موڵکی سلێمانی بوو، لە سییەکانەوە بەشداری چالاکییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی دەکرد، بەتایبەت لە ڕەتکردنەوەی پیلانەکانی حکومەت بۆ بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنە ساختەکەی ١٩٣٠، یەکێک بوو لە ڕابەرانی ٦ی ئەیلوول لە سلێمانی، تازەگەری بەکار و پرۆژە بازرگانییەکانی دیاربوو، بنیاتنانی ئەپارتمانێکی گەورە و هاوچەرخ لە خوار مزگەوتی گەورە، دەستهێنان بەو زەویانەی سەرچنار و گۆڕینیان بۆ هاوینەهەوار و جێی گەشتوگوزار، بنیاتنانی خانوویەکی جوان ڕێکوپێک بەپێی ئەندازەیەکی تازە کە بە (قەسرەکەی تۆفیق قەزاز) ناسرابوو... ناویراو باوکی: سەربەست، سەرچڵ، نامیق، فائق، سامان، ڕەفیق، شەفیق، زەکیە و شەوبۆیە، لەو بنەماڵەیە کەسایەتی ناوداری تیا هەڵکەوتووە، وەک بەهەشتی سەعید قەزاز وەزیری ناوخۆی بەر لە ١٩٥٨ کە برازای تۆفیق قەزازە، و زاوایشی بوو، د. شەفیق قەزاز وەزیر لە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا.

لەتەکدا دەبێ. ئەوانیش بەر دەکەون. لەو شتومەکانەی ئینگلیزەکە پێی دەبێ (وێنەگرێکی) باش دەست (کامیل)، سەرکۆمارێکی شێخ مەحموود، دەکەوێ. ئەمەش بەکەڵکی ئەوان زۆر دێ کە زۆرداری بێگانە و گەلێ شتی تر بەسایەی ئەوەوە دەکەوێتە سەر لاپەڕەی مێژووی کورد!

یەکێ لەو فڕۆکانەی دەچێتە قەرەداغ، بۆ پاراستنی ئەو لەشکرەی کە دەچێ بۆ دەرکردنی چەند پیاوێکی شێخ لەوێ، لە نزیکی شاخەکانی قەرەداغەوە تووشی گوللەی چەتەکان دەبێ. باڵێکی فڕۆکەوانەکە بریندار دەبێ. لە ترسی کەوتن، بەشێوەیەکی شپرزە دێتەوە سلێمانی.

## نووسراوەی کوردی (١٩٣١/٣/٢٠)

بەڕاستی لە سەیر بەدەرە من لە شوێنێکی وەک (ئیمام مووسا)دا لە کابرایەکی عەرەب یاخود عەجەم شەش نووسراوەی کوردیم چنگ کەوێت کە لە ٧٠٠ لاپەڕە زۆرترین: (ئەسکەندەر نامە، عەدیم شاه، قەهرەمان، ڕۆستەم و زۆراب، سیاه جەنگ، هەفتخوان).

## تورک سەردارێکی کورد دەخاتە بەندیخانەوە (١٩٣١/٣/٢٢)

(خوێندەوارەکانمان دەیزانن کە حکوومەتی تورک لە پارەوە تا ئێستا سەلاحەدین بەگی کوڕی شێخ سەعید، گەورەی هەرای کوردی ڕابردووی ڕاگیر کردبوو، ئەوەش لە پێش ئەوەی ئەم هەرای دواییە لە کوردستاندا بقەومێ. شێخ سەلاحەدینیش لەبەر ئەوە گیراوە کە گۆیا لەلایەن (کۆمەڵی خۆیبوون)ی کوردەوە کە لە سووریەیە نێرراوەتە تورکیا بۆ ئەوەی هەرایەکی تازە هەڵبگیرسێنێت.

دەمێکی بەسەردا چوو، ئەویش هەر لەژێر قسە لێ وەرگرتن و قسە لێ دەرهێناندا بوو، هەتا ئەم دواییە کە ڕۆژنامەکانی تورکیا بەهەموو لایەکیاندا بلاوکردەوە کە حکوومەت دە ساڵ و نیوی بۆ داناوە کە لە بەندیخانەدا بەپێوەندەوە بێنێتەوە. کە گۆیا هێشتا بەزەییان پیادا هاتۆتەوە، چونکو دەچێنشینی هەمووە داوای لەسێدارەدانی کردبوو!!)

بەغدا، ڕۆژنامەی: سەدەل عەهد، ژمارە ١٨٥
ڕۆژی یەکشەمە، ٢٢ی مارتی ١٩٣١م

## جەژنی نەورۆز (٢٢ی مارتی ١٩٣١)

لە ڕاستیدا پیاو هەتا خوا حەز دەکات دەشێ دڵخۆش بێ، چونکی لەم ڕۆژەدا کورد هۆشی هاتۆتەوە بەر خۆی، ڕۆژی ڕەشی لە ڕۆژی ڕووناکی جیا دەکاتەوە. مەبەستم ئەوەیە بەخۆی زانیوە کە (نەورۆز) ڕۆژێکی پاکی ڕووناکی خۆیەتی، کە دەشێ هەموو حەلێ بەڕوویێکی خۆشەوە بەپیریەوە بچێ چونکو لە ڕۆژێکی وەکو ئیمڕۆدا بووە کورد لە دەست دوژمنێکی زۆرداری ڕزگاری بووە کەوتۆتەوە ڕۆژی ڕووناکی پێشووی، کە ئیتر خۆی خۆی بەڕێوە دەبرد، تا پێشکەوت و ئەو حکوومەتە گەورەیەی پێکەوەنا!... ئێستاش کورد لەو تاریکییەدایە. خودایە ئەمجارش دەست بدەیتەوە باڵی فەرەیدوون و کاوەیەکی تری بۆ بڕەخسێنی تا لە دەست زۆری بێگانانی ڕزگاری بکات!!...

ئەوەی کە یەجگار دڵی خۆش کردم ئەوەبوو لە شەوی یەکشەممەوە ٢٢ی مارتدا لە سلێمانی (حاجی تەوفیق بەگ)[١] بویژی ناودار لای باغی (پوورە بەگی)[٢]یەوە کۆڕێکی جوانی پێکەوە نابوو، هەموو پیاوە گەورەکانی بانگکردبووە ئەوێ...، بەکەیف و زەماوەند تا دەمێکی درێژ ڕایانبواردبوو.

لەلایەن دوو سێ کەسەوە وتە درابوو. بەگۆرانییەکی جوان کە حاجی خۆی قسەکانی بۆ هەڵبەستبوو.قوتابییەکان دڵی ئەو گوێگرانەیان گەشاندبووەوە.

بەڵام داخی گرانم بۆ نواندنی گەورەیەتی ئەم جەژنە پیرۆزە ئاگرێک پێویست بوو. بەڵام ڕەشەبایەکی بەهێز ئەوشەوە هەڵی کردبوو، نەیهێشتبوو بیکەنەوە. ئەمەش ئەو خۆشخوانییانەیە کە حاجی بەتایبەتی بۆ نەورۆزی ئەمساڵی ڕێک خستووە، کە ئەو شەوەش بەگۆرانییەوە وتراوە:

مــــوژدەبێ ســــاڵ گـــەڕایەوە
ئاگـــــری نەورۆز کــــــرایەوە
بەفـــــری زســـــتان توایەوە
گــژ و گـــیــا و گــوڵ ژیایەوە
نوخـــشـــەبێ لە کـــوردی هەژار
گــوڵ لە باغـــدا خـــۆی دەنوێنێ
بولبـــــول بەڕوویدا دەخـــوێنێ
هەور مــــــرواری دەپرژێنێ
شـــەمـــاڵ زیندەگـــانی دێنێ
نێـرگـس مـەسـتـە و چاو بەخـومـار
را فـــەرشی چیـــــمەن ڕاخـــرا
گـــــوڵاڵە بوو بەشــــــەوچرا
گـوڵ دەســـتەیان بەست وەک برا
نەســــرین و لاولاو تێک خـــزا
هاتنە لەنجـــە ســـەروو و چنار
بولبـــــول شــــەو بەئاواتەوە
بادەی شـــەونم دەخـــــواتەوە
دەڵـــێ وا نـــەورۆز هــاتـــەوە
یـــەزدان دەروویـــەک بـکـاتـــەوە
ئێـــســـەشی پێ بکەرینە بەهار

(١) پیرەمێردی شاعیر و ڕۆژنامەنووس: ١٨٦٧-١٩٥٠.
(٢) باخی پوورە بەگی: یەکێک بووە لەو باخانەی لە شار و دەورووپشتیدا زۆر بوون، سا بۆ گەشت و سەیران یان بۆ سەوزە و میوەی هاوینە (بێستان). ئەم باخە لە جێی ئاشی عەلەتریکەکەی جاران بووە کە ئێستا بینای قوتابخانەی ئەوجەوانانی مەلا کاکە حەمەی لەسەرە و ڕاستەوخۆ لەبەردەم (قەڵەندەرخانەکە)ی پیرەمێردا بووە.

ئەو جەژنە پیرۆزەیەی کە مامۆستا کەریم سەعید زانستی بۆ نووسەری ناردووە لە پشتەکەی نووسراوە: گێلاسی کچم جەژنە پیرۆزی لە گشت لایەک دەکا. سەرنجی ناوەڕۆکی شیعری سەر کارتەکە بدە.




وێنەی کارتی جەژنە پیرۆزەکە

## دەنگی سلێمانی

١- ئێستە لە عێراقدا هەرچی لەشکرێک هەیە بەکۆمەڵ لە سلێمانین، حکوومەت وای داناوە لە یەکی نیساندا دەست بکات بەجوولان بۆ سەر شێخ مەحموود[١].

٢- ئێستە شێخ مەحموود لەناو قەرەداغدایە کە لە ناوچەکەیدا لەشکری عەرەب هەیە.

٣- فڕۆکێک لە ڕێی قەرەداغدا زۆر بەرز دەبێتەوە، لەبەر بێ بایی سەرنەنگری دەبێ. لەو کاتەدا بەر زەوی دەکەوێ بۆمباکانی دەتەقێن، بەفڕۆکە و دوو ئینگلیزەوە دەیانکا بەخۆڵ.

لە ڕێی عەربەتیشدا لە شوێنێکی تریش، هێشتا ناوەکەیم بۆ دەرنەکەوتووە، دوو فڕۆکی تر کەوتوونەتە خوارەوە کە بەمە ئینگلیز چوار فڕۆکە و دوو پیاوی لەدەست چوو.

٤- لە سەرکردانی جاف (حەمەد بەگ) گیراوە، چونکو جاف وتوویانە هەتا سەردارکمان بۆ دانەنێن هیچ

(١) جێگای خۆیەتی لێرەدا ئەوە بهێنینەوە یاد کە سوپای عێراق هەمیشە خەریکی لێدانی کورد و کاولکردنی کوردستان بووە، جا لێرە لەو ڕایەی (د. رەحیم عجینە) بەباشتر نازانم کە لەم بارەیەوە دەڵێ: (عندما أعلن وزير الدفاع جعفر العسكري في ١٩٢١/٥/٢٦ بدفع من المندوب السامي البريطاني، قانون التطوع للجيش ودعوة العراقيين الأنخراط به، أهدت الحكومة البريطانية بالمناسبة بطاريتي مدفعية جبلية إلى الجيش العراقي وكان مغزى ذلك واضحاً. فالهدية موجهة ضد الشعب الكردي، وبعد التطوع إرتفع عدد القوات المسلحة من بضع مئات الى ٦٥٠٠ جندي؛ لكن الحكومة لم تكتف بذلك وحاولت أن تشرع قانوناً=

نادەین بەحکومەت. لەسەر ئەوە (کەریم بەگ)ی برای هەڵساوە هاتۆتە لای خانەقینەوە مەرگەلێکی بێ شوماری مەلیکی عێراقی ڕاڕفاندووە کە وەکو دەڵێن لە ٤٠٠٠ مەڕ بەولاوەتر بووە.

بۆ بۆنەی هەڵسانی جاف دەنگێکی تر هەیە گوایا لە کاتی ڕۆیشتنی چەند سوارێکی جافدا بەبەر یانەی پۆلیسەکاندا دەستڕێژێکیان ئاراستە دەکرێ. لەو جافانە برایەکی بچووکی حەمەد بەگ پێوە دەبێ. لەسەر ئەوە جافەکان هەرا دەکەن، خۆیان کۆ دەکەنەوە و دێنە سەر ئەو پۆلیسانە، لە پاش کوشتارێکی زۆر چوار لە پۆلیسەکان دەکوژرێ.. بردنی مەڕەکانی فەیسەڵی لە پاش ئەوەوە دەبێت.

ئەم قسەیەی دوایی لە یەکێکی شارەزا پرسراوە، بەلام گرتنی (حەمەد بەگ)یش ڕاستە.

٥- لە مووسڵ هەرایەکی پیس لەناو ئاسووری و عەرەبدا ڕووی داوە، کە لە سلێمانی هەتا دێت کەمەری برایەتی کورد و ئاسووری توندتر دەبەسترێ.

## عەقەرقووف ١٩٣١/٣/٢٦

چل و پێنج قوتابی و مامۆستایەک -مامۆستای مێژوو- ڕۆژی هەینی بەیانی زوو تازە ڕۆژ لە کەل سەری دەرهێنابوو، تیشکەکەی شەپۆلەکانی زێی دەجلەی بەسەرپۆشێکی زێڕین داپۆشیبوو. لەلایەکەوە مەل لە ئاسمانەوە سەرەوژێر دەهاتە خوارەوە بەرسنگی دەدا بەئاوەکەدا، دیسانەوە دەیدایەوە لە شەقەی باڵ و دەچووەوە بەگژ ئاسماندا. لەلایەکی تریشەوە کەشتییە سپییەکان، گەمیی ڕەشەکان لەناو ئەو ئاوە شینەدا لە هەر چوار لای ئاوەکە لارولەنجەیان دەکرد. کزەبایەکی خۆشی دەهات، بەڕاستی ئەو بەیانییە بەیانییەکی خۆش و پیرۆز بوو، ئەوسا زانیمان نرخی چەندە، چەند بەهاوارەکە گەڕاینەوە!...

کاتێکت زانی هەر کەسە ملی کەرێکی گرت و سواری بوو، هەر دەمێک بوو، ئەوەندەی پێ نەچوو خۆمان لەوبەر پردی (خر) گرتەوە. چوارناڵەی کەر، جووتە هاوێشتنی کەر، زەڕینی کەر، تەپوتۆزی ڕێگا، قیژەی منداڵان، ترپەی کەوتنە خوارەوەی قوتابییەکان، چاوی پیاوی کوێر دەکرد گوێی کەڕ دەکرد، دەمی دەهێنایە پێکەنین. دڵی دەگەشاندەوە، ئەوەندەی نەمابوو پیاو بەسەر کەرەکەوە هەڵپەڕێنێ.

= للتجنيد الأجباري عام ١٩٢٧، وأبرز رئيس الحكومة لائحة التشريع في مجلس النواب في ١٩٢٧/٦/٢٧ بمايلي: إن مهام الجيش هي -الأمن الداخلي والدفاع عن الوطن-، وهكذا أنيطت بالجيش منذ تأسيسه مهمة بوليسية داخلية.. وإذا مااستعرضنا مسيرة الجيش منذ تأسيسه سنجد ان السلطة إستخدمته باعتباره قوتها الضاربة، ضد المظاهرات الجماهيرية والتحركات الفلاحية العشائرية واضرابات العمال والنشاطات الأجتماعية على الضائقة ألاقتصادية وعلى المعاهدات العراقية البريطانية ومواكب العزاء الشيعية والثورات الكردية والحركات اليزيدية وإنتفاضتي ١٩٥٢ و ١٩٥٦) ومطالب الكرد بتطبيق المادة ٣ من الدستور المؤقت عام ١٩٦١ وثورة أيلول وكولان. أ.ب) ولم يعصي الجيش الأوامر الصادرة اليه بذلك ولم يقف ولا مرة واحدة مع الشعب ضد السلطة.) من ١٣-١٥.

بۆ زیاتر بڕوانە: د. رحيم عجينة، هل من تجديد في الموقف من الجيش!؛ مجلة الثقافة الجديدة، عدد (١٠) سنة (٣٨) آب ١٩٩١ سوريا، دمشق.

مامۆستاکەشمان کەتەیەکە باڵابەرز، شان پان، دەموچاو سپی، قژ زەرد، ئەوەندەی نەمابوو قاچی لە زەوی بخشێ. هەموو لەملا و لەولای کۆبووبوونەوە دەماندوان، قسەمان لەگەڵ دەکرد.

منیش ئەمەندەی لێ چووبوومە پێشەوە، کەرەکانمان لە ژێرەوە ماچ و مووچیان دەکرد. هاوڕێکانم بێ دەنگ، ئینجا منیش هاتە قسە لێم پرسی: «ئەفەندی لە عەقەرقووف چی دەزانی، پێم نافەرمووی؟»

(موقدادی[1] سەری بەرز کردەوە و تۆزێ تەماشای ئاسمانی کرد وەکو بیر بکاتەوە وا بوو. ئینجا دەستی کرد بەوتن: «ئەمە شوێنێکی مێژووییە، لە پێش عیسادا بە ۳۰۰۰ ساڵ کۆمەڵێ لە شاخەکانی رۆژهەڵاتی عێراقەوە هاتوون (کوسی)یان ناو بووە، بابلستانیان داگیرکردووە. لە دەمی (کوری گالزۆ) پاشایەکیاندا ئێرەی دروست کردووە. ئەم کۆمەڵە نزیکی ۶۰۰ ساڵ بەسەر ئێرەدا فەرمانڕەوا بوون».

- لام وایە ئەو کۆمەڵە لە ئاری بوون، لە سامی نەبوون!

- مەبەستت ئەوەیە بڵێم کورد بوون؟

(۱) ئەو مامۆستایەیان ناوی (دەروێش مقدادی)بووە، وەک لە نامیلکەی (خەباتی رۆشنبیران)دا ل، ۲۹، هاتووە. بەڵام دەمانەوێ شتێک لە بارەی کەسایەتی ئەو مامۆستایەوە بڵێین: مامۆستا «دەروێش مقدادی» یەکێک بوو لەو دەیان مامۆستایانەی حکومەتی عێراقی لە سییەکاندا بۆ دەرس وتنەوە لە سوریە و فەلەستین و لوبنانەوە هێناونی، بەبیروباوەڕ لە نەتەوەییە عەرەبەکان بووە، لەگەڵ هاوەڵەکانیدا وەک (ساطع الحصري، محمد عزة دروزة و كنفاني...) بیروباوەڕی نەتەوەیی عەرەبیان بەشێوەیەکی بەرچاو لەناو قوتابییە عەرەبەکاندا بڵاوکردبۆوە، بەشێوەیەکە لە ۱۹٤۳دا وەزارەتەکەی (جميل المدفعي) بەتەواوی تەنگەتاو بوو، جا پەنای بردە بەر یاسای (سەندنەوەی ڕەگەزنامەی عێراقی) کە لە ۱۹۳۳ ڕشید عالی گەیلانی سەرەک وەزیران و حیکمەت سولەیمان وەزیری ناوخۆ دەریان کردبوو، بۆ دوورخستنەوەی ئەمانە لە عێراق، بۆیە یاساکە بەسەر زۆر لەو مامۆستایانە وەک (ساطع الحصري واحمد قدري و درويش= المقدادي) و گەلێ لە هاوڕێ قەومییەکانیان پراکتیزە کرا و بەدەستبەستراوی بردیانە سەر سنووری عێراق - سوریا و کردنیان بەو دیودا. بۆ زیاتر بڕوانە: (رجال ووقائع في الميزان، حوار مع الأستاذ. جرجس فتح الله، دار آراس للطباعة والنشر؛ أربيل ط۱، سلسلة رقم ٦۷، ۲۰۰۱). شایەنی باسە، من بۆ خۆم لە گۆڤاری (التلميذ) کە تایبەت بووە بەمنداڵانەوە و لە (ثانويه المركزيه) لە بەغدا ژمارەیەکی لە شوباتی ۱۹۲۹ دەرچووە ئەم نووسینانەی (دەروێش مقدادی)م دیوە: ۱- أبو محجن الثقفي.. ژمارە سێ ، مارتی ۱۹۲۹. ۲- عمرو بن العاص.. ژمارە پێنج، ۳۱ مارتی ۱۹۲۹. ۳- نبذه عن تاريخ سامرا، ژمارە شەش ۳۰ی نیسانی ۱۹۲۹. هەروەها دەروێش ئەلمیقدادی (تأريخ الامه العربيه)ی بۆ پۆلی دووی ناوەندی داناوە، قەبارەیەکی گەورەی ٤۰۰ لاپەڕەیی لە ۱۳۵٥ک - ۱۹٦۳ز (مكتبة الشرق - سوق السراي) لە بەغدا چاپ و بڵاوی کردۆتەوە، دانەیەک لەو کتێبەم لە کتێبخانەکەی مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەری خوالێخۆشبوودا دیوە، لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی. بەخەتی خۆی لە بەرگی ناوەوەی نووسیوە: (خاوەنی پەرتووکی مێژووی گەلی عارەب عەبدوڵڵا تۆفیق جەوهەر - قوتابی دەبستانی ناوەندی سلێمانی تیپی سەهەم ۱۹۳۷ - ۱۹۳۸م/۱۳٥٦ - ۱۹٥۷هـ). جگە لەمە لە شوباتی ۱۹۳٥دا لەگەڵ دەستەیە لە ڕووناکبیری نەتەوە پەرستی عەرەب لە بەغدا (نادي المثنى بن حارثة الشيباني)یان دامەزراند و بەگەرمی تێدەکۆشان بۆ جۆشدانی بیر و هەستی عەرەبی لەناو خەڵکیدا. بۆ زیاتر بڕوانە (د. کەمال مەزهەر چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد - بەرگی دوو، دەزگەی موکریان، هەولێر ۲۰۰۱ - ل۳۳٤).

ئینجا من دەستم کرد بەپێکەنین، ئەویش دەستی کردەوە بەقسەکردن. وتی: کوردەکان وا دەڵێن، زۆر لە بێگانەکانیش هەر پێ لەمە دەنێن.

ئیتر کاتێکمان زانی ٣ سەعات و نیو بەڕێگاوە بووین، گەیشتینە عەقەرقووف: شوێنێکە دەشتێکی کاکی بەکاکی، هیچ ئاوایی تیادا نییە، ئاوی نیو سەعات لێوە دوورە، گەرم، ناشرین، هەتا بڵێیت.

پێی ناوێ دابەزین، چووین سەیری وێرانەکانی بکەین، هیچی نەمابوو خشتەکانی نەبێ، بەڵام سەکۆیەکی پانی باڵابەرز چووبوو بەئاسماندا، ٤٥ گەز بەرز ببوو، لە خشتی کاڵ بەسێ نهۆم تەواو ببوو، لەناو نهۆمەکاندا قامیش و زەل دانرابوو، بۆ نەڕووخاندن.

خشتەکان هەر وا لە جێی خۆیان مابوون. موقدادی دەیگوت:

– ئەمە لە دەمی ئەو پاشایەدا دروست کراوە، ئەوێیان لەسەر بانی ئەو سەکۆیە کردووە کە تەماشای گەڕانی گەردوون و ئەستێرە و مانگ و ڕۆژ بکەن.

نانمان خوارد، هەندێ وێنەمان گرت، لەبەر بێ ئاوی هەریەکە بستێ زمانیان دەرکێشا بوو، ئەگەر ئاوەدانەکەی من و کوڕێکی تر نەبووایە، بێگومان زۆریان لار دەبوونەوە. چونکو لە شوێنێکی زۆر دوورەوە دەچوون ئاویان تێدا دەهێنا. ئینجا گەڕاینەوە، بەڵام لە ڕێی کازمییەوە کە بە ٢ سەعات و نیو بڕیمان... بەڵام ئەوەی دەشێ بینووسم، تاکە و لە بیر نەچێتەوە کردەوەی مامۆستاکەیە... ئەو هەموو ڕێیەی بەپێ بڕی، هەر تۆزێک بوو سواری کەر بوو... ئاوی نەدەخواردەوە، دەیگوت:

– ئێمە بۆ ئەوە هاتووین فێری ناخۆشی ببین، فێری گەرما، ماندووبوون، تینوێتی، ناخۆشی سواربوون... بۆ ئەوە نەهاتووین لەنجەولار بکەین. بەتایبەتی بۆیە بەسواری کەر هێنانی کە گیانێکی سووکمان بەبەردا بکات، لامان شوورەیی نەبێ سواری کەر ببین، لە پاش ئەوە تا دراوی خۆمان نەدەین بەئۆتۆمۆبیلی بێگانە.

ئەوە لە ڕێگا هەر باسی دیدەوانی ڕۆژئاوای کردووە، باسی وڵاتپەروەری کردووە، گیانی وڵاتخۆشەویستی کردووە بەبەر قوتابییەکاندا.



بەڕاستی سەیرانی وا گیانسووکانەم بۆ هەڵناکەوێتەوە: لە زانین، لە فێربوونی ناخۆشی لە ڕابواردن کەڵکەوەر بووین. ئەوەی کە لام جوان بوو دڵمی ڕۆشن کردەوە ئەوەبوو لەپڕ دوو کوردی دارولموعەللمینم دی هاتبوونە ئەوێ، منیش بەزۆر سواری کەرەکەی خۆم کردن، ماندووم حەساندنەوە، کە بەوە کوردایەتی خۆمم پیشان دا[1].

(١) لەم ئاستەدا دەستنووسەکە کۆتایی بەباسی گەشتەکەی عەقەرقووف دێنێ، بەڵام لە ئامیلکەی خەباتی ڕۆشنبیراندا بەشێکی تایبەت و سەربەخۆی دەخاتە سەر بەناوی (یەکەم دەوڵەتی کوردی...) و لە پێنی باسەکەوە دایناوە، لەناو دەستنووسەکانیدا ئەم باسەم نەدیوە، بەڵام لەبەر گرنگی باسەکە وا لێرەدا وەک خۆی دایدەنێین.

## یەکەم دەوڵەتی کورد کە لە عێراقدا دامەزراوە یاخود: ئاریەتی کوردەواری

کە لە گەشتی (عەقەرقوون) بوومەوە. لە نووسراوخانەکاندا بەدوای هەندێک سەرچاوەدا گەڕام، تا تێروپڕ لە بابەت ئەو دەوڵەتەوە کە (کاسییەکان) لە (بابلستان)دا دایانمەزراندووە، زانیاری کۆ بکەمەوە، خودا و ڕاستان ژمارە (٢)ی گۆڤاری (الأقلام)م دەست کەوت، کە لە ساڵی ١٩٢٨دا لە شاری بەغدا چاپ کراوە و خاوەنەکەی (علي ضريف الأعظمي) بووە... لەلاپەڕ (١٤٣)یدا بەزمانی عەرەبی نووسیبووی (أول دولة كردية قامت في العراق - أو: أرية الأكراد).

منیش وا لە خوارەوە دەیگێڕمە سەر زمانی کوردی، تا ئەوەی (مامۆستا دەرویش مقدادي) لە بابەت مێژووی ئەو دەوڵەتە و عەقەرقووفەوە پێی گوتم تەواوی بکەم.

«لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمی پێش لە دایکبوونی عیسادا کە باری خاکی عێراق تێک چووبوو، شیرازەی ئاسایش لە ئەندازە ترازا و ئاژاوە و شەڕ و شۆڕی ناوەوە سەرانسەری خاکەکەی گرتەوە، لە ناوەند فەرمانڕەواییە بچکۆلەکانی ئەمپەڕ و ئەوپەڕی خاکەکەدا، (کوردەکان)ی دانیشتووی ئەو شاخانەی کە کەوتوونەتە ناوەند خاکی (فارس) و خاکی (عێراق)ەوە، وریابوونەوە و ڕاپەڕین. لەناو خۆیاندا پێشەوایەکیان هەڵبژارد کە ناوی (کاندیش) بوو.

ئەو کوردانە لەوەپێش هەندێک فێری شارستانێتی ببوون، کە لە عێراقییەکانی کۆنیانەوە وەرگرتبوو، ئەو پاشاگەردانییەی ناو عێراقیان بەهەلزانی، هووروژمیان بردە سەر خاکی عێراق بەو نیازەی زەویە بەپیتەکەیان بچێتە ژێر چنگەوە، کە پێویستیان پێی هەبوو.

جارێ لە سەرەتاوە بەشێکی باکووری عێراقیان داگیر کرد، دوای ئەوە مرخیانی لێ خۆش کرد، هووروژمیان بردە سەر (بابل) و دەوروپشتی، ئەویشیان لە ساڵی ١٧١٤ی پێش زایینیدا داگیرکرد. (کاندیش)ی پێشەوایان دەوڵەتێکی بچووکی لە خاکی عێراقدا دامەزراند، ئەوساکە ناویان نابوو (کردونیاش)، هەندێکیش پێیان دەگوت (دەوڵەتی کووسییەکان).

لە دوای (کاندیش)ەوە چەند خونکارێک هاتن، سنووری دەوڵەتەکەیان فراوان کرد: چەند شارێکی باکووری عێراقیان داگیرکرد: ئەم دەوڵەتە نزیکەی (٥٧٤) ساڵ ژیا: (١٧١٤-١١٤٠)ی پێش زایین.

(٣٦) خونکار فەرمانڕەوایی تێداکرد، یەکەم خونکاریان ناوی (کاندیش) بوو، دواین خونکاریان ناوی (نادنشوما)ی دووەم بوو، بەناوبانگەکانی ئەو خونکارانە ئەمانە بوون: «کاندیش، گالزۆی یەکەم، گالزۆی دووەم، نازمرتاش، نادنشومای دووەم».

لە ناوەند ئەم دەوڵەتە و دەوڵەتی ئاشووری و خونکارەکانی خاکەکانی باشووری عێراقدا گەلێک شەڕ و شۆڕ هەڵگیرسان، کە تا ماوەیەکی دوور و درێژ نەکوژانەوە.

خاوەن لێکۆڵینەوە ئەورووپاییەکان، لەپێش شەڕی جیهانی یەکەمدا، گەلێک کەلەپووری ئەم دەوڵەتەیان لە (عەقەرقووف) و چەند شوێنێکی تردا دۆزیەوە: لەناو ئەو جیماوانە (آثار) نووسینی وایان بەرچاو کەوت کە چەسپاندییە دڵیانەوە: ئەم دەوڵەتە لەلایەن ئەو نەتەوەیەوە دامەزراوە کە

لەوەپێش لەناو (کوردستان)دا نیشتەجێ بوون، مێژوونووسی بەناوبانگی تورکیش (ئەحمەد ڕەفیق) پشتی ئەو بیروباوەڕەی گرتووە؛ نەک هەر ئەوە بەڵکو بەتەواوەتی ئاشکرای کرد کە ئەم دەوڵەتە (دەوڵەتێکی کوردەکان) بووە؛ ئەو کوردانە لە پێش ئەوەدا کە ئەو دەوڵەتەی خۆیان دابمەزرێنن لە خاکی عێراقدا، لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری (دەجلە)دا جێنشین بوون؛ واتا لە (کوردستان)دا.

ئەوەندە هەیە ئەو ناوی ناون: (کاسییەکان = کاسیلر)، ئەم وشەیەش هەر لەوشەی (کۆشیەکان) یاخود (کووسیەکان) دەکا کە لەووەپێش ناویان براوە.

وا دەردەکەوێت ئەم جیاوازییە کەمەش کە لە ناوەند ئەم وشانەدا پەیدا بووە لە پەرچەڤەکردنی یەکێک لەو دوو لایەوەبێ.

جا لەبەر ئەمەی ئەم دەوڵەتە کوردەی کە پێشنیان پێیان گوتووە (کردونیاش) لە ساڵی ١٧١٤ی پێش زایینی لە عێراقدا دامەزراوە و (میدییەکان)یش دەوڵەتە کۆنەکەی خۆیان لە ساڵی ٧٥٩ی پێش زایینی دامەزراندووە، کە دوای ڕووخانی دەوڵەتی یەکەمی ئاشوورییەکان دێت. بێگومان (دەوڵەتی کوردەکان) زۆر لە پێش (دەوڵەتی میدیا)وە دامەزراوە. بێجگە لەوە (ئەوەی مادەکان) یاخود ( (نەتەوەی میدییەکان) تا پێش سەدەی حەوتەمی پێش زایین ئینجا پەیدابوون؛ ئەو (ئاری)یانەیش کە لە نزیک ساڵی ١٨٠٠ی پێش زاییندا بڵاوبوونەوە بەهەموو لایەکدا، بریتی بوون لە گەلێک هۆز، کە زۆربەیان لەناو خاکی (میدیەکان)دا نیشتەجێ بوون. جا بەپێی ئەم قسانەی کردمان، بۆ خوێندەوار دەردەکەوێ کە (نەتەوەی کورد) لەو نەتەوە ئاریانەیە کە هەر لە سەردەمی کۆنەوە لە (کوردستان)دا نیشتەجێ بوون، نەتەوەی کورد و نەتەوەی فارس و میدیاییەکانیش هەر لە یەک ڕەگەزن؛ واتا کوردەکان برای فارس و میدییەکانن، نەک وەکو هەندێک دەڵێن: لە میدییەکان کەوتوونەتەوە. (دەوڵەتی کووسی)ش کە پێیان گوتووە (کردونیاش)، بریتی بووە لە (دەوڵەتێکی کورد)، لە جێماوەکانی کۆنیشدا ناوی (نەتەوەی کورد) بە(کاردۆخی) براوە؛ ئەم ناوەیش زۆر نزیکە لە ناوی (کردونیاش)ەوە کە واتاکەی (دەوڵەتی کورد) دەگرێتەوە.

ئەوانیش کە وایان زانیوە (کوردەکان) لە ڕەگەزی (تووڕانی)یانن، بەهەڵەدا چوون، چونکە ئەوە چەسپیوەتە دڵەوە و ڕوونیش بۆتەوە کە لە ڕەگەزی (ئاری)ن.

کۆمەڵێکی گەورەیش لە زانایانی ئینگلیز و فەرەنسز و ئەڵمان و ڕووس و عەرەب و کەسانی تر ئەم قسەیەیان پەسند کردووە و بڕیاریشیان لەسەر داوە.[1]

(١) (سامي سعيد الأحمد) لە کتێبی (العراق في التأريخ) کە لیژنەیەک لە پسپۆڕانی مێژوو لە ١٩٨٣دا بەپێی پرۆژەی (إعادة كتابة التأريخ) دایانناوە، دەربارەی کاسییەکان یان کیشییەکان دەڵێ: ماوەیەکە حوکمی کیشییەکان، لەگەڵ درێژەکێشانیدا ١٥٩٥-١١٥٧ پ.ز. تەمومژاوی و نادیارە، بۆیە بەسەردەمێکی تاریک ناودەبرێ. کیشییەکان بیانین و بەرلەوەی وڵاتی بابل داگیر بکەن، هیچ شتێ دەربارەیان نازانرێ وەیا لە کوێوە هاتوون. بەڵام دوای چەند دێڕێک لەمە دەڵێ: یەکەم پاشای کیشییەکان کە ناوی دەبەن: (گندش)ە، هەندێک دەستپێکی حوکمەکەی لە ساڵی (سەشێ تیلۆنای نۆهەم)ەوە دیاری دەکەن. ئەو ساڵەی یەکەم جار پەلاماری=

## عەرەبیش؟!

ئیمڕۆ ڕۆژێکە قسەیەکمان لە گوێدا دەزرنگێتەوە، بەبیرماندا نەدەهات ئەوە لە عەرەبی عێراق ببینین! لەلایەکەوە بەبرای خۆیانمان دادەنێن، بەهەموو تەرحێک خەریکی ڕێکخستنمانن لەگەڵ خۆیاندا. کەچی لەم ڕۆژەدا بەتەرحێک قسەمان لێ دەکەن دوژمن لە دوژمن، خوێنخۆر لە خوێنخۆری خۆی ناکا!...

وە نابێ هۆشدارەکانمان ئەمەیان لەبەرچاو نەبووبێ، وەنەبێ لەو ڕۆژەوە کە کورد ناوی خراوەتە سنووری عێراقەوە بیر لەم ڕۆژە ڕەشە نەکاتەوە و هەموو قسەیەکیانی بەبا نەدابێ، هەمیشە بۆ کوردایەتی خۆی و بۆ پێشکەوتنی کوردستان هەوڵی نەدابێ. بۆ پێکهێنانی کوردستانێکی سەربەخۆ تێنەکۆشابێ... بەڵام چەرخی چەپگەرد بووەتە پەرژینی ئەو سەرکەوتنە.

ئەگینا کورد لە یەکەم هەناسەیەوە تێ گەیشتووە کە ژین لەگەڵ عەرەبدا هەروەکو لەگەڵ تورک و ئێراندا بێ کەلک بووە، بێ کەلکە. ئەگەر ئەم قسانە دەخوێنینەوە کە لە ڕۆژنامەی (البلاد)ی بەغداوە نووسرابوو، کە نێرراوە عەرەبەکان بەگوێی نێراوە کوردەکانیاندا داوە: ئەوسا تێدەگەی کە عەرەب هەر لەو ساوە کە پێی کەوتۆتە کوردستانەوە بەناوی ئایینەوە تا ئیمڕۆ لە پێستی دۆستدا بووە لەگەڵمان بەڵام لە ڕاستیدا دوژمنێکی بێ هاوتا، دڕندەیەکی بێ سامان... بۆ گیانی کورد!...

لە کۆبوونەوەی ٢٨ی مارت ١٩٣١یاندا باس لە شێخ مەحموود دەکەن،[1] نێرراوێکیان (سەعد سالح) دەڵێ: «دەمەوێ لە دەنگوباسی شێخ مەحموود تێبگەین، حەللی هیچی تر نییە، لە هەر حەلێکا عێراق بکەوێتە تەنگانەیەکی سیاسییەوە یاخود لەگەڵ شتێکی خۆیدا خەریک بێ، شێخ مەحموود دەبێ لێی ناخۆش بکا، هەرا هەڵگیرسێنێ. ئاسایش کەم بکاتەوە!».

وەزیری جەنگ بەرپەرچی دایەوە و وتی: «شێخ و کۆمەڵەکەی هەڵساونێن بەڵکو جەردەن[2]. یا

= عێراقیان دا. ئەسڵی ئەمانە لە دەڤەری ناوەڕاستی زنجیرە چیاکانی زاگرۆسەوەی کە ئێستا بەلوڕستان دەناسرێ. دیسان دەڵێ: (ئەگومی دووەم) یەکەم پاشای کیشییەکان بوو کە هەموو وڵاتی بابلی لەژێر دەسەڵاتدا بوو .... هەروا (کرنەش)ی پاشایانی کە بەکارە ناوەدانکردنەوەکانی ناسراوە لە شارەکانی بابلدا، (کۆریگالزۆی یەکەم) بەدوایدا هات و شاری (ئیشا)ی دەست پیا هێنایەوە و ناویشی نا (دورکۆریگالزۆ) کە ئێستا پێی دەوترێ (عەقەرقووف - ئەکەرکووف)ی ئێستای نێزیک بەغدا. هەروا دەڵێ: لە عەکەرکووفدا کۆشکی پاشا دۆزراوەتەوە کە پێ دەچێ تێکەڵێک بێ لە چەندەها دیر و حەوشە و گۆزەپان، جیا لە شێوەی بیناسازی عێراقی کۆن، هەروا زەقوورەی عەکەرکووف سێ پلیکانەی لە پێشەوە هەیە کە لەوانەی زەقوورەی نور دەچن. بۆ زیاتر بڕوانە: مجموعة من الأساتذة، العراق في التأريخ، دار الحرية للطباعة. بغداد ١٩٨٣ ص ١٠٢ - ١٠٥.

(١) دەقی ئەم دانیشتنەی (مجلس النواب)ە و ئەو گفتوگۆیانەی دەربارەی شێخ مەحموود و ڕاپەڕینەکەی کراوە. بڕوانە: (البلاد - جريدة، عدد ٤١٤ الأحد ١٩٣١/٣/٢٩ السنة الثانية. ص ٥).

(٢) ئەمە بەعەرەبی ئەوە دەگەیەنێ: (ليسوا بثوار بل قطاع طرق).

چۆنیـان ناودەنێی بنێ، بەڵام شـێخ مەحمـوود بەخۆڕایی ئەمە ناکا بەڵکو پشـتـیـوانێکی پەنهـانی هەیە. منیش وام پێ باشە هەتا ئەرازووی دراومان سەربەسەر نەکراوە[1] کە بۆ ئەمە دراوێکی بێشومار دابنێین دەشێ هەر کلۆجێ دەبێ ئەم هێزە نهێنییەی شێخ بەرباد کەین!... ئەگینا دەبێ وەزیر پێ لەمە بنێ[2] کە حکوومەتەکەم پێی ناکرێ ئەم پشێوییە لابەرێ. ئینجا ئەو حەلە ئێمە شێخ مەحمـوود لە خۆمـان ڕزگار دەکەین، سـەربەخۆیی دەدەینێ، چونکو پێمان ناکرێ خۆمان لە دەستی ڕزگار بکەین. جا ئەو حەلە خۆمان بۆ ئەوەی کە ماومانە تێدەکۆشین سـەربەخۆیی بۆ وەربگرین». نێراوێکی تریان (سلمان البراک) دەڵێ:

«شـێخ مـەحمـوود جەردە نییـە بەڵکو هەڵـساوە، بەم چەند پۆلیســەش دانامرکـێنرێتەوە. وەنەبێ پیاوەکانیشی ۳۰۰ تا ۵۰۰ کەس بن وەکو وەزیری جەنگ دەڵێ، کە ئەو بەو پیاوانەی هەروەکو ئێستا دەتوانێ بەربەرەکـانیـان لەگەڵدا بکات، لەمەو دواش زۆر چاک بەرگـە دەگرێت، واشـدەزانم ئەگـەر هەر ناچاربین بەرامبەری شێخ مەحمـوود بکەین، وا چاکە کوشتنی هەمـوو کورد ئاشکرا بکەین!... من یەکێکم لەو کەسـانە کە ئەوەیان دەوێ، کە لەو کارەدا دەبن!...».

ئینجا (ئەحمەد الجلیلی) بەتووڕەییەکەوە هەستا بەقایم دەیقیژاند: «شـێخ مەحمـوود هەڵـساوێکی کەم نییە، بەڵو چەکێکی پیسە بەدەست بێگانەوە، کە هەروەکو ڕۆژنامەیەکی هاوڕێمان دەڵێ: لەسەر ئەم کۆمەڵەیە، کە هەموو عێراق چاوی لە دەستێتی، ئاگای لە هەموو کارێک بێ کە لە وڵاتدا ڕوودەدا... شێخ مەحمـوود شتێکە بەدەست بێگانەوە، هەچ کاتێ ئارەزووی بوو کاری پێ بەجێ دەهێنێ، تاکو لە دەرەوە وا تێبگەن عێراق پڕی هەرا و گێچەڵە. هەمیشە خوێنی تیادەڕژێ. بەڵێ بۆ ئەوانە دەست دەدا کە پێیان گرانە عێراق بچێتە کۆمەڵی گەلانەوە» ئینجا جێنشینی وەزیری ناوەوە بەربەرچی قسەکەی دایەوە وتی: «ئەمە شتێکی ئەوەندە گەورە نییە ئەم تووڕەییەی پێویست بێ».

(سلێمـان فـەتاح): «من وا دەزانم کە ئەو لەشکر و پۆلیسـەی لەوێ هەیە زۆر چاک دەتوانێ ئەم یاخیبوونە دامرکێنێتەوە، سا ڕۆژ ڕاستی قسەم دەر دەخات».

(زامل المناع): دەمەوێ بەهەر ڕەنگێ دەبێ ئەو پشێویە لابرێ، سا بەهێزبێ یان بەئاشتی سیاسی؛ چونکو زۆر شایانی شوورەییە لە حکوومەتێکی عەرەبدا پاشای عەرەب بێ و ئەم تەرحە شتانە ڕووبدا».

(غیاث النقشبندی) نێرراوی ئامێدی - کوردپەروەرێکی گەورە:

«حکوومەت هی عەرەب نییە چونکو سلێمانی کوردن بەڵکو حکوومەتەکە حکوومەتی عێراقە...»

(المناع): حکوومەت هی عەرەبە. عەرەبە...!!

(سـەردار)[3]: «تکا لە -زامل المناع- دەکـەم ئاگـای لە پێـڕەوی کـۆمـەڵ بێ». (نەقـشـبـەندی): «هەڵـسانی شێخ مەحمـوود هیچ شتێکی نییە بەسەر حکوومەتەوە، کە هی کوردبێ یا عەرەب، بەڵکو

(۱) مەبەستی ئەوەیە کە: (قبل تصدیق المیزانـة یجب تخصیص مبالغ طائلة..)
(۲) واتە خۆی، وەزیری جەنگ.
(۳) مەبەستی لە (رئیس مجلس النواب)ە.

بزووتنەوەیەکە بتوانێ بەرپادکرێ. منیش حەز ناکەم لێرەدا ناوی حکومەتی عەرەب بەم!».

پاشان وەزیری جەنگ هەڵسا و قسەی لە بابەت تووڕەیی هەندێ لە نێرراوەکانەوە کرد، دەیگوت: «ئەم جوولانەوەیە شێخ مەحموود دەیکا لە پێش هەموو کەسێکدا زیان بەکوردەکان دەگەیەنێ...».

## ئەمین زەکی بەگ -مێژووی کوردستان- ١٩٣١/٤/٢

ئەمین زەکی[١] یەکێکە لە زانستە[٢] کوردەکان خەڵکی سلێمانییە، لە لەشکردا گەلێ پایەی بڵند بووە، لە عێراقدا چەند جار وەزارەتی پێک هێناوە... یەجگار زانستە[٣]، با وەجوود لە مێژوو و زانینی زەویدا.

پار ئەوەبوو بوو بەپەلی یانەی سەرکەوتن، ئیتر لەوساوە لە کاری حکومەت وازی هێنا، ئینجا بەجارێ بەرەڵلای کرد، هاتە پێشەوە بۆ ڕەنجدان لە پێناوی کوردایەتیدا. لە پارەوە تا ئیمڕۆ کە نزیکی نۆ مانگە خەریکی مێژووی کوردە.

وەکو لە خۆیم بیستووە لە ٢٥٠ نووسراوی دەرهێناوە، کە بەکوردی، فارسی، عەرەبی، تورکی، ئینگلیزی، فرانسزی و ئەڵمانی نووسراون، تا ئێستە هەر بەمەوە خەریک بووە. سێ نووسراوی جوانی نووسیوەتەوە:

یەکەم: مێژووی کوردستان کە ٣٠٠ پەڕەیە.

دووەم: مێژووی سلێمانی.

سێیەم: مێژووی ناودارانی کورد.

هەر سێکی تەواو کردوون.

ئیمڕۆ کە ١٩٣١/٤/٢ ی یەکەمیانی دا بەچاپخانە لەسەر دراوی یانە[٤]، بەڵام خۆی هیچ شتێکی

(١) لە گەڕەکی گۆیژەی شاری سلێمانی ساڵی ١٨٨٠ هاتۆتە دنیاوە، خوێندنی سەرەتایی و ڕوشدیەی عەسکەری لە سلێمانی تەواوکردووە، لە ١٨٩٦ ئامادەیی عەسکەری بەغدای خوێندووە دوای (حەربیە)ی ئەستەموڵ و (ئەرکان)ی هەر لەوێ... دوای شکانی عوسمانیان لە شەڕی جیهانی یەکەمدا لە ١٩٢٤ گەڕایەوە بەغدا، چەند جارێ لە وەزارەتەکانی عێراقدا پلەی وەزیری ڕێگاوبان و مەعارف و بەرگری و ئابووری پێ دەسپێررا، (١٩٣٦) بەنائیبی سلێمانی هەڵبژێررا... لە ٩ی تەمووزی ١٩٤٨ لە بەغدا گیانی پاکی سپارد و لە گردی سەیوانی سلێمانی بەحورمەتەوە سپێردرا. لە ژیانیدا (٩) کتێبی لە بواری سەربازی و لێکۆڵینەوەیدا بەتورکی چاپ و بڵاوکردۆتەوە. لە ١٩٣١ بەرگی یەکەمی خولاسەی تەئریخی کورد و کوردستانی چاپ کرد و لە ١٩٣٧ بەرگی دووەمی. لە ١٩٣٩ لە قاهیرە کرا بەعەرەبی و چاپ کرا. جگە لەمە (مشاهیر الکرد) و (تاریخ السلیمانیە وأنحائها) و گەلێ وتار و نووسینی لە گۆڤاری گەلاوێژدا.

(٢) مەبەستی (کە یەکێکە لە زانا کوردەکان).

(٣) یەجگار زانایە.

(٤) بەمانای: لەسەر ئەرکی یانەی سەرکەوتنی کوردان لە بەغدا.

لە یانە ناوێ. بەڵکو هەر پوولێکی تیا دەست کەوێ پێشکەش یانەی کردووە، لە پاش دەرچوونی ئەمە ئەوانی کەش لە چاپ دەدا، خوا هاوتای ئەم پیاوە گەورانەمان بۆ زیاد کا...

## یانەی سەرکەوتن ١٩٣١/٤/٣

بەیانی هەینی لەسەر جاڕدانی یانە لە رۆژنامەکانی بەغدادا، چوومە یانەی سەرکەوتن، شوێنەکەی جمەی دەهات لەبەر هاتووان، نزیکی ٧٠ کورد لە هەموو رەنگە: لە پیاوانی گەورە، دەوڵەمەندان، مەلایان، سەرکۆماران، شت فرۆشان و قوتابیان کۆبوونەوە، بۆ ئەمەی سەرلەنوێ پەل بۆ یانە هەڵبژێرن بەپێی پێڕەوی یانەکە هەر نۆ مانگە جارێک پەلی تازە هەڵبژێرێتەوە.

لە پێشەوە لەلایەن جیاووکەوە[1] وتەیەکی جوان خوێندرایەوە، پاشان ئەمین زەکی بەگیش هەندێ قسەی کرد، ئینجا دەست کرا بەهەڵبژاردنی پەلەکان.

دوو کۆمەڵ هەڵبژێررا، هەر یەکەی ٩ کەس، کۆمەڵێکیان هی ناوچە، دووەمیان بۆ بەڕێوەبردنی یانە و بەجێهێنانی کار و فەرمانی لە پاش ڕاکێشانی قاقەز کۆمەڵی ناوچە دەرچوون:

١- ئەمین زەکی بەگ

٢- مارف جیاووک

٣- ئەحمەد ئەفەندی هەولێری

٤- عەبدوڵڵا لوتفی عەلی ئاغا

٥- ئەمین ڕەواندزی

٦- موحەممەد عەلی سەقا

٧- کەریم

٨- دوکتۆر شوکری مەممەد

٩- غیاث الدین - نیرراوی ئامێدی.

(١) مەعرووف جیاووک: کەسایەتییەکی سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی دڵسۆزی کورد بووە، سەر بەعەشیرەتی (باڵەک)، لە گوندی (سرێشمە)ی نێزیک خەلیفان لە هەولێر.

دوای چوونی خێزانەکەی بۆ بەغدا، ئەم لە ١٨٨٥ لەوێ لە دایک دەبێ و هەر لەوێش خوێندنی سەرەتایی تا بڕوانامەی (حقوق) دەخوێنێ. لە ١٩٢٨ بەنائیبی هەولێر هەڵدەبژێررێ، نموونەی کوردێکی دڵسۆز دەبێ لە پەرلەمانی عێراقی ئەو رۆژەدا، دوایی دەبێتە ئەندامی دادگای تەمیز لە بەغدا، ئینجا موتەسەریفی سلێمانی، هەروا لە دامەزرێنەرانی (یانەی سەرکەوتن) دەبێ لە بەغدا. گەلێ نامیلکە و نووسراوی بەچاپ گەیاندووە: هەزار بێژ و پەندی کوردی، ئیملای کوردی، (مأساة بارزان المظلومة) بەعەرەبی لە ١٩٥٤دا کە بەرگرییەکی بوێرانەیە بۆ ئەو سەردەمەی کتێبەکەی تیا بلاوکردۆتەوە و ڕێز و ئەوازشێتی بۆ خودی سەرۆک مستەفا بارزانیی ئەمر.

دەزگەی ئاراس لە هەولێر لە ٢٠٠١دا چاپی دووەمی ئەم کتێبەی کردەوە، بەپێشەکی سامی شۆڕشەوە.

ئەمانەیش پەلی دووەمی کۆمەڵەن:

١- تەوفیق وەهبی

٢- جەمال بابان

٣- میرزا فەرەج

٤- شێخ عەلی قەرەداخی

٥- سەبری عەلی ئاغا - ئێرراوی کۆن

٦- موستەفا شەوقی - نووسەری ناودار

٧- بەشیر موشیر - بەرگدروو

٨- عارف پشدەری

٩- داوود حەیدەری - کوڕی برایم حەیدەری سەرداری یانەی کۆن.

وتەی جیاووک: ئەمە بەکورتی قسەکانی جیاووکە:

گەورەکانم

هەموو دەیزانن کە پار بە چ گێرە و کێشەیەک ئەم یانەیەمان کردەوە، چەندە خەریک بووین هەتا ئەمەمان پێک هێنا. دیسانەوە هەموو لەبیرتان دێ بەچە زەماوەندێکی گەورە و ڕازاوە گوشادمان کردەوە، لە سەرەتاشەوە یانە چۆن بوو؟ کە ڕێ بەر کەس نەدەکەوت بۆ دانیشتن!...

ڕۆژ بەسەر ڕۆژدا دەڕۆیشت ئێمە هەر لە کۆشش و تەقەللادا بووین، لە بەغدا ١٢٥٠ ڕووپیەمان بۆ کۆکردەوە، ئەوەبوو بەندە بەخۆرایی لەلایەن یانەوە ئێررامە هەولێر بەسایەی ئەحمەد ئەفەندیەوە نزیکی ٥٠٠٠ ڕووپیەمان لای کوردەکانی ئەو ناوە بەنا، بەڵام حکومەت بووە پەرژینی گەیشتن بەو دراوە باشە، ئیتر ئەوەبوو پوولێکمان دەستگیر نەبوو. دیسانەوە گەردوون نەیپەرژاندنیە سەر ئەوەی لە شوێنانی تر بگەڕێین پیتاک کۆیکەینەوە، کە هەر لەو حەلەشدا پشێوی کارێکی لێ کردین حکومەت بەتەرحێکی وا ڕێی لێ بەستین بەهیچ کلۆجێ لێ لەو تەرحە شوێنانە بکەینەوە، کە دەبوو هەتا ئێستا هیچ شارێکی کوردستانی خواروو نەمایە لێمان نەکردایەتەوە.

دیسانەوە بێ دراوی کارێکی وای پێ کردین نەمانتوانی قوتابییەک لەسەر دراوی یانە ڕەوانەی ئەوروپا یاخود شوێنانی تر بکەین... بێگومان هەموو دەیزانن کە ئەمانە ئۆباڵی بەئەستۆی کێ بووە؟!

ڕۆژ دەڕۆیشت و یانە هەتا دەهات گورێگری کەم دەبووەوە هەتا بەتەرحێکی لێ هات لە ڕۆژی هەینیەکاندا کە وتەمان تێدا دەدا گوێگر لە ژمارەی پەنجەی دەستی تێپەڕ نەدەکرد. بەڵام ئێمە هەر لەسەر ڕێی خۆمان دەڕۆیشتین لە هیچ نەدەوەستاین... لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەبوو بەندە (ئیسلایەکی کوردیم) لە چاپ دا و بڵاوم کردەوە، جەنابی ئەمین زەکی بەگیش دەستی کرد بەمێژوو نووسینەوە، ئەوا دوێنێ تەواوی کرد. لەسەر دراوی یانە (هەرچی مابوو) دەست کرا بەچاپی...

بەڕاستی شایانی زوێرییە، جێی شورەییە ئێمەی کورد یانەیەکی وا بچووکمان پێ بەڕێوە نەبرێ، کە

لەناو گەلانی تردا بەدەیان کۆمەڵ و یانە بەڕێوەدەچن!... ئەو پارەیەش کە لێرە گردمان کردبوودوە هەمووی بەیانەکە و چاپکردنی ئەو ئیملا و مێژووە، لە مردنی (برایم حەیدەری - سەرکاری یانە) و هەندێ شتی تردا بەخت کردووە (کراوە - ا.ب.).

بەندە زۆر حەز دەکەم یەکێک لێم بپرسێتەوە کە چۆن بەخت کراوە تا پێی بڵێم، کەس هەیە؟!. نەبووە. ئێستەش بۆ ئەمە کۆبووینەتەوە سەرلەنوێ پەلێ هەڵبژێرینەوە، ئێمەش بەمەردایەتی ئێوە و بەپشتی ئێوەوە بەناوی خودا لەمەودوا ئەم نامەیە لەپێشوو چاتر بەخێو دەکەین..

«چەپڵە»

ئەمین زەکی: ئەمەش بەکورتی قسەکانی ئەمین بەگە:

گەورەکان

بەندەش دەمەوێ لەم ڕووەوە چەند قسەیەکتان لە ڕوودا بڵێم. لە قسەکانی مارف بەگ وا دەرکەوت کە ئیتر یانە هیوای نەماوە بۆ ژیان، بەڵام بەندە بەهیچ ڕەنگێ لەمەدا هاوتانیم. بەندە لە تەمەنی خۆمدا بێ هیوایم نەزانیوە، قەت حەزم لە بێ هیوایی نەکردووە... پیاو هەمیشە بەهیوابێ چاکە، بێگومان هەر ڕۆژێک دەبێ بۆی بێتەدی!...

خوا وای داناوە گەلێک حەز لە ئازایی بکا هەمیشە بەشی ئێش و ئازار دەبێ، کوردا خوا کە هێناویەتە بوون بەئازایەتی دروست کردووە، لەبەر ئەوە دەتوانم بڵێم کورد لە هەموو گەلێک ناخۆشی زۆرتر چەشتووە، لە هەموو کەس زۆرتر خوێنی ڕژاوە. بۆنمش ئەوەیە کە هەمیشە کوژراوی ئازادی بووە، قەت حەزی بەرەنجبەری بێگانە نەکردووە!...

لە دەمی پێشوودا ئاسوور لە هەموو گەلێک دڕندەتر، خوێن ڕێژتر بوون، کەس بەوەندەی ئەوان گەلی کەی بەتەواوی نەهێناوەتە ژێر بارەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پاشایەکیان کە لەسەر خشت ویستوویەتی زەبر بەدەستی خۆی نیشان بدا، وتوویەتی:

«لە دەمی منا هیچ بەردەستێکم (گەلێکی بێگانە) نەیتوانیوە سەربەرزکەنەوە... گەلی (گۆتۆ - کورد) نەبێ!...».

ئینجا بیهێننە پێش چاوتان بزانن کورد لەو حەلەشدا چۆن بۆ ئازادی خۆی هەوڵ و تەقەللای داوە... کە ئەوەبوو لەگەڵ پاشای کلدان (کەی ئاخسار)ی کورد لە ژێرەوە ڕێک کەوتن، پێکەوە هاتنە سەر ئاسوور (ئاشوور - ا.ب) نەینەوایان لە بنەڕەت تێکدا، کە مێژوو باسی دەکا دەڵێ:

«یەکەم لەشکرێ هاتە سەر ئاسوور (ئاشوور...) لەو هەڵمەتەدا لەشکری کورد بووە».

ئێمەش نابێ بێ هیوابین، نابێ گوێ بدەینە پێچ و ناوناخنی گەردوون، دەشێ نەترسین، هەوڵ بدەین، خۆمان ڕاگرین: کاتێک دەزانین بەهەموو نیازێکمان دەگەین کە بەناوی خوا بەم زوانە پێک دێ، دەشبێ هەتا تنۆکێک خوێنمان تیا ماوە بۆ بەرزی ئەم یانەیە هەوڵدەین چونکی ڕەنج بۆ کورد دەدا...

«چەپلە»[1]

بەندەش هەواڵی ئەم ڕۆژە خۆشەم بۆ فائیق بێکەسی هاوڕێم نارد، لام وایە نووسینی بەم بۆنەیەوە ناشیرین نییە:

یانەی سەرکەوتن لە سەرکەوتنە
ڕابوردووی کەوتن، ئێستای ڕۆیشتنە
هەیئی ڕابوردوو، گەورە و بچووکمان
تیا کۆبووینەوە بۆ ئەعزا دانان
لەلایەن جیاووک کردەوەی یانە
پیشانمان درا دانە بەدانە

(١) دەربارەی کورتە مێژوویەکی دامەزراندنی ئەم یانەیە، لە نامیلکەی (باربوو) کە لەلایەن (هەیئەتی ناوچەی یانەی سەرکەوتن)ەوە ئامادەکراوە ١٩٤٣-١٩٤٤، ئاوا دەڵێن:
* لە ٩ شباط ١٩٣٠ مەعروف جیاوک ئیستدعایەکی پێشکەش کرد بۆ کردنەوەی کۆمەڵێکی زانستی لەگەڵ کۆمەڵێک پیاوانی ناسراوی ئەو ڕۆژە... ئەم سکالایە پێشکەش بەوەزارەتی داخلیە کرا، ئینجا ئیذنی پێ درا بەسەرۆکایەتی جەنابی مەعروف جیاوک بەژمارە (٦٨٩٥) لە (١٩ مایس ١٩٣٠) مەنشوورییەتی کردنەوەی درا.
* لە ٣٠ مایس ١٩٣٠ لە سینەمای ڕۆیاڵ حەفلەیەکی گەورە کرا خەڵکێکی زۆر لە کورد و بێگانە و ئەعیان بانگ کران، لە پاش حەفلە هەیئەتی مەرکەزی کۆمەڵە هەڵبژێررا:
١- شێخ الاسلام العثمان ابراهیم افندی حیدری. ٢- مەعالی امین زکی بگ. ٣- محمود جەودەتی ڕەحمەتی. ٤- احمد ئاغای کرکوکلی زادە. ٥- عبداللە لطفی بگ حاجی علی ئاغا. ٦- میرزا فرج شریف. ٧- مرحوم شێخ علی قرداغی. ٨- مرحوم خلف شوقی داودی. ٩- بشیر مشیری بەرگدروو.
* نزیکەی دوو ساڵ هەیئە لە خانووەکەی مەعروف جیاووک کۆ ئەبوونەوە، لە پاش وەفاتی ئیبراهیم ئەفەندی ئەمین زەکی بوو بەرەئیسی یانە.
* لە ١٩٤٣/٤/١٧ هەیئەتی ناوچەی تازەی کۆمەڵە هەڵبژێررا بریتی بوون لەمانە:
١- میرزا فرج شریف. ٢- علی کمال بگ. ٤- حکمت زهاوی. ٤- ناجی عباس. ٥- هادی رشید چاوشلی. ٦- بشیر مشیر. ٧- حەمەڕەش - حەمە حەمۆیزی ڕەحمەتی. ٨- عبدالرحمن نورجان.
* لەبەر بێ جێگەیی نظامی داخلی دەرنگ بۆ دانرا ئامانجی یانە: (یارمەتی قوتابیانی کورد. دانانی لجنەی تالیف و ترجمە و طبعی کتێب و قاموس یەکبوونی زمانی کوردی. گێڕانی حفلەی مانگان بۆ ئەوەی یەکتر بناسن).
* خلاصە نظام داخلی و اساس: (کۆمەڵ زانستیە و سیاسی نییە. بەرزبوونەوەی میللەتی کورد بەزانست و وەرگێڕان و تەربیە. یارمەتی هەژار و هەتیوو و نەخۆشی کورد. هەموو کوردێکی ڕەوشت باش و غەیر مەحکوم دەتوانی داخل بێ. دخولیە ٣٧٤ فلس و مانگانە لە ١٥٠ فلس کەمتر نەبێ، ئەگەر ئەبێ لێی ناسێنرێ. بەهەر سەبەبێ کۆمەڵ تێک چوو سامانی بۆ مۆسساتی خەیریەی کورد دەبێ، ئەگەر نەبوو بەسەر هەژارانی کورددا دابەش دەکرێ.
(باربوو: چاپخانەی نجاح - بغداد ١٩٤٣-١٩٤٤ نادي الأنقاء الكردي (ل: ٢٧-٤٠)

ئینجا ئەمین بەگ خۆی ڕاستەوە کرد
بەدەنگ چەشنی شێر ئاوازی بەرزکرد
وتی: مەئیوسی پیشەی کورد نییە
یانە هەوڵ دەدا وەستانی نییە
لە ساڵی پاردا (ئیسلامان) چاپ کرد
دوێنێش (تەئریخمان) بۆ چاپخانە برد
(بێکەس) مزگێنی ئەگەر ئەنێری
مژدە ئانێریێ (شاکر) بەفێری![1]

## لاوانی کورد

لە ڕۆژی هەینی ۱۹۳۱/٤/۳دا هەرچی قوتابی بەغدا هەیە -۸۱ کەس- لە باخچەی مۆددا کۆبووینەوە: بۆ ئەمەی وێنەیەکی خۆمان بگرین بۆ یادگاری برایەتی و کوردپەروەریمان.

کورد لە بەغدا زۆرترن لە ۸۱ کەس، بەڵام ئەو کەسانەمان بانگ کردبوو کە ڕەگی کوردایەتی لە لەشیاندایە.

باخچەکە یەجگار خۆش بوو، ئێمەش لەبەر ڕۆژ وەستاین وێنەکەمان ئەگرت هەتا هەور هاتە سەرمان، ئەو دەمە لە سەعاتێک زۆرتری کێشا، ئێمەش بەخۆڕاییمان ڕانەبوارد: دەستمان کرد بەیاری کردنی خۆمان، لە لایەکەوە (سێ باز) لەلایەکی ترەوە (یەکەو حەیزەران) لە شوێنێکی ترەوە (هەڵپەڕکێ) لەبەر سێبەرەکە گۆرانی کوردیان دەوت، ئیتر خۆمان لە عەرەبستاندا نەدی بەڵکو لە شوێنێکی کوردستاندا.

ئینجا چەند خۆش بوو کوردێکی ئامێدی و کوردێکی زاخۆ، یەکێکی سلێمانی، کوردێکی کۆیسنجەق، کوردێکی هەولێر، کوردێکی کەرکوک... دەست لەناو دەستی یەکدا هەڵپەڕکێی کوردیان دەکرد!...

لاوانی کورد حەلی خۆی کۆمەڵی هەبوو. بەڵام ئێستە ئەمە دوو ساڵە نەماوە[2]، بەڵام ئەوی جێی خۆشییە هیچ هەینییەک نییە قوتابی سانەوی و قوتابی دارولموعەللمین نەبینی، هی قوتابخانەکانی تر

(۱) لە دەستووسی (خۆشخوانی)دا لەژێر ناوی (نامە) دایە، دەڵێ لە ۱۹۳۱/٤/۷ بۆ بێکەس نادرووە، ئەو دێری تری لە پێشەوەیە، جیاوازییەکی بچووک لە دێری یەکەمدایە (ڕابوردوی کەوتن...) لە دەستووسەکە: (ڕابوردووی وەستان...).

(۲) لەم بارەیەوە مامۆستا (جەمال بابان) دەڵێ: کۆمەڵەی لاوان لەلایەن خوێندەوارانی کوردەوە لە بەغدا لە ۱۹۲۳ پێک هات، کۆمەڵێکی زانستی و کۆمەڵایەتی بوو، لە دواییدا دەستی لە سیاسەتیشەوە دەدا. ئامانجی یەکێتی و بڵاوکردنەوەی زانیاری و هاندانی خوێندن بوو، دەبوایە هەر قوتابییەک پاش خوێندن بۆ هەر لایەکی کوردستان بنێرێ بچێتە ناو خەڵکەوە، بیروهۆشی کوردایەتی و سوود و قازانجی زانستییانە لەناودا بچەسپێنێ. کۆمەڵە پەیوەندی بەرۆڵە کوردەکانی دەرەوە و ناوەوە هەبوو، نامەی دەنارد بۆ: بەدرخانییەکان، مستەفا شاهین، مەمدوح سەلیم لە سوریا، د. سەعید کوردستانی لە تاران، د. عەبدوڵڵا =

نەبێتن. هەروەهاش بۆ ئەوانی تر، ئەوی شایانی ئاژکردنیشە ئەوەتە هەموو بەناوی کوردپەروەرییەوە دەچنە لای یەک... دووبەرەکی لەناودا نییە، لەبەر ئەوە هیچ کەم نییە، بەناوی خوا، ئەم ڕێکییە بگۆڕێتە سەر دامەزراندنی کۆمەڵی گەورە گەورە بۆ پێشکەوتنی کورد هەوڵ بدات[1].

## کوردستان لەم دوو هەفتەیەدا ۱۹۳۱/٤/۱۲

خانەقین: لەم ناوەشدا ئاگری شەڕ هەڵگیرساوە، گڕەکەی تا دەمی کەرکووک درێژ بووە، لەم شوێنەدا تیرەی جاف، تاڵەبانی، داوده و زەنگەنە هەڵساون. لەم چەند ڕۆژانەدا هەرایەکی خراپیان لەگەڵ عەرەب کردبوو، تاڵەبانییەکان لەشکرەکەیان شکاندبوو بەڵام لە دواییدا پۆلیس و فڕۆک بەفریایاندا گەیشتبوون، لە پاش کوشتارێکی زۆر لە هەردوو لا، تاڵەبانی بەناچاری هەرای کردبوو. فڕۆکەکان بەوەش وازیان نەهێنابوو، هەندێ دێی ئەو ناوەیان بۆمباباران کردبوو... لەوانە دوو فڕۆک کەوتبوونە خوارەوە.

دزەیی: ئەمانیش لەلای کەرکووک و هەولێرەوەن، (هەرکی)یشیان لەگەڵە، ئەوا ئەوانیش هەڵساون. ئەم تیرەیە لە هەموو تیرەکانی تر بەهێزترن، خەریکن (بەقسە) بدەن بەسەر هەولێر و کەرکووکدا.

قلیاسان: سەیری ئێرە لە هەموو خۆشترە، (سەید حەمەدە بچکۆلە) لە سەعاتی دوو لە شاری

= جەودەت لە ئەستەموڵ و شوکری محەممەد سەگبان. ئەشرەیەکی دەستنووسیان هەبوو، لە سلێمانی و هەولێر و شەقلاوە و، ڕەواندز بڵاو بوو، بڕیار بوو ئەندامانی هەموو ساڵێ کۆببنەوە و وێنە بگرن، هەرچەند (إجارە)ی نەبوو بەڵام ئیشی خۆی هەر دەکرد، دوای نسکۆکەی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و لێدانی کوردەکان، لە سەرەتای مایسی ۱۹۲۵ لە باخەکانی (صالحیة)ی بەغدا کۆبوونەوەیەکیان بەست، زۆربەی وەزیر و باڵیۆز و کاربەدەست و کەسایەتی کورد و عەرەبیان بانگ کرد، هەروا نوێنەرانی ڕۆژنامەی (الأستقلال، المفيد، العالم العربي، البلاد) وتار بەکوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی لەلایەن کەریم ڕۆستەم و ئەنوەر سائیب و مەعروف جیاووک و مەمدوح سەلیم خوێندرایەوە، وتەکان کرانە ئینگلیزی و فەرەنسی بۆ باڵیۆزەکان.

هەر بەو ئێنەوە کۆمەڵە تا ۱۹۲۷ی خایاند، دوایی بەهۆی گواستنەوەی ئەندامەکانی بۆ دەرەوەی بەغدا، کارەکانی سست بوو. وەک مستەفا سائیب بۆ سلێمانی، عەبدولواحید نوری و ئەحمەد ڕەفیق و عەبدوڵلا عەزیز کە هەریەک دوای کاری خۆی کەوت.

مامۆستا جەمال لە بەرگی گۆڤارەکەدا ئەو وێنەیەی بڵاوکردۆتەوە کە لێرەدا مامۆستا شاکر فەتاح باسی دەکات و دەڵێ: ئەم وێنەیە لەسەر پشتەکەی نووسراوە (الاوانی کورد لە بەغدا ۱۹۳۱/٤/۳) وا دیارە کۆمەڵە لەسەر چالاکی خۆی مابێ ئەگەر بەسستیش بێت.

بۆ زیاتر بڕوانە: ڕۆشنبیری نوێ، بڵاوکراوەی بەڕێوبەرێتی گشتی ڕۆشنبیری کوردی بەغدا، ژمارە ۳۹ی نەورۆزی ۱۹۷۵، جەمال بابان: مێژوویەکی لەبیر چووەوە.

(۱) لە دەستنووسەکەدا جێی وێنەیەێ هەیە، بەڵام لێی کراوەتەوە، مامۆستا خۆی و ئەریان جیاووکی دیاری کردووە بەژمارە (۱ ۲) هەروا قوتابیانی ئەو قوتابخانەیەی بەغدا کە بەشداربوون لە وێنەکەدا وەک: سانەوی مەرکەزی، دارالمعلمين، طيران، صنائع، ئەعزەمیەی ئاییی و حەربیە... جێی داخە ئەو وێنەیە دیار نەماوە.

سولەمانییەوە بەخۆیی و پەنجا سوارەوە لە چایخانەکەی قلیاسان دادەبەزن. بەزۆر چاگێڕەکە (چاچیەکە - ا.ب) دەنێرنە سلێمانی کە بەحکومەت بڵێ ئەوا چەتەی شێخ مەحموود لە قلیاسان دابەزیون!

ئینجا پۆلیس و لەشکر دێن. لێیان دەبێتە هەرا، سەرکۆمارێکی عەرەب و چوار پۆلیس دەکوژرێ، لەوانیش دوو سێ کەس بریندار دەبن...

ئینجا چەتە دەڕۆنەوە بۆ شوێنی خۆیان، لە پاش ئەمەی ئەو فەرمانەی شێخ مەحموود بەسەریادابوون بەجێیان هێنابوو.

کوردستانی ژوورو: ئیمرۆش لە رۆژنامەی (ئیستیقلال)ی بەغدا ١٩٣١/٤/١٢ خوێندمەوە کە هەرا دیسانەوە لە کوردستانی تورکیادا هەڵگیرساوە.

بەڵام ئەم هەرایە زۆر گەورە و بەتینە، چونکو هەندێ لە کوردەکانی ئازربایجانیشیان چوونەتە سەر (چوونەتە پاڵ - ا.ب.) و پشتیوانیان کردوون.

## لێرە و لەوێ ١٩٣١/٤/١٨

شێخ مەحموود: ئەی خوێندەواری خۆشەویست، تۆ وا تێنەگەی ئەم هەواڵانەی ئێمە لێرەدا دەینووسین خۆهەڵبەست یاخود لە بیستنێکی بێ سەروپاوە بیگرێنە سەر نووسین لێرەدا بیخەینە پێش چاوت. لەسەری ئەم نامەیەشەوە نووسیومە کە ئێمە هەرچی هەواڵی راست نەبێ، خۆمان بەتەواوەتی نەچووینە (نەچینە - ا.ب.) بنجوبناوانیەوە؛ لێرەدا نایینووسین. چونکی ئەگەر وانەکەم ئەو حەلە ئەم نووسراوەیە بەهای پووشکەیەکی نابێ، ئینجا ئەو حەلە هەرچی رەنجێکم تیا داوە بەبا دەچێ!

بەتایبەتی ئەمەم بۆ هەواڵی هەرای شێخ مەحموود هێنایەوە: ئەگەر بەندە هەواڵی شێخ مەحموود کە وەکو هەموو رۆژ لە دەمی ورد و بچووکی کورد و بێگانەوە دەبیستم، کە لە رۆژنامەکاندا دەیبینم بیخەمە سەر قاقەز، مانگی نووسراوە بەڵکو هەفتەی ٣٠٠ لاپەڕەی دەوێ تیادا ڕەشکرێتەوە، زۆریش لەمانە دەنگە خۆهەڵبەستە، هیچی پاڵ نادانە سەر سەرچاوەیەکی راستەقینە.

چەندێ لەمەوپێش، (٥) رۆژ، رۆژنامەی عەرەب، ئەم هەرایەی دواییەی شێخی نووسیبوو، بەڵام هەمووی درۆ، لەناو ئەم و ئەودا دەمبیست هەر درۆ، سەرت نەیەشێنم بەپێنج جۆرم بیست، هیچی لەوە نەبوو پیاو بیخاتە کەللەیەوە!، لەبەر ئەوە منیش راوەستام هەتا یەکێکی باشم دەست کەوت لە سلێمانیەوە هاتبوو، بەتایبەتی لە سەرکۆمارێکی عەرەبی پرسیبوو کە خۆی لە هەراکەدا بووە. ئەمەتا:

«شێخ مەحموود لەشکرەکەی بڵاوە بەهەموو شوێنێکدا قەرەداغ، شارەزوور، سیلاحیە، لە ناکاو ئاگای لەخۆی نابێ دەبینێ هەر چوار لای بەلەشکری عەرەب تەنراوە، خۆی و ٢٥ سوار و ٣٠ جەنگاوەری پیادە دەبن. لە دێی (کانی باریک)[١] بەسەر شاخێکەوە نزیکی کفری؛ مەترەلۆزێکیشیان پێ دەبێ. لە پاش

(١) کانی باریک: یان (ئاوباریک) کە ئەمەیان راستترە. وەک رووداوەکان دواییتر دەریان خست، ئەم شەڕە کە لە گەرمیاندا لە نێوان هێزەکانی حکومەتە (سوپا و پۆلیس و غەیرە نیزامی-یان جاش بەناوونانی ئەمڕۆ) و=

نیوەڕۆیەكی نزیكەوە تا پاش نوێژی شێوان (٥) سەعات بەرامبەر بە (١٥٠٠) پیاوی عەرەب، (٤٥) مەترەلۆزیان شەڕ دەكا (شەڕی دەكرد -ا.ب.)... هەتا ئێواریێ هیچیان ناشكێن، ئەوەندەی نامێنێ شێخ مەحموود بگیرێ. (٣٠) سواری عەرەب هەڵمەت دەبەنە سەر دێیەكە. بەڵام كوردەكان لەبەر جێیەكەیان ناشلەژێن. مشتیان لێ دەگرنەوە، لە هەر سێ سوارەكە دوو سێیەك دەهێڵنەوە، هەموو دەكەونە خواریێ - دەكوژرێن-. عەرەبەكانی تر كە ئەوە دەبینن دەگەڕێنە پاشەوە، شەویش تاریك دەبێ یەجگاری هەڵدێنەوە شوێنی كۆنیان شێخ بەجێ دەهێڵن. شێخ مەحموود و لەشكرەكەشی لە ترسی گرتن لە دێیەكە هەڵدێن. بەو تاریكییە خۆیان ڕزگار دەكەن. لە عەرەبەكان دوو سەركۆمار و ٤٥ كەس، لەمانیش هەشت كەس دەكوژرێ. لەو كاتەدا بەڕاستی ژیانی شێخ مەحموود لە ئەماندا دەبێ، بەڵام خوا یارمەتی دابوون. دوژمن بەسەریاندا زاڵ نەبووبوو. ئێستە لە شاربازێرن...»[1].

كۆمەڵێكی نهێنی: لێرە لە بەغدا، ئێستا كۆمەڵێكی نهێنی كورد هەیە بۆ دەستكەوتنی ئەمەكی كورد هەوڵ دەدا.

پەلەكانی: شێخ قادری شێخ سەعید، موستەفا شەوقی، عەلی عیرفان، تەوفیق قەزاز، تەوفیق وەهبیش سەردارییانە، پەلیان لە شوێنانی تر كوردستانی خواروودا هەیە. وەكو بیستوومە، بەڵام

= هێزێكی شێخ كە لە باشترین حاڵەت و بۆچووندا لە سەد شەڕكەر زیاتر نەبوون، ڕووی دا و هێزی ئاسمانی بەریتانیش پاڵپشتێكی چاكی ئەو هێزانەی حكومەتی دەكرد. ڕووداوەكان ئەوەیان دەرخست كە ئەو شەڕە یەكلاییكەرەوە بوو سەبارەت بەو بزووتنەوەیەی شێخ و بگرە كۆتاییشی هێنا بەژیانی سیاسی و شۆڕشگێڕایەتی، لە ڕاستیدا (دەردە كورد) كاری خۆی كرد و ئەمجارەش ناكۆكی نێوان كورد خۆی بووە هۆی سەرەكی لە سەركەوتنی دوژمندا، هەر ئەو هەڵوێستە ناجوامێرانەیەی عەشرەتە كوردەكان بوو كە لە ژێرەوە دەستیان لەگەڵ حكومەتدا تێكەڵ كردبوو، وای لە شێخ كرد نائومێد بێ و دوای ماوەیەكی كەم بڕیاری تەسلیم بوونەوە بدات. لە ١٣ی مایسی ١٩٣١ تەسلیم بوو ئێررایە سەماوە، ناسریە، عانە و لە ١٩٣٣ هێنرایە بەغدا بەدەستبەسەری، هەتا ١٩٤١ لە هەراكەی ڕەشید عالیدا هاتەوە داریكەلی.

(١) لەلایەن حكومەتیشەوە ئەم (بلاغ رسمی)یە دوای شەڕەكەی ناوباریك بڵاوكرایەوە: «ئەو ئاڵای سواری لەگەڵ قوتی پۆلیس كە لەژێر قوماندەی عقید اسماعیل نامق دابوو لە تاریخی ٥ی نیسانی ١٩٣١ ئیستخباركرابوو كە شێخ محمود خۆی و أتباعی لەوێن. قوتی مذكورە دێی ناوباریكی إحاطەكرد لە طرف طیارەشەوە متمادیاً ئەشقیاكان و دەوروپشتی دێی مەذكور بومباردومان ئەكەن لە پاش نیوەڕۆ هەتا تاریكە شەو بەشدت مصادمە دەوام ئەكات. قوەتی جیش لەم مصادمەیە (٤) عسكر و (١) ضابط شهید وە (١٤) عسكر و (١) ضابط بریندار ئەبێت. تلفیات و خەسارەتی شێخ محمود جداً زۆرە بەدەرەجەیەك كە تەنها لەدێی ناوباریك (١٠) كوژراو و مەیتی دوو كەس لە ڕونەسا، یەكێكیان (شێخ علی كوڕی رحیم) لە كوژراوەكاندایە وە بریندارێكی زۆریان لەگەڵ خۆیان نقل كردوە. ئێستا شێخ محمود تەنها لە لجاتداتی ڕۆحی خۆی زیاتر تفكر ناكا. ئەمڕۆ موثوقاً زانیومانە كە لەگەڵ (١٠٥) سواری دا لە شاخی قرەداغ تێپەڕیوە وە قوەتی جیش و پۆلیس بەشدت تعقیبات ئەكات وە محوكردنیان قریباً مەئمولە). بڕوانە (ژیان - ڕۆژنامە: ژمارە، ٢٧٩، ١٦ی نیسانی ١٩٣١).

بەڕاستی، تا ساڵێکی تر هەمور شتێکمان دوایی دێت، ئەو حەلە (کۆمەڵی گەلان) لە جنێف قسەی دواییان لە بابەت کوردەوە دەردەبەڕێن.

بەڵام ئێستەکی ئاسووریش بۆ خۆیان خەریکن، لام وایە عەرەب ئاگایان لەمە نییە، هەتاکو لە جنێف جێنشینێکیان داناوە کە لە سەریان بکاتەوە، کە گۆیا ئەوانیش وەک کورد شتێکیان بۆ ڕێکخرێ و خۆیان خۆیان بەمن بەڕێوە. لەسەر ئەوە لەلایەن ئەم کۆمەڵەشەوە (سورەییا بەدرخان) ناو کوردێکی ورپایان کردووە بەنێرراوی کورد، ئێستە لە جنێفە لەگەڵ کۆمەڵی گەلاندا کەینە و بەینەی ئەم ویستەی کوردی عێراق دەکا کە چی پێ دراوە بەجێ بهێنرێ...

(سورەییا بەدرخان) لە بەدرخانییەکانە، لە هەرای کوردستانی ژووروودا دەستێکی بەهێزی هەبوو، پار لە میسر بوو، پاشان چووە پاریس، ئەوا ئێستا بۆ ئەم لا دانرا کە بچێتە جنێف. جگە لەمەش هەفتەی پێشوو تەوفیق وەهبی بەگ چووە سوریە، بێگومان بەبۆشی نەچووە، هەڵبەت شتێکی بەدەستەوە بووە، بەڵام خوا دەیزانێ چییە؟ بەشێکی ئەویشمان بۆ دەرکەوێ پێشکەشی خوێندەوارانی بکەین.

شەرەفنامە: مێژووی کوردستانە، (ئەمیر شەرەفخان)ی بدلیسی کورد لە ساڵی ١٠٠٥ھ دا بەفارسی دایناوە، باسی هەموو حکومەتان دەکا کە لە کوردستاندا دامەزراوە، لە سەرەتایەوە تا ئەو دەمەی کە خۆی تیادابووە. ئەم مێژووە (٥٩٢) لاپەڕەیە، زۆر بەهادارە، دەتوانم بڵێم یەکە مێژووە کە کوردستانی بەڕاستی تیا دەربکەوێ. کە ئەگەر ئەو نەبوایە کورد هەروا بەبێ ناو دەمایەوە. بەسایەی کوردێکی (میسری)یەوە (فەرەجوڵلا زەکی کوردی) لە چاپ دراوە، بەسەرەتایەکی (٣٢) لاپەڕەییش لەلایەن (موحەممەد عەلی عەونی) کوردێکی ترەوە، کورد و کوردستان و زوبانی کوردی و لەسەرکردنەوەی، بەرچدانەوەی هەندێ بێگانانی، بەزوبانی عەرەبی تێدا نووسراوە[1].

دوێنێ بەناڕەزوویەکی بێ ئەندازەوە کڕیم بە(٤.٢٥) ڕوپیە، گەلێ کەڵکم لێ وەرگرت. نووسراوەکە وەنەبێ بەکوردی بێ، بەڵام چونکی ئەو پیاوە ئەو هەموو ئەرکەی لەگەڵدا کێشاوە، پیاو دڵی ڕەنجەڕۆی نەکا، یارمەتی دا، تاکو بۆ کارێکی بەکەڵکی تری وەها بەدڵێکی گەرمەوە بچێ، دەستی سارد نەبێتەوە.

کاشکی لە هەموو شوێنێکی تریشەوە یارمەتیان بدایە تا لە ڕێی ڕاستی خۆیەوە بڕوا، کە بەوە کورد پێ دەگا، کوردستان بەرز دەبێتەوە...

(١) محەممەد عەلی عەونی (١٨٩٧-١١/٧/١٩٥٢) لە ناوچەی دیاربەکر لەدایک بووە، دوای خوێندنی سەرەتایی چۆتە ئەزهەر و خوێندوویە، دوایی لە دیوانی مەلیک فاروقی میسر کراوە بەوەرگێڕ چونکە گەلێ لە زمانانی ڕۆژهەڵات و فەرەنسییەکی باشیشی دەزانی، پەیوەندی چاکی هەبوو لەگەڵ بەدرخانییەکان و ناودارانی کوردی ئەو کاتە، لەوانە (ئەمین زەکی بەگ)، زۆر ورد خۆی دابووە مێژوونووسێ و لێکۆڵینەوەکانی، هەر خۆی پێشەکییەکی نایابی بۆ ئەم تەرجەمە فارسییەی شەرەفنامەیە نووسی کە مامۆستا لێرەدا باسی دەکات، ناوبراو لە قاهیرە نێژراوە و لە دوای خۆی کچ و کوڕێکی لە پاش بەجێ ما: (دوریە) کە ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەنووسێکی دیاری میسرە، (عصام) کە ئەندازیارێکی سەرکەوتووە.
بۆ زیاتر بڕوانە: د. کمال مەزهەر ئەحمەد، مێژوو، بەغدا، ل١٩٠-١٩١.

ئەلقە زیبەتول کوردیە: ئەمە پێنجەمین نووسراوەی کۆمەڵی خۆیبوونە، بەڵام بەزوبانی عەرەبی لە چاپ دراوە. نووسراوەکە باسی ڕابوردووی کورد و ئێستای دەکا، مێژوویێکی یەجگار نرخدارە؛ باسی هەرای کوردستانی ژووری ١٩٢٥ و هەرای پار هاوینێ تیادایە، نووسەرەکەی (دوکتۆر بلەچ شێرکۆ)[1] دەڵێ: مەبەستمان لەمە ئەوە بوو گەلی عەرەب لە ڕاستیی چۆنێتی کوردستان بگەیێنین، چونکی تورک بەڕەنگێکی خراپ کوردیان پیشانی خەڵک داوە. یەکێ لەو باسانەی: زوبانی کوردییە، ئێمەش لەبەر ئەوەی زۆر لە بێگانان هەتا لە کورد نەشارەزان لە چۆنێتی زوبانی کوردی، گۆڕیمانە سەر کوردی، تا تێبگەن کە کورد هەروەکو بەدەستە بەزوبانیشە. (لە لاپەڕەی ئەودیودا ئەو باسە بەکوردی بخوێنەرەوە).

ئەم نووسراوەیە پڕە لە وێنەی سەرکۆمار و لەشکر و شوێنە قایەکانی کوردستان کە لەم هەرای دواییەدا گیراون.

ئەم نووسراوەیەشم لە (موستەفا زەکی سائیب)ەوە چنگ کەوت کە لە شوێنێکی تری ئەم نووسراوەیە باسم کردووە. ئەویش دەمێک بوو بەڵێنی پێ دابووم، دوێنێ بۆی هات و منیش لێم وەرگرت.

زوبانی کوردی و ئادابی[2]: زوبانی کوردی وەکو هەموو زمانە ئارییە ڕۆژهەڵاتەکانی تر لە پەهلەوی و سەنسکریتی و میدیەیی بۆتەوە، لە پێش ئیسلامدا لە چەپەوە بۆ ڕاست دەنووسرا، بەنووسینێکی سەربەخۆوە کە زۆر لە نووسینی ئاسووری و ئەرمەنی دەچوو. ئەم نووسینە لە پاش پەیدابوونی ئیسلامەوە ئیتر وازی لێ هێنرا؛ کوردەکان دڵیان دایە نووسینی عەرەبی کە قورئانی پێ نووسراوە. بەڵام ئێستە: زوبانی کوردی چوار ئاهەنگە[3]: کرمانجی، گۆرانی، لوڕی و، کەڵوڕی.

لەمانە نزیکترینیان بەپەهلەوی، ئاهەنگی لوڕییە کە لە ناوچەی پەهلەوییەوە نزیکترینیانە، لەلایەن زوبانی کلدانی و ئاسوورییشەوە زامدار نەبووە... لە دوای ئەو کەڵوڕ دێت، ئینجا گۆرانی لە پاش ئەویش کرمانجی. بەڵام ئەم دووانەی دوایی لەبەر دراوسێتیان بەکلدان و ئاسوور زۆر تێکچوون.

(١) (الدكتور بلەچ شیركو، القضیة الكردیة، ماضي الكرد وحاضرهم، قاهرة، ١٩٣٠)، میر جەلادەت بەدرخان ئەم کتێبە مێژووییەی بەو ناوەوە بەفەرەنسی و عەرەبی بڵاوکردەوە، پوختەی مێژووی کۆنی کورد و بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەناویدا، زمان و ئەدەبی کوردی، خەبات و ڕاپەڕینەکانیانی تۆمارکردووە، یەکێکە لە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی خۆیبوون، د. کەمال مەزهەر مەزندەی ئەوە دەکات کە زانای ناوداری کورد محەممەد عەلی عەونی هاریکاری کردبێ لە دەقە عەرەبییەکەیدا، چونکە دۆستایەتی ئەو دووانە گیانی بەگیانی بووە. (بڕوانە: د. کەمال، مێژوو، بەغدا، ١٩٧٣، ل ١٨٩). بۆیە دەربارەی ناوە ڕاستەقینەکە بۆ (بلەچ شێرکۆ) سێ ڕای جیاواز هەیە: دەڵێن گوایە میر جەلادەت بەدرخانە، هەیە دەڵێ: میر ئەحمەد سورەییا بەدرخانە، سێیەم دەڵێ: محەممەد عەلی عەونییە... جا دەبینین د. کەمال مەزهەر لەگەڵ ڕای یەکەم دایە و بەڵام هاریکاری محەممەد عەلی عەونیش پشتگوێ ناخات.

(٢) ئەمە ئەو بەشەی کتێبی (القضیة الكردیة)ی بلەچ شێرکۆیە کە مامۆستا لەوەپێشتر ئاماژەی دابوو بەگێڕینی بۆ کوردی.

(٣) ئاهەنگ: ئەم وشەیەی بەرامبەر (شێوەزمان، دیالێکت، لەهجە) بەکارهێناوە.

بۆ دەرخستنی ئەمە لێرەدا ئەوە دەنووسین کە خاوەنی جوگرافیای (مەلتەبروون) لە سەد ساڵ لەمەو پێشەوە لە بابەت پیتی (ایران و یران)ەوە وتوویەتی کە وەک لە ڕۆژهەڵاتدا بەناوبانگن هەروەها بەپیتی (ایریانە، آریانە)ش لەناو ڕۆژئاواییەکاندا بەناوبانگن، لەو بابەتەشەوە کە چەندان زوبان لەناو گەلی ئیرانی پێشکەوتووی کۆندا بەکارهێنراوە، دەڵێ: «پێشنیان جیاوازیان لەناو پیتی ئاریەکان و ئەسقوییەکاندا بەو ڕەنگە دەکرد کە لەناو پیتی -توران و ئیراندا- دەیانکرد.

کە لە کۆشکی (ئیستەخر)دا پیتی (ئاریانە)یان دۆزیوەتەوە کە هەر ناوی (ئاریان)ە کە یۆنانییەکان دەیانزانی، بەڵام یۆنانییەکان ئەم ناوەیان هەر بەسەر ڕۆژهەڵاتی ئێرانی ئێستەدا بڕیوە (خوراسان و ئەفغان) بەڵام (هیرۆدۆت)[1] ئەم ناوەی بەسەر ئەو وڵاتانەدا بڕیبوو کە لە ماوەی زێی سەند و دەجلە و فوراتدا، ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییدان، کە خەڵکی میدیاش ئاری بوون، بێگومان لەوانن.

کۆنترین زوبانی ئاریانە زوبانی زەند و پەهلەوین، بەڵام زوبانی (زەند)ی نووسراوەی ئایینە کۆنەکانی ئێرانی پێ نووسراوەتەوە کە پێی دەڵێن «زەند ئاویستا»، کە ئەم زوبانە هەرچی ژووررووی وڵاتی ئێران هەیە هەر لە ڕۆژئاوای بوخاراوە هەتا ئازەربایجان قسەیان پێ دەکرد.

ئەم زوبانە هێشتا لای ئاگرپەرستەکان پیرۆزە، کە لە زوبانی سەنسکرێتی دەچێ؛ ئەویش لای زانستە (زانا - آ.ب) هیندییەکان پیرۆز و نازدارە. ئەویشی کە پشتیوانی قسەکەمان دەکا ئەوەیە کە زۆر شێوە لە هەردوو زوبانەکەدا یەکن.هەرچی زوبانی پەهلەوییە، یاخود زوبانی پاڵەوانان و جەنگاوەرانە، وا دیارە لەناو عێراقی عەجەم و میدیای گەورەدا بەکارهێنراوە، دیسانەوە لە (وڵاتی فارس)دا بەکارهێنراوە. هەندێکیش دەڵێن کە ئەم زوبانە یەکە زوبانێک بووە کە لای پاشاکانی نەتەوەی (ڤیرۆس) بەکارهێنراوە.

دیسانەوە ئەمیش بەهێزی دراوسێتی و ڕۆژگارەوە گەلێ پیتی کلدانی و ئاسووری تێدایە، نووسراوەکانی ئاگرپەرستەکانیش هەر لە کۆنەوە لە زەندییەوە خراونەتە سەر پەهلەوی.

دیسانەوە بەم زوبانە گەلێ نووسراوەی هەڵکەندراو دەبینرێ کە لە دەمی ساسانییەکانەوە نووسراون، ئەمەش ئەوە دەبەخشێ کە ئەم زوبانە لەناو ئەو پادشایانەشدا بەکارهێنراوە. ئەوەندە هەیە لە ساڵی ٢١١م هەتا ساڵی ١٣٢م دەستیان کرد بەلادانی ئەم زوبانە (پەهلەوی) کە لەلایەن باووباپیریانەوە لەناو پێشکەوتن و بەرزبوونەوەدا ئەوەیان بەکار دەهێنا. ئەو حەلە ڕۆیشتنە ناو شاخەکانی (برسە)وە، بەفرمانی پاشایانی بەهێزی ئەو حەلە، زوبانی (فارسی)یان هەنگی لای فارسی (شیرازی ئێستەکی)یان بەسەر هەرچی وڵاتی ئێراندا بوو بڵاو کردەوە، بەڕاستی ئەم زوبانە لە پەهلەوی سووکترە، هەروەکو پەهلەویش لە زەندی سووکترە.

(١) هیرۆدۆت: Hērodotos (٤٨٤؟ - ٤٢٥؟ پ.ز) گەڕیدە و مێژوونووسێکی گریکی بە(باوکی مێژوو) ناسراوە، گەلێ جێگای بەناوبانگی سەردەمی خۆی گەڕاوە، لەوانە هاتۆتە عێراق و فینیقیا و میسر، (مێژوو)یەکی داناوە کە بەسەرچاوەیەکی گرانبەها و دەگمەنی لێکۆڵینەوە مێژووییەکان دەژمێررێ لە بواری دەنگ و هەواڵی میللەتانی کۆن و ئەفسانەکانیان.

حەلی عەرەب وڵاتی ئێرانیان داگیر کرد، حکومەتی فارسیشیان (لە پشتی حەوتەمینی پاش لەدایکبوونی عیسادا)[1] لەناوبرد، ئەم زوبانە نازکی و شیرینی گوم کرد. لە ساڵی ۹۷۷ی پاش عیسادا کە (دەیلەمییەکان) ویستیان یەکێ لەم زوبانانەی وڵاتی ئێرانە بژێیننەوە، کە پێشکەوتنێکی گەورەی بووبێ لە دەمی پێشوودا، نزیکترینیان پەسەند کرد کە زوبانی فارسی بوو، ئەوی کە لەمەوپێش باسمان کرد، بەڵاَ تەماشای کرد زۆر گۆڕینی بەسەردا هاتووە: لەبەر تێکەڵبوونی پیتی عەرەبی و زوبانانی دراوسێی تر.

بەڵام بوێژان و خاوەن قسەی جوان لەم زوبانە و لە زوبانەکانی تری ئێران وەکو زەندی و پەهلەوی (زوبانی کوردی کۆن) ئاهەنگێکی قسەی سووک دەنگ خۆش، مەبەست پێشاندەریان پێک هێنا کە ناونرا (زوبانی فارسی تازە). ئێستە ئەو زوبانە لە وڵاتی فارسدا قسەی پێ دەکرێ.

فارسی کۆنیش بەسایەی نووسراوەی (شانامەی فیردەوسی)ی ناودار و بەسایەی نووسراوەی ئاگرپەرستەکان کە ئاینیان تێدا نووسرابووەوە، لەناو گەورەی ئایینی ئاگرپەرستەکانیشدا مایەوە. (تەماشای وتەی پەنجا و پێنجەمی تەختیتی ئاسیا بکە کە لە گۆڤارەی جوغرافیای قەڵقەبرونی عەرەبیدایە، لاپەڕەی ۱۲۱).

لەم هەموو قسەیەوە بۆمان دەردەکەوێ کە کورد لە کۆنترین گەلی ئێرانن، ئەوەی پێشکەوتنێکی گەورەی لەبانی گەورەی ئێراندا هێنابووە بوون (وجود. آ.ب)؛ ئەوەی کە دەستی بەسەر ئەو وڵاتانەدا دەڕۆیشت کە لە شیوی سەندەوە (لە ڕۆژهەڵاتەوە) هەتا دەشتی دەجلە و فورات (لە ڕۆژئاواوە) درێژ بووبووەوە. زوبانە کوردییەکەش بەناوی زوبانی پەهلەوی یان پاڵەوانان و جەنگاوەران لەناو هەموو شار و دێهاتێکی ئەو ئیمپراتۆرە ئێرانییە گەورەدا قسەی پێ کرا؛ کە ئەوەبوو (ئەسکەندەری مەکدۆنی) لەناوی برد، پاش ئەوەش بەدەمێکی کەم حکومەتانی (ملوک التوائف - ملوک الطوائف. آ.ب) کە لە مێژووی فارسەکاندا بە(ئەشکانیان) بەناوبانگن هاتنە کۆڕەوە: کە هەمیشە لەسەر سەرداریتی ئێرانی گەورە هەتا دەمێکی دوور بەگژ یەکدا دەچوون. بەڵام پاشای زەوی (فارس) بەسەر هەموویاندا سەرکەوت، ئینجا ئیمپراتۆرێکی ئێرانی دووەمی دامەزراند، کە لەوە پاش بە(ساسانی) ناودەبرا. ئیتر لەو حەلەوە پیتی فارسی شان بەشانی پیتی (ئێران) دەڕۆیشت، ئیتر هەر کەسێ ئێرانی بوویایە (بووایە- آ.ب) سا هی کۆن یا تازە، (فارسی)یان پێ دەگوت؛ کە هەر ئەوە بووە بۆنەی ئەوەی ئیمپراتۆری گەورەی ئێرانی کۆنیش بەفارسی بدەنە قەڵەم، کە لە ڕاستیدا ئیمپراتۆرێکی کوردیی پەهلەوی بوو.

چونکی گەلی فارس لەگەڵ ئەوەشدا کە خاوەن حکومەت و دەست درێژ (دەستڕۆیشتوو - آ.ب) و پێشکەوتوو بوو لە مێژووی ئێراندا؛ گەلێکی تازە پێگەیشتوو لەچاو خوشکەکەیدا گەلی کورد کە لەپێش ئەودا لە ئێراندا حکومەتی دامەزراندووە... وڵاتی ئێرانی بەرز کردۆتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا گەلی لە بوێژ و نووسەر و زاناکانی (زاناکانی - آ.ب) کورد لە پاش ئیسلامەوە هەر چێکیان نووسیبێ لە بابەت زانین و فنونەوە بەزوبانی خۆیان نەیاننووسیوەتەوە؛ بەفارسی و بەعەرەبی، دوایی بەتورکی. بەڵام هێشتا

(۱) واتە لە (سەدەی حەوتی دوای لەدایکبوون)دا.

ژمارەیەکی کەمیان لێ نابینین (بەڵکو -لێ دەبینین- ا.ب) کە زەمانەکەی خۆیان لە بیر نەچۆتەوە، بەسایەی ژیری و زیرەکی و زانستی ئەوانەوە کۆمەڵێکی گەورە لە نووسراوانی کوردی لە بابەت هەموو جۆرە زانین و فنونێکەوە بۆ کورد ماوەتەوە. ئێمەش؛ لێرەدا هەر بەناوهێنانی هەندێ بەناوبانگی لەو پیاوە گەورانە وازدەهێنین، لە ترسی درێژکردنەوە، چونکو نووسینی ئەوە لەگەڵ تۆزێ لەوان لە کردەوە و ژیانیان نووسراوەیەکی سەربەخۆی دەوێ:

عەلی حەریری: لە ساڵی ١٠٠٩م لەدایک بووە، شارەکەی حەریری لە سنجاقی ئەربەلدایە. کۆمەڵە خۆشخوانییەکی ناوداری هەیە، خۆشخوانییەکانی زۆرن، یەجگار جوانن، هەر لە شارەکەی مردووە، لەوێشدا نێژراوە، گۆڕەکەی بەناوبانگە، خەڵک دەچنە سەری.

مەلای جزیری: ناوی شێخ ئەحمەد، بەڵام بەو ناوەی تریەوە ناودارە، خەڵکی (بۆتان)ە، قەسیدەی زۆری هەیە، یەجگار ڕەنگین، باس لە: حەزلێکردن، لە خوا، لە سۆفێتی دەکەن. کۆمەڵە خۆشخوانییەکی (دیوان) زۆر نازداری هەیە لای کوردەکان، لە ساڵی ١١٦٠م دا لە جزیرەی بۆتان مردووە. گۆڕی لەوێیە، خەڵک دەچنە کنی.

فەقێ تەیران: ناوی مەحموودە، خەڵکی شاری مەکسە، لە ساڵی ١٣٠٢م لەدایک بووە، دوو هەڵبەستراوەی گەورەی هەیە:

(شێخ سەنانی)[1] و (چیرۆکی برسیا)، هەڵبەستراوەیەکی بەناوبانگیشی هەیە پێی دەڵێن (ئەسپی ڕەش - ئەسپی پێغەمبەر - بوراق). ئەم هەڵبەستراوەیەی زۆر لەم دەست و لەو دەستدایە. دیسانەوە نووسراوەیەکی هەڵبەستراویشی هەیە ناوی (م. ه)یە باسی لە (تەسەوف و یەکیەتی خوا دەکا) (التصوف ووحدة الوجود- أ.ب). لە ساڵی ١٣٧٦م لە شاری مەکس مردووە و نێژراوە.

مەلای باتێ: مەلا ئەحمەدە کە بەباتێ بەناوبانگە؛ چونکی خەڵکی دێی باتەیە کە لە دێهاتی حەکارییە، لە ساڵی ١٤١٧م لەدایک بووە، هەڵبەستراوەیەکی گەورەی لە بابەت لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە هەیە، کۆمەڵە خۆشخوانییەکیشی هەیە هەمیشە لەناو دەستداندایە. لە ساڵی ١٤٩٢م دا مردووە.

ئەحمەدی خانی: زانستی (زانای - ا.ب) گەورە، بوێژی دڵ سووتاوی بەناوبانگ، لە تیرەی (خانیان)ە، خاوەنی کۆمەڵە خۆشخوانی (مەم و زین)ی ناودارە؛ کە خۆشخوانییەکی چیرۆک ئاسایە، هاوتای نییە لە تەرحی خۆی، (ئەلیادەی هۆمیرۆس) نەبێ. نووسراوەیەکی تری لە زوبانی کوردی و عەرەبیدا هەیە، پێی دەڵێن «نەوبەهار»[2] دیسانەوە گەلێ هەڵبەستراوەی تری لە عەرەبی و تورکیدا هەیە، ئارەزوویێکی بێ شوماری بەکاری ڕەنگینەوە (فنونی جەمیلە) هەبوو. لە ساڵی ١٦٥٢م دا ئەسپەردەی گڵ بوو، لە تەنیشت ئەو مزگەوتەی خۆی دروستی کرد نێژرا.

(١) واتە: شێخی سەنعان یا شێخ سەنعان.

(٢) دیارە مەبەستی (نەوبارا بچویکان)ە کە قامووسێکی بچووکی بەشیعر داناوە بۆ منداڵان تا فێری عەرەبیان بکات.

ئیسماعیل: خەڵکی بایەزیدە، لە ساڵی ١٦٥٤م لەدایک بووە... ئەویش دیسانەوە لە بوێژە حەزلێکەر (غەزەلی) و چیرۆک ڕێکخەرەکان بووە، چاوی لە (شێخ ئەحمەدی خانی) هۆمیرۆسی کورد و فیردەوسی فارس کردووە، دەلیا (قاموس)ێکی بچووکیشی لە زوبانانی کوردی و فارسی و عەرەبیدا ڕێکخستووە، ناوی ناوە (گولعوزار). (قەسیدان)ی ڕەنگین، خۆشخوانیانی شیرینی زۆری هەیە کە بەزاری کرمانجی وتوویەتی، لە ساڵی ١٧٠٩م دا مردووە. گۆڕەکەی لە بایەزید ناودارە.

شەریف خان: ئەمیش ئەمیر شەریف خانە، لە سەردارانی حەکاری، لە ساڵی ١٦٨٩م دا لە شاری (جۆڵەمێرگ)دا -ناوچەی حەکاری- لەدایک بووە، کردەوەی (آثار)یەکی زۆری لە نووسین و لە بێژیندا هەیە، کۆمەڵە خۆشخانییەکی بەجگار باشیشی هەیە، دەستێکی درێژیشی لە هەڵبەستنی خۆشخوانی فارسیدا هەبووە. لە ساڵی ١٧٤٨م دا لە جۆڵەمێرگ مردووە. هەر لەوێشدا نێژراوە.

مورادخان: جێی بایەزیدە، لە ساڵی ١٧٣٧م دا تیا لەدایک بووە، گەلێ دانراوی هەیە. خۆشخوانییەکی جوانیشی لە بابەت حەزلێکردن و تەسەوفەوە هەیە، ساڵی ١٧٨٤م مردووە.

عەلی تەرموکی: لە زانستە (زانا -أ.ب) گەورەکان و مامۆستا پایەدارەکانی کوردستان بووە. لە ساڵی ١٠٠٠هـ دا لە دێیەکەی خۆیدا کە لە ماوەی (ئێوان - أ.ب) حەکاری و مەکس دایە، لەدایک بووە. دەستێکی درێژی لە زانین و فنوندا، بەتایبەتی کاری ڕەنگین (فنونی جمیلە)دا بووە. زۆر حەزی بەپێخوێندن کردووە، (دەستووری زوبانی کوردی)، ئەو دایناوە، گەلێ گەشتوگوزاری لەناو شارە دراوسێیەکاندا کردووە، گەلێ شتی بەکەڵکی تیا نووسیوە، گۆڕەکەی هەر لە دێیەکەی خۆیدایە[1].

مەلا یونسی هەلکاتین: خاوەنی سێ نامە (رسائل)ی کوردی بەناوبانگە لە کوردستاندا؛ کە بۆ فێربوونی زوبانی عەرەبی دایناون: ئەوانیش: (دەستوور، زروف - ظروف، تەرکیب)ن. گۆڕەکەیشی هەر لە دێی هەلکاتینە کە تێیدا لە دایک بووە.

## جەژنی قوربان ١٩٣١/٤/١٩

جەژن هات، خەڵک هەموو دڵخۆش!... داروبەرد زەردەخەنە دەکات، خونچە دەپشکوێ، بولبول لە خۆشیدا دەچریکێنێ... جەژن هات، هەموو کەس خەریکی کڕینی ترۆتفاقی تازەیە!... منداڵان زەرد و سوور بەناو شەقامدا دەسووڕێنەوە... ئوتۆمبیل و ڕەوان، چەرخوفەلەک و ماین چەقەڵ بۆ منداڵانی خەڵک

(١) ئێستا ئەوەی دەربارەی ئەم (عەلی تەرموکی)یە بوترێ ئەوەیە کە ڕاستییەکەی (عەلی تەرەماخی)یە. (بڕوانە: ڕەشید فندی، بۆچی عەلی تەرەماخی ئیکەمین ڕێزمان نڤیسێ کورد نەبێت؟، ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١٠٣-١٠٤ ساڵی ١٩٨٤، ل٢٣٦) (تەرەماخ: گوندەکە دکەڤیتە کوردستانا تورکیا ل ناڤ بەینا -هەکاری مەکس). هەروەها: (... ڕاستی عەلی تەرەماخی ١٠٠٠ک-؟ بەسەردتایەک مرکم دست بەڕێزمانا کوردی کریە، هەرچەندە مەخسەد و مەبەستا وی نەبوویە ڕێزمانا کوردی شروڤەکەت، بەڵێ نەچار بویە جارجارا گەل ریزمانا فارسی هندەک سەرقەلەمێت تێژوبها ل ریزمانا کوردی ژێ بدەت). بڕوانە: حجی جعفر، بەڵێ عەلی تەرەماخی یەکەمین ریزمان نڤیسێ کوردە. ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١٠٦، ١٩٨٥، ل ١٠٥.

ئەواجێژن هات بە بەزمو خۆشی
عالەم شـــرابی سروری نوشـی
کوردی دڵ سوتاو لەم ڕۆژە یادی
شەهیدی کرد وماتەمی پۆشـــی

عبدالله سامی

وێنەی کارتەکەی عەبدوڵلا سامی



جەژنانە پیرۆزبێ

ماڵ‌ئەزەیە ڕۆژی دڵخۆشی • وتو چارە بەرگی ڕەش پۆشی
گەر لەت لەت کری جیگ ڕامەوی • هـــەتانەبێ جەژنی بەرلیش

کەوتوونە کار... خەڵک هەموو پۆل پۆل بەجلی جوان و ڕووی خۆشەوە بەناو باغدا هاتوچۆ دەکەن... بەدەستە کوڕان بەگۆرانی لەناو گەمێدا ئەمسەر و ئەوسەر دەکەن... سینەما و تیاترۆ و لاسایی کردنەوە، کام چیرۆکی خۆش هەیە ئەوە پیشان دەدەن... نوقوڵ لە هەموو ماڵێکدا بۆ میوان لەسەر سینی دانراوە... خەڵک بەڕوویەکی خۆش: چاوێکی گەش، دەم بەپێکەنینەوە بۆ پیرۆزبایی یەکتر دێن، نوقوڵ دەخۆن... پێدەکەنن گفتوگۆ لە خۆشی دەکەن هەموو شادمان، بەکەیف و پێکەنین.

هەر کوردی جەرگ سووتاو نەبێ لە بریتی باغ کوشتارخانەی هەژارانی خۆی دەبینێ، لە باتی بۆنی گوڵ بۆنی خوێنی ڕژاوی خۆی بۆن دەکا، لە جیاتی چەرخوفەلەک قەنارە و سێدارە بۆ جەرگەکانی بەدی دەکا، لەجێتی مۆزیقە و گۆرانی، دەنگی بولبول، نالەی دایکی کوڕکوژراوان: دەنگی شیوەنی براکوژراوان دەبێتی... لە جێگای زەماوەند و شایی قاقای پێکەنین، شین و قوڕپێوان، نۆف و هەناسەی سارد هەڵدەکێشن... لە شوێنی جلی سەوز و سوور، تارای ناڵ و واڵا بەرگی تاریکی دەپۆشن.

کورد وا ڕادەبوێرێ... جەژنی چی؟!، کەس کوژراوان، هەناسە سارد، پیاوانی تر ڕەنجەڕۆ، هەموو شینیانە. لە بریتی ناردنی کارتی جەژنە پیرۆزە کارتی سەرخۆشی کردن بۆ یەک دەنێرن.

جەژنی چی؟!

قوتابی لەباتی باسی خۆشی پاشەڕۆژ، لە جیاتی ئەوەی باسی سەربەرزی کوردستان، پێشکەوتنی کورد، ئاوەدانی وڵات... باسی قوڕبەسەری کورد، وێرانی کوردستان و داگیرکردنی دەکەن... هەموو مات و زویر، هەموو هاتوچۆی یەکتر دەکەن: بۆ بینینی یەکتر بەڵام بۆ کەیف و زەماوەند نا بۆ شین.

جەژنی چی؟!

کارتی یەکەمم لەلایەن (موستەفا سائیب)ەوە (وەکو بۆە دەرکەوت) بۆمان هات (بۆ هات - ا.ب)، ئێمەش بەهەموو قوتابییەکانمان گەیاند کە کەس کارت نەنێرێ.. هەموو نەمانناردو، هەتاکو بۆ باوکیشمان.

بەڵام لە سلێمانی و جێگایانی ترەوە دوو تەرح کارت هاتبوون.

بەڕاستی شایانی پەسندی بوون. چونکو گیانی وڵاتپەروەری لێ هەڵدەقوڵێ.

## هەواڵی شێخ مەحموود (٢٧ی نیسانی ١٩٣١)

لە پاش ئەو هەرا گەورەیەی دوایی[1]، شێخ مەحموود بەخۆی و سوارەکانیەوە چووبوونەوە بۆ شاربازێڕ، لەوێوە چووبوونەوە بۆ شوێنەکەی کۆنی سەر سنووری ئێران، لەبەر هاتنی جەژنی قوربان، لێرە وەکو هەموو جارێ دەیڵێن، ڕۆژنامەکانی بەغدا نووسیویانە گوایا گەلێ لە سوارەکانی تفەنگیان داوەتە دەست حکوومەت، خۆشی وازی لە شەڕ هێناوە؛ پاڕاوەتەوە لە حکوومەت چاوی لێ پۆشی، ئیتر بەقسە وایان لەپیاو کردبوو بڵێ: بۆ دوو ڕۆژی تر شێخ مەحموود بەپێوەندکراوی دێننەوە بەغدا[2]! بەڵام لە هەرچی کەسێکی ترم دەپرسی کە لە سلێمانییەوە دەهاتن، کە ئەوێ سەرچاوەی کارەکەیە بەئاوەڕووی ئەمە قسەیان دەکرد، هەموو قسەکەی سەرەوەیان دەوتەوە.

## بەقی و شێخ ڕەئووف: دوو قوتابی کوردی سلێمانی

بەبۆنەی چوونەکەی شێخ مەحموودەوە لە کاتی هەراکەدا حکوومەت گرتبوونی، لە پاش سێ مانگ لە بەندیخانەدا ڕابواردن بردیانە کەرکووک، لەوێ پرسیشیان لێ کردن، دوایی ڕزگاریان بوو. بەڵام ئەوە خۆشە کە هاتبوونەوە قوتابییەکانی سلێمانی بەدزی قوتابخانەوە بەئوتۆمبێل، زۆر کەسیان هەتا سلێمانی[3] بەپیری برا کوردەکانیانەوە چووبوون. هەر بژی کورد پەرست!!

(١) مەبەستی لە شەڕی ئاوباریکە کە لە ١٨ی نیساندا بەرپابوو.

(٢) دیارە ئەوەش بەشێک بووە لەو هێرشە ڕاگەیاندنەی کە حکوومەت دژی بزووتنەوەکەی شێخ مەحموود لەو ڕۆژانەدا پەیدای کردووە.

(٣) خۆی ڕاستتر وا بوو بیوتبا «... هەتا دەرەوەی سولەیمانی...» چونکە دیلە بەردراوەکان لە کەرکووکەوە هاتوونەوە. وا دیارە هەڵەیەک لە نووسینەوەی دەستووسەکە دایە.

## گرتنی تەوفیق وەهبی ١٩٣١/٥/٧

لەوەپێش وتمان کە تەوفیق وەهبی[١] چوو بۆ شام، بەڵام دەزانی بۆچی چوو؟؛ ئەم پیاوە بەدەستی ئینگلیزەکان و کۆمەڵە نهێنییەکە نێرابووە ئەوێ لەگەڵ یەکێ لە سەردارەکانی ئەرمەنی قسە بکا بۆ دانیشاندنی (دامەزراندنی - أ.ب) کۆمەڵێکی گەورەی ئەرمەنی -ئاسووری لە خاکی پاکی وڵاتەکەی تەوفیق وەهبی و هاورێکانیدا. بەڵام لە سایەی خواوە هەموو شتێکیان لە ڕۆژنامەکانی بەغدا دەرخرا: جیاووک بەوتەیەکی گەورە ئابڕووی بردن (لەگەڵ ئەوەشدا هاورێی هەموویان بوو)؛ وتبووی: «ئەی ئەو گەلەی (کورد) بەخۆیێ سپاردنتانەوە دەنازم وەخۆم بەگەورە دەزانم؛ بۆ ئیمرۆمان وا چاکە لەگەڵ عەرەبدا -گەلێک کە لە هەموو شتێکدا لەیەکەوە نێزیکین- رێکەوین، چونکو لێرەدا هەر ئەوانن ئەم بەڵا گەورەیەمان شان بەشانی خۆمان لەکۆڵ بخەن و لەدەست داوی ئینگلیز ڕزگارمان بکەن»[٢].

## مارف جیاووک ١٩٣١/٥/٧

مارف جیاووک کوردێکی مەرد و ئەبەرد و ئازایە[٣]، لە کوردەکانی شاری (هەولێر)ە، ئەمە چەند

(١) تەوفیق وەهبی: (١٨٨٦-١٩٨٤) کەسایەتییەکی بواری سەربازی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دەگمەنی کورد بوو، خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی (موسوعی) فراوان بوو، خەڵکی سلێمانی بوو، بەدڵ حەزی بەبەرزی نەتەوەکەی دەکرد، لەو لاوە کوردە ڕۆشنبیرانە بوو کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانەوە لە ڕیزی وریابوونەوەی بیری نەتەوەیی کورددا کاریان دەکرد بۆیە لە ڕووی زمانەوانی و زیندووکردنەوەی مێژووی کورد و هاندانی پەخش و بڵاوکردنەوەی چاپەمەنییەوە تا کۆتایی ژیانی دریخی نەکرد، لەو بڕوایەدا بوو کە بەخەباتی سیاسی و وشیارکردنەوە کورد شتێ بەشتێ دەکات، لاپەڕەکانی گەلاوێژ و دەنگی گێتی تازە و گەلێکی تر پڕن لە وتاری ئەو، جگە لە کتێب و نامیلکەی زۆر دەربارەی زمان و بنچینەی شار و ناوچە کوردییەکان، شارەزاییەکی باشی لە زمانەکانی عەرەبی و تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی و فارسیدا هەبووە، لە ١٩٣٠ کراوەتە موتەسەریفی سلێمانی، لە ١٩٣٥ یەکێک بووە لەو ٣١ کەسەی لە بەغدا (یانەی قەڵەم - نادی القلم)یان دامەزراند، لە ١٩٤٧ یەکە کوردێک بوو لە (المجمع العراقي) کە بووە ئەندام، پلەی وەزارەتی پێ درا، لە دوای ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ بەیەکجاری چووە بەریتانیا و لە لەندەن تا مردن نیشتەجێ بوو، کە مردیش لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەکەی لە چیای پیرەمەگروونی نێزیک سلێمانییەوە سپێردرا.

(٢) لێرەدا ئەو ئاراستە جیاجیانەی دڵسۆزان و ڕۆشنفکرانی کورد چەمکێکی بەدیار دەکەوێ، وەک دەڵێن «هەموو ڕێگاکان بۆ بانە دەچن». لێرەشدا مەبەستی هەمووان پاک و تێکۆشان و تەقەللایان پیرۆز و بەرزبووە، ئەوەندە هەیە هەر دەستەیە و بەڕووکارێکدا چووە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە پیرۆزە: ئامانجی سەربەخۆیی و ڕزگاری نەتەوەکەیان، بۆیە ئەو دەستە تێکۆشەرانە پەنایان بۆ هەر لایە بردووە کە ترووسکاییە هیوایان تێدا بەدی کردبێ.

(٣) ئەم باسە لە دەستنووسەکەیدا نەبوو، زۆریش بۆی گەڕام بەڵام بێ سوود، لە نامیلکەی (خەباتی ڕۆشنبیراندا) هەیە، لەبەر بایەخی مێژوویی ئەوا بەپێی بەرواری نووسینەکە لێرەدا دایدەنێین.

ساڵێکە دەبینم شێرانە خەبات دەکات بۆ گەلک و چاکەی نەتەوەکەمان؛ جیاووک ئازا و سەربەستە. کە قسەی ڕاست هاتە پێشەوە و بەباشی زانی بیکات، بۆ گەلک و چاکەی کورد، لە بەردەمی هەر کاربەدەست و دەسەڵاتدارێکی میریدابێ دەیکات، بێ باکە سڵ لە کەس ناکات. وتارە بەناوبانگەکانی لە ڕۆژنامەکانی عێراقدا و لە (کۆڕی نەتەوە- مجلس الأمة)ی عێراقدا و نووسراوەکانی کە بۆ لەسەرکردنەوەی نەتەوەی کورد و پاراستنی مافی کورد و سەندنەوەی مافی کورد بڵاوی کردوونەتەوە و خوێندوونیەتەوە، چاکترین بەڵگەن بۆ ڕاستی قسەکەم. لە ڕۆژی ١٩٣١/٥/٧دا وتارێکیم لە ڕۆژنامەیەکی عەرەبیدا کە لە بەغدا دەردەچێ خوێندەوە. (جیاووک) بەئازایی و سەربەستییەکی تەواوەوە بیروباوەڕی زرنگکارانەی خۆی دەردەبڕێ بۆ چارەسەرکردنی (کێشەی کورد و کوردستان).

وا لە خوارەوە چەند دێرێک لەو وتارە دەگێڕمە سەر زمانی کوردی:[1]

«ئەی نەتەوەی کورد! ئەی ئەو گەلەی کە خۆم بەیەکێک دەزانم لە ئێوە و سەربەرزیشم بەرز بۆتەوە بەوەی کە یەکێکم لە ئێوە! بۆ ئێمرۆمان وا چاکترە کە لەگەڵ گەلی عەرەبیدا ڕێک بکەوین؛ چونکە ئەوان لە هەموو شتێکدا لە ئێمەوە نزیکن. بێجگە لەوە هەر ئەوانیشن کە بتوانن شانبەشانی خۆمان ئەم سەرگەردانی و ماڵوێرانییەمان لە کۆڵ بکەنەوە و لە دەست فرۆفێڵ و تەڵەکەبازی و داوی ئینگلیز، بۆ گەلکی خۆیان و ئێمەیش، ڕزگارمان بکەن!...» جیاووک کەسایەتییەکی بەهێز و هەڕەتی هەیە چ لەناو کوردەواریدا، چ لەناو برا عەرەبە ڕۆشنبیرەکانماندا. لەم وتارەیدا وا دیارە گەلێک دۆستی گەورەی پەیدا کردووە بۆ (نەتەوەکەمان) لەناو ڕۆشنبیرانی عەرەبدا، کە پێکەوە پشتی مافە ڕەواکانی (کورد) و (عەرەب) بگرن و بۆ سەندنەوویان خەبات بکەن.

## شێخ مەحموود

هەڕەشە: وەنەبێ شێخ مەحموود هەر عەرەب یان ئینگلیز دوژمنی بن، ئێرانیش و تورکیش بۆ گەلکی خۆیان لەگەڵ ئەماندا بۆ نەهێشتنی شێخ کۆشش دەکەن. ئەوە ئێرانیش و ئەوە تورکیش، هەردووکیان هەڕەشە نامەیان ناردە عێراق؛ کە یان ئێوە یەکی شێخ دەخەن یاخود ئێمە کە هەموو تروتفاقێکی جەنگمان ئامادە کردووە، دەدەین بەسەریا تا لە ناوی دەبەین، دەبێ بشزانن گۆڕی شەڕ عێراق نەبێ هیچ کوێیەکی تر نابێ... هتد. ئیتر شێخ مەحموود لە پاش شکاندنی لەم هەرایەی دواییەیدا -گۆیا وەکو عەرەب دەڵێن-وە لە پاش ئەوەی کە زانی ئێرانیش لەشکری کردۆتەسەر[2]، هەر لەو کاتەیشا، مەحموود

(١) بەمەزندەی ئێمە ئەو وتارەی مامۆستا کردوویەتی بەکوردی بەشێکە لەو وتارەی کە لە باسی پێشووترا، لە (گرتنی تەوفیق وەهبی)دا ئیشارەی پێ دابوو.

(٢) ئەمەش نسکۆیەکی ترە کە لەو سەردەمەدا ئابڵوقەی ئەو ڕاپەڕینە چەکدارییەی کورد دەداتەوە، پلانە گڵاوەکانی نێو دەوڵەتی، بەتایبەتی عێراق و ئێران و تورکیا بەموبارەکبایی ئینگلیز، لەوانەیە بەرەنگرێتیشی بووبن، تا بەهەموان دەست بنێنە بینی ئەو جووڵانەوە چەکدارییەی بەهێزی سەربازی عێراق نەیتوانی بیفەوتێنێ. ئەمەش دەقا و دەق وەک ئەو بار و زرووفەی لە ١٩٢٧دا خولقاندیان تا شۆڕشەکەی شێخ هەر =

و حامید[1]، سەرکۆمارەکانی، بەجێیان هێشتووە، جگە لەمانەش لەبەر هەڕەشەی عێراق کە دەبێ لە ١٤ی مانگدا وازبێنن... لەبەر ئەمانە ناچار لەپاش بەستنی پەیمانێک لەگەڵ وەزیری ناوەوە (مەزاحیم بەگ) وە لەگەڵ هاورێکانی موتەسەریفی سلێمانی (ئەحمەد بەگ)، کەپتان گاورن، کەپتان هۆلت و چەند کەسێکی تر لە پیاوانی حکومەت، خۆی دا بەدەست حکومەتەوە لە ١٩٣١/٥/١٤ لە دێی پێنجوێندا!...

## هەینی ١٩٣١/٥/١٦

شێخ خۆی بەدەستەوە دا، بەڵام لەمەیدا وڵاتپەروەرییەکەی دەردەکەوێ، پیاو هەر ئەوە نییە خۆی بەقوربانی بکا. بەو چەشنەی شێخ مەحموود خۆی داوە بەدەستەوە و هێناویانەتە سلێمانی بڕوا بکە هەر کەسێ تۆزقاڵێ خۆشەویستی وڵاتی لە دڵابێ جەرگی بۆی ئەبێ بەکەباب!...

لە پاش ڕێککەوتن، خۆی دەدا بەدەستەوە، بەڵام پێیان دەڵێ: «تکاتان لێ دەکەم لەناو عەسکەری عەرەبدا مەمنێرنەوە سلێمانی!». بەڵام ئەوان دڵی دەشکێنن دەیخەنە ناوخۆیانەوە وەکو بەزۆری خۆیان گرتبێتیان بەگۆرانی وتن و مۆزیقە لێدان بەرەو سلێمانی دەبەن. شێخ مەحموود کە خۆی لەناو ئەوانەدا بەو تەرحە دەبینێ، پرمۆهوڕ دەست دەکا بەگریان، وەک چۆراوگەی ئاو فرمێسک بەچاویا دێتە خوارەوە، بەدڵێکی شکاو و لەشێکی برستبڕاوەوە وڵاتە نازدارەکەی بەبێ باوکی بەجێ دەهێڵێ.

لەوەپێش پێدەکەنی چونکی دەیزانی بەختیاری کوردستان بۆ ئەو ڕۆژە لە گرتنی ئەو دابوو، وەک شێر بێ باکانە هاتە ناو دوشمن، بەڵام ئێستاش وا بەسەرهات کە بەسەری هات. قەد مەپرسە چەند هەزار کورد لە ڕێیدا دەستیان ماچ کردووە، چەند خەڵکی سولەیمانی بەپیریەوە چوون و بەخوایان سپاردووە...

شێخ مەحموود لە ماڵی موتەسەریف میوان کرا. بۆ سبەینێ بەفڕۆک لەگەڵ دوو پیاویدا فڕین و لە هنێدی[2] دابەزین، لەوێ لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی حکومەتدا یەکتریان دیبوو... ئیتر هەر ئەو ڕۆژە بوو شێخ لە (نوور) بینرا[3]. بڕوا بکە ئەوەندەی لەناو کورددا شێخ گەورەیە، دوو هێندە لەناو عەرەبدا

= لەو ناوچەیەدا خەفەکەن، ئەو ساکەش شێخی ئەمر لەو وتارەیدا کە دوای ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی پێنجوین ١٩٢٧/٦/١٥ بۆ جەنگاوەرەکانی دا و تیایدا لۆمەی دەوڵەتانی چواردەور و دۆستە ساختەکانی ناوخۆی کرد کە دەوریان چۆڵ کرد، دیارە مێژوو ئەم تراژیدیایەی زۆر کەرەت لە ڕێڕەوی خەباتی ئازادیخوازی کورددا دووبارە کردۆتەوە، ڕێککەوتننامەی جەزائیری ١٩٧٥ هەڵقەیەکی تری ئەمەبوو کە نسکۆکەی شۆڕشی ئەیلوولی لێ کەوتەوە.

(١) مەبەست لەو دوو ئەفسەرەیە کە بەر لەم بەروارە خۆیان تەسلیم بەحکوومەت کردەوە: مەحموود جەودەت و حامید جەودەتی برای.

(٢) فڕۆکەخانەی ئەوسای بەغدا لەوێ بوو.

(٣) هەر لەم بۆنەیەدا (ملاحظ المطبوعات) لە بەغدا ڕۆژی ١٩٣١/٥/١٥ ئەم وتەیەی بڵاوکردەوە: (على أثر إستسلام الشيخ.. سلم الشيخ محمود نفسه الى الحكومة حسب الشروط التي أمليت عليه، والآن في طريقه الى محل إقامته التي ستعينه له الحكومة وسيكون هذا المحل على ضفاف الفرات على الأرجح. بغداد. ملاحظ المطبوعات. ١٩٣١/٥/١٥

(بەشی نەخوێندەوار) بەناوی ئیسلامێتییەوە خۆشەویست و نازدارە. چەند جارم بیستووە، کە دەچووم بۆ پردی مۆد، دەمبینی لەلای وێنەیەکی گەورەی شێخ مەحمود کە هەڵواسرابوو، کۆبوونەوە، هەزار (فەیەڵ) و پیاوەکانی خۆیان و ئینگلیزیان بەقوربانی کردووە، هەزار نزایان بۆ کردووە.

## کۆمەڵی یاریدەدەر ۱۹۳۱/٥/۱۸

لە هەولێر قوتابییە کوردپەروەرەکان کۆمەڵێکیان دامەزراندووە ناویان ناوە (کۆمەڵی یاریدەدەری کورد)، کۆمەڵێکە لە کورە ئاغا بەدەستەکانی هەولێر دروست بووە. مەبەسی بڵاوکردنەوەی کوردایەتییە، پێشخستنی زمانی کوردییە. وە وەکو بیستوومە هەندێ هەرەشە و نومایشاتیشی هەیە، مەبەستم ئەوەیە ئەگەر بۆیان دەست بدا دەست لە سیاسەتیشەوە دەدەن...! چاکی ئەم رەنجەش لە سایەی (رەفیق حیلمی ئەفەندی) مامۆستای هەولێرەوەیە لە خەڵکی سلێمانی، ئەمیش چەند رۆژێک لە بەندیخانەدا لە سلێمانی رایبوارد. سەرداری کۆمەڵەکە (جەلال نووری)یە، ئەمیش ئەوەی سەیرە ساڵی لەمەوپێش تورکخواه بوو، بەڵام (کورد هەر چۆنێ بێ هەر کوردە). وتەیەکی ناردبووە بەغدا، بەسایەی هاورێیەکەوە (برایم فەتاح) خوێندمەوە. بۆ تەواوی گیانی کوردایەتی لێ هەڵدەوەری. بەراستی ئەم کۆمەڵە لە شوێنێکی وەک هەولێردا شتێک بوو سەری لێ سوڕدەما. بەڵام وەکو وتم کاری مامۆستا کوردپەروەرەکانە لە مێشکیاندا جێگیر بووە.

## بەسایەی جوولانەوە گرفتم نەما ۱۹۳۱/٥/۲٥

لە شوێنێکی تری ئەم یادنامەیەدا باسی ئەمەم کرد، کە چەند مانگێک دەبێ نووسیومە بۆ (معهد التربیة البدنیة) لە میسر کە گرفتم هەیە بەسایەی جوولانەوە چارێکم بکەن. لە پێشەوە کە هات[1] چونکی لە هی قوتابخانەی دەکرد گاڵتەم پێ دەهات، لەبەر ئەوە بەکارهێنانی دەرمانم بەپێویست دەزانی... بەڵام ئەوە سەیر بوو لە پاش تەواوبوونی یارییەکان کە سێ مانگی پێ چوو، خۆم خۆم بەدرێخستەوە، وام لێ هات بەبێ داوودەرمان هەر رۆژە سێ ژەمم بەنارەزوویەکی بێ ئەندازەوە نان دەخوارد... لەوە سەیرتر ئەوەبوو خوو و کردەوەشم هەندێکی گۆڕا! لەوەپێش تەمەڵ، هەر کارێکی بچووکم بهاتایە پێش بەبارێکی گرانم دەزانی، ناوی یاریکردنت بهێنایە لام لەشم دادەگیرسا، کە تێدەکۆشام سەرم ژانی دەکرد، کە دەرۆیشتم هێواش، بێهۆش ناگام لەلایەکی کە بوو، هەمیشە مێشکم پڕی بوو لە بیری پیس و ناخۆش، لە هەر قسەیە رەخنەیەکم لێ دەردەهێنا، لە هەر شتە دڵگیرییەکم دەگرتە خۆم. بەکورتی بیبڕمەوە، گرتنی هاورێیەکم لەو قوتابخانە گەورەیەدا بەشتێکی گران دەزانی، هەتا ئەوساش

(۱) ئەو پەیمانگەی پەروەردەی لەشە لە میسر، بەهۆی نامە ناردنەوە رێنماییەکانی خۆی بەپۆستەدا دەنارد بۆ ئەوانەی بەشداریان دەکرد، جا مەبەستی مامۆستاش ئەمەیە کە: (لە سەرەتادا کە رێنماییەکانیانم بۆ هاتە..)...هەروا: (الریاضة البدنیة، مجلة صحیة تصدر لخدمة الجنس البشري، صاحبها ومحررها: محمد فائق الجوهري المحامي، الأدارة: ٦ شارع سکاکین باشا، مصر، القاهرة).

دوو قسم لەگەڵ یەکێکیان بەناوی هاودەمییەوە نەکردووە. چوار ساڵە لەوێ بووم (لەوێم -ا.ب) لەبەر دڵتەنگیم نەمدەپەرژا هاوڕێکانم لە دوان تێپەڕکەم... ئەمانەش، هەموو لە سایەی گرفتەوە!!... لە سایەی بەغداشەوە!، بەڵام ئێستا کە دوای سێ مانگەکەیە؛ بەرەو پیری هەموو ئەرکێکی شان، بەرەو ڕووی هەموو کەسێک بەڕوویەکی خۆشەوە دەچمە پێشەوە، خەفەتم لاپەشمە، هیچ دەرد و ئازارێکم نەماوە!...

بۆ هەموو شتێک بەڕوویەکی خۆشەوە مل دەنێم، واش کە سەرکەوتنم بەتەواوی بەبوونی خوا و پێغەمبەر دەزانم کە چەند ڕاستن.. گەرانم، کۆششم، خۆشەویستم (خۆشەویستیم- ا.ب) بەرامبەر بەخۆم، بەخەڵک، بەدنیا هەتابێ لە زۆرییە. ئێستا سێ ژەمە هەموو ڕۆژێ نان، بەئارەزوویەکی بێ ئەندازەوە دەخۆم، هەموو شتێ کە ناوی خواردن (خواردنە) بەشێوەیەکی جوان دەسازێنم، بەکەڵکی دەهێنم... سا بۆیە هەتا دێت خەڵک بەچاوێکی گەورە تەماشام دەکا (دەکەن -ا.ب)، حەز بەهاودەمیم دەکات (دەکەن)، کە هەر لەبەر ئەوەیە ئەمساڵ بەدەیان قوتابیم بووە بەهاوڕێ، هەموو کەسم خۆشدەوێ، هەموو کەسێکیش خۆشی (خۆشیان) دەوێم... بەڵام ئاخ کەم کورد هەیە کەڵکی ئەم تەرحە بزووتنە بزانن، کەمیان هەیە بزانن کە بەبێ داوودەرمان، هەر بەو جۆرە ڕێیەی کە خوا بۆی داناوین دەتوانین بژین، یان خۆمان بژێنینەوە، ئینجا ماڵ و منداڵیشمان بەو تەرحە لە خۆشیدا بژین.

## وردە هەواڵ

شێخ مەحموود: ١٩٣١/٥/٢٥

جێگا بۆ شێخ لە مونتەفیک چاک کراوە[1]، لەوێ وەکو دەگێڕنەوە لە خۆشییەکی تەواو ڕادەبوێرێ، سەرداره عەرەبەکانیش زۆر دەچنە لای وە زۆر بەگەورەی دەگرن. هەر لە سایەی شێخ مەحموودەوە: هەرچی لەگەڵیدا شەڕیان بەرامبەر عێراق کردووە چاویان لێ پۆشرا (چەند کەسێک نەبێ). شێخ قادری برای شێخیش بۆ چوونەوە سلێمانی بەرەڵا کرا، ئەو شەوە هەرچی گەورە و بچووکی کوردی بەغدا هەیە هەتاکو (فائیقی تاپۆ) هاتنە سەر هەواری شەمەندەفەرەکە، ڕەوانەیان کرد، (حەمەخان)[2]یشیان لەگەڵ بوو.

کوردستانی ژووروو: ١٩٣١/٥/٢٥

هەر ئەمڕۆ لە ڕۆژنامەی (الأستقلال)ی بەغدادا خوێندمەوە کە کوردەکانی ژووروو دیسان دەستیان

(١) لیوای مونتەفیک: دوایی بووە پارێزگای (ناصریە) و ئێستا (ذی قار)ە.

(٢) حەمەخانی نەقیب: (١٨٩١-١٩٥٣/٤/١٥) ناقرەتێکی دیار و بەرچاوی نێوەندە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکانی سلێمانی بوو، لە سلێمانی لەدایک بووە، ئامۆزای شێخ مەحموودی نەمر بووە و خێزانی شێخ قادری حەفید بووە، کچی شێخ مارفی نەقیبە. دیوەخانەکەی هەمیشە ئاوەڵابوو بۆ پەنابردنی لێقەوماوان و پەنابەران، زۆر بوێرانە داکۆکی لە ئافرەت دەکرد و تەقەللایەکی بێ وچانی دەدا بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندەواری لەناویاندا لە چالاکییە سیاسییەکانی بیستەکان و سییەکانی چەرخی بیستدا لە سلێمانی ناوی ئەو لە پێشەوە بوو، دواجار شێر پەنجە کۆتایی بەژیانی هێنا و لە سەیوان سپێردرا.

کردۆتەوە بەشەڕکردن لەگەڵ تورکیا، کە مەرشیان بۆ شەڕ وا بەستووە کە هەتا تنۆکێ خوێنیان تیادا دەمێنێ. تا تورک لە کوردستان دەکەنە دەرەوە وازنەهێنێ.

کوردستانی خوارروو: ١٩٣١/٥/٣٠

تەوفیق وەهبی و مەحامی سەعید نامیق بەسی و سێ هەزار ڕووپیە بارمتەوە بەندکران.

نووسراوەی کوردی: لە ڕۆژنامەدا چاوم پێ کەوت کە «حکوومەت!...» دەیەوێ چەند نووسراوەیەکی کوردی لە چاپ دا. ئەمانەش هی قوتابخانەی منداڵەکانن. ئەو مامۆستایانەی خۆیان بەباش دەزانن، خۆیان لای حکوومەت بنوێنن، ئینجا دەستبکەن بەگۆڕینی ئەو نووسراوە عەرەبییانە بەکوردی. حکوومەت چاکەیان ئەداتەوە (دراویان دەداتێ). نووسراوەکانیش ئەمەن:

مەزاحیم بەگ: وەزیری ناوەوەی عێراق لە حوزەیران چووە سلێمانی، لەوێ زۆر میوانداریان کردبوو، (ڕەشید کابان) داوای پێشخستنی زانینی لێ کردبوو (قوتابخانە و نووسراوە). لە پاش ئەوانی دەڵێ:

«من بۆیە ئەم وەزارەتەم پەسەندکرد، چونکی باوەڕم هەیە بۆ کورد ئەکۆشێ»[1].

«ئەوا بەناوی حکوومەتەکەمەوە هەر کەسێ لەم هەرایەدا لەگەڵ شێخ بووە، چاوی لێ دەپۆشم، بەلام چەند کەسێکیان لێ دەرچێ؟!».

مەلیک فەیسەڵ: بۆ ئەم دارۆغا (بەلەدیە)ی سلێمانی ١٢ هەزار ڕووپیەی لەناوبرد (خەرج کرد - ا.ب)، میوان ئەوازەیەکی زۆری کردبوو[2]. چووبووە (زانستی) سەد ڕووپیەی بەخشیبوو. عەبایەکی دابوو بەمەلاکەی مزگەوتی گەورە (خەتیب). ئیتر لەو ساوە خەتیب ناوی لە جومعەدا دەخوێنێتەوە... بەسایەی ئەمەوە مانگانە بۆ هەموو مەلاکان بڕایەوە... چووە هەڵەبجە دەستێکی درێژ و هێزێکی گەورەی دایە دەست مەلا و شێخانیان (کە ئێستا کەس لەوێ ناوێرێ فزە بکا) سەربەستی بیر و هۆش نییە، کەس ناوێرێ بەبێ پەنجەی ئەوان نققەی لێوەبێت[3].

(١) ئەو سەردانەی وەزیری ناوخۆی عێراق (مزاحم بگ) بۆ سلێمانی، لە ڕۆژی شەممە ١٦ی مایسی ١٩٣١ دابووە، دەربارەی ئەم وتەیەشی، دەقاودەق وتوویە: «... لە جملەی ئەو عواملەی کە منی هێنایە سەر هەوەس و ئارەزوو کە داخلی وەزارەتی فخامەتی نوری پاشا بیم یەکێکی ئەوەیە کە أکیداً ئەزانم وەزارەتی مشار إلیها بەرامبەر بەکوردەکانمان عاطفەیەکی زۆر لە سیاسەتیان معاملە ئەکات...» بڕوانە دەقی وتەکەی ئەو وەزیرە لە (ژیان، ڕۆژنامە: ژمارە ٢٨٣، ٢٥ی مایسی ١٩٣١، ل ١ ٢ هەروا ژمارەی ٢٨٤، ١٩٣١/٦/١).

(٢) وا دیارە سەردانەکەی وەزیری ناوخۆ بۆ ڕێگە خۆشکردنێک بوو تا مەلیک لە ڕۆژی چوارشەممە ١٠ی حوزەیرانی ١٩٣١ سەردانی سلێمانی بکات و لەوێ چاوی بەئەشراف و ئەعیان بکەوێ، بەتایبەت دوای (کوژاندنەوەی هەراکەی شێخ مەحموود و دوورخستنەوەی بۆ خوارووی عێراق). مەلیک فەیسەڵی یەکەم لە ١٢ی حوزەیرانی ١٩٣١ سەردانی هەڵەبجەشی کرد وە لە ١٣ی حوزەیرانی ١٩٣١ گەڕایەوە بۆ کەرکووک. (بڕوانە دەقی وتەکان فەیسەڵ لە سلێمانی: ژیان، ڕۆژنامە، ژمارە ٢٨٧، ١٩٣١/٦/٢٥، ل ١)

(٣) شێخانی ناوچەی هەڵەبجە کە شێخەکانی بیارەن و ڕابەرانی تەریقەتی نەقشبەندین، وەک بەهەشتی (ئەمین نەقشبەندی) دەیگێڕێتەوە: لە مێژووە پەیوەندی توند و تۆڵیان لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ و (هەندێ لە =

لە زەماوەندێکدا کە لە باخچەی میللی بۆیانکردبوو گوتبووی «ئێستا کەمێک لە وتەکان گەیشتم، بەڵام بەناوی خوا ساڵێکی تری پێ ناچێ کە هاتمەوە ئێرە بەکوردی قسەتان بۆ دەکەم»[1] لای حاجیەکانیش گوتبووی: «وام بۆ دەرکەوت خەڵکی سلێمانی زۆر بەسەزمانن (؟؟) بەڵام بەدخوا نایەڵن بسرەون».

تاقیکردنەوە: تاقیکردنەوەمان لە ١٤ی حوزەیراندا دەستی پێکرد، بەسایەی خوا و ڕێوشوێنێ کە خۆم بۆ کۆشان و ڕابواردنم دانابوو -گەڕان، جولان، بەخۆشی ڕابواردن، نووسینێکی زۆر، کەم کۆشان- زۆر چاک سەرکەوتم. لە ٢٥ی مانگدا لێبووینەوە، بەڵام یەکێکمان لەبەر گرتنی کاکی، دووانمان لەبەر نەخۆشییەکی کوتوپڕ -زگچوون، ئەنفلۆنزا- لە ناوەڕاستی تاقیکردنەوەدا وازیانهێنا... چوارمان توانیمان بەتەواوی تەواویکەین..

هاتنەوە: لە شەوی ٢٧ی حوزەیراندا بەگەڵ هەموو قوتابیە کوردەکانی لەناو بەزم و زەماوەندێکی گەورەدا ڕووبەڕووی وڵاتە خۆشەویستەکەمان چووینەوە...

= نێزیکەکان لەوەوە)یان هەبووە، بەجۆرێ کە نامەی تایبەتیش لە نێوانیاندا بووە، لەو کاتەوەی کە بەهەشتی شێخ عەلائەدین نەقشبەندی (١٨٦٣-١٩٥٣) زیارەتی بەغدا دەکات بەرەو (دیرالزور) لە سووریا و لەوێ لە تەکیەی خالیدی میوان دەبێ (١٩٢٢). لەناو ئەو خەڵکە زۆرەش کە سەردان و زیارەتی دەکەن (یاسین الهاشمي) دەبێ کەسایەتی و وەزیر و یاوەری مەلیک فەیسەڵ. هەروا (حاجی علوبە)ی خوشکی، بەهۆی ئەمانەوە پەیوەندی لەگەڵ مەلیک دەبەستێ، ئەویش کاتێ فەیسەڵ داوای تەبەڕوک و دوعای خێری لێ دەکات کە لە کاری ئایندەیدا (پاشایەتی عێراق) خوا یاریدەدەری بێت و سەری بخات، شێخی گەورەش بەهاشمی دەڵێ: با پەیمان بدات کە شەریعەتی محەممەد پەیڕەو دەکا و لە وڵاتەکەیدا خراپە نەکا و بەغدا بێتە پایتەختی پاک و ڕووناکی ئیسلام. کە ئەو پەیمانەی مەلیکی بۆ دێنێ، ئەویش لەژێریەوە دەنووسێ: «أتمنی من الله أن یصبح ملکاً في مدة قلیلة بل أقل من القلیل». ئیتر لێرەوە پەیوەندییەکە زیاتر توندتر دەبێ و سەردانی فەیسەڵ بۆ هەڵەبجە یا بیارە کارێکی ئاسایی دەبێ. (بۆ زیاتر بڕوانە: أمین النقشبندي، وقائع ووثائق في حیاة والدي الشیخ علاءالدین.. (جریدة القادسیة)، ١٩٨٩/١٢/١٥ الجمعة) شێخ عەلائەدین خۆیشی باسی ئەو پەیوەندییە قووڵە دەکات لەگەڵ فەیسەڵدا، بۆ مامۆستا شاکر فەتاح، کاتێ لە ١٩٣٣/٨/٢٣ سەردانی بیارە دەکات (گەشتی هەڵەبجە و هەورامان -١٩٣٣، چاپخانەی کامەران، سلێمانی ١٩٧٤، ل٤٣).

(١) مەلیک فەیسەڵی یەکەم سەرکردەیەکی حکوومەتەکەی عێراق نەبوو کە لەم جۆرە قسانە بۆ کوردەکان بکا و هەوڵدات سۆزیان ڕاکێشێ و هەڵیانخەڵەتێنێ.. بەڵام کە بەدواداچوونێکی ئەم جۆرە وتە و بەڵێنانە دەکەین دەبینین هەرگیز نەهاتوونەتە دی، ئەوەش ساختە و فشەڵی ئەو خۆ لێ نزیککردنەوەی ئەو کەسانە دەردەخات. ئەگینا فێربوونی سەرکردەیەکی عەرەبی حوکمی عێراقی یا فێرنەبوونی زمانی کوردی دەبێ چ شتێک لەو مێژەزمەیە بگۆڕێ کە بەسەر سنگی نەتەوەکەوەیە وە یا چ ڕێگەیەک لەو خزمەتانە بگرێ کە بەرێ بەو گەلەی بکات؟

## کۆمەڵی دیدەوانی کورد ١٩٣١/٥/٣٠

هێشتا ماندوومان نەحەسابووەوە، چوار قوتابی: فەهمی تەوفیق، کەریم ئەحمەد، فەخری سامی (لە دارولموعەللمین) لەگەڵ بەندە (شاکر فەتاح)دا کۆمەڵێکی دیدەوانمان پێکەوەنا . هەرچی سەرەتایەک بۆ دیدەوان دانراوە لە دەفتەرێکماندا دانا (دامانا- ا.ب)، ئینجا سوێندمان خوارد کە بەپێی ئەوە بەڕێوەبچین، سێ دەفتەرمان بۆ گرت:

یەکێ بۆ یادنامەی کۆمەڵە. یەکێک بۆ پیشاندانی دراو وەرگرتن و دراو بەختکردن (خەرجکردن- ا.ب)، سێیەمیشیان بۆ ئەوەی هەر کەسێ (لەم چوار پەلە -ئەندامە- ا.ب) شتێکی بەبیرداهاتێ تیابنووسێ. هەموو شەمووان و سێشەمووانێک لە ماڵی ئێمە (شاکر فەتاح) بۆ قسەکردن گرد دەبووینەوە. هەر هەفتەی یەکی دوو نامەمان دەخستە هەگبەی کۆمەڵەوە. جارێ ئەم کۆمەڵە منیان بە(نهێنی نووس - سکرتێر) دانا، ئیتر من دەمنووسی، هەرچی شتێکیش بووایە بەمن دەسپێررا، من جێبەجێم دەکرد، لەبەر ئەوە کردیشیانم (هەرچەندە من دەمدا بەیەکێکی تر) بەسەرداری کۆمەڵەکە.

لە پاش چەند ڕۆژێک بەدزیەوە (ئەحمەد عەزیز) ناو قوتابییەکمان خستە کۆمەڵەوە. بەڵام چونکی بەپێی پێڕەوی کۆمەڵەکە نەڕۆیشت دەرمانکردا... ئیتر نەماندەویست جارێ خۆمان پیشانی قوتابییە کوردەکانی کە بدەین، چونکی چاوەڕوانی ئەو حەلەمان دەکرد بەڕێکوپێکییەکی واوە خۆ بنوێنین، هونەرێکی وایان پیشان بدەین؛ ئەوانیش ئازایەتیان ببزوێ، دڵیان بێتە جۆش، کە ئەوسا هیچ گومانی تێدا نەبوو یا دەهاتنە سەر ئەم کۆمەڵە یاخود خۆیان کۆمەڵێکی کەیان پێکەوە دەنا.

چونکی پێڕەوی کۆمەڵەکەمان وا بوو کە یاری کوردی زیندوو بکەینەوە، گیانی گەڕان و جووڵان بخەینە ناو لەشی قوتابی کوردانەوە... لەسەر ئەمە جارێ دەستمان کرد بەڕێکخستن و یەککردنی کەلوپەلمان:

١- گۆرەوی و پانتۆڵ و کراسمان کردە یەک ڕەنگ.

٢- چوار فیکفیکمان بەقەیتانەوە (هەموو لە ڕەنگێک) لەسەر دراوی کۆمەڵ کڕی، لە ١٩٣١/٧/١.

٣- چوار چەقۆمان (یەکێکیش بۆ ئەوەی کە دەرکرا) هەمووی لە ڕەنگێک لای کوردێک بەکردن دا (لەسەر پوولی کۆمەڵە).

٤- چوار داری دیدەوانمان لای دارتاشێکی کورد لەسەر دراوی کۆمەڵە لەگەڵ قوتوبەیەک ڕۆنی سووردا کڕی.

٥- من (شاکر فەتاح) وێنەگرێک و تفەنگێکی دیدەوانم (هەتا قوتابخانە دەکرێتەوە) پێشکەشی کۆمەڵ کرد، لە ١٩٣١/٧/١.

٦- سەید کەریم ئەحمەد، دەفتەرێکی زلی دا بەکۆمەڵ، لە ١٩٣١ ٧/١ ئالێرەدا بووین بەسایەی هەندێ چەپۆکی گەردوونەوە کە بەتایبەتی بەسەر هەندێکمانی دادا (فەخری و من) لە ڕێکوپێکی کەوتین. وەستاین، ئیتر بۆ دەمێکی کورت وازمان لە هەموو شتێ هێنا. جارێ بەس بوو...

لەگەڵ ئەوەشدا کە کۆمەڵەکەمان مانگێک بەرێکوپێکی بەسەری نەبرد، هێشتا هیچمان لێی سارد نەبووینەتەوە، لە کردنی پەشیمان نین..[1]

بەناوی خوا

١٩٣١/٦/٣٠

سلێمانی/ کۆمەڵی دیدەوانی کورد

مەبەس: بلاوکردنەوەی ڕۆحی یاریکردن و جوولان (ڕیازەتی بەدەنییە) لەناو قوتابیانی کورد.

سەرەتا «مبادئ»

١- درێژکردنی دەستی یارمەتی بۆ لێقەوماوان:

أ- کوژاندنەوەی ئاگر.

ب- ڕزگارکردنی منداڵ لە تەنگانە.

ج- بەلەش و بەپوول، یاریدەدانی هەژاران.

٢- بەرامبەری هەموو تەرحە ناخۆشییەک بەڕوویەکی خۆشەوە.

٣- برایەتی، یەکگرتن، یەک قسەیی لەناو خۆمان و قوتابیانی کوردا.

٤- بەقسەی گەورەکردن، ملکەچکردن بۆ قسەی کۆمەڵ.

٥- دڵی یەک ڕاگرتن وە ڕاگرتنی دڵی هەموو کەسێکی تر.

٦- پاک و تەمیزی.

«پەیمان»

من کە یەکێکم لە پەلی کۆمەڵی دیدەوانی کورد بەشەرەفی خۆم و خێزانم سوێند دەخۆم کە هەتا لە توانامابێ چی لە پێڕەوی و سەرەتای ئەم کۆمەڵەدا دانراوە، بەجێی بێنم:

شاکر فەتاح، سەید کەریم، فەهمی تەوفیق، فەخری سامی، ئەحمەد عەزیز - ١٩٣١/٧/٤

«پێڕەوی»

١- کۆمەڵ لە سەردارێک و نهێنی نووسێک (سکرتێر) و شەش پەل دروست دەبێ -کۆمەڵ لە هەشت

(١) لە کۆتایی ئەم دەفتەرەی یادنامانەی مامۆستادا، ئەم باسە هاتووە بەم بەروارەوە، ئەمەش پوختەی ناوەڕۆکی دەفەرێکی دەستنووسی تریەتی کە لە کتێبخانەکەیدا بەردەستم کەوت: بریتییە لە پرۆگرام و دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیە و بەشداربووەکانی، هەروا ئەو چالاکییانەی لە چوارچێوەی ئەم کۆمەڵەیەدا نواندوویانە، جا وام بەچاکتر زانی کە هەر ڕاستەوخۆ ناوەڕۆکی (تۆماری ئەو کۆمەڵە) بخەمە بەردەست، بەتایبەت مامۆستا ئەم دەفتەرەشی ناو ناوە (یادنامە)، بەمەش دەشێ بەتەواوکەرێکی ئەوەی پێشووی دابنێین. هەروەک دەریش دەکەوێ کە لە ٢٧ حوزەیرانی ئەو ساڵەدا دوای تەواوبوونی تاقیکردنەوەکانیان گەڕاونەتەوە سلێمانی، ئیدی لە پاش سێ ڕۆژ، بیریان لە دامەزراندنی کۆمەڵەکە کردۆتەوە و لە ١٩٣١/٦/٣٠دا لە ماڵی خۆیان کۆبوونەوەی دامەزراندنیان ئەنجام داوە. جا ئەمەی کە دێت ناوەڕۆکی تۆماری کۆمەڵەکەیە.

کەس زیاتر نابێ-.

٢- کۆمەڵ لە هەفتەیەکدا دوو جار کۆدەبێتەوە: شەممو، سێشەممو.

٣- دوو دەفتەر دەبێ: یەکێ بۆ یادنامەی گەشت و سەیران، یەکێکیش بۆ بەختکردنی (خەرجکردن-ا.ب) و وەرگرتنی دراو.

٤- لە سەرەتای هاتنە ناودا (ناوەوەدا - ا.ب)، چوار ئانە دەدرێ، هەر هەفتەیەش دوو ئانە دەخرێتە سندووقی دراوەوە.

٥- دەفەرێکیش بۆ نووسینی ئەوەی بەبیردا دایە (بەبیردا دێت- ا.ب). لە پەلەکان بەولاوە کەسی تر تیادا نانووسێ.

٦- دامەزراندنی یاری لەناودا. زیندووکردنەوەی یاری کۆن. گەشت و سەیران لە دەرەوەدا.

«یادنامە»

لە ژیانی ئەم کۆمەڵە باس دەکا کە لە دیدەوانی رایدەبوێرێ، بەوێنە دەرازێنرێتەوە.

* ١٩٣١/٦/٣٠: لەم رۆژەدا فەخری سامی، سەید کەریم ئەحمەد، فەهمی تەوفیق، شاکر فەتاح. لە ماڵی شاکر فەتاح کۆبوونەوە، کۆمەڵی دیدەوانی کوردیان دامەزراند... جارێ سەرداریان دانەنا، بەڵام شاکر فەتاح بەقسەی هەموو دانرا بەنهێنی نووسی کۆمەڵەکە.

شێوەی کۆمەڵەکە لە سەرەتای ئەم دەفتەرەدا نووسراوە.

* ١٩٣١/٧/١: لەبەر ئەوەی مەبەسمان بڵاوکردنەوەی گیانی جوولان و یاریکردنە بەناو قوتابیانی کورددا، بەگشتی داماننا کە هەتا لە توانامانداية بەکەلوپەلی دیدەوان خۆمان برازێنینەوە، بەرەنگێ هەتا بۆمان بکرێ شتی بێگانە نەکڕین، هی کورد نەبێ.

بەڵام لەبەر ئەوەی کۆمەڵ پوولی ئەمەندە بوو بۆ یەکەم سەیرانمان چوار فیکفیکەمان بەقەیتانیانەوە کڕی، کە ئەوەش یەکێکە لە هەرە کەلوپەلە بەکارەکانی دیدەوان.

## گۆیژە - وێڵەدەر ١٩٣١/٧/٢

فەهمی تەوفیق، سەید کەریم، شاکر فەتاح، فەخری سامی.

بەیانی پێنج شەممە بوو، فێنک، شەماڵ لە لق و گەڵای گوڵ و درەختانی دەدا، شەونم بووبوو بەملوانکەی سەوزەگیا، گوڵیش بەیاقووت و زومرووتی باخمان؛ بۆنی بەسلیمانیدا پەخشان دەکرد، هەروەکو دڵی بولبولی فریو بێنێتەوە جێ، غونچە دەمی دەکردەوە بەدەم چرۆی گوڵەوە بەهێزی بای بەیانی شنەشن لار و لانجەی دەکرد، بۆنی دەنارده کن بولبول - چونکی ئێمەش لە بولبولانی باغی کوردستان بووین چەزوو بەو میسک و عەبیرە خەبەر بووینەوە، خۆمان بەبەرگی دیدەوانی پۆشی، لە قەراغ شار لەیەک حەلدا وەکو برای دایک و باوکی کۆبووینەوە. هێشتا لە شار جوێ نەبووبووینەوە: هەروەکو یەکێ لە سەری گۆیژە بڵێ دردنگە حەلی هاتننانە، رۆژ بەڕوویەکی پێکەنینەوە، لە چەشنی کچێکی چواردە

ساڵەدا لە کەلەکەوە سەری دەرهێنا ، ڕێی بۆ ڕووناک... (کردنەوە- ا.ب) ، شاری بەتارایەکی زێڕین بۆ هێزی ئەژنۆمان بۆ ڕازانیەوە؛ هێشتا هەر پێدەکەنی هەتا سەعات و نیوێکمان ڕۆیشتن پێ چوو ئیتر ئەو حەلەبوو کە لە چایخانەکەی گۆیژە ڕۆژباشیمان لە چادرەکە دەکرد. قەد مەپرسە ، هەتا نیوەڕۆیەکی درەنگ لەم چایخانەیەدا بەچە کەیف و زەماوەندێک ڕامان بواردووە؛ چایدەر چەتەیەک بوو[1] قسەخۆش، باسی هەرای کۆنی شێخ مەحموودی بۆ دەکردین. ڕەوشت و کردەوەی ئازایی، دڵسۆزی، ئانیدەیی، گیان سووکی بەچیرۆکەوە لە مێشکماندا دادەمەزراند. خۆ باسی تژێنتیی[2] لادێیی هەر ناکرێ، ئینجا چەندە ڕووخۆش، دەم بەپێکەنین بوو ، چەندە گۆرانی خۆشیان بەشمشاڵ بۆ لێ دەداین، لە هەموو باسێکیان جوانتر ئەوەبوو بەتەواوەتی بەهۆشی کوردایەتی خەبەر بووبوونەوە، هەروا قسەی وڵاتپەروەری لە دەمیانەوە بازرەقەی دەبەست... هەر بەوە وازمان نەهێنا ، چووینە سەر تەوقەسەری شاخەکە لەوێ بەرامبەر بەو هەموو دێهاتانەی سەرچنار لەو بەرەوە کە لە بناری شاخدان، ڕوو بەشاری سلێمانی کە لە دوورەوە لە باخچەیەک دەچوو گوێزە تەلاری بێت، لەم دیوەوە بەرامبەر بەو هەموو دێهاتانەی شاربازێڕ، ئاوازمان لێ بڵند کردبوو ، گۆرانیمان بەچاوئەندازی جوانی کوردستاندا دەخوێند.



ئینجا ڕووەو وێڵەدەر[3] چووین، نیوەڕۆ بوو کەچی هیچ بەگەرمیمان نەدەزانی؛ چونکی کزەبایەکی زۆر فێنک بەسەر باڵەکانی گۆیژەدا شنەی دەهات، لە ڕێی گەلێ وێنەی هێلکە شەیتانۆکە و گیانلەبەرمان دی لە بەردەکان هەڵکەندرابوون، تاشە بەردی زۆر ڕێک و لووسیشمان بەدی دەکرد ، کە ئەوە یاریدەیەکی گەورەی داین بۆ دروستکردنی تیری دیدەوانی (ـــــ) کە ئەگە کەسی تر لەوێ ڕووی کردە وێڵەدەر ئەوە ببینێ، دێیەکەی پێ بدۆزێتەوە.

جا چەندە دڵخۆش دەبووین کە لە حەلێکا یەک لە یەک دوور لە پڕێکا بەفیکەیەک لە شوێنێکا بەهەراکردن گرد دەبووینەوە!

یەکێکمان قاچی ڕووشا بەڵام هیچ دەرمان و لۆکە و کەتانمان پێ نەبوو -کە دەبوو پێمان بووایە- برینەکەی پێ سارێژ کەین، ناچار بەدەسەر و بەخۆڵ پێکمان هێنا.

سەعات و نیوێک بەناو ڕەز و دارگوێز و ترش و چوالەدا ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە «وێڵەدەر».

وێڵەدەر دێیەکە بەقەد شاخەکەوە، چەشنی پلیکانە ماڵ بەماڵ کە لەبەرد و گڵەسپی جوان دروست کراون، ڕێیەک دەیکا بەدوو کەرتەوە دێتە خوارەوە، دوو کانی و دوو مزگەوتی ڕێکوپێکی هەیە، ئیتر دێیەکە بەسەر ئەو باڵە بچکۆڵەیەدا دەڕوانێ کە لەبەردەمیایەتی.

(١) چەتە: بۆ هەریەکێ لەوانە بەکاردەهێنرا کە لەگەڵ شێخ مەحموودا بوون و جەنگاوەر بوون. بەمانای (پێشمەرگە)ی ئێستا دێت.

(٢) تژێنتی: مامۆستا پەراوێزی بۆ ئەم وشەیە لە دەستنووسەکەدا داناوە بەڵام هیچی لە بارەوە نەنووسیوە.

(٣) گوندێکە لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانی بەدامێنی (قوتەی مەحموود خان)ەوە کە بەشێکە لە شاخی گۆیژە. گوندەکە بەدیوی شاربازێڕدایە (ڕوو لە سلێمانی نییە).

ترێی وێڵەدەر زۆر بەناوبانگە:

توخوا لێت نەشارمەوە، کە چووینە ناو دێیەکە، چونکی هەریەکە جلمان شێوەیەک و ڕەنگێک بوو، منداڵان و کچان بەسەرسوڕمانێکەوە تەماشایان کردین!! دیسانەوە لە مزگەوتەکە بەپێنج کەس چەقۆیەکی بچووکمان پێ بوو، ڕوومان نەدەهات لەبەر گاڵتەی لادێییەکان دەری بێنین - لەوان چەقۆمان سەند بۆ ترۆزی و سێو خواردن.

پیاوەتی ئەو سێ چوار لادێییەمان قەت لەبیر ناچێتەوە کە لە نەدیوو نەناسراو چوو (چوون - ا.ب) دۆ و نانی گەرمی بۆ هێنابن (نانی گەرمیان بۆ هێناین- ا.ب).

ئینجا لە سەعات دە و چارەکێکەوە لە پاش تێربوون، لە پاش ئەوەی ناوی خۆمان و کۆمەڵەکەمان لە دەرگاکەی خانووی عەلی ڕەزا بەگەوە نووسی، بەرەو شار بەگۆرانی کوردی بەڕۆیشتنێکی دیدەوانانەوە نزیکی بانگ بەدیداری سلێمانی شادبووینەوە!...

سەرمان لەمە سوڕ دەما کە شەش سەعات بەپێ ڕۆیشتین کەچی بەماندوێتیمان نەزانی هەتا ماڵەوە.

ئەمجارە، یەکەم جارمان بوو، جلمان یەک نەبوو، بێ دار، بێ چەقۆ، بێ دەرمان بێ وێنەگر و بێ تفەنگ بووین، مەتارە و دۆلکەکە لە هەموو بەکەڵکترە ئەویشمان (ئەوانەشمان- ا.ب) پێ نەبوو.

## کانی ماسی- کانی گۆمە ١٩٣١/٧/٦

فەهمی تەوفیق، شاکر فەتاح، ئەحمەد عەزیز، فەخری سامی.

بەیانی دووشەممە لە دە و نیو، ئەحمەد عەزیز نەبێ، هەرسێکمان بەرەو کانی ماسی[١] دەسمان کرد ڕۆیشتن (بەڕۆیشتن- ا.ب)، ڕێ ئەمەندە نەرمان بوو، هێندە تەخت و بێ چاڵ و چۆڵ بوو، نیو سەعات ڕانەبورد، خۆمان لەسەر ئاوەکەی کانی ماسی دی. بن تووەکەمان پاک کردەوە، چاییمان نۆش کرد، هەندێ بەدێی (قەرەتۆغان)دا گەڕاین -دێیەکە وشکە بەڵام سێ چوار تووی گەورە و ئاوی سازگاری هەیە- ئینجا قنەفسێکمان[٢] دایەوە و کەوتینە ڕێ.

لە ڕاستیدا وەکو تێیان گەیاندبووین، حەزمان نەدەکرد وا زوو کانی ماسی بەجێ بهێڵین، چونکی ئێرەمان لە کانی گۆمە[٣] لا خۆشتر بوو. بەڵام چایی دەرێکی شەلی لێ بوو ئەمەندە ئەوسن و چڵێس بوو، ئەوەندە بەدکردار بوو، حەزمان دەکرد چایەکەشیمان نەخواردایە[٤].

(١) کانی ماسی: گوندێکە لە خوارووی سلێمانییەوە لەسەر ڕێگای گڵە زەردە و قەرەداغی کۆن... بەرلەوەی بکەیتە ناوی تانجەرۆ.

(٢) واتا: پشوویەکی کەم، دوای دانیشتنێکی کەم.

(٣) قەرەتۆغان و کانی گۆمە: دوو گوندن هەر نێزیک کانی ماسی.

(٤) بەراورد و سەرنجی باسکردنەکەی مامۆستا بدە دەربارەی (چایدەر)ەکەی لە چاخانەکەی گوێژە بووە و ئەمەش کە لەکانی گۆمە بووە!!

راسته و راست ڕوومان کرده کانی گۆمه... قەد مەیرسە درک و داڵ، بەلەک و زەل، ئاو و قوڕاو کە هەتا کەمەر بەناسماندا چووبوون، چی لێ کردبووین، ئەو گۆڕەویە درێژانە لەگەڵ پێتاوەکانماندا لەبەر وردە درک زەردی دەکردەوە...

هەر سەعاتێکمان پێ چوو گەیشتینە جۆگەی ئاوبارەکە بەپشت دێیەکەدا دەڕۆیشت، پەڕینەوە بەناو کۆمەڵێکی ٤٠ ماڵیدا ڕێگامان بڕی هەتا گەیشتینە مزگەوتێکی ئاوسارد هەر چوار لای توو و بیی گەورە گەورە داگیری کردبوو. لەوێدا هەوارمان لادا.

ئەم دێیە لەناو دەشتێکی پاندایە، تووتنی لێ دەکرێ، چەمی قلیاسان دەکەوێتە خوارووییەوە، بێ میوەیە، دارو درەختی بەرداری نییە چەند توویەک نەبێ، خوێندن لێرەدا زۆر باشە دوو مەلا و سێ قوتابی گەورە سێ قوتابی بچووکی تێدایە، لە مەلا و فەقێکان زۆر ئەوازشمان دی، خۆ کوێخاکەیان کە بیستبووی ئێمە هاتووین، هاتبووە کنمان زۆری لێ دەکردین بچینە ماڵەکەی نان و چاییمان بۆ بکات، گلەیی دەکرد: «باوکەکەم ئێرە ناسینی ناوێ هە چ کەس دێت هی من ماڵی خۆیەتی، ئێستا زۆر شوورەییتان بەسەرما هێنا کە لە پێشەوە لاتان نەدایە خێوەتەکەم».[1] ئینجا سەیری خوو و ڕەوشتی جوانی میوانداریی کورد کە.

بەڵێ شوێنەکەی لالەزار نەبوو، بەلام ڕابواردنمان، پێکەنینمان کردی بەلالەزار، بەتفەنگەکە قڕاڵێکی مزگەوتمان سێ کوت کرد، نیشانمان شکاند، گۆرانیمان وت، شمشاڵ -فیفرە-مان لێدا.

خۆ یاری و هەراکردن، گاڵتەکردن لەگەڵ قوتابییەکان و مەلا و لادێییەکاندا نایەتە نووسین، ئیتر پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بەرەو شار بەسەر شەقامەکەی شاردا بەگۆرانی وتن بەسەعات و نیوێک ڕۆیشتین گەیشتینەوە سلێمانی.

ئەمجارە لە کەلوپەلی دیدەوانی هەر فیکفیکە و تفەنگ و ئاودان -مەتارە- و شمشاڵمان پێ بوو، ئەبوونی دار دەمێکی درێژ لێ زیاندابین چونکە بەسایەی کورێکەوە بەولاغ لە جۆگەکە پەڕینەوە.

## سەرچنار ١٩٣١/٧/٩

سەید کەریم، فەخری سامی، فەهمی تەوفیق، شاکر فەتاح، ئیبراهیم فەتاح.

قەد مەپرسە لەمجارە کە چەند ناڕێک ڕۆیشتین، بەیەکەوە نەکرا بجوولێین، لەبەر ئەوە لە ڕێیەکی دوورەوە خەڵکمان ڕادەسپارد: بەهاوڕێکانمان بڵێین دوامان کەون. بەلا، ئەمجارە ئەرکمان زۆرتر بوو: شتومەکمان زۆرتر پێی بوو، لەوێ چامان لێنا.

ڕەنگە تۆ وا بزانی ئیمڕۆ لە دوو سەعاتی هاتوچۆ بەولاتر ئیتر نەگەڕاوین. بەلام بڕوابکە هیچ وچانێکمان کە تۆزێ سەرەوەمان بروبێ لە دەقیقە تێپەڕی نەکردووە: چونکی ئەو باغ و دارستانە، چیمەن و

(١) خێوەتەکەم: چادرەکەم، دەوارەکەم، خەیمەکەم... کورد ئەم ناوە لەگەڵ میواندا بەکاردێنێ بەرامبەر (خانووەکەم، دیوەکەم، ماڵەکەم...) وەک کینایەیەک بۆ تەوازوع و خۆ بەکەمزانین لە ئاست کەمانی خۆشەویستدا.

لالەزارە وای لێ کردبووین کە جارێک گەشتمان بەناودا دەکرد، جارێکی کەشی دووبارەمان دەکردەوە کە لام وایە بەناوی سەیرکردنی درەختەکانیەوە، بۆ بینینی مەل و پەلەوەرەکانی و ڕاوکردنیان لە شەش جاران گەشتمان تێپەڕ کردووە. خوا بکا هەر بەوەش وازمان بێنایە؛ لەسەر دەنگی خوڕەی ئاو و شنەی دارەکان بەرامبەر بەجوانی چاوئەنداز کە هاتبوینە یاریکردن، یاری پاڵەوانانە... پێم بڵێ کام دیدەوان هەیە خۆی ڕابگرێ نەچێتە ناو ئەو ئاوە بلوورەوە لەش بلوورین بکا، پاشان خۆی بەو تیشکی ڕۆژە و با فێنکە کەلکەوەر، دڵگشاوە بکا.

ئیتر بەکورت بیبڕێنمەوە؛ ئەو ڕۆژە بەگەڕان لە سەیران پەکەمان زیاتر بڕی... خۆشییەکەشی لەوە دابوو میواننەوازی چەند قوتابییەکمان بەجێ هێنا، هەندێ شێوەمان (شێوازمان- ا.ب) بۆ بانگکردنی یەک داهێنا[1]، نیشانمان نایەوە، ئیتر داشیانانا (بڕیارماندا- ا.ب) کە ئیتر وا بەجگار نارێکوپێک نەبین - بێ دار و بێ فیکە بێ دۆلکە...



من بۆ جێیەک دەگەڕام سەربەستی و ئازادی تێدابێ!. بەتەنگ خواردنی باش و جلوبەرگ و کۆشکی دەوڵەمەندانەوە نەبووم، کە بەو ڕەنگە تێیدا بژیم! لە ماڵی خاڵمدا چوار ساڵەکەم تەواوکرد. ئێستاش هەست بەگرانی ئەو باری چاکەیەیان دەکەم، هی ئەو و هی خاڵ و خاڵۆزاکانی ترم. ئێستەیش کە دەیانبینم شەرمیان لێ دەکەم. ئەگەر بەدەستم بێ هەرچیم هەیە پێشکەشیان دەکەم، بۆ ئەمەی ئەو چاکانەیان بدەمەوە! بەڵام داخەکەم هێشتا بەو ئاواتە نەگەیشتووم، چونکە ئەو هەلانەم دەست نەکەوتووە کە بەدڵی خۆم ئەو چاکانەیان بدەمەوە! ئاوارەیی و نەشارەزایی لە زمانی عەرەبیدا ناچاریان کردم

(١) وەک دەردەکەوێ لە سییەکانی سەدەی بیستەوە جووڵانەوەی دیدەوانی لە عێراقدا باربووە و چالاکییەکی بەرچاوی پرۆسەی فێرکردن و خوێندن بووە، جا هەروەش لەناو قوتابخانەکانی کوردستاندا کە مامۆستای تایبەتی (دیدەوانی - کشافە) هەبووە؛ بۆ نموونە مامۆستا سەعید فەهیم لە ١٩٢٨ مامۆستای دیدەوانی بووە لە ڕەواندز و نووسینی لەم بارەیەوە و دەربارەی پەروەردەی منداڵ هەیە لە گۆڤاری (زاری کرمانجی)دا (بڕوانە ئەو گۆڤارە: ژمارە -٥- تشرینی دوو ١٩٢٨، ژمارە، ١٧ و ١٨ شوباتی ١٩٢٩). ئەم دیاردەیەش زیاتر لە ئەورووپاوە سەری دەکرد، بەتایبەت لە ئەڵمانەوە کە سەرەتای پەیدابوونی بیری نازییەتی لێوە دیاردەی دابوو، خۆ ئامادەکردن و ڕاهێنان بەژیانی سەخت و زبری نیمچە عەسکەری سیمایەکی ئەو سەردەمە بوو، لای خۆشمان هەر ئەو بیرە بووە کە ناوا پاڵی بەو لاوانەوە ناوە: بیری ڕاهاتن بەژیانی سەخت و دژوار.
خۆ هەر لە دوایی سییەکاندا بوو ١٩٣٨ کە شاندێکی دیدەوانی قوتابیانی عێراقی نێرران بۆ بەرلین و لەناویانا قوتابییەکی سلێمانی (تاهیر یەحیا ١٩١١-١٩٧٩)ی تێدا بوو، شاندەکە چاویان بەهیتلەریش کەوت.
جا لە دیسپلینەکانی دیدەوانیدا کۆمەڵێ ڕێوشوێن پیادە دەکرێ: لە گەشت و ناو شاخ و دارستان.. هتد، ئەو شێوازانە چەسپاون لەناو بزووتنەوەی دیدەوانی جیهانیدا وەک یەک پەیرەو دەکرێن (وەک چۆن نیشانەکانی هاتوچۆ یەکخرا)... نەک هەر کۆمەڵە و بۆ خۆی دابهێنن. وەک مامۆستا لێرەدا دەڵێ.

بەماندووبوونێکی بێ ئەندازە لە خوێندنەکاغدا.

لە یەکەم ساڵمدا خراپ نەخۆش کەوتم. لەگەڵ ئەوەیشدا ساڵێکیان نەبێ بەهۆی نەخۆشییەوە لە تاقیکردنەوە (ناتەواو - إکمال) دەرچووم هەر چوار ساڵەکەم بەبێدەنگی و سەربەرزییەوە بردە سەر. فەرمانڕەوایی عێراق ناردمی بۆ دەرەوە لەسەر ئەرکی خۆی.

## یادنامەی ساڵی ١٩٣٢

## سوریا - لوبنان - بروممانا[١]

### ساڵی تازە ١٩٣٢

سەیرە، سەری ساڵی ئەمساڵ، لە هەموو لایەکەوە لە ساڵی پار ناچێ! لە بریتی دەنگی بانگدەر، دەنگی کەنشتەم گوێ لێیە، لە بریتی زمانی کوردی یاخود عەرەبی، زمانی ئینگلیزییە بەلای گوێما ویزە دەکا، ولات شاخستانە، بەفر و باران و کوێستانە، دار و درەختە، چەمەن و لالەزارە، ژیانی ئەورووپایە. لێرەدا کە ئەم قسانەی تیا دەنووسم ژوورێکە لە ژوورەکانی قوتابخانەی برومانا لە جێگا بەناوبانگەکانی لوبنانە بۆ ئاووهەوای سازگاری.

ئێستە هەمووی دە ڕۆژە پێمان لە سەفەر هێناوەتە دەرێ، لە ڕاستیدا هەرچەندە دڵ بەلای یەکەم شوێنەر لادەدا، یاخود ڕەوشتی کوردایەتی وام فێردەکات هەمیشە چاکیی سەفەرم لەبیر نەچێتەوە، بەڵام ئەمساڵە وەکو دەردەکەوێ، ساڵێکی ڕووناکییە، خۆشییە، لە هەموو شوێنێکەوە ژیان بەرەو پێش دەڕوا.

ئێمشەو یەکی سەری ساڵی تازەیە؛ ئەوا دەبینی سەر مامۆستاکەمان (میستەر ناش) بەدڵێکی بەجگار خۆشییەوە، بەنازێکی بەجگار بێشومارەوە، بۆ ئەم بیست کەسە و لەبەر دڵی ئەم بیست کەسە هەموو مامۆستا و ڕەنجبەری قوتابخانەکەی کۆکردۆتەوە، مێزێکی (+) شێوەیی ڕازاندۆتەوە: لە ناوەڕاستی مێزەکەدا درەختی لەدایکبوونی عیسا (خوا لێی خۆشبێ) بەڕەنگاوڕەنگ، مۆم و ناوێزەوە ڕازانراوەتەوە، سەر ژوورەکەی سەرانسەر بەگەڵای سەوز و شتی جوان وەکو بووکێکی چواردە ساڵە ڕازانراوەتەوە. ئەوە منم لەلای دوو کەسەوە یەکێکیان میستەر ناشە ئەوی تریان پەری ڕوویەکی ئەرمەنییە، بەو دەستە ناسکانەی چێشتم بۆ تێدەکا؛ هەمووشمان خەریکی چیرۆک و قسەی خۆشین.

(١) دەفتەرێکی مام ناوەندی بەرگی سەوزی قەبارە ١٧ × ٢٢سم. پەڕەکانی سپی و خەتی بەیانی لە سەرە، هەتا لاپەڕە (١٣) ئەرقیم کراوە لەوەدوا ژمارەی لاپەڕەکانی پێوە نییە، بەهەمووی (٣١) پەڕەی لێی نووسراوە. لە ناوەڕاستیدا پەڕەی لێکراوەتەوە، سەرجەم چواردە وێنەی پێوە بووە بەپێی بابەتەکان. یەکیان وێنەیەکی ناو ڕۆژنامەیە، لەمانە سێ وێنەیان لێکراوەتەوە و براوە... خەتی نووسینەکەی زۆر پوخت و خۆشە، مامۆستا بەدەستی خۆی نووسیویەتەوە، بەڵام لە هەندێ لاپەڕەیدا مەرەکەبەکە کاڵ بۆتەوە، ڕێنووسەکەی لە چاو سەردەمی خۆیدا باش و گونجاوە، هەروا وشە و زاراوە کوردییەکانی. باسی ژیانی ئەوساڵە خوێندنەی خۆی دەکات لە لوبنان.

نان خورا. ئینجا نۆرەی چیرۆک و قسەی سەیری ناشە. حەلی پیشاندانی گەورەیی ئەم کۆبوونەوەیەیە کە ئەم شەوە پیرۆزە لە هەموو ڕەگەز و ئایینی کۆکردۆتەوە. ئینجا بۆ ژووری میز داڤیدشە (ژنی دەستە ڕاستی ناش) هەتا چواریەکی شەو یاری و پێکەنینە، ڕەنگە لەچاو خۆماندا سەرت سوڕبێنێ. پیاوی تەمەنی (٥٠) سالە لەگەڵ کوڕێکی (١٨)سالەدا یاری دەکرد؛ یەکێک لەوانە سەر مامۆستاکەمان بوو، شێوەی پیاوێکی شێت و بێ مێشکی پیشان دەدا کە لە پێکەنیندا دەگریاین!... ئەوا ئێمە یاری دەکەین، (ڕادیۆ) لەلایەکەوە، (ئاوازەش) لەلایەکی ترەوە باوەشێنی دڵمان دەکا.

کە شت سەرەتای باش دامەزرا زۆر جار دواییشی باش دەبێ، ئایا خوایە دواییشمان باش دەکەی؟ هەروەک ئەم شەوەت لێمان ڕابوارد... دەروویەکی ئازادی و سەربەخۆییش لە کورد دەکەیتەوە؟!

## پانزە ڕۆژ

ئەو پانزە ڕۆژە قوتابخانە داخراوە، لە ڕاستیدا هیچ شتێکمان نەخوێندووە تا پێوەی خەریک بین، لەبەر ئەوە بەئارەزووی خۆم دەجووڵێمەوە. ١٩٣٢/١٢/٢٥ ئیمڕۆ چوومە بێروت سەرێکی «American Universityم دا (٤٨) خانووی گەورە بوو، لەناو خۆیدا بازاڕ و دووکان لە هەمەچیزە، زەوی (٦٠) تەرح یاری تێدابوو، خانوویەکی تایبەت بۆ مۆسیقا یەکێک بۆ سینەما و لاساییکردنەوە یەکێکی تر بۆ (ئاساری عەتیقە - مۆزەخانە) دانرابوون، جگە لەشتی تر کە نایەنە ژماردن.

چوومە ناوەوە، هاوڕێیەکی کوردی خەڵکی سلێمانیم - عەبدولقادر مەجید[1] دۆزییەوە، بڕوا دەکەی ئەمەندە بۆ بینینی یەکتر سووتابووین لە بەیانییەوە تا نزیکی ڕۆژئاوا پێکەوە بووین... هێشتا ماندوو نەبووین.

بێروت شارێکی پێشکەوتووە، کۆشکی پێنج نهۆمی شەش نهۆمی هەیە، زۆریان گاورن، هەتا خوا حەز بکا دووکاندارەکانیان زمان لووسن و پیاو زوو لە خشتە دەبەن، خۆ کاری ناشرین لە بێروتدا هەر باس ناکرێ، بەڵام پێشکەوتوویشی لەگەڵ ئێمەدا ئەندازە ناگیرێ. نیوەشەو بوو هاتینەوە قوتابخانە.

١٩٣٢/١٢/٢٦ لەگەڵ هاوڕێیەکمدا، بەخۆمان و ناهەنگێکی بچووکەوە لەگەڵ نانەبەرەیەک[2] بۆ هەردووکمان، نزیکی سەعات و نیوێک ڕێیەکمان تەی کرد[3] تا گەیشتینە (بەعەبدات).

(١) عەبدولقادر مەجید (١٩٠٨- ١٩) کوڕی مەجید ئەفەندی کانێسکانە، ناسراو بە(حیشمەت) و برای (ڕەئووف حیشمەت)ە، دوای تەواوکردنی ئامادەیی نێراوە بۆ زانکۆی ئەمریکی لە بەیروت، ماستەری لە هەندەسەی مەدەنیدا هێناوە، بۆتە ئەفسەر تا پلەی عەقید موهەندیس لە ئەشغالی عەسکەری لە بەغدا، مامۆستا بووە لە کۆلیجی هەندەسەی بەغدا. ژنی نەهێناوە، هەر لە بەغدا مردووە. خاڵی شەهید ئەریمان فوئاد مەستییە.

(٢) نانەبەرە: توێشەبەرە، ئەسبابی خواردنی کەسێ یا دووان دەخرێتە کیسەیەک یا پارچە قوماشێکەوە، لای خۆمان بەزۆری (خام یا بلووری) سپی بەکاردێ: لە شێوەی چوارگۆشەدا.

(٣) تەی کرد: بڕیمان - ڕێگاکەمان بڕی. وشەکە لە (طی)یەوە هاتووە.



بەعەبدات دێیەکی (٦٠) مالییە، بەڵام لەچاو دێی خۆماندا شارە، دوو قوتابخانەی تیایە، یەکێکیان هی تەنیا پیاوێکە کە کردوویەتیەوە، هەموو ئاو لە کانییەکی بەرەو ژووری دێیەکە دەخۆنەوە کە بەلوولە ئاسن بۆیان دێ.

لەوێ لەناو دار و درەختی سنەوبەردا، بەقەد ئەو شاخە جوانەوە دەستمان کرد بەنانخواردن، لەوێ یادی شوانی کوردم کردەوە، شمشاڵەکەمم دەرهێنا، بەرامبەر بەجوانی کردگار دەستم کرد بەگۆرانی وتن، هەندێ تفەنگیشمان تەقاند، ئینجا بۆ ئێوارێ گەڕاینەوە.

١٩٣٢/١/٤ بۆ سبەینێ لەتەک چەند کەسێکی تر بۆ (بەعەبدات و عێن عەرعار) هاتینەوە. لەسەر ڕێگای بەعەبدات و عێن عەرعاردا وێنەیەکی خۆمان لە بەردەمی هەیکەلی سەرداری کۆمەڵی میللی لوبنانی گرت؛ کابرا خەڵکی بەعەبداتە، ناوی (نعیم لوبکی)یە... خزمەکانی بەپارەی خۆیان ئەم هەیکەلەیان بۆ دروست کردووە... ئینجا سەیری پێشکەوتنیان کە!

نیو سەعاتە ڕێیەک لە بەعەبدات دوورکەوتینەوە ئینجا گەیشتینە (عێن عەرعار). عێن عەرعار چاوەیەکی گەورەیە بەقەد شاخەکەوە هەرچوار لای دار و دەوەنە، ئاوەکەی بەلوولە براوە بۆ بەعەبدات... چاوئەندازێکی جوانی هەیە، لەوێ چێشتەنگاومان کرد. دیسانەوە دەستم کردەوە بەشمشاڵ لێدان، هاوڕێکانم یەجگار دڵخۆش بوون.. لەوێدا ئەم وێنە جوانەمان بەوێنەگرەکەی خۆم گرت.



خوێندنەوە: لەم ئاوەدا پێنج چیرۆکی ئینگلیزیم خوێندەوە، بەتەواوەتی لە هەموو سەرە و کارێکی گەیشتم، کەڵکێکی گەورەم لێیان دەستکەوت. میستەر ناش یەک چیرۆکی دابوومێ بەڵام من پێنجم پەیداکرد و خوێندمەوە: چیرۆکەکان بۆ منداڵ داترابوون، هەریەکە ٣٠-٣٢ لاپەڕەیەکی بچووک بوون، هەمووشی باسی جنۆکە و شتی سەیر سەیر بوون. کەچی لای ئێمە ئەم هەموو چیرۆکە هەیە کە دایکمان بۆمان دەکا فڕێمان داوەتە ئەولاوە دەڵێین بۆ منداڵ ناشێ!

زۆر حەزم لێ کردن، لەبەر ئەوە نیازم کردووە لەم هاوینەدا بیانگۆڕمە سەر کوردی، تا خوێندەوارەکانمان

تیی بگەن کە خەڵکی ئەمەیان هەیە و کەڵکی لێ وەردەگرن. نازی پێوە دەکەن، ئەوانیش ئەو هەموو چیرۆکە کوردییە جوان جوانانەیان فێرێ داوەتە لاوە.

عوود: ژوورەکەمان کەمانچەی تێدایە، فیفرە -شمشاڵ-ی تێدایە، هەمووش پێنج کەسین، یەکە ژووری قوتابخانەکەیە کە (فەن) پیشان بدات، من بەدڵ حەز لە مۆزیقە دەکەم[1]، باوەجود لێرەدا ئەو دڵەم کە بەرامبەر بەئاو و سەوزایی و شاخ و داخ و مانگەشەو و-چاوئەندازی بەری بەیانیان و نیوەشەوان و سەر لە ئێواران- بەرامبەر بەمانە دەخرۆشێ، دەشێ خۆی بەتەرحێ دەربخا. لەبەر ئەوە بەشمشاڵ وازم ئەهێنا، عوودێکم کری، هاورێکانم یەکێکیان فێرم دەکا.

ئەمیش یەکێکە لە رۆژە خۆشەکانی ساڵی تازە، خوا پیرۆزی بکا.

(۱) مامۆستا باسی لە هەمو شتێ کردووە، تەنیا لەوەی کە لە هونەری مۆسیقادا شارەزایە و هەتا لە سلێمانی بەشداری تیپی مۆسیقاشی کردووە: یەکەم تیپی مۆسیقا لە سلێمانی لە ۱۹۲٦ دامەزرا، ئالەتەکان ۱٦ پارچەبوون، قوتابیانی مەکتەبی یەکەم تەمسیلیەکیان لە ماڵی شێخ باباعەلی پیشان دا، بەپارەکەی ئالەتەکانیان کری، ئەمەش ناوی بەشدارانی ئەو تیپەن لەگەڵ ئالەتەکانیان:

أ- شاکر فەتاح: کلارنێت

ب- سالح عەلی: ترامپێت

ج- فوئاد قەفتان: دەهۆڵ

د- ئەحمەدی میرزای عارف: هۆرن... هتد.

( بۆ زیاتر بروانە: ئەکرەمی مەحمودی سالحی رەشە، شاری سلێمانی، بەرگی دوو ۱۹۸۹ بەغدا. ل٤٣٦).

جا ئەمە پیشانی دەدات کە مامۆستا لە بواری مۆسیقاشدا شارەزا بووە و چالاکی نواندووە، کەچی لە یادنامەکانی سەردەمی منداڵیدا یا کوڕێتی... هیچ باسیان ناکات. لەلایەکی ترەوە مامۆستا (عوسمان شارباژێری) دەربارەی جوولانەوەی هونەری مۆسیقا لە سلێمانی چاوپێکەوتنێکی کردووە.. باسەکە دەڵێ:

«عەبدولواحید کوری حاجی مستەفا ۱۸۸٦-۱۹۷۳ کە لە سلێمانی لە دایک بووە، ئەفسەرێکی مۆسیقای عوسمانییەکان بوو، دوایی هاتەوە سلێمانی، تیپێکی لەسەر نۆتەی تازە دامەزراند، لە ماڵی خواجە ئەفەندی نزیک مزگەوتی گەورە: پەنجا قوتابییەکی هەبووە، لەوانە شاکر فەتاح، رەفیق چالاک... ئینگلیزەکان تێکیان دا، جا دوایی دێتە سەر قسەکانی مامۆستا:

مامۆستا شاکر فەتاح دەڵێ: ئەو تیپە ساڵی ۱۹۲٦-۱۹۲۷ بوو، کە شانۆگەری نیرۆن پێشکەش کرا، بۆی پارە کۆکرایەوە، چەند ئامێرێکی هەوایی مۆسیقای پێ کرا، مامۆستا عەبدولواحید حاجی مستەفا فێری دەکردین: کە لەو رۆژەدا مۆسیقالێدان عەیب بوو، بەڵام من یەکەمین کەسێک بووم چوومە تیپی مۆسیقاوە و ئالەتی -کۆرنێت قرناتە-م دەستدایە کە فێربیم، لە ئەندامانی ئەو تیپە: رەحیم کەریم، رەمزی قەزاز، جەمال و جەلال مەجید، فائیق زێوەر- بەختیاری شاعیر. پرسیم: ئەی رەفیق چالاک؟.

وتی: ئەختیر ئەو هاوتەمەنی ئێمە نەبوو. ل: ١٤٠-١٤١ - بۆ زیاتر بروانە: (کاروانی ۱۷۸٤-۱۹۸٤ی مۆسیقا و گۆرانی لە سلێمانی- عوسمان شارباژێری- رۆشنبیری نوێ، ژمارە ۱۰٦ ساڵی ۱۹۸۵ بەغدا).

## قوتابخانە ١٩٣٢/١/٩

ئیمرۆ قوتابخانەکەمان کرایەوە، من لە کووزی[١] پێنجە مام. بەئینگلیزی دەخوێنین، مامۆستاکانمان چواریان ئینگلیزن، ئەوانی تریان سووریەیین. ئەمساڵ لە لەندەنەوە پرسیارمان لێ دەکرێ[٢].

منیان لەگەڵ دە کەسی تردا خستۆتە پایزێ کە خۆم تاقی بکەمەوە. پێنج تەرح دەرسم وەرگرتووە:

١- ریازیات، حیساب، هەندەسە، جەبر.

٢- ئینگلیزی: بەهەموو لق و پۆپێکی بەرز و ئەوییەوە.

٣- عەرەبی: بەڵام هەر تەرجومە.

٤- فیزیا: بەهەموو کەرتێکیەوە.

٥- کیمیا: کیمیای Oldham

خوا هەڵناگرێ سەر مامۆستاکەمان و ئەوانی تریش لە ئینگلیزیدا زۆر لەگەڵمان خەریکن. بەتایبەت نووسین و هەڵبەستن.

(میستەر ناش) لە سێ شت کە بۆ ئینشا دابووینێ یەکێکیان ئەمەبوو: باسی ئەو شتانە بکە کە لەناو ساڵی ١٩٥٠ و ساڵی ٢٠٠٠دا دادەهێنرێن.

منیش ئەمەم بەشێکی زۆر خۆش هاتەپێش لەبەر ئەوە هیچیانم نەنووسی ئەمە نەبێ.

ناش کە خوێندییەوە گەلێ چاکێتی و خۆشێتی (شتە داهێنراوەکانی) پیشاندا، بەڵام گوتی: لە تاقیکردنەوەدا ئاگات لە خۆت بێ قسەکە مەخەرە ناو دوو کەسەوە. هەر لەخۆتەوە قسەیان لێ بکە.

چونکە من بیرەکەم وا پیشان دابوو کە دوو کەسن (ڕۆستەم و بارام)، لە کوردستانەوە بە فڕۆکەیەک کە بەئەلەکتریک دەڕوا بەشەش سەعات دەگەنە (نیویۆرک). خواردنیان بۆ ئەو ڕۆژە درێژە (سێ دەنک چێشت دەبێ)، لە ڕێ کە بە سەر بۆداپێستا[٣] تێپەڕ دەبن، دەبینن هاوینە. کەچی بە مەکینە باران لە ئاسمان دەهێننە بوون.

لەناو دەریای ئەتلانتیکدا چەند کەسێک دەبینن بە ڕووتی بەپێوە بەسەر ئاوەکەوە یاری دەکەن، پێتاوێکی کەشتی ئاساییان لە پێدایە، لە ژێریانەوە لە بنی دەریاکەدا کۆشکێک هەیە خەڵک کە لە ئەمەریکا و ئەورووپاوە دێن لەوێ لادەدەن.

پاشان نزیک بە ئەمریکا بە ناوچەی (پاپۆڕە ژێر ئاوینەی)[٤] ئەمەریکا دەگەن، کە ئەویش خانوویەکی گەورەیە لە بنکی دەریاوە.

(١) کووز: پۆل، وشەکە تورکییە بۆ (بەش، قسم)یش بەکاردێ.

(٢) مەبەستی ئەوەیە: پرسیارەکانیان لە لەندەنەوە دێت.

(٣) بۆدابست: پایتەختی وڵاتی مەجەرستان- هەنگاریایە.

(٤) تحت البحر

لە نیویۆرک بەئاسمانەوە خانووی (شێر و پاشا)[1] دەبینن کە لەلایەن (حکومەتی یەکبووی کوردستان - United state of kurdistan)ەوە نێرراوە تا فەننی خانوو دروستکردنی کورد لەو (وێنەگاه - معرض)ی عالەمەدا پیشان بدا.

کە دادەبەزن، دەچن لەو لەشە چلکنەیان بەتیشکی ڕۆژ کە بەسایەی مەکینەیەکەوە وای لێ دەکرێ پیاو پاک بکاتەوە، لە خانوویەکی شووشەدا خۆیان پاک دەکەنەوە. چای ئەو ڕۆژەیان بەسایەی (پرتەوی تیشکی ڕۆژ)ەوە دەکوڵێنن.

ئەو شەوە لە هەموو ئەمریکادا زەماوەندی یادکردنەوەی (ئەدیسۆن) دەبێ. لە ئاسماندا پەردەیەکی سینەمایی گەورە بەسایەی غازەوە دروست دەکرێ، وێنەی سێ دووریی تیا دەبینرێ.

کە پیاو لێی تێک دەچێ بزانێ ئەمە سینەمایە یاخود پیاوی ڕاستەقینەن لەوێدا یاریی دەکەن. سینەماکەی ئەمەندە گەورە دەبێ هەموو ئەمریکای ژووروو چاویان لێ دەبێ.

بەیانی (بارامیان) لە ڕۆژنامەی قسەکەردا هەواڵ دەخوێنێتەوە، لەگەڵ ژنەکەیا (مێردێ) بەتەلەفۆنی وێنەگر قسە دەکا. کوڕەکەی (هۆمەر) بانگ دەکەن، خۆی پیشان دەدا، کوڕەکەی گوێی لە جوولانەوە و گۆرانی باوکی دەبێ، هەتاوەکو چاوی لەو پۆلە مەلانەوە دەبێ کە بەئاسمانەوە دەبن؛ بەباوکی دەڵێ: بابە بەباڵەکانتەوە بفرە ئەوانە مەلن، لە بیرت نەچێ لەگەڵ ئەو مەلانەدا (نووسراوەیەکی گۆرانی قسەکەرم) بۆ بێنی.

ئێستە خوا ئاگادارت بێ بفرە، بەڵام بەیانی چێشتەنگاو نان ناخۆم هەتا تۆ نەیەیتەوە[2].

(١) ئەو خانووە لە کوردستانەوە گوێزراوەتەوە ئەمریکا.

(٢) ئەم جۆرە نووسینە پێشبینی نامێژەی مامۆستا، پراوپڕ چیرۆکێکی بیری زانستییە (الخیال العلمي) کە لەو سەردەمەدا ئاوا پێشبینی داهاتنی ئەو جۆرە ژیانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٥٠-٢٠٠٠دا کردووە؛ کورتکردنەوەی ماوەی نێوان کوردستان و نیویۆرک بۆ شەش سەعات، بارانی دەستکرد، خەڵکان بەسەر ئاودا، کە ئێستا وەرزشێکی باوی بەربڵاوە؛ ژیان لەژێر دەریادا، حکومەتی یەکبووی کوردستان - هەرچەندە حکومەتەکە یەکبوو نییە؛ بەڵام بەشێکی خەونەکەی هەر هاتۆتەدی، بەکارهێنانی تیشکی خۆر وەک وزە یا بۆ چارەسەرکردن، ساڵوەگەڕی ئەدیسۆن، پەردەی سینەما یا (شاشە)یەک کە وێنەکان سێ دووری (الابعاد الثلاث)یان هەبێ کە ئەوە وێنەی بەرجەستە (مجسم)ە ئێستا هەیە، ڕۆژنامەی قسەکەر و چۆن بارام باوکی تیا دەبینێ و هەروا باوکیشی کە دەقاودەق ئەمە (ئەنتەرنێت)ی ئەمڕۆیە، (نووسراوەی گۆرانی قسەکەر) کە پێشبینییە بۆ (سیدی کاسێت)ی ئێستا.

بەڕاستی بەم بەرهەمەی مامۆستا کە بەداخەوە هەر لێرەدا باسی دەکات و دەقەکەیم لەناو کتێبەکانیدا چاو پێ نەکەوت، دەتوانین داینێین بەیەکەم چیرۆکنووسێکی کورد کە لە بواری بیری زانستیدا نووسیویە و زۆربەی بۆچوونەکانیشی ئەمڕۆ هاتوونەتە دی.

## کۆمەڵە خۆشخوێنیی کوردی

لەم ڕۆژانەدا لەلایەن برایەکەوە (کۆمەڵە خۆشخوانیی موستەفا بەگی کوردی)م بۆ هات.

ئەمەش وەک براکەی (نالی) لەلایەن (کوردی و مەریوانی)یەوە (موستەفا زەکی سائیب و تاهیر بەهجەت)ەوە، دوو کوردی لاوەوە، لە چاپ دراوە. ئەم دووانە لە هەموو لایەکەوە خۆشخوانی کورد کۆ دەکەنەوە، من هەندێکم نالی هەندێکم کوردی و بەشێکی گەورەی سالمم بۆ ناردن. لەلایەن چەند لاوێکی کوردی تریشەوە یاریدەیان دراوە، وایان نیازە بەرە بەرە هەرچی خۆشخوانییەکی کوردی کۆنە لە چاپی بدەن.. خوا ئاگاداریان کا.

## زهور شوێر ١٩٣٢/١/٣٠

دەمێک بوو بەئاواتی هەناسەیەکەوەین ڕۆژ ناو جەرگی ئاسمان بکاتەوە، هەفتەیەک بەڵکو زۆرتریش باران چاوی لێک نەنابوو، ئیمڕۆ شەممەیە ئەوا ئاواتمان هاتەدی، سەر و پۆتەڵاکی درەختەکان زێڕین بوو، ئاسمان و دەریا شین دەکەنەوە، هەموو شتێ لە شوێنی خۆیایە. سبەینێ یەک شەممەیە، خۆش بێ یا ناخۆش بێ، نابێ بچینە دەرەوە چونکی ڕۆژی (سەر ژماردنی لوبنانە). کەواتە ئەم ڕۆژە خۆشە لەدەست بچێ؟ ئەم پیتە[1] بەبیری هەموو قوتابییەکی وریادا دەهات، هەر ئەوەندەمان زانی دوو ئۆتۆمبیلمان هێنا و سواربووین. لە خۆشیانا بەپێوە ڕاوەستابین، ئەوەندە گۆرانیمان ڕت هەتا ئەو نیو سەعاتە تێپەڕی، گەیشتینە (زهور شوێر)[2]. بەڵام چی؟ ئەمەیە دڵی هەموو کوردێکی بۆ دێتە خرۆش، دێیەکە بەسەر تەوقە سەری شاخێکەوەیە بەم دیوا دەڕوانی هەتا چاوت بڕ دەکا شاخ و شیو و دارستان و دێهاتە، بەو دیویشا دەڕوانی بەسەر بەیروت و دێهاتەکانی، دەریا و پاپۆڕەکانی... بەردەمت ئەتڵەمێن بەدرەختی سنەوبەر، دوو ئاسمان پێکەوە نووساون[3]، کە ئاوڕ دەدەینەوە، مەلایەک دەبینی سەرسپی خانووەکانی زهور شوێر، کیژ و کوڕی بڕوممانا -ئێمە- خاڵ خاڵی کردووە.

قەد مەپرسە ئەو دەمەمان بە چ تەرحێ ڕابواردووە، لێت ناشارمەوە ناتەواوی (ئاو و سەوزایی) کە دەمێک بوو جێگیر ببوو ئێستە لاچووە، ڕووی جوان، پەری ڕوو بەکراس و کڵۆجەی ئاڵ و واڵاوە کچە لوبنانی بەو دەستە ناسکانەیان ئەو بەفرە زیچوینەیان[4] تۆپەڵە دەکرد (بەڕاستی زیو بەلای یاقووتەوە جوانە). بەدەم زەردەخەنەیان بۆ دەکردین، بەچاو کێشیان دەکردین، بەدەستیش تۆڵەی چەند ساڵەی ڕەگەزی جوانیان لێ دەسەندینەوە.

(١) پیت: لێرەدا مەبەستی (قسە یا بیرۆکە)یە، نەک بەواتای ئەمڕۆ کە بۆ (حرف) بەکار دەهێنرێ.

(٢) هاوینەهەوارێکە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی بڕوممانا وە لەسەر (نهر الكلب) ناوەکەشی (ظهور شوير)ە لە دەشتاییەکانی ناوەوەی لوبناندا.

(٣) دوو ئاسمان پێکەوە نووساون: ئاسمان و دەریا کە لەو دامێنەوە لێیانەوە دیاربووە.

(٤) زیچوین: وەک زیو، چواندوویەتی بەزیو (زیوین).

ئینجا ورد بەردەوە: لە ڕۆژدا خۆشەویستی، لە ئاسماندا خۆشەویستی لە دەریادا لە سەوزاویدا لە بەفر لە جوانیدا. لەمانە لە هەموویدا هەر خۆشەویستییە و دەردەکەوێ.

هاوڕێکانم زۆریان هێشتا بەفریان چاو پێ نەکەوتبوو، شەڕە بەفریان دەکرد. ئینجا من -کوردێک- بێنە پێش چاوت، سەرنجی بدە چۆن ئازایەتیی کوردایەتی دێتە جۆش. بە چ تەرحێک شەڕە بەفریان لەگەڵدا دەکا!!

## جەژن

مانگی ڕۆژوو تەواو بوو، جەژن هات. لە هەموو لایەکەوە ناردنی جەژننامە دەس پێ کرا. لە پێشدا باران و بەفرێکی زۆرر باری، سەرمایەکی بێشومار دەستی پێ کرد.

بەڵام کە جەژن هات ئەوانە هیچی نەمان. ڕۆژ دەستی کرد بەهەڵاتن. بەڵام بەڕاستی جەژنی کورد نەبوو، دەبوو لە بریتی جەژننامە (پرسەنامە) بنووسرایە.

لە ڕاستیشدا ئەمە ڕووی دا: قوتابییە کوردەکان کە کوردی کوردپەروەر پیشان دەدەن بەهیچ کلۆجێ بەجەژنیان نەدەزانی.

هەروەکو لە پاردا یەک کەس جەژنە پیرۆزەی لە کەس نەکرد ئەمساڵیش لەسەر ئەو پێڕەوییە لە سەدا نەوەد و نۆیان بەڕێوەچوون[1]، ئەو لە سەدا یەکەش لەبەر ئاگاداری نەبوونی قوتابییەکە بووە.

لەناو ئەو لە سەدا یەکە چەند کەسێکی تیابوو جەژننامەیان ناردبوو بەڵام پێتێکی جوان بوو؛ ئەوەندە جوان بوو ئەوەندەیش کاریگەر بوو، چونکە لە دڵێکی وریا کارتێکراوەوە هاتبووە دەرێ.

شتی وا خۆشە، چونکی بەسایەی ڕۆژێکی واوە، بیرێکی پیرۆز، گیانێکی شیرین لەناو ئەوەی ڕۆستەمی زاڵدا بڵاودەکاتەوە، لەبەر شیرینی، چوارچێوەیەکم لەم نامەیەدا بۆ جیاکردەوە.

مایەوە خۆم! پارم بەناخۆشی ڕابوارد. لەبەر ئەوە بۆ کەسم نەناردبوو، پلاری مەلاکانم گەلێ تێ گیرا!

(١) ئەم جەژن نەکردنەی قوتابییە کوردەکانی ئەو کاتە بەهۆی لە دڵ دەرنەچوونی یادی ڕاپەڕینەکەی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ بەردەرکی سەرای سلێمانییە کە حکوومەت دەستێکی زاڵمانەی وەشاند و چەند کەسێکی کوشت و بریندار کرد و دەیانیشی لە گرتووخانەکاندا توند کرد.
لە ڕاستیدا ئەوە یەکەم جار بوو کە دەسەڵاتێکی بیانی لە شاردا ئاوا بەڕەقی مامەڵە لەگەڵ خەڵکەکەدا بکات و توندوتیژی بەکاربێنێ. بۆیە سام و ئاسەواری خەمناکی هەتا چەند ساڵێکیش دوای ئەوە لە مێشکی خەڵکەکەدا هەر بەرجەستەبوو، دیارە لەگەڵ بەرەو پێشەوە چوونی ڕۆژگار چنگاڵی تیژ و ڕەشی داگیرکەر زیاتر لە جەستەی گەلەکەمان دەچەقی و دەستی زیاتر دەچوو بەخوێنی ڕۆڵەکاندا، هەتا ڕادەی ئەمە گەیشتە تەفروتوناکردنی هەزاران بارزانی و ئەنفال و گازی ژاراوی ڕشتن بەسەر شار و لادێدا!!




«خاوەن ئەم کارتە (حاجی فەرەج بەگزادە) باوکی مامۆستا حامید فەرەجە خاوەنی
(ئەلف با)ی کوردی بۆ منداڵان و ئەفسەری پۆلیس کەریم زەندە»

قاچمی نەشکاند بەڵام دڵمی شکاند. نەک من هەموومان لە (گاور لایان کەمتر بووین)[1]، دیارە باوک و خزمانیشمان کە لەو بیرەدان بەچەندان سەرشکێنەیان کردین. بەڵام لەبەر ئەوەی لەم دەمەدا هیچمان بۆ ناکرێ بەبێ یاریدەدانی ئەو تەرحانە یاخود کە هیچ نەبێ بێڵن بکۆشین، بۆ ئەوانەی کە بیری دەمی (١١٠٠) پاش مەسیحیان هەیە[2]، جەژنانامەمان نارد، بەڵام بۆ کوردان یان نا، یان پرسەنامە!!

## کورد و کوردستان ١٩٣٢/٢/٢٨

لەم ڕۆژەدا لەلایەن هاوڕێیەکی دڵسۆزمەوە (کورد و کوردستان)م بۆ هات... بەڕاستی مێژوویەکی زۆر کەڵکدارە. (ئەمین زەکی بەگ) وەزیری ڕێگاوبانی عێراقی نووسیوەتی.

بەتەواوی باسی کوردی تێدایە، لە حەڵێکەوە (نادر شاە) هاتۆتە سەرتەخت تا ئیمڕۆ. جگە لەوە باسی (زمان، ڕەوشت و کۆمەڵ و ڕۆژنامان، خێڵاتی کورد) دەکا، ئەمە دووەمین جزمی (مێژووە گەورەکەیەتی) جزمێکی پار لە چاپ دا. ئەم مێژووەی لە نووسراوانی چەند زمانێکی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات، لە (٢٥٠) سەرچاوە دەرهێناوە، لە دواییەکەیدا ژیانی خۆیشی تیا نووسیوە.

خاوەنی ئەم مێژووە یەکێکە لە هەرە کوردە زیرەک و بەکارەکانی کۆن. لەگەڵ ئەوەشدا لە (٦٠)ساڵ تێپەڕی کردووە، هێشتا بۆ هاوزمانەکانی خۆی دەکۆشێ. ئەم یەکەم چاپەی (هەروەکو لەوی تریشدا کردی) داوە بەیانەی سەرکەوتن. دوو سێ مێژووی تریشی بەدەستەوەیە، خوا سەری بخا، یەکێکی وا لە کورد کەم نەکاتەوە.

(١) ئەمە ئەو مشتومڕە دەردەخات کە لە نێوان خوێندەوار و قوتابییەکاندا لەلایەک و چینی پیاوانی ئایین و باوکان و دایکان لەلایەکی تر، کە دیارە بەڕای ئەوان جەژن جەژنی موسوڵمانانە و نابێ ئەو ڕووداوانە کار بکاتە سەر بەشداریی نەکردنی. هەرچی بەرەی لاو و تازەکانیشە کوردایەتی لەلایەن زۆر پیرۆزتر بووە لە جەژنکردن و خۆشی پیشاندان. بەڵام لەوڵاشەوە مێردەزمەی داگیرکەر بەسەر وڵاتدا داسەپێنراوە.
(٢) زیادەڕۆییەکە بۆ ناونانی ئەوەی کۆن و کۆنەپەرستان.

## نامەیەک

من لێرە کەمم ڕۆژنامە دەست دەکەوێ کە باسی کوردی تیا بخوێنمەوە، لەبەر ئەوە دارا لە هاوڕێ کوردەکانم دەکەم ئاگادارم بکەن.

لە ١٩٣٢/٢/٣١ نامەیەکم بۆ هاتووە، بەکورتی ئەمەتا: (شێخ مەحموود بێ دەنگە، بەڵام ٤٠ ڕۆژ لەمەوپێش - جافر سوڵتانی هەورامانی- لەگەڵ ئێراندا تێکچووە، سەرشکەوت بەڵام لە هەردوولاوە - عێراق و ئێران- زۆریان بۆ هێنا، ناچار خۆی دا بەدەست عێراقەوە، ئیتر نازانم چی لێ دەکەن)[1].

دیسانەوە دەڵێ: (نزیکی مانگ و نیوێکیش لەمەو پێش -شێخی بارزان و لەشکری عێراق- تێک هەڵچوون، شێخی بارزان عەسکەرێکی زۆری کوشت، چەند مەترەلۆزێکی لێ داگیرکردن. عێراق ناچار ئاشتی کردەوە ئێستە لە شوێنی خۆیا دانیشتووە هیچ ناکا)[2].

١٩٣٢/٢/٣١

برای ڕاستەقینەت/ مەلا موحەمەد

قوتابی دارولموعەلیمین - بەغدا

## حەیدەری ١٩٣٢/٢/٣٠

ئەم کوڕە کوردی هەولێرە، ناوی سولەیمان داوەد کوڕی ئیبراهیم بەگی حەیدەرییە لە خانەوادە بەناوبانگەکانی کوردن. باپیری ئەمە سەرداری (یانەی سەرکەوتن)ی ئێستای کورد بوو، پێرار مرد[3].

ئەمیش وەک من قوتابییەکە لێرە، ئەم شەممەیە نومایشی ساڵانەی یاریکردن بوو. سولەیمان لە زۆریا

(١) هەر لەم بارەیەوە (ژیان) لە ژمارە (٣٠٥)ی ١٩٣١/١٢/٢٤ دەنووسێ: «حکومەتی عێراق دوو سریە عەسکەری بردە حدودی عێراق بۆ ئەوەی جعفر سلطان لە حدود خۆی نەشارێتەوە، ئێستاکە وضعی خراپە لەوێ، محاصرە کراوە لەلایەن حکومەتی ایرانەوە»

سەبارەت بەسلێمانیش، ئەمە دەقی بروسکەیەکی (متصرفیة)تە بۆ وەزارەتی داخلیە: «الناس أخذوا بزاولة أعمالهم، الحالة جيدة، الناس عرفت محاولات المشاغبين وصارت تمقتهم.

متصرف السليمانية/ الداخلية، رقم البرقية ٩١٥٦، ١٦ تموز ١٩٣١»

دیارە ئەمە دوای تەسلیمبوونی شێخ مەحموود و دوورخستنەوەیەتی بۆ خوارووی عێراق.

(٢) ڕاپەڕینی یەکەمی بارزانە، لە ١٩٣١/١٢/٩ وە لە شەڕی (بەرقی بەگ)دا هەشتا بارزانی توانیان هێزێکی عەسکەری حکومەت بەزێنن و ١٢٦ لاشەیان لە مەیدانی شەڕەکەدا جێهێشت، بەرامبەر (٥) شەهید لە کوردەکان. شەڕەکە بەسەرکردایەتی مستەفا بارزانیی ئەمر بووە.

(٣) شێخ الاسلام عثمانی: ئیبراهیم ئەفەندی ئەلحەیدەری لە ٣٠ مایسی ١٩٣٠ دوای ناهەنگی کردنەوەی یانەی سەرکەوتن لە بەغدا هەڵبژێررا بەیەکەم سەرۆکی یانەکە. داود حەیدەری کوڕی لە ١٩٣١/٤/٣ هەڵبژێردرا بەئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری یانە.

بەیەکەم دەرچوو. لەبەر ئەوە نیشانەیەکی نیوچە زیوینە -کابرایەکی دانیشتوو- یان پێ بەخشی.

کە هاتەوە بروگمانا -ئاش- لەناو هەموو قوتابییەکاندا ئازایەتی حەیدەری پیشان دا.

## نەهرولکەلب ١٩٣٢/٣/١



بەیانی زوو هەموو خۆمان ڕێکخست، نزیکی (٦٠) قوتابییەک بڕۆین بۆ نەهرولکەلب[١]. بووین بەدوو دەستەوە، دەستەیەکمان بۆ سەرچاوەکەی، دەستەیەکیشمان ڕێنگەکەی، من لە هی دووەمدا بووم، بەپێ بەسێ سەعات گەیشتینێ، ئەولا لە پاش ٦,٥ سەعات ئینجا گەیشتنە ئێمە.

بەڕاستی تەماشاگاهەکەی خۆش بوو. نزیکی بەدەریاکە لە گوێ زێیەکە چاخانەیەکی یەجگار ڕێکوپێکی تێدا دروست کرابوو، لە ناوەڕاستی ناومالی ئوتێلەکەدا حەوز و فوارەیەکی یەجگار جوان و نایابی تێدابوو.

هەموو لایەکی بەدار و درەخت داپۆشرابوو، دوو پردی لێ بوو، دوو لاپەڕە بەری[٢] حەلی ناپلیۆنی سێیەم جەنەرال (غۆرۆی) فرانسزی بەقەدی شاخەکەوە دیی. وەکو دەڵێن ئەو دوو شاخەی کە ناوەکەی لێ دێتە دەرەوە جێگای فینیقییەکانی کۆن بووە[٣].

## بروميه ١٩٣٢/٣/٢٤

لە پاش نووسینی نامەیەک بەدوای (عەبدولقادر حیشمەت)دا بەیانی زوو لە بەیروتەوە هاتە کنم، قوتابخانەکەمان تێدا نەمابوو، چوار کەس نەبێ. لەبەر ئەوە یەجگار سەغڵەت ببووم، کە ئەم هاوڕێ کوردە خۆشەویستەم هات یەجگاری دڵم ڕووناک بووەوە، هەر تاوێک بوو جلی دیدەوانیم لەبەر کرد، ترۆتفاقی سەیرانم ڕێکخست، بەخۆمان و وێنەگرێکەوە بەناو لالەزار و دار و درەختە سەوزەکانی

(١) نهر الکلب: ناوی ڕووبارێکە لە شاخەکانی ناوەوە ڕووە و ڕۆژئاوا لە باکووری بەیروتەوە دەڕژێتە دەریای سپییەوە، ئەو شوێنەی ئەمانی بۆ چوون کەوتۆتە باکووری ڕۆژئاوای بروگماناوە.

(٢) ئەم دەستەواژەیە: (دوو لاپەڕە بەری حەلی ناپلیۆنی سێیەم...) دەبوو ئاوا بووایە: دوو تاشەبەردی سەردەمی ناپلیۆنی سێیەم...)

(٣) لە (أطلس العالم)دا ئەو شوێنە وا دەستنیشان کراوە کە جێگای شوێنەواری گریکی و ڕۆمانییەکانە. (بۆ زیاتر: أطلس العالم، مجموعة أساتذة، مکتبة لبنان، طبعة جديدة، بيروت ١٩٩٨)

شاخەکانی بروکمانەدا دەستمان کرد بەڕۆین. زۆری پێ نەچوو گەیشتینە دێی (برومیە)، هەرچەندە سەرچاوەیەکمان دەست نەکەوت لە سەری دانیشین بەلام دێیەکە ئەمەندە خنجیلانە بوو، ئەمەند تەماشاگاهی جوانی هەبوو، لەوێ بەولاوە ئیتر جوولەمان بۆ نەکرد لەناو گوڵ و گەلا و سەوزاییدا، لە بن درەختی گۆنا گوندا، بەقەد بەردێکی زلەوە لەسەر چیمەنێکی نەرمونۆڵ هەوارمان دامەزراند. بەڕاستی جێی پیاوەتی بوو کە ژنێک لە یەکێ لەو مالانە هاتە دەرەوە، ڕۆژباشی لەگەڵدا کردین مەنجەڵێک ئاوی پاکیشی داینێ. هەتاکو ئەمەندە شیرین کرداربوو دەیگوت دەبێ ئێوە چا لێرە بخۆنەوە. ئاوەم هێنا، لەو کاتەدا هاوڕێکەم خەریکی ئاگرکردنەوە بوو، چایەکمان لێ لێنا کە تاقەتمان کرد ئینجا دەستمان کرد بەگۆرانی کوردی وتن، تاوێک ئەو گۆرانی دەوت تاوێکیش من شمشالم بۆ لێدەدا. بەڕاستی تەماشاگاکە هەر شتێکی تری دەویست تەواو بێ: ئاو و سەوزاییمان هەبوو[1]...، بەلام دەنگی شمشال ئەمەندە کاریگەر بوو لەگەڵ ئەو ڕەشەبا و ساردییەشدا سێ چوار پەری ڕووی برومیەی لە لانە کردە دەرەوە. هەرچەندە خۆیان لە ئێمە نەگەیاند بەلام لە دووری پەنجا هەنگاویشەوە بەتەواوەتی دیاربوو کە ئەو ئاوازە کوردییە شیرینە کاری تێکردوون: هەڵدەپەڕین، ڕادەپەڕین، هەرایان دەکرد، بەڕوویان دەگرتە یەک، لە کورتی بیرمەوە خرۆشیان لە ئەندازە چووبووە دەرەوە.

نانمان خوارد، هەندێ گۆرانی و شمشالی ترمان لێدا، تۆزێک باسی (کورد)مان لە نووسراوی کابرایەکی کلدانیدا (کە هەوڵی بۆ سەربەخۆیی گاورەکانی موسڵی داوە)[2] خوێندەوە، چایەکی ترمان بۆ

(١) مامۆستا مەبەستی لە (الوجه الحسن)ە، شاعیری عەرەب کە دەڵێ:

ثلاث يذهبن من القلب الحزن
الماء والخضراء والوجه الحسن:

هەر ئەمە لەلایەن مامۆستا مەلا سەیید موختار سەید عطاوە کراوە بەکوردی:

سێ شت لابەری خەمی ئینسانە
ئاوی ڕووبار و سەوزەی هەردانە
سێ هەمە لە هەموان کە گرنگترە
تەماشای زوڵف و ڕوومەتی جوانە

ئەم دوو دێڕە شیعرە لە مامۆستا (فاروق ڕەسوڵ یەحیا)وە وەرگرت.

(٢) مەبەستی بەطرێک (مارشەمعون ئیشای)یە کە بەدنەی ئینگلیزەکان ڕابەرایەتی نەسطورییەکانی دەکرد لە پێناوی دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆ بۆیان لە موسڵ و هەولێردا، بۆ ئەمەش ئینگلیز کاری دەکرد بۆ نیشتەجێکردنی دیان و نەسطورییەکانی هەکاری کە لە دیالی ئۆردووگای بۆ کردبوونەوە لە دەڤەرەکانی موسڵ و بارزان، هەتا هێزێکیشی بۆ دروست کردبوون بەناوی (لیڤی)یەوە. دوای هەراکەی ئابی ١٩٣٣ لە دهۆک و سێمێل حکومەتەکەی ڕەشید عالی گەیلانی بەپێی یاسایەکی تایبەت مارشەمعون و ماڵ و منداڵی لە عێراق دەرکردنە دەرەوە و هەتا ڕەگەزنامەی عێراقیشیان لێ سەندنەوە... دوا جار چووە ئەمریکا و لەوێ نیشتەجێ بوو هەتا کۆچی دوایی کرد.

لێنا، ئیتر خۆشی لەسەر خۆشی بوو. بەڵام بارەش و هەور و ترسی باران لەو جێگا خۆشەی هەڵکەندین، هەتاکو بەوەش وازی نەهێنا، ئەو وێنەیەی کە لەبەر دەرکی ماڵەکەی ژنەکەی لە پێشەوە باسمان کرد، گرتمان، باشی دەرنەهێنا. تێکی دا.

هاتینەوە بروممانا، گەلێ عودمان لێدا، یاریمان کرد، خۆ قسەی خۆشیش هەتا نزیکی ئێوەشەو لەگەڵ ئەو برا نازدارەمدا درێژەی بەست.

## بێروت ١٩٣٢/٣/٢٥

بەیانی بەخۆشی چوونم لەگەڵ (میستەر ناش)دا کرد، خۆمان ئامادە کرد، هەردووکمان چووینە (جامعەی ئەمریکان)، ئەو ڕۆژەمان لە بێروت ڕابوارد. لەم ڕۆژەدا خۆمان ئامادەی سەیرانێکی گەورە کرد: بچین بۆ شام بەعلەبەگ، تەرابلوس، بێنەوە بێروت.

## شام ١٩٣٢/٣/٢٦

بەیانی سواری ئۆتۆمبیل بووین، بەڵام شەستەبارانە و بایەکی توندی هەبوو، هەر ئەوەندەمان خۆش بوو گەیشتینە (عالیە)[1] ئیتر بەتەرحێک کردیە تەم و هەڵم پیاو ژێر پێی خۆی نەدەبینی، ئۆتۆمبیل لێخوڕەکە بەهەزار حاڵ دەیتوانی ڕێگاکە ببینێ. بەڕێگایەکی بەفر و باران و تەرزە و ڕەشەبادا دوو سەعات و نیومان ڕابوارد، پاشان گەیشتینە قەراغ شار، بەڕاستی شیو و دۆڵێکی جوان و شیرین بوو (دوسەر)یان پێ دەگوت. گەشتینە شام، ئینجا وەرە بەو ژانە سەرەوە چەقە چەق لەگەڵ خاوەن ئۆتۆمبیل بکە: لە بێروت پەیمانمان لیرەیەک بوو ئێستا بەلاساری خۆی لیرە و چواریەکێکی دەوێ، ئەمە ڕوویەک بوو لە کردەوەی سوریەیی؟!

نانمان خوارد، ئینجا تێکەوە بچو بۆ جێگا ناودارەکان: مزگەوتی ئەمەویان دۆزیەوە؛ گەلێک بەناویا گەڕاین، گۆڕی ئیمام یەحیای تێدا بوو، دیوارەکان بەکاشی سەوز و سوور و قسەی خوا ڕازابوونەوە[2].

مزگەوتەکەی ئەمەندەی گەورەبوو هێندە تەمەڵ و تەوەزەلی ئیسلامی تێدابوو، ناوەوەی زۆر پاک ڕادەگرن، هەتاکو لە دەرگاکەوە دەبێ پێڵاوەکانت داکەنیت یاخود پێڵاوێکی پاکی خۆیان لە پێ بکەی.

پاشان گەڕاین بۆ گۆڕی (سەلاحەدینی کورد)، کەوا دەبینین لە ماڵێکدایە حەوز و فوارەکی جوانی تیایە، بەهەر چوار لایدا درەخت و گوڵ بەرز بۆتەوە بەدەستە ڕاستدا هەیوانێکی بچووکە، لە دەرگاکەیەوە دەچیتە ژوورێ کە دەبینی ئەوا دوو گۆڕ لەبەرد دروست کراون، ڕووەکانی نیگارکراوە، لە دیوێکیەوە ناوی سەلاحەدین ئەیوبی هەڵکەندراوە، گۆڕەکە چوار قوتکەی جوانی هەیە بەدوانیانەوە زنجیرێکی پیادا

(١) هاوینەهەوارێکە لە شاخی لوبنان، خوارووی ڕۆژهەڵاتی بێروت، مەرکەزی قەزای (عالیە)یە سەر بەپارێزگای (جبل لبنان)ە. جێگای خلیسکاندنی سەر بەفرە لە زستاندا.

(٢) قسەی خوا، مەبەستی: ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانە.

هەڵواسراوە. بەنوچکەی گۆڕەکەیەوە کڵاوەکەی خۆی -کڵاو و میزەرێکی کوردانە- هەڵواسراوە، بەگۆڕەکەی کەشەوە کڵاوێکی وای پێوەیە، کۆڵەکەکان هەموو بەردی مەرمەڕن، لەم ژوورەدا دەرگایەکی بچووک هەیە دەتکاتە ژوورێکەوە پڕە لە کتێب، کە بەکتێبخانەی خۆی بەناوبانگە، دیواری ژوورەکەی بەهەمە ڕەنگە قسەی خوا و پێغەمبەر ڕازانراوەتەوە.

لەم شوێنەدا، لە پاش فاتیحە خوێندن بیرم لە ڕابوردووی خۆمان دەکردەوە کە چۆن بووین و پیاوی چۆنمان پێگەیاندووە، بەهاوڕێکەم گوت وێنەیەکم بەتەنیشت ئەم جێگە پیرۆزەی سەلاحەدینەوە بگرێ، گرتی، بەڵام حەیف!... دەرنەچوو.

لێرە هاتینە دەرەوە، دەستمان کرد بەگەڕان بەناو شارەکەدا، ئەولایە هەمووی خانووی کۆن کۆن و ڕووخاو بوو، بازاڕەکەی لە مەیدانی ماست فرۆش و دارفرۆشەکانی خۆمانی دەکرد، با هێندە تەپوتۆزی کرد بەچاوماندا وازمان لەو ناوە هێنا، خۆمان کردەوە بەئوتێلەکەماندا.

ئەو ئێوارەیە بەشێکی زۆر لە بازاڕەکانی شام گەڕاین، شەو چووینە (کشکش). بەڵام بازاڕەکەی شام بەگشتی لە شێوەی کۆن نەهاتۆتە دەرەوە، کۆڵانەکانی بچووک و تەسک و پیس و پۆخڵ، چێشتخانەکانی لە دووان بەولاوە هیچی وای تیا نییە کە پیاو بوێری نانی تێدا بخوا. جێگای سینەما و تیاترۆ تەمسیلی کە ئەمشەوە چووین یەجگار ناخۆش و ناڕێکوپێک بوو.

## سالحیە ۱۹۳۲/۳/۲۷

بەیانی بوو، هەروا هەردووکمان هێواش هێواش دەڕۆیشتین، گەیشتینە گەڕەکێک شەقامێکی ڕێکوپێکی گەورەی جوانی بەناودا دەڕۆیشت، لەمبەر و لەوبەریەوە درەختی لێ ڕوێنرابوو، حەوزێکی جوانی بچکۆلەی لە ناوەڕاستدا بوو، بەحەوزێکی گەورە دەورە درابوو، چوار لای ئەو حەوزەش بەگوڵ و سەوزایی نەخشێنرابوو، بەسەر حەوزە مەرمەڕەکەوە چوارچێوەیەک دروست کرابوو، بەسەرەکەوە گومەزێک بوو. بەچواردەوری چوارچێوەکەدا بەزمانی فرانسزی نووسرابوو: «یادگاری کاپیتانێکی فرانسزی». لەوێدا هەردووکمان یەکە یەکە وێنەیەکی خۆمان گرت، پاشان دووی شەقامەکە کەوتین، سالحیەمان تێپەڕ کرد، ئیتر لەوەدوا نە ڕێگای خۆشی ڕێکوپێک نە کۆشک و خانووی چاک چاکمان بەرچاو نەکەوت. ئەو ڕێیەی ئێمەی پیا دەڕۆیشتین ترامواشی پیا دەڕۆیشت و دەچوو.

سەرکەوتین، سەرکەوتین هەتا گەیشتینە بەرزترین خانووی شام، ئیتر لەوێوە هەموو شامت چاو لێ بوو، خانووەکانیان لە گڵ دروست کرابوو، بەڵام وەکو خەڵکی گەڕەکەکان دەیانگوت: ئەو تەرحە خانووانە گەلێک بەرگە دەگرێ. ئەو شوێنە گەڕەکی (موهاجرین)یان پێ دەوت.

بەوێمان(*) زانی گەڕەکی کوردەکانە، بەڵام ئەو نەبوو، لەبەر ئەوە بەسەر شاخەکەدا دەگەڕاینە خوارەوە،

(*) لە پێش ئێرەدا تووشی کۆشکێکی کۆن بووین بەنووسینی کوفی هەندێ شتی لێ نووسرابوو، کە پرسیمان وتیان: ئەمە حەلی خۆی بیمارستان بووە سەلاحەدین کردوویەتیەوە. (ش. ف)



نزیکی نیو سەعاتێک ڕۆیشتین گەیشتینە گۆڕی (شێخ موحیەدینی عەرەبی)[1]، ویستمان بچینە ژوورەوە، من هەندێ دەسەسڕیشم کڕی لەوێ بیکەم بەموفەرک بۆ مالەوەی بنێرم، بەلام لەو کاتەدا مردوویەکیان هێنا، لەبەر ئەوە پەکمان خست بچین.

دەمێکی کە ڕۆیشتین، خانوویەکی گەورەی کەمان پێ گەیشت، ئەمەی لێ نووسرابوو: «مدرسة الصاحبة - أنشئها ربيعة خاتون أخت صلاح الدين الأيوبي»[**]. ئەم شوێنە ئێستا قوتابخانەی کوردەکانی سالحییەیە بەلام بەفەرەنسزی و عەرەبی دەخوێنن. خەریکن نووسراوی مێژووی کوردیان بۆ لە چاپ دەدەن، قوتابخانەیەکی شەش ژوورییە.

لێرە ڕەت بووین ئیتر گەڕەکی کوردەکان دەستی پێ

(١) شێخ موحیەدینی عەرەبی: (أبوبكر محمد بن علي) ناسراو بە(ابن عربي) لە ١٧ی ڕەمەزانی ٥٦٠ - ٢٨ یولیە ١١٦٥ز لە شاری (مورسیە)ی ئیسپانیا لەدایک بووە. لە خێزانێکی بروەی خواناس، هەر لە بیست و یەک سالییەوە بووە سۆفییەکی ڕاستی پاک، بەتەواوی تەرکی دنیای کرد و بەگیان و دڵ ڕووی کردە خوا، دەستی دایە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی باس لە سۆفیگەری دەکەن و سەردانی شێخەکانی ڕێبازە سۆفییەتەکان، زۆری نەبرد لە ئەشکەوتێکدا چووە خەلوەوە و تەرکی خەلکی کرد، دوایی دەستی کردە گەڕان و نالوودەی ژیانی سەفەر و گەڕان بوو، بەولاتانی مەغریب و تونسدا هاتە میسر، لێرە لێی کەوتنە گومانەوە لەسەر بیروڕای (یەکبوون - وحدة الوجود) وەیا خاوەنی بیدعەیە و هەتا کافرە. کە لە ٦٠٤ک لە قاهیرە خوا ڕزگاری کرد، کەوتە ڕێگا بەرەو مەککەی پیرۆز، دوایی بۆ (موصل) و (قونیە) کە کتێبی (مشاهد الاسرار) و (رسالة الأنوار)ی تیا دانا، لە دیارترین قوتابییەکانی لێرە (صدرالدين القونيوی) بوو، لە ولاتی ڕۆمدا گەلێ شوێن گەڕا: قەیسەرییە، مەلاتییە، سیواس، ئەرزرۆم، حەڕان و دیاربەکر. لە ٦٠٨ گەیشتە بەغدا. زۆری نەبرد لەگەڵ (شهاب الدين عمر السهروردي) بەیەدەنگی یەکتریان دی، دوایی سەهرەوەردی وتی: «إن إبن عربي بحر الحقائق». لە ٦١١دا دیسان چووە مەککە، لێرە کۆمەلە شیعرێکی سۆفیەتی لە خۆشەویستیدا دانا بەناوی (ترجمان الاشواق)ەوە، لە ٦٢٠ کاتێ تەمەنی ٦٠ سال بوو هاتە دیمەشق، ئیتر تیایدا مایەوە هەتا لە ٦٢٥ک گیانی پاکی سپارد. إبن عربی لە ژیانیدا گەلێ کتێبی بەنرخ و بەبەهای لەسەر بیر و ڕێبازی داناوە: «الفتوحات المكية، تحفة السفرة، الأمر المحكم المربوط، كنة مالابد للمريد منه، مواقع النجوم، الأنوار، ذخائر الأعلاق...». بۆ زیاتر و کەمێ تێگەیشتن لێی بڕوانە: «أثنين بلاثيوس - إبن عربي، حياته ومذهبه ترجمة: عبدالرحمن البدوي، الناشر وكالة المطبوعات، كويت، ١٩٧٩».

(**) شێخ محیەدینمان لە دوای هەردووکیان پێ گەیشت. (ش. ف)

کرد، ئەوەندەی پێ نەچوو دەرگایەکی بچووکمان هاتە بەر، بەنووسینێکی فارسی و عەرەبی، بەڕەنگی سپی لەسەر تەختێکی بەردی سەوز بەزمانی تورکی و عەرەبی ئەمەی لێ نووسرا بوو:

تأریخ وفاة أحدهم ٦٣٧هـ

اسبو محل کراد ایوبیه ون اولیاء کرام حضر تلرنیک بچون بابا مرقد شریفیدر

هذا محل تربة الأشراف الأسـاد الأكراد الأيوبية قدس سرهم العزيز

جدد إظهار هذا المحل المبارك ١٣٤٤هـ

لە دەرگاماندا، کابرایەکی ڕیش سپی پشت کۆماوە هاتە دەرێ گوتی: فەرموون، بەکوردی زازا (ئەمنیش کوردم وەکو ئێوە، ئەمە گۆڕستانی پیاوە گەورەکانی کوردە کە هەموو لە نەتەوەی سەلاحەدینی ئەیوبین، فەرموو بێن سەیر کەن. چووینە ژوورەوە. کابرا گەلێ گوڵ و دار و درەختی لەو خانووە بچووکەدا ڕواندبوو، پیاو هەر حەزی دەکرد سەیریان بکات. سەرمان کرد بەژوورێکی بچکۆلەدا، دوو گۆڕی تیابوو، هەر ئەوەندەمان زانی کابرا سێ چوار مۆمی داگیرساند و کردی بەگۆڕەکەدا، کە دەبینین قاچێک بەهەر پێنج پەنجەکەیەوە دیارە، لە گۆڕەکە هاتۆتە دەرەوە، هەر چوار لاشی بەلۆکە تەنراوە، لێمان پرسی وتی ئەمە گۆڕی (موحەممەد ئەیوبە) ئەوی تریشیان هی (سالح ئەیوبە)، هەردووکیان پیاو چاک بوون. سەر کۆماری سەلاحەدین بوون لە شەڕی گاوراندا کوژراون. هاتینە دەرێ. قنگەلە فسیکمان بۆ دایەوە، کابرای کوردە قاوەی دەرخوارد داین. لەو حەلەدا گەلێ پرسیارم لە بابەت کوردەکانەوە لێ کرد، وتی: لێرەدا کە پیاوی زۆر گەورە هەبێت (جەلالەدین بەدرخان)[1]ە، نیوەڕۆ وەرنەوە دەتانبەمە کنی ئەو و کن (مەولانا خالید)[2] بۆ نووسراوەی کوردیم لێ پرسی هیچی نەبوو، نووسراوەیەکی لەدایکبوونی پێغەمبەر نەبێ

(١) جەلالەدین بەدرخان: جەلالەدەت ئەمین عالی بەدرخان (١٨٩٧-١٩٥١) لە ئەستانە لە خێزانێکی دەستدار هاتۆتە دنیارە، هەر لەوێ بڕوانامەی (حقوق)ی وەرگرتووە، دوای سەرکەوتنی کەمالییەکان فەرمانی خنکاندن درا بەسەر باوکی و سووریا و جەلادەت و کامەران، ئەمین پاشا و سووریا چوونە میسر، کامەران و جەلادەتیش چوونە ئەلمانیا و دەستیان کردە خوێندن تا هەشت ساڵ. لە ١٩٢٥دا جەلادەت خۆی گەیاندە ڕیزی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران. لە ١٩٣٠ هاتە سوریا و لێرەوە قۆناغێکی تێکۆشانی سیاسی و ڕۆشنبیری میر جەلادەت شێوەیەکی جیاواز لە جارانی وەرگرت. زوو لەگەڵ کۆمەڵێ تێکۆشەراندا (کۆمەڵەی خۆیبوون)یان دامەزراند، بەناوی د. بلەچ شێرکۆ وە کتێبی (القضية الكردية)ی لە قاهیرە چاپ کرد. لە ١٩٣٢/٥/١٥ گۆڤاری (هاوار)ی لە شام دەرکرد، بەر لەمەش (ڕوناهی) ناو بەناو بڵاو دەکردەوە، چونکە زمانەکانی فارسی و تورکی و عەرەبی و ئەلمانی و فەرەنسی و ئینگلیزی باش دەزانی، قاموسێکی کوردی- فەرەنسی چاپ کرد و زۆر نووسینی بەو زمانانە دەربارەی دۆزی کورد بڵاو دەکردەوە. لە ١٩٣٤-١٩٣٦ بووە مامۆستای زمانی فەرەنسی لە دیمشق، لە ١٩٣٩ بووە پارێزەری کۆمپانیای ڕیجی.

(٢) مەولانا خالید: (١٧٧٩-١٨٢٦) خالید کوڕی ئەحمەد کوڕی حسێن، لە هۆزی میکایلی جافن، لە قەرەداغ لەدایکبووە، پیاو چاک و زانا و پێشڕەوی ڕێبازی سۆفیەتی ناوداری نەقشبەندییە، لە قەرەداغ و سلێمانی خوێندوویە، لە مامۆستاکانی: شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی و مەلا مەحموودی غەزایی. لە١٨٠٥ لە شامەوە=

بەخۆشخوان بەزیان (شێوەزاری- ا.ب)ی زازا نووسرابووەوە: لەلایەن (احمد رامز) ناوێکی کوردەوە لە میسر لە چاپ درابوو، لە دواییەکەیدا ئەمە نووسرابوو: (پاش حمد و ثنا، تاە ژ بو خالق انام، صلات و سلام سر فخر انام، وکل انبیا، عظام، وآل واصحاب واتی کرام بی کو. خدی تعالی ژ مرا میسر کرد نشرا (مولدا) کردی: انجا نیتا من از کتب و رسائل کردی طبع و نشر بکم. رجا من اوە هرچی لجم وی کتابک کردی هیت، ژ فضل و احسانا خو، یا ژبو ناموسی و عیزتا قوم خو، ژ مرا بشینن، حتی کو از طبع بکن. پاشی دکل نسخا وی چەند نسخە، ون ژی ژیرا تقدیم دکم)

عنوان/ کردی زاده (احمد رامز) برواق السادة الاکراد بالازهر بمصر

لە کابرا جیابووینەوە، چووین نان بخۆین، منداڵێکمان دی، قسەمان لەگەڵ کرد کورد دەرچوو، هەندێ قسەمان بەکوردی لەگەڵ کرد، بەجگار زیرەک و سەربەستانە قسەی لەگەڵا دەکردین، لێمان پرسی تۆ قوتابیت؟ وتی: بەڵێ، حکومەت سێ قوتابی[1] بۆ کوردەکان کردۆتەوە بەلام بەعەرەبی و فرانسزی دەخوێنن، لە پڕ چاومان بەم نووسینە کەوت (مدرسة الأکراد الأمیریة للأناث)، کوڕەکە بەجگار کوردپەروەر بوو، ئەیوت: من چۆن کوردم خۆش ناوێ، ئەوان هەموو لە خوێنی منن، هەموویان لە شوێنێک لە دایک بوون کە کوردستان.. بەڕوویەکی خۆشەوە لێمان جیا بووەوە.

گەڕاینەوە لای کابرای، ڕیش سپی[*]، دوو وێنەمان لە ماڵەکەیدا گرت، بەلام بێ بەختی ئەمانیش وەک ئەوانی تر دەرنەچوون. هەر ئەوەندەمان زانی گەیشتین بەخانوویەک ئەمە لەسەر دەرگاکەی نووسرابوو: (نادي صلاح الدين الأيوبي)... لەوە ڕەتبووین زۆرمان پێ نەچوو نووسینێکی کەمان هاتە بەر (قهوة حيّ الأكراد الركبة)، لەوێوە چەند سەد گەزێکمان بەناو کۆڵانێکی بچووکی پۆخلا تەی کرد، خانووەکانی لەسەر شێوەی کۆن بوون، هیچ نیشانەیەکی ئەم دەمەی پێوە نەبوو، ئەو کوردانەی کە لەو ناوەشدا دیانن جلی کوردی خۆمانیان لەبەردا نەبوو، بەرگی سوورییان پۆشیبوو، ژنەکانیشیان هەر بەو جۆرە بوون، بەلام هەموو بەکوردی قسەیان دەکرد. لە شار دەرچووین، بەسەر گردێکی بەرزدا سەرکەوتین هەتا گەیشتینە گۆڕستانی لە تەوقەسەری گردەکەوە لە جێگایەکە هەموو شارەکەی لێ دیار بوو،

= چوو بۆ حەج، لە ۱۸۰۹ چووە بۆ هیندستان لەسەر دەستی شێخ عوبەیدوڵڵای دیهلەوی تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرتووە، لەو سەفەرەیدا گەلێ شارانی ئەفغان و ئێران گەڕاوە و پیاوچاکانی زۆر ناسیوە لە ۱۸۱۱ گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و ناوبانگێکی بەجگار گەورەی پەیدا کردووە، لە دنیای ئیسلامدا بەخواناس و سۆفییەکی دەست و دەروونپاک ناسراوە، لێرە کۆسپی تووش هاتووە و لەلایەن زانای گەورە شێخ مارفی نۆدێییەوە (۱۷۵۳-۱۸۳۸) بەربەرەکانی کراوە، ناچار سلێمانی جێدەهێڵێ و دەچێتە بەغدا و لەوێشەوە بۆ شام تا لەوێ کۆچی دوایی دەکات. مەولانا دەست و قەڵەمێکی بەتوانا و ڕەنگینی هەبووە، لە بوارەکانی تەسەوف و شەرع و زمان و شیعردا وێنەی کەم بووە، زۆر لەو بەرهەمانەی بەعەرەبی و کوردی و فارسین چاپ کراون.

(۱) لێردا مەبەستی (قوتابخانە)یە.

(*) ناوی ئیسماعیل ئەیوبە لە نەتەوەی سەلاحەدینی سوڵتانە. (ش. ف)

خانوویەکی چوارگۆشەی بچووک لە ناوەڕاستیدا گومەزێک بەرزبووەوە، ئەو شوێنە گۆڕی مەولانا خالید بوو، بوێژ و ئایینداری بەناوبانگی کورد[1]، دیوارەکەی بەناوی ئەوانەی هاتوونەتە ئەوێ ڕەشکرابووەوە. لەوێدا نامەیەکم وەرگرت.

لەوێ چەند قسەیەکم بەناوی خۆمەوە لە دیوارەکەی نووسی کە تکا بۆ گەلە قوربەسەرەکەی بکات[2] ئیتر لەوەدوا ڕاستەوخۆ ڕوومانکردە ماڵی جەلالەدین بەدرخان بەڵام هێشتا (٣٠) هەنگاوێک دوور نەکەوتبووینەوە کابرا وتی: وەرن گۆڕی بەدرخانیەکان ببینن، کە چووین گۆڕەکانیانمان دی. گورج ئەو ناوەشم هاتە پێش چاو: (شيخ الخاني بن شيخ احمد الخاني)، زۆر دوور نییە ئەم پیاوە کوڕی ئەو شێخ ئەحمەدە خانییە بەناوبانگە بێ کە مەم و زینی هەڵبەستووە.

هاتینە خوارەوە، وێنەیەکی گومەز و دیوارەکانمان گرت، ئیتر چووین بۆ ماڵ جەلالەدین.. بەڵام حەیف! لە ماڵ نەبوو، چووبوو بێروت، پیاوەکەشی کورد بوو بەزازایی قسەی دەکرد، گەلێ لەگەڵمان خەریک بوو بچین دانیشین، بەڵام نەچووین لە بریتی ئەوە هەردووکمان ناوونیشانی خۆمان بۆ نووسی دامانە دەستی کە هاتەوە بیداتێ. لەوێ سواری ئۆتۆمبیلێک بووین کابرایەک بەوەیتریانی دەوت: «بەخوا بەسایەی پیاوێکی گەورەوە ئەبێ بڕواناکەم لە قوتابخانەی شەو[3] ڕامبگرن[4]»، کابرا پێی وت: «بچۆرە کن جەلالەدین بەدرخان ئەو بۆت جێبەجێ دەکا، چونکێ لێرەدا دەستێکی درێژی هەیە» ئەم پیاوە وەکو کابرای ڕیش سپی دەیوت مانگانەیەکی گەورەش لە فەرانسییەکان وەرئەگرێ. منداڵەکەش دەیوت ئەوا لێرە هەوڵ ئەدا قوتابخانەیەک بۆ کوردەکان بکاتەوە بەکوری بخوێنن، مامۆستا و نووسراوی کوردیان بۆ دەهێنن. هەندێ ماندومان حەسایەوە ئینجا چووین شەقامی بەغدا و گەڕەکی گاورەکانمان بینی، بەڕاستی لە هەموو گەڕەکەکانی تر خۆشتر و پاک و خاوێنتر بوو.

## سێیەم ڕۆژ لە شامدا ١٩٣٢/٣/٢٨

نیمڕۆ هەندێکی تر بازاڕ و دوکانەکانی گەڕاین، بەشێکی لێدەرچی ئەوی تری گەلێ جوانبوو، هەندێ شتومەکمان کڕی، پاش چا خواردنەوەی دوا قاوەڵتی چووین خۆمان بشۆین، بەڕاستی جێی خۆشتنەکەی یەجگار پاک و خاوێن و فراوانبوو، دیوارەکانی، ناو فەرشەکەی بەبەردی مەڕمەڕ و کاشی جوان جوان ڕازانرابووەوە، بانەکەی لە بریتی کونێک وەکو لە وڵاتی خۆمان هەیە بیست سی کوتی تێدا هەبوو کە سەرشۆرکەکەی گەلێ ڕووناکتر و خۆشتر کردبووە. جوڕنەکانی بەردن، بەشێوەیەکی جوان تاشراون. ژووری تایبەتیشی هەیە، ئاوی سارد و گەرمیشی هەیە، بەڵام فراوانی ناگاتە هی سلێمانی. ئەوەندە هەیە ئەم پاکتر ڕادەگیرێ ئەویش هەر لەبەر ناوەکەیەتی و لەبەر چاودێری حکومەتیشە کە زۆر بەتەنگ

(١) ئەو گردەی کە مەولانا خالیدی لێ نێژراوە (گردی سالحیە)یە لەنێزیک دیمشق و ئیستا کەوتۆتە ناو شارەکە.
(٢) واتا پاڕاوەتەوە کە مەولانا تکا بۆ گەلەکەی بکات.
(٣) واتا (مدرسة الحرية)
(٤) ڕامبگرن: وەرمبگرن، دامبمەزرێنن.

خۆشوزەکان و لەشخۆشی شارەکەوەیە. کە پیاو دێتە دەرێ سێ جار پەشتەماڵەکەی دەگۆڕن، بەڵام ئەمەی لێ دەرچێ یان ئەگەر لای ئێمەش ئەمەندە حکوومەت بەتەنگیەوەبێ هیچ گومانی تێدانییە، سەرشۆرکەی سلێمانی لە هی ئێرە بەڵکو ئەم هەموو ناوە چاکتر دەبێ: چونکی ئەو جوانتر ڕازانراوەتەوە، ئاوی زۆرترە، فراوانترە کە پیاو دەتوانێ بەبێ ئەمەی هیچی بەسەربێ زۆری تیا بمێنێتەوە. لەشەودا چووینە سینەما، بەڕاستی جێگایەکی ڕێکوپێک و خۆشی هەبوو بەرامبەری هێنەکانی بێروتی دەکرد. شوێنەکەی هی فەرەنسزەکان بوو، بۆ قوتابی نیوە نرخ دەسێن، لە خواریشیەوە شوێنێکی خۆش هەبوو بۆ هەڵپەڕین - دانس کردن- بەڵام ئێمە هەتا ئەو شەوە پێمان نەزانیبوو لەبەر ئەوە بۆمان نەکرا بچینە ئەوێش.

## بەعلەبەک ١٩٣٢/٣/٢٩



بەیانی ئۆتۆمبیلمان گرت چووین بۆ بەعلەبەگ[١]، ڕۆژەکەی ساردبوو، تەم و تاریک بوو. لەبەر ئەوە ئەو دەشتە سەوزە جوانە ئەو شاخە سەرسپیانەمان بەتەواوەتی جوان نەدەهاتە پێش چاو، پیاو کە بەناو شەقامەکەدا دەڕۆیشت بەتەواوەتی تەماشاگای دەشت و شاخەکانی سلێمانی دەهاتەوە بیر چونکو زۆر لەو دەچوون. هێندەی نەمابوو بگەینە بەعلەبەک دێیەکی گەورەی جوانکیلانەمان هاتە بەر، هەتا خوا حەز کا جوان و شیرین بوو، (زەحلە)[٢] بەقەد دوو کەژ بەڵکو سێ کەژی گەورەدا ئاودامان هاتبووە خوارەوە. بەڵام جوانییەکەی لەوە دابوو خانووەکانی هەموو سپی بوون بەتەرحێک شاخەکەیان ڕازاندبووەوە، پیاو وای دەزانی هەموو دێیەکە یەک ماڵە یان لەسەریان نهۆمی تیا دروست کراوە.

(١) ماناى ئەوەیە لەو ڕۆژەدا گەشتەکەیان بۆ شام کۆتایی پێ هات و گەڕانەوە بۆ لوبنان. (بەعلەبەگ یان بەعلبەک) مەرکەزی قەزایە لە پارێزگاریی بیقاع، کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی لوبنان نێزیک بەسنووری سوریا، ناوەکەی لە نەسڵە فینیقییەکەیەوە هاتووە، لە سەردەمی سلوقیەکاندا بە(هیلیۆپۆلیس) بەناوبانگ بووە، واتا (شاری ڕۆژ)، ڕۆمانییەکان کۆشک و پەیکەری گەلێ جوان و بەبەهایان تیا بنیاتنا، ئێستاش ماون، لە ساڵی ١٩٥٥ەوە هەموو ساڵێ فێستیڤاڵێکی نێودەوڵەتی هونەری تیادەگێڕێ: لەنێو ئەو پایە و ستوونە مێژووییە جوانانەدا.

(٢) زەحلە: لەسەر ڕێگای بەعلبەگە، مەرکەزی پارێزگای بیقاعە، لە ڕۆژهەڵاتی لوبنان، شارێکی سیاحیە و گەشتیاران ڕووی تێ دەکەن، وا لەسەر ڕووباری (بەردونی) بەتریی ڕەش و دروستکردنی شەراب و نارەق بەناوبانگە.

بەناو ئەم خانووانەدا درەخت و گوڵ و دار و بەردی شاخەکە ڕازابووەوە. لەوێ ڕەت بووین نیو سەعاتێک ڕۆیشتین، گەیشتینە دێیەکی بچووکی خنجیلانە، لەگەڵ بچووکیدا خانوو و ئوتێلی باش باشی تێدا بوو، چۆنی تێدا نابێ؟ بۆ هیچ ساڵێک لە (١٢٠٠) کەس کەمتر هەیە بچن بۆ بینینی ئەو شوێنە؟ ئایا خەڵکی بەعلەبەگ، حکوومەتی لوبنان لەوانە کەمی دەس دەکەوێ؟

لە ئوتێلێکی باش لامان دا، گەلێ جوان ڕازابووەوە، هی خێزانێک بوو یەجگار نازکانە بەدەور و پشتماندا هاتن، هێشتا دانەنیشتین ژنێکی ژیر و لەسەرخۆ هاتە کنمان و دانیشت، باسی قوتابخانەی هێنایە پێشەوە گەلێ میوان نوازی پیشاندا، ژنی خاوەن ئوتێلەکە بوو، بەلام باسی کابرای وێنە فرۆشم قەت لەبیر ناچێتەوە، هێشتا لە ئۆتۆمبێلەکە سەرمان نەهێنابووە دەرەوە، سەبەتەیەک وێنەی بەعلەبەگی نایە بەردەممان، پێمان گوت ئێستا نا، تۆزێ وازی نەهێنا، نەگەیشتینە ئوتێلەکە گەیشتە سەرمان، لەوێش ڕزگارمان بوو لە دەستی هەتا شتومەکەکانمان ڕێکخست، دیسان هاتەوە سەرمان، بەناچاری لێمان کڕی، ئەگەر بەوە وازی لێ هێنابنایە باش بوو، ئەمجا داوای ئەوەی لێ دەکردین بمانبا بۆ سەیری (هەیکەلەکان)، پێمان وت: حەلێکی کە. جگەرەکێشێکی پێ ئەچوو پەیدا بووەوە، هەمیسان لە خۆمان دوور خستەوە، بەکورتی بیبڕمەوە سێ جاری کە هاتەوە سەرمان، دوایی پێمان گوت: ئێستە نازانین کەی دەڕۆین، ئەویش وتی: کەواتە هەر لەناو چاردەکێکدا جارێک سەرتان دەدەم، لە کاری خۆی نەکەوت، لە ڕێگاشدا سێ چوار جارێک پێ شوێنی هەڵدەگرتین، دەهاتەوە بەردەممان کە لەگەڵیدا بچین بۆ ئەوێ، ئیتر وەڕس بووین، بەدوو قسە (چووین!... ئیتر تۆمان ناوێ) لە کۆڵمان بووەوە. وەنەبێ هەر ئەم وابێ، خەڵکی لوبنان و سوریە زۆریان لەم بەرگەدان[1].

ئەو ڕۆژەمان لە تەڕ و تووشی و ڕەشەبادا ڕابوارد، لەبەر باران بۆمان نەکرا بچین سەیری ئاسارەکان بکەین، بەلام دێیەکە هەموو گەڕاین، بەیانی گەلێ خۆشی کرد و لەبەر ئەوە یەکسەر چووینە کن هەیکەلەکان، لەوێ نۆبەچی لەبەر دەرگاکە ڕاوەستابوون، یەکی لیرەکی سووریەییان بۆچوونە ژوورەوە، ئەو لیرەشیان بۆ پیشاندان لێ سەندین، بەڕاستی کابرا گەلێ قسەوباسی لە بابەت بەعلەبەگەوە بۆ کردین، ئێمەش وەکو قوتابییەکی گوێ ڕادەر لەبەر دەمیدا وەستابووین، لەپێشەوە قەڵەم و کاغەزم بەدەستەوە گرت، هەرچی لە دەم دێتە دەرەوە بینووسم.

پاشان تەماشام کرد نامەیەکی گەورەی پێویستە، کاری دووپەڕە و سێ پەڕە نەبوو... وازم هێنا. لە ڕاستیشدا ئەگەر باسی ئەم بینینەی بەعلەبەگ بەتەواوەتی بکەم بەسەدان لاپەڕەم پێویستە ڕەشی بکەمەوە، بەلام بەکورتی ئەمەیە: «بەعلەبەگ شارێکی فینیکییەکان بووە، بەناوی (بەعل) خواکەیانەوە مزگەوتێکیان[2] تیا دروست کردووە، پاشان یۆنانییەکان هاتوون بەتەواوەتی بردوویانەتە ڕێزی کەنشتەکانی خۆیان.

(١) خەڵک و دانیشتووانی ئەو وڵاتانەی دەرامەتیان لەسەر گەشتیارانە. ئەم جۆرە کار و ڕەفتارانە لەلایان ئاساییە، بەتایبەت ئەگەر وڵاتەکەیان لە ڕووی کانزا و پیشەسازییەوە دواکەوتوو کەم دەست بێ.
(٢) ڕاستتر وایە کە: پەرستگایەکیان تیا دروست کردووە.

کۆشکی هێنده گەوره و بڵند، هەیکەلی هێنده جوان و خنجیلانه، کاریکی هێنده وردیان تێدا کردووه، لەم دەمەشدا نەک لە بەرد لە گڵیش شتی وا بەگران پێک دێت... دوو هەزار ساڵ بەسەر دروستکردنی ئەو پەرستخانەیەدا ڕۆیشتووە کەچی هێشتا بەشی زۆری وەکو خۆیەتی، هێشتا بەشی زۆری هەیکەلی خواکانیان وەکو خۆی ڕەنگین ماون. ئەو دەمە ڕۆمەکان بۆ هەر شتە خوایەکیان هەبووه، لەبەر ئەوە لە هەیوانی کەنشتەکەدا بەبێ سەربانەکەوە بەریز هەیکەلی هەموو خواکانیان لەبەری هەڵکەندووه، پلیکانەیەک بەپێنج شەش پله و ده پانزه گەز درێژییەوە هەمووی لە یەک بەرد هەڵکەندراوە.

وای هەیە پێنج گەز درێژه، دوو باڵی پیاو بەقەدیا نایەتەوه، لەگەڵ ئەوەشدا لەیەک بەرد داتاشراوه. سەری هەر پایەیەک سەرە گایەک یان سەرە شێرێکە کە باران باریوە ئەو ئاوە لە دەمیەوە هاتۆتە خوارەوه. نەخش و نیگاری بەعلەبەگ لە نووسین نایەت، ئەگەر یەکێ بیەوێ بەتەواوەتی لە بەعلەبەگ بگات، نووسراوەی تایبەتی، چوارسەد لاپەڕە هەیە، ئەوە بخوێنێتەوە ئینجا تێدەگا.

لە پاش دەرکەوتنی عیسا (سەلامی خوای لێ بێ) ئەوێ کراوە بەکەنشتەی ئەو ئایینە، کە ئیسلام هاتوون، هەر لەو پایە و بەردانە مزگەوتیان دروست کردووە بەڵام بێ جوانی و ڕێکوپێکی، مزگەوتێکی سەلاحەدینی کوردیشی تێدایه.

ڕەنگە خوێندەواری ئەم نامەیە حەز بکا تۆزێ پێشکەوتوویتی عەرەب و ڕۆمی ئەو دەمەی بۆ پیشان بدەم: عەرەب چوون لەبەر سێ لوولە ئاسن ئەو پایە بەردە گەورانەیان تێک و مەکان داوه، ئەو نەخش و نیگارانەیان سەراپا -هەندێکی نەبێ- شکاندووه. ئەو دیوارە ڕێک و پێکەیان هەڵکۆڵیوه وەک قوڵفە گۆزە کونیان تێدا کردووە بۆ بەستنەوەی وڵاخەکانیان!!، جێی نوێژی گاورەکانیان بەپیسایی حوشتر و کەر و گاکانیان ڕازاندۆتەوه!!...

لەوێ دەرچووین، وێنەیەکمان لە مزگەوتێکی ئیسلامیدا کە لەو بەردانە دروست کراوە گرت. گەلێکی کەشمان گرت، بەڵام لە هەموویان بێ بەخت بووین. شوێنێکی زۆر جوانی کەمان مابوو (رأس العین)یان پێ دەوت، ئەویشمان دی، ئیتر کارمان لە بەعلەبەگ نەما، چووینەوە بیروت.

گەڕاینەوە بیروت، لەوێ بەلای (بوحمدون) (عالیة، عصفوریة) و گەلێ دێی تردا ڕابواردین، هەمووی خنجیلانه، جوان، ڕێکوپێک و پێشکەوتوو بوو، چۆنها ئەگەر شارەکانی خۆمان بەو پێیە وا ڕێکوپێک بێ. لە بیروت سێ ڕۆژی تر لای عەبدولقادر ئەفەندی مامەوه، گەلێ کوردانە برایانە پێکەوە خۆشمان ڕابوارد. لەگەڵ ئەوەشدا هەشت ڕۆژ پێکەوە بووین و دیسانەوە دەستگوشینی جیابوونەوەمان لە ئاهێکی قووڵی کانی دڵ، لە دڵتەنگییەکی چەند سەعاتی ڕزگاری نەبوو.

## جەژن

لەبەر گێژی و دڵی هەمووان هیچمان پێ نەکرا، ملکەچ کردن نەبێ، چونکی مێشکی ئەوان لەگەڵ مێشکی کۆمەڵی لاوان لەم تەرحە شتانەدا بەتەواوەتی جوێیه. لەبەر ئەوە ناچاربووین بۆ ئەمەی دڵیان نەڕەنجێنین -کە بۆ ئیمڕۆ بەبێ یاریدەی گەل هیچمان بۆ ناکرێ- کارتی جەژنە پیرۆزەی بەهەموو لایەکدا

بڵاو بکەینەوە. بەڵام لەم چاردا بەڕاستی کورد هەنگاوێکی گەورەی ناوە: کارت لە بووک جوانتر ڕازاوەتەوە. بەنووسینی لاتینی و کوردی لێی نووسراوە (جەژنتان پیرۆزبێ)، لە پشتەکەی بەلاتینی نووسراوە (جەژنە پیرۆزەی جەژنی قوربان، لە ناوەوەی وێنەیەکی جێگار سەربرینەکەی ساڵی ١٩٣٠ سلێمانی و عەرەبەکانی تێدایە[1]، لە پشتەوە بەگوڵێکی سوور بەستراوە. بەڕاستی کارتێکە هەموو کەسێک ڕادەکێشێتە سەر بیری ئەوانەی دەیانەوێ بەلاتینی بنووسن. لە گۆشەیەکی بەسامیشەوە ئاگری کوردایەتی بەردەداتە دڵی هەموو کوردێک، وەنەبێ ئەم لە قوربانەدا دەستی پێ کرابێ، بەڵکو ئەم تەرحە نووسینە بە(جەژنی نەورۆزی کورد) سەری بڵند بوو، گەورە هاتە پێش چاوی دۆست و بێگانە، ئەو بەلاتینییەکی پەتی دوو خۆشخوانییەکەی حاجی تۆفیقی - پیرەمێردی لێ نووسرابوو. بەم بۆنەیەوە بۆ دڵخۆشیکردنی براکانم سەیری سەرسوڕمانی عەرەب و بێگانەکان دەگێڕمەوە: هاوڕێیەکی جوولەکەم بەزۆر کارتێکی نەورۆزی لێ سەندم. بەڵام وای زانی ئەڵمانییە، هەتا پێم گوت. ئینجا دار و بەردی قوتابخانەکە ئەما ئەو جوولەکەیە پیشانی ئەدا. نەک ئەو گەلێکی کە داوایان لێ کردم، مامۆستاکان بەتایبەتی ئینگلیزەکان سەریان لەمە سوڕما وە پیرۆزباییان لێ دەکردم -دیارە دوژمنەکان تەقیان پێ دەکرد-.

## کورد و بێگانە

کورد ناسرەوێ هەتا خۆ لە دەست بێگانە ڕزگار نەکا - (خۆیبوون)

لە عێراق: حەلی خۆی تۆزێ باسی هەڵسانی بارزانمان کردبوو، ئەو حەلە کەم کەس بیستبووی. بەڵام ئێستا ڕۆژنامە نەماوە لە دنیادا لێی نەنووسێ، لەمانە هەندێکیان بەدەستێکی پیس قەڵەم دەگرن، بەڵام پێویستە ئەگەر دەنگێکیش بێ لەناو ئەو دەنگە چەوتانەدا دەنگی ڕاست و ڕەوانی خۆی بنوێنێ.

ئەوە ڕۆژنامەی (الندا،)ە کە لە سوریە دەردەچێ لە ڕۆژی ١٩٣٢/٤/٢٢دا باسی ئەو هەرایە بەتەواوی دێنێتە پێش چاومان دەڵێ: «شەڕ خراپ دەست پێ کراوە. دەستی شێخی بارزان هێندە بەهێزە هەرچی لەشکری عێراق و بەشێکی پۆلیسی هەیە لەگەڵ فڕۆکەی ئینگلیزەکان تا ئێستا نەیتوانیوە تەنیا سەرکەوتنێک سەربکەوێ بەڵکو هیوای عێراق زۆر کزە کە بتوانێ ئەم هەڵسانە بکوژێنێتەوە هەتاکو بۆی هەیە بەتەواوی هێزی شەڕکردنی لەناو بچێ.

تا ئێستا ٩٥ کەس کوژراوە ٢٠٠ کەس بریندار لە عەسکەرەکە پەیدا بووە. فڕۆکێکی ئینگلیزی بەسەر کۆمارێکی گەورەی (ڕوبنسن) شکا و بریندار کراوە.

ئینگلیز لەمە زۆر پەشۆکاوە: ئەوا لە تاران لەگەڵ ئێراندا، لەگەڵ تورکیا لەگەڵ عەسکەری عێراقیشدا پشتیان بەستووە تا ئەم هەرایە بکوژێننەوە. شێخی بارزانی ئەمەندە خۆی قایم کردووە لەوانەیە هیوای سەرکەوتنی لێ بکرێ». ڕۆژنامەکە دەڵێ: «دوو وەزیری کورد لەسەر ئەم خراپییەی حکوومەتی عێراق داوای دەرچوونیان کردووە لە کارەکەیان».

(١) وێنەی بەردەرکی سەرای سلێمانی کە ڕووداوی ٦ی ئەیلوولی تێدا ڕووی دا.

لە تورکیا: ئەمجارەش بۆ جێ پێ لێژکردنی تورک دیسانەوە کوردەکان لە سنووری تورکیادا هەڵساونەتەوە. بەڵام وەکو دەرکەوتووە ئەرمەنیشیان لەگەڵدایە.

سەرداری هێزێکی گەورەی کورد لەسەر ئەوەی یاریدەی حکومەتی تورکی داوە کوژراوە. حکومەت بەجگار لە پرسشایە ئەم کوژەرەی بدۆزێتەوە، وا دیارە کوژەری ئەم پیاوە نێراوەی دەستی کۆمەڵی خۆیبوونی کوردبێ.

## تەمسیل لە کۆیسنجەق (٢٠ی نیسانی ١٩٣٢)

کۆمەڵی مامۆستاکان هەوڵێکی گەورە ئەدەن بۆ پێشخستن و چاککردنی زمانی کوردی قوتابییەکان، لەبەر ئەوە کۆمەڵێ (وتە - خطبة) و (لاساییکردنەوە - تمثیل) لە قوتابخانەی کۆیسنجەقدا دامەزراوە. لەم هەفتەیەدا چیرۆکێکی زۆر خۆش و کەڵکەوەریان لەبەر چاوی خەڵکی شارەکە بەناوی (کچی کوردستان)ەوە نواندووە.

بەکورتی چیرۆکەکە باسی کچێکی کورد دەکا لەگەڵ ئەوەشدا زۆری باوک و کەسوکاری بەسەرەوە دەبێ کە شووی پێ بکەن بەپیاوێکی دەوڵەمەند، خۆی دەرباز ئەکا، خۆی دەخاتە ناو ئەشکەوت و رێگاوبان و برسێتییەوە تاکو دەستپیسی لەگەڵ ئەو دۆستە بێ پوولەیدا ئەکا. دوایی خوا لە پشتیەوە، بەئارەزووی خۆی دەگا... سێ رۆژ ئەم نواندنە نواندراوە. وتەی باش لەلایەن عەبدولخالق ئەفەندی سەر مامۆستا و مەلا موحەممەد ئەفەندیی کۆییەوە دراوە.

## هەرای بارزان (٢٢ی نیسانی ١٩٣٢) ،الفداء،

ئەمجارە بەجگار گڕی هەراکە کڵپەی سەندووە چەند شەڕێکی گەورە بووە، لە هەموویدا کوردەکان سەرکەوتوون، بەڵام لە ١٦ و١٧ی نیساندا فڕۆکەکان بەخۆیان و بۆمبا گەورەکانیانەوە کەوتنە کار، وایان لێ کردن کوردەکان لە دەشت و دەر لایان دا چوونە سەر شاخ و ناو ئەشکەوتەکانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا توانیان سێ فڕۆکە لە کار بخەن. لەعەسکەریش کوژراو ژمارەی گەیشتۆتە ٣٠٠ کەس.

خەستەخانەکان پڕ بووە جێگایان پێ تەنگ بووە، لەبەر نەخۆش، بریندارەکانیش هەر باسیان ناکرێ، جگە لەوەش وەکو لە ناوچەی هەراکەوە بەدزییەوە زانراوە، کوردەکان چوار تۆپی مەترەلۆز و دوو سەد تفەنگ و کۆمەڵێکی گەورە کەلوپەلی عەسکەری و دوو سەد باری ئێستر فیشەکی مەترەلۆز و تفەنگیان لە عەرەبەکان داگیر کردووە. جگە لەوەش پیاوەکانی شێخی بارزان چوونەتە سەر دوو تۆپی گەورەی عەسکەرەکان، گوللەکانیان لێ دەرهێناوە. هەتا دەمێکی دوور و درێژ پەکیان خستوون بەڵام زیانی کوردەکان بەتەواوەتی دیار نییە. سەیر ئەوەیە ئەو تفەنگانەی بەکوردەکانە هەمووی هی بۆلشەویکی کە وا دیارە بۆلشەویکی لەوێشا خۆی جێگا کردبێتەوە.

شێخ ئەحمەد لە کەلوپەلی شەڕکردندا بەشی دوو ساڵی لە پێشەوە ئامادە کردووە، تفەنگی لە تورکیاوە لە هێزی کوردەکانی ئەوێوە بۆ دێ، هێزی دەرسیم زۆر یاریدەی دەدا، تورکەکان کە بەمەیان زانی

لەشکریان نارد کە پەکی ناردنی ئەم تفەنگانە بخەن. شەڕێکی گەورەیان بوو. لە تورکەکان (٤٠) عەسکەر کوژراوە. سەرکەوتنی شێخ ئەحمەد کارێکی وای کردۆتە دڵی هۆزە کوردەکانی تر زۆر دوور نییە هەموو بەم زووانە لە دەوری کۆببنەوە. بەڵام بۆ سەرکەوتنی شێخ ئەحمەد لەم ڕۆژانەدا هیوایەکی زۆر بەهێز نییە؛ چونکی ئینگلیز بەهەموو هێزیانەوە (هەروەکو ستێر هەمفری لە کۆمەڵی گەلاندا بەئاشکرا وتوویەتی) هەوڵ بۆ ئەوە دەدەن عێراق بخەنە (عوسبەتول ئومەمەوە) لەبەر ئەوە بەهەموو هێزێکیانەوە تەکان دەدەن ئەم ئاگرە کوردییە بکوژێننەوە.

## مەلیک فەیسەڵ

قوتابییە عەرەبەکان لە بروممانا زەماوەندێکی گەورەیان بۆ هاتنەوە یادی لەدایکبوونی پاشای عێراق ڕازاندەوە. هەر قوتابییەک کارێکیان دابووە دەست، لەبەر ئەوە داوایان لە منیش کرد کار و فەرمانێکیان بۆ وەرگرم، لە عەرەبەکاندا گەلێ هاوڕێی خۆشەویستم هەیە، لەبەر ئەوە بەئاسانم نەزانی گورج بەڕەپەرچیان بدەمەوە. هەندێک بیرم لە شوێنی خۆم کردەوە، کوردێک لە جێگای مندابێ بۆچی جەژنی عەرەب بەجەژنی خۆی بزانێ؟ بەیداخی عێراق بۆ من داوەشێن نییە بیکەم بەبەرۆکما؟ باشە ئەگەر ئەمە نەکەم دەبێ ۳۵ قوتابی و هاوڕێی خۆشەویست لەخۆم بکەما. ئایا ئەمە بۆ من ناخۆش نییە؟

بەڵام کورد و بەرزێتی کوردایەتی لە هاوڕێیەتی گەورەتر نییە؟ لە پێناوی کورددا هەزار هاوڕێ دەخەمە ژێر پێمەوە!! بەم تەرحە قسەم لەگەڵ خۆمدا دەکرد... وە ئەم قسەی دواییەمش (لەپێناوی کورددا هەزار هاوڕێ دەخەمە ژێر پێمەوە) پێڕەویم بوو. ئیتر هەرچەند ڕەخنەیان لێ گرتم و ڕوویان لێ ترش کردم بەهیچم نەزانی، ملم بۆ ئەو بەندگیەتییە کەچ نەکرد!!

(لە پەراوێزی ئەم لاپەڕەیەشدا و لە پەنا ئەم دێڕەی دواییەوە ئەم سەرنجەشی نووسیوە، ا.ب):
هەروەها هیچ کوردێکی کەشم نەدی یاریدەیان بدات.

## گەڕانەوە ۱۹۳۲/٦/۱۸

لەم ڕۆژەدا دەستی هەموو مامۆستایان و قوتابیان و ڕەنجبەرانی قوتابخانەی بروممانای ڕەنگین گوشی، گەڕامەوە بۆ وڵاتی خۆم. دوو ڕۆژ لە بێروت و یەک ڕۆژ لە شام و چوار ڕۆژ لە بەغدا مامەوە. لە بەغدا هەموو برا کوردەکانم بینی، کۆمەڵێکی گەورەیان لە (دار المعلمین) دامەزراندبوو. پووڵێکی منفەعەتیشیان کۆ کردبوو، مەبەستیان یاریدەدانی هەژارەکان بوو، دەستی زۆر داماوی کوردیان بەو دراوەیان گرتبوو، لە ناوەڕاستی ساڵدا پیانقۆیەکیان[1] کردبوو، ئاوازە (غەرامەفۆن)یەکی باش بۆ بیدەوبستێنەرێکی[2] کورد (عەبدوڵڵا لوتفی بەگ) دەردەچێ، ئەمیش ئاوازەکە پێشکەش بەو کۆمەڵەیە دەکاتەوە.

(۱) پیانقۆ: یانسیب
(۲) بیدەوبستێنەر: بازرگان، تاجر، کاسب.



لەسەر دراوی ئەم کۆمەڵە بۆ ئەوەی یاری لە کوردستاندا بڵاوبێتەوە چەند تۆپێکی یارییان کڕیبوو لە سلێمانی و لە کۆیە ڕەنگاوڕەنگ، هەر لە تۆپی قاچەوە هەتا تۆپی سەبەتە هەتا تۆپی ئاسمانە یاری دەکرێ.

وەکو بۆم دەرکەوت ئەمساڵ هاتوچۆ و دۆستایەتی قوتابییە کوردەکان لە پار و پێرار چاکتر بووە، هەتاوەکو قوتابییەکانی (دار المعلمین) کۆمەڵی دۆزینەوە و گەردانی قسەی کوردیشیان دامەزراندبوو[١].

ئەمساڵ لە (دار المعلمین) و (حەربیە و سانەوی) گەلێ قوتابی دەرچوون. بەڵام لە پێش تەواوبوونی قوتابخانەکاندا -هەروەکو هەموو ساڵێ گرتوویانە- وێنەیەکی لاوانی کوردیان گرت، بۆ هەموو قوتابخانە کوردەکانیان ڕەوانە کرد.

بەسایەی خواوە ئەمساڵیش لەو خۆشییە ڕەنجەڕۆ نەبووم کە لەگەڵ برا کوردەکانمدا لە ڕێی بەغداوە هاتینەوە بۆ سلێمانی. بەندە عوودم لێدەدا ئەوانیش گۆرانیان دەوت. یەکێکیشمان چیرۆکە کوردییە ناودارەکانی بەگۆرانییەوە دەگێڕایەوە. یەکێ لەوانە هی (مەم و زین) بوو: کوڕەکە کوردی هەولێر بوو بەڵێنی دامێ کە گەیشتە ئەوێ بۆم بنووسێتەوە و بۆم بنێرێ.

لە ڕێ ئاسوورییەکی خەڵکی حەکاریمان هاتە لا. لە فەرمان پێدراوەکانی شەمەندەفەرەکە بوو، کوردییەکی باشی دەزانی، دەیگوت: «لەبەر ئەوەی ئینگلیز بەڵێنی داوینێ بۆ خۆمان حکوومەتێکمان بۆ دامەزرێنێ، هەرچی ئاسوورییە لە دوای ئەم مانگە واز لە کاری حکوومەتی عێراق دەهێنێ!...».

(١) کۆمەڵی دۆزینەوە و گەردانی قسەی کوردی: لەوانەیە مەبەستی لە دۆزینەوەی وشەی کوردی ڕەسەن و بژارکردنی زمانەکەبێ لە وشە و زاراوەی بیانی.

## شێخ ئەحمەد (١٩٣٢/٦/٢٣)

ئێمڕۆ دوا ڕۆژی شێخی بارزانە لەناو ڕۆژنامەکاندا، بارزانییەکان بەتەرحێک بەرامبەریی عەرەبیان کرد هیچ هەرایەک، هەتا ئێستا لە عێراقدا بەو تەرحە کورد خۆی تیادا نەنواندووە. شێخ ئەحمەد داوای هیچی لە حکومەتی عێراق و ئینگلیز نەدەکرد ئەوە نەبێ (ئاسووری) لە زەویەکەیدا دانەمەزرێنن، بەڵام ئەمە بۆ ئینگلیزەکان باش نەبوو. لەبەر ئەوە هەرا هەڵگیرسا، ئەوەبوو ئینگلیز جگە لە خۆی تورک و عەرەب و ئێرانیشی لێ ڕاست کردنەوە. لەگەڵ ئەم دوژمنە گەورە و بەهێزەشدا شێخ ئەحمەد هەتا نزیکی حەوت مانگ توانی بەسەرێکی بڵندەوە ئەو وڵاتە ئازادەی بپارێزێ، هەرچەندیش زیانی خۆی کەم نەبوو بەڵام زیانێکی حەوت ئەوەندەی لە کەلوپەل و گیانی عەرەب و ئینگلیز و تورک دا. لەگەڵ ئەو هەموو سەرکەوتنەشدا (کە هێندەی نەمابوو عەسکەری عەرەب قڕی تێ بکەوێ) شێخ ئەحمەد حەزی بەدرێژەدانی کوشتارکردن نەدەکرد، دەیگوت: «من دوژمن نیم دۆستم حەز ناکەم خوێن بڕژێ، هەر ئەیەنە زەویوزارەکەمەوە من واز لە شەڕ و هەرا دێنم».

بەڵام حکومەت بۆ ئەمە لۆکەی لە گوێی ئاخنی بوو، وەکو خۆی بەسەرکەوتوو بزانێ دەیگوت: «هەتا ئێستا ئەم ئاوە دراویان نەداوە بەحکومەت، سەریان بۆ کەچ نەکردووە، دەبێ بیانکەمە بەشێک لە لەشی عێراق». بەڵام حەیف!... بەخت یاری کورد نەبووە، بەدەستی ئینگلیز هەر کوردەکانی ئەو ناوە خۆیان باڵی شێخ ئەحمەدیان شکاند، ئیتر ئەوەبوو ئەو شکانەی کە شکا خۆی نەگرتەوە. حکومەتیش هەتا دەهات (بەیارمەتی فڕۆکی ئینگلیزەوە) خۆی دەخزانە وڵاتەوە لەهەر پێشکەوتنێکیدا قەڵای لە سەختەڵانییەکانی شاخەکان دروست دەکرد، کەوا ئێمڕۆ لە ڕۆژنامە دەیخوێنینەوە: «شێخ ئەحمەدی بارزانی لە سنووری عێراق چووە دەرەوە خۆی دا بەدەست لەشکری تورک!!»

بەم تەرحە ئێوە دواییەکی شێخ ئەحمەد هات[1]، ئینجا خوا دەیزانێ چی بەسەر خۆی و کەسوکار و وڵاتەکەی دێ، بەدەست سەگ و گورگەوە!!؟

(١) لە ڕاستیدا هەر لە سەرەتادا شەڕفرۆش و یاخی نەبوون، ئیمپریالیزمی ئینگلیز چۆن دەستی عێراق و ئێران و تورکی خستە ناو دەستی یەکتر بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحموود، ئاواش بەهۆی ئەو بەڵێنەی دابووی بەئەستووری و ئاسوورییەکانی هەکاری و جۆلەمێرگ و دوای دەربەدەربوونیان و نیشتەجێکردنیان لە دیالەی نزیک بەغدا، بەهەموو جۆرێ دەیویست جێگا پێیەکیان لە کوردستان (ئەو ناوچانەی دەکەونە سەر هێڵی بڕۆکسل) -دهۆک، عیمادیە، مێرگەسوور، شێروان مەزن، زێبار و بارزان- بۆ بدۆزێتەوە و تیایدا نیشتەجێیان کات، بارزانییەکان بەسەرۆکایەتی شێخ ئەحمەدی بارزانی هەوڵێکی زۆریان دا کە دەڤەرەکەیان نەکرێتە شوێنی نیشتەجێکردنی ئەو ئەستوورییانە و خەڵکی ئەو ناوە ئاوارە و دەربەدەر نەکرێن، بەڵام حکومەت بەهاندانی ئینگلیز و بەکرێگیراوانی کارەکەیان گەیاندە ڕادەی شەڕ و پێکادان، لەمەشدا مام ئینگلیز لە یارمەتیدانی سوپای عێراقیدا هیچ دریغی نەکرد. لە تشرینی دووی ١٩٣١ەوە سوپای عێراق بەرەو بلە و بارزان جوولا و کەوتە داگیرکردن و شەڕکردن، ئەوە بوو لە ١٩٣١/١٢/٩ شەڕی بەرقی بەگ بەرپابوو، لە نیسانی ١٩٣٢ سوپای عێراق بەرەو بارزان چووە، لە شەوی ٣/٤-٤-١٩٣٢ شەڕی (دۆڵی =

لەگەڵ ئەم هەموو تەنگانەیشدا، کە لەناو شارەکەدا جێگیر بووە، لەگەڵ ئەم هەموو لێ نەپرسینەوەی حکومەتەشدا بەڵکو لەگەڵ ئەم هەموو هەوڵەی حکومەت بۆ بچووککردنەوەی گۆڕێی خوێندن و فێربوون لە سلێمانیدا... جوانەکانمان لە هەوڵدان و تێکۆشین نەکەوتوون، هەمیشە بۆ بەرزی خاکەکە لە تەقەللادان:

دیدەوانێتی: قوتابخانەکانی سلێمانی یەجگار لە پار پێشکەوتووترن، ئەمساڵ دیدەوانەکان لە جلوبەرگدا، لە کەلوپەلی دیدەوانیدا، لە مۆزیقەدا، بەتەرحێکی وا ئامادە و ڕێکوپێک خراون لە دیدەوانەکانی بەغدا چاکتر نەبن خراپتر نین. ئەمساڵ گەلێ سەیرانی گەورە گەورە و بەهاداریان کردووە: بۆ ئەزمڕ، گۆیژە، وێڵەدەر، سەرچنار، هەزارمێرد بەئەشکەوتەکەیەوە، هەڵەبجە و بەغدا، بەکۆمەڵی گەورە و بچووک چوون... هەموو ڕەنگە یارییەک کە لەناو قوتابخانە چاکەکاندا بکرێ، وەک تۆپی قاچ، تۆپە ئاسمانە، تۆپە سەبەتە. لە قوتابخانەکانی سلێمانیدا جێگای بۆ چاک کراوە و پۆل و دەستەی بۆ دامەزرێنراوە.

نمایش - تەمسیل: لە قوتابخانەی سانەویدا چیرۆکی (خەسرەو و شیرین) کە لە حەلی خۆیدا ناوچەکەی ئەرمەنستان و کوردستان بووە، نمایشکراوە، ئەمەش قوتابی کردوویەتی، گەلێ چیرۆکی پێکەنینیشیان لەگەڵدا کردبوو. لەو دراوەی دەستیان کەوتبوو (١٤٠) ڕووپیەیان بۆ بەرگ پێکردنی قوتابییە هەژارەکان بەختکردبوو، بەشێکیشی کەلوپەلی دیدەوانیان پێ تەواو کردبوو، ئەوی کە ماویشە بۆ کردنەوەی (نووسراوخانە - مكتبة)یەک دانراوە بۆ قوتابییەکان لە قوتابخانەدا بکرێتەوە.

وەنەبێ (قوتابخانەی دووەم)یش لەمەدا کورتیان هێنابێ، ئەوانیش هی خۆیان ڕێکخستووە، هەر

= قازێ) ڕووی دا کە لاشەی(٢٥٣) سەرباز و ئەفسەر لە مەیدانی شەڕەکەدا کەوت. لە ١٩٣٢/٤/٢٦ هێزی ئاسمانی بەریتانی بەتوندی ناوچەکەی بۆردومان کرد و دەیان گوند و مەزاری کاول کرد و سەدان منداڵ و ژن و پیری کوشت و بریندارکردن. لە ١٩٣٢/٤/٢٩ بارزانییەکان یەکێ لەو فڕۆکە جەنگییانەیان خستە خوارەوە و دوو فڕۆکەوانەکەشیان گرت. سکرتێری باڵیۆزخانەی بەریتانی (هۆلت) و پزیشکی خۆیان گەیاندە لای شێخ ئەحمەد. شەڕ وەستا، وتوێژ کرا، تا ١٩٣٢/٥/٢٣ بەردەوام بوو بەلام بێ ئەنجام، حکومەت و ئینگلیز سووربوون لەسەر چەککردنی بارزانییان و بنیاتنانی مەخفەری پۆلیس و بەبارمتە گرتنی شێخەکانی بارزان لە بەغدا. لە ١٩٣٢/٥/٢٥ حکومەت کەوتە بلاوکردنەوەی بەیانێ بۆ خەڵکی کە ڕیزەکانی بارزانی بەجێ بهێڵن و بێنە پەنا حکومەت، هەر لەو کاتەشدا کەوتە بۆردومانکردنەوە، ئەمە تا ١٩٣٢/٦/٩ی خایاند. خەڵکی پەنایان بردە بەر دۆڵ و ئەشکەوتەکان. شێخ ئەحمەد و هاوەڵانی ناچار چوونە خاکی تورکیاوە، ئەو حکومەتەش گولستنییەوە بۆ (ئەدرنە) لە ڕۆژئاوای ئەستانە. بەم جۆرە بەناسن و ئاگری ئینگلیز ڕاپەڕینی یەکەمی بارزان کۆتایی هات. جا لێرەدا مامۆستا ئەو کۆتاییە بە(نیوە دوایی) ناو دەبات کە ڕاستی فەرمووە و ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانە قەت دواییان نەهات و هەتا ١٩٤٧/٦/١٨ کە بارزانیی ئەمر لە ئاراس پەڕییەوە و دواجار لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ و دواتریش.

نواندنەکەی مـاوە، ڕەنگە لەم هاوینە بینوێنن. جگە لەمـەش (ڕەشـیـد زەکی)[1] سـەر مـامـۆسـتـای قوتابخانەی سانەوی خەریکە لەم هاوینەدا (چیرۆکی سەلاحەدین) و هی کە دەگۆڕێتە سەر کوردی کە ئامادەیی بۆ حەلێک قوتابییەکان دێنەوە بەر خوێنن. لە زانستی نیوە گیانیشدا نووزەیەک هەیە بۆ کردنی شتێ[2]!

قوتابخانەی کچان: ئێستە ئەم قوتابخانەیە شەش کۆزی هەیە، لەم هەفتەیەی ڕابووردوودا چوومە سەیری ئەو شتانەی بەدەستی کچە کوردەکان لەناو ساڵەکەدا دروست کرابوو، بەڕاستی شتی جوان و کارێکی ورد و ڕەنگینم لە دورمان و چنینەکانیاندا دی، زۆریش نافرم ئەگەر بڵێم کاری وای تێدابوو لە هی (موغازەکانی شتومەکی ئەورووپا) کەمتر نەبووە!...

قوتابخانەکەیان ڕێکوپێکە، زۆریان لێ پێگەیشتووە هەتاکو خەریکن هەر لە قوتابییە گەورەکانی خۆی مامۆستا بۆ ئەو قوتابخانەیە دابنێن... لەوێ هەر کەس ئەوی بەبیریدا دەهات لە (سیپارە) (دەفتەر)ێکدا کە بۆ ئەوە بەتایبەتی دانرابوو لەلایەن ئەو شتانەوە دەینووسی[3].

سەرچنار: میرزا تەوفیق ولات پەروەرێکی بێ هەمتا، بەشە زەوییەکی بەهاداری بەنرخێکی هەرزان لەکن سەرچنارەوە کڕیوە، لەسەر گردەکە چاخانەیەک لە بەردەمی چاخانەکەوە لەسەر شێوەی پلیکانە شەش حەوت سەکۆی پانی کردووە و هەتا دەگاتە گوێ ئاوەکە، بەشی دوایی باخچەیەکی جوانکیلانەیە لەسەر شێوەی تازە بەنەخش و نیگارێکی ڕەنگین ڕازانراوەتەوە.

وەکو لە باغەوانەکەم بیست (ئەمین زەکی بەگ) وەزیری ڕێگاوبانی عێراق هاتووە ئەو ناوەی کێشاوەتە سەر قاقەز وای تەمایە حکوومەت بخاتە سەر ئەو کارە: گۆمێکی جوانکیلانەی ڕێکوپێک لە کن سەرچاوەکەوە بکا، بەربەستێکی واشی بۆ بکا ئاوەکە بۆ دوو سێ گەز بەرزکاتەوە. جگە لەوە دوو شەقامی پان بەڕاست و چەپ لەناو ئەو باغ و چنارانەی سەرچناردا بکاتەوە، هەرچی دار و درەختی بێ کەلک هەیە لابیرێ، لە جێگای دار و درەختی بەردار و بەکەڵک لەسەر شێوەیەکی تازە و جوان بڕوێنرێ.

(١) ڕەشید زەکی کابان (١٨٧٦-١٩٤٠)، کە پۆلەکانی مەکتەبی یەکەم زیادی کرد، ئەوسا ناوەندیان لێ جیاکردەوە، ئەم مامۆستایە هەتا ١٩٣٥ بووە بەڕێوەبەری.

(٢) چالاکییەکانی (کۆمەڵەی زانستی) لە سلێمانی لە ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠وە کە حکوومەت لێی ڕەنجا، بەتەواوی کزبوو... دەبوایە دایخات و قوتابخانەکەی بێتە حکوومی. بەڕێوەبەرێتی (معارف) سەرپەرشتی بکات... دوایی هەرواش دەرچوو.

(٣) وا دیارە قوتابخانەی کچان ساڵانە پیشانگای نیشی دەستی قوتابییەکانی ڕێکخستووە، بڕوانە لە (ژیان)دا ئەم هەواڵە: (بۆ زانینی هەموو... ڕۆژی ٣ی تەمموز ١٩٣٣ لە مەکتەبی کچاندا نموونە نمایش هنری کچانە. ڕۆژی ٣ ٤ ٥ی مانگ بۆ پیاوان و ڕۆژی ٦ ٧ ٨ بۆ ئافرەتە. هرکس تشریف بینی بەشریت و جگەرد ماندووی احسێن ئەوە و بەتماشاکردنی دەستکردی کچەکانی خۆشیان چاویان اگەشێتەوە. مقابل بەمە اوی تشریف اهینی -٥- فلس ادات بو مکتب. اگر لەو پینج فلسە لە پاش مصرف شتیکی بمینێتەوە بو مکتب صرف اکری. إنجارجا اکەین کە هەمو ارباب ذوق تشریف بفرمون). ل: ٣- ژیان، ژمارە (٣٦٨)٣ تموز ١٩٣٣.

ئەگەر ئەمە ڕاست دەرچێ ئەو شوێنەی میرزا تەوفیق کرپویەتی هاوینـــتانێکی گەوردی لێ دێتە بوون. بەڵکو سەرچنار دەبێتە شارێکا...

## هاوین - گاه

پێنجوین: ڕێگای پێنجوین تەواو بووە، ئیتر ئەوی ئەیەوێ بۆ ئەوێ بچێ لە (١٥) سەعاتەوە بەسەیارە بۆی دەبێتە سێ سەعات و نیو. پێنجوین خۆیش و بێگانەش پێ لە ناو و با خۆشی و دەستدانی بۆ هاوینگاهێکی چاک دەنێ، ئیتر مژدەبێ بۆ کورد کە دەتوانن بەئاسانییەکی زۆر لە جێگەیەکی نازک و نازداری وڵاتەکەی خۆیان کەڵکەوەر بێن. هیچ دوور نییە پێنجوین لە چەند ساڵێکی کەمدا بگاتە ڕیزەی دێیەکی نرخدار وەک دێیە هاوینگاهەکانی لوبنان، وەکو بیستوومە لە بێگانەش گەلێک پەل دەکوتن لەو ئاگرستانەی خواروو ڕزگاریان بێ، بێنە ئەم بەهەشتەی کوردستان... (فەیسەڵ) پاشای عێراق یەکێکە لەوانە!

سەر عیمادییە: یەکێ لەو زیانانەی لە کورد کەوت، لەم شکانەی بارزانییانەدا، ئەوەبوو حکومەت چنگی گیر کردە بەروبوومی خواکردی وڵاتەکە!... دەیەوێ ئەو ناوە (بەناوی هاوینگا تیاکردنەوە) بکاتە جێ لەوەری حوشتر؟! ئەوا لەم سەر شاخانە شوێنێکی گەورە و جوانیان دۆزیوەتەوە، خانوو، هەموو کەلوپەلێکی ئاسوودەگی بۆ دەبەن، شەقامی باش باشی بۆ دروست دەکەن بەهەواری هاوینیان. بەلای منەوە ئەگەر ئەمە بێ نیازێکی پیس بێ زۆر باشە، چونکو وڵاتەکە بەلێشاو دراوی تێ دەڕژێ، ئاوا دەبێتەوە، وریا دەبێتەوە و پێش دەکەوێ. بەڵام قەد پێشینان درۆیان نەکردووە وتوویانە: (ئەو هەنگوینەی دوژمن دەتداتێ لە بن کاسەکەدا لەگەڵ ژەهرایە).

ڕەواندز: وەنەبێ ئەم شارە نازەنینەش لە گۆڕینی تێکۆشیندا دواکەوتبێ، سەید حسێن نامەیەکی بەناوی «........»[1] لە چاپ داوە، ئێستەش هەر لە کۆششدایە وەکو دەڵێن خەریکی دانان و گۆڕینی چیرۆکانە بۆ لە چاپدانیان ئامادە دەکا. لە قوتابخانەکەی ڕەواندز بەکۆششی مامۆستاکانەوە چیرۆکی (نیرۆن) و چەند چیرۆکێکی پێکەنینی تریان نواندووە، هەتا سێ ڕۆژ خەڵک بەبینینیەوە هاتوون، بەو دراوەی کۆکراوەتەوە قوتابخانەکە و گەلێ شتی تری کەی پێ ڕێکخراوە.

## زانستی

ئاخ!... زانستی چەند ناوت خۆشە! بەلام چۆن بوویتە سەر لوێلکی ئەم و ئەو. هەردەم گاڵتەیەکت پێ دەکەن! دوو مانگ و نیو لەمەوپێش خەڵکیان کۆکردۆتەوە بۆ هەڵبژاردنی کۆمەڵێک بەڕێوەی بیا. هەڵبژێررا. هەمووشی چاکترین کەسێ کە کاریان پێ ڕاپەرێ، کەچی هێشتا کەسێکیان سەری پیا نەکردووە.

(١) لە دەستنووسەکەدا ناوی ئەو نامەیە نەنووسراوە و ئاوا بەبۆشی ماوەتەوە.

سەردارەکەش حاجی تۆفیق وازی لە سەرداریتی خۆی هێناوە، ئێستە بەدەست مندالە وردکەوەیە، هەر شەوە بەتەرحێک پێیان دەخوێنێ. هەر شەوە تەرحە مامۆستایەکی قوتابیان بۆ دێ!!

ئەوا خەریکێن (ئەو قوتابیانەی کە بەکەڵکی مامۆستایەتی دێن) کە هیچ نەبێ لەم سێ مانگە پێخوێندن و فێرکردنی ئەو هەژارانە بگرنە دەست... بەڵام لەوە پاش؟!

## یەکتا بەگ

ئەم پیاوە ئێستا دارۆغا (رەئیسی بەلەدیە)ی سلێمانییە[1]. لە هێنەکەی پێشوو باشتر دیارە، لەسەر شەقامەکاندا بەمبەر و بەو بەرەوە ئەمامی چنار و ئۆکالیپتۆسی رواندووە. باغچەیەکی بچووکی لەبەر مزگەوتی گەورەدا لە ناوەراستی شەقامەکەدا دروست کردووە، باغچەکەی بەلەدیەی سەرلەنوێ رازاندۆتەوە. بۆ کردنی لوولەی ئاو و هێنانی مەکینەکەشی دەستی پێ کردووە. ئەوا خەریکن دەنێرن بۆ حورووفاتی چاپ بۆ ئەڵمانیا، نیازیان هەیە تۆزێ چاپەکە رێکوپێک بخەن، رۆژنامەکەش گەورەتر بکەن.

## هاوار

گۆڤارێکی کوردییە، ئەمیر جەلادەت بەدرخان لە شام لە گەرەکی کوردەکاندا دەری دەکا. هەرچەندە کوردییەکەی زازایە بەڵام ئەوانەی کە دەری دەکەن هێندە زانا و تێگەیشتوون پیاو حەز دەکا -ئەگەر وڵاتپەروەریش نەبێ- بیکڕێ. ئەم پیاوە دەیەوێ نووسینی کوردی بگۆڕێتە سەر لاتینی، لەبەر ئەوە نیوەی گۆڤارەکەی بەکوردی لاتینی نووسیوە[2]، دەیشیەوێ هەموو ئاهەنگێکی[3] زمانەکەمان بکا بەیەک، گۆرانی و سەما و یاریی کوردانە بژێنێتەوە. بەندە بۆ چوار مانگی رۆژنامەکەی دراوم نارد، وێنەیەکی خۆم و سەرکوتێکی (پارمەت داواکەرانە) و کۆمەڵەیەکی گەورە خۆشخوانی بوێژ کوردەکان کرمانج بەدیاری پێشکەش کرد.

بۆ زانینیش بەپێتاکی هەموو لایەک دراوی ساڵێکمان بۆ رەوانە کرد[4]. ۱۹۳۲/۷/۱۱ ئیمرۆ ئەمیر

(۱) یەکتا بەگ: کوڕی مستەفا بەگ بووە، لە ۲٦ی کانوونی یەکەمی ۱۹۳۱ هەتا ۲۲ی تشرینی دووەمی ۱۹۳۵ سەرۆکی شارەوانی سلێمانی بووە.

(۲) مەبەست لە نووسینی کوردییە بەپیتی لاتینی نەک (کوردی لاتینی).

(۳) ئاهەنگی زمانەکە: واتا دیالێکتی زمانەکە (لهجه).

(٤) بەخۆشی دەرچوونی گۆڤاری (هاوار)ەوە پیرەمێردی ئەمر دەڵێ:

(هاوار)ی کوردان لە شامەوە هات
هاواریان بەرزێ دووریێ لە ئەهات
شام سەحەری دێ، سووری سوورداره
تا لە شەودابێ بەشمان هاواره

(بڕوانە ژیان، ژ ۳۳۰، ساڵی (۷)، ۱۱ی تەمووزی ۱۹۳۲).

جەلادەت چوار ژمارەی (هاوار)ی بۆ ناردبووم، لە ژمارەی یەکەمیدا پێڕەوییەکەیم خوێندووە، جگە لەوەی کە نووسیبووم: مێژوو و جوگرافیای کورد و کوردستان، ژیانی پیاوە گەورەکانمان، دامەزراندنی نۆتەی گۆرانییە کوردییەکان، پیشاندانی نووسراوانی عولوم و فنونی کوردان و پێگەیاندنی ئەدەبیاتێکی بڵندی کورد لەم پێڕەوییەدایە. کابرا جگە لە ئاهەنگە کوردییەکان هەشت زمانی کەی بێگانە دەزانێ. لە گۆڤارەکەیدا هەر جارە چەند پیتێکی کوردی تیا دەنووسێ و لێکی دەداتەوە، کە لەوە هەموو ڕەنگە ئاهەنگێکی کوردانی تیادایە، زۆری خۆشخوانییەکان هی پیاوە، بەناوبانگەکانی وەک: (ئەحمەدی خانی و قەدری جان و حاجی قادری کۆیی...) جگە لەمەش سەرگوتێکی بەناوی (چیرۆک)ەوە تیایە... ئێمە چیمان ئەوێ لە خوا؟ ئەوەمان دەوێ ڕۆژێ ببینین کورد لە زمان و لەناودا بکەوێتەوە ڕیزی گەلان!!

## کتێبی «یاری»

## کوردی و مەریوانی ١٩٣٢/٧/٨

ئیمڕۆ ئەم نووسراوە تازەیەم بەدەست قوتابییە کوردەکانەوە دی، دەیانفرۆشت و بڵاویان دەکردەوە، دانەرەکانی خێوی (نالی و کوردی)ن[1]، ئەم نامەیە ٣٠ پەڕەیە، گەلێک یاری قوتابخانەکان و (مەشقی سوێدی) و چەند یارییەکی کوردی وەک: (شەقێن و قەلەمرداری و بوخچە بەگەردانێ)ی تیادایە... سەیر ئەوەیە ئەم سێ یارییە کوردیە لە هەموو وڵاتە پێشکەوتووەکانی ڕۆژئاوادا دەکرێ!... زۆر دووریش نییە

(١) خێوی نالی و کوردی: مەبەستی ئەوانەی دیوانی نالی و کوردییان چاپ و بڵاوکردەوە: (کوردی و مەریوانی) ئەم دوو ڕۆشنبیرە دڵسۆزەی وشەی پاکی کوردی، ئەندازیار مستەفا سائیب و تاهیر بەهجەت مەریوانی ناسراو بە ت.ب. مەریوانی. ت. ب. مەریوانی: لە ١٩٠٥ لە سلێمانی لەدایک بووە، بۆتە برینپێچی ئاژەڵ و لە شارەبان دامەزراوە، لێرە ئەحمەد شوکری شاعیری ناسیوە، کە دەچێتە بەغدا دۆستایەتی لەگەڵ پیاوانی ڕۆشنبیر و قەڵەمی کوردیدا پەیدا دەکات، دەکەوێتە بواری چاپ و چاپکردنەوە، دەنێرێ بەدووی د. شۆ تا پێکەوە کار بکەن.مستەفا سائیبیش هەر لەو بوارەدا هاوڕێی بووە. لەولاشەوە بەشەو خوێندوویە بەو نیازەی لە کۆلیجی پزیشکی وەرگیرێ، ئەو هاوکارییەشی لەگەڵ مستەفا سائیبی هاوڕێیدا بۆتە مایەی ئەوەی کۆمەڵێکی چاک نامیلکە و کتێبی هەمە چەشنەی کوردی بەچاپ بگەیەنن: «دیوانی کوردی ١٩٣١، نالی ١٩٣١ نامیلکەی گۆرانی ١٩٣٢، یاری ١٩٣٢، دیوانی سالم ١٩٣٢، هەموو کچێک چی بزانێ ١٩٣٣، یادگاری لاوان ١٩٣٣، خورشیدی خاوەر ١٩٣٣، گوللەیەک لە تاریکیدا ١٩٣٥، دیوانی شێخ ڕەزا ١٩٣٥، نروتنەکمان ١٩٥٣، دیوانی حەریق ١٩٣٥» لە ١٩٣٥دا بەناوی خۆیەوە چاپخانەیەکی لە بەغدا دامەزراند، یەکێ لە بەرهەمەکانی کتێبی (دور تەقەللای بێ سوود) بوو لە نووسینی ئەمین زەکی بەگ، هەر دوای چاپکردنی دەستی بەسەرداگیرا و قەدەغە کرا. کە کۆلیجی پزیشکی بەغدا وەری نەگرت، ڕووەو وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بڕوە و لەوێ ئاواتەکەی هاتەدی و پلەی دکتۆرای لە بایلۆژیدا وەرگرت. لەوێشەوە زوو زوو وتاری ئەدەبی و باسی تەندروستی و پزیشکی دەنارد بۆ (گەلاوێژ و ژین و هەتاو)، نامە و دەنگوباسی هەتا ١٩٥٦ لە دۆست و برادەرانی نەبڕا، لە سەرەتای پەنجاکاندا سەرێکی دایەوە لە کەسوکاری.. ئیدی دەنگوباسی نەما. هەتا لە ١٩٧١/١٠/٣٠دا گیانی پاکی سپارد... سڵاو لە یاد و لە دڵسۆزی.

ئەوان لە کوردیان وەرگرتبێ، چونکی کورد لەوان کۆنترە.

هەتاکو موستەفا بەگی کوردی، بوێژی ناوداری بابانیش لە ٨٠ ساڵ لەمەوپێش زیاترەوە ئەمەی وتووە:

«ئەلعەجەب بۆ شەهسواری خانەیی زینم نەهات؟»

کە لێرەدا دەست بۆ باری (پۆلو) درێژ دەکا کە کوردی بابان (شەقێنی سوارییان پێ گوتووە).

نامەکە بەناوی ئەمەوە کە هەنگاوێکە بۆ پێشخستنی نووسینی کوردی ئەنرێ، بێ بەها نییە، بەڵام دانەرەکانی بەجگار قسە و پیتی بێگانەیان بەکارهێناوە کە نامەیەکی کوردی ناشیرین. جگە لەوەش بەگرانی قوتابی لەو پیتانە دەگا!

## شێخ مەحموود ١٩٣٢/٧/١٠

ئێمەو چاوم بەشێخ رەئووف شێخ مەحموود کەوت، خۆی ئامادەی ئەوە کردبوو بچێتە کن باوکی.

شێخ لەمەو پێشەوە گواستیانەوە لە (ناسریە)یان گوێزاوەتەوە لە نزیکی بیست رۆژ لەمەو پێشەوە گواستیانەوە (حیللە) پاشان ئەوێشی پێ ناخۆش بوو، گواستیانەوە (عانە). ئەم شوێنە چۆلترین و دوورترین شارانی عێراقە: لە سنووری سوریە و عێراقدایە.

لەگەڵ ئەوەشدا وەکو دەگێرنەوە شوێنەکەی بانە تۆزێ لە گەرماوە دوورە.

## رێگای بارزان ١٩٣٢/٧/١٢

حکومەت وای داناوە ئەو رێیەی دەچی بۆ بارزان لە شاری عیمادیە و سووریەوە برواتە ئەوێ، کە بەسایەی ئەم رێگایەوە لیوای هەولێر و موسڵ پێک دەگەیێنێ، لە ژوورەوە: زێبار و رەواندز. شاری مروسڵیش بەناحیەی گوێرەوە دەبەسترێ.

## سالانەی یەزیدییەکان ١٩٣٢/٧/١٢

یەزیدییەکان کوردن. بەلام کەم کەس هەیە چ لە خۆمان و چ لە بێگانە لێیان شارەزابێ. لەم هەفتەیەدا وەکو رۆژنامە نووسیبووی حەلی گێرانی تاووسەکەیان بوو. بەناو هەمرو شوێنەکانی خۆیاندا گێراوە، ئەمجارە وەکو سالانی تر هەرا و شەڕ و شۆڕی تێدا نەقەوماوە.

## زانستی

پیانقۆیەکمان بۆ زانستی دامەزراند هەندێ دراوی بۆ کۆبکەینەوە، دراوەکەش بۆ ئەوەیە ئەو نووسراوانەی لە کتێبخانەکەیدا بەشروپری ماوەتەوە خەریکە لەناو بچێ، پەڕ و باڵێکی بەسەردا بنێرێتەوە. لەمەدا هیچ لەوە خۆشتر نییە بەتیرێک دوو نیشان دەشکێنێ، یەکەمان وت.

دووەمیش ئەوەیە ئەو شتومەکانەی خراونەتە پیانقۆوە شەکر شکێن و کەلاش و سەداردی دەستکردی کوردانە.

هەرچەندە لەبەر تاقیکردنەوەی (بروگمانە)مان دەبێ ئەم سێ مانگە خەریکی دەرسەکانم بم (کە هێشتا نیوەیم ماوە خۆم دەبێ بیخوێنم) خۆم پێ ڕاگیرا نەکرا بڵێم ئەو قوتابیانەی زانستی ئەمساڵ بێ بەش. بهێڵمەوە لەبەر ئەوە هەفتەی سێ دەرسی کوردی هەبوو خستمە دەستی خۆم. ئێستا هەموو پەلێکی ئەم زمانە ناسکەیان پێ دەڵێم. وەنەبێ هاوڕێکانی تریشم دەرس نەڵێنەوە. ئەوانیش هەریەکە چەند دەرسێکیان گرتۆتە دەست، خوا یارمەتی هەموو لایەک بدا.

## قەرئەتخانەی کوردستان

لەناو بازاڕی سلێمانیدا (قادر ئاغا)[1] ناوێک دووکانێکی بچووکی بۆ خوێندنەوە کردۆتەوە، گەلێ جوان ڕازاندوێتیەوە، گەلێ وێنەی جوانیشی تیادایە، وێنەیەکی گەورەی شێخ مەحموود و یەکێکی شێخ (          ) تیادایە. پڕە لە نووسراوانی تورکی و عەرەبی و فارسی و کوردیی، کوردی لە هەموویان کەمتر تیادایە. پێم گوت، دەیگوت: بەناوی خوا هەر ئێوە یارمەتیم بدەن هەموو تەرحە ڕۆژنامەیەکی کوردیتان بۆ پەیدا دەکەم، ئەوا خۆم بەهەموو لایەکدا بۆ ئەو تەرحە نووسراوانە هەوڵ دەدەم بەشکی ئەمە خوایە دەستم درێژ بکا بتوانم لە چاپیان بدەم. خوا ڕاگیراوی کا چونکی ئەمە یەکەم خوێندنەوە خانەیە بەم ناوە جوانە دەرچووبێ.

## زاری کرمنجی ١٩٣٢/٧/٢٧

(زاری کرمانجی) ئەمە دوو ساڵ بوو لە دەرچوون کەوتبوو، ئیمڕۆ ژمارەی (٢٤) هەمین بەدەست کوردپەروەرێکەوە دی دەیفرۆشت[2]. لە ٢٣ی تەمووزدا لە چاپدرابوو، دوانزە پەڕەیە. لە زبان و مێژوو پزیشک و پەروەردەشەوە دوابوو، سەید حوسێن -خاوەنەکەی- وا دیارە ئەمجارە نیازی هەیە بۆ دەرکردنی گۆڤارەکەی بەڕاستی و ڕێکوپێکی بێتە پێشەوە، چونکی نرخی ئێستای گۆڤارەکەی حەوت یەک و نیوی جارانیەتی، کە بەم بۆنەیەوە کڕیاری زۆرتر دەبێ... خوا یارمەتی بدا.

(١) قادر ئاغای سەعید ئاغای عومەر ئاغای عەتتار ١٨٨٢-١٩٧١، لەوەبەر دووکانی عەتتاری هەبوو، دوایی کردیە کتێبخانە و بەو جۆرە مایەوە هەتا کۆچی دوایی کرد.

(٢) ژمارە (٢٣)ی ئەو گۆڤارە لە ٤ی حوزەیرانی ١٩٣٠دا دەرچووە، هەرچەندە د. کوردستان موکریانی بەدرێژی باسی ئەو ئاستەنگانە دەکات کە هاتوونەتە ڕێگای داماوی موکریانی تا گۆڤارەکە بەڕێکوپێک و لەوادەی خۆیدا دەرنەچێ بەڵام تێکڕا لە دوو خاڵدا خۆی دەگرێتەوە:

أ - دووره دەستی و چەپەکی جێگای دەرچوونی گۆڤارەکە.

ب- باری نەدارایی و یارمەتی نەدانی حکوومەت بۆی و تاکە باڵی خاوەنەکەی.

ئەو ژمارەیەی مامۆستا لە سلێمانی دیویە (ژمارە ٢٤) دواژمارەی ئەو گۆڤارە ناوازەیە بوو... ئیدی ژمارەی تری بەدوادا نەهات. (بۆ زیاتر بڕوانە: د. کوردستان موکریانی- زاری کرمانجی ١٩٢٦-١٩٣٤، دەزگەی موکریان، هەولێر، چاپی یەکەم ٢٠٠٢-ل٨-١١).

## شێخی بارزان

بۆ مەعمورەتول عەزیز دەگواسترێتەوە

حکومەتی تورک مەلا عیسا و ئۆغوز بەگ و موستەفا شوکور و براکەی لە جۆلەمێرگا کردوونی بەداردا.

شێخ ئەحمەدیش نێرراوەتە قۆلی مەعمورەتول عەزیز[1].

## زوبانی کوردی (١٩٣٢/٨/١)

لە قوتابخانەی پۆلیسدا دەگوترێتەوە:

سەردارەکانی پۆلیسی هەموان[2] وایان داناوە لەم وچانەوە کە دێتەوە، زوبانی کوردی بەسەرکۆمار و سەردەستەی پۆلیسەکان (لەو قوتابخانە)دا بخوێنن.

(١) وتمان لە دوای ئەو هێرشە دڕندانەیەی هێزی ئاسمانی ئینگلیز کە گوند و مەزرای ناوچەی بارزانی کاول کرد و خەڵکی ئاوارە و دەربەدەرکرد، سوپای عێراقیش لەسەر زەوی دەستی نەدەپارلست، لە ١٩٣٢/٦/٩ شێخ ئەحمەد و هاوەڵانی و براکانی پەنایان بۆ تورکیا برد و ئەویش ڕەوانەی ناوچەیەکی سەر سنووری بولگاریای کردن (ئەدرنە). ئینگلیز کەوتە هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی نەخشە گڵاوەکەی (نیشتەجێکردنی ئاسووری و نەستوورییەکان لە بارزانەوە تا زاخۆ). کاتێ حکومەتی تورکیا دوای ساڵێ لەم پیلانە گەیشت، دیارە بەوە ڕازی نەبوو کە ئەوانەی ئەو دەری پەڕاندن ئێستا بخرێنەوە بن دەستی، بۆیە شێخ ئەحمەد و هاوەڵانی لە ئەدرنەوە هێنایەوە بۆ ناوچەکانی سەر سنووری عێراق بەرامبەر بارزان، دیارە ئینگلیز و عێراقی ئەم کارەیان بەباڵەپەستێیەکی تورک دانا بۆ سەریان، جا کەوتنە پیادەکردنی ڕێگای دیپلۆماسی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە.

(٢) سەردارەکانی پۆلیسی هەموان - ضباط الشرطة العامة.

# گەشتی سرۆچک
## لە ساڵی ۱۹۳۲دا




زۆر دەمێک بوو پێوە بووم بچمە سرۆچک. چونکە جێی بەزم و ئاهەنگ، شوێنی ئاو و با خۆشییە. جێگای ئەو کوردانەیە کە لە پێشیندا پێشکەوتنێکی زۆریان پێکەوە ناوە. ئیتر وا ڕێک کەوت بکەوینە ڕێ. سات سێ و نیوی کوردی، لەگەڵ هاوڕێکەمدا کاک (ئیسماعیل عەلی)، جووت بەجووت کەوتینە سەر ڕێی گۆیژە. گەیشتینە سەر شاخەکە. لە چایخانەکە دانیشتین. ئیتر لەوێ هاودەمێکی قسەخۆشمان دەست کەوت. کابرا (کەریم ئاغا)یان پێ ئەگوت. خەڵکی دێی (پۆڵە) بوو. جارێ نەیدەناسین. هەتا لەسەرەوژێر بەردەڵانییە ناخۆشەکەی گۆیژە ڕزگار نەبووین، خۆی تێ نەگەیاندین. لەوە دوا کەرباز و کەرسوارەکانمان لێ جوێ بوونەوە. ئێمەیش سێ کەسە (ئیسماعیل ئەفەندی و من و کەریم ئاغا)، ملمان نایە سەر ڕێی (بەرزنجە). ڕێگاکەی خۆش بوو. لەبەر ئەوە هیچ خەمێکمان نەبوو. قسەی خۆشمان ئەکرد. کوێخا بەسایەی باوکمەوە ناسیمیەوە. ئیتر هەر باسی دێی (خێوەتە) و زەویوزاری ئەو ناوەم بۆ ئەکرد. کابرا وا دیاربوو قسەکانی بەدڵ بوو. چونکە باش گوێی ڕاگرتبوو. چرچ و لۆچی دەم و چاویشی بەقسەکانم ئەکرایەوە. ئەویش باسی لای خۆیانی بۆ ئەکردین. گەیشتینە (وڵڵانە). لەوێش گورج تێپەڕبووین. چونکە دێیەکی وشک و ناخۆش بوو. ئینجا گەیشتینە ئاستی (عازەبان). لەوێش لاچووین. ئینجا گەیشتینە (پۆڵە). ئیتر لەوێوە کوێخامان لێ جیابووەوە. بەپیشاندانی ئەو، ملی ڕێگایەکمان گرت، ئیتر کەوتینە ناو نزارەوە. دەستمان کردە غار. هەتا کەوتینە ناو ڕێییەکی ناخۆشەوە. ئیتر هەر ئەو ڕێییە بوو، کە لەوە بووینەوە گەیشتینە سەر ڕێی (کاژاو). ئەو حەلەیش سات هەشت چارەکێک کەم بوو.

## کاژاو
### (۱)

کە گەیشتینە (کاژاو) هێشتا لەبەر فێنک و خۆشی ڕێگاکە ناوی ماندوویتیمان نەئەزانی. لەگەڵ ئەوەیشا کە چووینە ناو کەڵەگییەکەی (سەید ئەحمەد حاجی مامەند)ەوە کزە بایەکی ئەوەندە ساردی دەست پێ کرد، وا بوو پیاو بڵێ سەرمامە.

(سەید ئەحمەد) خۆی خەڵکی (حاجی مامەند) بوو. نزیکی پێنج دێ زەوی هەیە. هەتا پار سەری پانزە ساڵەی بووە لە سرۆچکدا کارگێڕی (مدیریتی) بکات. یانزە کوڕی هەبوو. کە ئێمە چووین خۆی لە

شاربوو. بەبۆنەی کوڕە گیراوەکەیەوە چووبووە ئەوێ، پاکانەی بۆ بکا. کە ئەو نەبووە شەقی لەو ئافرەتە هەڵدابێ، کە کوڕەکەی لەبارچووە.

بەڵام کوڕەکانی یەجگار پیاوانە میوانداریان کردین. لەو کەلەکییەدا گەلێ قسەی خۆشمان کرد. بەڵام شەپۆلی قسە، هەر خۆی لە کەناری ڕەوشت و کردەوەی چاک و خراپ ئەدا. باسی بەدخوویی هەندێ لە شێخەکان ئەکرا. کوڕێکیان گوتی: «باوکم، کە شێخ دەستی دابێ، خراپ دەستی ئەداتێ، لە کردنی هیچ شتێکی بەد کە بۆ خۆی و خەڵک خراپ بێ ناسڵەمێتەوە. ئەوە ئەو... ئەوە ئەوی تر... بزانە چییان بەسەرهاتووە؟!».

لەم قسانەدا بووین. هەر ئەوەندەمان زانی، یەکێک هات (مەلا محیێدین)یان پێ ئەگوت. ئەو گوڕج بەو ئاونیشانەدا کە هەڵماندا ئێمەی ناسییەوە. خۆیشی بەدەم و پلیا وا دیاربوو خەڵکی شاربوو. ئەمیش لە قسەکردنا تارێکی گرت بەدەستەوە لە تەلی ئایین نەبوایە، لێی ئەئەدا. باسی بێ ئایینی ئەم و، بەدکرداری ئەوی ئەکرد. لە دوایدا دای بەدەستەوە. گوتی: «باوکم تۆ هەرچییەک ئەکەی بیکە، بەڵام وای بکە کە کەس پێ نەزانێ. بام خەڵکیش لە تۆوە بەدخوو نەبن.. تۆ هەر بەئاشکرا جنێو مەدە بەخوا و پێغەمبەر (وەکو هەندێ لە خوێندەوارەکان ئەیدەن)، هەرچییەک ئارەزوو ئەکەی بیکە!».

پاشان من لەو بوارەم پێ لادان. باسی خۆشخوانی و بوێژم هێنایە پێشەوە. مەلا وا دیاربوو لەو بابەتەوە زۆری ئەزانی. هەندێ قسەی سەیری (شێخ ڕەزای تاڵەبانی)ی بۆ پێکەنین گێڕایەوە. منیش کورتوبڕ نووسیمن. ئەمەتان (بەڵکو بۆ دوارۆژ بەکەڵکی ئەوانە بێن کە ڕابردووی بوێژەکانمان ئەنووسنەوە).

جارێک (شێخ ڕەزا) ئەچێتە ناو کۆمەڵێک وێژەوانانی تورکەوە. (نامیق کەمال)ی ناودار ئەپرسێ ئەمە کێیە؟. (شێخ ڕەزا) پێش ئەمەی هاوڕێکەی پێشکەشی ئەوی بکات، هەڵئەداتێ ئەڵێ: «من لە فحولی أهلی کەمالم!» (نامیق کەمال) لەمە خراپ تێ ئەگات. ئەڵێ: «هەی بێ ئەدەب ئەمە لەکن خۆت ئەدیبی؟!». (شێخ ڕەزا)یش ئەڵێ: «نا. من بەو تەرحە ناڵێم. ئەڵێم یەکێکم لە گەورەی ئەدیبان!».

جارێک بە(شێخ حەمە عەلی برازا)ی ئەڵێ: «بەخودا ئەی پەری شێخ تۆ هەر جاشەکەری!». (شێخ حەمە عەلی)یش هەڵ ئەکێشێتە خەنجەر (شێخ ڕەزا) بکوژێ. (شێخ ڕەزا)یش ئەڵێ بۆچ ئەمکوژی؟ خۆ من وتوومە: «تۆ هەر جا شەکەری» واتا: تۆ لە هەموو شوێنێک وەک شەکر وایت. ئیتر (شێخ حەمە عەلی) وازی لێ ئەهێنێ.

کە (شێخ ڕەزا) ئەچێتە (جێشانە) و ئەگەڕێتەوە، ئەمە بە(شێخ مارفی شێخ ئەحمەدی شێخ ڕەسوڵ) ئەڵێ:

«مزدی ئەوەندە نەبوو ئاشەکانی جێشانەت
بێ بەقووتی کەرێ هەی ڕیامە (جێ شانەت!)»

(شێخ ڕەزا) لێرەدا لە سەرێکەوە جنێو بەدێیەکە ئەدات کە (جێشانە)یە. لەسەرێکی تریشەوە جنێو بە(شێخ مارف) خۆی ئەدات (بەو شوێنەی لە لەشیا شانە ئەیگرێ!).

پاشان باسی نووسراوانی کۆنی کوردیم هێنایە گۆڕێ. مەلا پەیمانی دامێ هەوڵم بۆ بدات، ئەگەر لەو

خواردیش بووم بۆە بنێریێ!! دەمی ئێواریێ هەند بەناو نزار و تووتنی (کاژاو)دا گەراین. ناوێکی زۆری بوو. کورەکەی شێخ ئەیگوت: «ئەم ئاوە پۆلە کەوی زۆری دێتە سەرە. بانگی شێوان (سەید ئەحمەد) هاتەوە. پیاوێکی ریش سپی تێکسمراو بوو. شەو ماندووبوو، قسەی زۆر نەکرد. بەیانی گەلێ باسی پێشکەوتوویی (لوبنان)م بۆ کرد. چامان خواردەوە و، بەجووتە ماڵئاواییمان لێ کردن و هاتین بەرێوە. رێگاکەمان زۆر ناخۆش بوو. لە رێگامان دا لە (گێلەدەرە)[1]وە تێپەڕ بووین. ئینجا گەیشتینە (بەرزنجە)، کە ئەو حەلە و دەمە و چێشتەنگاو بوو.

## بەرزنجە

(٢)

لە ماڵی (واحید ئەفەندی)ی ئامۆزای باوکم، لامان دا. شوێنەکەی زۆر دڵگیر بوو. ئەوەندە بەرزبوو، هەرچی خانووەکانی بەرزنجە و نزاری شاخەکانیەتی لەبەر دەمماندا دیاربوون. خانووەکانی (بەرزنجە)یش چەشنی پلیکانە، لە دامێنەوە هەتا ناوقەدی (شاخی رێ سوور) هەڵچووبوو و ریزی بەستبوو. دێیەکە تژی بوو[*]. سێ سەد ماڵێک نەبوو. چونکە ناوی کەم بوو، سەوزاییشی کەم بوو. هەر ئەوەندە بوو کە بەشی خۆی بکا (بامێ و تەماتە و کوولەکە و سلێ)ی تیا کرابوو. قەدپاڵی (شاخی کورە کاژاو)یش کە دەستە راستی (بەرزنجە) کەوتبوو، بەڕەز و دار و دەوەن رازابووەوە.



چاوەندازێک بەرزنجە بەسێ بەشی ماڵەکانی و رەزەکانی بەرامبەریەوە.

(١) خەڵکی بە(گێلەدەرە) ناوی دەبەن.

(*) تژی: چڕ و پڕ. (ش. ف)

تەنیا مزگەوتێکی هەبوو. یەجگار جوان و ڕێکوپێک بوو. لە پێش بەردنوێژەکانەوە ئەستێرکێکی چوار سووچی ڕێکوپێک بۆ ئاودانی ئاژەڵ دروست ئەکرا. خانووەکانی بەرزنجە دوو نهۆم بوون. هیچیان حەوشی نەبوو. چڕ و پڕیش بوون، ئەگین دوو هێندە ئەبوون، بەتایبەتی ئەگەر حەوشەدار و بڵاو بوونایە وەک دێهاتەکانی تری شارباژێر. تازە سەرای فەرمانڕەوایی تەواو بووبوو. بەڕاستی سەرایەکی قایم و ڕەنگین بوو. بەسەر تەوقە سەری شاخەکەی (چواڵەی شێخ محەممەد)ەوە بوو. کە لەوێوە زۆر چاک بەریەستی ڕێگاکانی بەرزنجەی پێ ئەکرا.

خەڵکی بەرزنجە تێکرا هەموو شێخ بوون. کەمیان شێخ نەبوون. ناو و بای بەرزنجە زۆر سازگاربوو. چونکە خەڵکەکەی هەموو توانا و لەش جوان بوون. ژنەکانیان بەسەربەستی و جوانییەوە بەناوبانگ بوون. دوو چایخانە و خوێندنگایەکی سێ دەستەیی هەبوو. حەلی خۆی، (وەکو ئەڵێن!)، بازاڕ و دووکانیشی هەبووە. بەڵام بەسایەی (شێخ مەحموود)ەوە بومباردومان کراوە. تازە وا خەریکن دەزگای (شارەوانی) و (ئازووقەی)ی بۆ دابنێن. بەرزنجە ئۆتۆمبیلیشی بۆ دەرچوو. بەڵام ڕێگاکەی بەشارەزووردا ئەڕۆیشت. بێینەوە سەرە و کاری ڕابواردنمان.

لە ماڵی (واحید ئەفەندی) هەر دەمە تەرحە کۆڕێکی پێکەنین بوو. ئیتر ئەوە هەر باسی ئەم و ئەوی قسەخۆش بوو. سەرگوزەشتەکان هێندە زۆر بوون لە نووسین نەدەهاتن. قسە لەبابەت (حوسێن بەگی هەڵەبجە)ەوە ئەکرا کە چەند بەگزادەیەکی سەیر و بەزمهێنەر بووە.

شەوێ چووینە کن (ڕەشید ئەفەندی کارگێڕ). کابرا گەلێ زیرەک و چالاک دیاربوو. بەهەڕەشە و گوڕەشە لەگەڵ لادێیەکاندا ئەبزووتەوە. وایش چاک بوو. چونکە شێخانی بەرزنجە ئەبوو سەریان نەرم کرایە. ئەگەر وای نەکردایە ڕەنگە کەڵلەڕەقیان بکردایە. بەیانی هەندێ بەدێیەکەدا گەڕاین. وێنەیەکمان گرت. پاش چێشتەنگاویش چەند وێنەیەکی خۆمان گرت. ئینجا چووینە دێی «مۆرپاس»

## مۆرپاس ١٩٣٢/٩/٣

**(٣)**

بەسات و چارەکێک گەیشتینە (مۆرپاس). ڕێگاکەمان زۆری بەر دەشتە ئەرمانە دێمەکەی (زەڵێ) کەوت. (شێخ سمایل) گەلێ قسەوباسی بۆ ئەگێڕاینەوە. ئەیگوت: «بەسەر تەوقە سەری شاخی (کوڕە کاژاو)ەوە ئەشکەوتێکی گەورە هەیە. دەرگا و تاقی تاشراوی هەیە. بەبەهاران دەچینە ئەوێ بۆ سەیران.

تەرحە شتێکی هەیە کە لەو کاتەدا لەسەر شاخەکە پەیدا ئەبێ. ئەوەندەی سووروویەک یان نوقوڵێکی درێژ ئەبێ. زۆر ڕوونە. هێندەیش تیژە شووشە ئەبڕێ. (مانگەسەود)ی پێ ئەڵێن». (شێخ مەحموودی شێخ عەلی دەرمیانە) کوێخای (مۆرپاس) بوو. چووینە کن ئەو. پیاوێکی یەجگار دڵ تەڕ و نان بدە و قسەخۆش و زیرەک بوو. ئازایەتی و نیشتمانپەروەریشی هەبوو. ئیتر هەر باسی «کورد» و «کوردستان»ی بۆ ئەکردم. بەئاواتەوە دەیگوت: «کاشکێ ئەم کوردە هەموو یەک دەنگ بوونایە. کە یەکێکیان لەلایەک ئازار بدرایە ئەوانی کە بهاتنایە خرۆش. ئێستا بۆ ئێمە ناپیاوەتییە وەها لەسەر

کورسی دانیشتووین و، پلاو و گۆشت ئەخۆین و، کەچی برا کوردەکانی ژوورووومان لە سوپێرا بەدەست لەشکری (تورک)ەوە پەرێشان بن!». ئیتر من بەدرێژی باسی (هەرای کوردستانی ژوورو) و کۆمەڵی (خۆیبوون)م کرد، شێخ گەلێ قسە و باسی خۆشی کەی بۆ کردین. شەوێ زۆر ناخۆش نوستین. چونکە مێشوولە و گەرما دێیەکەی پڕ کردبوو، ناویشیان بەگران دەست ئەکەوت، دێیەکە کەوتبووە ناودۆڵەوە. کەم ئاوبوو. لە تووتن بەولاوە هیچی کەی نەبوو، ڕەزەکانیش بەدەگمەن ترێی چاکیان تیا دەست دەکەوت، بەیانی چووینە (قەڵای سرۆچک).

## قەڵای سرۆچک ١٩٣٢/٩/٤

(٤)

بەیانی کە چامان خواردەوە هەرسێکمان (من و ئیسماعیل ئەفەندی و شێخ سمایل) ڕوو بە(قەڵای سرۆچک) ڕۆیشتین. بەسەر چەند شیو و شاخێکا ڕێگامان بڕی، کاتمان کردە سات و چارەکێک، ئینجا بەردەڵانییەکی سەختمان بەسەر قەڵاکەوە هاتەبەر کە لەوە ڕزگار بووین گەیشتینە بەردەمی قەڵاکە.

قەڵای چی؟! کێویک بوو چووبوو بەئاسماندا. هەر دیوارێکی کە ڕووخاویش بوو، ئێستا لە سێ گەز بڵندی کەمتر نەبوو، نیوەی کێوەکە هەتا نیوەی دامێنی بەدیوارەکانی داگیر کردبوو، لە دیوارەکانیدا، بەشێوەیەکی ڕێکوپێک، شەش قوللەی دوو نهۆمی تیابوو، لە ناوەوە حەوشێکی پەنجا گەزی بەپانی و درێژی هەبوو، لەناویدا ئەستێرکێک بووبوو، درەختی هەموو ڕەنگەی تیا ڕوێنرابوو، کە تا ئێستاش گەلێکیان تیا مابوو، بەهەر چوارلای حەوشەکەیشا ژووری یەک نهۆمی و دوو نهۆمی تیا دروست کرابوو.



لەتە چاوئەندازێکی دەرەوەی قەڵاکە



کەلاوەیەک لە قەلاّی سرۆچک

ئەم ژوورانە ئێستەیش جێ تاقەکانیان -گەورە و بچووک- ماون، وا دیارە کە موغەیری لە هەموو ژوورێکدا، هەتاکو لە قوللەکانیشیدا هەبووە، شوێنەکەی هێندە گەورەیە، پیاو هەرگیز بەبیریدا نایە کە بەو تەرحە بەبەرد و قسڵ و گەچ بەساڵێکیش کردنی تەواوبووبێ! تەنانەت بەدەمیەوە درۆیەکیش هەڵبەستراوە: «گوایە ئەڵێن کرێکارێک هەتا حەوت شەو و حەوت ڕۆژ خشتێکی بەدەستەوە بووە، لەبەر کرێکار زۆری دەستی نەگەیوەتە وەستاکە بیداتێ!». ئەمەیش هەرچەند بەزۆرەوە گوترابێ، من ئەوەندم بەسە بۆ پیشاندانی گەورەیی (قەلاّی سرۆچک) و ئەو دەمەی بەکردنیەوە بەسەر براوە. کە پاشایەک بەخۆی و فەرمان پێ دراوان و لەشکر و دەستوپێ و ژن وماڵی هەموویان و ئاژەڵیانەوە بەناو و نانیانەوە، بەتر و تفاقیانەوە، لەو قەلاّیەدا جێگایان بۆتەوە. قەلاّکە هێندە بەرزە، لە کێوەکە بۆتە کێو، کە پیاو لە قوللەیەکیەوە سەیری ئەو دێهاتی گوێ چەم و سەرگەردانە ئەکات چاوی ڕێشکە و پێشکە ئەکات، هێندەی نامێنێ زارە ترەک ببێ و بەسەرا بکەوێتە خوارەوە، هەپروون بەهەپروون ببێ!. ئێستەیش کەلاوەی ژوورەکانی، بەشێکی گەورەی موغەیری و تاقەکانی، لا و نیوێکی دیوارەکانی، بەسەر ئەو چەم و چوغوردەی خوارەوەدا چاو ئەگێڕن!

ناو لەناو قەلاّکە، خۆیدا دەست ناکەوێ، بەبزنە ڕێیەکی سەخت و ناخۆشدا، ئەبێ دەمێکی نیو ساتێ، بەبەردەمی قەلاّکەدا، بەقەد کێوەکەدا، بەپێ خشکێ و ڕۆیین، سەر بەرەو خوار، بەسەر هەزار دڕک و داڵ



کەلاوەیەکی تری ناوەوەی قەڵاکە، هێشتا موغەیرییەکەی ماوە.

و بەرد و سەختەڵانیدا، ڕێ ببڕێت، ئینجا ئەگەیتە سەر ئاو!. ئاویش، هەمووی، چۆڕێکە هێندەی لوولەی سەماوەرێکی پیا دێتە خوارەوە، شوێنەکەی هێندەی سەختە، دوو ئەوەندەی تر بەدیوار و بەربەست و قوللە و مەتەریز، بۆ دوژمن سەخت کراوە!. ئەوەیشیان زۆر بەجێ بووە، چونکی ژیانی ئەو قەڵایە بەو ئاوە بووە ئەگینا دوژمن زوو پەکی ئەخستن. ئێستە شوێن ئەستێرک (حوض)ەکەی ماوە. بەهەر چوار لای ئاوەکەوە، کە لەو کەلەبەردە دێتە دەرەوە، هەموو ڕەنگە گیایەکی جوانی لێ ڕواوە. سەیر ئەوەیشە یەکی لەو گیایانە خۆم لە ژووری میوانی مامۆستا ئینگلیزەکەی (خوێندنگای بڵندی برومانا)دا دیومە لە «لوبنان»، کە لە ساڵی ۱۹۳۲دا لەوێ بۆ «مەتریکولێشان» ئەم خوێند!

ئێمە ئەوا گەیشتینە خوارەوە!،

دەی ئینجا وەرە سەرەوە!،

کوڕم ئەوێ ئەخزێ، ئەترسێ کەوتنە خوارەوە، خوە «ئارەق»ی ڕەش و شین دەرئەدا هەتا دێتە سەرەوە!، هاتینە سەرێ. (سێ) وێنەی قەڵاکەمان گرت، هێندەی سەیرمان کردووە، دوو هێندە بۆ دۆزینەوەی نووسین و پەیکەر «هیکل» سەرنجمان داوە، هیچمان بەدی نەکرد!، بەڵام هەرچۆنێک سەرگوزشتەی ئەم قەڵایە لە ئێمە ون بووبێ، قەڵاکە وامان پیشان ئەدا کە فەرمانڕەواییەکی زەبر بەدەستی کوردی تیا بووە. کۆنیشی کار لە سەد و دوو سەد ساڵدا نییە. چونکە «شێخ مەحموود» ئەیگوت: «بەسەرێتی باپیرمان هێشتا قەڵاکە بەتەواوی ماوەتەوە تێک نەچووە». شتێکی تریشی هەیە: پایتەختی ئەو پاشایە «وەکو ئەڵێن»، دێیەک بووە ناوی «سەربۆرە» بووە، ئێستەیش هەندێ خانوو لەو شوێنەدا ماوە.

کوردە کۆچەرییەکان زستان تیا ئەبن. ئەو دێیە لە گوێ چەمەکەی خوار قەڵاکەودیە، بەوبەرەوە، پیاو بەگـران خـانوودکـانی دێتـە پێش چاو، بۆ ئەم کـردەوە سـەیرەی کـوردانە، هەر ئەمـەندەم لەو ناوە بۆ دەرکەوتووە!

## لە ڕەوشتی کوردان

کە لە گۆڕەندی قـەڵاکە بووینەوە، دەمەو چێشـتـەنگاو بوو. گـەرمـای کردبوو. ئیـتـر ڕۆیشـتـینەوە بۆ (مۆریاس) بۆ کن (شێخ مەحمود). شێخ گەلێ قـەی خۆشی تری بۆ کردین. بەڵام چیرۆکێکی کوردی ژووروو، کە زازایەک بۆی گێڕابووەوە، بۆی گێڕامەوە. یەجگار کاریگەر بوو:

«دوو بەگـزادەی ئامـۆزا تێک ئەچن. یەکـێکیـان ئەچێ مـاڵ و ژنی ئەوی تریان ئەداتە دەسـت تورک و خـۆی ئەکـا بەیاریدەدەری تورک. چونکە ئەمی کـەیان لەو کـاتەدا هەڵدێ. کـابرا بەشـەڕ ئەتوانێ ژن و منداڵەکەی خۆی لە تورکەکان بسێنێتەوە. ژنەکـەیشی کچێک ئەبێ ئازەنین کە هێشتا نەچووبووە پەردەوە. کابرا سـوێند ئەخوا. ئەڵێ: (هەتا ئەم ئامۆزایەم نەکوژم -چونکە پەنای بردۆتە بەر تورک و ماڵ و منداڵی داوەتە دەست ئەو- ناچمە پەردەوە). پێ ئەزانێ کـەوا ئامـۆزاکەی لە شـارێکی بچکۆلەدایە. بەخۆی و لەشکریەوە ئەچێتە سەری. کابرا خۆی ئەخزێنێتە قەڵایەکەوە ئەمیش وازی لێ ناهێنێ هەتا (٣٠) لەوان ئەکـوژێ. دوو ڕۆژ و سێ ڕۆژی پێ ئەچێ هەر واز ناهێنێ. ناچار خـەڵکی شـارەکـە پەنا دەباتە بەر شێخێکی گەورە کە (٤٠٠٠) دەرویشی ئەبێ. شێخ دێت، تکای لێ ئەکا. کابرا ئەڵێ: (سـوێندێکە و خواردوومە، هەتا نەیکوژم واز لە کوشتنی ناهێنم!». شـێخەکە ئەڵێ: (وا من ئەچم دەری ئەهێنم. تۆ ئازایت دڵی من بشکێنە). کابرا ئەڵێ: ئەوە دوو کورم سـەریان بیرە قـە ناکەم. بەڵام ئەگەر بسێ دارەدا کراوم لە قـەی خۆم پەشیمان نابمەوە. هەر ئەی کوژم!). شێخەکە ئەچێ ئامۆزاکەی لە قەڵاکە دەرئەهێنێ. کە ئەمان ئەیبینن دەست ئەکەن بەدەسـتڕێژکردن، شێخ ئەیداتە بەر زاخۆ (پاڵتۆ)کەی. ئەوان هەر لە تفەنگ هاوێشتن ناکەون. بەڵام وا بەوەستـایانە ئەیتەقێنن، هەمـوو زاخۆکەی شێخ کون کون ئەبێ، (ئامـۆزا) ئەکوژرێ، شێخ هیچی لێ نایە! ئینجا کـابرا ئەڵێ: (ئیـتـر بەس!) خۆی ئەیشوا و ئەینێژێ. لە پرسـەیا چەند ڕۆژێک دائەنیشێ. ئینجا شاییەکی گـەورە بۆ پەردەچوونی خۆی پێک ئەهێنێ. پاشان بەخۆی و دووسـەد سـوار و (١٤) بار لیرەوە ئەچێتە کن شێخ هەموو پێشکەشی شێخ ئەکات! تا لەگەڵی ئاشت بێتەوە. شێخ وەری ناگرێ!؟». ئەم چیرۆکە، هەرچەندە، زۆری خراوەتە سەر، بەڵام ڕەوشتی کوردان پیشان ئەدات، کە تا چ ئەندازەیەک بایەخ بە ڕووسووری و سەربلندی ئەدەن.

لە مـاڵی شـێخ نانمان خـوارد. چایمان خـواردەوە. دەمـەو ئێـوارە گـەیشـتـینەوە (بەرزنجـە). لە دێی (مۆریاس) و (قـەڵای سـرۆچک)دا، (کندرژار) کە بنی (کندر)ە، هانیـمـان وردمـان کرد و خـسـتمـانە جگەرەوە. جگەرەکەی نەرم و بۆنخۆش کرد. (سرۆچک) لە هەموو شوێنێکیدا ئەوەی تیا دەست ئەکەوێ.

# دیسانەوە بۆ بەرزنجە

کە هاتینەوە (بەرزنجە) هێشتا ڕۆژ بلند بوو. لە ڕێگا زۆر خوە (ئارەق)مان دەردابوو. کەمێکی ماندوویش بووبووین. لەبەر ئەوە ئاوێکی سارد کرد بەلەشما. لەشم پێی سووک بوو. لەوێ دەسم کرد بەنووسینی یادنامەکەم هەر ئەوەندەم زانی (واحید ئەفەندی) هاتەوە (نوری)یش لەوێ بوو. چەند میوانێکی تریشمان هات.



(نووسەر خۆی ئامادە کردووە بۆ گەشت لە پشتیەوە خانووەکانی بەرزنجە دیارن)

ئیتر هەر بەقسەی خۆش ڕامانبوارد، تا زەردەپەڕ. پاشان من و (ئیسماعیل ئەفەندی) هەڵکشاینە سەر تەوقەسەری کێوەکە. سەراکە کرابووەوە. چووین سەیرمان کرد. یەجگار ڕێکوپێک بوو. هێشتا نەچووبوونە ناوی. بۆ هاتنی (متصرف)یان دانابوو. کە توزێ چووین بەو دیوا ئاخمان خواست: کاشکێ لەوە پێشیش بەوێمان بزانیایە. ڕەزەکانی (هەراوی خواروو) تارایەکی زێڕینی ڕۆژیان بەسەرا کشابوو. کێوە گڵ سوورەکەی وەک گوڵزار ڕازاندبووەوە. دڵی هەزار دڵداری ئەهێنایە جۆش. ئیتر بانگی شێوان بوو، هاتینە خوارێ چووینە کن (ڕەشید ئەفەندی کارگێڕ) بۆ شێو. لەوێ نانێکی ڕەنگینمان خوارد. شەو هەر لەگەڵ میوانەکاندا ڕامانبوارد هەتا ساتی چوار.

بەیانی کە چایمان خواردەوە دەستی خانەخوێ و کارگێڕمان گوشی. ئینجا بەجووت لامان دایە سەر ڕێگای (هەراوی ژووروو) کە گەیشتینە ئەودیو کێوەکەوە نزار و لالەزاری ئەو ناوە دەرکەوت. چونکە لەوەپێش هەر کێوە رووتەکانی (بەرزنجە)مان دیبوو بەو بینینە دوو ئەوەندە دڵمان کرایەوە. منیش بەفیرۆم ئەزانی کە لەو شوێنە خۆشە بەبێ لادان تێپەڕبین. داوام لە هاوڕێکەم کرد: لەسەر کانی و ئاوێکی سارد و سازگار لاماندا. تێر و پڕ لەو ئاوە شیرینەمان نۆشی. دوو سێ لادێیی، ئەدیو و ئەناسراو، لە ڕەز و بێستانەکانەوە ترێ و شووتییان بۆ هێناین. گۆرانی کوردیشیان بۆ وتین. هەر لەو شوێنەدا بامێ و تەماتە و باینجان و پەموو و کاڵەک و شووتی و ترۆزیشیان ڕواندبوو.

## باسك ١٩٣٢/٩/٥

(٥)

که له (بەرزنجه) جوولاین، مەبەستمان چوونه (باساک) بوو. بەنیوەڕۆکات گەیشتینه (باساک). باساک دێیەکی تازە بوو. هەمووی شەش ساڵ نەئەبوو دروست کرابوو. ماڵەکانی لە ژمارەی پەنجە تێپەڕیان نەئەکرد. لەگەڵ ئەوەیشا، باساک، دێیەکی ڕێکوپێک و، خنجیلانە و جوانکیلانە بوو لەگەڵ ئەو ناوە کەمەیشیدا کە هەیبوو بەکۆششی (شێخ قادر) و (شێخ غەریبی) خاوەنیەوە. باساک هەموو کەسێکی تیا ئەژیا تیا ئەحەوایەوە! بۆ تەماشاگاه هەتا خوا حەزکا ڕەنگین بوو داری بەڕوو و مازوو، بێستان و ڕەز و چنوور، مێرغوزارێکی پێک هێنابوو. لەناو شاخی بڵندی کوڕە کاژاو و لکەکانیدا پیاو هەر حەز ئەکات، بەبێ دەنگی، لەسەر بانەکەی (شێخ قادر) یان لەناو باخچەکەیدا، بەسەر کەڵەبەردێکەوە، لە کردەوەی پەروەردگار، بەڕۆژان و بەمانگان سەرنج بدا و وردبێتەوە. ئەوە سەیرا!

بێینەوە سەر باسی بەروبوومی «باساک»: هەر لە ترێی ڕەنگاوڕەنگەوە هەتا کاڵەک و شووتی و کوولەکە و تەماتە و بامێ و تووتن و سلق، هەرچی پێویستی دێیەکی گەورە، بەڵکو شارێک بێ تیا هەبوو و تیا پەیدا ئەبوو. هەتا سبەینێ بەیانی میوانداری یەکێ پیاوانە کراین. (شێخ قادر) دەرەنگی پەکی خست، ئەگینا ئەی بردینە ناو ڕەزی «چنارە»وە ئاگری بۆ ئەکردینەوە و، گیسکی بۆ سەر ئەبڕین و، گۆبەند و ئاهەنگی تا بەیانی بۆ دائەمەزراندین. شەو زۆر سەرما و نسرم بوو. کزەبایەکی سارد لە شاخی



(بەماڵەکانی «باساک»ەوە، شاه کلاوی شاخان، «کوڕەکاژاو» دەرچووە)



چاوئەندازێکی تری باساک کە (١) شێخ قادر و (٢) شێخ غەریب (٣) نوومەریشی تیا دیارە.

«کوڕە کاژاو»ەوە ئەهاتە خوارێ. لەبەر ئەوە ئاگرێکی ئێلـە ئێلـمـان کردەوە. لە پڕ «شێخ ئەحمەد»ی ئامـــۆزایان شـەوباشی لێ کـــردین. کـابرا هەرچەندە بەمـــۆن ئەهاتە پێش چاو، بەڵام خـــاوەن ڕەوشت و کردوویەکی پیاوانە بوو. باسی چەتەیەتی خۆی بۆ ئەکردم. بەڵێنی دامێ هەندێ پوولی «دوایی» «شێخ مەحموودی گەورە» و هەڕەشە نامەکانیم بۆ بنێرێ. ئەگەر هەمووم لە بیر بچێتەوە هەرگیز ئەوەم لەبیر ناچێتەوە کە «شێخ قادر» و «شێخ غەریب»، ئەو چیرۆک و سەرگوزشتە کوردییە خۆشانەیان لەژێر ساباتی دیواخانەکەیاندا، بەرامبەر بەو نزار و لالەزارە بۆ ئەگێڕامەوە:

## ورچەکە

«کاکە حەمە»، باپیری باپیری ئەم «شێخ قادر»ە یەکێ لە سێ کوڕەی «شێخ عیسی» بووە، کە پیاوێکی زەبر بەدەست و نان بدە بووە. جارێک لەشکری عەجەم کە هێرش دەهێننە سەر «خاکی بابان» لە سرۆچکەوە، بەخۆی و چەند سوارێکەوە تا سنە ڕاوەدوویان دەنێ. لەسەر ئەوە «سرۆچک» لە دەست خۆیا ئەهێڵێتەوە! بەروبوومی ناداتە دەست «ئەحمەد پاشای بابان»!.

ئەحمەد پاشایش پیاوێکی لەسەرخۆ ئەبێ، نایەوێ یەکە و ڕاست بەسایەی لەشکرەوە «شێخ کاکە حەمە» تەمێ بکا. هەر بەناوی گاڵتە و پیاوەتییەوە خەریکی ملکەچ پێکردنی ئەبێ.

جارێک لە تەنگی بانگی شێواندا بەخۆی و هەشت سەد سوارەوە بەمیوانی ئەدا بەسەر «کاکە حەمە»دا، بۆ ئەوەی بێ دەستی و میوان ڕانەگرتنی پیشان بدات. «کاکە حەمە» لە ماوەی دوو سێ کاتا ئەوەندە نان و چێشت پێ ئەگەیێنێ بۆ ئەسپەکانیشیان مریشک و پلاو ئەخەنە ناو ئاخوڕەکانیانەوە؟!. «ئەحمەد پاشا» لەمەدا سەرناکەوێ. ئەگەڕێ بۆ فێڵێکی ترا!.

---

لەو دەمەدا لە شاخی (کوڕە کاژاو)دا، ورچێک پەیدا ئەبێ ڕێ لە هەموو هاتوچۆکەری ئەو دێهاتانە کە

بەبەردەمیا ئەڕۆن ئەبەستێتەوە. چەند کەسێک ئەخوا و تێک ئەشکێنێ. دێهاتییەکان وایان لێ دێ ناوێرن سەر لە کون بکەنە دەرەوە. کار و فەرمانیان، هەموو پەکی ئەکەوێ. (ئەحمەد پاشا) پێ ئەزانێ بەخۆی و چەند سەد سوارێک و تۆپ و تفەنگەوە ڕوو ئەکاتە کوڕە کاژاو، تا ڕێی لادێییەکان لەو ورچە زەبر بەدەستە ڕزگار بکا. ئینجا لێرە، (پاشا) داو بۆ (کاکە حەمە) ئەنێتەوە.

بۆی ئەنووسێ کە بێتە ئەو شوێنە پێکەوە ڕاوی ئەو ورچە بەدکردارە بکەن. (کاکە حەمە) بەخۆی و چەند سوارێکەوە ئەچێتە لای. بەڵام ڕێی (شێخ مارف)ی کوڕی نادات کە خۆی بخاتە ئەو داوەوە!. (شێخ مارف)یش کوڕێکی زۆر لاوچاک و توانا و بەهێز ئەبێ. کە باوکی ئەڕوا بەشەرمەزاری ئەزانێ بهێڵێ باوکی بەبێ خۆی بڕواتە ئەو ڕاوە. هەڵئەسێ بەتەنیا سوارە ڕوو ئەکاتە لەشکری (ئەحمەد پاشا). لەگەڵ (کاکە حەمە) ئەیبینێ دڵی دائەخورپێ ئەڵێ: (ئەوا کوڕەکەم لە دەست چوو!). لەگەڵ ئەوەیشدا بە(ئەحمەد پاشا) ئەڵێ: (بفەرمووێ کەس لە سوارەکانی تەقە نەکات. مارفی کوڕی دەچێتە مەیدانی ئەو ورچەوە!) وا ڕێک ئەکەوێ ورچە پەیدا ئەبێ. (شێخ مارف) بۆی ئەچێتە گۆڕێ وە دەست ئەکەن بەزۆران گرتن. دەمێکی درێژ ڕائەبوورێ. هەردووک خوە (ئارەق)ی ڕەش و شین دەرئەدەن. بەڵام هەر ئەو دەمە ئەبێ، هەرئەوەندە ئەزانێ ورچ ئەکەوێتە ژەوی (شێخ مارف) بەسەریەوە ئەبێ. چوارپەلی ئەبەستێتەوە!.

(ئەحمەد پاشا) دڵێکی مەردانەی ئەبێ. لەگەڵ ئەوەیشدا کە دوژمن زادەیەکی خۆی، بەچاوی خۆی، بەسەرکەوتوویییەوە ئەبینێ، گەلێ دڵشاد ئەبێ. پاداشتێکی گران بە(شێخ مارف) ئەدات!.



## بەرازەکە

دیسان داو داوی (ئەحمەد پاشا)یە بۆ (کاکە حەمە)ی ئەنێتەوە!. لەناو ئەو (شارەزوور)ەیشدا بەرازێکی دڕندە پەیدا ئەبێ. ڕێ بەهەژاران ئەگرێ. بەسەدان گیانلەبەر و پیاوان هەڵئەدڕێ. (ئەحمەد پاشا) بەخۆی و چەند سەد سوار و تیر و تفاقی شەڕەوە دەچێتە لای (بێستان سوور)ەوە. دەنێرێ بەشوێن (کاکە حەمە)یشدا. (کاکە حەمە) ئامۆژگاری (شێخ مارف) ئەکات: نەیەت. (شێخ مارف) دەنگ ناکات هەتا باوکی ئەڕوا. کاتێک ئەزانێ لە پاش باوکی، (شێخ مارف)یش بەتەنیا سوارە پەیدا ئەبێ. (کاکە حەمە) ئەم جارە، بەتەواوەتی دەست لە کوڕەکەی ئەشوا. (ئەحمەد پاشا) هیوای وا ئەبێ، بەرازەکە ڕاوی (شێخ مارف) بکا و باڵی (کاکە حەمە) بشکێ! بەڵام (پاشا) بەهەڵەدا ئەچێ، چونکە دەست و بازووی (شێخ مارف) لەوانە نابێ کە هێزی ورچ و بەراز سستی بکا. (شێخ) بەدەستی خۆی ئەبێ، نایەڵێ کەس ئەو بەرازە بکوژێ. ئەڵێ: (جا چ هونەرێکی تیایە بەم هەمەندە سوارە ئەم بەرازە بەتۆپ و تفەنگ بکوژرێ. بەخوا بەزۆرانبازی نەبێ نای کوژم!. ئەمە ئەڵێ و دەستبەجێ لە ئەسپەکەی باز ئەداتە خوارەوە. فەردەنجییەک بەدەستی چەپەوە و، شیرێکیش بەدەستی ڕاستەوە ئەگرێ و بەرەو ڕووی بەرازەکە ئەچێ. بەرازەکە کە ئەیبینێ هەڵمەتی بۆ دەبا. شفرەیەک بۆ (شێخ مارف) دائەوەشێنێ.

(شێخ) فەردەنجییەکەی ئەداتە بەر. شفرەکەی بەفەردەنجییەکەدا ئەچێ. هەتا بەرازەکە خەریکی شفرە

دەرهێنانەوە ئەبێ لە فەرەنجییەکە. (شێخ) شیرێکی لێ ئەدا هەر چوار پەلی ئەپەرێنێ. بەرازەکە ئەکەوێ. (شێخ) بەیدەستی ئەکا. ئەیباتە کن (ئەحمەد پاشا). (پاشا) دیسانەوە پاداشێکی گەورەی تری پێ ئەبەخشێتەوە!.

## وەندەرینە ١٩٣٢/٩/٦

(٦)

بەیانی هەرسێکیان لەگەڵ دوانی کەی (باساک)یدا چووینە (وەندەرێنە). رێگاکەمان بەناو دار بەروو و رەزا ئەرۆیشت.

لەبەر ئەوە گەرما کاری لێ ئەکردین. ئەو شاخانەی ئەمانە بڕی، هەموو پەلوپۆی شاخی (کورە کاژاو) بوون. ئیتر شوێنەکەی لەوانە ئەبوو پیاو بەبێ دەنگی بڕوا بەڕێوە. لەبەر ئەوە کەوتینە گۆرانی وتن. (شێخ سمایل) گۆرانی لادێییانە، منیش هی خوێندنگا، کوڕەکەی کەیش بەناوازێکی خۆشەوە، ئەو کێو و کەژ و دۆڵی چیایەمان پڕ کردبوو. تاو تاو منیش ئەگەڕام بۆ قسەی خۆش تا ئەوانی پێ دڵخۆش بکەم. زۆرمان بەم تەرحە بەسەر برد. دەمەو نیوەڕۆ گەیشتینە (وەندەرێنە). ئێرەیش دێی شێخان بوو، (شێخ نەجیبی شێخ عەلی دەرەمیانە)ی بەسەرەوە بوو. باوکی ئەو (شێخ سمایل)ە بوو، کە لەگەڵمان بوو. بەرتەنگ و تاریکی ماڵ، لە ماڵ لامان ئەدا. (شێخ نەجیب) بردینیە بن دارگوێزێکەوە. کە پشتەوەی باخچەیەکی گوڵی رەنگاورەنگ بوو. تەنیشتەکانی ریزێک چنار و چنوور بوو. بەردەمەکەیشی شوێنێکی فراوان بوو. بەرەز و بەهەموو رەنگە دارێکی بەردارەوە جوان بووبوو. چوار لاکەی بەشاه کڵاوی (کورەکاژاو) و باسکەکانی تەنرابوو. ئەو شوێنە، بەلای منەوە، هەموو شوێنەکانی تری سرۆچکی ئەهێنا... چونکە دارگوێز و چنارەکانی بەشەماڵ و کزەبای کورەکاژاو باوەشێنیان ئەکردین. رەنگی کەسک و سووری شاخەکە و دامێنەکانی، بێجگە لەوە ئەو تارا زێڕینەی کە رۆژ بەسەر و پۆتەلاکی شاخەکان و دارەکانیان دابوو، بەتەرحێ ئەو شوێنەی دڵگیر کردبوو، ناخمان ئەخوارد کە ئەو چەند رۆژە ئەو شوێنەمان ئەناسی بوو. (شێخ نەجیب) هات، هەموو لەبەری هەڵساین، پیاوێک بوو بارێکەلانە و کەڵەگەت. دەموچاوێکی درێژکۆلە و چرچ و لۆچداری هەبوو. ریشێکی ماش و برنجیشی هەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا بەتەرحێکی وامان لەگەڵ ئەودا، وەکو هاودەمی چەند ساڵە بووبین بەیەکەوە وابوو. ئەو دەموچاوەی کە چەرخی چەپ گەرد بەو دەردەی بردبوو، لەگەڵماندا بەتەرحێک ئەکرایەوە، «شێخ نەجیب» وەک گوڵێکی گەشاوە ئەچووە دڵمانەوە. بۆ لە میوانداری خۆی و کوڕەکانی مەپرسە. لەو نان و میوە جوان و رەنگینانەی مەکۆڵەرەوە، بزانە خۆی چۆن پیاوێک بوو؟! کە قسەی ئەکرد ئەوەمان لە بیر ئەچووەوە کە لەبەر دەم لادێییەک دابووین، خۆمان لەبەردەم پیاوێکی مەند و زرنگی چاکدا ئەدی، کە دەردی (کورد) و (کوردستان)ی بەتەواوەتی بۆ دەرکەوتبوو. ئەیەویست سارێژی بکات. بەڵام بێ دەستی ئەی ئەهێشت دڵی خۆی بەجێ بێنێ. هاواری بوو: بۆچی خوێندنگایەکی پیشەسازی و کشتوکاڵ لە(سلێمانی)دا ناکاتەوە؟. تاکو (کورد) فێری چاندن و کرمی ئاوریشم بەخێوکردن و دروستکردنی

ماوەت و بەرھەمھێنانی شەکر و رواندنی داری چا... بین. هاواری بوو لە دەست بڵاوبوونەوەی شەکر و چا و ماوەت و کەلوپەلی تر کە بێگانەکان لەناو کوردستاندا ئەیان فرۆشتن.

ئەیگوت: «ئەمە بەیارمەتی میری و دەست و بازووی خوێندەواران پێک دێت. ئێمە ئەشێ بۆ ئەوە بگەڕێین هیچ لە ئەوروپایی و بێگانانی نەکڕین. ئەشێ شتێکی وا بدۆزینەوە کە جێی چا بگرێتەوە. چەوەندەر بروێنین بۆ شەکر دروستکردن ماکینەی چنین و ڕستن و کێڵان و چاندن بهێنین بۆ خاکەکەمان تا ئەوی هەمانە بەکاری بهێنین، خۆمانی پێ بەخێو بکەین، دوژمنی بێگانەیشی پێ ڕووت بکەینەوە!».

پاش نیوەڕۆکی درەنگ چووینە ڕەز و باخەکان. هەموو ڕەنگە ترێیەکمان چاو پێ کەوت. هەڵووژە و هەرمێیشمان بەدی کرد. (وەندرێنە) هیچی سەیر نییە، ئاوەکەی نەبێ. هێندە ساردە ترێی تێ دەخرێ شەق ئەبا! تەنانەت ئەڵێن مەڕێکی تیا مابووەوە تەقاندبووی. لەوێ بەو بەرزییەوە گەلێ سەیری ئەو تەماشاگاهە ڕەنگینەمان کرد. گەلێ چیرۆک گێڕرایەوە. بەجوانم زانی ئەمەیان لێ بگێڕمەوە:

## ئەفغانییەکان

(شێخ سمایل) وتی: ئا لێرەدا بووین - دەستی کێشا بۆ مزگەوتەکەی وەندەرێنە- کابرایەکی تەنگە زلی مێزەر بەسەر بەخۆی و کوڵێک و گۆچانێکەوە پەھەڵەداوان هات. ئێمەیش بەفارسی پێمان وت: (فەرموو). وتی: «دانانیشم هەتا ئەنێرن هاوڕێکانی کەیشم ئەدۆزنەوە. ئێمە شەش کەس بووین، پێکەوە. هەریەکەمان بەلایەکدا ڕۆیشت ناو بدۆزێتەوە» ئێمەیش ناردمان بەدوویاندا هەر پێنجەکەی کەیانمان گرد کردەوە و ئێواری و دوو ڕۆژی تریش میوانداریەکی زۆرمان کردن. لێمان پرسین، وتیان: «ئێمە گەشت دەکەین، بۆ گیای بەھادار ئەگەڕێین. بیکەین بە(ئەکسیر)، بۆ داوودەرمان و زێڕ و زیو. ئەم شاخی (کوڕەکاژاو)ە، وەکو بیستوومانە تەرحە گیایەکی هەیە بەشەو وەک گەوهەر ئەدرەوشێتەوە. بەڕۆژ دەر ناکەوێ. (گیا هەرجن)ی پێ ئەڵێن. پیاو کە خۆی هەڵی کەندی ئەمرێ. لەبەر ئەوە پەنێن گیسکێک بەبنجەکەیەوە ئەبەستینەوە. لە دوورەوە ئەو گیسکە بەر بەرد ئەدەین. هەتا گیایەکە لەبن هەڵئەکەنێ. ئیتر گیسکەکە ئەمرێ، ئێمەش گیایەکە پوختە ئەکەین و بۆ کار و فەرمانی خۆمانی بەکار ئەهێنین!». بۆ بەیانی داوای براکەمی کرد کە لەگەڵیا بچن بۆ سەر کوڕەکاژاو، بەڵام ئێمە مەترسیمان لێ ئەکردن، باش بوو بەسایەی خوارەوە هەتا براکەم لە بەرزیجەوە هاتەوە، ئەوان ئارامیان نەگرت، لێیان داچوون بۆ دێهاتەکانی تر. تومەز ئەمانە مەبەستێکی خراپیان هەبوو، لەبەر ئەوە لەهەر لایەک داوای پیاویان کردبوو ئەیان دابوونێ. ئیتر خوا وای ڕێکخست لائەمدەنە دێی (زێیە)، کوڕی کوێخاکە بەناوی میوانداریەوە دڵیان ناشکێنێ بەتەنیا سوارە ئەچێتە سەر شاخی (زێیە)، لەوێ ئەفغانییەکان بەهەر شەشیان ئەیگرن و ئەیخنکێنن! سەرەو ژێر بەدارێکا هەڵی ئەواسن! ئاگرێکی نیڵە نیڵی لەژێردا ئەکەنەوە. بۆ ئەوەی پیری لەشی بتوێتەوە تک تک ڕۆنەکەی بکەوێتە خوارەوە، ئەوانیش کۆی بکەنەوە. با لێرە ئەمان بەجێ بهێڵین. بێینە سەر باسی کوێخا.

«کوێخای زێیە کە لە شار ئەگەڕێتەوە باسی کوڕەکەی بۆ ئەگێڕنەوە هەر بەو شەوە بەخۆی و چەند

سوارێکەوە پێ شوێنی ئەفغانییەکان هەڵئەگرێ و ڕوو ئەکاتە شاخەکەی زێیە. تا بەیانی ئەسووڕێنەوە هیچ نابینن. بەناهێکی سەرد و لێوێکی بەگەردەوە بۆ قوڕپێوان، بەرەنجەڕۆیی لە شاخەکەوە دێنە خوارەوە، بۆ ماڵەوە. خوا و ڕاستان ئەو بەدخوازانەیان دێتە ڕێ. کە لە دوور تەماشا ئەکەن دووکەڵێک دیار ئەبێ. ئەچن بەپیریەوە کە ئەبینن ئەوا شەش ئەفغانییەکەن ئاگریان کردۆتەوە. کوڕەکەش سەرەونخوون هەڵواسراوەتە سەر ئاگرەکە! جارێ هەر لە دوورەوە دەسڕێژێک ئەکەن دوانیان لێ ئەکوژن. ئەچنە سەریان ئەوانیش چوار پەل ئەبەستنەوە، دوونیان ئەنێرن بۆ شار بۆ باڵبازخانە. دووانەکەی تریشیان ئەبەنە ماڵەوە. هەر ڕۆژ کوتێک گۆشتیان لێ ئەبڕن، هەتا ئەمرن!».

ئیتر هەر ئەو شەوە سارده لەوێ ماینەوە. بەیانی بەجووتە بەرەو شار چووینەوە بۆ (سلێمانی).

***

## سرۆچکم چۆن دی ١٩٣٢/٩/٧

(سرۆچک) یەکە بەشی چوار لای سلێمانییە. دەراوی بەشێکی گەورەی خاکەکە لە سەرچاوەی سرۆچکەوە دێتە دەرێ. سرۆچک بەکۆمەڵ دێهاتەکانیەوە تێکرا بەدەست کوڕانی (شێخ عیسا) و (شێخ مووسا)وە بوو. (شێخ عیسا) نزیکەی (٨٠٠) ساڵ لەمەوبەر پێش پێی کەوتبووە سرۆچکەوە. ئیتر لەو ساوە هەچ بەروبوومی بۆ میری دەستکەوتووە بەرەو ڕووی ئەو شێخانەی

کردۆتەوە. دێهاتەکانی پڕن، خانووەکانی دوو نهۆمن، شێوەیەکی سەیریان هەیە. تۆزێ لە هی (سلێمانی) دوورە، هەردێیە، یەکێ، یان گەلێک لەو شێخانە سەرداری ئەکات. هەتا چوار ساڵ لەمەوپێشیش لادێییەکان بەدەست زۆر و ستەمی ئەو شێخانەوە نازاریان ئەچێشت. ئەو شێخانەی لەدەمی(بابان)ە کاندا کە دەستیان سەندبوو، یاخی بوو بوون.

(سرۆچک) لەگەڵ ئاوکەمیشیدا تووتنێکی بێشوماری چاکی لێ ئەکرێ. بێجگە لەوە، هەموو ڕەنگە سەوزەوات و دار و درەختێکی تیا ئەچێندرێ. خۆ ترێ و هەرمێ و هەڵووژەی هەر باس ناکرێ بۆ زۆرێ، نیوەی میوەهاتی شاری (سلێمانی) لە سرۆچکەوە دێت. تەنانەت جێی وای هەیە ترێکەی بەر دەمی بەفرباریین ئەکەوێ!.

سرۆچک لە تەماشاگاه و ئاو و باریشدا هەر دەوڵەمەندە. شاخی کوڕەکاژاو کە هەر لە شاه کلاوێک ئەکات، لە ناوەڕاستیدا بڵند بۆتەوە. ئەم شاخە بەتەرحێکی وا زەوییەکەی بەپیت کردووە لە دوورەوە بستێک زەوی ڕووت بەگران بەرچاو ئەکەوێ.

لەبەر شیرینی و ڕەنگینی کوڕەکاژاو بەسەرێتی (بابان)ەکان و شێخە دەستدارەکانی (سلێمانی) و پیاوە گەورەکانیان سەیرانگاهێکی یەجگار گەورە بووە. هێندە بەرزە، هەموو شارەکانی چوار لای سلێمانی لێوە دیارە. بەهاران کە تەرزە ئەبارێ (کوڕە کاژاو) بە(مانگەشەوە)، کە مرواریەکی خواکردە ئەبریسکێتەوە. لە بەهاردا گژ و گوڵ و گیا بەتەرحێکی لێ ئەکا، نە مەل ئەمێنێ، نە گیانلەبەر، نە



لە وەندەرێنەوە وێنەی شاخی ڕەنگینی کوڕەکاژاو گیراوە

پیاوان، دڵیان نەخرۆشێ و، کەمەندکێش نەبن و، نەچڕێن و، گۆرانی نەڵێن و شەو و ڕۆژیش لەوێدا نەکەنەوە. بێجگە لەمە (کوڕەکاژاو) هەموو ڕەنگە گیایەکی بەهاری کیمیایی هەیە. خۆ گیاتلەبەران هەر باس ناکرێ کە چەند لەوێدان. پەل و پۆکانی (کوڕەکاژاو) کە هەموو سرۆچک نەگرنەوە لە هەرچی دار هەیە بەسەریانەوەیە. داری گوێز، قەزوان، باسقەندە، هەڵوورژە، بەلاڵووک، گێلاس، ڕێواس، هەرمێ، بەهێ، ترێ... هەموو تەرحە دارێکی تیایە، کە گیرفانی لادێییەکان پڕ ئەکەن لە پوول و پارە. ئەم شوێنە خۆشە کاری کردۆتە ڕەوشتی سرۆچکییەکان. شێخەکان و لادێییەکانی تریش هەتا خوا حەز بکا، جوامێر و توانا و لەش سووکن. کە ئەچیتە مالّیان سەریان لە ڕێتایە. بەگەورە و بچووکەوە میوانداریت ئەکەن. خۆ بەزم و ئاهەنگی شێخانی ئەوێ هەر باس ناکرێ. زۆربان دڵتەڕ و دڵکراوە و گۆرانیبێژن.

ئەم شاخە بەرزە لووتی هەموویشیانی بڵند کردۆتەوە. لە ئازایەتیدا بێ هاوتان. لە شەڕا شێرن. لە سواری و تفەنگ ئاگردان و خۆ بەکوشتداندا دلێرن. بەکۆمەڵ بیرێکی پاک و خاوێنیان هەیە. هەموو شتێکی ڕاست و ڕەوان پەسەند ئەکەن. (نیشتمانی کورد)یان خۆش ئەوێ. حەز بەبەرزی خاکەکەیان ئەکەن. ڤینیان لە هەموو بێگانەیەکە. ئارەزووی شت دروستکردن و خوێندن و چاندنیان زۆرە.

(شاکر فەتاح)

(شاگردێکی خوێندنگای بڵندی بروممانا لە لوبنان)

١٩٣٢/٩/٧

## کامیل

ئەوەبوو پار کە هێشتا شێخ مەحموود خۆی نەدابوو بەدەستەوە، مەحموود جەودەت و حامیدی برای لە شێخ تەکانەوە و خۆی دایە دەست ئەو حکوومەتەی لە دەست زۆریی هەرایان کردبوو. بەڵام کامیل هەر خۆی نەدا بەدەستەوە، هەردەمە لە هەرد و شیوێکدا خۆی دەشاردەوە، هەتا ئەم حەلە:

کە فەیسەڵ پاشای عێراق چووە پێنجوێن هەر بەر تەرحە مابووەوە، ئەمجارە هاتبووە ناو خێوەتەکەی فەیسەڵ، خۆی هاویشتبووە بارەگای ئەوەوە(؟)، ئەویش لێی خۆش بوو.

فەیسەڵ ئەمجارە لە هەڵسان و دانیشتنیدا گەلێ کەسی لە خۆی دڵیەشاند. کوردەواری ناو شار و دێهاتییەکان بەجارێک دڵ شکستە بوون، لەسەر ئەوەشدا (١٢) هەزار ڕوپیە لەکیس بەلەدیەی قوڕبەسەر چوو، لەسەر ئەوەشدا خەریکە چەند دێیەک لەو ناو دەشتی قزلجەیەدا دەکڕێ.

بەم بۆنەیەوە ئازایەتی پیاوێکی چایچی کورد دەگێڕنەوە، لەناو چوار باغی پێنجوێندا (فەیسەڵ) بەشە زەویەکی جوان دێتە پێش چاو، یەجگار دڵی دەیگرێ، (ئەمین)، چایچییەکە بانگی دەکا هەرچەندە لەگەڵیدا دەکا و دەکۆشێ ئەمین پێی نافرۆشێ... فەیسەڵ بۆی دەکا بەسەد لیرەی زەرد، بەساردییەکەوە دەڵێ: «نە، نایفرۆشم!...».

..........................................................

(زۆر بەداخەوە، لێرەدا دەفتەرەکە لەوە دەچێ پێنج شەش پەڕەی لێ کرابێتەوە، بۆیە پاشماوەی ئەو پەڕە دڕاوانە بەدەرزی ناوەڕاستی دەفتەرەکەوە ماوە، ئەوەشی ماوەتەوە تەنیا پەڕەو نیوێکە و ئاوا دەست پێ دەکا: (أ.ب):

... شەو، هەر کەسە لەماڵی خۆی نوستوو ئاگای لە هیچ نییە، لافاو لە گزێژە بە هاژە هاژ هاتۆتە خوارەوە. ئیتر ئەوە خانووە و ڕای داوە، ماڵە و بەسەر بێشکەوە بردوێتی، بازاڕ و دووکانە تێک و مەکانی داوە، قەیسەری نەقیبی شکاندووە چووەتە ژوورەوە هەرچی شەکر و چا و کووتاڵ بووە بەجارێ بەناو ئەو هەموو کۆڵانانەی دەرگەزێن و سەرشەقامدا ڕاپێچی کردووەتە شیوەکانی خوار جوولەکانەوە.

ئاو بەتەرحێک بووە تا باڵا پیاوێک ئەو خانووانەی گەڕەکی گزێژە و لای مزگەوتی گەورە و مەڵکەندیی پڕ کردووە. لەو نیوەشەوەدا قیژ و هوڕی دایکی ڕۆڵە خنکاوان و زریکەی منداڵان بەدەم ئاوەوە، قوڕ پێوانی ماڵ کاول بووان گوێی پیاوی کەڕ کردووە.

قوڕ و چلپاوی ناو بازاڕ و دووکانان تا سێ ڕۆژ پاک کراوەتەوە. لە مەدا گەلێ ماڵوێران بوو، گەلێ کەس نابووت بوو، گەلێکیش بێ ڕۆڵە و دایک و باوک و خوشک و برا مایەوە!!

ئەو زیانەی بەراورد کراوە دەڵێن لە ٣٠ هەزار دینار کەمتر نییە، کاری کۆمەڵی (هیلالی ئەحمەر)ی بەغدا ڕاست بێ، گەیشتن بەهاواریاندا و چوونە سلێمانی ٢٥٠ دیناریان دابەش کرد بەسەریاندا و ٢٠

دیناری کەشیان لە بەغدا لەملا و لەولا بۆ کۆکردنەوە، ئەگین گەلێ گیانی کە دەبرایەوە ئاسمان!...[1] قوتابییەکانی بەغدا: منیش لە بەغدا لە قوتابییە کوردەکان چوار دینار و سێ سەد فلس بۆ کۆکردنەوە و بەسایەی ئەو کۆمەڵەوە بۆم ڕەوانەکردن بۆ سلێمانی. ناویشیانم لە ڕۆژنامەکاندا نووسی تا برا کوردەکانی کەشمان بێنە جۆش. ئەوانیش شتێ کۆ بکەنەوە و بینێرن.

## تەمسیل

کە هاتمەوە سلێمانی قوتابییەکانی قوتابخانەی سانەوی خەریکی تەمسیلی (سەلاحەدینی گەورە) بوون، توانیان لە (١٥)ی مانگی ڕۆژووەدا بەشێوەیەکی جوان دەری بێنن. منیش بەسایەی شەوگاری درێژی ئەم مانگەوە توانیم کۆمەڵێکی (٢٠) کەسی لە دەستەی براکانم ڕێکخەم، ئیتر هەموو شەوێک لە شوێنێک گرد ئەبووینەوە بەیاری و گەمە و قسەی خۆشەوە خۆمان خەریک دەکرد، پاشان (بۆ کەڵکی لێقەوماوانی لافاو) توانیم بیانهێنمەوە سەر ئەوەی کۆمەڵێکی تەمسیلی لەو چەند کەسە ڕێک بخەین.

بەڕاستی هەموو بەمەردانە هاتنە پێشەوە، هەتاکو لە ناوچەی شەش ڕۆژدا یەکێکیان موستەفا سائیب توانی دوو چیرۆک لە زمانی بێگانەوە بگۆڕێتە سەر کوردی و دابەشی کا بەسەر ئەوانەدا کە یارییەکە دەکەن. منیش چیرۆکێکی پێکەنینی (١٨) لاپەڕەییم ڕێکخست.

(١) لە مانگی تشرینی دووەمی ١٩٣٢ لافاوێک لە شاری سلێمانی ڕووی دا. بەڵام وەک سەرچاوەکان دەڵێن زیانی ماڵی زۆر داوە و زیانی گیانی نەبووە.

هەر بەم ناسۆرەوە حەمدی ساحێبقران هەڵبەستێکی داناوە و دەڵێ:

سالێ جارێ هەر ئەبێ ئەم شارە بێتە مەزبەلە
یا بە بۆمبا، یا بە ئاگر، یا بە بارانی پەلە
بۆچی بوویتە مەسخەرەی ئەرز و سەما ئەی مەملەکەت
بۆچی بوویتە مەعرەزی ئافات و فیتنە و وەلوەلە
خەڵقی وەک تینووی بەراون بۆ غەمی باران کەچی
بەو غە بارانە ئێمەت خستە ئەم مەرگەمەلە
یا بە حاڵی ئێمە گریا گۆیژە فرمێسکی بە خوڕ
هات و لێشاوی سلێمانی کە خستە زەلزەلە
ئەم برینانە زەمانە هەر دەبێ سارێژی کا
(حەمدی) ئەمما بۆ ئەمەش پێویستە: سەعی و حەوسەڵە

بۆ زیاتر بڕوانە:

أ- دیوانی حەمدی، چاپی ١٩٥٧، ل ١٠٤-١٠٥.

ب- ئەکرەمی مەحموود سالح ڕەشە: شاری سلێمانی - دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی - بەغدا ١٩٨٩، ل ٣٢٩.

هەموو داماننا کە شەوی جەژن دەست پێ بکەین، هیوامان وا بوو کە هیچ نەبێ سێ سەد ڕوپیەیەک کۆ بکەینەوە، بۆ ئەو هەژارانە. بەڵام (واحید مەجید) ناو ماموستایەکی ترسنۆک بوو، بووە خۆرە و چووە گیانی ماموستاکانی ترەوە، هەرچەند هەوڵمان دا لە کەس نەترسن و بیکەن: چونکی بۆ وڵاتە قورپەسەرەکەیانە، گوێیان نەگرت... هەر ئەوەندەت زانی ئەوانی کەیش پێیان زانی، کۆمەڵ سارد بوودوە، موستەفاش ئەوی نووسیبووی لە داخا دڕاندی، بەسایەی چەند بەدێکەود تەمسیل تێکچوو، ئەو چەند هەژار و بەسەزمانەش لە ژیانەوە بێ بەش کران!!

شاکر فەتاح
یەکێ لە قوتابیانی بیعەی هەندەسە
بۆ ئینگلیتەرا دوایی ساڵ[1]

هەرچەندە نزیکەی نۆ مانگ لە (فەلەستین) و (لوبنان)دا مامەوە بۆ خوێندنی زمانی ئینگلیزی[2]، بەڵام هەرچی ئەرک و ئازار و نەخۆشییەکم لە (بەغدا) تووش بووبوو لە بیرم چووەوە. لە بەغداوا کە هەرگیز تەندروستیم بەخۆمەوە نەدەدی، لە (فەلەستین) و (لوبنان)دا گەیشتمە ئەوپەڕی تەندروستی و ئازادی و کامەرانی. ئەمەیش هەر لەبەر ئەوە نەبوو کە ئاو و بای هەواری نوێم لە هی کۆنم چاکتر بوو، هەروەها لەبەر ئەوەیش بوو، کە لێرەدا هەستم بەسەربەستی و ئازادی و چێژکەی جوانی و پێشکەوتن و کامەرانی دەکرد. خۆ سروشتەکەیش لەوێ بوەستێ کە سەرتاپا لە سروشتی کوردستانی ڕەنگینی دەکرد. داخەکەم بەهۆی گێژەلووکەی زرنگ کاری (السیاسة)یەوە ناردن (بعثە)کەم لەدەست چوو! کاربەدەستانی نوێ زۆرداریەکی زۆریان لە من، بەڵکو لە هەموو کوردەواری کرد! وەک لەوەپێش بڕیار درابوو، نەنێرام بۆ زانکۆی (ئۆکسفۆرد و کەمبردج). هەر هەوڵ و تەقەلایەکم دا بۆ چوونە ئەورووپا بەفیڕۆچوو[3]!. ساڵێکی تریشم لە دەست چووا بۆ ساڵی سێهەم ناچار بووم چوومە (زانستگای ماف)[4].

لە بەغدا هەر سێ ساڵەکەم بەسەرفرازییەوە بردەسەر. بەڵام خەم و خەفەتی ڕۆژگار و ئەرک و ماندووبوونی خوێندن دیسانەوە کز و لاواز و بێ هێزی کردمەوە!. گەلێک جار لە تاو ئاوارەیی و ئازاری کارەسات، دەردی دڵی خۆم بەگریان سارێژ دەکرد! جیهان لەبەرچاوم تاریک بووبوو. ئەم دەزانی لە ژیاندا ئەمەندە فروفێڵبازی و چاوڕاو و زۆرداری و بەدخوویی هەیە. لەگەڵ ئەمەیشدا، هەستم دەکرد بەچاکەی

(١) هەتا ئێرە لە دەفتەری (یادنامەکانی ساڵی ١٩٣٢) دایە و درای ئەمە دێینەوە سەر دەستنووسەکەی (ئارتینەی ژینم ١٩٨٨).

(٢) مامۆستا لە دەفتەرە دەستنووسەکەی ئەو کاتەیدا دەڵێ: «... مامەوە بۆ مەتریکۆلیشن».

(٣) وەک دەردەکەوێ ئەو ساڵەی خوێندنی لە (برومایا) لە لوبنان وەک (تمهید)ێک وا بووە کە زمانی ئینگلیزی فێربێ و دواتر بینێرن بۆ بەریتانیا - ئۆکسفۆرد، بەڵام بەهۆی باری سیاسییەوە ناردنەکەی چاوی لێ پۆشراوە. جا ڕوونی ناکاتەوە ئەو باری سیاسییە پەیوەندی بەخودی خۆیەوە بووە یان بەرەوشی گشتی دنیاوە؟

(٤) مەبەستی کۆلیجی یاسا، -قانون، حقوق-ە.

خەم و خەفەت و ئەرک و ئازاری کارەسات. تەماشام کرد وەک مامۆستایەکی زرنگ و کارگوزار فێری (ڕاستیی ژیان)م دەکەن. هەروەها فێری زۆرانبازی و بەرەنگاریی کردنی زۆرداری و نەخۆشی و هەژاری و نەخوێندەواریم دەکەن لەناو (کوردەواری)دا. لەم دوو سێ ساڵەدا چ بەوتار، چ بەنووسراو، لە چاپکراو و چاپ نەکرا و، گەلێک بەرهەمی وێژەییم بۆ پێک هێنرا. لە شوێنێکی تردا بەدرێژیی باس دەکرێن. ئەم بەرهەمانە و هەندێک فەرمانی تر، لەگەڵ پێگەیاندنی خۆمدا تروسکاییەکی هیوایان لە تاریکی دڵمدا داگیرساندبوو. جاروبار ژیانم بەخۆشییەوە دەهاتە پێش چاو، بەتاڵ و شیرینییەوە. زۆر جاریش تەنگوچەڵەمەی تەندروستیم دەیخستمە پشم و قین و ڕقەوە، دەیخستمە دوژمنایەتییەوە، هەڵەی گەورە گەورەی، پێ دەکردم، کە زۆر دوور بوون لە من بوەشێنەوە... لەمەدا زۆرتر ڕقم لە خۆم دەبوودوە خەفەتم دەخوارد بۆ خۆم کە ماوەم دەدا خەفەت بمخوا!... لێرەوە هەستم بەخۆم کرد: هەروەک تەندروستیم لە دەست چووە، بەهۆی ئەندازە نەگرتنەوە[1] لە میانی (ئەرک) و (ماندوو و حەسانەوە)دا، هەروەها ئارامی گیانیشم لە دەست چووە بەهۆی نەمانی (خۆشەویستی)یەوە لە دڵمدا!... ئینجا لەسەر ئەم دوو بنچینەیە چارەی (لەش) و (گیان)ی خۆم دەکردا... بەڵام ساڵانی بەسەردا تێپەڕی ئینجا چوومەوە سەر دۆخی جاران!.

## ساڵێکی سەیر

لە ساڵی ۱۹۳۳م سەیرترم نەدیوە! ساڵێکی پڕ کەیف، ساڵێکی پڕ ئازار. ساڵێکی بێ فرمان، ساڵێکی کاروباردار. ساڵێکی بێ قوتابخانە، ساڵێکی پڕ خوێندن و بێ خوێندن! خۆشی و دڵگەشی، ناخۆشی و دڵتەنگی، سەرسووکی و ئەرک گرانی، ژینی کۆمەڵی و ڕابواردنی تەنیایی، هیوا و ڕەنجەڕۆیی، هەمووی لەم ساڵەدا بۆ من کۆبووبووەوە. گاهێ لە ژوورێکی چوار لا گیراوی دووکەڵداری بچووکی ڕەشدا، خۆشییەکم هەبوو کەس نەیبوو، جاری واش هەیە لە گوڵزارێکی نەشئەبەخشی خۆشی دەرا، بەدڵتەنگی و ماتی سات بەسات و کات بەکاتم ڕانەبوارد!! لەگەڵ ئەوەشا سەر ئازادی ئەوەم کە توانیم کەمەکێ بۆ وڵاتەکەم بکۆشم. سوپاس بۆ خوا.

## مەنگی ڕۆژوو

کە لە تاقیکردنەوەی مەتریکولێشن بوومەوە هاتمەوە سلێمانی. بەڕاستی هاوڕێ دڵسۆزەکانم، ڕەئووف ئەمین، جەلال محەممەد، ئەحمەد عارف... ئەمەندە بەدەورپشتما هاتن، هێندە بەدڵی من بزووتنەوە ڕۆژ و شەو، بەهەناسەیەک لێ دەڕۆیشت. سلێمانی شتێ وای تیا نییە کە پیاو خەریک کا و پێوەی ڕابوێ لەبەر ئەوە بیرم لەوە نەکردەوە لەم هاوەدەمانە کۆمەڵێک ڕێک خەم هەموو دەم پێکەوە بێن ئێش و ئازاری بێ کاری ڕوومان تێ نەکا!.

(۱) بەهۆی ئەندازە نەگرتنەوە: بەهۆی لەنگەر نەگرتنەوە لە نێوان...

شەوێک، شەش حەوتێکیان بانگ کردە ماڵەوە تا سەعات چوار و پێنج بەقسەی خۆش و گاڵتە و یاریی ڕامان بوارد. تومەز ئەوانیش ئەمەیان بەدڵ بوو ئیتر کۆبوونەوە وای لێ هات هەر شەوە بەرێکوپێکی لە ماڵی برایەک کۆ ئەبووینەوە. کۆمەڵ تا ئەهات گەورە ئەبوو، دۆست و ناسیاوی پێوە ئەنیشت، بەزم و ڕەزم تا ئەهات گەرم ئەبوو. ئیتر کۆمەڵەکەمان بوو بەخێزانێک، باسی نیشتمانپەرستی، ئاداب، زانست، پێکەنین، قسەی سەیرسەیری تیا ئەکرا. تێکرا هەموو گۆرانی و یارییە کۆنەکان لەو کۆمەڵەی ئێمەدا ژیانەوە. ئەمە تا ٢٨ی مانگی ڕۆژوو درێژەی بەست. زۆر خۆشە بیست برا لەو شەوە ساردانەی مانگی ڕەشەمێیەدا بەدیار گوێ ناگردانەوە، بێ شەڕ و ناخۆشی تا سەعات حەوتی شەو بەگۆرانی و یاریی و بەزم و ڕەزمەوە ڕابوێرن. شەوچەرەی خۆش و چایی بخۆن و بخۆنەوە.

نزیکی دوو مانگێک ئەبوو لافاوەکەی سلێمانی هەڵسابوو. ئەم لافاوە زیانێکی گەورەی بیست هەزار لیرەیی دابوو. بۆ لێقەوماوان شتێکی زۆر کەم کۆکرابووەوە. من کە لە (بەغدا) بووم. لە قوتابییەکان، نزیکی (٤٣٠٠) فلسم کۆکردبووەوە و دابوومە دەست ئەوانەی بەسەر لێقەوماوەکانیاندا دابەش ئەکردن. بەڵام یەجگار کەم بوو. لەبەر ئەوە ویستم لەم کۆمەڵە هاوڕێە شتێک پێک بێنم، چارەسەرێکی ئەو لێقەوماوانەی پێ بکەم. کە بەبراکانم گوت بام (تمثیل)ێک بکەین. دراوەکەی بۆ لێقەوماوانی دەستی لافاوبێ هەموو پەسندیان کرد. کۆمەڵمان ڕێک خست، دوو سێ سەرگوروشتەمان گۆڕییە سەر کوردی خۆم یەکێکی پێکەنینم دانا، یاریکەران هەڵبژێران هەر کەسە بەشی خۆی نووسییەوە لەبەری کا. وا دانرابوو شەوی جەژنی (تمثیل)ەکە بکرێ. کۆمەڵێکی زۆر گەورە و پیرۆز بوو. لە پێشەوەرانی شار، لە قوتابیان، لە فەرمانبەران، لە مامۆستایانی تیابوو نزیکی (٢٢) کەس بەڕوویەکی گەشەوە بۆ پێکهێنانی ئەم کارە کەلکدارە هەوڵیان ئەدا. هەموو شتێ ئامادە کرابوو. هیوا زۆر بەهێزبوو لە (٤٠٠) روپیەمان کەمتر دەستگیر نەبێ.

بەڵام داخی بەجەرگم، خورە کەوتە ناومانەوە ترس و لەرزی یەک دوو مامۆستا و قوتابی لەوەی کە جێگاکەیان لەق نەبێ، بەدزیانی چەند کەسێکی دەرەوە کە بەناوی «خەریکبوون بەسیاسەتەوە» بەدناویان کردبووین. ئەو کۆمەڵە گەورەیەی تێک و مەکان دا، نە (تمثیل) کرا، نە کۆمەڵ گیرا، نە هاودەمی ما، نە یێکەس و هەژارانیش تۆزێ سوودمەندبوون!!

ئیستر لەو کۆمەڵە گەورەیە هەر دووان و سیانە، یاخود تاک و تەرا هەر کەسە بەدڵێکی غەمگینەوە خووی دابووە لایەک، یان تەمەڵخانە یاخود چایخانە!؟...

## بیعثە - نێراوان

لە ساڵی ١٩٣١ەوە بوومە کۆمەڵی (بیعثە)ی زانستی حکومەتی عیراقەوە. ئەوەبوو و لە پاش ئەو هەموو کەشمەکەشە کە بەسەرمان هات، چووینە تاقیکردنەوە، تەواومان کرد، بەڵێن وابوو پاش جەژنی (رمضان) نمرەکانمان لە ئینگلتەرەوە بۆ بێتەوە. ئیتر ئەوەندە دڵنیابووم لە هاتنی. لە هاتنی جەژن ئەترسام

که زوو بڕۆمەوە بۆ بەغدا، ئەمگوت نەوەکی غەرەکانمان هاتبێت و ئاگام لێ نەبێ، نەوەکی بیانەوێ زوو ڕەوانەی لەندەنمان بکەن.

ئەگەر نەخۆشییەکی یەجگار گرانم نەگرتایە لەو دەمەدا بێگومان بۆ بەغدا نەچووم. نەخۆشییەکەم کاریگەر بوو زۆری لێ نەترسام، پارەیەکی زۆریشی لەدەست کردمەوە. بۆیەکا سلێمانیم بەجێ نەنەهێشت!.

تا شانزەی مانگی نەورۆزیش -مارت- هیچ هەواڵێکم چنگ نەکەوت. دوایی لە ڕۆژنامەکانی عێراقدا نووسرا من یەکێک بووم لەو سەرکەوتووانە. دەستبەجێ بەهیوایەکی بەهێزەوە چوومە بەغدا کاروباری خۆم ڕێک بخەم کە ئەبینم سکرتێری وەزارەتی معارف ئەڵێ ئێوە هەموو (دەرنەچوون) ئەبێ تەواوی کەنەوە. ئەگەر قسەکەی ئەو ڕاست دەرچوایە باری من لە هەموویان گرانتر دەبوو. تا یەک دوو ڕۆژ لەبەر دڵتەنگی ئارامم نەدەگرت. ڕەنجەڕۆیی زۆر ناخۆشە. بەڵام بەسایەی خواوە قسەکەی ئەو دەرنەچوو. پاش چەند هەفتەیەکیش پیرۆزنامەی سەر مامۆستاکەی (B. H. S.)ی لوبنانم بۆ هات ئیتر بەتەواوەتی لە ڕاستیی دەرچوونم دڵنیا بووم. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو ڕابواردنەشدا کە لە بەغدا ڕام بوارد هێشتا کاسیم لەسەرا مابوو، تاریکی دڵمی بەر نەئەدا. سەیر ئەوەیە لە پاش وەرگرتنی (شهادة)یش، هێشتا وەزارەت بەندوباوی دەرنەچوونمانی ئەخستە ناوەوە، بەڵام بەسایەی هەڵمەتی خۆمانەوە کە لە ڕۆژنامەکاندا ئەمان برد، خوێندەوارانمان تێگەیاند کە وەزارەت ناشییە، لە نەزانین و دوژمنایەتییەوەیە ئەم بەندوباوەمان دوائەخات. هاوین هات و ڕۆیی وەزارەتی معارف کەسمانی نەنارد. بەڵام شیعەیەتی و کەدارییی و پشت بەستەیی، سیاغانی لەسەر دڵ و دەروونی سەر ڕاستیی وەزیری معارف هێشتەوە؟! ئەوان نێران بۆ بەیرووت - ئەمریکا. ئێمەیش دەستەئەژنۆ لە پاش جەور و جەفایەکی دوو ساڵی ڕەنجەڕۆ کراین.

دەستم لەم لا بەردا. بۆ وەزارەتی (اقتصاد و مواصلات) نامەیەکم -لەسەر داواکردنی خۆیان- نارد کە من شهادەتی متریکولیشنم بەدەستەوەیە، تکا ئەکەم وەک خۆتان داواتان کردووە، لەسەر پارەی (شرکتی نەوتی) عێراق بمنێرن بەسایەی (ئەمین زەکی بەگ)وە ئەوەندە سەری گرت کە ناردیان بەشوێنما، شهادەتەکەیان داوا کرد، کە پیشانم دان، پەسندیان نەکرد، لەگەڵ چوار کەسدا ڕەنجەڕۆیان کردین. کەچی لەجێی من جوولەکەیەکیان نارد شهادەتیشی پێ نەبوو، بەچاو و ڕاو وایان لە وەزیر گەیاند کە هەیەتی هەتا گەیاندیانە ئینگلتەرە. ئیجا بۆیان جێبەجێ کرد کە بۆ (شهادەتی متریکولیشنیش) ساڵێکی کەش لەوێ بخوێنێ! بەو جۆرە لەوەشیان ڕەنجەڕۆ کردم!!...

دوایی وچانی هاوینی قوتابخانە بوو، (بابا عەلی شێخ مەحموود) بەپەلە نامەیەکی بۆ ناردبووم کە بەزوویی داوای (بیعثە) نەکەیت، دڵنیابە کە پەسند نەکرێیت. چونکی لە (وەزارەتی داخلیە)وە داوایان کردوویت کە معارف لەگەڵ چەند کوردێکی تردا بتنێری. دەستبەجێ تلغرافم بۆ هەردوو وەزارەتەکە لێدا، بۆ سبەینێش چوومە بەغداد، لە بەختی من عەلی کەمال بەگ کە خۆی ئەمەی خستبووە مێشکی وەزیری داخلیەوە چووبووە شەقڵاوە ئەمین زەکی نەخۆش بوو، جەمال بابان. لەوێ نەبوو، خاڵیشم ئەمەندە تکای

کردبوو و رووی شکێنرابوو، کول بووبوو. تکایەک کە بۆ مزێکی راستی بێ بدرێ، تکایەک بۆ شتێکی وابێ کە منیش وەکو هەموو کەس بۆ داواکردنی ئەمەکی خۆم بێ. هەرچەندە وەزیری داخلیە و جەلال بابان -وزيري حربة- داوایان لە وەزیری مەعارف (عبدالمهدي) کرد، نەیبیست و نەیبیست. بەم جۆرە، بەبەرچاوی خۆمەوە کە لە دەستەی ئێمەدا، مەجید عەباس، دەرنەچوویەکیان ناد، سیانی تریان بەخاتر و خۆتر ڕەوانە کرد، پاش هەموو شتێک سەدی نەوەد و پێنجیان لە شیعە نارد. منێک کە گوناهم ئەوەبوو لە تاقیکردنەوەدا دەرچووبووم، بەدخوو نەبووم، شەهادەتم وەرگرتبوو، چونکی مەرایی و...م نەکرد نەنێررام!؟.

لە ڕاستیدا، لەگەڵ ئەوەشا کە دوو ساڵم لە دەس چووبوو، کەڵکەڵەی بیعسەم لەسەری خۆم کردبووە دەرەوە، بەڵام وەزارەتی ئەشغال و مواصەلات و وەزارەتی داخلیە پێیان تازەکردمەوە. جا وەرە لە بەغدادا، هیوایەکی وات لە سەرا بێ و ڕەنجەڕۆ بکرێیت، لە خانێکی چۆڵ دابی و کەست لە لا نەبێ، ناخۆشی ناومالەوە و ماڵی خاڵم، سەرت بکاتە سەر، هەر ڕۆژەش بەجەورێک ئەم و ئەو بیعسەم بۆ لێک بداتەوە، داخ لە دڵی کردەوەی چەند هاودەمێکی دیش -ئەمانە هەمووی سەرت بکاتە سەر، چۆن ترووکە لە دڵتا ئەمێنێ و چۆن دنیای بەدکارت لە پێش چاو تاریک نابێ. خەیاڵات و هاڵاوی داخی دەروونم بەتەرحێک زۆر بووبوو، هەر ئەوەندەم مابوو شێت بم!!.

پاشان کە تێگەیشتم بۆ بەزرییەکی چەند مانگی، پیاو ئەبێ نایێ و دڵ و دەروون و کردەوە و ڕەوشتی بنێتە بانی، بۆ بەختیارییەکی کەم تەمەنی ئەبێ لە پیاوەتی و سەربەرزی خۆی کەل بکا، شەقێکم لەو هیوا و ئاواتە هەڵدا کە لە بیعسەوە دەسم ئەکەوێ. بەناوچەوانێکی پاک و دڵێکی بێ باک و سەرێکی بەرزەوە چوومە (کلیەی حقوقی بەغداد)ەوە ئێستەش لەوێدا ئەخوێنم.

## هەوڵە خۆشەویستەکەم

سەردەفتەری ئەو هاوڕێ خۆشەویستانە مامۆستایەکی زیرەک و زرنگ و کردەوە ڕەنگینە. کەمال حەسون، ئەم لاوە بەنرخە کەرکووکییە، هاودەمییەکی وای لەگەڵا گرتم شەو و ڕۆژ پێکەوە ئەبووینایە نارامان نەئەگرت ئەویش وەک من هەمیشە ڕازی ناشیرینی و شێوەی ژیانانی لە زارا بوو. هێندە دۆستێکی دڵسۆز دەرچوو باسی خاوخێزانی خۆی بۆ دەکردم. کە ڕۆیشت وەک برایەکی دایک و باوکیم لە دەست چووبێ وابوو.

لە سلێمانیدا یەکە خێزانێ کە خۆشەویستیی خۆیان بەرنەدابێ خێزانی (صائب)ن. لەمانە ئێستا حاجی تۆفیق بەگ، بوێژی ناودار، جەمیل جەلال نووسەرانی چاک، مستەفا صائب، یەکە لاوێک کە بۆ نیشتمانییەکانی خۆی بکۆشێ، ئەنوەر صائب، هادی کوردی نووسی پێکەنینێ هێنەری بەناوبانگ ماون. حاجی تۆفیق بەتایبەتی مستەفا صائب بۆنەی ناسینی من بوون بەم خێزانە. لە ڕاستیدا یەکە خێزانێکی خوێندەوارن لە سلێمانیدا. قسەی خۆش و هەواڵی کوردایەتی و ئەدەبیات ئەم چەند کەسەی هەمیشە پێکەوە بەند کردووە. ڕێکییەکەیان، زانینەکەیان. منی شەیدا کرد لەبەر ئەوە بەجگار دڵخۆش بووم کە

لەگەڵ ئەم خێزانەدا ناسیاویم پەیداکرد. بەو بۆنەیەوە لەگەڵ کوڕەکانیشیانا دۆستایەتییەکی باشم پەیداکرد. بەڵام داخی بەجەرگم دەستی بێ ئەدەبان کەوتە ناوەوە، ئەو هاوڕێیەی من و ئەو کوڕانەی تێک دا و بێ هێزی کرد!!.

لەگەڵ ئەوەشا، ئەوانی کە، هەر لەسەر هاوڕێی خۆیانن، منیش تا ئەمێنم بەکزەی ئەو دۆستایەتییەوە ئەنازم.



دوو پوورزای یەکتر هەن: باقی نوری بەگ و، محەمەد محێدین هەردووکیان لە هاودەمیا ئەوی من ویستم کردیان.

پیاوانە و مەردانە لە سلێمانی و لە بەغداد لە نانخواردن و گەڕان و ڕابواردنا بەدڵی یەک ئەجوولاینەوە یەکەمیان ئەوهاوڕێم بوو، باشیش هاتە پێشەوە، دووەمیشیان هەرچەند لەوەپێشەوە ئەمناسی بەڵام تا لەم دواییەدا چاک نەبوو و دڵچاکیم بۆ دەرنەکەوت کەمەری دۆستایەتیمان نەبەست. ئێستاش هەردووکیان لە کانی دڵما جێگایەکی ناسکیان هەیە.

نوری مەلا حەکیمی قەرەداغی و حامید قادر دوو قوتابی (ثانوی)ی سلێمانین، کە تەماشام کرد بێ ئەمەی چاکەیەکم بۆیان بێ، ئەوان منیان خۆش ئەوێ و ئەوازشم ئەکەن؛ برایەتییەکی تەواوم لەگەڵ گرتن، ئێستە ڕووناکی چاوانمن.

وەستا عەبدوڵڵای بەرگدروو و ئەحۆلی پیت ڕێکخەری (چاپخانەی ژیان) زۆر پیاوەتیان نواند، بوون بەدۆستێکی گیانی بەگیانیم.

(ڕەشید ئەجیب)یش لاوێکە زۆری ئەخوێندووە لەگەڵ ئەوەشا بەزیرەکی خۆی گەیشتۆتە ڕادەیەک لە کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی و ئینگلیزیدا زۆر جوان ئەنووسی جگە لەوە لە زرنگترین و لەسەرخۆترین و نازکترینی دۆستە نازدارەکانی ۱۹۳۳مە. ئەم کوڕە بوێژێکی یەجگار زەبر بەدەستە. نووسەرێکی یەجگار وشیارە. هیوادارم، چونکی هەوەسی ئەدەبیاتم هەیە، زۆر لە کردەوەی ڕەنگینی و لە کاری ڕەندینی کەلکەوەر ببم. بەسایەی ئەمەوە (تۆفیق وەهبی بەگ)، وڵات پەرستی ناودارم ناسی، ئەم پیاوە کە ئەچێتە دیوانە ڕێکوپێکەکەی هێندەی شەیدای گیانی کوردایەتی ئەبێ، هێندەش دڵبەستەی نادابی قسەکردن و زانست و زانایی ئەبێ.

ئێستەکی من بەیەکێکی هەرە خۆشەویستی خۆی ئەژمێرێ. بۆ من ناشێ بەدەمی خۆم بیڵێم کە چەند لای (شێخ حەبیب)ی تاڵەبانی و خەڵکی تر هەڵی داوم! ئەم پیاوە وریا و زرنگەش ئەو پێی ناسیم. بەناسینی (تۆفیق وەهبی) کانێکی زانست و نادابم بۆ خۆم کڕی. لە سایەی ئەمەوە مایەی کوردایەتی و شارەزایی زمانە کوردییەکەم ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لە زۆری ئەکا.

بەسایەی سەید حوسێنی موکریانییەوە (مێجەر ئەدمۆندس)م ناسی. ئەم پیاوە ئەوەتی ئینگلیز پێی ناوەتە ئەم خاکەوە (سیاسەت بازی)یەکی گەورە ئەکا. بەڵام من لەودا دۆستی نیم. بۆیەکا حەزم

بەدۆستایەتی کرد، بەجگار خەریکی پژاری زمانەکەمانە، تا ئێستا بەچەندان (وتەی) ئینگلیزی بۆ ڕۆژنامەکەی (ئاسیای ناوەڕاست) لە بابەت کورد و زبانی کوردییەوە -بەچاکی- داوە. بەڕاستی بێگانەیەکی وا دڵسۆز پێویستە -لە ڕێگای پەروەردەکردنی زمانەکەمانەوە- یارمەتی بدرێ. کە زانیی منیش وەک ئەو سووتاوی پێشخستنی زمانەکەم وەک دۆستێکی چەند ساڵە تکای لێ کردم هەمیشە هاتوچۆی بکەم و، قسە و گوفتاری زبانە شیرینەکەی بۆ بکەم. ئێستا (سکرتێری وەزارەتی خارجیەی عێراق)ە.

جگە لەمانە: (حەمە فەرەجی هەڵەبجەیی)، (ئەحمەد بەگی وەسمان پاشا)، (حەمە سەعید بەگی دەرەشیش)، (شێخ محەمەدی شێخ حسامەدین)، (شێخ حسامەدین) (کوڕانی شێخ عەلائەدین) لەو کەسانەی کە سەرەتای دۆستایەتییان لەگەڵ گرتووم و زۆر بەدەورما هاتوون.

بەڵام ئەوەی ئێستەش جگەرم ئەکرۆژێنێتەوە ئەو بەدکارییەیە کە (حامید فەرەج) و (ئیبراهیم ئەحمەد) و (فەهمی تۆفیق) کردیان. فەهمی هەرچەندە مامۆستایە زۆر سادەیە بەهەموو شتێ باوەڕ ئەکا، کەوتۆتە دەست (حامید فەرەج) کە ناپاکی و دووزبانی و خۆپەرستی، بەری چاوی گرتووە. (ئیبراهیم ئەحمەد)یش یەکێکە لە هەردوولا بەدتر. ئەم سیانە، ئارمانجێکیان لەگەڵ کوڕانی جەمیل سائبدا، ئەهێنایە کارەوە، ئەم (یادنامەیەی) پێ پیس ئەبێ ئەگەر ناوی بێنم. خۆپەرستی و ئەو ئارمانجە پیسە، لەگەڵ بەدکارییا، سەنگی پڕکردن کە زانییان لەو دەستە برایەی ئێمەدا جێگایان نابێتەوە، کەوتنە دووزبانی تێکدان دەن.

من زوو لە کار گەیشتم زانیم ئەو کوڕانەش و کۆمەڵەکەشمان ڕیسوا ئەبێ زوو خۆم کێشایەوە، داخی بەجەرگم، مەلا جەلال و ڕەئووف ئەمین و مستەفا لەوان نەگەیشتن هاودەمییان کردن. قسە کەوتە دووی ئەو کوڕانەی جەمیل. هەر هەفتەیەک ئەو کۆمەڵە ما، بەسایەی خواوە تێک چوو. وا لەو کۆمەڵە گەورەیە هات تاک و تەرا لەگەڵ یەکا ئەگەڕان. کوڕەکانیش هاودەمی کەسیانیان نەدەکرد. ڕەئووف و جەلال پێکەوە ئەگەڕان حامید و فەهمی و ئیبراهیمیش -بەدخواهەکان- بۆ خۆیان مانەوە. بەڵام تەواو قەدریان شکا. پاش ئەمە کە ڕەئووف و جەلال محەمەد لەسەری کار گەیشتن هۆشیان هاتەوە بەرخۆ، سویاسی بیری منیان ئەکرد، کە زوو وازم هێنا. منیش لەو خۆکێشانەوەیە مەبەسم ئەوەبوو لەگەڵ ئەو برایانەدا (مستەفا، جەلال، ڕەئووف) تێک نەچم. لە ڕاستیدا وەخت بوو تێک بچن -بەهۆی ئەو سیانەوە- بەڵێ دۆستایەتیی ڕاستەقینەکە لە مێژەوە بنجی بەستبوو بەسایەی خواوە تێک نەچوو بەڵکو بەهێزتر بوو. لە ڕۆژی شەشی ئەیلوولدا ١٩٣٣ ئەو کردەوانەم لەگەڵ هەردوو برای خۆشەویستما: باقی و محەمەد دایەوە بەچاوی حامید و فەهمی و ئیبراهیمدا. لەبەر چاوی دە دوانزە لاو شکان و پەیانیان دا، ئیتر لە دڵپاکی بەولاوە هیچی کە نەکەن. جا نازانم!؟...

بەڵام من لە بریتی ئەو کۆمەڵە دەستەبجێ لە هاوڕێ خۆشەویستەکانی کەم کۆمەڵێکی هاودڵیی باشترم پێکەوەنا: شەو و ڕۆژمان پێکەوە ڕائەبوارد. بەڵام لە دڵدا شینی ئەو خۆشەویستییە کە لە کۆمەڵی پێشوودا هەمان بوو هەر ئەم کرد وە چەند شەوان پێوەی تلاومەوە. خوا بەد بگرێ!

بەراستی ئەوەندەی بەبوونی ئەو دۆستانە دڵشادم هێندەش بەدۆستایەتی تازەم لەگەڵ (شێخ مەحموودی گەورە) و (شێخ قادری برای) و (شێخ رەئووف) و (شێخ بابا عەلیدا) دڵخۆشم. خوا ئەنجامی ئەم دۆستایەتییەمان، لە پێناوی پێشخستنی کوردستاندا بەباش بگێڕێ! یاخوا.



(ئیسماعیل شاوەیسی)، سەرکۆماریش کە ئێستا لە پاش دەستکێشانەوە لە فرمانە حکوومەتییەکەی، چووتە ئەمریکا بۆ خوێندن، دۆستایەتییەکی تەواوی لەگەڵا گرتم. هەتا کە ڕۆیی. پەیمانی دامێ نامەم بۆ بنووسێ و نامیلکە و ڕۆژنامەش بۆ یەکتر بنێرین.

مەحموود جەودەت و ڕەشید عارف و جەلال مەولوودیش سەرەتای دۆستایەتییان دامەزراندووە. ئەم برایانە زۆر بەهادارن، هەموو کاری بەکەڵکیان لێ ئەوەشێتەوە، خوا بیانهێڵێ!

## رابواردنی سلێمانی

شەوانی زستان کە پەردەی عوورووسیم لائەدا، ئەو پڵپڵە بەفرانە ئەستێرە ئاسا ئەکەوتنە بەرتیشکی ئەلەکتریکەکە ئەبوونە پەپوولەیەکی گەوهەرین، ئینجا سپی هەڵئەگەڕانەوە، ئینجا شین. دڵی هەزارانی پەیوەستە ئەکرد، لەم لاوە لەناو ژوورێکی ڕازاوەدا بەگوێ ئاگردانەکەدا دەستەی هاوەڵان بەبەزم و ڕەزم و پێکەنین و قسەی خۆشیانەوە، دڵی هەزار دەردەدارانی ساڕێژ ئەکرد. ئەو سەیرانانەی کە لە بەهاردا بەئاوازە (غرامەفون) و عوود و گۆرانیبێژەوە، لە سەرچنار، لەسەر زەوییە ئەتلەسینەکەی ئەمان کرد، ئەو یاریی و ڕابواردنەی لەوێدا ئەمان کرد. لەم لاوە ئەوپەڕی ڕووبانەی کە بەکراس و کەوا و سەرپێچی ئاڵ و واڵاوە، دەورووپشتی گردە ڕەنگینەکانی سەرچنار و مێرغوزارەکەی کارێزی وەستا شەریف و وڵویەیان ڕازاندبووەوە، دەنگی بلوێر و نای و تەپڵ، تەقتەقەی پانی بەرز و زڕەی پڵپڵە و گەردانەی ئافرەتان، سیرەی سەماوەر و چریکەی مەلان، هەزارانی لە پرسەوە ئەخستە خۆشییەوە.

قەد سەیرانی (کانی مەندم) و (سەرچاوەی تابین) کە لەژێر سێ چادرا، بیست کەس - خێزانی صائبەکان (پیاوەکانیان) و هاوەڵان، تا سێ ڕۆژ لەناو ئەو سەوزەگیایە و لەشکری لالەیەدا، بەتەنشت ئەو ئاوە لاجیوەردییەوە کە هەمیشە تافەتافی ئەکرد و بەشەو هاژەهاژی ئەکرد، بەبەزم و ڕەزم و گۆرانی و یاریی و عوودلێدان و غرامەفون لێدان و مەلەوە ڕامان بوارد قەد لە بیرم ناچێتەوە. ئەو گەشتە خۆشەی شاربازێڕیش کە لەگەڵ ئەو هاودەمە خۆشەویستانەی کەوا کردم، کۆچی ئەو شەوی مانگەشەوانە، گەشتی هەورامان و هەڵەبجە کە لە هاوینەدا کردم، ئەشئە بەخشێک بوو بووم، تاڵیی کردەوەی گەردوون و ناکەس بەچانی لە بیر بردمەوە.

## کۆششی زانستی و ئەدەبی

ئەو نۆ مانگەی بەبێ کاروبار ڕام بوارد، لەگەڵ ئەو ئەشنەیەی کە برا کوردەکان و شاخ و دەشتەکانی کوردستان پێیان ئەبەخشیم، لە تەنیاییدا بیری لە بابەت گەلێ شتەوە پێ ئەکردمەوە. گەلێ شتم لە بابەت یار و چاوئەندازەی خواکرد و، کردەوەی ئەوەی ئادەمەوە نووسی. ئەمانە، لای حاجی تۆفیق و تۆفیق وەهبی و گەلێکی تر پەسندکران. لەو وتانە (مقالانە): (گەشتێک بەسەر باڵی پەرندەی خەیاڵەوە - کردەوەی ئەوەی ئادەم)، (فرمێسکی مەم)، (شەو)، (پێککەیشتن)، لە ڕۆژنامەی ژیاندا نووسران. (شەو) و (مام ورچ)یش لە (یادگاری لاوان)دا نووسرانەوە. (سەیران) و (گۆرانی زانستی) و (ناسکەقسە) و (ژن و مێردییەکی بەختیاری)یش لە دەفتەری تایبەتی خۆمدا نووسراوە. لە مانگی ڕۆژووەوە هەتا ناوەڕاستی هاوین هەشت چیرۆکی منداڵانم بەوێنە و نیگای ڕەنگاوڕەنگەوە بەنووسینێکی فراوان و سووک کە بۆ منداڵ دەست بدا، لە عەرەبییەوە گۆڕییە سەر کوردی و نووسیمنەوە: (ڕاوکەری ئەستێران، گوڵچین و گورگ، خانووی تازە، پەریزادە پچکۆلە، شوغالی چەپخوون، مام ڕێویی، مریشکە سوورە پچکۆلە، پرچ زێڕین). لە بەغداد و شام و قاهیرەدا بەسایەی دۆستانەوە گەلێ هەوڵم بۆ چاپکردنیان دا، سەری نەگرت. (خانووی تازەم)، لە چاپخانەی ژیان، بێ وێنە و ڕەنگاوڕەنگی لە چاپ دا. سەید حوسێن موکریانی لە هاوینەوە، بەڵێنی دا (پەریزادە پچکۆلەم) وەک خۆی نووسراوەتەوە وا لە چاپی دا. بەتەنشت ئەمانەوە ڕومانێکی (٦٤) لاپەڕەییم لە عەرەبییەوە کردە کوردی، ناوی (بەلقیس کچە شای سبا)ە. لەگەڵ فائیق بێکەسدا (پرشنگ)، خوێندنەوەیەکی قوتابخانەمان دانا (٦٤) لاپەڕەی گەورەیە، تێکرا باسی کەلوپەل و سامانی کوردستان ئەکا. (٢٥) وێنەی تیایە.

لەم دواییەدا (فەرهەنگۆک) ناو قاموسچەیەکی کوردی و ئینگلیزیم بەشیعر دانا نزیکی (١٤٠٠) وشەی ئینگلیزی تیایە. ئێستە لە ڕەواندز لەژێر چاپایە، گەلێ کەس وەک (حزنی، ڕەشید نەجیب، تۆفیق وەهبی) پەسندیان کرد.

لەسەر گەشتی هەورامانیش (گەشتنامەیەکی) پڕ وێنە و نیگاری (٥٠) لاپەڕەییم نووسییەوە. لە بابەت (هەڵەبجە، تەوێڵە، بیارە، دەروێش، هانە ئەوتی، باغەکۆن و خورماڵ)ەوە قسەی تیایە.

بەکورتی: ئەمساڵە، کە زۆری پێوەی ئەنازم ئەمەیە کە توانیم کەمەکێ پەروەردەی زیانەکە بکەم و لە کوردییا خۆم بەهێز بکەم و تۆزێ نووسینی کوردی بڵاوبکەمەوە. نیازم وایە، خوایارێ، یەکەیەکە لە چاپییان دەم.

## هەواڵی ناو ساڵ

١- (هاوار) کە لە شام دەردەچێ لە ژمارەی چواردەهەمەوە عێراق نەیهێشت بێتە ناوەوە.

٢- سەید حسێنی موکریانی بەبیانووی ئێرانی ڕەگەزییەوە، لە دەرهێنانی (زاری کرمانجی) دەست بەستە کرا.

٣- قوتابخانە (ثانوی)یەکانی کورد لە عێراقدا لەگەڵ پێنج و شەشی (ئیبتدائی) خوێندنیان کرا بەعەرەبی.

٤- قوتابخانەی (أمي) -نەزان- لە سلێمانی و شارەکانی کەی عێراقدا -کوردەکان- کرایەوە.

٥- قوتابی و مامۆستا کوردەکان خرانە ژێر ترس و سامێکی گەورەی حکومەتی عێراقەوە.

٦- لە هاوینیا لە ناوەندی مەلاکانی سلێمانی و چەند خوێندەوارێکا لەسەر دین هەرا پەیدابوو، مەلاکان، بەگژ تێکۆشان خستیانە (محکمەوە)، دوایی، خوێندەوارەکان سەرکەوتن.

* لە زانستیدا: کۆمەڵێکی قسەکردن -خطبة-م پێک هێنا تا نزیکی شەش مانگ قوتابییەکانی زانستی بەرێکوپێکی لە بابەت هەموو شتێکی زانستی و ئەدەبی و کۆمەڵییەوە قسەیان ئەکرد.

* لە زانستیدا تماشاگاهـ -معرض-ێکی جوانکیلانەم لە دەستکری قوتابییەکان پێک هێنا. گەلێ شتی نایابیان دروست کردبوو.

* حاجی تۆفیق، سەرداری زانستی، خەریکی دەرهێنانی (گۆڤاری زانستی) بوو، بەڵام تا ئێستا سەری نەگرتووە.

* لەسەری زستانا لە (چەمچەماڵ) رۆژنامەیەکی بچووکی دەستنووس بەکوردی لەلایەن مامۆستا ولاتپەروەرەکانەوە دەرهێنرا تا شەش حەوت دانەی دەرچوو.

* بۆ یەکەم ساڵ، قوتابخانە ثانەوییەکانی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی هاتنە بەغداد چوونە دەستەی یاریکەرانی رۆژی غایشی جوولانی لەشەوە.

٧- لە نامیلکان (گۆرانی، ناودارانی کورد، قسەی پێشینان، خوێندەواریی باو، خانووی تازە، یادگاری لاوان، خورشیدی خاوەر) لە عێراقدا: لە سوریەشدا: (دلێ کورێن من، نڤێژێنێ ایزیدیان، مولودا نبی) لە چاپ دران. لە بابەت کوردەوە بەزبانی بێگانە -ئەوەی خۆم دیومە- (لە رۆژنامەکانی ئاسیای ناوەراست و عصبة الأمم و ایران لیگ)دا، (الکرد أزاء العفو العام الترکي)، (عارنیک مصطفی کمال برمکتوب) (Question to Kurde) لە پارس و میسر و شام و هندستاندا لە چاپ دراون. لە دەستنووسی جگە لە هێنەکانی خۆم (کەلیلە و دەمنە)، (سێ دەروێش) و (مەم و زین) و (دیوانی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ) و چەندێکی تر ئامادەی چاپن.

٨- شێخ مەحموود لە لیوای دلێمەوە هێنرایە بەغداد. ئێستا لە (أعظمیة)یە.

٩- ئاسوورییەکانی عێراق، زۆریان لە زەویی کوردەکان پاک کرانەوە ئەنێررێن بۆ بەرازیل. عصبة الامم بەکوردەکانەوە خەریکە. جا نازانم چی ئەبێ؟!.

١٠- ئەفراسیاب بەگ لەسەر سنووردا، حکومەتی عێراق و ئێران چەند دێیەکیان داوەتێ کە ئیتر شەڕیان لەگەڵا نەکا. ئەوانیش وازی لێ بێنن.

١١- لە ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٣دا قوتابییەکان هەموو لە سلێمانی کۆبوونەوە لەسەر -رای من- پارەمان

نزیکی (٤٠) ڕوپیە بۆ هەژار و بێ کەسەکانی ئەو شەرە کۆکردەوە و بەسایەی میرزا تۆفیقی قەزازەوە بەسەرمانا بەش کردن.

لەو ڕۆژەدا هەرچی لەگەڵ یەک قسەیان نەبوو ئاشتمان کردنەوە. خۆشم لەگەڵ حامید و فەهمیدا ئاشت بوومەوە.

١٢- بۆ (بعثەی زراعەتی تورکیا) (ئەحمەد فەرەج). بۆ ئەجزاچێتی بۆ بەیروت (جەلال تۆفیق)، بۆ (B.A)ی بەیروت (عبدالقادر صبغة الله) بۆ (Politic Economy) لە جامعەی کۆلۆمبیای ئەمەریکا، باباعەلی شێخ مەحموودیان نارد. خوا سەریان خات. تا وڵات ئاواکەنەوە.

١٣- بۆ زانستی تیاترۆیێکم پێک هێنا (٨٠) ڕوپیەی دەست کەوت. تمثیل لە سلێمانی و ڕەواندز و کۆیە و هەڵەبجەدا کرا.

# گەشتی
# هەڵەبجە و هەورامان
# لە ساڵی ١٩٣٣دا(١)


گەشتی
هەڵەبجە و هەورامان
شاکر فتاح

## سەرپەڕە

وا ئێستا لە پاش شەش ساڵ توانیم بێمە ناوچەی (هەڵەبجە) و (هەورامـــان). وا لە پاش ئەو هەمـــوو نارامگرتنە توانیم بەبینینی کەرتێک لە خاکە نازدارەکەم دڵی خۆم شاد بکەم. خاکێک هێندە کۆن، ئەمەندە ڕازاوە، نیشتمانێک هێندە پێشکەوتوو، گەلێک هێندە زیرەک و توانا و کار ڕەنگین، هێندە زانا و دەوڵەمەند، بەکوڵی دڵەوە ئەیڵێم ئەو گەشتە، بەختیارترین هەلێکە کە بۆ بووژاندنەوەی لەش و هۆشم هەڵکەوتووە.

(هەڵەبجە) دەرگای هەورامانە. ئەو شارەیە کە بەنیشتەنی گەورە گەورەی گەورەترین هۆز (عەشیرەت)ی کوردەوە، (جاف)، ناوی دەرکردووە، پیاوی وەک (وسمان پاشای جاف) و (مەحموود پاشا) و ئافرەتی وەک (عەدیلە خانم) ئەم ناوچەیەیان بەڕێوەبردووە. لەو سەردەمەدا پیاوی وەک (شێخ عوسمانی تەوێڵە)، بوێژی گەورەی وەک (مەولەوی) و (تاهیر بەگی وسمان پاشا)، خوا ناس و زانا و تێگەیشتوو و بوێژی پێ گەیاندووە. ژیان لێرەدا ژیانی ئەوروپایە. سەربەستی ژن لەگەڵ پیاودا، لێرەدا لە هەموو شوێنێکی کوردستان زۆرترە.

(هەڵەبجە) سەرە ڕێگای بدەوبستێن (تجارت)ی عێراق و ئێرانە.

(هەورامان)یش جێگای تەماشاکاری خۆش و، بەزم و دڵداری و کۆڕی دەروێشان و کۆڕی ئازادی و سەربەستییە. ئەم ناوە لەم چەند ساڵەی دواییدا لەناو پشێویش و خۆشیشیدا ناوێکی گەورەی دەرکرد. ئێستا هەموو کەس لە خۆ و لە بێگانە بۆ «گەشت» ڕووی تێ ئەکا.

لەبەر ئەوە چاوی کوردی ئەم ناوە زۆر کراوەتەوە. جێ و بانیان زۆر پێشکەوتووە. لەبەر ئەوە منیش ئەم هەلەی بۆم هەڵکەوت، لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆشەویستمدا کاک (ئیسماعیل عەلی)، لە دەستم نەدا. هاتم

(١) ئەم گەشتە لە مانگی ئابی ١٩٣٣دا کراوە.

لە چیمەن و لالەزاری، لە کزەبای فێنکی، لە کۆڕی دڵدارانی، لە کۆمەڵی زانا و تێگەیشتووانی کەڵکەوەر بیم.

شاکر فەتاح ١٦/٨/١٩٣٣

(دەرچووی مەتریکولێشنی ئۆکسفۆرد و کەمبرج، لە خوێندنگای بڵندی بروممانا لە لوبنان)[1]

## لەڕێدا

پەیمان وا بوو ڕۆژی چوارشەممە لە بەیانیدا بڕۆین، بەڵام ئۆتۆمبیلچییەکە پەیمانەکەی خۆی ڕانەگرت، نیمەی خستە چێشتەنگاو. ساتی چوارەم[*] سواربووین. کوڕێکی دەنگخۆش و پیرێژنێکی ڕووخۆش و دوانی بێدەنگی کەمان لەگەڵ بوون. لە ڕێگا تاو، تاو، بەنۆرە من و ئەو گۆرانیمان بۆ یەکتر ئەسەندەوە. لەگەڵ هاوڕێکەیشمدا ناو بەناو قسەی خۆش خۆشمان ئەکرد.

ڕێگاکەی زۆر باش بوو. چونکە هاوین بوو. ئەگین لە زستانا ئۆتۆمبیل لە قوڕ ئەچەقی، دەرەتانی نابێ بچێ بەهیچ لایێکا. ڕێگاکەمان بەناو گەرمای شارەزووردا ئەڕۆیشت. جارجارێکیش لە شاخە دوورەکانی هەورامانەوە کزەبایەکی فێنکی لێ ئەداین. گەلێ دێمان هاتە ڕێ. لە هەوراماندا چایخانە هەبوو. (ئاوی چەقان) و (ئاوی سەراوی سوبحان ئاغا) و گەلێ ئاوی زۆری کەمان هاتە ڕێ. شوێنەکەی یەجگار ئاودار و زەویزاردار بوو. چڕە دارستانی گەورە گەورەیش بەلای ئەم ئاوانەوە پەیدا بوو بوون. بێجگە لەوە ئەم ئاوە تووتن و مەرزە و چنار و بییەکی زۆری لێ دەڕوێنرێ. زۆریەیان هی بەگزادەکانی جافن. تووتنەکان چاودێریکەری میرییان بەسەرەوەیە. لەسەر شێوەی تازە تووتنی (سامسۆن) ئەچێنن. بەسایەی ئەم تووتنەوە کۆمەڵێکی گەورەیش لە لادێیی و ژنە لادێییەکان نان ئەخۆن. لە پاش دوو کات گەیشتینە (خورماڵ). دێیەکی بچووک بوو. بەڵام خاوەنی باخ و باخاتێکی فراوان و ئاوێکی زۆر و مزگەوتێکی یەجگار گەورە بوو. مزگەوتەکەی دوو نهۆمێکی بەرز بوو. هەیوانێکی پان و درێژ و، چەند ژوورێکی دەرگا و پەنجەرە داری هەبوو. لەسەر شێوەیەکی جوان دروست کرابوو. لە خواریەوە ئەستێرک (حوض)ێکی زۆر گەورەی هەبوو. ئاوەکەی سارد بوو. لە شوێنی بەردەنوێژەکانیدا تەختەڕێژ کرابوو. لە دەستە چەپی ئەستێرکەکەوە ڕیزە گوڵ و گوڵەباخێکی جوان، لە پشت مزگەوتەکەیشەوە چەند تاوێر و کەڵە بەردێک هەبوو، ئاوێکی خوڕ بەناویاندا گڤەی ئەکرد، ئەو باخ و باخاتەی خورماڵی ئاو ئەدا. لە هەیوانی نهۆمی دووەمی مزگەوتەکە و سەربانەکەیەوە چاوئەندازێکی دڵگیری ئاو و سەوزایی (خورماڵ) چاوی پیاوی ئەگەشاندەوە. ئەم باخانە ترێ و هەنجیر، هەنار و هەڵووژە و قۆخ و قەیسی و گەلێ داری وەک چنار و عەرعەر و شۆڕەبی و ناردەوند و سوورە چناریان تیابوو. (شێخ حسامەدین) کە دێت لەم

(١) ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو خوێندنەوەی لە بروممانای لوبنان، پەیمانگایەکی فێربوونی زمانی ئینگلیزی بووە بۆ بەردەو وەرگرتن و خوێندن لە(ئۆکسفۆرد و کەمبرج) لە بەریتانیا، هەر ئەو پەیمانگایەش سەر بەو زانکۆیە بووە.

(*) ئەو سەردەمە ساتی کوردەواری بەکار ئەهێنرا، نەک فەرەنگی. (ش. ف)

مزگەوتەدا دەسوپێوەند و میوان و پیاوانی دائەنیشێنێ. (خورماڵ) چەند دووکانێکیشی تیابوو. لێرە نزیکی ساتێک مایەوە. لە بن سێبەری سووردچنارە گەورەکەی مزگەوتەکەدا ماندوویتی خۆمم حەساندەوە. لەگەڵ چەند ئاشنایەکدا لەسەر سەربانەکە بەرکوڵێکمان کرد و سواربووین بۆ هەڵەبجە. زۆری پێ نەچوو، تووشی جۆگەکانی (دەڵێن) بووین. لێرەدا پیاوێکی بەکاری سلێمانی، (ڕەمزی ئەفەندی)، تووتن و مەرەزەی کردبوو. گەڵێ کرێکارمان دی. لەوێدا، فەرمانیان ئەکرد. هاوڕێیەکی خۆمم لەوێدا دی، سەرکار بوو، خێوەتی لەوێ هەڵدابوو. گەڵێکمان لەگەڵ خەریک بوو، بێنینەوە. بەڵام بۆمان نەکرا. ئیتر بەناو چەند دارستانێکی کەیشدا تێپەڕمان کرد. ساتە ڕێیەکی تریش دەشتی (شارەزوور)مان بڕی، ئینجا گەیشتینە (هەڵەبجە).

## هەڵەبجە ١٩٣٣/٨/١٦

ئەوی لە دوورەوە بێتە (هەڵەبجە)وە، ڕیزە خانوویەکی بەرچاو ئەکەوێ، شارێک لە شارە ڕازاوەکانی ڕۆژئاوای دێتەوە بیر. ئەم خانووانە هی (وەسمان پاشا)، (تاهیر بەگ)، (حامید بەگ) و دەوڵەمەندەکانی تری جاف و هەڵەبجەیین. ئێمە چووینە ماڵی (وەسمان پاشا)، لای (ئەحمەد موختار بەگ)ی کوڕی. بەڕاستی کۆشکێکی ئاوازە بوو. دوو نهۆم، بەرز بوو. لە خوارەوە تار مەوداڵانی گەورە گەورە و پان، لە سەرەوە بەر هەیوانی فراوان، هەر چوار لای کۆشکەکەی ڕازاندبووەوە. ژوورەکان یەک لەسەر یەک بوون. دەرەوەیان بەئاوێنە بەندی و میناکاریی پڕ نەخش و نیگار، بەڕەنگی ئاڵ و واڵا، ناوەوەیان بەئاڵەت و ئاوێنەکاری، پەنجەرە و بن میچەکان و دیوارەکانیان جوان کرابوون. دەرگاکانیش کارێکی یەجگار جوانیان تیا کرابوو. لەهەر گۆشەیەکی کۆشکەکەوە لە ناوەندی دوو هەیواندا، ژوورێک هەبوو. پەنجەرەکانی بەهەر چوار لایدا ئەیڕوانی. یەکێک لەمانە (قوله)ی پێ ئەڵێن. چونکە جێگای شەڕە تفەنگ بووە بۆ بەرامبەری دوژمن. لەهەر لایە هەیوانێک هەبوو، بەدرێژایی لای خانووەکە. لەبەر ئەوە بۆ تەماشاگاه هەموو حەلێ ئەم کۆشکە شاهانەیە بەسەر ماڵەکانی هەڵەبجە و دێهاتەکانی بنار شاخەکانی هەورامان و باخەکانی چوار لای هەڵەبجە و دەشتی فراوانی شارەزووردا ئەیڕوانی. تێکڕا هەموو ژوورەکانی سەرەوە بەبەڕە و قالیچە، بەکورسی و مێز و ئاوێنەی گەورە گەورە پڕ کرابوونەوە. میوانەکانی (بەگ) لە نهۆمی سەرەوە دائەنیشن. سەیر ئەوەیە، بەپێچەوانەی (سلێمانی) ئەوی تۆزە ئاشنایەتییەکی هەبێ لەگەڵ (ماڵی پاشا)دا، بێ پرس ئەتوانێ بەهەموو لایەکی خانووەکەدا بسوڕێتەوە، تا خۆی یاخود ژنەکەی یان یەکێ لە دەسوپێوەندان ئەدۆزێتەوە. ئەم کۆشکە گەورەیە بەلای کەمەوە چل ژوورێکی گەورەی تیابوو. هەموویان پەنجەرەی گەورە گەورەی باکێشیان تیابوو. لەبەرئەوە (ماڵی پاشا) تا بڵێی فێنک بوو. چونکە با هەموو لایەکی ئەگرتەوە. لەو سووچەوە کە ئێمە لێی دانیشتبووین -بەری ڕۆژهەڵات- چاومان لە باخچەیەکی فراوان بوو، ئەستێرکێکی گەورەی لە ناوەڕاستدا بوو. لایەکانی کەیشی بەدار و درەختی بەردار و سێبەردار تەنرابوون. لەلای دەرگانەکەیەوە سەرشۆرک (حمام)ێکی خنجیلانەی جوان کرابوو، حەلی خۆی بۆ پاشا و خێزانی بووە. بەڵام ئێستا بۆ هەموو کەسە.

که چوونه سەرێ بردیانینه ژوورێکەوە. ژووری ژنان بەرامبەری بوو. (حەبەخانی) ژنی (ئەحمەد بەگ) لەگەڵ دەسوپێوەندەکانیدا بەسەربەستییەکەوە. لەولامانەوە قسە و گەپی ئەکرد. چای ئەخواردەوە. ئێمەی نە ئەناسی نەگین ئەهاتە لامان، دائەنیشت.

پیاوێکی باریکەلانەی چاوشینی دەموچاو سووری وریا دەستی هەردووکمانی گوشی. ئەم پیاوە که (عەلی ئەفەندی)ی ناوبوو، خۆی له بنچینەدا ئەڵمانی بووە. برایەکی پسپۆری له منداڵیدا ئەیفڕێنێته هەڵەبجە. ئێستا ئیسلامە. کوردی زۆر چاک ئەزانێ. له ژنێکی کورد کوڕێکی کورتە بنەی یەک چاوەی زیرەک و وریای بووبوو. جا ئەم پیاوە بوو کە کار و فەرمانی (بەگ)ی بەباشی هەڵئەسووڕاند. ئەگین ئەوانی کەی گێژوویژ بوون. فریان بەسەر هیچەوە نەبوو.

ئەم و (حەمە فەرەج)ی کوڕی زۆر میوان ئەوازییان کردین. سەردەمێک لەمەوپێش (حەمە فەرەج) له (خوێندنگای ئەمریکان)ی بەغدا بووبوو. ئینگلیزییەکی باشی قسە ئەکرد. (تاهیر بەگی برای ئەحمەد بەگ) ئەڵێ: «قوربانی پەلت بم کە پەلی هامپەلت پەل کرد». گوایا براکەی (عەلی ئەفەندی) کە ناوی (هامپەل) بووە، (داود بەگی جاف)ی دەرمان خوارد کردووە. ئەوانیش ڕایان سپاردووە، یەکێکیان کوشتوێتییەوە. ئینجا (تاهیر بەگ)، خۆی ئەکات بەگۆڕی (قوربانی) بۆ ئەو کەسەی کە (هامپەلی) برای (عەلی ئەفەندی)ی کوشتووە!...

ژوورەکەمان بن میچکێکی ئاوێنەبەند، دیوارێکی ڕەنگکراو، چەند پەنجەرەیەکی میناکاری لەسەر شێوەی کۆن تیابوو. تاقەکان بەچینی شتی ناوازەی بلوورین ڕازابوونەوە. قاڵی و دۆشەک ئەمبەر و ئەوبەر ڕاخرابوون. ئێمە لێرە دانیشتین. چایان بۆ هێناین. له پڕ کوڕێکی (١٦) ساڵەی قەد و باڵا جوانی پەری ڕوو هاتە ژوورێ. دەستی گوشین. ئێمەیش جگەرمان دایە. پرسیم کێیە؟ خۆی وتی: «من مەسعودی کوڕی تاهیر بەگەم». بەڕاستی دڵم ڕۆشن بووەوە. گەلێ قسەی خۆش خۆشی بۆ کردین. تەرحە پێکەنینێکی هەبوو، کاری له دڵی پیاو ئەکرد. سەرگوروشتەی خۆی بۆ گێڕامەوە، کە بۆچی له خوێندنگا وازی هێنا. بەڵام له دواییدا تێگەیشتم کە سەرە واوێکی له سکا نییە. هەر لەم لاو ئەولا ئەسووڕێتەوە. منیش ئاخێکم هەڵکێشا و له دڵی خۆمدا گوتم: «داخەکەم تاهیر بەگی ناودار کەسێ نەبوو جێگای بگرێتەوە!». ئەگەر ئەم کوڕە باوک و دایکی بمایە وازیان لێ نەئەهێنا تا پیاوێکی ناوازەی وەک باوکی خۆی لێ ئەهاتەوە دەرەوە. بەڵام وا دیارە (ئەحمەد بەگ)ی مامی هیچ ئەوەی لێک نەداوەتەوە!؟... یاخود لێکی داوەتەوە بەڵام بۆی نەچۆتە سەر!... لەگەڵ ئەوەیشدا (مەسعود بەگ) هاودەمێکی زۆرباشی نواند. لەگەڵ (حەمە فەرەج)دا هەموو جارێ لەگەڵماندا ئەهاتە دەرەوە، ئەی گێڕاین بەناو شاردا.

له دەرەوە (ئەحمەد بەگ)یشمان پێ گەیشت. ماندوو نەبوونی لێ کردین. پیاوێکی کەڵەگەت بوو. بەخۆوە بوو. موو زەرد و دەموچاو سوور بوو. جوانترین زەردەخەنەی هەبوو کە له هەڵەبجەدا دیبووم. له ئێمە تێپەڕ بوو... جارێ بام بڕۆین...

***

باخەکانی هەڵەبجە لای خوارووی کەوتبوون. (باخی میر)یان هی (ئەحمەد بەگ) بوو. له هەموویان

گەورەتر بوو. باخچەیەکی کەیشی هەبوو، سوڕک و ئەستێرکی تیابوو، لەگەڵ چایخانەیەکدا کە لە بن سێبەری چەند دارێکی گەورەدا بوو. باخەکانی هەڵەبجە گەورە بوون. هەنار و هەنجیر و کەمێک ترێ و میوەی ترشیان تیابوو. جگە لەمانە ماڵە گەورەکانیش باخ و باخچەیان هەبوو. میوەی شاری هەڵەبجە ئەو باخانە پێکیان ئەهێنا. خانووەکانی هەڵەبجە چەشنی هی سلێمانین. ڕاستە شەقامێکی خنجیلانەی پاکی تیابوو. بەڵام کۆڵانەکانی تەسک و تووروسک، پیس و پۆخڵ، نارێک و ناقۆڵابوون. دوو قەیسەری، دوو سەرشۆرک، چایخانەیەکی سەر نهۆمی سەرەوەی جوان، چەند ڕیزە دووکانێکی زۆر ڕێکوپێکی لێ کرابوو. تازە خەریکی دروستکردنی ئوتێلێک و ئۆتۆمبێل خانەیەک بوون... بەڵام چەند دووکانێکی ناشیرین بازاڕەکەی ناخۆش کردبوو. هەڵەبجە پێنج سەد ماڵێک ئەبوو. لە شوێنێکی تەختا هەڵکەوتبوو. گەلێ کانیاوی جوانی هەبوو. تووتنێکی زۆریشی لێ کرابوو باخەکان لە شیو و دۆڵەکانی خواروویدا هەڵکەوتبوون. هەر چوار لای دەشت و ئەرمان بوو. لە دوورەوە شاخەکانی (هەورامان) دیار بوون. دێهاتی (عەبابەیلێ، جەلیل، عەنەب، گردی بەکراوا)ی لێوە دیاربوون.



سێ ڕۆژ لە هەڵەبجە ماینەوە. جوولەکەکانی هەڵەبجە، لە هی سلێمانی، ئافرەتیشی دیسانەوە لەهی گەلێ جێگای تر سەربەستترن. (کانی ژنان) کە لە ماڵی پاشاوە دیاربوو، زۆر ژنی جوانی ئەهاتە سەر. ژن لە هەڵەبجەدا زۆر خۆیان ئەڕازێننەوە. لە کاتی کار و فەرمانیشدا هەر بەرگی جوان ئەپۆشن. سەری ژنی هەڵەبجەیی، جوانترینی سەری ژنانی کوردە کە دیبێتم. جوانیان زۆرە. پیاوانیش لەبەر ئەوە سەربەستن.

(ئەحمەد بەگ) هەمیشە بەدیار تووتنەکەیەوە بوو. دەیگوت: ئەم تووتنە هەزار دیناری بێ ئەگرمەوە!... گەلێ کرێکاری بۆ ڕاگرتبوو. سەرکارەکانیان دوانیان (ئەرمەنی) بوون. لەسەر شێوەی تازە تووتنە (سامسۆن)ەکەیان ئەشکاندەوە. بێگومان (ئەحمەد بەگ) بۆیە ئەمەندە بەدیاریانەوە ئەبوو، زۆر لە کرێکارەکانی ژنی جوانی هەڵەبجەیی بوون. هەر لەبەر ئەمەیش بوو کە کار و فەرمانەکەی وا زوو هەڵئەسووڕا.

(ئەحمەد بەگ) زۆر دڵتەڕ بوو. لە بەرگ و هەستان و دانیشتندا، لە ڕابواردندا، ڕەوشتێکی بزێژانەی هەبوو. وا بزانم لەبەر ئەوەیشە کە وا بوو، هەڵەبجە، خۆی دڵتەڕانە هەڵکەوتووە. ئاو و بای سازگاری، چاوئەندازی ڕەنگینی کچ و ژنی شیرین و نازەنینی، تیکڕا کاری لە ژیانی هەموو هەڵەبجەییەک کردووە. لەم هاوینەدا ئەبینی لە هەموو باخێکدا کەپرو هەوار، نیشتەنییەکانی هەڵەبجە تیایاندا ڕائەبوێرن. (ئەحمەد بەگ) کە ئێوارە ئەهات، بەخۆی و چەند هاودەمێکیەوە لەگەڵ گۆرانیبێژێکدا بەمەی و جامی مەیەوە ئەچووە باخێک لەو باخانەوە. تا کاتی چوارەمی شەو ئەیخواردەوە و بەبەزم و ڕابواردن لە دەمە و ئێوارێوە، لەناو ئەو باخانەدا ڕایان ئەبوارد تا خەوتان.

ئێوارێ نانێکی خۆشمان خوارد. هەڵەبجەیی لە چێشتا وەستان. گەلێک چێشتی خۆش خۆش و ناوازە دروست ئەکەن. لە پاک و خاوێنیشدا تەواون. پاش نان، چووینە (خوێندنگای زانستی). لەوێدا شاگردە



بوێژی نیشتمانپەروەر ئەحمەد بەگی پاشا

هەڵەبجەییەکان بەشەو بەدووکاندارەکانیان ئەخوێند. نزیکەی سی شاگردێک لەوێدا ئەیان خوێند.

***

بەیانی لە مزگەوت دەموچاومان شت. مزگەوتی ئێرە ئەستێرکەکەی گەورە بوو. بەردە نوێژەکانی تەختە بوون. پێشاوەکانی، بەپێچەوانەی هینەکانی سلێمانی دەرگایان هەبوو. دیوارێکیش پێشاوەکانی لەجێی نوێژ و دانیشتن جوێ ئەکردەوە. بەکورتی مزگەوتەکەی هەڵەبجە رێکوپێک و پاک و خاوێن بوو.

کە گەڕاینەوە ماڵی پاشا، (ئەحمەد بەگ) لە دیوەخانەکەیدا دانیشتبوو. زۆر گیان سووک و ڕوو خۆشم هاتە پێش چاو. باسی وێژەی کوردیم لەگەڵ کردەوە. لە کۆمەڵە هۆنراوەکانی خۆی گەلێکی بۆ خوێندینەوە. قسەکانی ئاودار و ناسک بوون. باسی دڵداری و نیشتمانپەروەرییەکی یەجگار بەهێزی ئەکرد. بەڕاستی خۆشخوانییەکانی لە چێشکەدا لە هۆنراوەکانی (تاهیر بەگ)ی برای کەمتر نەبوون. (ئەحمەد بەگ) نیازی هەبوو لە چاپیان بدات. بێجگە لەوە ئەیگوت: «چیرۆکێکی کاریگەری قوڕ بەسەری کوردم نووسیوەتەوە. ئارسەنی بێگانە پێشان نەدات. چاوی کورد ئەکاتەوە». ئەیگوت: «گوێ نادەمە دڵ و ئارەزووی میری. قسەی سەربەستی ڕاستی خۆم هەر ئەکەم. بەوانەوە ئەبێ لە چاپی نادەم». گوتی: «شتێکی تریشم بەدەستەوەیە. ڕەنگە ئەم زستانە تەواوی بکەم!».

بەرچایی، لە هەڵەبجەدا ئەمەندە بایەخی پێ نادرێ. لەگەڵ ئەوەیشدا بۆ ئێمە نان و ماست و چایان دانا، کە زۆر خۆشیمان لێ چێشت، هەر لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ (ئەحمەد)دا بووین.

لەگەڵ (ئەنوەر بەگ)ی هاوڕێمدا چووینە ماڵی (حامد بەگ)ی مامۆی. ئێرەیش گەلێک ڕێکوپێک بوو. ئەستێرکێکی ئەندازەیی جوانی لە ناوەڕاستدا بوو کە لە بەردەمی کۆشکەکەیاندا بوو. ئەم خانووەیش

گەورە و بڵندبوو. ژوورەکانی بەکورسی و قەنەفە و میزی ناوازەوە ڕازێنرابوونەوە. (حامد بەگ) مەکینەیەکی ئەلەکتریکی هێنابوو، چرای ئەلەکتریکی بەناو هەموو خانووەکەیدا بڵاو کردبووەوە. بەڵام لەبەر ئەرک زۆری کەم کەم ئەیانخستە کار. پارەی زۆری ئەویست. هەرچی هەڵەبجەیییەکانی تر بوون، هێشتا هەر چرای نەوتیان ئەسووتاند.

بەڵام خانووی (تاهیر بەگ) وێران بووبوو. جاران لەبەر دڵی (خانمی وەسمان پاشای جاف) هەیوانی ئەوێ و ماڵی پاشایان بەپردێکی تەختە ئەگەیاندەوە یەک.

ئێستە ئەوەیش نەماوەتەوە. (ئەنوەر بەگ) ئەیگوت: «حەلی خۆی ماڵی پاشا، لەو حەلەدا کە (خانم) سەرداری هەڵەبجە بووە، دەرووژوور، کەسی ئەگرتووە. ئێستە ئەمەندە نیشتەنی کەمە وەکو چۆڵی لێ هاتووە». ئیتر لە پاش نازگرتنێکی زۆر و میواندارییەکی یەجگار باش لەلایەن برا هەڵەبجەیییەکانەوە، لەسەر فەرموودەی (ئەحمەد بەگ) چووینە «دەرەشیش».

## دەرەشیش ١٩٣٣/٨/١٩

(ئەحمەد بەگ) لەگەڵ یەکێکدا ناردینیە کن (حەمە سەعید بەگ)ی زاوای. لە دێی (عەنەب)ەوە تێپەڕین. دێیەکی پڕ لە باخی خۆش بوو. لەسەرە ڕێگادا لە بن چەند دارێکدا ئەستێرک و ناوێکی جوان هەبوو. چایخانەیەکی لێ کرابووەوە. لەوەلا بەسەر گردێکا جگەرەکێشێک سەرکەوتین و ڕۆیشتین ئینجا بەسەرەو لێژایییەکدا هاتینە خوارەوە. لە چەمێکمان دا. لە سەر و باخاتێکی درێژۆلکەدا چەند ماڵێکمان دی. ئەوە (دەرەشیش) بوو. لەناو خانوویەکی یەک نهۆمیدا کە ئەیڕوانی بەسەر باخ و باخاتەکەدا، (حەمە سەعید بەگ)، دانیشتبوو. پیاوێکی درێژکۆڵەی باریکەلانەی، بەسەزمانی لەسەرخۆ و گوێڕایەڵم هاتە پێش چاو. لەبەرمان هەستا و دەستی گوشین. پاشان (حەمەد بەگ)ی برایشی هات. کە پیاوێکی بەدەم هەڵمشە و دەم گەرم بوو. کورتیڕ هەواڵی (ناسووری)یەکانی لێ پرسیم. لە پێشەوە حەزی بەمانیان ئەکرد، لە کوردستاندا. لە دوایی‌دا قسەکەی گۆڕی. کوڕێکی بچکۆلانەی خنجیلانەی جوانکیلانە، کە ناوی (حەمە عەلی) بوو، لەو لاوە دانیشتبوو بەتەمەن هەر دوانزە ساڵێک ئەبوو. کوڕی خانەخوێکەمان بوو. خوێندنی سەرەتایی لە هەڵەبجەدا تەواو کردبوو. لە چاو خۆیدا ئینگلیزییەکی جوانی قسە ئەکرد و زۆر باش بەئینگلیزی گفتوگۆی لەگەڵدا ئەکردم. (حەمە عەلی) زیرەکترین و سەربەستترین شاگردی ناوچەی هەڵەبجە بوو، کە تا ئەوسا دیبووم. بەخۆی و لووتە کەرۆشکییەکەیەوە، بەدەنگە زرنگدار و قسە گورجەکانیەوە، بەچاوە گەشە جریوەدارە بچکۆلەکانیەوە، بەتەرحێکی وا کێشی کردین، زۆربەی قسەکانمان لەگەڵ ئەودا ئەکرد.

باوکی زۆری خۆش ئەویست. چونکە دایکی نەمابوو، زۆر جار لە باوکی توڕە ئەبوو، قسەی ئەترازاند. قسەی بەمامی ئەگوت. (حەمە سەعید بەگ)، خۆی لێ لێڵ نەئەکرد. لەگەڵ مامیدا کە پیاوێکی نەزان و نەخوێندەواربوو، کەوتە دەمەقاڵێیەوە. مامی سوێندی خواردبوو کە خانووی لە سەهۆڵ دروستکراو، پیاوی تیا نازی. چونکە (حەمە عەلی) تێی نەگەیاندبوو کە سەروخواری بەکەوڵ

دانەپۆشریَ. بەلاَم کە (حەمە عەلی) لە منی بیست خانووی سەهۆڵ، پیاوی بەو تەرحە تیا نەژی، مامی بەدرۆخستەوە. پێی گوت: «سوێندەکەت کەوت!؟» لەسەر ئەوە مامی تووڕە بوو، لێمان تۆرا.

لە چەمەکەی (دەرەشیش)دا تۆزێ خۆمان شت. تا گەڕاینەوە (حەمە سەعید بەگ) لە بن دارێکدا بەتەنشت جۆگایەکی جوانەوە سەماوەری لێ دەم کردبوو. ئەسکەملی ڕێکوپێکی بۆ ئێمە دانابوو. لە ناوەند چای خواردنەوەدا باسی (کورد) و (کوردایەتی) هاتە پێشەوە. بەو و بە(حەمە بەگ)ی برای گەلێ قسەی ژیرانەیان لە بابەت پێشکەوتن و سەربەخۆیی کوردستانەوە کرد. پاشان چووینە باخەوە. لە بن دارگوێزێکدا لە گوێی چەمەکەدا دانیشتین. دەورووپشتمان دار هەنجیر و هەنار و قۆخ و کەڵەمێو بوون. هەندێ میوەی بۆ کردینەوە و خواردمان. (حەمە سەعید بەگ) حەزی ئەکرد، لەگەڵ کوڕەکەیدا، قسە بەئینگلیزی بکەین. ئەیگوت: «ئەم ساڵ بێتەوە ئەینێرمە (سلێمانی)، خوێندنی ئەوێش تەواو بکات.

دەمە و شێوان بوو. کابرایەکی کەتەی چوارشانەی کوت و کوێری دەموچاو کرمۆڵ، بەهەڵەداوان هات و دانیشت. ماندوو نەبوونیمان لێ کرد. ئەمە (شێخ جافر)، پیاوێکی بەگزادەکانی هەورامان بوو. (بەگ) وای پێشان داین: «شێخ جافر لە هیچ ناسلەمێتەوە: ئەخواتەوە...». خۆیشی گوتی: «پرسیم. وتیان دووانی خەڵکی سلێمانی لەلایە. ئیتر زانیم خواردنەوەتان لا هەیە. بۆیە هاتم!...». بەلاَم (حەمە سەعید بەگ) تکای لە ئێمە کرد بێ بەخشین کە ناتوانێ ئەو ئێوارەیە خواردنەوەمان بۆ بهێنێ. بەلاَم من تێم گەیاند کە نە من، نە هاوڕێکەم، کاک (ئیسماعیل عەلی)، هیچمان ناخۆینەوە... وا دیارە ئەم بەگزادە جافانە، تێکڕا هەموو ئەخۆنەوە. گوێ نادەنە نوێژ و ڕۆژوو و شێخ و مێخ!!.

لەگەڵ ئەوەیشدا (شێخ جافر)، پیاوێکی دووربین و شارەزا، لەسەرخۆ و قسەخۆش و دەم گەرمی پێشان دا. خوێندەوار و زیرەک بوو. گەلێ قسەی جوان جوانی لە بابەت زۆرزانی ئینگلیز و نەزانی کوردەوە، هەروەها لە بابەت پاشکەوتوویی کوردەوە کرد. سەر بە(خانم) و کوڕەکانی و، بەگزادەکانی (هەورامان) بوو. زۆر خەفەتی ئەخوارد کە (مەسعود بەگ) جێگای ئەو پیاوە گەورەیە، (تاهیر بەگ)ی باوکی ناگرێتەوە، باسی جوامێری و نان بدەیی و وێژەوانیی (تاهیر بەگ)ی ئەکرد. ئەیگوت: «حەلی خۆی، خۆی شاگردەکانی خوێندنگای تاقی کردۆتەوە لە گیرفانی خۆیشی پاداشی پێ داون». شێخ جافر جار بەجارێ باسی (ناپلیۆن) و (ئەدیسۆن)یشی ئەخستە ناو ناوانەوە.

باسی هۆنراوەی کوردیم لەگەڵا کردەوە. ئەیگوت: «ناهی خانی کچی خانم خوێندەوارە. کەشکۆڵێکی بەجگار گەورەی هەیە. بوێژ نەماوە لە کورددا هەڵبەستی ئەوی بەتەواوەتی تیا نەبێ». دوای ئەوە گوتی: «سەیر ئەوەیە هی چەند بوێژێکی نەخوێندەواری ئەم ناوەی تیایە، بێ هاوتان. هی چەند کەسێکی کەشی تیایە، کەس ناویشی نەبیستبوون». بەڵێنی دامێ کە هاتمەوە هەڵەبجە بباتە لای (ناهی خان)، ئەو کەشکۆڵە نرخدارەیم پیشان بدات. دیسانەوە لە کۆڕی قسەکردندا گوتی: «لە شاری (هەورامان) کە لە کوردستانی ئێراندایە، مێژوونامە، (تاریخ)ەک بەزمانی هەورامی نووسراوەتەوە حەوت سەد تا هەشت سەد لاپەڕە ئەبێ. لە دەمێکەوە کە نۆ سەد ساڵ لەمەوپێش ئەگرێتەوە، تا ئیمڕۆ بەنووسین و هەڵبەست باسی پاشایان و سەردارانی کوردانی (هەورامان) ئەکات. باسی شەڕ و شۆڕ و ئاوایی ناو شاخەکان

نەکات تا ئیمڕۆ». ئەیگوت: «ئەم نووسراوە لە دەمی بەهمەن شای هەورامییەوە دەست بەنووسینی کراوە، سەرەتاکەی بەزمانی کوردی هەورامانی کۆنە. ئیمڕۆ لە خۆیشیان کەم کەس تێی نەگات. وا بزانم تەنیا دانەیەک لەوە هەبووە. چونکە هەر پشتێ هاتووە و خستویتییە سەری. لام وایە مەلایەک لە(مەریوان) دانەیەکی کەی لەبەر نووسیوەتەوە، دای بەکوڕێکی (جافر سان) بەحەفتا تمەن!».

(شێخ جافر) بۆ بەیانی زوو بەرەو کەژی سەر سنوور چوو، (ئەفراسیاب بەگ)ی ئاغایشی کە ئێستا لە فەرمانڕەوایانی (عەرەب) و (عەجەم) هەڵساوە دەروونی پڕە لە خەم و خەفەت بۆ تێک چوویان، بۆ سەرشۆڕیان، ئافەرین بۆ (بەچکەی عەبابەیلێ). بەیانی سواربووین، لەگەڵ پیاوی بەگدا چووین بۆ (هانە نەوتی).

## هانە نەوتی ١٩٣٣/٨/٢٠

هەر نیوە ساتێکمان بەسەر گرد و دۆڵی ڕووتدا بڕی. ئیتر کەوتینە گوێ چەم و ئاوی (بیارە)وە. تا ساتێکی تەواو ئێمە بەتەنشت باخ و باخاتی هەنار و گوێز و توو و کەڵەمێودا ڕابوردین کە بەو ئاوە ئاو ئەدرێن، تا گەیشتینە «هانە نەوتی». ئەم باخانە هەموو هی (شێخ حسامەدین) بوون. ئیتر خوڕە و هاژەی ئاوی چەمەکە و، بەرگی ئەتڵەسینی باخاتەکە، باوەشێنی عەرعەرەکانی سەر ڕێ ماندوویێتی درێژی ڕێگاکەی لە بیر پیاو ئەبردەوە. کاتێکمان زانی لەبەر ماڵێکی وشکە کەڵەکی بەرزدا باخەکانی خوار و ژوورووی (هانە نەوتی)ی لێوە دیاربوو. (هانە نەوتی) ئەم ماڵە و ماڵێکیکەی تیایە. ئەمەیان ماڵی (شێخ محەمەدی کوڕی شێخ حسامەدین) بوو.

(شێخ محەمەد) بەزمانێکی میوان نەوازانەی یەجگار ماندوونەبوونی لێ کردین. هیوام وایە خوێندەواران لێم ببوورن کە بەزمانێکی ڕاستی پەرستییەوە باسی (شێخ محەمەد) ئەکەم. ڕەنگە لە پیشاندانی کردەوەی ئەم و شێخی باوکیدا خۆشییەک و کەڵکێکی بۆ خوێندەواران تیا بێ. ئەمە زۆر سەیرە لە پیاوێکی وەک (شێخ حسامەدین)ی ئیسلام و خواپەرست، لەناو گەلێکی پاشکەوتووی چاو بەستراودا، لە کۆڕی ئەم هەموو دەروێش و دێوانانەدا، لەناو ئەم شاخ و داخەی (هەورامان)[1]دا: پیاوێکی وا ببێ و هەڵکەوێ وەکو (شێخ محەمەد).

پیاوێکی وا کە بەئاشکرا، نوێژ نەکا، بەڕۆژوو نەبێ، مەی بخواتەوە، کە هەرچی دڵی ئارەزووی ئەکات

(١) هەورامان: دەڤەرێکی دڵگیر و جوان و سەختە لە کوردستاندا، لە دوورویشتی هەڵەبجەوە دەست پێ دەکات، هەردوو ناحیەی خورماڵ و بیارە و شارۆچکەی تەوێڵە دەگرێتەوە؛ جگە لە دەیان گوندی جوان و ناودانی تر. ئەم بەشەی کە لە باشووری کوردستاندایە پێی دەوترێ (هەورامانی لهۆن) و بەشەکەی ئەودیو کە سەر بەئێرانە (هەورامانی تەخت)، کە لە ڕووی ژمارە و پانتاییەوە گەورەترە. ڕا و بۆچوون زۆرە لەسەر ئەسڵی ناوەکەی، هەریەکەو بەپێی بۆچوونی دەیباتەوە سەر ڕووداوێ یا جێگایە، بەڵام ئەوەی شیاوتر و لەبارترین ئەو ڕایەیە کە گوایە لە (هەوار - ئەمان)ەوە هاتووە، کە بەپێی پەناگیری و سەختی دەڤەرەکە بۆتە هەوارێکی ئەمین و بێ ترس بۆ دانیشتووەکانی.

بیکات[*] بەلای (شێخ محەممەد)ەوە: خانەقا، شێخێتی، دەروێشی، خواناسێتیێک بەم تەرحەوە -وەکو خۆی ئەیگوت- کە خەڵک لە کار و فەرمان بخات، تەمەڵی بڵاو بکاتەوە، گەلی پێ بدۆشرێ... پەشمە... پەشمە!!.

یان وەکو خۆی ئەیگوت: «شێخ پیاوێکی ژیرە، چونکە ئەتوانی ئەمەندە کەس کەر بکات. چونکە خۆی لە نوێژ و ڕۆژووە درۆکانیان ئاگادارە... بەڵام چونکە ئەزانی لەوەدایە، قسە ناکات!. ئەوان چۆنیان پێ خۆشە وا ئەکات!...».

لە زۆر لادێییم ئەبیست ئەیانگوت: «شێخ محەممەد خوا ئەناسە. پیاوی ئینگلیزە!... هەرچی ناشیرینە ئەوە ئەکات... لە هەموو شتێکدا!».

لەگەڵ ئەمانەشدا هەمووی (شێخ محەممەد)م پیاوێکی تێگەیشتوو و، پێگەیشتوو و، ژیر و زرنگ هاتە پێش چاو. پیاوێک بوو کە بەباڵایەکی بڵند و دوو چاوی گەش و تیژبینەوە، بەڕۆینێکی لەسەرخۆ و دەم و چاوێکی مەندەوە، سیمای پیاوێکی سامداری ئەخستە مێشکی پیاوەوە. بەڕانکرچۆغەیەکی مەرەزە و پێڵاوێکی نرخ هەرزان و مشکی و جامانەیەکی کۆنەوە، گورج لە پیاوی ئەگەیاند کە (شێخ محەممەد) گیان سووکە، بێ وەیە، بێ کەشرفشە بەسەر بەردەست و لادێییەکانیدا. مۆن نەبوو. مەند بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا کە هەر خۆی و میوانەکانی بووایە، جار بەجارێکیش لەگەڵ پیاوەکانیدا بووایە، خۆشترین قسە و سەرگوروشتەی ئەهێنایەوە، پیاوی بەکوڵ ئەهێنایە پێکەنین. لە شێخ و دەروێش، لە باوکی و (شێخ عەلائەدین) تەقەیەکی زۆری ئەکرد. ساهەر لەبەر ئەم تەقانەبوو، کە ئەمانبینی پیاوەکانی (شێخ محەممەد) گەلێک لە پیاوەکانی شێخەکانی تر وریاتر و چاو کراوەتر و ڕێکوپێکتر بوون... خانەخوێکەمان، بەکوردی هەورامان و کرمانج و فارسی و تورکی و عەرەبی بەتەواوی قسەی ئەکرد. کەمێک لە زمانی ئینگلیزیش تێ ئەگەیشت. بەڕاستی خوێندەوارێکی پوختە بوو. ئەیزانی لەگەڵ خواناس و خوا ئەناس، ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییدا، زۆر چاک هەڵبسێ و دانیشێ و، لە بابەت هەموو شتێکەوە، بەپێی تێگەیشتنیان قسەیان لەگەڵدا بکات. لەناو ئینگلیزەکاندا هاوڕێی زۆر هەبوو، زۆریشی لەگەڵدا ڕابواردبوون. وەکو خۆی ئەیگوت: «چەند ساڵێک لەمەوبەر بەفڕۆکە لە خورماڵەوە بەسەر شاخەکانی هەوراماندا و بەسەر سلێمانی و کەرکووک و هەولێر و موسڵ و بەغدادا گەڕابوو». سەیر ئەوەیە بەتەواوەتی لە کاروباری بێگانە لەگەڵ کورددا شارەزابوو. زۆر جاری وا بووە، کەوتووەتە ناوەند ئینگلیزەکان و کوردەکانەوە، ئاشتی کردوونەتەوە. وەک خۆی ئەیگوت: «هەمیشە نامەکاری لەگەڵ ئینگلیزەکاندا هەبوو. لەبەر ئەوە زۆر لە فەرمانڕەوایی ئێران ئەترسا، نەی ئەوێرا بچێتە ناویانەوە!».

بەڵام نازانم بۆچ، لەو کاتەدا، خۆی بەژێردەستی فەرمانڕەوایی بەریتانیا نووسیبوو؟! لەو حەلەدا کەوا (ئەفراسیاب بەگ) لە عەرەب و عەجەم هەڵسابوو، کە شەو هەبوو، لە جێگایەکی نهێنیدا، نانی لەگەڵ

(*) خوا لێخۆشبوو (شێخ محەممەد)، لە ساڵەکانی دوایی تەمەنیا کە کرابوو بەشێخ و چوو بووە جێگای باوکی خوالێخۆشبووی، وازی لە هەموو بەزم و ڕەزمێک هێنابوو. (ش. ف)

ئەخواردایە، ڕێوشوێنی نیشان نەدایە! زۆر شەوی وا هەبوو تفەنگ بەدەستە یاخیبووەکان تا دەمەوبەیان لە ماڵی (شێخ محەممەد)دا نانیان ئەخوارد، ڕایان ئەبوارد، کە بەیانی ئەهات، ئەچوونەوە شەڕ!؟.

(شێخ محەممەد) زۆر نان بدە و دەست بڵاو بوو. هەر چی ببوایە دەرخواردی میوانی ئەدا. دەسا لەبەر ئەم دەست بڵاوییەی بوو کە گیرفانی تەنگ بووبوو. دوور نەبوو تەنگتریش بێ.

لە (هەورامان)ی عێراقدا خانەخوێکەمان باڵی ڕاستی شێخی باوکی بوو. باخ و باخاتەکانی ئەم ئەی هێنانە بەرهەم. ئەیانگوت: «شێخ موعتەسەمەی برایشی لە ئێراندا وەها بەکار بوو. بەڵام شێخ عوسمان هەموو دەم لە خانەقادا کەوتبوو... بێ کارە بوو...».

من (شێخ محەممەد)م وەک (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) ئەهاتە پێش چاو. بۆ هەموو پرسێ ئامادەبوو. لە هەموو کۆڕێکدا، لەژێر پەردەیەکی ناسک و پیاوانەدا، پڵاری خۆی ئەهاوێشت. پیاوی ئەهێنایە پێکەنین. بەرامبەرەکەیشی ئەپێکاند. لە باسی (بیارە) و (باخە کۆن)یشدا ئەو قسانە دێنە گوتن.

جا ئەم پاڵەوانە سەیرە بوو، سەرداری (هانە نەوتی)[1].

***

(شێخ محەممەد) بردینیە ناو باخەکانیەوە. ئاوی چەمی (بیارە) بەبەر دەمماندا تافە تافی ئەکرد. لە بن دارێکی گوێزی گەورەدا دانیشتین. شێخ گوتی: «دەی بام تۆزێ قسەی خۆمانە بکەین. واز لە قسەی گەورە و بچووکی بهێنین!».

ئینجا بەناو ئەو دارستانە گەورەیەدا، کە دە و دوانزە سەریان داپووە یەک و بەپلپلەی گەڵامێو ڕازابوونەوە، ئەتگوت شایی و زەماوەندە، لە هەر دارەوە تەرحە تیشکێک ئەهاوێژرا. هەڵووژە، تیشکی سوور، ترێیش تیشکی ڕەش و سەوز و زەرد و سووری ئەهاوێشت. لە هەر شوێنێکەوە سەیرت ئەکرد، ئاو بوو هەڵئەقوڵی و، بەسەر وردە بەردی ئەو باخانەدا، بەناو گڵە سووری زەوییەکەدا پەخشانی ئەکرد. لە هەرلایەکەوە گوێت ئەگرت خوڕە و تافە و هاژە هاژی ئاو بوو، بەسەر ئەو کەڵەبەردانەدا. شەقەی باڵی پەلەوەر بوو. ئاوازی شیرینی چۆلەکە و بلبلان و، قاسپە قاسپی کەوان بوو. ئەو سەوزییە ئەتڵەسینەی دار و درەختە، لەگەڵ ئەو تارا زێڕینەدا کە ڕۆژی ئەیدا بەسەر باخ و چەم و قاڵیچە سەوزەی سەر زەوی بن دارەکاندا، ئەو بۆنە خۆشەی گەڵا دارگوێزانە و، ئەو ترنجۆکەی کە پەنا سێبەرەکانی داپۆشیبوو، لەگەڵ ئەو تیشکە زیوینەی کە لە ئاوی بلوورینی چەمەکەوە ئەهاتەوە بەگژ دار و بەردی چەمەکەدا و لاگەردنی درەختەکانی وەک ئاوێنە ئەدرەوشاندەوە... ئەمانە، هەموو، تەماشاگایەکیان پێک هێنابوو، نەک دڵێ، هەزاران دڵی شێت و شەیدا ئەکرد... خۆزگە خریەی ئەو خەوە خۆشەی کە لە بن ئەو دارانەدا ئەهاتە گوێی هاودەمەکانم، جارێکی تر لێم بهاتایەوە. کاشکی ئەو خۆشییەی کە لە خواردنی ئەو کاڵەکە شیرین و

(١) لە ساڵی ١٩٤٠دا کە بووم بە(کارگێری لادێی خورماڵ)، لە خوالێخۆشبوان (شێخ محەممەد) و (شێخ حسامەدین)ی باوکییەوە، بۆ کەلکی گشتی، یارمەتیم زۆر دی، کە هەتا ئەمێنم سوپاس و ڕێزیان پێشکەش ئەکەم. (ش. ف)

شـوتـيـيـه سـارده ناسـكه و، ئەو ترێ دەنک زله و، ئەو جگەرە بۆنداره و، ئەو ئاوه سـازگـاره و ئەو كزەبا فێنكه و، ئەو مريشـک و قـوێلی و باميـه و دۆيه شـيـرينه و، ئەو چايه بۆن خۆشـەدا ديم، لەناو باخـەكـانی (شێخ)دا، جارێكی كەیش زمانم بپچێشتايەوه!.



دەمە و ئێوارێ بەژێر سێبەری ئەم دارانەدا چارەكێک ڕۆيشـتين. (شێخ محەمەد)، ڕيزه چنار و بێسـتان و دووكـانه پەمـوودكـانی خۆيانی پيشـان داين. لەبەر مـالەكـەيدا پيـاوەكـانی خـەريكی شـەنكردنی گـيـا «وێنجه» بوون. ئەمه تۆوێكی وردی ڕەنگ ڕەش و زەردی هەيه. پرۆشەكەی خۆرشتێكی يەجگار نايابه بۆ ئاژاڵ. (شـێخ مـحـەمـەد) وەكو برايەكی خۆی قـسـەی لەگەڵدا ئەكردن. دياربوو كه لەگـەڵ ڕەنجـبـەر و لادێـيـيـەكـانيـشـدا هەروەها شـيـرين و بێ وەی بوو. ئەو شـەوه (شـێخ) دياربوو، مـەسـت بوو. لەبەر ئەوه قـسـەی خۆشی بۆ ئەكردين. جەرگی بۆ پاشكەوتنی كورد ئەسـووتا. ڕەخنەی له ئەشارەزايی و كەمتەرخەمی (شێخ مەحموود)ی گەوره بەرامبەر بەگزادەكانی (هەورامان) ئەگرت.

ئەی گوت: «ئەگەر شـێخ مەحمـوود تێبينی بكردايه و بيزانيـايه چۆنيـان ئەكاته پشـتيـوانی خۆی، له بريتی پارەسـەندن، پارەی بدانايه بەتايبەتی بەجافرسـان وەكو دامان نابوو، بەسـايەی لەشكری خۆی و ئێمه و هەورامان و پشـدەرەوه. (هەڵەبجه) و (سـلێمانی) و (خانەقين) له يەک دوو ڕۆژدا داگير ئەكران».

ئەو شـەوه زۆر سـارد بوو. بەيانی لەگـەڵ پيـاوێكی خـۆيدا، له پاش مـاڵئـاوايی كـردن، چووين بۆ (تەوێڵه).

## تەوێڵه ١٩٣٣/٨/٢١

هەر نيو سـاته ڕێـەک دوور، بەتەنشـت باخ و ڕەزەكانەوه له بن سێبەری سووره چنارێكدا چايخانەيەكی خنجيـلانه و جوان كـراوه، له سـەمـاوەری وەرشـاو، له قـۆريه و پيـاڵەی نـاياب، بەپاک و خـاوێنيـيـەكی تەواوەوه چاييت بۆ دێنن. لادێـيـيـەكـانيش ڕێكوپێك، زۆر بەنـاسـكيـيـەوه مـاندوو نەبوونيت ئەكـەن. له بابەت قـسـەكردن و هەڵـسـان و دانيـشـتنەوه، له بابەت خـاوێنی و ڕێكوپێكيـيـەوه، ئەمـان گـەلێک له شـاربـاژێڕيـيـەكـان پێشكەوتووترن. بەلای گوندەكـانی «مشـيله» و «بەڵخه» و «شـمـشـه»دا ڕۆيشـتين. مـاڵەكانيان دوو نهۆم و، زۆر ڕێكوپێک بوون. كه نزيک تەوێڵه بووينەوه، تا ئەوێ. له چەند لايەكيـشـەوه ئاو ئەهاته خوارێ. بەرتيشـكی ڕۆژەكه ئەكـەوت، ئەچريسـكايەوه. سێ سـاتی تەواوی پێ چوو، ئينجـا گـەيشـتينه (تەوێڵـه). بەسـەر پردێكـا پەڕينەوه. له ژێريەوه چەم ئاوی (تەوێڵـه) گـڤـەی ئەكـرد. لەبەر كۆشـكێكی گەورەی دوو نهۆمدا ڕايان گرتين. ئەوه ماڵی (شـێخ حـسـامەدين) بوو. يەک دووانێ برديانينه كۆشـكێكی كەوه. بەتەنشـت دەرگاكەيەوه ئەسـتێركێكی گەوره هەبوو، له بن سـێـبەرێكدا له كانيـيـەكـەوه ئاوی ئەچووه سـەر. سـەر دەرگاكه، كەلەگی و ژێرخانێک بوو، (شـێخ حـسـامـەدين)ی تيـا دائەنيشـت. له خـوارەوەيش بەلای دەسـته چەپدا، چەند ژوورێک هەبوو، لەگـەڵ هەيوانێكی نوێژكـردن، سـپـيكراو و، پڕ ئەخش و نيـگار، له تەنيـشـتيـەوه ژوورێک هەبوو، (شـێخ بەهائەدين)ی باوكی (شـێخ حـسـامـەدين)ی تيـا

نیـژرابوو. لە بەردەمی ئەم هەیوانەوە، ئەسـتێـرک و سـورکـێکی جـوانی ڕێکوپێک هەبوو، دەوروپشـتی بەتەلەبەردی تەخت و خشـت تەنرابوو. لە پێش ئەم سـەکۆیەوە. دە پانزە دار عـەرعـەری سـی گـەز بەرزی چووبون بەئاسـماندا. ئەگەر ئێـواران لەسـەر ئەم ئەسـتێـرک و سـورکە دابنیشـیت و تەماشـای ئەو چەم و باخـاتەی خواروی خـانەقـاکە بکەیت، لەو لایشـەوە سـەیری خـانووەکانی (تەوێڵە) بکەیت، کە بەقـەد شـاخەکەدا هەڵچووبوون، لەگەڵ ئەم دار عەرعەرانەدا، هەرچی خەم و خەفەت هەیە لە دڵتدا نامێنێ.

***

بێچووە سـەیدێکی هەرزەکاری ڕووخۆش لە پلیکانەیەکەوە بردینیـە سـەرێ بۆ ژووری میوان. کە چووین نان دانرابوو. سـەید ئەو ڕستەیەی دا بەبن چنگماندا:

«متی حضـر الطعـام بطل الكلام». سـینییـەکە: نانی هەورامی و، ماسـت و، قـوبولـی تەماتە و تۆزێ ترێی لەسـەر بوو. پاش نانخواردن، لە چایخانەی تایبەتی خانەقاوە چایشـیان بۆ هێنـاین.

شـێخ ئەمانەی بەسـەر کاروباری خانەقاکەدا: بۆ چێشـت هێـنان و چا دان و ئەسـپ و ماین بەسـتنەوە... دابەش کردووە.

پاش نوسـتن چووینە لای (شـێخ حـسامەدین)، لە ژووری دانیشـتنی خۆیدا. دەسـتمان ماچ کرد. ئەویش هەسـتایە سـەر پێـیان و سـەری ماچ کردینەوە. یەکـێک باوەشێنی ئەکرد. دەروێشـەکانیشی بێجگە لە کورەکەی و براکەی، هەموو دەست بەسـنگەوە، لەبەر دەمیا وەسـتابوون. فـەرمووی: جگەرە و چایان بۆ هێنـاین. ئێمەیش، من و ئیـسماعیلی هاوڕێم ڕێز و خۆشەویسـتی باوکمان پێشـکەش کرد.

شـێخ پیـاوێکی چوارشـانە، لە بالآدا ناوەنجی بوو. دەموچاوێکی بەسـامی هەبوو. ڕیشـێکی سـپی، ڕوویەکی سـوور، دوو چاوی پێوە بوو، کلێکی زۆری لێ دابوون. تا خوا حەز بکات دڵی پیـاوی کێش



شێخ محەممەدی شێخ حـسامەدین

نەکرد. کوتوپڕ بەزەردەخەنەیەکی شیرینەوە، بەگەرمی دەستی کرد بەقسەکردن. پیاوێکی زۆر تێگەیشتوو بوو. نەیویست بەدڵی ئێمە قسە بکات. باسی (مەحموود پاشا) و جافەکانی نەکرد، کە حەڵی خۆی ئامۆژگاری پیاو چاکی کردوون، تا زۆر لە کەس نەکەن. پاشان هاتە سەر باسی خانوو دروستکردن. جار بەجاریێ قسەی پێکەنینی هێنەریشی ئەهێنایەوە. جارجارێکیش قسەکانی ناو قورئان. لە قسەکانیەوە وا دیاربوو کە لەگەڵ بەگزادەکانی هەوراماندا تۆزە ناکۆکییەکیان هەبوو. ئەیگوت: «تا ئێستا پیاوخراپ، دوو جار ویستوویانە بمکوژن». یەجگار قینی لە شەڕ و کوشتاری هەورامییانە بوو. ڕاستییەکەیشی ئەوەی لەبەر ئەوەبوو کە بەهۆی ئەو پشێوییەوە کوردەکانی ئێران ناتوانن بێنە ئەم دیو، دیاری و داهاتی بۆ بهێنن. چونکە (شێخ) هەرچی دەست ئەکەوت زۆری لە ئێرانییەکانەوە دەست ئەکەوت.

شێخ بەشی زۆری دێهاتەکانی لە هەورامانی ئەم دیو و ئەو دیودان. لە (سنە) و (سابڵاخ)یشدا بەشی هەیە. ئەمانەی هەموو داوە بەسەرکار و باخەوان، بۆی بهێننە بەرهەم. زۆرجار وتوویەتی: «قەی ناکات بام بەدزییەوە بیخۆن. ئەوی من هەمە هی کێیە؟ هی خۆیان نییە؟!». کوڕەکانیشی چاکی ئەخۆن!... باخەکانی یەجگار گەورە و بەردار و ئاوەدارن. داری توو و گوێز و ترێ و هەڵووژە و چناریان بەهەزاران تیایە. دارگوێزێکی (شێخ) لە (تەوێڵە) حەفتا هەزار گوێزی گرتبوو!... شێخ ئەم شاخە سەختانەی وەکو پلیکانە، لە سەرەوە تا خوارەوە کردووە بەسەکۆ، سەکۆ. بەمە شاخەکە زەوییەکەی زۆرتری لێ هاتووە. هاتوچۆیشی تیا ئاسانتر بووە. ئەو ڕێکوپێکییەی لە دروستکردنی ئەم سەکۆیانەدا دیومە لە (لوبنان)یشدا، بەو هەموو شارەزاییەوە کە هەیانە، ئەم دیوە. ئەمە هەمووی بەکۆڵی «دەروێشان» کراوە!.

کاشکی تووەکەی بۆ کرمی ئاوریشمیش بەکار بهێنرایە. ئەوساکە شێخیش و لادێییەکانیش دەوڵەمەندتر ئەبوون. دێی (باخەکۆن)یش شێخ حسامەدین ئاوای کردۆتەوە. جگە لەوە لە هەموو دێیەکدا کۆشک و خانووی نایابی هەیە.



ئینجا چووین بۆ گەڕان. هەموو ئاوەدێ و بەشێکی گەورەیش لە باخەکان گەڕاین. خانووەکانی تەوێڵە یەجگار ڕێکوپێک کرابوون. لەم (٦٠٠) ماڵەدا تا نزیکەی (٥٠) خانوو سێ نهۆمی تیایە.

خانووی (قادر بەگی جافرسان) نموونەیەکی کار ڕەنگینی و زیرەکی وەستا و خانەخوێکانی تەوێڵەیە. خانوویەکە سێ نهۆم، پڕە لە ئاڵەتکاری. پەنجەرەدارە. پڕە لە ئاوێنەکاری. مینا بەندیش کراوە. پیاو بەڕاستی کە بەراوردی لادێییەکانی شارباژێڕ و هەورامان ئەکات سەری سوڕئەمێنێ. ئەم خانووانە لە شاریشدا کەم وێنەیان هەیە. زۆریان بەبەردی ڕەنگاوڕەنگی شاخەکە. بەوشکە کەڵەک دروست کراون.

قەیسەرییەک، سێ چوار چایخانە، چەند دووکانێکی تر، دوو سێ سەرشۆرک، (حمام)، خانەقایەک و، دوو مزگەوتی زۆر نایابی تیابوو. کەڵاش دوور و، چەقۆگەر، ئاسنگەر، دارتاشی یەجگار هونەرمەند، لە تەوێڵەدا هەبوون. ڕەنگە نزیکەی (١٥) مەکینەی بەرگ دوورینم تیا ژماردبێ. (تەوێڵە)، زۆر گەورەیە. خانووەکانی لە کەمەری شاخەکەوە، هەتا دامێنی بەپلە، پلە، هاتوونەتە خوارەوە.

چاوەندازێکی جوانی هەیە. بەڵام تا بڵێی کۆڵانەکانی چەپەڵ و پۆخڵن. هەڵی نەگرت (قائمقام نوشین) بوایە. چونکە لە هەڵەبجە گەورەتر بوو. کەلاشی قۆندەرە ناسا، پۆتینی دەزووی نایاب، چەقۆی بەجگار ناسک و جوان، داردەستی زۆر ڕەنگین، کەوچک و شەکردانی چاک، لە (تەویلە) دروست ئەکرێن. خوا زیرەکییەکی گەورەی پێ بەخشیون. لەگەڵ ئەو ئاوە سازگار و بایە خۆشەدا، لەشێکی سووک و بەکاریشی داوتێ. (تەویلەیی) جگە لەم هەموو باخ و باخاتە، بۆ بێستان و باخ کردن، لە ژوور ئاوایییەوە، تا نزیک لوتکەی شاخە سەختە سەرەولێژەکە، هەموو ڕۆژ هەتا ئێواری خەریک ئەبن، لەوێوە بەرووبووم بەو ڕێگا سەختەدا ساتە ڕێیەک بەکۆڵ ئەهێننە خوارەوە. ئەمەیش کارێکە کە ئێمە بۆ ڕابواردنیش کەمان هەیە، بوێرێ بۆی بچین!... لە هاوینا هەموو خاوەن باخەکان لە بەیانییەوە دێنە ناو باخەکانیانەوە. لە کەپر و قۆختەدا دائەنیشن، خەریکی باخەکانیان ئەبن تا ئێوارێ. ژن و پیاوی تەویلەیی جوانییەکی خواکردیان هەیە. ئافرەتیان زۆر سەربەستە، هەموویشیان زمانی کوردی ئێمە ئەزانن.

لە تەویلە چوومە مزگەوتێکەوە، سێ نهۆم بوو، لە خوارەوە دوو ئەستێرکی ڕێکی ئاو ڕوونی هەبوو. بەپلیکانەیەکدا کە هەردوو تەنشتی بەتەختەی گوێز گیرابوو، سەرکەوتمە سەرەوە. ناو ژوورەکەیشی بەتەختە گوێز داپۆشرابوو. لە دیوارێکیدا هەر بەتەختە گوێز، چوار، پێنج (نووسراودان) کرابوو. دیسانەوە بەپلیکانەیەکی تەختە گوێز تەنراودا سەر کەوتمە سەر نهۆمی سێیەم. لەوێوە چاوەندازێکی زۆر جوانی تەویلە، بەخۆی و باخ و باخاتیەوە دیاربوو. (تەویلەیی) لە بەرگدا خۆیان پۆشتە و پاک و خاوێن ڕائەگرن هەر کەلاش دوورەکان پۆخڵن. زۆریان باڵا بەرز و شەنگ و شۆخن.

لە تەویلەدا، چونکە کەوتۆتە ناو دۆڵی دوو شاخی بەرزەوە ڕۆژ کەم ئەمێنێتەوە. بەیانیان ساتی یەکە، -لە هاویندا- ئینجا هەتاوی لێ ئەدا. ئێوارانیش لە پێش بانگی شێواندا بەدوو سات ڕۆژئاوا ئەبێ. لە (تەویلە)دا جگە لە (حوجرە)، خوێندنگایەکی چوار پۆلیش هەبوو. ئێوارە لەسەر ئەستێرک و سوڕەکە پشوویەکماندا. ساتی یانزەهەم و نیو، سەیدە بەخرۆشەکە هات بەشوێنماندا بۆ نان خواردن. نانی ئەو جارەمان باشتر بوو: «دۆ و، نان و، یاپراخ و، قوبولی و، شفتە بوو».

لەوەتی «شێخ حسامەدین» لەگەڵ ڕێگرەکاندا ناڕێک بووبوو، لە زووەوە نانیان ئەدا بەمیوان. شەوێ، هەرچەندە لە ترسی تەقەبوو، بەڵام بەناوی سەرماوە لە ژوورەوە نواندیانین!، بەڵام مێشوولە و وردە گەرما نەیهێشت تا ساتی پێنجەم بنووم. بیرم لە هەزار شت ئەکردەوە. شەپۆلی ئەندێشە هێنامیە سەر بیری چاپکردنی دووەم چیرۆک لەو هەشت چیرۆکانەی کە لە عەرەبییەوە بۆ منداڵانی کوردم کردبوو بەکوردی[1]. ئەو ژمارەی دووەمەیان بۆ دەستەی کچان ئەشیا. لەبەر ئەوە هەر لەو ژوورە گەرمەدا بەبیر ئەم هەڵبەستەی خوارەوەم بۆ بەشی پێشکەشی چیرۆکەکە دانا:

بۆ دەستەی کچان، دایکانی دوا ڕۆژ:
کە پێگەیێن چرۆی هیوامان،

(١) هەر هەشت چیرۆکەکە، بەناوی (چیرۆک بۆ منداڵان)ەوە لە ساڵی ١٩٣٥دا، لە شێوەیەکی جوان و ڕازاوە و نایابدا، لەلایەن میرییەوە چاپ کرا. تا منداڵانی کورد، هی پۆلی دووەمی سەرەتایی بیخوێنن. (ش. ف)

بەکـــــردەوەی جـــــوان بەکــــاری ڕەنگین
ئاوا کـــەنەوە خـــاکی کـــوردســـــتـــان،
ئەم چیـــرۆکـــانەم ئەوا پێـــشـــکەش کـــرد

بەیانی زوو یەکێک بەلاماندا وییزەی کرد. گوتی: «ئای قوڕم بەسەر. ئیسلامەتی نەماوە. خۆ وا سات (٩)یە کەچی هێشتا لەخەو هەڵنەستاون!». منیش وەنەبێ نوێژکەر نەبووبم. بەڵام جارێ زۆری مابوو بۆ نوێژ. لەبەر خۆمەوە وتم: «ئەگەر هەڵیشسم، لەگەڵ ئەوەیشدا کە ساتێک لە پێشەوە هەڵساوم. هێشتا هەر دەرۆیش گلەیی ئەکات. کەواتە هەڵناسم!...». لەمەدا بووم خەوە لێ کەوتەوە. لە ساتی دەهەمدا خەبەریان کردمەوە. نوێژم کرد و چاشم خواردەوە.



سەیید چونکە خۆی ئیستری دەست نەکەوتبو، سواری بێ، ئەیگوت: «ڕۆیشتن بەپێ بێ باشترە!». دوایی تەفرەی داین، کە ئێمەش هەر بەپێ بڕۆین!... نزیکەی سێ چارەکە ساتێک بەبن ئەو دارە گەورانەدا ڕۆیشتین، ئینجا گەیشتینە «ئاوێ سەر». هەر سەرووی باخەکانی (تەوێڵە)، لەم لاوە، (ئاوێ سەر)ە. جێگایەکی تەختانی بوو. داری گەورە، گەورە، سەری داپۆشی بوو. لە سێ لاوە کانیاوی سازگار هەڵەقوڵا. تاقە خانوویەکی هاوینە -قۆختە-ی شێخی لێ بوو. کە ئەویش هی پیاوە باخەوانەکەی بوو. سەد هەنگاوێک بەرەو ژوورتر، سنووری (ئێران) بوو. قولەی ئێرانییەکان بەسەر شاخەکەوە بوو. بەدەستە چەپیشەوە، لە شاخەکەی ئەملادا، قولەی عێراقی پێوە بوو. «هەر دوو لا کوردستان بوو. بەڵام بەسایەی بێگانەوە بەش کرابوون!؟...» ئێرە سەیرانگای نیشتەنییەکانی (تەوێڵە) بوو. چایخانەیەکی لێ بوو. کاشکی جێگاکەی وا پەست نەبووایە، پۆل، پۆل، ڕوو ئەکەنە ئێرە. ئافەرین بۆ سەیید!... هەتا چا پێگەیشت کولێرە بەڕۆن و نانی هەورامی و کەرەی بۆ پەیدا کردین. سەیر ئەوەیە، لەوە پێش بەسات و نیوێک چاییمان خواردبووەوە.

سەیید کوڕێکی قسە خۆش و بەخرۆش، بزێو و بەجۆش و چاک دەرچوو !. لەوێ بەکەوا و سەڵتەی ئێمە و خەنجەر و دەمانچەکەمانەوە وەکو «پەهلەوانێکە» بەسەر دارێکەوە نیشتەوە. منیش «وێنەیەکم» کێشا. پاشە جار پێم گوت: «پیاوی چاک بە. ڕیشەکەت قەڵەم بکردایە، ئینجا وێنەی خۆت بگرتایە !». گوتی: «ڕیشەکەم هی خۆم نییە، هی شێخە، لەبەر ئەوە ناتوانم دەستی لێ بدەم !»... سەرت نەیەشێنم، سەیید لە (لا اله الا الله) و (فەرموودەی قورئان)ەوە، کەوتە گۆرانی وتن و سەماکردن و، چاو و برۆ -لە خانەقادا- داگرتن !...



دروان لە جەنگاوەرەکانی (عەجەم) هاتنە خوارێ، چایان خواردەوە. بەرگەکانیان یەجگار شڕ و چڵکن و پڵکن بوون. لەگەڵ ئەوەشدا چونکە کورد بوون، لە هی بێگانەکان وریاتر و چالاکتر بوون!.



پاشان بەڕێگەیەکیکەدا، کە هەموو تەوێڵە و باخەکانی، بەبەرزەوە، لێوە دیار بوو، هاتینەوە ماڵی شێخ.

پاش نیوەڕۆ، هەندێکی تر قسەمان لەگەڵ (شێخ حسامەدین)دا کرد. پرسی: «ئایا باوکم فەرمانبەری میرییە یان نا؟» پێیان گوت: «بۆ خۆی کار ئەکات». شێخ قسەکەی یەکجار لا خۆش بوو. ئەیگوت: «بەخوا چاک ئەکات. ئازادی خۆشترە!». وەک ئەیان گێڕایەوە:

«حەلی خۆی کە ئینگلیزەکان بە(شێخ حسامەدین)یان گوتووە (٣٠٠) ڕوپیە مانگانەی بۆ ببڕنەوە، گوتوویەتی: «بەڵکو سبەی دووسبەیەک (تورک) یان (عەجەم) ئێرەیان داگیر کردەوە، ئەوسا نالێن نانخۆری خوا نەناسی بوویت؟!» دیسانەوە وتبووی: «ئیمڕۆ مووچەکە ئەبڕن، ڕۆژێک دێ کە بیبڕن. خەفەتی ئەوسایش لە خۆشی ئێستا زۆرتر ئەبێ. کەواتە بەلێفەی خۆم ئەنووم!...».

«کەچی (شێخ عەلائەدین) مووچەی وەرگرتبوو. ئێستەش بەناوی تەرخانگاه (ئەوقاف)ەوە وەری ئەگرێ!.» لەو حەلەوە کە قسەمان ئەکرد، ئەوەم بیرکەوتەوە، کە بەقسەی هەندێک دەروێشەکانی، شێخ وتبووی: «چەند جارێک وێنەی منیان گرتووە، دەرنەچووە!. هەرگیز وێنەی من ناگیرێ!». منیش بەشیرینییەکەوە پێم گوت: «نافەرموون وێنەیەکتان بگرم؟!»... ئەوساکە شێخ پێی زانی کە من (شاگرد)ێکی (خوێندگا)م. ئیتر وەک بیەوێ دڵی شاگردێکی خوانەناس -خۆیان ئەڵێن- کیش بکات، بەو لەشە گرانەیەوە، گورج ڕاست بووەوە و (عەگالێکی ئاوریشمی سپی)ی کردە سەری و فەرمووی: «چۆن ئەڵێی وا ئەکەم. ئارەزوو ئەکەی دێمە بەر هەتاو. دێمە بەر باخ. حەز ئەکەی هەڵبەپەرم؟». شێخ پیاوێکی گەورە بوو. ئەیزانی چۆن دڵی لاوێکی وەک من خۆش بکات. بەسەڵتەیەکی سەوز و کەوایەکی شیرداخی سوورەوە، بەو عەگالە سپی و چاوە ڕێژراوانەیەوە، لەبەر هەتاوەکە ڕاوەستا تا وێنەم گرت. پاشان دەستمان ماچ کرد و ماڵئاواییمان لێ کرد. لەگەڵ یەکێکدا ئاردینیەوە «هانە نەوتی».[1]

## بیارە ١٩٣٣/٨/٢٣

ئەوشەوە لە «هانە نەوتی» بووین. بۆ بەیانی نزیکەی ساتە ڕێیەک بەناو باخەکانی شێخدا بەژێر سێبەری داری گوێز و توو و کەڵەمێو و شاتوودا ڕۆیشتین تا گەیشتینە «بیارە». (شێخ عەلائەدین)یش لێرە خانەقایەکی گەورەی هەیە. بەڵام ئەو وێنە شیرینەی خانەقاکەی تەوێڵەی نییە. لەسەر بانی خانەقاکەوە گۆڕی (شێخ عومەر زیائەدین)ی باوکی شێخ عەلائەدینی لێیە. ئەڵێن تووکی ڕیشی پێغەمبەریشی بۆ هێنراوە! پەنجا ماڵێکە. بەڵاد بەباخ و باخات و تەنراوە. بەو چەماوەی کە بەناویدا ئەڕوا، لەگەڵ ئاوی ئەو تاڤگەیە کە ئاشەکەی شێخ ئەگێڕێ، لەگەڵ ئەو کێو و کەژە ڕەنگینەدا، چاوئەندازێکی یەجگار ئاوازەی هەیە. بیارە یەک دوو شۆڕەبیم تیا دی، باڵابەرز بوون. لقەکانی وا شۆڕ

(١) کە لە ساڵی ١٩٤٠دا بووم بەکارگێری لادێی خورماڵ، بۆ (کەڵکی گشتی) پارەتیم زۆر لە خوالێخۆشبوو، (شێخ حسامەدین)ەوە دی، کە تا ئەمێنم چاکەیم لەبیر چاوە و بەدڵ سوپاسی ئەکەم.

بووبوونەوە ئەتگوت پرچی کچێکن کە لە گەرمەی دڵداریدا بێ. بەڕاستی جوانترین دارێک بوو کە لە (هەورامان)دا دیبووم. بیارە لە هەموو دێهاتەکانی تر جوانترم هاتە پێش چاو. لادێییەکان چایخانەیەکیان لەسەر ئەو چەمە لەناو جوانترین جێگای (بیارە)دا کردبوودوە. تەخت و کورسی یەجگار نایابیان تیا دانابوو. لادێییەکانیشی وەک هی ئەولا ڕێکوپێک بوون. قەیەرییەک و چەند دووکانێکی تریشی تیایە. پاشان لەگەڵ (شێخ محەممەد)دا سەرکەوتینە سەر سەربانی ئاشێک. یەجگار تەخت و پان و پاک و ڕێک بوو. دوو داری گەورەی ناردەوەن و گوێز بەسێبەرەکانیان جێگاکەیان داپۆشیبوو. ئاوێکی خوڕی ڕوونی ساردیش لە شاخەکەوە لە سەرەوە ئەکەوتە خوارەوە، هاژەی ئەکرد. بەناو جۆگەلەیەکی پانی ڕاستی، قەراغ خشتا ئاوەڕاستی سەربانی ئاشەکەی ئەبڕی و ئەچووە ناو تەنوورەکەیەوە. بەرامبەر بەم تاڵگە دەنگ خۆشە، ئێمە لەسەر تەختێکی یەجگار باش دانیشتبووین. لەناو لقی دارەکانەوە، ئەو تیشکە زیوینەی کە پریشکی ئاوەکە ئەیدایەوە بەڕووی دارەکاندا، لەگەڵ ئەو تیشکە زێڕینەی کە لەم لامانەوە ڕۆژ لە ڕووکەشی باخەکان و ماڵەکانی بیارەی ئەدا، ئەیدا لە چاومان، لەش و هۆشی وا ئەبووژاندینەوە، زمانی وا ئەکردینەوە، ئەو قسانەی ئەمان کرد و گوێمان لێی ئەبوو، بەچەشنی ئەو چاوئەندازە دڵگیر و ئاوازە و ڕازاوەیە دەرچوون. هەندێک چووینە ناو باخەکانەوە. پاشان کە هاتینەوە، (شێخ عەلائەدین) و کوڕەکانی و بەردەستەکانی لەگەڵ (شێخ محەممەد)دا لەوێ دانیشتبوون. چاییان لێ دەم کردبوو. دەستی شێخمان ماچ کرد. زۆر بەفیزەوە خۆی نواند. سەربازێکی عەرەب، سێ جار دەستی ماچ کرد. نازانم بۆچی هاتبوو؟... دووانی کەی عەجەمیش، کە سنوورەکانیان سەد هەنگاوێک بەو لاوە بوو، هاتبوون.

شێخ پاڕانەوە نامە، یاخود نوشتەی بۆ ئەنووسین. پاشان شێخ بەرە بەرە زمانی خۆی کردەوە. وەکو هاودەمێکی دە دوازدە ساڵەیی ئەیدواندین. شێخ و کوڕەکانی شێوەیەکی زۆر جوانیان هەبوو. هەموو مێزەری سپی و سەڵتە و کەوایان لەبەردابوو. یەجگار بەسەزمان و ڕووخۆش بوون. شێخ، لە دەرەوەی (بیارە)، بەزۆرزان و دوو دەنگیان دائەنا. بەڵام وەک بۆم دەرکەوت پیاوێکی هێمن و بێ وەی و ساکار بوو. دەم و چاوە پاکەکەی بەڵگە بوو بۆ ئەوەی کە لە فرۆفێڵەوە زۆر دوور بوو. باسی هاودەمی خۆی و (خونکار فیصلی یەکەم)ی بۆ ئەکردین. کە شێخ ئەچێتە (بەغدا)، هەموو جارێ (خونکار) ڕووخۆشی لەگەڵیدا ئەنوێنێ و شانی ماچ ئەکات. گوایا جارێک ئەخۆش ئەکەوێ، شێخ ناوی چەند دەرمانێکی بۆ ئەنووسێ، بەکاری بێنێ. (فیصل)یش -بەو هەموو خوێندەواری و زۆرزانییەوە کە هەیبوو- گوێی نەداوەتە پزیشکە باشەکانی (بەغدا)، بەقسەی ئەمی کردووە و چاک بۆتەوە!!.

بەڵێ، شێخ، بەسایەی خوێندەوارییەکەیەوە، گەلێ شتی پزیشکایەتی فێر بووە. بەڵام لە شتی دەرەوە نەبێ لە شتی ناوەوەی لەش هیچ نازانێ. ئەو بۆ لادێییەکان باشە کە باوەڕی زۆریان بەشێخ خۆیەتی، نەک بەدەرمانەکە خۆی!. ئەی گوت: «داوام لە فەرمانڕەوایی ئێران کردووە هەزار تمەنم بداتێ، دەرمانێ دروست بکەم، بەسواری فڕۆکەوە بەناو لەشکری گاوردا -مەبەستی ڕووسەکانی شەڕی گەورەی یەکەم بوو- بڵاوی بکەمەوە، هەموویان بکوژم. بەڵام بەقسەیان نەکردووم!».

پاشان قسە هاتە سەر گوڵت و درەخت. وا دیاربوو شێخ بۆ ئەوانە زۆر بەپەرۆشەوە بوو. چونکە هەواڵی زۆر ئەپرسین. دیسانەوە هاتەوە سەر قسە شێخانەکانی خۆی: «ئەڵێن لە هیندستان دارێک هەیە... لەپێش دەرچوونیدا. لە زەوی، گرمەیەک ئەکات. هەرچی لەم لاو لەو لایەوەن تا ساتە ڕێیەک ئاگادار ئەبنەوە. تا ئەگەنە ئەوێ، لە خواوە، دارەکە بیست گەز بەرز بۆتەوە، گەڵای کردووە، لادێییەکان دەست ئەکەن بەبڕینەوەی. خوا ئەم گرمەیەی بۆیە داوەتێ، کە لادێییەکان بزانن ئەو دارەیە، لە ڕواندن و گەشەکردندایە!». منیش گوتم: «وەک لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندوومەتەوە، ئەڵێن دارێک لە ئەفریکا هەیە، هەموو ساڵێ پیاوی پیر و پەککەوتوو، یاخود بێ فەڕی بۆ ئەبەن، ئەیخەنە ناو کلۆرەکەیەوە، دارەکە دێتەوە یەک. خوێنی کابراکە ئەمژێ. پاشان یەکالا ئەبێتەوە، ئێسکەکانی نێچیرەکەی فڕێ ئەداتە دەرەوە!...». شێخ کە وام گوت، سەری سوڕما. هێنەکەی خۆی لە بیر چووەوە!...



پاشان زۆر گیان سووک خۆی پیشان دا. کوڕەکانیشی وەک خۆی وا بوون. کوڕەکانی بەکوردی هەردوولا و بەعەرەبی و فارسی باش قسە ئەکەن و ئەنووسن. لام وایە شێخ لە تورکیش تێ ئەگەیشت. جگە لەمە کوڕێکی هەبوو، ناوی (شێخ خالید) بوو. ددان سازێکی زۆر چاک بوو. گەلێک ددانی بۆ ئەم و ئەو دروست کردبوو، یەجگار ڕێکوپێک دەرچووبوون.

شێخ خۆیشی تۆزێ، پزیشکایەتی ئەزانی. منیش هەروەها بیرم لە کردەوەکانی (شێخ) ئەکردەوە. لە پڕ (شێخ محەمەد) بەچۆکدا هات و سەری نایە بناگوێی شێخ عەلائەدینەوە. لە دواییدا (شێخ محەمەد) بۆی گێڕامەوە، گوتی. شێخ عەلائەدین لێی پرسیم:

«بیستوومە کە باوکت -شێخ حسامەدین- زانیویەتی من تەلگرافێکم لێ داوە بۆ فەرمانڕەوایی (بەغدا)، کە بە دە هەزار سوارەوە ئامادەم بۆ کوشتنی ئاسوورییەکان. گوتی: شێخ عەلائەدین (....)ە. ئایا ڕاستە باوکت وای پێ گوتووم؟!...». (شێخ محەمەد) گوتی منیش وەرامم دایەوە، گوتم:

«باوکم دەمێکە ئەم قسە (....)انە ئەکات...» (شێخ محەمەد پلارێکی زۆر زانانەی تێ گرتبوو. واتا باوکم لە دەمێکەوە ئەزانێ کە تۆ (....)ی!؟.



سەماوەرێکی وەرشاوی جوان دەم کرابوو. لەسەر سینیچکەی وەرشاو چەند پیاڵەیەک چای جوانیان بۆ هێناین. پاشان لەسەر قالیچەیەک هەموومان دانیشتین، دەستمان کرد بەنانخواردن. نانەکە: «نانی هەورامی و ماستاو و پلاو و ئاو و گۆشت و کەباب و ترێ» بوو.

پاش نانخواردن، باسی کەشکۆڵ و نووسراوانی کوردیم هێنایە گۆڕێوە. یەکێ لە مەلاکان نووسراوێکی هەڵبەستی خۆی هێنا کە بریتی بوو لە (ئایین نامە)یەک. شێخ و کوڕەکانی گەلێک پەسندیان کرد. کابرا نیازی هەبوو چاپی بکات. منیش بەڵێنم دایە کە یاریدەی بدەم. (شێخ خالیدی کوڕی عەلائەدین) گوتی: «لە سنە، (شێخ محەمەدی ئایەتوڵڵا) فەرهەنگێکی کوردی داناوە. زۆر نایابە. بەزمانێکی تریش لێکی



خوالێخۆشبوو شێخ عەلائەدین

داوەتەوە». ئیتر دەستی (شێخ عەلائەدین)مان ماچ کرد و لەوەدا بووین بڕۆین، پرسی: «ئاپ لە سلێمانی مامۆستای ئینگلیز هەیە. ناپێنی گاور بلاو بکاتەوە؟... چونکە ئەم کچەزایەم لە ئێرانەوە هاتووە، ئەمەوێ بینێرمە خوێندنگایەکی ئەوێ...» ئێمەش گوتمان: «نە» ئینجا ئەویش وای نواند کە بینێرێ. جا نازانم ئەم پرسەی لەبەر ئەوەبوو کە مێشکمان سڕ بکات، یاخود بەڕاستی بوو؟!.

## باخەکۆن ١٩٣٣/٨/٢٤

لە چەمی (بێرە)دا، لای (کەریم ئەفەندی) ناو، کارگێڕی لادێی خورماڵ، لە بن دار گوێزەکاندا، ئەم بەر و لەو بەری جۆگەیەکی ئاو بلووریندا، دانیشتین. دەستمان کرد بەقسەی خۆش و نان و چا خواردن. لە پڕ شەستە بارانێک باری. بەجارێ هەمووەمان، لە کەری خوا سەرمان سوڕما. چونکە کەشی باران نەبوو. سەیر ئەوەبوو دڵۆپێک بارانمان لێ نەکەوت، لەبەر پڕی و چڕی گەڵای دار گوێزەکان!...

سواربووین. کزەبایەکی بەجگەر فێنک لەت و لقی دارەکانەوە شنەی ئەکرد. بەناو دارا ڕۆیشتین، تا گەیشتینە بەر «چەمی هەناران». لێرە ئاوێکی زۆر، بەپانی لەسەرەوە ئەکەوتە خوارەوە، تاڤگەیەکی زۆر جوانی هێنابووە بوون. ئیتر گەرما دەستی پێ کردەوە. بەلای دێیەکی ئاوەدانی پڕ لە باخ و باخاتی جواندا تێپەڕین. (نارنجەلێ)یان پێ ئەگوت. ئیتر دەمەو ئێوارێ بوو، لە دوورەوە (باخەکۆن)مان دی. چارەکێک دوور لە دێوە شەقامێکی بەجگەر ڕێکوپێک هەبوو. حێ، حێ، ئەمبەر و ئەوبەری، دار توو و دار چناری بەڕیز لێ ڕوێنرابوو، ئەیبردینە دێیەکەوە. دێیەکە، (باخەکۆن)، لەناو قەدی شاخەکەدا هەڵکەوتووە. لەبەر دەمیەوە باخەکانی دەست پێ ئەکەن. ئینجا دەشتێکی کاکی بەکاکی خوارووبان پڕ ئەکاتەوە. (باخەکۆن) چەند خانوویەکی دوو نهۆمی و سێ نهۆمی گەورە و بلندی ڕێکوپێکی تیابوو. بەردی سەوز و سووری

شـاخـەکـە بەجگار چاوئەندازێکی جـوان و پـاک و خـاوێنی دابوویە. لەسـەرە ڕێگادا چەند دووکـان و چاپخانەیەکی یەک نهۆم بەسـەر گردێکی نزمەوە دروست کرابوون. ئینجا گەیشتینە سـەر ئەستێرک و جێ دەسـتنوێژ و خانەقای (شێخ حسامەدین). ئینجا ڕێگاکە هێنایینە سـەر میوانخانەیەکی زۆر گەورە کە بەپلیکانەیەکی سـەکۆ ئاسا بەرەبەرە دێتە خوارەوە.

لە سـەرێ سـوڕک و ئەسـتـێـرکـێکی جـوانی بەئەندازەی ڕێکوپێک لەبەرد دروست کـرابوو. لەبەر دەمیشیەوە سـەکۆیەکی تەلەبەردی بەخشت و خاڵ دروست کرابوو. بەسـەر ئەم تەکـیەیە سێبەرێکی گەڵا بەکـەپر کـرابوو. خـرابووە سـەر دوو دیواری بەرامـبەر. لە هەردووکـیـانـدا دەرگـایەک لە شـێـوەی تاقـدا کرابووەوە. کە لە سێبەرەکە تێپەڕ بوویت، لە هەر لایەکەوە ئەڕۆیشتیت ئەچوویتە سـەر تەختە بەندێک، ئینجا پلیکانەیەکی وشکە کەڵەک ئەیبردیتە خوارەوە بۆ سـەر ئاوێک کە لە ژێر ئەم کۆشکی دانیشتنەوە گلەی ئەکرد و لەژێر سێبەری چەند دارێکی شۆڕەبی و زەیتووندا ئەیوەستاندیت.

بەتەنشت ئەو کۆشکی میوانانەوە کۆشکی مالی شێخ دروست کرابوو. ئەمیش سێ نهۆم بوو. بەهەیوان و ژوور و پەنجەرە و دەرگای جوان جوان ڕازێنرابووەوە. لەبەر دەمیشیا ئەستێرکێکی (١٥) گەز پانی و (٣٠) گەز درێژی و (٤) گەز قـووڵی هەبوو. ئەم ئاوە تا دە سـاتێک بەشی گـێڕانی ئاشـێک و هەمـوو باخەکانی (باخەکۆن)ی ئەکرد. لە سـەربانی ئەم کۆشکەوە، یاخود ئەوانی ترەوە چاوئەندازی هەمـوو خانوو و باخـاتی (باخـەکـۆن) و دەشـتـی شـارەزوورت لێوە دیاربوو. چەند هەنگاوێک لە دەسـتـە ڕاسـتـی ئەم کۆشکەوە لە بن چەند دارێکدا، ئاوێک لە شاخەکەوە دەهاتە دەرەوە. ئەستێرکێکی خڕی جوان لەبەر دەمیا دروست کرابوو. بەچوار لای ئەم ئەستێرکەدا کەمەرەیەکی ڕێکوپێکی ئاوی تریش هەبوو. لەمەوە بەڕاست و بەچەپ و بەخـوارەوەدا بەجـۆگـەلەی زۆر ڕێکوپێکدا ئاو ئەڕۆیشـتـە ناو باخـەکـەوە. لە چوار لای ئەستێرکەکەوە کەڵەکێکی خنجیلانە یاخود (سـەکۆیەکی بەرد) هەبوو. ئەم ئەستێرکە دوو ماسی سـوور و ڕەش بۆری گەورە و چەند ماسییەکی وردی تری تیابوو.

ئەمانە هەمـوو نیشـانەی دڵتەڕی (شێخ حسامەدین) بوون. ئەمانە هی شێخ بوون. بەکۆڵی دەرویش و ڕەنجی شـانیـان دروسـتی کـردبوون. شێخ نەی ئەهێشت مەڕ و مـالات لە باخـەکۆندا ڕابگیرێ. ئەوەک شەقامەکە بەپاک و پوختەیی ئەمێنێتەوە.

ئەم باخاتە هەنجیر، هەنار، گوێز، شاتوو، زەیتوون و فـستـقیـان تیابوو. ترێ و تووشی زۆر بوو. ئەمە هەمووی هی شێخ بوو. هاوینان لێرە دائەنیشت.

پشت شاخـەکـە بەودیوەدا هی ئێـران بوو. ئەم خـانووانە سێ سـاڵێک لەمەوپێش کـرابوون. لەگـەڵ ئەوەیشدا ئەوەندە پاک و خاوێن ڕاگیرابوون. پیاو لە دوورەوە وای ئەزانی، هەمووی سێ، چوار مانگێکە دروست کرابوون. (باخـەکۆن) خۆشـتـرین و پێشـکەوتووترین و جوانـتـرینی دێیەکـانی هەورامـان بوو. بەڕاسـتی ئەو پاک و خاوێنی و دروسـتییەی لەوێدا دیمن لە شاری (سلێمانی)یش ئەم دیبوون.

## لەگەڵ ئەفراسیاب بەگدا

(شێخ محەمەد) هات پێی گوتین: «تکا ئەکەم ئەگەر حەز بەبینینی (ئەفراسیاب بەگ) ئەکەن فەرموون بیبینن، بەڵام بۆ کەسی مەگێڕنەوە». تومەز، ئەفراسیاب بەگ، ئەو ڕۆژە زانیبووی ئێمە دێینە (باخەکۆن). بۆ (شێخ محەمەد)ی نووسیبوو، کە ئیمشەو دێمە لات. وەکو (شێخ محەمەد)، خۆی ئەیگوت، ئەفراسیاب بەگ، بەسایەی پیاوەکانیەوە ئەزانێ من لە کوێم، ئەگەر بۆی هەڵکەوت، دێت، پێکەوە ڕائەبوێرین. لەگەڵ پێنج پیاویدا، بانگی شێوان لەسەر بانەکە وەستابوون. کە لە نوێژ بوومەوە، چووم ماندوو نەبوونیم کرد. پێم گوت: «بەندە زۆر سەربەرزم کە ئەم ئێوارەیە، بەکامی دڵی خۆم گەیشتم. بەسایەی (شێخ محەمەد)ەوە ئێوەم بینی. بەهەموو کوڵی دڵمەوە لە خوا ئەپاڕێمەوە کە لە پێناوی کوردایەتیدا سەرتان بخات». ئەویش بەگەرمێکەوە دەستی گوشیم بەڕوویەکی یەجگار خۆشەوە، پێی گوتم:

«سوپاستان ئەکەم. من شەرمەزاری پیاوەتی هەموو شاگردێکی سلێمانیم. ئەشێ هەموومان بۆ نیشتمان خۆما بکوژین. مردن بەئازادی خۆشترە لە ژینی نامەردی!».

(ئەفراسیاب بەگ) پیاوێکی چوارشانەی کەڵەگەت بوو. ئێسقان ئەستوورێکی گەنم ڕەنگی مرو خورمایی بوو. دوو چاوی گەش، دەنگێکی نەرمی دلێرانەی پێوەبوو. لە چرچی دەموچاو و دانیشتن و هەستانیەوە وا دیاربوو، کە پیاوێکی ئازا و سەربەرز و خاوەن کاری گەورەبوو. مشکی و جامانەیەکی سلێمانی پێچابوو، ڕانکوچۆغەیەکی ساکاری سپی، کەڵاشێکی نایابی هەورامان، چەند ڕیزێک فیشەک



خوالێخۆشبوو ئەفراسیاب بەگی ڕۆستەم سوڵتان

و خەنجەرێک و دەمانچەیەک و دووربینێک و کاتژمێر (سەعات)ێکی پێوەبوو. بەمانە و خۆیەوە، (ئەفراسیاب بەگ)، سامێکی بێ ئەندازەی پەیدا کردبوو.

من تۆزێک کوڕەکانیم ئەناسی. چونکە بەدڵمدا چووبوو، ئەمویست بیدوێنم. خۆم، وەک دۆستێکی کوڕەکانی پیشان دا. ئەویش زۆر سوپاسی کردم و گوتی: «پێیان بڵێ خەفەت نەخۆن. هەموو شتێکیان بۆ پەیدا ئەکەم. ئەوا قۆختەم بۆ کردوون!».

پاش نانخواردن پێم گوت: «خوا ئاگادارە هێندە لام پەسەندن، ئەگەر خوێندنم نەبوایە و بۆم بکرایە، دەستم ئەدایە تفەنگ و ئەهاتم و ئەبووم بەجەنگاوەرێک و لەگەڵ تۆدا خەباتم ئەکرد. بەڵام هەرچی فەرمانێکتان هەبێ لە شار، لە بەغدا، لە هەر کوێیەک بێ، بەسەر سەر بەجێی دێنم». دیسانەوە گەلێ سوپاسی کرد و گوتی: «من هەر سەرکەوتنی ئێوەم ئەوێ».

ئینجا پێم گوت: «هەرچەندە من ڕایەی ئەوەم ناکەوێ ئامۆژگاری یەکێکی وەکو ئێوە بکەم. بەڵام پیاو نابێ لە دوژمنی خۆی دڵنیابێ. ئیمڕۆ شەڕی ئاسووری لە ئاودایە. بۆیە لێت بووراون و، ئەیانەوێ ئاشتت بکەنەوە. تکا ئەکەم کوشتاری سەرکۆمارەکانی (شکاک) لە ئێراندا بهێنەرەوە پێش چاوی خۆت!».

ئەویش گوتی: «من خۆم چاکی تێ گەیشتووم. من لە پێناوی خاکەکەمدا بشکوژرێم پێم خۆشە. بەڵام ئاخ!. کاشکی هەر لەناو ئەم شاخانەدا بکوژرامایە!» کابرا هێندە پیاوی بەناو ئەم ناوچەیەدا بڵاو کردبووەوە هەموو هەواڵێکی ئەزانی. وتیان: «عەجەم بەدوانزە هەزار کەسەوە هەزار ماڵی جافی لە ئێراندا گل دابووەوە» (ئەفراسیاب بەگ)یش گوتی: «برا ئەمە فرە قوڕەڵە. بەخوا بۆ ئێمە سەد کەس بن و هەزار کەس بن وەک یەکە، هەتا خۆمان ئارەزوو نەکەین تەقە نابێ!».

ئیتر کوڕج دەستی گوشین و ڕۆیشت. پاشان (شێخ محەممەد) گوتی: «ئەمە ڕەوشتێتی. لە پڕ ئەڕوا، لە پێشەوە ئاڵێ ئەڕۆم. یان ناڕۆم». وەک (شێخ محەممەد) ئەیگوت:

«ئازایی ئەم پیاوە بەتەرحێکە، بەڕۆژ کە بۆی هەڵبکەوێ، ناترسێ بیگرن، لە باخەکانی ئێرەدا لەگەڵیاندا ئەنیشێ. زۆر جاری وا هەیە ئەچێتە (بیارە)، سەری لە ماڵ و منداڵەکەی خۆی ئەدا. لە کاتی پشێویدا کە هەوڵیان بۆ گرتنی ئەدا، چەند مانگێک، بەخۆ گۆڕینەوە، لەناو کەرکووک و چەمچەماڵ و سلێمانی و هەڵەبجەدا ڕایبواردووە، کەس پێی نەزانیوە.

«ئەفراسیبا بەگ لە لەشکری دوژمن بەولاوە، زیانی بۆ هیچ کوردێک نەبووە. بەڵام ئەوانەی دوژمنین، ئەگەر لە منە و هەڵەبجە و ئەم دێهاتانەیشدا بێ جەریمەیان ئەکات و کەتێنیشیان پێ ئەکات!؟.

هەموو ڕۆژێ بەئارەزووی خۆی چێشتی ڕەنگاوڕەنگی بۆ ئەکرێ. چونکە هەموو خواردەمەنییەک بەسایەی پیاوە بەکارەکانی خۆیەوە ئەتوانێ پەیدا بکات. هەروەها چێشتکەری تایبەتی خۆیشی هەیە، چێشتی بۆ لێ ئەنێ. ئەم وەکو (شێخ...) لادێیی ڕووت ناکاتەوە، پۆشتەیان ئەکاتەوە!.

ئێستا عەجەم بەخشیوەتی. عێراقیش چەند دێیەکی بۆ لاداوە کە بەدەست (ئەفراسیاب بەگ)ەوە بێت. داوای ئاشتبوونەوەیشی لێ ئەکات. بەڵام وەکو ئەڵێن: داوای (٣٠٠) تفەنگی پیاوەکانی لێ

ئەکات. منیش پێم گوتووە کە بە(عێراق) بڵێ پیاوەکانم نێرانین. هەریەکە بەلایەکدا چوونەوە. هەر خۆم هەمە و کەسی تر». لە کاتی ڕۆیندا پێم گوت: «کاشکی تا بەیانی لێرە بوویتایە. وێنەیەکم ئەگرتیت». گوتی: «سوپاستان ئەکەم. خۆت ئەیزانیت کە چۆنم نابێ گلەیی بکەیت!». کەچی وەک بیستمەوە هەر لە (باخەکۆن)دا مابووەوە. لە خانەقاکەیدا نوستبوو!؟.

## دوا قسە ١٩٣٣/٨/٢٥

ڕاستە ئەڵێن هەموو شتێ بەپێی خۆی. (هەڵەبجە) و (هەورامان)یش، بەئاو و بای سازگاریانەوە، بەچاوئەندازی جوانیانەوە، بەسێبەری بن داری گەورە گەورەی باخ و باخاتیانەوە، بەو کێوە بەرزە نەخشینە ڕەنگینانەیانەوە، دیارە ئەبێ پیاوی دڵتەڕ و، کیژ و لاوی بەفەڕ و، گەلێکی هێمن و دڵپاکی، پڕ لە لاوی خاوێن و چالاک و، پڕ لە دەولەمەند و تێگەیشتوو و پێگەیشتوویان تیا پەیدا بێ. ئێستایش ئاخ ئەخۆم ناوات ئەخوازم، کە جارێکی تریش لە بن کەڵە مێوەکانی (هانە ئەوتی)دا، لە تەلارەکەی (ئەحمەد بەگی پاشا)دا، لە سەربانی ئاشەکەی (بیارە)دا، لە گوێ سوڕک و ئەستێرکەکەی (باخەکۆن) و (تەوێڵە)دا دانیشم. لەم ناوچەیەدا بەبینینی پیاوانی بلیمەت و زیرەک و زرنگ و ئازا و مەرد بەختیار بووم. لەگەڵ زۆریاندا دۆستایەتییەکی تەواوم گرت. لە زۆریانەوە ڕۆشنبیریم دەستکەوت. ئێستەیش یادی هاودەمی (مەسعود) و خوێندەوار دۆستی (حەمە سەعید بەگ) و، زرنگی (شێخ حسامەدین) و زۆرزانی و قسە ئەستەقی و سەربەستی و زانایی (شێخ محەممەد) و ڕووخۆشی (شێخ عەلائەدین) و میواندارییە بەنرخەکانیان ئەکەم و بیریان لێ ئەکەمەوە. بەڵێ بەم گەشترگوزارە، چاوم گەشایەوە، لەشم بووژایەوە، سروت و ئارام کەوتنە دڵ و دەروونمەوە، هۆشیاربوومەوە. یاخوا هەر ئاوابێ خاکی دڵگیر و خاوەن پیاوان و پێشکەوتوو...

شاکر فەتاح
١٩٣٣/٨/٢٥

## کە بوومە کارگێڕی لادێ پێم خۆش بوو!

لە پاش دەرچوونم لە (زانستگای ماف) بەسێ مانگ، فەرمانڕەوایی، ڕووی لێ ناوم بیم بە(کارگێڕی لادێ - مدیری ناحیە)ی مزووری لە (ئەترووش)دا. لە پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ گەلێک دۆست و نیشتمانپەروەراندا، فەرمانەکەم پڕ بەدڵ پەسەند کرد. لە ١٩٣٦/١٠/١٤دا چوومە (ئەترووش)کە ئەوساکە سەر بەناحیە (قضا)ی (دهۆک) بوو، لە (لواء)ی (موصل)دا. جا بەمە تافی کوڕێنیم بڕایەوە.

# خەبتی ڕۆشنبیریم لە تافی کوڕێنیمدا[١]

لەم تافی کوڕێنییەمدا، خۆم بەزۆر کوردی خوێندەوار و نیشتمانپەروەر ناسی و دۆستایەتیم لەگەڵ گرتن. لەوانەوە گەلێک شێوەی ژیان و خوێندەواری فێر بووم. (زێوەر، فایەق بێکەس، حوسێن حوزنی موکریانی، ئەمین زەکی، تۆفیق وەهبی، ڕەفیق حیلمی، مەحموود جەوددت، شێخ محەممەدی خاڵ، ئەمین ڕەواندزی، ئیسماعیل شاوەیس) لەو پیاوە بەنرخانەن کە هەموو دەم سوپاسیان دەکەم و شانازی بەدۆستایەتییانەوە دەکەم. هەروەها لەم دەمەدا ڕۆژنامە و گۆڤار و نووسراوێکی کۆن و نوێی کوردی چاپکراو و چاپ نەکراو بێ و بەردەستم کەوتبێ خوێندوومنەتەوە. خۆ چاکەی باوکم هەرگیز لەبیر ناچێتەوە کە لەسەر خوێندەواری هەموو دەم پشتی دەگرتم و تیژی دەکردم و یاریدەی دەدام. هەرچییەکی هەبوو بمدایە بەنووسراوانی بەکەڵک دەنگی نەدەکرد. دایکم بەتەنگ ئەم شتانەوە نەبوو!...

جاروباری وتارم دەنارد بۆ ڕۆژنامەی (ژیانەوە)، (ژیان)، (ژین)[٢]، بۆ گۆڤاری (هاوار)[٣]، (ڕووناکی)[٤]، (دیاریی لاوان)، (یادگاری لاوان)[٥]. بەناوی (خانووی تازە)[٦] و (چیرۆک بۆ منداڵان)ەوە کە لە زمانی عەرەبییەوە گۆڕیبوومنە سەر زمانی کوردی، هەروەها بەناوی (فەرهەنگۆک)ەوە[٧] کە بەئینگلیزی و کوردی هۆنیبوومەوە، سێ نووسراویشم لە چاپ دا و بڵاو کردەوە. چیرۆکی (بەلقیس کچە شای سەبەء)م لە عەرەبییەوە گۆڕییە سەر کوردی. نووسراوی (هاوڕێی

(١) ئەوەی نووسەر لەم بەشەدا دەیگێڕێتەوە، بریتییە لە پوختەی ئەو چالاکی و هەوڵدانە دڵسۆزانەیەی کە لە یادنامەکانی ساڵی ١٩٣١ و ١٩٣٢ بەوردی و فراوانی باسیانی لێوە کردووە و لەمەوبەر خستمانەڕوو.

(٢) ژیانەوە، ژیان، ژین: هەر سێکیان لە سێ قۆناغی جیاوازدا لە سلێمانی دەرچوون و پیرەمێردی شاعیر (ژیان و ژین)ی بەڕێوە بردوون، لە نێوان ١٩٢٤-١٩/٦/١٩٥٠.

(٣) ئەوەی بەدرخانیان لە شام دەریانده کرد بەشێوەی کرمانجی ژوورروو، میر جەلادەت بەدرخان سەرنووسەری بوو. ژمارە یەکی لە ١٩٣٢ دەرچووە.

(٤) ڕووناکی: یەکەمین گۆڤاری کوردی شاری هەولێرە ٢٤/١٠/١٩٣٥ - ١٦/٥/١٩٣٦ بەڕێوەبەر پارێزەر شێت مستەفا و سەرنووسەر حوسێن حوزنی موکریانی بووە -بۆ زیاتر بڕوانە: د. کوردستان موکریانی- ڕووناکی، دەزگەی ئاراس- هەولێر ٢٠٠١.

(٥) دوو نامیلکە بوون لە ١٩٣٣ و ١٩٣٤ لە بەغدا دەرچوون، کۆمەڵێ وتار و نووسینی ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەیان گرتبووە خۆ، کۆمەڵەی لاوانی کورد لە بەغدا بڵاوی کردۆتەوە، مامۆستا شاکر فەتاح یەکێک بووە لەوانەی ئەو ئەرکەی کێشاوە، بۆ زیاتر بڕوانە: غەفوور میرزا کەریم: یادگاری لاوان و دیاری لاوان- کۆڕی زانیاری کورد ١٩٧٨ بەغدا.

(٦) زنجیرەی چیرۆک بۆ منداڵان -١- دانەر کامل گەیلانی ١٩٣٣ چاپخانەی ژیان. سلێمانی نامیلکەیەکی بچووکی ٩ × ١٤سم، لە چاپکراوە تایبەتە دەگمەنەکانی ئەدەبی منداڵانە بەکوردی.

(٧) قاموسچەیەکی ئینگلیزی کوردییە لە ١٩٣٤ لە چاپخانەی زاری کرمانجی لە ڕەواندز چاپ کراوە، پێشەکی و ڕوونکردنەوەیەکی پوختی لەگەڵدایە، نرخی (١٦) فلس بوو.

منداڵ)یشم[1] نووسی. نووسراوی (چیرۆک بۆ منداڵان)ەکە لە ساڵی ١٩٣٥دا کاربەدەستی زانیاری (وزارة المعارف)ی عێراق لێی کڕیم. بە(٣٥) سی و پێنج دینار. لەسەر ئەرکی خۆیشی لە چاپی دا. ئەمە یەکەم خوێندنەوەی کوردی بوو، لە عێراقدا، کە بەوێنە و ڕەنگاوڕەنگییەوە لە چاپ درابێ. ئەم بەرهەمە لەو کاتەدا، بەشتێکی ناوازە و نایاب لە قەڵەم درا[2]. (ئەمین زەکی) و (شێخ محەممەدی خاڵ) و (ئیسماعیل شاوەیس) و گەلێک لە مامۆستایان و خوێندەواران پەسندیان کرد و، دەستخۆشییان لێ کردم. بیرم لە نرخەکەی کە (٣٥) دیناربوو، دیاریم کڕی بۆ باوکم و دایکم و (٣) دیناریشم پێشکەشی دایکم کرد. ئەوەکەی تریشم دانا بۆ یارمەتی دایکم و باوکم لە بەخێوکردنی خۆمدا. دایکم بەمە دڵی زۆر کرایەوە، زۆر چاوی گەشایەوە باوکیشم زۆر پێی خۆش بوو. هەردووکیان بەدڵ پیرۆزباییان لێ کردم. بەڵام بەشی خۆیشم گرامەفۆنێکم لێ کڕی بەچەند قەوانێکی نایابەوە، بۆ یادگار. هەر هاوینە کە دەچووم بۆ شوێنێکی کوردستان بۆ (گەشتوگوزار). نووسراوێکم لەسەر دەنووسییەوە. بەوێنەیش دەمڕازاندەوە. لە ساڵی ١٩٢٨دا (گەشتی پیرەمەگروون)[3]، لە ساڵی ١٩٢٩دا (گەشتی شارباژێر)، لە ساڵی ١٩٣٠دا (گەشتی پێنجوێن)، لە ساڵی ١٩٣٢ (گەشتی سرۆچک)، لە ساڵی ١٩٣٣ (گەشتی هەڵەبجە و هەورامان)م نووسییەوە. بێجگە لەمانە لە ساڵانی (١٩٣٠ و ١٩٣١ و ١٩٣٢)دا بیرەوەری (مذکرات)م بەوێنەوە نووسییەوە کە پڕ بوون لەو کارەساتانەی بەکەڵکی (کوردایەتی) دێن، یاخود ژینی خۆم پیشان دەدەن، بەمەبەستی کەڵکی گشتی[4]. بێجگە لەمانە نووسراوی (ڕێگای بەرلیچ)م گۆڕی بە(کوردی) و (ئینگلیزی)[5]. هەروەها توانیم سەر بەگەلێک مزگەوت و ماڵە کورددا بکەم بۆ

(١) لە ١٩٤٨ لە چاپخانەی (معارف) لە بەغدا چاپ کرا، (خوێندنەوەیەکی نوێیە بۆ پێگەیاندنی منداڵانی کورد) کۆمەڵێ نووسین و وتاری هەمەچەشنەیە لەگەڵ گەلێ وێنەی ڕەنگاوڕەنگ.

(٢) بەداخەوە نە لە کتێبخانە تایبەتییەکەی مامۆستا خۆیدا و نە لەو شوێنانەی بەدوایدا گەڕام ئەم کتێبەم بەرچاو نەکەوت.

(٣) ئەم گەشتە لەناو دەستنووسەکانیدا نەبوو، هەروا چاپیشی نەکردووە وەک ئەوانی دی کە چاپی کردوون: (گەشتی سرۆچک ١٩٧٢، شارباژێر ١٩٧٢، گەشتی پێنجوێن ١٩٧٣، هەڵەبجە و هەورامان ١٩٧٣) چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی.

(٤) دەقی ئەو بیرەوەریانە لە دەستنووسەکانی خۆیدا، وەک خۆیان گواستمانەوە ناو ئەم (ئاوێنەی ژینم)ە. چەند لاپەڕەیەک لەمەوبەر، بەو ئیعتیبارەی ئەوانە تەواوکەرێکی گرنگ و بنەڕەتین و لە ژیانی مامۆستادا، بەڵام ئەوەی بوترێ ئەوەیە کە بیرەوەری ١٩٣٠ لەناو دەستنووسەکانیدا نەبوو.

(٥) لە دەستنووسە ئەسڵییەکەدا (ژمارە -١-) ئەم پەرەگرافەی خوارەوە دوای ئەمە دێ: «داخەکەم مامۆستا حوزنی موکریانی لە بریتی ئەمەی لە چاپی دا، لە ناوی برد!، کە لەسەر ئەو کردەوەیەی دڵم لێی شکا وە تاماوەیەکی دوور و درێژ نێوانمان چاک نەبووەوە!... دوایی ئاشتی کردمەوە و تۆڵەی بۆ کردمەوە و دڵخۆشی دامەوە». دیارە ئەمە دڵپاکی و لێبووردەیی و جوامێری (ئەهلی قەڵەم)ی ئەو ڕۆژگارە دەردەخات کە تا چ ڕادەیەک پەیوەندییەکانیان (ئەگەر بەدحاڵیبوونێکیشی لێ کردبێ) چۆتەوە دۆخە پتەو و بێگەردەکەی خۆی. ئەو (تۆڵە بۆ کردنەوەیەش) کە بەهەشتی حوزنی موکریانی بۆی کردۆتەوە: چاپکردنی (فەرهەنگۆک)ەکەی =

کۆکردنەوەی نووسراوانی چاپکراو و چاپ نەکراوی کوردی. سوپاس بۆ خودا تا ئەندازەیەکی گەورە بەئامانج گەیشتم. تەنانەت لە (بەغدا) و (شام)یشدا لەو نووسراوانەم پەیدا کرد. هەندێ جار دەمخواستن لەبەرم دەنووسینەوە. لەمانە هەمووی نووسراودانێکی بچکۆلانەی کوردیم بۆ خۆم پێکهێنا. تا لە دوارۆژدا بیانکەم بەبنچینە بۆ چاپەمەنی کوردی. کە کۆمەڵە هۆنراوەکانی (مستەفا بەگی کوردی) و (نالی) و (سالم) لەلایەن مامۆستایان (کوردی) و (مەریوانی)یەوە لە چاپ دران، خۆشبەختانە زۆربەیان لە نووسراودانەکەی منەوە وەرگرت. هەروەها یاریدەی کاک (فەتحوڵلا ئەسعەد) و مام (حوزنی)یشم دا. پەنجا چامەی (مستەفا بەگی کوردی)م بەدەستی خۆم نووسییەوە و ناردم بۆ (فەتحوڵلا)، بۆ ئەوەی لە چاپی بدات. سەد و پەنجا چامەیشم لە هی (نالی) و (کوردی) و (سالم) و (غەریق) و (حەریق) نارد بۆ (حوزنی) لە رۆژنامەی (ژیان) و گۆڤاری (زاری کرمانجی)دا بەرامبەر یارمەتییەکانم کاک (فەتحوڵلا) و مام (حوزنی) لە ساڵی ١٩٢٧دا سوپاس و ستایشیان کردم[١]. هەروەها (کوردی) و (مەریوانی)یش لە نووسراوەکانیاندا سوپاسیان کردم. هەر لەو رۆژەوە بیرم لەوە دەکردەوە: «کەی رۆژێک بێت و بتوانم رۆژنامە و گۆڤارێکی شایستەی کوردەواری دەربهێنم؟». گەلێک جار خەوم بەمانەوە دەبینی. چونکە ئەودەمە (کورد) چاپەمەنی یەجگار کەم بوو... دەمویست بەشێکی بچووکی ئەم کەم و کورییەمان پڕ بکەمەوە.

## شاگردە کوردەکانم کرد بەدۆست

که هاتمەوە (بەغدا)، نەشارەزا بووم لە هەموو هەڵسان و دانیشتنێکی ئەوێ، لە هەموو شێوەیەکی ژین و شارستانێتییان. زمانی عەرەبیشم نەدەزانی، مەگەر تاک و تەرایەک لە وشەکانی. لەبەر ئەوە بەگران لە عەرەبەکان هاودەمم بۆ دەدۆزرایەوە[٢].

= مامۆستا بوو لە ١٩٣٤دا. پیرەمێردی نەمر لە (ژیان)دا بەباڵابڕینێک بۆ ئەم بەرهەمە دەنووسێ و دەڵێ: «من راست و رەوان و بێ پەروا دەتوومە و ئەڵێم: هیچ میللەتێک بەتەقە و رەقە تەق و دەر، نابێ بەکەس، جەسارەت و فیداکاریش لە چەنبەری خوێندەواری و تێبینیدا نەبێ فیرۆیە، بێهودە، هەزار سواری زرەپۆش بینم و دە آثاری عیلمی، دە آثرەکەم لەلا پەسندترە، ئەخوازەلا یادگارێک کە ئێمە فێری ژیانی ئەورووپا بکات. »بڕوانە: ژیان، ژمارە ٣٩٩، ٨ی مایسی ١٨٣٤، ل ٤.

(١) گۆڤاری (زاری کرمانجی) نووسیویە: «لەبەر ئەوەی کە جناب شاکر فتاح قوتابی قوتابخانەی یەکەمین سلێمانی: ٦٠ غەزلی نالی و ٧٠ غەزلی سالم و چەند غەزلێکی حەریق و کوردی و غەریقی لەگەڵ کتێبێکی حساب لەئەسەری و کردەوەی خۆی بۆ ناردین کە چاپیکەین، زار کرمانجی تەشکراتی ئەو تازە پێگەیشتووانە بەجێ دێنێ». زاری کرمانجی، ژمارە (١١) ١٤ی ئەیلولی ١٩٢٧، ل ٢٠.

(٢) لە دەستنووسە ئەسڵییەکەمدا (ژمارە یەک) دوای ئەمە ئەم چەند دێڕەش هەیە: «بەڵام لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی چەند ساڵیدا بۆم دەرکەوت کە بۆ هاودەمی و دۆستایەتی، کوردەکان، بۆ من لە هەموو کەس باشتر دەرچوون».

بەڵام لەگەڵ شاگردە کوردەکاندا ئاسانتر دۆستایەتیم بۆ دەگیرا. لەبەر ئەوە و لەبەر هەستی ئاوارەیی، تێکڕا یەک بەیەک ناسیاوی و دۆستایەتیم لەگەڵ شاگردە کوردەکاندا گرت. جاروبار دەچوومە لایان و، لەگەڵیاندا گەشتوگوزار و هاتوچۆم دەکرد.

لەم ئاشنایەتی و دۆستایەتییە کامەرانییەکی یەجگار پیرۆز و بەرز دەکەوتە دڵمەوە. گەلێک جار کۆمەڵانی دیدەوانی و زانستی و یارمەتیمان دادەمەزراند. گەلێک جار دەیانکردم بەئەندامی دەستەی کارگێڕی (الهیئة الأداریة)، یاخود بە(ڕازنووس - سکرتێر)ی کۆمەڵەکە چ بەوە کە ماوەیان دەدام تێبکۆشم بۆ کەلکی گشتی، چ بەوە کە ئەوباوەڕەیان پێ دەکردم، دڵخۆش دەبووم و سەرم بەرز دەبووەوە. ئێستایش ئەو برا خۆشەویستانە جێگەیان ماوە لە دڵمدا و، لە جاران زۆرتر ڕێزیان لێ دەگرم. بیرمە بەهۆی ئەم کۆڵانەوە دوو کۆڤارمان بەناوی (دیاریی لاوان) و (یادگاری لاوان)موە لە ساڵەکانی ١٩٣٣ و ١٩٣٤دا لە چاپ دا[1].

لە ساڵی ١٩٣٦دا دووکانێکمان بۆ دوو شاگردی هەژاری (ڕەواندزی) و (کۆیی) کردەوە، بۆ ئەمەی بژین، تا هەڵێکیان دەست دەکەوێت بۆ خوێندن یاخود بۆ فەرمانبەری. بەهۆی ئەو دووکانەوە سەربەرزی زۆربەی شاگردە کوردەکانمان پاراست. چونکە خاوەنی ئەو چێشتخانەیەی شاگردە کوردەکان نانیان لێ دەخوارد، کابرایەکی (ئەرمەنی) بوو، لەم دواییەدا بایی بووبوو لە خۆی، وای لێ هاتبوو، دڵی دەشکاندن، نازی نەدەکێشان، ڕێزی لێ نەگرتن!. بێجگە لەوە، هەر داماو و هەژارێکی (کورد)مان بدیایە دەستمان دەگرت، بۆ ئەوەی لە کەس دەست پان نەکاتەوە و، بەناوچەوان بەرزییەوە بگەڕێتەوە بۆ (کوردستان).

هەروەها بیرمە (کۆمەڵی دیدەوانی)یەکەمان کە لە ساڵی ١٩٣١دا داممان مەزراندبوو، هەموو هەفتەیەکی هاوین، ڕۆژێکی تەرخان کردبوو، بۆ خۆ ڕاهێنان بەسەختی ژیانەوە. ڕامان دەکرد بەناو دڕک و داڵدا. سەردەکەوتین بەپێ بەسەر شاخ و داخدا. سواریمان دەکرد. مەلەمان دەکرد. نیشانمان دەنایەوە.

(١) ئەم کۆمەڵەیە لە بەهاری ١٩٢٦ لە سلێمانی لەلایەن دەستەیەک لە ڕۆشنبیران و دڵسۆزانی شارەکەوە دامەزرێنرا، دوای ئەوەی لەلایەن وەزارەتی (داخلیە)ی عێراقەوە لە ٢٤ی شوباتی ١٩٢٦دا بەڕەسمی ڕێگای پێ درا. یەکەم سەرۆکی کۆمەڵە (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ)ی مرتەسەریف بوو. کۆمەڵە هەوڵی دەدا بۆ بووژاندنەوەی کەلتوور و فەرهەنگی کوردی و نەهێشتنی نەخوێندەواری، بۆ ئەمەش گەلێ شێواز و ڕێگای جیاجیای دەگرت و بەڵام (بەهیچ سوورەتێک لەگەڵ سیاسەتدا خەریک نابێ).
کار و چالاکییەکانی کۆمەڵە و بەپێی باری سیاسی لە هەڵکشان و داکشاندابوو، بەتایبەت دوای ڕاپەڕینی ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠ کە بە(هەرای بەردەرکی سەرا) ناسرا: حکوومەت کۆمەڵەی بەوە تاوانبار کرد کە دەستی تێدا هەبوو، کاروبار و چالاکی بەتەواوی کزبوو، دوایی لە ڕووی دارایی و چالاکییەکانی ترەوە کۆمەڵە لە پەلوپۆ کەوت و حکوومەت دەیویست بەیەکجاری نەیهێڵێ و بۆ سەرەنجام مایەوە سەر قوتابخانەیەکی ئێواران و ئەویش بەڕێوەبردن و کاروباری بەرەو ڕووی (معارف) کرایەوە. بۆ زیاتر بڕوانە: غەفووری میرزا کەریم، کۆمەڵی زانستی لە سلێمانی، چاپخانەی (دار الجاحظ) ١٩٨٥، بەغدا.

خۆمان دەدایە بەر گەرما و هەتاو. یارییەی هەژارانمان دەدا بەفەرمان و بەپارە. یادنامەی کردەوەکانیشمان ڕۆژ بەڕۆژ دەنووسییەوە. ئێستایش خۆشی سەیرانەکان و ئاهەنگەکان و گەشتوگوزارەکانی ئەو برایانەم لە دڵدایە و، هەموو دەم بەشانازییەوە یادیان دەکەم. بەهۆی ئەم گیانەوە بوو کە توانیم لە (تافی کوڕێتیمدا)، زۆربەی شارەکانی (کوردستانی عێراق) و هاوینە هەوارە خۆشەکانی ببینم و لە ئاوات و ئازاری (کوردەواری) تێبگەم. تەنانەت لە (شام) و (بێروت)یشدا هەندێ کوردم دۆزییەوە، ئاشنایەتیم لەگەڵ پەیداکردن بۆ کەلکی گشتی.

## سوروشتیش پەزیشکێکە بۆ خۆی!

تا لە (بەغدا)بووم شپرزەی دەستی نەخۆشی و کزی و لاوازی بووم، هەستم بەناوارەیی و ئاشێتی خۆم دەکرد. نەمدەزانی یاخود نەمدەتوانی لەنگەرێک بگرم لەناوەند (ماندووبوون) و (سرەوت)دا. لە ناوەند (ناخۆشی) و (خۆشی)دا. لەناوەند (فەرمان) و (یاری) و (بەزم) و (ڕەزم)دا. تا سێ ساڵیش بەدوای داوودەرمان و پزیشکدا دەگەڕام. ترسم پەیدا کردبوو لە خواردن. زۆر کاتم بەخەم و خەفەت و گێژ و وێژییەوە ڕادەبوارد. لەناو خوێندنگادا، تەنانەت لە دوای هاتنەوەیش بۆ ماڵەوە، خۆم بەتەنیا لەناو چۆڵ و بیابانێکدا دەبینی! زۆر خەفەتم لەوە دەخوارد، کە نەمدەتوانی وەک هاوڕێکانی تر دۆستایەتی بگرم و بێمەوە ناو ئاوانەوە! چڕچاو و بەژن و باڵا و هێز و توانایشم ئەوەیان لێ نەدەوەشایەوە، کە دۆست پەیدا بکەم!... دیارە ئەم قسانەم دەربارەی بێگانەکانە نەک دەربارەی (کوردەکان). کە شاگردەکان باسی دۆستایەتی و دڵداریی خۆیان لەگەڵ ئەم کچ و ئەو کچدا دەکرد، من سەرم سوڕ دەما! هەناسەی ساردم هەڵدەکێشا! بەخۆمدا ڕانەدەپەرموو شتی وام لە دەست بێت! بەجگار شەرمن بووم لە ئاستی ئافرەتدا. کەچی گرفتاری هەموو جوانییەکیش بووم! هەرچەندە وام بەباشتر دەزانی کە بەتەنگ خوێندنەکەم و ناوبانگەکەمەوە بم، بۆ ئەوەی بەسەرفرازییەوە خوێندەواری تەواو بکەم، بەڵام لەژێرەوە کپە لە جگەرمەوە دەهات کە بێ بەش بووم لەو ڕابواردنە خۆشانە! هەستیشم دەکرد، کە ئەو جۆرە دڵدارییانە، داخەکەم، لە توانای مندا نییە!؟ لەم کاتەدا کارەساتێکی بچووک ڕووی دا[1]. هەموو بیروباوەڕێکمی گۆڕی بەرامبەر بە(پزیشک) و (داوودەرمان). گۆڤارێکی (مصر)یم دی، ناوی (الریاضة البدنیة - وەرزش) بوو. تەرخان کرابوو بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی و پاراستنی تەندروستی. تێیدا بڵاوکرابووەوە کە: «پەیمانگای وەرزش (معهد الریاضة البدنیة) بەنامەکاری، هەموو جۆرە نەخۆشییەک چاک دەکاتەوە بەبێ دەرمان!»، ئامۆژگارییەکانیم هەفتە بەهەفتە بۆ دەهات. دەستم کرد بەپێڕەوی کردنیان: لە وەرزش و، خۆشتن و، خۆسوونەوە و، نوستن و خواردن و، سرەوت و، خۆدانە بەر ڕۆژ و، ڕابواردندا... تا دەهاتم بەرەو چاکی دەڕۆیشتم. بگرە هەر لە یەکەم هەفتەوە هەستم بەئازادی کرد و، ڕزگاربووم لە دەست (پزیشک) و (داوودەرمان)!... نەخۆشییەکەم بەرە بەرە کزبوو، نەما. وردە وردە هەستم بەکامەرانی و هێز

(١) لە ڕاستیدا ئەم دەروودی کە لە مامۆستاکرایەوە و بۆی ڕەخسا، بە(کارەسات) ناونابرێ، چونکە هەلێک بوو سوودی لێ وەرگرت و باری دەروونی و تەندروستی پێ چاک کرد.

و هەڕەت و تەندروستی کرد. ترسم نەما لە ژین. پڕ بەدڵ حەزم لە ژیان دەکرد! کە گەیشتمە زستانی ساڵی ١٩٣٢ لە «لوبنان»دا، (شاکر فەتاح)ێکی کە بووە! نە باکی سەرمام هەبوو، نە ئاشنایەتیم لەگەڵ پاڵتۆ و بەرگ و پۆشەنی گراندا بوو. نەترس و لەرز لە دڵمدا مابوو! هاتمە ناو ژیانەوە. هاوڕێم دۆزییەوە. لەناو شاگردەکاندا کە لە هەموو جۆرە ڕەگەز و ئایین و زمانێکیان تێدا بوو گەلێک دۆست و هاودەمم پێکەوەنا و، تێکڕا لەگەڵ هەموویاندا لە گەرمە و پێکەنین و بەزم و ڕەزمدا بووم. تا ئەندازەیەکی زۆریش شەرمم لە ئافرەت کەم بووەوە و، حەزم بەتێکەڵییان دەکرد. کە تەماشام کرد: «دەست بەپەڕ و باڵی خۆمدا دەهێنم!»، بەدوای جلوبەرگی جواندا دەگەڕێم، لەبەری بکەم... خۆ فێری ساز و ئاواز و گۆرانی گوتن و قسەی ئەستەق و گەمەوگەپ دەکەم... دەمەوێ خۆشەویستی بخەمە دڵی هاوڕێ و مامۆستاکانەوە. دەمەویست بژیم و لە ژیانیشدا زۆر بەخۆشی و بڵندییەوە ڕایبوێرم.

پێویستە ئەمەیش بڵێم: کە ئاو و با سازگارەکەی لوبنان و دیمەنە جوانەکانی و پێشکەوتوویی دانیشتووەکانی، بۆ بڵندکردنەوەی بارستایی کامەرانی و سەربەرزی و تەندروستی من لە وەرزش و ئامۆژگارییەکانی «پەیانگەی وەرزش»ەکە کەمتر نەبوون. ئەوساکە تێگەیشتم کە (سرووشت)یش پزیشکێکە بۆ خۆی. ئەگەر پیاو لەسەر دەستووری ئەو ڕۆیی لە: خواردن و ڕابواردندا، لە نوستن و فەرمان و هەڵسان و دانیشتن و سەرەوتدا، ئەوا تەندروست دەبێ. ئەگەر لەسەر دەستووری سرووشت نەڕۆیشت بەڕێوە، ئەوا نەخۆش دەکەوێ. ئەوساکە تێگەیشتم کە زۆربەی دەرمان ژەهرن!... ئەوەندەی باشن بۆ لەش، ئەوەندەیش زیانی پێ دەگەیێنن. هەروەها لە فرۆفێڵ و جانبازی زۆربەی پزیشکەکانی جیهانیش تێگەیشتم کە هاوبەشن لەگەڵ دەرمان فرۆشەکاندا، بۆ کەلکی ناپوختەی خۆیان. ئیتر لەوساوە هۆگری (سرووشت) بووم و، بووم بەهاودەمی: (وەرزش) و (بای پاک) و (ئاوی سازگار) و (تیشکی ڕۆژ) و (چاوئەندازی جوان) و (خۆرشتی سروشتی و ساکار) و(گۆرانی) و (ساز و ئاواز) و (بەزم و ڕەزم) و (گەشتوگوزار) و (دەروونی خاوێن) و(دڵی چاک) و (زمانی شیرین) و (کردەوەی پیاوانە)... بۆ ئەمەی خۆم بپارێزم لە نەخۆشی و، هەموو دەم هەست بە(تەندروستی) و (کامەرانی) و (سەربڵندی) و (خۆش گوزەرانی) بکەم لە ژیاندا.

بەڕاستی ئەم ساڵەی لە فەلەستین و لوبناندا ڕامبوارد، لەگەڵ ساڵێکی تریش کە لە پاش گەڕانەوەم لە عێراقدا ڕامبوارد، بەژین دادەنێم. چونکە تەنیا ئەو دوو سێ ساڵە بوو کە تەندروستییەکی تەواوم هەبوو و، خۆشیم لە ژیان دەبینی. داخەکەم لەوە پاش بەهۆی زۆرداری ڕۆژگارەوە، کزی و لاوازی و نەخۆشم تووش بووەوە. تا لە زانستگای ساف نەبوومەوە، تەندروستیم بۆ نەگەڕایەوە. ئەرکی زۆر و دڵی شکاو، کە لە زۆرداری فەرمانڕەوایی و پاشکەوتوویی کۆمەڵایەتییەوە، تووشم هاتبوون، بوون بەهۆی ئەوەی ئەو سێ ساڵەی دوایی کە لە زانستگای سافدابووم، بەئازار و هاوارەوە ڕابوێرە!. کە خوێندنی ناو (ئەورووپا)یان لە دەست دام، خەووم دایە خوێندنەوەی باش و گرنگ و خۆش. هەروەها خۆم ناسی بەهەندێک خوێندەوار و نیشتمانپەروەرانی (کورد) و (عەرەب) بەهۆی ئەو دوو شتەوە توانیم بارستایی خوێندەواری و تێگەیشتنم بەرز بکەمەوە و، تۆڵەی ئەو (زیان)ە بکەمەوە کە لە نەچوون بۆ (ئەورووپا)وە

لێم کەوتبوو. لە ساڵی ١٩٣٣دا، «کۆمەڵی زانستی کوردان»[1] لە (سلێمانی) منیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببمە (کارگێڕی خوێندنگای زانستی)». مووچەیشیان بۆ بڕیەوە. بەسوپاسەوە ئەم فەرمانەم گرتە ئەستۆی خۆم. بەڵام لەبەر کەڵکی کۆمەڵەکە و نازگرتنیان مووچەکەم لێ وەرنەگرتن، گێڕامەوە بۆ خۆیان. بەیارمەتی چەند هاوڕێیەکەوە، (خوێندنگای زانستی) بووژایەوە و، پەرەی سەند و، کەوتەوە بزووتنەوە و، سەرپشی بڵندبووەوە. خوێندنەکانیان سووک و ئاسان کران. بەڵام وەرزش و گۆرانی و، وتار خوێندنەوە و، گفتوگۆی سەربەست و، پیشەسازی و، بڵاوکردنەوەی (گیانی کوردایەتی) و، ڕێکوپێکی، خرانە خوێندنگاکەوە. من هەرچەندە لەوەپێشیش، هەموو ساڵێک لە هاویندا، یارمەتی ئەم کۆمەڵەم دابوو، بەڵام بەم فەرمانە تازەیە» کە بەجۆرێکی فراوانتر و گرنگتر ڕێی دەدام بەکەڵکی نیشتمانەکەم بێم، یەجگار دڵم خۆش بوو، یەجگار سەرم بەرز بووەوە. ئەو کاتە تازە دەرچووبووم لە (مەتریکولێشن).
بەهۆی ئەمانە و چەند هاوڕێیەکی خۆشەویستی ترەوە، کە لە ساڵی ١٩٣٦دا دەستم کەوتن، گیانم بووژایەوە، دووبارە تورووسکەی کامەرانی تێ کەوتەوە. کە لە زانستگای ماف دەرچووم، لە زمانی (فەرەنسی)دا، کە تاقیکردنەوەیەکی جوتی بۆ دانرابوو، بەیەکەم دەرچووم. ژمارەی شاگردەکان (٦٥) کەس بوو. لە ژیانی خوێندەواریمدا گەلێک جار لە تاقیکردنەوەدا بەیەکەم دەرچووم. بەڵام هیچ جارێک پاداشیان نەدابوومێ، ئەم جارە نەبێ کە بریتی بوو لە بەشی دەستێک جل لە قوماشێکی (مصر)ی و، دوانزە جووت گۆرەوی ئاوریشم. لەگەڵ سوپاسێکی گەرمی «دکتۆر عەبدولڕەزاق ئەلسنهوری» گەورەی زانستگاکەمان. ئەم پاداشە یەجگار کامەرانی کردم. یەجگار سەری بەرز کردمەوە.

دەمودەست (ڕێدانی پارێزەریی - إجازة المحاماة»م وەرگرت[2]. بەڵام ئەو هاوینە» بەگەشتوگوزار ڕابوارد. سێ چوار مانگی پێ نەچوو، لەسەر خواستی (موتەسەریفی موسڵ)، (عومەر نەزمی بەگ) کرام بە(کارگێڕی لادێی مزووری).

ئیتر لێرەوە لاپەڕەی تاڵی کوڕێتیم دادرایەوە.

(١) لە ڕاستیدا ئەو دوو بەخشنامەیە هیچ سیفەتێک گۆڤاریان پێوە نەبوو، بەڵکو کۆمەڵێ وتاری هەمەڕەنگە و چیرۆک بوون لەلایەن چەند نووسەرێکی جیاجیاوە و پێکەوە لە بەرگێکدا بەدوو ناوی جیاوازەوە چاپ و بڵاویان کردبووەوە. ئەو بابەتانە نرخ و بەهای وێژەیی ئەو کاتەی خۆیان هەیە، بەڵام بەهەڵە ناوی (گۆڤار)ی لێ دەنرێ.
(٢) ئەو کاتە خوێندن لە کۆلیجی حقوقی بەغدا سێ ساڵ بووە.

## ڕانیە بۆ من بووبووە خوێندنگەیەک!

لە ڕانیـەدا کز و لاواز بووم. هۆشم پەرێشـان بووبوو بەدەست ئەو زۆرداریـیانەوە کە لەلایەن هەندێک فەرمانبەری خراپ و هەندێک سـەرەک هۆزی خراپەوە لێم کرابوون. زۆر جاری وا هەبوو دڵم تەنگ دەبوو، بەهۆی کارەسـاتی ناسـازی ناوچەکە و، کزیی فەرمانڕەوایی و، فڕوفێڵ و تەڵەکەبازیی دوژمـانی گەلەوە. لەگـەڵ ئەمـەیشـدا، لە دڵمـدا، هەسـتم بەکامـەرانییـەکی قـووڵ دەکـرد. چونکە لە زۆربەی بەرەنگاریی کردنەکاندا بەسـەر دوژمنانی نەتەوە و نیشـتمانەکەمدا سـەر دەکەوتم. ناوچەکەیشم لە زۆربەی گێروگرفت ڕزگار کرد. ناوچەکە هەنگاو بەهەنگاو بەرەو چاکی دەڕۆیشت.

خـۆشـەویسـتی ناوەند من و گـەل بووبووە چرایەکی پرشنگدار دڵمی ڕووناک دەکـردەوە. لەبەر ئەوە دواکەوتنی خۆم و زیانی خۆم بەلاوە گرنگ نەبوو! لە هەڵەکانی خۆیشمەوە، زۆر پەندم وەرگرت! بەڕاسـتی (ڕانیـە)، خوێندنگایەکی سـەخت و بەکەلک بوو بۆ من! لە ئازار و زیان و تەنگ و چەڵەمەکانیـەوە کە تووشیان دەبووم، پەندێکی باشم وەردەگرت. گەلێک ڕەوشت و خوویشمی ڕاست کردەوە!.

لە ڕانیـەدا کـە دەسـتم بپـەرژایە، دڵی خـۆم بەخـوێندنەوە و نووسـین خـۆش دەکـرد وتارێکم لە بابەت (ئافرەتی کورد)ەوە نووسی بەعەرەبی، لە گۆڤاری (الثقافة الحديثة)دا، لە بەغدادا بلاو کرایەوە. لە پاش چەند سـاڵێک لە خاوەنی گۆڤارەکەوە زانیم کە «دوکتۆر تەها حوسێن»ی نووسـەری بەناوبانگی (میـسـر)،

=موریدەکانیـدا گیرایانەوە، چوو لە گوندی کەلکەسـمـاقی خوار دوکانەوە دانیشت. کەلکەسـمـاق سـەر بەناحیەی میرزا ڕۆستەم بوو (کە ئێستـا لەژێر ئاوی دوکاندایە) دیسان گیرایەوە و نێرایەوە عەمارە، موریدانی ماڵ و سـامانیـان فرۆشت و بەرەو کەرکووک بەڕێ کەوتن. ماوەیە لە گزێـتەپە دوایی بۆ شوان و ئینجا کەرکووک، تا پاییز ئاوا مانەوە، حکوومەت ناچار لەگەڵیاندا ڕێککەوت، مامە ڕەزا هێنرایەوە سلێمانی و نێررایە هەڵەبجە، لەوێشەوە بۆ بیارە. گیراوانی تریش چوونەوە گوندەکانی خۆیان لە (ئیللەللا) کە گوندێکە وا لە ناوچەی کۆیە وە (گەڵنێری) کە سەر بەمیرزا ڕۆستەم بوو. لە ١٩٤٩ حکوومەت ڕێگایدا بەمامە ڕەزا کە بگەڕێتەوە کەلکەسـمـاق، لە ١٩٥٢ بۆ یەکەم جار ڕێی درا گەشتێک بەناو موریدانیدا بکات لە ناوچەی سوورداش، لە ١٩٥٣/٦/٣٠ کتوپڕ تووشی ئیفلیجی دەبێ و تا لە ١٩٦١/٢/٢٥ لە سلێمانی کۆچی دوایی دەکات، پاش ئەو (کاکە حەمەی کوڕی) جێی گرتەوە. ئەم کورتە چڕکراوەم لە کتێبەکەی کاک مستەفا عەسکەرییەوە وەرگرتووە، بەلامەوە ئەم کتێبە ڕاستترین و باشترین باسێکە لەسەر بزووتنەوەکە، ئەگەر هەندێ لەو پەراوێزانەی لێبوەکەین کە بۆ هەر مەبەستێ بێ نازانم کاکە مستەفا بۆ ناولخنی باسەکانی کردوون. بزووتنەوەکە جێگای سەرنجی بیانیانیش بووە، (سی. جی. ئەدمۆندز) یەک دو جار سەردانی شێخی کردووە لە شەدەڵە و لە (کورد و تورک و عەرەب)دکەیدا لێی دەدوێ. هەروا هەندێ لێکدانەوەی تریش بۆ ئەمانە هەیە کە بەڕای من (هەقە) زۆر دوورە لەو (ئەفکار)انەوە، بیروبۆچوون و پراکتیزەیان گشتی هەڵقوڵاوی ناخی ئەو کۆمەڵە کوردەوارییە هەژارە بووە بەهیوای باشترکردنی گوزەرانیان. جا ڕژێم و حکوومەتان کە لە هەموو (خشـپـەیەک) سڵەمیونەتەوە، بۆیە ئاوا ئەوانیش تووشی چەوسـاندنەوە و دەردەسـەری بوون. (بۆ زیاتر: مستەفای عەسکەری: بزووتنەوەی هەقە -چاپخانەی علاء، بەغدا ١٩٨٣).

له گۆڤارەکەیدا (الکتاب) چەند دێڕێکی باشی لەسەر نووسیبوو. من ئەوەم زۆر پێ خۆش بوو. تیژیشی کردمە سەر لێکۆڵینەوەیەکی فراوانتر لە بابەت (ئافرەتی کورد)ەوە. ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٥٨دا نووسراوێکم لە بابەت (ئافرەتی کورد)ەوە بەزمانی کوردی لە چاپ دا و بڵاوکردەوە، کە لە پاشدا لەلایەن گەلێک ڕۆشنبیرانی کوردەوە پەسەند کرا.

## چەمچەماڵ

لە بەهاری ١٩٤٦دا لەسەر خواستی خۆم گوێزرامەوە چەمچەماڵ. دەمویست: لە شوێنێکی بێدەنگ و سەنگ و کەم گەڕ و گێچەڵدا چەند مانگێک پشوو بدەم و بحەسێمەوە. بنکەی ناوچەکە (چەمچەماڵ)، خۆی نزیکەی (٥٠٠) پێنج سەد ماڵێک دەبوو. دانیشتووانی هەموو ناوچەکە، کە بریتی بوو لە سێ لادێ، (٣٠،٠٠٠) کەسێک دەبوون. هۆزەکان: (هەمەوەند، قەڵاسێوکە، جاف) و هەندێک (تاڵەبانی) بوون. وەک لە باوکم بیستبوو، باپیرە گەورەم لە تیرەی (سێتە بەسەر)ی سەر بە(هەمەوەند) بووە. لەبەر ئەوە هۆزی هەمەوەندەکە هاتنی منیان زۆر پێ خۆش بوو.

منیش بەو خۆشەویستییەی ئەوان دڵم دەگەشایەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا بەپێویستم دەزانی لایەنگیری هیچ لایەک نەکەم. هەموو لایەک لە کاتی کار و فەرمان بینیندا بەیەک چاو تەماشا بکەم، تا ئەو هۆزانە هیچ لایەکیان دڵیان لە خۆیان نەمێنێ و، ئاژاوە و دووبەرەکییان تێ نەکەوێ. بەڵکو بەپێچەوانەوە بەرەو برایەتی و دۆستایەتی و یەکێتییان بەم، بەو ناوەوە کە هەموویان کوردن و ڕۆڵەی خاک و ناوێکن. جێی داخە کە ڕۆژگار نەیهێشت زۆر لە ناوچەی چەمچەماڵدا بمێنمەوە، ناوچەکە زۆر پاشکەوتوو بوو، ناحەزانیشی زۆر بوون. لەبەر ئەوە دەمویست زۆری تێدا بمێنمەوە، تا بتوانم زۆرتر بەکەڵکی بێم. هەر نزیکەی چوار مانگێک مامەوە. ئیتر گوێزرایانمەوە بۆ هەڵەبجە. بەڵام لەو ماوەیەدا توانیم: (خوێندنگایەکی شەوی) بکەمەوە، (لاسایی کردنەوە - تمثیل) بەزمانی کوردی و، (گۆرانی کوردی) ببووژێنمەوە. بە(ڕۆژنامەی چەمچەماڵ)یش، کە فریاکەوتم هەر حەوت ژمارەی لێ دەربهێنم، تا ئەندازەیەک دانیشتووانی ناوچەکە وریا بکەمەوە.

هەروەها کۆبوونەوەیان پێ بکەم و، وتاریان بۆ بدەم و، تیژیان بکەمە سەر دادپەرستی و، کاردروستی و، پاراستنی مافی خۆیان. هەروەها کوتاڵ و شەکر و چایەکەیان لە دەست فرۆفێڵی بازرگانە جامبازەکان و فەرمانبەرە خراپەکانی ئەو سەردەمە بە(دەستدە - تموین) ئەو بابەتانەیان دابەش دەکرد، ڕزگار بکەم و، بەتەواوی و چاکی بەشی خۆیان دەست بخەم. بێجگە لەمانە توانیم: (زمانی کوردی) بخەمەوە ناو سکاڵا نووسین و نامەکارییەوە. لێرەوە تێکچووم لەگەڵ کاربەدەستانی (کەرکووک)دا. چونکە ئەو دەمە (ناوچەی چەمچەماڵ) سەر بە(خاکی کەرکووک) بوو[1] (شێخ مەحموودی مەزن) خەریک بوو لەگەڵ

(١) چەمچەماڵ تا ساڵی ١٩٣٦ قەزایەک بوو سەر بەلیوای سلێمانی، دوای ئەمە خرایە سەر کەرکووک، وەک سەرنج دەدرێ زۆربەی قائیقام و پیاوانی ئیداری ئەو قەزایە خەڵکی سلێمانی بوون.

(هەمەوەندەکان)دا تێک بچن. زۆر هەوڵم دا نەهێڵم تێک بچن، سەری نەگرت. ئاژاوەیەکیش کەوتە ناوەند دەستەی (شێخ عەبدوڵڵای گۆیتەپە) و دەستەی (سەید ئەحمەد خانەقا)وە، لەسەر ناوی دێی (عەسکەر). باش بوو زوو کوژێنرایەوە. بێجگە لەمانە گەلێک کار و فەرمانی تریش کە بەیارمەتی خەڵکە باشەکەی چەمچەماڵەوە پێکهێنران، لەگەڵ گەلێک ڕووداو و کارەساتدا، کە لەو ماوەیەدا قەومان، لەلاپەڕەکانی (ڕۆژنامەی چەمچەماڵ)دا دەنووسران و بلاو دەکرانەوە[1].

ڕۆژنامەکە بووبووە پاڵپشتێک بۆ خوێندنگا شەوییەکەمان. هەفتەی یەک دانەی لێ دەردەچوو. بەدەستیش دەنووسرایەوە. لەم کاتەدا لەسەر خواستی موتەسەریفی ئەوسای سلێمانی مامۆستا (حەسەن تاڵەبانی)[2] کە دەیناسیم، گوێزرامەوە «هەڵەبجە»، کە زۆر بەمەترسییەوە پەسەندم کرد.



(١) ئەو ڕۆژنامە دەستنووسە لە ١٩٨٣دا چاپ کرا بەپێشەکییەکی مامۆستاوە (شاکر فەتاح، کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٣).

(٢) لە دوای (موسا شاکر) کە لە ١٩٤٦/٥/١٨وە موتەسەریف بوو (حەسەن تاڵەبانی) لە ١٩٤٦/٨/١١وە کرا بەموتەسەریف لە سلێمانی هەتا ١٩٤٨/١/١٧.

ژماره: (١)
رۆژی : ١٩٤٦/٧/١

## سەرەتا

برا خۆشەویستەکان، دانیشتووانی ناوچەی چەمچەماڵ!

لە دوای داواکردنی خۆشگوزەرانی و پێشکەوتنتان لە خودای گەورەی بێ هاوتا، بۆ پێگەیاندن و پێشخستنی ئێوە و، تێگەیاندنتان لە خۆتان و لە جیهان، ئەوا ئەم رۆژنامەیە، (چەمچەماڵ)تان هەموو حەفتەیەک رۆژێ، دووشەموان، بۆ دەردەهێنین و، حەفتەی جارێکیش لەلایەن مامۆستاکانی (خوێندنگای شەوی)یەوە بۆتان دەخوێندرێتەوە. لە لادێی خورماڵدا، لە ساڵی ١٩٤٠دا (رۆژنامەی خورماڵ)، لەلادێی (قادرکەرەم)دا، لە ساڵی ١٩٤٢دا رۆژنامەی (باسەرە)م، بۆ پێگەیاندنی لادێییەکانی ئەو دوو لادێیە دەرهێنا، گەلێک کەڵکی پێ بەخشین و زۆریش وریای کردنەوە و پێشی خستن. جا هیوادارم، بەیارمەتیی خودا و کۆششی خۆتانەوە، ئەم رۆژنامەیەیش کە ناومان ناوە (چەمچەماڵ) ببێتە پێشەوا و رێپیشاندەرتان بۆ پێشکەوتن و دەرکەوتن و سەرکەوتنتان لە ژیانتاندا. ئیتر پشت بەخودا بێ و، هونەرمەندیشی لە ئێوەوە، براکانم.

شاکر فەتتاح
«جێنوشین (قائیمقام)ی ناوچەی چەمچەماڵ»
١٩٤٦/٧/١

## ئامۆژگاری

هەروەک لە رۆژی یەکەمی هاتنمدا بۆ چەمچەماڵ، واتا لە ١٩٤٦/٤/٢٨دا پێم گوتن، دووبارە ئەم ئامۆژگاریيانەتان دەکەمەوە، تکایە پێڕەوی بکەن:

١- بۆ کاروباری فەرمانڕەوایی تەنیا لە فەرمانگە (دائرە)کاندا فەرمانبەر ببینن. نابێ بۆ کاروباری فەرمانڕەوایی بچنە ماڵی فەرمانبەرەکان.

٢- کەس مەهێننە سەر فەرمانبەرەکان بۆ تکاکردن. چونکە دەرگای فەرمانڕەوایی کراوەتەوە بۆ هەموو کەس، ئیتر پێویست بەماماناوەندی پیاوی دەسبر ناکات.

«جێنوشین (قائیمقام)ی چەمچەماڵ»

## هەواڵی چەمچەماڵ

بەرەنگاریکردنی نەخوێندەواری

بۆ ئەمەی بتوانین بەرەنگاریی نەخوێندەواری بکەین لە ناوچە خۆشەویستەکەی چەمچەماڵدا، لەلایەن مامۆستایان (کاک عەونی سەید کاکە) و (کاک نەجات سەید عومەر) و (کاک قادر مەجید)ەوە، (خوێندنگایەکی شەوی) لە مانگی پێشوودا لە چەمچەماڵدا کرایەوە. ئێستا (٤٢) شاگرد تێیدا دەخوێنن. شاگردەکان هەموو نەخوێندەوار بوون. وا ئێستاکە بەهونەرمەندیی ئەم مامۆستا باشانەوە، بەدڵ دەستیان داوەتە خوێندەواری و، زۆر بەخۆشییەوە گوێ لە خوێندنەکانیان دەگرن. ئێمەیش لە دڵەوە سوپاسی مامۆستاکان دەکەین. هەروەها لە خودا داوای پێشکەوتنی شاگردەکانی (خوێندنگای شەویی چەمچەماڵ) دەکەین.

شەڕ و ئاژاوە

لە ناوەند دەستەی (شێخ عەبدوڵلای گۆیتەپە) و دەستەی (سەید ئەحمەدی خانەقا)دا لەسەر ئاوی دێی (عەسکەر) لە مانگی پێشوودا شەڕە تفەنگێک و هەراوهۆریا و ئاژاوەیەک ڕووی دا. یەکێک لە دەستەی (شێخ عەبدوڵلا) کوژرا. بەڵام فەرمانڕەوایی زوو فراکەوت. شەڕەکەی کوژاندەوە و، لەشکری (حەقەکانی شێخ عەبدوڵلا گۆکتەپە)ی بلاوە پێ کرد. پێنج کەسی لە (حەقەکان) و هەر چوار کوڕەکانی شێخ عەبدوڵلای خستە بەندیخانەوە. پیاوێکی سەید ئەحمەدی خانەقایشی گرت. (ئاوەکەی عەسکەر)یشی خستەوە دەست سەید ئەحمەدی خانەقا، کە بەفەرمانی پارێزگاری کەرکووک درابووە دەستی.

پیتاک

بەپیتاک (١٠٠) سەد دینار بۆ تەواوکردنی خانووی (یانەی فەرمانبەرانی چەمچەماڵ) کۆکرایەوە. چونکە لە هەموو پیتاک دەرەکانەوە دەستبلاوی و ئازایەتی و هونەرمەندیان دی، پڕ بەدڵ سوپاسیان دەکەین. خودا سەریان بخات.

«جێنرشینی چەمچەماڵ»

بەهۆی هەندێک وردەکاری و دەستکارییەوە کە پێکهێنران ناوی خراردنەوەی بازێری چەمچەماڵ، لە دەست ناپوختەیی و پیسی ڕزگار کرا. ئیتر لە دوێنێوە ڕاستەوخۆ ئاوە پاکە ساردە خۆشەکەی (دێی مزەفەر) دەخۆینەوە.

خەرمان سووتاندن

خەرمان سووتاندن دەستی پێ کردۆتەوە. فەرمانڕەوایی خەریکی تەمێ کردنی تاوانبارەکانە.

## ناوچەکەت بناسە

* ناوچەی چەمچەماڵ، پارچەیەک بوو لە خاکی سلێمانی و، فەرمانڕەوایی (بابان) کاروباری هەڵدەسووڕاند. کە لەساڵی (١٨٥١)دا فەرمانڕەوایی (عوسمانی) خاکی سلێمانی داگیر کرد، ناوچەی چەمچەماڵیش کرا بەبەشێک لە خاکی سلێمانی. بەڵام فەرمانڕەوایی داگیرکەری (بەریتانیا)، لە ساڵی ١٩٢٢دا خستیە سەر خاکی (کەرکووک). ئیتر لەو ساوە لەلایەن پارێزگاری خاکی کەرکووکەوە کاروباری هەڵدەسووڕێنرێ تا ئیمڕۆ.

* سنووری ناوچەی چەمچەماڵ: ڕۆژهەڵاتی خاکی سلێمانی، ڕۆژئاوای ناوچەی کەرکووک و ناوچەی تاووق، لای ژووررووی خاکی هەولێر، لای خوارووی ناوچەی کفریە.

* ناوچەی چەمچەماڵ، سێ لادێی هەیە: چەمچەماڵ، ئاغجەلەر، سەنگاو. لە هەموو ناوچەکەدا نزیکەی (٣٠،٠٠٠) کەسێک دانیشتووە لە (٢١٥) دێدا.

* هۆزە بەناوبانگەکانی ناوچەی چەمچەماڵ ئەمانەن: هەمەوەند، قەڵاسێوکە، شوان، شێخ بزەینی، جاف، ساداتی بەرزنجە.

* پیاوە ناسراوەکانی ئیمڕۆی ناوچەی چەمچەماڵ ئەمانەن: لە هۆزی هەمەوەند: (حەمە ئەمین ئاغای مەحموود خدر، ئەمین ئاغای ڕەشید ئاغا، عارف ئاغای کاک ئەوڵا). لە هۆزی قەڵاسێوکە (شێخ عەبدوڵلای گۆکتەپە). لە هۆزی شوان: (کوێخا ئەفەندیی گەزەڵان). لە هۆزی شێخ بزەینی: (عەلی ئاغای تۆفیق ئاغا). هۆزی جاف: (ڕۆستەمی حەسەنی حاجی قادر). لە هۆزی ساداتی بەرزنجە، (شێخ عەبدولکەریی کریچنە، شێخ کەریی گۆیتەپە).

* دانیشتووانی ناوچەی چەمچەماڵ هەموو کوردن و ئاری نەژادن. ئایینیان ئیسلامە و لەسەر ڕێڕەو (مذهب)ی شافعین. هەندێ (حەقە)یشیان تێدایە.

* گوندی بەناوبانگەکانی ناوچەی چەمچەماڵ ئەمانەن: (چەمچەماڵ، قەرەویس، گورگەیی سەرخاسە، بنەی ژووروو، ئاغجەلەر، چنارتوو، گەرگەر، مرتلیجە، گەورە دێ، عەسکەر، سەنگاو، جەلەمۆرد، مۆرد خواهی سەروو، گۆیتەپە، کریچنە، مەملەحە).

* ڕووبارە بەناوبانگەکانی ئەمانەن: (باسەرە، زێی بچووک، ئاوەسپی).

* شاخە بەناوبانگەکانیشی ئەمانەن: (هەنجیرە، بانی مەقان، شێخ ڕەش، خاڵ خالان، سەگرمە).

## پێ بکەنە!...

دوو ڕۆژ بەدوو عەلیشیش

مامۆستا عەلی: بەگم! تکا دەکەم تەنیا ڕۆژێ ماوە بۆ جەژن. ڕێم بدە بام لێرە بمێنمەوە. پاش جەژن دەستوبرد دەچم بۆ گوندی (ش) و، لەوێ خوێندنگا دەکەمەوە.

کارگێر: باشە من ڕێت دەدەم کە ئەو دوو ڕۆژەیش لێرە بمێنیتەوە. بەڵام هەر بەم ئۆتۆمبیلە کە بۆ

کەلوپەلەکانی خوێندنگای (ش) گیراوە، بچۆ، کەلوپەلەکانی خوێندنگا لە دێی (ش) دابنێ و بگەڕێرەوە. بەڵام لە بیرت نەچێ کە ئەو دێیە عەلیشێشی زۆرە پێویستە دوو عەلیشیشم بۆ بهێنی بۆ جەژنێم. تێ گەیشتیت؟!.

مامۆستا عەلی: بەسەر چاوە میرم. (بەڵام کە مامۆستا عەلی چووە ئەو گوندە و تەماشای کرد دوو عەلیشیش بەدینار و نیویک دەدەن، نەیتوانی بۆ کارگێری بکڕێ. هەروا بەدەستی بۆشەوە گەڕایەوە).

کارگێر: کوانێ عەلیشیشەکان؟ پێویستە هەر ئێستا بگەڕێیتەوە خوێندنگاکەی خۆت. کە جەژن دەستی پێ کرد ئینجا بێیتەوە شار.

مامۆستا عەلی: میرم خۆت دڵگیراو مەکە. تۆ خۆشبیت فەرمووت بەجێ دەهێنم. ئەوا (عەلی) لە بەردەستتایە. (شش)ەکەی دەمێنێتەوە، کە گەڕامەوە ئەویشت بۆ ڕەوانە دەکەم!؟.

شەمە شکاندن

جێنشینی ناوچە: من شەمە و مەمە نازانم. ئێوە کە کووتاڵ فرۆشن، وەک فەرمانبەری فەرمانڕەوایی وانە. پێویستە هەر ئێستا دەست بکەن بەکووتاڵ فرۆشتن. بام ئەم لادێییە هەژارانە تووشی پارە بەختکردنی خۆرایی و دەردی سەری نەبن و، زوویش بڕۆنەوە بۆ گوندەکانی خۆیان.

کووتاڵ فرۆشە جوولەکەکان: ئەز گۆری (قوربان) شەمەکان دەشکێت. لای مالوەو خزمەکانی کەرکووکمان ئابڕوومان دەچێت. لای (خودا) و (مووسا) ڕووڕەش دەبین.

جێنشینی ناوچە: کەواتە یان یەکێک لە جێی خۆتان دابنێن، تا لە بریتی ئێوە کووتاڵ بفرۆشێ بەلادێییەکان، یاخود هەر ئێستا بەخۆتان و کووتاڵەکانتانەوە، بڕۆنەوە بۆ کەرکووک. من کووتاڵ فرۆشانی تر لە جێتان دەهێنم.

کووتاڵ فرۆشە جوولەکەکان: ئەز گۆری! فەرمانڕەوایی باوکی هەموومانە. ئەگەر زۆریش بکات، دەسەڵات چییە؟ هەر ئۆباڵی بەئەستۆی تۆ بێت، شەمە شکاندن قەی ناکات!؟.

## جۆگەلە پیسەکانی ناو چەمچەماڵ

یەکەم ڕۆژی هاتنم بۆ چەمچەماڵ، کۆڵانەکانیم پشکنی. تەماشم کرد لە گەلێک ماڵەوە جۆگەلە ئاوی چڵک و پیسایی دێتە دەرەوە و، بەناو کۆڵان و شەقامەکاندا تێپەڕ دەبێ. تا تێکەڵ بەشیوە گەورەکەی ناو دێ دەبێ. چ بەبۆگەنی، چ بەناشیرینی، چ بەبەرهەمهێنانی هەموو ڕەنگە مێشوولە و مێش و مەگەز و خۆرە (میکرۆب)، ئەم جۆگەلانە، ناو دێی چەمچەماڵیان تەواو ناخۆش و ناهەموار کردووە. دانیشتووانی دێیەکەیان خستۆتە چنگی هەموو ڕەنگە دەرد و نەخۆشییەکەوە، کە دوور نییە لەمڕۆ و لە سبەینێدا دابکەون و، لەش خۆشی هەموو لایەکمان تێک بدەن.

بۆ شیوە گەورەکە جێنشینی (قائیمقامێتی)ی چەمچەماڵ داوای پارەکەی پاری کردۆتەوە، کە هەزار دینارە، تا پێی داپۆشێ. بەڵام ئەم پارەیە ئەگەر بەش بکات بۆ شیوەکە باشە.

ئەی بۆ جۆگەلەکان چی بکەین؟!... جا بۆ ڕزگاربوون لە دەست زیان و ئازاری جۆگەلەکان هیچ چارەیەک نییە، ئەوە نەبێ کە پڕ بکرێنەوە، واتا هەموو خاوەن ماڵەکانی چەمچەماڵ، تەمێ بکرێن، کە لەناو خانووەکانیاندا چاڵێکی قووڵ هەڵبکەنن و سەری داپۆشن، تاکە کونێکی بچووکی تێدا بهێڵنەوە، کە لەو کونەوە کەبیانووی ماڵ، هەچ ئاوێکی پیس هەبێ لە ماڵیدا، بیکاتە ناو ئەو چاڵە قووڵەوە. ئەمە ڕێوشوێن پێشاندانێکی باشە. جارێ لەمە بەولاوە چارەیەکی تر نییە. لەبەر ئەوە ئامۆژگاریی خاوەن ماڵەکانی چەمچەماڵ دەکەین، کە هەتا پانزە ڕۆژی تر، هەر کەسە لە ماڵی خۆیدا ئەو چاڵە قووڵە هەڵبکەنێ و جۆگەلە پیسەکەی بەرماڵی خۆی پڕ بکاتەوە. جا ئەوا ئاگادارمان کردن: لە پانزەی ئەم مانگەدا ماڵەکان، دەپشکنرێن، هەر کەسێ بەقسەی نەکردبووین تەمێ خواردووی دەکەین.

## ژینی تایبەتی

### باخچەی ماڵ

تا پێت دەکرێ، باخچەکەت هەر چوار لای خانووەکەت، ئەگەر نەکرا لای بەردەمی بەتەواوەتی بگرێتەوە، هەر هیچ نەبێ: تیلماسکە زەوییەک لەبەر ژووری دانیشتنەکەتدا بکە بەباخچە. یاخود چەند ئینجانەیەک گوڵی لە بەردەمدا دابنێ. باخچە بۆ ماڵەکەت زۆر پێویستە. چونکە دەیرازێنێتەوە، جوانی دەکات، بۆنی خۆشی دەکات، تەپوتۆزی لێ دەگرێتەوە، فێنکی دەکاتەوە، دڵی ماڵ و منداڵ و میوانانت دەگەشێنێتەوە.

### ساز و ئاواز

پێویستە لە ماڵەکەتدا: یان شمشاڵێک، یان تارێک، یان عوود و کەوانجەیەک (کەمانجە) یان گرامەفۆن و ڕادیۆیەک، هەر هیچ نەبێ دەنگخۆش و گۆرانیبێژێک هەبێ. چونکە گۆرانی و ساز و ئاوازی خۆش: سەر سووک دەکەن، دڵ خۆش دەکەن، لەش دەبووژێننەوە. بۆ خۆت و خێزان و میوانت دەبنە گوڵێکی کۆڕی دانیشتووان. دەبنە پزیشکێکی دڵسۆز.

### نووسراوخانە

نووسراو (کتاب): دۆستێکی دڵسۆز و هاودەمێکی ڕووخۆش و، یارێکی بەجۆش و خرۆش و مامۆستایەکی زرنگ و بەهۆشە. لەبەر ئەوە نووسراوخانە (کتێبخانە)یەکی خنجیلانە لە ژووری دانیشتنەکەتدا دابنێ، پڕی بکە لە نووسراوانی خۆش خۆش و نایاب نایاب، تا لە شەواندا ببنە گوڵی کۆڕی دانیشتووانت، دڵی خۆت و ماڵ و منداڵ و میوانانت پڕ بکەن لە گەشی و خۆشی.

### پاک و خاوێنی

١- تا دەتوانیت: شتی پاک بخۆ و بخۆرەوە. لە شتی پاک و خاوێندا بخۆ و بخۆرەوە.

٢- بەرگت پاک بێ. پێخەف و ناو ماڵت خاوێن بن.

٣- هەروەها دڵ و سەر و دەروونیشت پاک و خاوێن بن.

•لە ڕۆژنامەی خورماڵەوە وەرگیراوە•

## هەواڵی دەرەوە

* (ئەمین خاڵس)، پارێزگاری کەرکووک گوێزرابووەوە بۆ (بەسرە)، چوو بۆ شوێنی خۆی. لە خاکی (دلێم)ەوە (حوسێن فەهمی) بەپارێزگاری دێتە کەرکووک.
* (مووسا شاکر) پارێزگاری سلێمانی گوێزراوەتەوە بۆ خاکی (حلە).
* جێنوشین (قائیمقام)ی سلێمانی تازە (حەسەن تاڵەبانی) گەیشتە شوێن فەرمانی خۆی.
* لە بەغداد هەندێ لە کوردە فەیلییەکان کۆمەڵێکیان دامەزراندووە، بۆ ئەمەی فەیلییەکانی بەغدا فێری خوێندەواری بکەن. ئافەرین بۆ خەباتیان. لێیان پیرۆزبێ.
* لەسەر شەپۆلێکی نوێ ڕادیۆی بەغداد، ئێواران گۆرانیی کوردی بڵاو دەکاتەوە. دەنگەکەی باش دەبیسترێ، بەڵام تۆزێ کزە.
* کارگێڕی زانستی سلێمانی (مستەفا مەزهەر) کە تازە مردووە، دانیشتووانی شاری سلێمانی دوو هەزار دینار پیتاکیان بۆ خێزانەکەی کۆ کردۆتەوە.
* هاوبەشی (شرکة)یەکی ئەمریکایی، جۆرە خانوویەکی داهێناوە، هەریەکەی بە(٢٥٠) دینار دادەمەزرێ. نە دەسووتێ، نە باران کاری لێ دەکات و نە گوللە تفەنگ. دوو ژوور و چێشتخانەیەکی تێدایە. بەکەڵکی خێزانێکی بچووک دێت. ئەو شوێنانەی کە داماون لەسەر خانوو بۆ نیشتەجێکردنی لێقەوماوانی شەڕی گەورەی دوایی، خەریکی کڕینی ئەم خانووانەن.
* ڕووسەکان جۆرە ئاوێنەیەکیان دروست کردووە، کە بەزەبری تینی گەرمایی تیشکی ڕۆژ، گەلێک ماکینە بخاتە گەڕ، تا ئیتر پێویستی بەنەوت و بەنزین و خەڵووز نەمێنێ. تاقییان کردۆتەوە، بەم هێزە گەلێک کاروباری ناوماڵ (کە جاران بەدار و ڕەژوو و نەوت و بەنزین و ئەلەکتریک پێک دەهات) پێک دێت. دیارە کە ئەم جۆرە ئاوێنەیە بەکەڵکی ئابووری زۆر دێت.
* هەروەها ڕووسەکان ماکینەیەکی چاپکردنی (تایپ ڕایتەر)ی وایان داهێناوە کە لە جیاتی ئەمەی پێی بنووسیت بەدەست، تەنیا قسە دەکەیت، ئیتر ئەو ماکینەیە بەزەبری هێزی ئەلەکتریک و هەندێ شتی تر، دەنگەکە وەردەگرێت و، وەریشی دەگێڕێتە سەر نووسین. بەم چەشنە پیاوی نەخوێندەواریش دەتوانی وەک خوێندەوار بەم ماکینەیە بنووسێ و چاپ بکات!...

## نەخۆشی کۆمەڵایەتی

دەردی نانخواردن لە چێشتخانەکانماندا

(میوانی چێشتخانە): کورە هەی کابرای چێشتکەر! لە ڕاهی خودادا تۆزێ دەنگی ڕادیۆکەت نزم بکەرەوە، مێشکم چوو!؟... بۆچ بۆ من نانخواردنێکی بێ دەنگ و لەسەرخۆ هاتوومەتە

چێشتخانەکەتەوە یان بۆ مێشک چوون؟!...

(چێشتکەر): ئەز گۆری (قوربان) من مەبەسم ئەوەیە هەموو کەس گوێیان لە ڕادیۆکە بێت و، کەسانی تریش بەدەنگەوە بێن، بەڵکو نان بخۆن و منیش چەند پوولێکم چنگ بکەوێ.

(میوانی چێشتخانە): خودا ئاگادارە دەنگی بەتەواوەتی نزم نەکەیتەوە و ڕادیۆکە نەخەیتە سەر ساز و ئاوازێکی دەنگ نەرم و خۆش، لای جێنوشینی ناوچە (قائیمقام)، سکالات لە دەست دەکەم.

(چێشتکەر): باشە ئەوا لەبەر دڵی تۆ ڕادیۆکە دەخەمە سەر گۆرانی و ساز و ئاوازێکی دەنگ نەرم و خۆش. دەنگەکەیشی نزم دەکەمەوە. بەڵام تۆیش لە بیرت نەچێ کە بەجێنوشینی ناوچە بڵێیت، هەروەک دەنگی ڕادیۆکەی من نزم دەکاتەوە، دەنگی باڵبازەکانی بەر سەرایش نزم بکاتەوە!!...

تێبینی: هەر ئەو ڕۆژەی ئەمە ڕووی دابوو، جێنوشینی ناوچە فەرمانی دا لەبەر سەرادا و هەموو جێگایەکی تریشدا نە باڵبازەکان، نە کەسانی تر دەنگ بەرز نەکەنەوە تا سەروت لە کەسانی تر تێک نەدەن!... مەلایەک ئەو فەرمانەی شکاند هەر ئەو ڕۆژە تەمێ کرا!...

***

## چەمچەماڵ

ژمارە: (٢)
ڕۆژ: ١٩٤٦/٧/٨

### دەوڵەمەندەکانمان

بۆ پێکهێنانی ئەلەکتریکی چەمچەماڵ بۆ دروستکردنی هەندێ چاپخانە و چەند دووکانێک، بۆ دروستکردنی پەرژینێکی بەهێز و هەروەت بۆ باخچەکانی شارەوانیی چەمچەماڵ، بەنامەی تایبەتی داوامان لە چەند دەوڵەمەندێکی گەورە کردبوو، کە بەخۆیان و دۆستەکانیانەوە هەندێ پارەمان بۆ ڕەوانە بکەن. یەکێکیان هەر وەرامی نەدایەوە، یەکێکیان ئامۆژگاری کردبووین کە هەر واز لەم بیرەیش بهێنین و، سەریشی سوڕمابوو لە خواستەکەمان. ئەوی تریشیان بەجۆرێکی تر بەربەستی کردبووین. کەچی وەک بۆمان دەرکەوتووە بۆ خێزانی کارگێڕی زانستی سلێمانی، (مستەفا مەزهەر) کە لە مانگی پێشوودا مردبوو، تەنیا ئەو سێ کەسە (٣٥٠) دیناریان پێشکەش کردبوو!... ئینجا بام لە گشت لا ئاشکرا بێت، کە زۆر لە دەوڵەمەندەکانمان پیاوی ڕاستەقینەی چاکە و پیاوەتی نین. ئەگەر تەماشایان کرد ئەوا دوژمنەکانیان پیتاک دەکەن، ئەوانیش لە ڕووی بەربەرەکانێ و دڵپیسییەوە بێ بیرکردنەوە و لێ وردبوونەوە، پیتاک لەوان زۆرتر دەدەن. یان ئەگەر زانییان ئەم پیتاکە بەکەڵکیان دێ، سا یان فەرمانڕەوایی یان زۆردارێکیان لێ دڵخۆش دەکات، یاخود ناوێکی وەهای پێ دەردەکەن کە چاوبەستی نەزان و هەژارەکانی نیشتمانەکە بکات، یان لە زۆر و ستەمی فەرمانبەرێکی فەرمانڕەوایی یاخود زۆردارێک ڕزگاریان دەکات، ئەوا پیتاک دەدەن. بەڵام ئایا ئەم پیتاکە بەکەڵکی شار و دێیەک دێت، یاخود چەند داماوێک دڵخۆش دەکات، یان دانیشتووانی نیشتمانەکە پێش دەخات، ئەم بابەتانە ناخەنە

بەرچاو. جا زۆر لە دەوڵەمەندەکانمان، وەکو لە سەرەوە پیشان درا، چاکە کردنیش بەبابەتی بازرگانی دەدەنە قەڵەم. تا لە دەردی سەرییەک ڕزگاریان نەکات، یاخود کەڵکێکیان پێ نەبەخشێت، چاکە ناکەن!... لە خاکە پێشکەوتووەکانیشدا هی وا هەیە بەکلوور پارە دەبەخشێت بۆ چاکەی هەژاران و پێشخستنی گەل و نیشتمان و جیهان، کەچی زۆریش دەپارێتەوە کە کەس ناوی ئاشکرا نەکات!...

## هەواڵی چەمچەماڵ

* شەوی سێشەممەی ڕابردوو، ئاهەنگێک لە خوێندنگای شەوی چەمچەماڵدا گێڕرا. گەلێک وتاری خۆش و گۆرانی بەجۆش و ئەم ڕۆژنامەیەشی تێدا خوێندرایەوە. ئیتر لەمەودوا، مژدەیی بێ لە هەمووان، هەموو شەوێکی سێ شەممووان بەم جۆرە ڕادەبوێرێ، تا شاگردەکانی خوێندنگای شەوی، بەخۆش ڕابواردنێک دوو ساتی کامەران بن. جێنوشینی ناوچە و هەندێ لە فەرمانبەرانیش کە بۆ ئەم ئاهەنگە هاتبوون، گەلێک سوپاسی مامۆستاکان و شاگردەکانی خوێندنگای شەوی چەمچەماڵیان کرد.
* کووتاڵ فرۆشەکان، پاش دابەشکردنی کووتاڵ بەسەر دانیشتووانی ناوچەی چەمچەماڵدا، گەڕانەوە کەرکووک. بۆ ئەوانەی کە بێ بەش مابوونەوە لە کووتاڵ جێنوشینی (قائیمقامیەتی) لە کۆششدایە کە بەشی ئەوانیش کووتاڵ کێش بکاتە چەمچەماڵ.
* پاش هەوڵدانێکی دوو مانگی دەسگای جێنوشینیی چەمچەماڵ (قائمقامیتی) دەسگای پارێزگای کەرکووکی هێنایە سەر ئەوەی کە لە بریتی دانیشتووانی شاری کەرکووک کووتاڵ فرۆشەکان لە دانیشتووانی ناوچەی چەمچەماڵ هەڵبژێررێن. دوێنێ دەسگای پارێزگاری کەرکووک داوای ناوی بیست کەسی لە جێنوشینی چەمچەماڵ کرد کە بیکات بەکووتاڵ فرۆشی ناوچەکە. جا بزانین چەند کەس لەمانە دادەمەزرێنرێن.
* (یانەی فەرمانبەرانی چەمچەماڵ) بۆ ئەم هاوینە هەواریان گوێزایەوە ناو باخچە گەورەکەی شارەوانی، کە لەوێدا کەپر و سەکۆیەکی گەورەیان دروست کردووە جێگای دانیشتنی (٣٦) کەسی تێدا دەبێتەوە.
* خەمڵکردنی دەغڵودان، چ لەلایەن دەسگای دارایی (مالیة)وە، چ لەلایەن دەسگای سامانی تەرخانکراو (اوقاف)ەوە، دەستی پێ کرد. ئەوی بەخەمڵەکە دڵنیا نییە، دادی خۆی بگەیێنێتە لای جێنوشینی ناوچە (قائمقامی قضاء).
* لە دێی (عەسکەر) ئەو هێزانەی لەلایەن ناوچەی چەمچەماڵ و شاری کەرکووکەوە نێررابوون، لەلایەن دەسگای جێنوشینی چەمچەماڵەوە گێڕرانەوە دواوە بۆ شوێنی خۆیان. بەڵام (بنکەی باڵبازی عەسکەر) چوار باڵبازی خراوەتە سەر. بێجگە لەوە چاوەشێکی وریایشی بۆ دانراوە.
* (شێخ محەممەدی شێخ عەبدولکەریم) کە خاوەنی (تەکیەی قەڵامکایل)ە لەلادێی (قادرکەرەم)دا، چوارشەممەی ڕابردوو بەخۆی و دەروێش و دەفیەوە هاتبووە چەمچەماڵ. ڕۆژی پێنج شەممە ڕووی کردە گوندەکانی (شوان) بۆ پیتاک کۆکردنەوە لە جووتیار و لادێییە هەژارەکان. گەورەی ناوچە بەشیرینییەکەوە پێی گوت، کە پێویستە، ئاگایان لە خۆیان بێت لە کاتی نووستن و سەردوتی

دانیشتووانی ناوچەکەدا دەنگە دەنگ و هەرا هەرا نەکەن و، وازیش لە زەرگ لێدان و شەپلێتە خواردنی ئاشکرا بهێنن!...

## ناوچەکەت بناسە

(٢)

* لە ناوچەی چەمچەماڵدا گەلێک کانی نایاب نایاب و نرخدار هەیە وەکو (خوێ، نەوت، گۆگرد، خەڵووزی بەرد، گەچ) کە ئەگەر بێتو بەرهەم بهێنرێن کۆڵێ دانیشتووانی ناوچەکە و فەرمانڕەوایی پێیان دەوڵەمەند دەبن و گوزەرانیان خۆشتر و چاکتر دەبێ.
* لە ناوچەی چەمچەماڵدا زەوی و ئاوێکی زۆر و بەپیت هەیە، ئەگەر بێتو بەرهەم بهێنرێن، دەغڵودان و سەوزە و میوەی ناوچەکە، گەورە و بچووکی دانیشتووانی ناوچەی چەمچەماڵ دەوڵەمەند دەکەن و، ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی بۆ دانیشتووانی ناوچەکە و سەرسووکی و کاروباری ئاسانییش بۆ فەرمانڕەوایی پێک دێت.
* لەگەڵ ئەمەیشدا، ناوچەی چەمچەماڵ، پەنیر، ڕۆن، خوری، موو، مەڕومالاّت، دار و خەڵووز، دەغڵودان و کەمەکێ سەوزە و میوە بەدەرەوە دەفرۆشێ. کەلوپەل و پێویستی خۆیشی لە سلێمانی و کەرکووک و کفری و کرێسنجەق دەکرێ.
* ناوچەی چەمچەماڵ هەروەک دەشت و هەردوو بیابانی گەرم و وشکی هەیە، هەروەها شاخی ڕەنگین و چەمەن و باخ و دارستانی جوان و، کانیاو و چەماری سازگار و شیرینیشی هەیە.
* لە ناوچەی چەمچەماڵدا دەستکرد و پیشەسازی زۆر کەم و کزە، جافەکان هەندێک قاڵی و بەڕە و خورج و دەوار و خەرار دروست دەکەن.
* تێکرا دانیشتووانی ناوچەی چەمچەماڵ دەستکورت و هەژارن. شەڕ و شۆڕی ناوەند هۆزەکان و فەرمانڕەوایی، یاخود ناوەند خۆیان، نەیهێشتووە ناوچەکە سەروەت و ئاسایشی تێ بکەوێ، تا دانیشتووەکانی بتوانن خوو بدەنە خوێندن و دەستکرد و پیشەسازی و سامان پێکەوەنان، تا (ناوچەکە) پێشکەوێ و دەوڵەمەندبێ. تازە وا خەریکن ملی ڕێگای ڕاستەقینە بۆ ژیانێکی پاک و پوختە و ئازاد بگرن.
* ئێمەیش لە خودای پاکی بێ هاوتا دەپاڕێینەوە، کە دەستی یارمەتی بۆ ئەو هاونیشتمانە کڵۆڵە هەژارە لێقەوماوانە درێژ بکات و، ئەمانیش وەک دراوسێکانیان بخاتە خۆشگوزەرانی و کامەرانییەوە.

## پێ بکەنە!...

پزیشک و خاوەن بارگیر

خاوەن بارگیر: جێنوشینی ناوچە! خودا ڕاوەستاوت بکات. ڕزگارم بکە لە دەست پزیشکی چەمچەماڵ. دەڵێ: «لە کرێی بارگیرەکانت چارەکە دینارێک دەبرم، لە بریتی ئەوەی کە چوومەتە کەرکووک و ڕستەی

هاتوچۆکەم لەوێ بۆ جێبەجێ کردوویت!».

جێنوشینی ناوچە: کوڕم! ڕەنگە تۆ بەهەڵەدا چوو بیت! ئەوە پزیشک ڕستەکەتی وەک لەشی نەخۆش پشکنیوە، تا بزانێ نەخۆشییەکەی چییە و چۆن چارە دەکرێ. جا لەبەر ئەوە کە کرێی پشکنینەکە چارەک دینارێکی لێ سەندوویت!...

پزیشک و یاریدەدەر

یاریدەدەری باڵباز: ئەوە بۆچی پزیشکت ناردۆتە لام؟

جێنوشینی ناوچە: گەرماپێو (ترمۆمەترە)کەی پزیشک هەر لەسەر پلەی (٤٢°) ڕادەوەستێ. بەڵام پزیشک دەڵێ کە گەرماپێوەکەم دەخەمە ناو دەمی (یاریدەدەری باڵباز)ەوە، هەر لەسەر پلەی (٤٢°) دەوەستێ. گوتم بزانم ڕاست دەکات؟!... بەڵام لە پێشەوە پێت دەڵێم، وریابە، وەک دەڵێن، گەرماپێوەکەی پزیشک نەخۆشت نەخاتەوە. چونکە نەخۆش بیت و نەخۆش نەبیت، گەرماپێوەکەی ئەو هەرگیز لە پلەی (٤٢°) نایەتە خوارەوە.

مەلا عەزیزی پریس و شێخێکی تەکیە

مەلا عەزیزی پریس: شێخم! تۆ لەکن خۆت شێخی تەکیەیت، ئەم کەوا قەنەووزە چییە لەبەرت کردووە؟ نازانیت پێغەمبەر فەرموویەتی: «هەرچی سپیاڵی ئاوریشم لەبەر بکات خۆشەویستی من نابێ؟».

شێخی تەکیە: خودا بتگرێ مەلا خۆت و تووانج و پلارت. ئەم کەوایە هی خۆم نییە. هی باوکمە. منیش بەیادی ئەوەوە لەبەرم کردووە!.

مەلا عەزیزی پریس: شێخم! خودا سەرفرازت بکات بۆ خۆت و قسەت. دەمێک بوو دەمگوت: «تۆ بڵێی باوکی ئەم شێخەیش هەروا، لە خودا یاخی بووبێ؟» هەرچەندم دەکرد بۆم هەڵنەدەهێنرا بەڵام کارت ڕاست بێ ئەوا لەم تەنگ و چەڵەمەیەیش ڕزگارت کردم!... بەڕاستی کوری باوکی خۆت دەرچوویت!؟...

## بپرسە و پێت بڵێم

گفتوگۆ لە ناوەند ڕۆژنامەی چەمچەماڵ و خوێندەوارەکانیدا

* وەستا ڕەشید خورشید: لەبەر بێ چرایی تاریکی کۆڵانەکانی چەمچەماڵی داگیر کردووە. ئایا شارەوانی چارەیەکی بۆ ئەمە نەدۆزیوەتەوە؟
* ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: بەڵێ شارەوانی چەمچەماڵ بڕیاری داوە: بەم زووانە پانزە چرای ئینگلیزی بۆ کۆڵانەکانی چەمچەماڵ بکرێ و دایشی بەزرێنێ. دڵنیابە تا حەفتەیەکی تر ئەمە پێک دێ.
* مەحموودی کاکەخان: نانەوایەک بەشی چەمچەماڵ ناکات. نرخی نانیش گرانە. ئایا شارەوانی بیری لەمە کردۆتەوە؟
* ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: سەرۆکی شارەوانی چەمچەماڵ (کە جێنوشینی چەمچەماڵیشە) بەڵێنی داوە

نانەوایەکی تر بدۆزێتەوە، نرخی نانیش: هەرزان بکات و سەرپەرشتیشی بکات.

کەریم تۆفیق: ئەگەر جۆگەلە بچکۆلەکانی ناو کۆڵانەکانی چەمچەماڵ لەلایەن شارەوانییەوە داپۆشرێن و چڵکاو و پیسایی ناو ماڵەکانیان پێدا بڕواتە خوارەوە سەر شیوە گەورەکە باشتر نییە؟

* ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: شارەوانی چەمچەماڵ، لەبەر دەستکورتی خۆی، ئەم جۆگەلانەی پێ داناپۆشرێت. لەبەر ئەوەی بەزەییشی بەخاوەن ماڵەکاندا دێتەوە کە پێیان داپۆشێت هەر وەکو لە ژمارەی پێشووی ئەم ڕۆژنامەیەدا پیشانماندابوو، چارە هەر ئەوەیە کە ئەم جۆگەلانە پڕ بکرێتەوە لەلایەن خاوەن ماڵەکانەوە. لەناو هەموو ماڵێکیشدا بیرێکی قووڵی سەرگیراو هەڵبکەندرێ بۆ چڵکاو و پیسایی...

* محەممەدی مەلا فەتاح: پووش و پەلاش و پیسایی، کۆڵانەکانی داگیر کردووە. تکا دەکەین بفەرموویت گەسک لێدەرەکانی شارەوانی ئەو کۆڵانانە پاک بکەنەوە.

* ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: حەز دەکەین بزانیت کە لە (١٩٤٦/٦/٢٣)ەوە گەسک لێدەرەکانی شارەوانی، لەبەر تەمەڵی و کەللەڕەقی خۆیان دەستیان لە فەرمان کێشراوەتەوە. لەو سایەوە شارەوانی هەوڵ دەدات چەند گەسک لێدەرێکی باش بدۆزێتەوە. تا ئێستا کەسی دەست نەکەوتووە. هەر کاتێ گەسک لێدەری باشمان دەستکەوت، کۆڵانەکان بەپاک و خاوێنییەوە ڕادەگیرێن.

## لەشخۆشی

### نەخۆشی و خۆپارستن

نووسینی: نەجات عومەر

نەخۆشی: یان لە پیسییەوە، یان لە کەسێکی نەخۆشەوە، یان لە بێ هێزییەوە تووشی پیاو دەبێ. نەخۆشی: برستی پیاو دەبڕێ. لە پەلوپۆی دەخات. خەم و خەفەتی بۆ پەیدا دەکات. کار و فەرمانی پەک دەخات. مایە و سامانی لەناو دەبات. خاوخێزانی دەخاتە تەنگانە و ناخۆشییەوە. لەبەر ئەمە بۆ ئەمەی نەخۆشیت تووش نەبێ، تەماشای ئەم ئامۆژگارییانەی خوارەوە بکە:

١- حەفتەی جارێک کەلوپەل و لەشت، لە پاش و لە پێش هەموو نانخواردنێکیشدا دەم و پلت بەئاو و سابوون بشۆ.

٢- خۆت لە خواردنی پیس و بۆگەن و ڕزیو بپارێزە. چێشت هەڵمەگرە بۆ سبەینێ. ئەو خواردنەی دەیهێڵیتەوە باشی داپۆشە مەهێڵە مێش و مەگەزی توخن بکەوێ. تا میوە و سەوزە پاک نەشۆیتەوە مەیخۆ. تا چێشتەکەت باش نەکوڵێ نەیخۆی. تا ئاوەکەت خاوێن نەبێ نەیخۆیتەوە.

٣- بام ژوورەکانت پەنجەرە داربن، تا تەواو تیشکی ڕۆژ و بای پاکیان بێتە ژوورەوە، بۆ نوستن و خواردن و دانیشتن و کەلوپەل، هەریەکە، ژوورێک تەرخان بکە. وریابە چێشتخانە و ئاودەستخانە و سەرشۆرک لەم ژوورانەتەوە دوور بن، تا بۆنی ناخۆش بەسەرتاندا نەیێ. تا دەتوانیت ژوورەکانت پاک ڕابگرە. حەفتەی جارێکیش پێخەفەکەت بخەرە بەر خۆر تا پاک ببێتەوە. دەورووپشتی خانووەکەیشت

پاک رابگرە.

٤- کە نەخۆشی لە ماڵەکەتدا داکەوت، دەموودەست پزیشک ئاگادار بکە. پارێز لە نەخۆشەکان بکە. هەرچی پزیشک گوتی بەگوێی بکە.

ئەو گەلە پێش دەکەوێ کە نەخۆشی تێدا نەمێنێ، یاخود زوو چارەی نەخۆشەکانی بکات. لەبەر ئەوە ئەگەر حەز بەپێشکەوتن دەکەن، تا دەتوانن بەتەنگ لەشی خۆتان و خاووخێزانتانەوە بن و، لە نەخۆشیش خۆتان بپارێزن.

## هەواڵی دەرەوە

* کۆڕی کاربەدەستانی عێراق خەریکن فەرمانێکی گەورەی دە ساڵی پێکبهێنن بۆ دانیشتووانی عێراق، کە لە هەموو ڕوویەکەوە عێراق بەرەو پێشکەوتن دەبات، بەتایبەتی لە ڕووی بووژاندنەوەی هەژاران و پێگەیاندنیانەوە، بەهۆی دروستکردنی خانووەوە بۆ کرێکارەکان، بەهۆی دروستکردنی ئاوبەند (سدە)وە لەسەر ڕووبارەکان، بەهۆی کردنەوەی ڕێگا و شەقام و ڕێگای ئاسن و، دامەزراندنی کارگە و کارخانە و بانک و گەلێک شتی نایاب و بەکەڵکی ترەوە... پێویستە لیژنەکانی کاربەدەستییەکان (وەزارەتەکان) لە دوایی ئەم مانگەدا، بڕیارەکانی خۆیان بەنووسراوی بنێرن بۆ سەرەکی کاربەدەستانی عێراق. تا لە ڕۆژی ١٩٤٦/٨/١٥دا کۆڕی لەسەر ئەم فەرمانە گەورەیە بدەن، ئینجا بەهۆی کۆڕی نێرراوان (مجلس النواب)ەوە بخرێتە شێوەیەکی یاساییەوە. ئێمەیش دەڵێین کاشکی ئەمە سەری بگرتایە، بەڵکو کوردستانی عێراقیش، بەتایبەتی (ناوچەی چەمچەماڵ) کە لەم جۆرە بابەتانەدا یەجگار دواکەوتووە بەشی خۆی پێش بکەوتایە و بووژایەتەوە. پێشینان گوتوویانە: «کوێر هەتا دەمرێ هەر بەهیوای چاوە!».

* کاربەدەستی زانستی عێراق (وەزارەتی معارفی عێراق) بڕیاری داوە لەم هاوینەدا سێ خول (دورە)ی هاوینەیی لە هاوینەهەوارەکانی کوردستانی عێراقدا، بۆ شاگردەکانی خوێندنگایانی (بڵند و، دووەمین و، ناوەندی و ئامادەیی و، خانووی مامۆستایان) بکاتەوە. کاربەدەستانی بەرگریی (دفاع) عێراقیش بەڵێنی داوە یارمەتییان بدات و شاگردەکان فێری سوارچاکی بکات.

* دەڵێن: (کارگێڕی گشتیی کشتوکاڵی عێراق) ڕێگایەکی تازەی دۆزیوەتەوە بۆ نەهێشتنی کوللە، بەهۆی خۆرشتێکی ژەهراوییەوە و، مەکینەیەکی نوێوە کە ئەو خۆرشتە ژەهراوییە بەگورجی و ئاسانی بڵاودەکاتەوە بەسەر شوێن گەراکاندا. ئەوەیش دەرکەتووە، کە بەم ڕێگا تازەیە، دەرمان کەمتر پێویست دەبێ و، زۆرتریش کوللەکان دەکوژرێن و لەناو دەبرێن. بێجگە لەمانە دەرمانەکە زیانی بۆ گیانلەبەرانی تریش نابێ!.

## ژینی تایبەتی

خۆش ڕابواردن

وا چاکە شەو و ڕۆژەکەت بکەیت بەسێ بەشەوە. بەشێکی دابنێیت بۆ نوستن. بەشێکی بۆ کار و فرمان کردن. بەشێکیشی بۆ سەربەوت. جا لەم بەشەی سەرەوتەتدا کە دەکاتە هەشت سات: دەم و چاو شتن، خۆشتن، نانخواردن، دانیشتن لەگەڵ خاوخێزان و میوانانەدا. گەڕانی ئێواران و چوونە لای دۆست و یاران و ڕاکێشانی تێدا جێ دەبێتەوە. تۆیش دەبێ زۆر بەتەنگ ئەم هەشت ساتەوە بیت. چونکە خۆشی ڕاستەقینەی ژیانت، لەم هەشت ساتەدا پێکدێ. ئەگەر وریا نەبیت و، لە شتی پڕ و پووچ و قسە و لێدوانی ناخۆش ناخۆشدا بەختی بکەیت، نە ژیانت دەبێ بەژیان و، نە فرمانیشت بۆ دەبێ بەفرمان. تەنانەت خەوەکەیشت لێ دەبێ بەگژەوشار.

لەم هەشت ساتەدا، کە ماوەی ڕچان و پشوودان و سەربەوتە خۆت لە گفتوگۆی ناخۆش و، لێدوانی کار و فەرمان و، خۆماندووکردنی بەلەش یان هۆش بپارێزە. هەموو هەوڵی ئەوە بدە، کە پێبکەنیت و، خۆش ڕابوێریت و، دڵی خۆت و ماڵ و منداڵ و دۆست و یارانت خۆش بکەیت... هەندێ کات بەقسە و لێ دوانی شیرین و خۆشەوە، هەندێکیش بەگوێگرتن لە گۆرانی و ساز و ئاوازی ئاوازەوە، هەندێک بەگەشتوگوزاری ناو باخ و بێستان و چەم و دارستانەوە، هەندێک بەسەردان لە کەسوکار و خزم و یارانەوە، هەندێک بەگەمە و یاریکردن لەگەڵ ماڵ و منداڵتدا، هەندێکیش بەخواردنی نایاب و، بەخوێندنەوەی نووسراوی بەکەڵک و خۆشەوە، بەمەلەکردن و سواری و شاخەوانی و سەیرانەوە ڕابوێرە. هەموو ساڵێکیش: جارێک یان دوو سێ جار، چەند ڕۆژێک تەرخان بکە، کە هیچ کار و فەرمانێکی تێدا نەکەیت. هەر هەوڵت ئەوەبێ کە زۆر بەئاوازەیی و پوختەییەوە ڕابوێریت. ئەوی نەزانێ خۆش ڕابوێرێ، ناێشتوانێ باش کار و فەرمانی خۆی ڕاپەڕێنێ: بێجگە لەوە دەیشبێتە بارێکی گران بەسەر خۆی و خێزان و نیشتمانەکەیەوە. لەبەر ئەوە لە پاش بەجێهێنانی کار و فەرمانەکەت، تا دەتوانیت هەوای باڵی خۆت بدە و، پشوو بدە و، ڕابوێرە!...

***

## چەمچەماڵ

ژمارە: (٣)

ڕۆژ: ١٩٤٦/٧/١٥

### دەوڵەمەندبوون بەدەست خۆمانە

کە هاتمە چەمچەماڵ لە پاش چەند پشکنینێک ئامۆژگاری کردنێکم چایخانە و کەبابخانە و چێشتخانەکانی چەمچماڵ گۆڕران. واتا بنمیچەکان بەجنفاس و گونیە داپۆشران و، تەختی دانیشتنەکان دۆشەکیان ترایە سەر. دیوارەکان تەڕاو دران و، مێزەکان سەرتەپڵەکیان بۆ کرا. ئیتر لەو ساوە، لە جیاتی

تەنەکە، لە پەرداخی شووشەدا ئاو دەدرا بەڕێبوار و میوان. پاک و خاوێنی و جوانی، ئەو شوێنە گشتییانەی ڕازاندەوە، ئیتر بەئاشکرا دەرکەوت کە ڕێبوار و میوانی ئەو شوێنانە و خاوەنەکانیان، خۆشیان دڵخۆش و دڵنیابوون، ڕێبوارەکانیش زۆرتر کێش دەبوونە ئەو شوێنانە. ئەمەیش دەرکەوت کە باخەڵی خاوەن شوێنەکانیش زۆرتر پڕ بوون لە پارە. بێگومان ئەم خاوەن شوێنانە گەلێک منیان دڵخۆش کرد. گەلێک جاریش بەدڵ و بەدەم سوپاسی گەرم و گوڕم بۆ ناردوون. مەبەستی منیش بێجگە لەوەی سرەوت پێدان و دڵخۆشکردنی ڕێبوار و میوانەکانیانە، هەروەها بەربەستکردنی بلاوبوونەوەی نەخۆشی و ناخۆشیشە لەناو کۆمەڵدا. دیسانەوە مەبەسم دەوڵەمەندبوونی ئەو خاوەن شوێنانەیشە، کە بەدڵ حەز بەکامەرانی و خۆشگوزەرانییان دەکەم. لەم ڕۆژانەدا لە سەرتاشێکی چەمچەماڵم پرسی، دەرامەتت چۆنە؟...

گوتی: «بەخودا مانگی شەش دینارێکم چنگ بکەوێ باشە، خودا ڕاگیراوت بکات، فەرمانبەرەکان لای من سەر ناتاشن، دەچنە کەرکووک و سلێمانی سەر دەتاشن. دانیشتووانی چەمچەماڵیش خۆیان هیچی وام پێ نادەن. هەرە دەوڵەمەندەکەی بۆ سەرتاشینێک بیست فلس دەداتێ. جا چۆن بەم ڕەنگە گوزەران دەکەم؟!».

منیش کە سەرنجم دایە کاکەی سەرتاش، تەماشام کرد: سابوونی سەرتاشینی نییە. شتێکی نییە کە کەفی سابوونەکە و تووکەکەی پێدا بسوێ، فڕێی دەداتە سەر زەوی. خاولی و بەروانکەی نییە. لە گەنەکەی پیس و ژەنگاوییە. ئیسپرتۆی نییە کە گوێزانەکەی پێدا بکات کە خوورە (میکرۆب) پاکی بکاتەوە... تەنانەت ئاوێنەیەکی وەهای نییە کە بەکاربێت!... پاشان ڕووم تێ کرد گوتم: «کاکەی سەرتاش! بەم هەموو کەموکوڕی و چڵکنییەشەوە، هێشتا گلەیی لە بەختی خۆت دەکەیت؟!». گوتی: «پەیمان بێ: هیچ کەموکوڕییەکم نەهێڵم! حەز دەکەیت چەند ڕۆژێکی تر وەرەوە، سەیری دووکانەکەم بکە: بزانە چۆنم پوختە و دروست و تەواو کردووە؟».

گوتم: «نە،، تەنیا سەیری دووکانەکەت ناکەم، سەیری باخەڵیشت دەکەم. تۆ ڕێکوپێک و پاک و خاوێن بە، بزانە چۆن کڕیارت زۆر دەبن و، چۆنیش دەوڵەمەند دەبیت. دڵنیابە لەسەد نەوەد کەس لەبەر تەمەڵی و چەوتی و ناڕێک و پێکیی خۆیەتی کە دەوڵەمەند نابێ!... چونکە لە ڕاستیدا:

کرد و کۆشە سەرچاوەی جوانی
ڕاستەوخۆ دەتبا بۆ کامەرانی

## خۆشەویستی سەرچاوەی کامەرانییە

لەو ڕۆژەی هاتووم بۆ چەمچەماڵ تا ئیمڕۆ، ئەوەندەی لە دەستم هاتبێت ئامۆژگاری دانیشتووانی ئەم ناوچەیە دەکەم: کە برابن لەگەڵ یەکتردا، ئەمەندە دڵپیس و قین ئەستوور و ڕقەبەرست و تۆڵەویست مەبن. بەسیەتی ئەمەندە دوژمنایەتی و ناکۆکی و نەکۆکی. ئەم ناوچەیە لە هیچ ناوچەیەکی تر، لە خاک و ئاو و شاخ و سامانی خوداپێداوادا کەمتر نییە. ئەوەی بۆ ئێرە هەڵکەوتووە شوێنانی تر خەوی پێوە دەبینن، کەچی ناوچەکانی تر تا دێن ئاوەدان دەبنەوە، دانیشتووەکانیشیان ڕۆژ بەڕۆژ گەش و کامەران و

خۆشگوزەران دەبن. ئێرەیش ڕۆژ بەڕۆژ دوادەکەوێ و، هەژارتر و کەمـاسـتـر دەبێ!... ئاخۆ دەزانیت ئەمە لەبەر چییە؟ ئەمە لەبەر دوودڵی و چەوتی و خراپی دانیشتووانی ناوچەکەیە!...

ئەگەر هۆزی (هەمەوەند): دوودڵی و ناکۆکی خۆیان نەبووایە، ئاوەها ڕەچەڵەکی یەکتریان نەدەبڕییەوە. ئاوەها هەژار و بێ دەسـەڵات و نابووت نەدەبوون و، ئێـسـتـاکـە دەوڵەمـەنـتـرین و گـەورەترین و دەسەڵاتدارترین دەبوون لەناو هەموو هۆزەکانی کوردستاندا.

لەم ڕۆژانەدا دەستەی بەگزادەکانی هەمەوەند و دەستەی مسکێنەکانی دێی (چراغەڕووتە)، کە لە هەر یەکەیان پیاوێکی ناسراو بەفرۆفێڵی ئەولای تر کوژرابوو، جێنوشینی چەمچەماڵ چەند ڕۆژێک لەسەر یەک، لە گەڵیـاندا خەریک بووبوو ئاشـتـیـان بکاتەوە و، پێکەوە لە دێی (چراغـەڕووتە)دا بەبرایەتی پێکەوە دابنیشن و گوزەران بکەن، کەچی هیچیان بەگوێیان نەکرد!... دەسگای جێنوشینی چەمچەماڵیش ناچار ما لەهەرلایەی چوار کەسی خستە بەندیخانەوە، تا هۆشیان دێتەوە کەللەیان!؟

## ناوچەکەت بناسە

(٣)

* لە ناوچەی چەمچەماڵدا ئەم دەسگایانە هەن: جێنوشینی (قائمقامیة)، یاریدەدەری کارگێڕی باڵباز (معاونیة مدیر شرطة)، فەرمانبەری بنکەی باڵباز (مأموریة مرکز الشرطة)، کارگێڕی دارایی (مدیریة المالیة)، دادگاه (المحکمة)، بەرهەمـەکـان (المنتوجات) بابەتانی لە دەرەوە هێنراو (المستوردة) سەرژمێر (النفوس)، سەربازی (التجنید)، پۆستە (البرید)، بەیتاڵی (البیطرة)، خەستەخانە، ئازووقە (الاستهلاك)، خوێندنگای کوڕان، خوێندنگای کچان، باڵبازخانەی دەربەندی بازیان، باڵبازخانەی دەربەندی باسەرە.
* لەلادێی ئەغجەلەردا ئەم دەسگایانە هەن: کارگێڕی لادێ (مدیریة الناحیة) بابەتانی لە دەرەوە هێنراو، نەخۆشخانە، سەرژمێر، فەرمانبەری بنکەی باڵباز، باڵبازخانەی عەسکەر، خوێندنگای کوڕانی ئەغجەلەر، خوێندنگای کوڕانی عەسکەر.
* لە ناوچەی سەنگاویشدا ئەم دەسگایانە هەن: کارگێڕی لادێ، فەرمانبەری بنکەی باڵباز، باڵبازخانەی سەگرمە، فەرمانبەری گومرگی مەملەحە، نەخۆشخانە، خوێندنگای کوڕانی گۆیتەپە.
* لە هەموو ناوچەی چەمچەماڵدا (١٢٠) باڵباز هەیە.
* پەیاە ناردن لەناو ئەم سێ لادێییەدا بەهۆی (هەلیۆگراف)ەوە پێکدێت، کە لە چەمچەماڵ، باسەرە، سەنگاو، سەگرمە، خاڵخالان و، ئەغجەلەردا ئێستگەیان بۆ دانراوە. پۆستەیش لە ناوەند ئەو شوێنانەدا بەهۆی باڵبازەکانەوە دەنێررێ.
* ڕێگای ئۆتۆمبیل بۆ ئەغجەلەر و سەنگاو زۆر خراپە. چونکە قیرتاو نەکراون. ئەم ڕێگایانە، تەنیا بەهاوین بەکاردێن. بەلام ڕێگای ناوەند چەمچەماڵ و کەرکووک، یان چەمچەماڵ و دەربەندی بازیان زۆر باشە. قیرتاوکراون، بۆ هەموو دەمێک بەکاردێن.

* بۆ پێکهێنانی هاتوچۆ و گفتوگۆ و پۆستە ناردنێکی باش، بەو بۆنەیەشەوە سەرپەرشتی کردنێکی باشی هەموو ناوچەکە، پێویستە ڕێگای ئۆتۆمبیلی قیرتاوکراو، لە ناوەند چەمچەماڵ و ئەغجەلەر و سەنگاو و باڵبازخانەکانی مەملەحە و عەسکەر و باسەرە و سەگرمەدا بکرێتەوە. هەروەها هێڵی تەلەفۆنیش لە ناوەند ئەم شوێنانەدا بکرێتەوە، لەم بابەتەوە (جێنوشینی چەمچەماڵ) لە کۆششدایە. سا پشت بەخودا.

* هەروەها پێویستە لەم گوندانەیشدا خوێندنگا بکرێتەوە: گورگەیی سەرخاسە، تەوەکوڵ، گۆڕتەپە، چنارتوو، کریچنە، هەشەزینی، خۆڵێن (مەملەحە). لەم بابەتەیشەوە (جێنوشینی چەمچەماڵ) لە کۆششدایە. خودا بکات ئەم ئاواتانەمان بێنەدی.

## پێ بکەنە!...

مامۆستا و فەرمانبەری دەستە

* مامۆستا: ئەمە چەند مانگە تێپەڕین و هێشتا ئێوە پەتووەکەمتان نەداومێ، بیدەم بەخۆمدا. خودا ئاگادارە بەشەو لەسەرماندا خەوم لێ ناکەوێ!.

* فەرمانبەری دەستە: مامی خۆم ددان بگرە بەخۆتدا. ئەوا بۆ چوارەم جار بۆت دەنووسمەوە بۆ کارگێڕی دەستە (قەوین). ئینجا ئەگەر خودا نەخواستە پەتووەکەیان بۆ نەناردیت، پەتووەکەی خۆمت پێدا دەدەم!

سپاڵی هاوینە

* فەرمانبەرێک: کارگێڕی بەڕێز خودا ڕاوێستاوت بکات، ئەوا نیوەی هاوین ڕۆیشت، هێشتا ئێمە خامی سپی و سپاڵی هاوینەمان وەرنەگرتووە، ئاخۆ کەی وەری دەگرین؟

* کارگێڕی دەستە: کوڕم وا دیارە تۆ لە مەبەسی ئێمە تێ نەگەیشتوویت، ئێمە بۆیەکا واتان لێ دەکەین کە هەر پارەتان لەدەست نەچێت. ئەوەیش دیارە: ئیمڕۆ گرانییە. پیاو تا دەست بڵاوی نەکات چاکترە. لەگەڵ ئەمەیشدا ئەگەر، بەبێ کڵۆجە (چاکەت) خۆتان ڕابهێنن و، بەکراس و پانتۆڵەوە بڕۆن بەڕێگادا بۆ خۆتان فێنکترە! ؟...

لای بەیتاڵ تیماری دەکەن

* فەرمانبەران: ئیمڕۆ پزیشک لە خەستەخانە دەرمانی نەکردین، ناردینیە کن بەیتاڵ تیماری کردین!... ئەی ئەگەر پزیشک خۆی نەخۆش کەوت چی لێ بکەین؟

* جێنوشین: خودا ئاگادارە ئەگەر پزیشک، خۆی، نەخۆش بکەوێت، دەینێرمە لای بەیتاڵخانە، تا مانگێک لەوێ تیماری بکەن!...

ئەگەر ئابڕوویان هەبێ هەرگیز نەخۆش ناکەون

* لە پاش چاککردنی ئاوەکەی سێتەپان، (جێنوشین) لە چاوەشی ئاوی پرسی: «ئاوەکە چۆنی لێ هاتووە؟» (ئیبراهیم تەپل)یش گوتی: «گەورەم! خودا ئاگادارە، ئاوەکە ئەمەندە پاک بۆتەوە، دانیشتووانی چەمچەماڵ، ئەگەر ئابڕوویان هەبێ، هەرگیز نەخۆش ناکەون!؟...».

## هەواڵی چەمچەماڵ

* لەم ڕۆژانەدا سەرۆکی هۆزی پیران لە ناوچەی (ڕانیە) کە ناوی (سوارئاغا)یە هاتبووە چەمچەماڵ. گەلێک ئاو و بای سازگاری چەمچەماڵ و ئاهەنگی حەفتەیی خوێندنگای شەوی چەمچەماڵی بەدڵدا چوو بوو. لەبەر ئەوەی سوارئاغا یەکێکە لەو سەرۆکە زرنگانەی کە پشتیوانیی مامۆستا و شاگرد و خوێندەواری دەکەن، لەلایەن جێنوشین و فەرمانبەرەکانی چەمچەماڵەوە گەلێک نازی گیرا.

* ئاهەنگی حەفتەیی ئەم جارەی خوێندنگای شەوی چەمچەماڵ، لە جاری پێشوو گەلێک بەبەزمتر بوو. ئێمە گەلێک سوپاسی مامۆستا و شاگردەکان دەکەین.

* کاربەدەستی ئابووری عێراق بەڕێز «بابە عەلی شێخ مەحموود» کە بەچەمچەماڵدا تێپەڕی کرد، لە ئەنجامی گفتوگۆیەکدا کە جێنوشینی چەمچەماڵ لە گەڵیدا کرد، بەڵێنی دا کە هەوڵ بدات هاونیشتمانەکانی لادێی ئەغجەلەر، ڕێ بدرێن وەک ساڵان تووتن بچێنن. هیواداریین تا سەری مانگ ئەم ئاواتەمان بێتەدی.

* نووسیار (کاتب)ی لادێی سەنگاو (عەزیز جەمیل)، گوێزرایەوە لادێی (قادرکەرەم). لە جێی ئەو نووسیاری لادێی قادرکەرەم دانراوە بۆ سەنگاو بنێررێت.

* فەرمانبەری سەرژمێری چەمچەماڵ (نازم ڕەفیق) گوێزرایەوە بۆ (تاووق). فەرمانبەری سەرژمێری تاووق (محەممەد دەرویش) گوێزراوەتەوە بۆ سەرژمێری چەمچەماڵ.

* بەپێی هەواڵێک کە جێنوشینی چەمچەماڵ وەری گرتووە لە دانیشتووانی لادێی سەنگاوەوە، کوتاڵ فرۆشەکان دەستبازییان لە نرخی کوتاڵ فرۆشتنەکەدا کردووە. لەسەر ئەوە جێنوشینی کەوتووەتەوە پرسشەوە. کوتاڵ فرۆشەکان و کارگێڕی لادێی سەنگاوی کێش کردووەتە چەمچەماڵ. پاشان ئەنجام پیشان دەدەین.

* پانزە چرا کڕران و، لە کووچەکانی چەمچەماڵدا دامەزرێنران.

* خانووەکانی شارەوانیی چەمچەماڵ خراونە کۆڕی فرۆشتنەوە هەر کەسێ دەیەوێ بیانکڕێ بچێتە کن سەرۆک شارەوانی و پەیی خۆی بنووسێ.

* دەست کرا بەتەواوکردنی خانووی یانەی فەرمانبەرانی چەمچەماڵ، بەو سەد دینار پارەیەی کە دانیشتووانی چەمچەماڵ پیتاکیان بۆ کردبوو.

* کوللەیەکی زۆر ڕووی کردۆتە ناوچەکەمان، خودا یارمەتیمان بدات لە ناویان بەرین.

## هەواڵی دەرەوە

* جێنوشینی چەمچەماڵ لەسەر خواستێکی فەرمانڕەوایی کە لە کەرکوکەوە کراوە، پێویستی ناوچەکەی بەدروستکردنی خانوو و ڕێگا و پرد و ڕاکێشانی هێڵی تەلەفۆن و گەلێک شتی تر پیشان دا. ئەمەی ئامادەییەکە بۆ پێکهێنانی (فرمان دە ساڵی)یەکە، کە لە ڕۆژنامەی پێشوومانا گوتبوومان فەرمانڕەوایی عێراق خەریکی سازکردنێتی.

* نزیکەی (۳۰۰۰) ڕەنجبەر و کرێکاری هاوبەشی (شرکە)ی نەوتی کەرکوک ئەمە (۱۲) ڕۆژێکە مانیان گرتووە فەرمان ناکەن. داوای ڕۆژانە و مووچەیەکی زۆرتر دەکەن لە هاوبەشی نەوتەکە. کاربەدەستی ئابووری عێراق بەڕێز (شێخ بابەعەلی) بەسەرۆکی کرێکارەکانی بەڵێن دابوو (لە بریتی فەرمانڕەوایی و هاوبەشی نەوتەکە کە تا چەند ڕۆژێکی تر ڕۆژانەی کرێکاریان لە (۸۰) فلسەوە بۆ دەگەیێنرێتە (۳۲۰) فلس. ئامۆژگاریشی کردبوون کە بچنەوە سەر فەرمانی خۆیان و، ئیتر لەمەندە زۆرتر پەکی کاروباری (هاوبەشی)یەکە نەخەن. بەڵام کرێکارەکان بەگوێیان نەکردبوو. ڕۆژی هەینی ڕابردوو کە بەر ۱۹٤٦/۷/۱۲ کەوتووە، خۆپیشاندانێکیان بەرپا کردبوو، لە ئەنجامی دەمەقاڵی و چەقەچەقی ناوەند کرێکارەکان و باڵبازەکاندا بووبووە تەقە، جێی داخە کە گەلێک لە کرێکارەکان کوژراون و برینداركراون. لەبەر ئەوە پرسشی دەسگای باڵباز و دادگاهی سزاخکردن و پرسین لە گەرمەدایە. لەگەڵ ئەمەیشدا کرێکارەکان هێشتا نەچوونەتەوە سەر فەرمانەکانیان. خودا ئەنجامی ئەمە بەچاک بگێڕێ.

* پزیشک (نۆلدفێلد) کە تەمەنی لە سەد ساڵ تێپەڕی کردووە و هێشتا تەندروستە، نووسیویەتی دەڵێ: «ئەگەر دەتەوێ ژینێکی پڕ شادمانی و تەمەندرێژی بژیت، پێویستە گۆشت نەخۆیت. سەوزە و میوە زۆر بخۆیت. کەم ئاوات بیت. لە ژینتدا خوازۆڵۆک نەبیت. چاو لە پیاوچاکان بکەیت. شت نەگریتە دڵ. فەرمان بەگۆرانی گوتن و خۆشەویستییەوە بکەیت. دڵسۆزیش بیت بۆ کەسانی تر و، تا دەیشتوانیت بۆیان چاک بیت».

* منداڵێکی (۱۳) ساڵەی ئەمەریکایی لە دەنکەداری ددان ئاژنین نموونەیەکی (قوللەی ئیفیلی فەرەنسە)ی دروست کردووە. لەسەر ئەو هونەرمەندییەی پاداشتێکی زۆر نایابی پێ بەخشراوە. ئەم نموونەیەی بەسێ مانگ تەواو کردووە، بەڕەنگێ کە هەر ڕۆژە سێ سات فەرمانی تێدا کردووە. نموونەکەی لە (۱۹) کەرت پێکهێناوە، پاشان ئەم کەرتانەیشی پێکەوە نووساندووە. بۆ تەواوکردنی ئەم قوللەیە (۳٦.۰۰۰) دەنکەداری ددانئاژنینی بەکارهێناوە. دە سەیری زیرەکی و کۆششی منداڵانی ڕۆژئاوا بکەن!...

## نەخوێندەواری و ڕزگاربوون لە دەردی

نووسینی: نەجات عومەر

نەخوێندەواری دەردێکی گران و بێ ئەمانە، دووچاری هەرچی گەلێک بوو ڕەگ و ڕیشەی دەردەهێنێ و، لە ژیان و ڕابواردنی خۆشی بێ بەش دەکات و، لە کار و کاسبی و پیشەوەری دوای دەخات و، دەبێتە ژێر دەستەی تێگەیشتوو و دانایان. هەمیشە چاوەڕوانی فەرمانی دەستی ئەوانە و لە هیچ کاتێکدا بێ هۆش و بیری ئەوان هیچی پێ هەڵناسووڕێت. گەر سەرنجێکی گەلە پێشکەوتووەکان بدەین، بەجوانی دەچێتە بیرمانەوە کە هۆی بەرزی و خۆشگوزەرانییان هەر خوێندن و هەوڵ و کۆششیانە. دواکەوتنی ئێمەیش لەبەر ناتەواوی ئەم شتانەیە. جا بۆ ڕزگاربوونی وڵاتەکەمان کردنی ئەمانە بەپێویست دەزانرێ:

١- کردنەوەی خوێندنگای ڕۆژ لە هەموو ناوچە و دێیەکدا بۆ نەوەکانمان.

٢- دانانی خوێندنگای شەو بۆ ئەو گەنجانەی کە لە تەمەنی چواردە ساڵی تێپەڕبوون و فێری خوێندن نەبوون.

٣- دانانی کۆمەڵی ڕزگاری وڵات لە پەنجەی نەخوێندەواری. ئەم کۆمەڵەیش پێویستە چوار کەس بێ: موعەللیمێک، مۆزەفێکی سەحی، مرشدێکی زراعی، کوێخا دێ. کە هات و ئەم شتانە لە ناوچەکەتاندا کرانەوە یان گەنجە نەخوێندەوارەکانتان، یان خۆتان ئایا بەچوونە خوێندنگای ڕۆژ بێ یان بەهی شەو، ئایا بەگوێ ڕاگرتن بێ لە ئیرشاداتی کۆمەڵی ڕزگاریی وڵات لە دەستی نەخوێندەواری، هۆش و بیرتان وریا بکەنەوە بۆ ئەوە ئەم بەڵایە بەربەست بکەین و بچنە ڕیزی گەلە پێشکەوتووەکان و، بەم هۆیەوە چرای ئازادی لە وڵاتەکەماندا هەڵکەین، تاکو لەم دیلی و دواکەوتنە ڕزگار بین.

## پرسە و پێت بڵێم

* جەوهەر کەریم: ناوی خواردنەوەکەمان کە لە دێی مزەفەرەوە دێت زۆر ناسازە. بەپێی تاقیکردنەوەی ساڵانی پێشوو، هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لەم ناوچەیەدا هەر ئەوەیە. تکا دەکەین لە جیاتی ئەم ناوە، ناوی (مەقان) بەکاربهێنرێت باشترە.

* ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: لەوە دڵنیابن کە ئەم خواستەتان جێبەجێ دەبێت. چونکە (جێنشینی چەمچەماڵ) بۆ ئەم مەبەسە لە مێژدوە بەرزکی پارێزگاری کەرکوکی گرتووە کە ئەندازیارێک بنێرێت بۆ چاککردنەوە و سازکردنی ئەستێرک و بۆری و سەرچاوەی ناوەکە. جا هیواداریین کە زوو پێک بێت.

* وەستا ڕەشید خورشید: بنکەی ناوچەی چەمچەماڵ بەتایبەتی و دێیەکانی بەگشتی نەخۆشی داگیری کردووە. تکا دەکەین بۆ بەربەستکردنی، چاودێرییەکیان لەلایەن خەستەخانەوە زۆر بەپێویست دەزانرێت.

* ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: لەم ڕووەوە ئامۆژگاریی نەخۆشەکان دەکەین کە زوو زوو بچنە لای پزیشک تا تیماریان بکات. خۆ ئەگەر نەخۆشییەکی کاریگەریش داکەوتووە، ئەوا پێویستە تێمان بگەیێنن، تا پزیشک ڕەوانە بکەین بۆ ئەو دێیانە.

* کەریم تۆفیق: باخچەکانی شارەوانی لە فەوتاندان. پاراستنیان لە گەرد بەجوان دەزانین.

* ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: لەم ڕووەوە پارە لە لەنگەرسازیی (مـیـزانیـة) شـارەوانیـدا دانرابوو، بەڵام پارێزگـاری کـەرکـووک ڕێی نەدا ئەو پارەیە بۆ پەرژین کـردنی ئەو باخـچـانە بەخت بکرێ. هەروەها باخەوانێکـیـشـیان دەرهاویـشـتـبوو. دیارە کە باخەوانێک هەر ئەمەندەی پێ دەکرێ. لەگەڵ ئەمەیشـدا، شارەوانی خەریکی بەدیهێنانی ئەم ئاواتەتانە. هیوادارین کە ئارەزووەکەتان پێک بێت.

* مەحموودی کاکەخان: شەکر و چا لە هەرزانیـدایە. کەچی نرخی چایی لە چایخانەکاندا هەر بە(١٢) فلس و (١٤) فلـسـە.

* ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: ئیمرۆ (جێنوشینی چەمچەماڵ) فەرمانی بەچایخانەکان دا کە لەمەودوا چایەک بە(١٠) فلـس زۆرتر نەفرۆشن. تەکایە هەر کـاتێ چایخانەکـان لەم نرخە زۆرتریان سـەند، ئاگادارمان بکەن، تا داوای سزادانی چایچییەکان لە (جێنوشینی) بکەین.

***

# چەمچەماڵ

ژمارە: (٤)
ڕۆژ: ١٩٤٦/٧/٢٢

## ڕەوشت و خوو

نووسینی: نەجات عومەر

پیشـەی ڕەوشت لەلایەن هەندێ زانا و تێگەیشـتـووەکانی ئیـسـلامەوە وا دانراوە: هەرچی کردەوەیەک، ئایا باش بێ یان خراپ کـردن و پێکهێنانی بەهۆی ڕەوشـتـەوەیە. کەوابوو ئەگـەر هات و دەوڵەمـەندێک ناچاربوو و، خـرایە ژێر بارێکی زۆر لێکراوییـەوە، کـە شـتـێک لە سـامـانەکـەی ببـەخـشـێ بەهەژار و لێقەوماوانی گەلەکەی بەو کـەسـە ناگوترێت ئەخلاق سەخی، چونکە پلەی ئەخلاقەکەی نەیهاوێشـتۆتە سـەر ئەوەی ئەم ئیـشـە باشە بکات. بەڵام لەلایەن دانایانی غەیری ئیـسـلامەوە وا ناوبراوە: کە ئەمە پیـشـەیەکی نەفسی داپۆشراوە و، ڕەگی لە خوێنی مەردومدا داکوتاوە و، هەموو کردەوەیەک بەبێ لێکۆڵینەوە و خۆ ئازاردان لەوەوە ڕوودەدات. جا ئەمەیش یان (وراثی)یە یان وەرگیراوە.

ئەخـلاق: علمـێکی بەرز و بەنرخـە، ئەگـەر هات و لە ڕێی چاکەدا بەکـاربهێـنرێت. ئەو شـتـەی کـە ناوونیـشـانی ئیـنـسـانی پێ بەرز دەبێتەوە هەر ڕەوشت و کردەوەی باشە. نە لەشی زل، نە مـاڵی زۆر، نە علمی بەرز، کـە ئەخـلاقی چاکی لەگـەڵدا نەبوو، بەکـاری هیـچ نایەت. ئەگـەر هات و خـوێندەوارێک علمەکەی لە ڕێگەی بێ ئەخلاقی و خراپەدا بەکارهێنا، ئەوا بەری خوێندنەکەی لێ دەبێتە مار و لە خۆی و لە خێزانەکەی دەئاڵێت. هەروەها پیـاوی دەوڵەمەند و بەهێزیش کە هات و ئەخلاقی خاوێنی نەبوو، هەرگیز ئەو پیـاوە ڕووی لە نزمی و ناخۆشی دەبێت. پێغەمبەر فەرموویەتی: «خودا تەماشای ڕەنگ و ڕوخـسـار و سـامـانتان ناکات. تەماشای دڵتان دەکات»، ئایینەکەیـشـمان بەجوانی بۆمان دەردەخات کە مایەی پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی ئادەمیزاد هەر خوو و ڕەوشتی باشە. کە هات و گەلێک، هەموویان،

دووچاری نەخۆشی بێ ئەخلاقی بوون، بێگومان ئەو نەخۆشییە لە ماوەیەکی کەمدا دەبێتە مایەی فەوتان و رزانیان. ئەمەیش شتێکی ئاشکرایە کە نەخۆشی لەش لە هەر کەلێکدا بنجی داکوتا، ئەو گەلە پێویستی بەپزیشک زۆر هەیە. تا بەسایەی ئەوەوە ئەو نەخۆشییەی بەربەست بکات. هەروەها ئەگەر جەردەیی، تالان کردن و، پیاوکوشتن و، داوێن پیسی و، دوودڵی لە گەلێکدا ریشەی داکوتا، هەمیشە ئەو گەلە پێویستی بەوەرگرتنی (دەرسی ئەخلاق) هەیە، تا بەو هۆیەوە لەو کردەوە خراپانەی رزگاری ببێ و بچێتە ریزی گەلە پێشکەوتووەکانەوە و بکەوێتە ژینێکی پڕ سەربەستی و کامەرانییەوە.

## ژینی تایبەتی

### خانوو

مامەی لادێیی! پێشینان گوتوویانە «شتی گران هەرزانترە لە هەرزان». جا لەبەر ئەوە ئەگەر خودا دەستی دایتێ، بەم خانووە تاریک و نووتەکەی بنمیچ نزمەی تەسک و تووروسکەی چڵکن و پڵکنەی دڵتەنگ کەرەت واز مەهێنە. بیروخێنە. چونکە بەکەڵکی ئاژاڵیش نایەت. لە بریتیی ئەوە خانوویەکی وەها دروست بکە کە خۆت و خێزانت دڵخۆش و گەش بکات و، لە نەخۆشی و پیسیت دووربخاتەوە. جا ئەگەر بەقسەت کردم، وەها برۆ بەرێوە:

١- وەستایەکی شارەزا بهێنە، شوێنێکی وەها بۆ خانووەکەت بدۆزێتەوە کە بارەش و گێژەڵووکە نەیگرێتەوە. یاخود کەم بیگرێتەوە. تەرتووشیی لێ دووربێ، زۆنگ و زەلکاو و سەرەزەیش لێوەی نزیک نەبێ. دووربێ لە خانووی ماڵە دراوسێکانەوە، نزیک ئاوی پاک بێ.

٢- بۆ خواردن، بۆ نوستن، بۆ چێشت لێنان، بۆ خۆشتن، بۆ سەراو، بۆ میوان، بۆ کەلوپەل، بۆ دەستپێوەند، بۆ رابواردن بۆ گیانلەبەری سواربوون، بۆ هەریەکە ژوورێک دروست بکە. بێجگە لەوە بام لە خانووەکەتدا گۆرەپانێکیش هەبێ.

٣- بام ژوورەکانت بلند و فراوان بن، پەنجەرە و دەرگای گەورەیان تێبخە، تا تێر رووناکی و بایان تێ بێت.

٤- بنمیچەکان یان بەچینکۆ یاخود بەتەختە داپۆشە، بام تۆز و خۆڵ بەسەر کەلوپەلەکانتدا نەیێتە خوارێ، پیسیان بکات.

٥- ئەردی ژوورەکان یان بەچیمەنتۆ، یاخود بەکسل و گەچ و بەرد، یاخود بەخشتی سوور بتەنە، بام مار و مێروو لە کون و قوژبنی درزەکانیاندا جێگیر نەبن و، بتوانیت هەموو دەم ناوماڵەکەت بەپاکی و خاوێنییەوە رابگریت.

٦- دیواری ژوورەکان و پەنجەرە و دەرگاکان بەرەنگ و رۆنی جوان و پەسەند رەنگاورەنگ بکە، با خۆت و ماڵ و منداڵت دڵتان بکرێتەوە.

ماڵ ڕازاندنەوە

١- لەسەر ئەرد دامەنیشە و مەنوو. چونکە پشتت دەکۆمێتەوە، لەشت ماندوو دەبێ، چاوت کزدەبێ، نەخۆشیت پێ دەگات، لەسەر کورسی دابنیشە و لەسەر تەختیش بنوو.

٢- هەروەها ماڵەکەت بەمێز و تەپڵەکیش بڕازێنەرەوە، بام باشتر بحەسێیتەوە.

٣- کەلوپەل و مەسینە و چێویتە و بلوورەکانت لەناو سندووق و دۆلابدا دابنێ، بام جروجانەوەر و مێش و مەگەز پیایاندا هەڵنەگەڕێت و تۆزیشیان لێ نەنیشێت.

٤- ژووری دانیشتن و میوانت بەوێنەی جوانی ڕەنگاوڕەنگ بڕازێنەرەوە، بەڵام وریابە، وێنەکان هی نیشتمانەکەی خۆت و هی پیاوە گەورەکانی نەتەوەکەی خۆت بن، یاخود هی ئەو پیاوانە بن کە بەکەڵکی هەموو نەتەوەیەک هاتبن.

(لە ڕۆژنامەی خورماڵ وەرگیراوە)

## پێ بکەنە!...

پاڕانەوەی (کفر ئەحمەد)

(کفر ئەحمەد) مانگایەک و کەرێکی دەبێ، ڕۆژێک لە ڕۆژان مانگاکەی نەخۆش دەکەوێ. دڵی پێی تەنگ دەبێ. دەست دەکات بەپاڕانەوە لە خودا دەڵێ:

«خودایە کەر و مانگاکەم مەکوژە. ئەگەر هەر دەیشکوژیت، کەرەکەم بکوژە».

کەچی کە بەیانی لەخەو هەڵدەستێت، تەماشا دەکات مانگاکەی تۆپیوە!... ئەویش ناکاتە نامەردی، دەچێتە بازاڕ کوێرێک دەدۆزێتەوە و، دەیباتە ماڵەوە ئینجا دەستی کوێرەکە دەخاتە سەر مانگاکە و پرسیاری دەکات، دەڵێ: «ئەمە چییە»؟

کوێرەکە دەڵێ: «ئەمە مانگایە».

ئینجا (کفر ئەحمەد) دەستی کوێرەکە دەخاتە سەر کەرەکە، لێی دەپرسێ دەڵێ: «ئەمە چییە؟». کوێرەکە دەڵێ: «ئەمە کەرە»

(کفر ئەحمەد)یش کە ئەوە لە کوێرەکە دەبینێ، دەدات بەتەپڵی سەری خۆیدا و ڕوو دەکاتە ئاسمان، دەڵێ: «خودایە ئەم کوێرە بەکوێریی خۆیەوە زانی کامیان کەرە و کامیان مانگایە، ئەی تۆ بۆچی بەو هەموو چاوانەوە کە هەتە، لە جیاتی کەرەکە مانگاکەت کوشتم!...».

بام مەلا نوشتەت بۆ بکات

(نەخۆشێک): بەگم! ئێستا چوومە خەستەخانە. لە جیاتی ئەوەی پزشک، خۆی، نەخۆشییەکەم بدۆزێتەوە، لە خۆمی دەپرسی: چیتە؟ دوایی ناردمیە لای تیمارکەر، ئەو سەیری نەخۆشییەکەی کردە. تیمارکەریش ناردمیە لای دەرگەوانەکە چاکم بکاتەوە.

دەرگەوانیش نەیکردە نامەردی لای بەیتاڵ تیمارم بکات. ئەی خودا ئەمە باری ژیانمانە، کە نەخۆش کەوتین ڕووبکەینە کوێ؟!...

(جێنوشینی چەمچەماڵ): لە هەمووی چاکتر ئەوەیە بچیتە لای مەلا، نوشتەت بۆ بکات و، بشچیتە سەر گۆڕی یەکێک لە پیاوچاکەکان. جا هەتا پزیشک ڕەوانەی نەکردوویت بۆ لای ئەم دووانە، بەخۆشیی خۆتەوە بچیتە لایان چاکترە!؟.

چاو ژان دەکات زمان چی بکات؟

پزیشک: ئەوە چیتە کوڕم؟

نەخۆش: بەگم! چاوم ژان دەکات.

پزیشک: ئازمانت دەربکە، بزانم نەخۆشییەکەت چییە؟

نەخۆش: من پێت دەڵێم: «چاوم ژان دەکات»، تۆ پێم دەڵێیت: «زمانت دەربکە»... چاو ژان کردن چ پەیوەندییەکی هەیە بەسەر زمانەوە؟!

بەخودا بەگم پزیشکی چاکیت. خودا لە ئێمەت نەسێنێ!؟.

## کۆمەڵایەتی

### ئەریمان و کاک ئەوڵای باوکی

نووسینی: عەونی کاکە

(کاکە ئەوڵا) لە یەکێک لە گوندەکانی سەنگاودا دادەنیشت. لە تەمەنی حەوت ساڵییەوە بووبوو بەدەرویشی شێخێک. ئەوەیش لە کاتێکدا ڕووی دا، کە (شاسوار)ی باوکی بردبووی لەگەڵ خۆیدا بۆ چاوپێکەوتنی ئەو شێخە. لە پاش مردنی باوکی (کاک ئەوڵا) زۆر هاتوچۆی شێخی دەکرد و، کەڵکیشی پێ دەگەیاند. لەبەر سستی خۆی، لە ڕاوە ڕێوی بەو لاوە هیچ کارێکی پێ نەدەکرا. دەچوو کەوڵەکانی دەفرۆشت و، نرخەکانیانی دەبرد بەدیاری بۆ شێخ. (ئەریمان)ی کوڕی ڕۆژێک لە (کاک ئەوڵا)ی باوکی پرسی: «بابە تۆ لەم هاتوچۆیەت بۆ لای شێخ چیت دەست دەکەوێت؟». ئەویش وەرامی دایەوە گوتی: «ئەمەندەم بۆ ماوەتەوە کە هیچ بۆ سامان پێکەوەنان خۆم نەپرووکاندووە. بەڕاستی لە سایەی شێخەوە ڕەنجم بۆ ئێرە نەداوە، ئیتر ماوەتەوە ئێوە و خۆتان».

(ئەریمان)یش لێی پرسییەوە، «ئەی من لە پاش مردنی خۆت چ چاکەیەک لە پێناوی تۆدا بکەم؟». باوکیشی پێی گوت: «من تێشووی خۆمم لە پێش خۆمەوە ناردووە!».

ئینجا (ئەریمان) پێی گوت: «هەر چیت هەبوو، هەموویت دەرخواردی شێخ دا!».

(کاک ئەوڵا)یش تووڕە بوو گوتی: «بەڕاستی تۆ زۆر هەرزە گۆیت. وا چاکە ئیتر هیچ ڕەنجێکتان بۆ نەدەم!». کاک ئەوڵا ئەمەی گوت و ئیتر ڕۆیشت بۆ ماڵی شێخەکەی. کەچی بەیانی هەر لە خۆیەوە گورج گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی!... کە چاوی بە(ئەریمان)ی کوڕی کەوت، پێی گوت: «ڕۆڵە! بەخودا شێخ نانەکی

دەرچوو!». (ئەریمان)یش گوتی: «ئەی بابە! تۆ تازە بەوە دەزانیت؟» (کاک ئەوڵا)یش وەرامی دایەوە گوتی: «تازە لە دەستم ترازا و ڕابوورد!».

جا ئەم پەندە هەر لە منداڵییەوە ئەریمانی خستە سەر کرد و کۆشش و فەرمان کردن و ڕەنجدان، کە لە ئەنجامدا مێگەلێک مەڕی دوو هەزار سەری و سامانێکی بێ شوماری دەستکەوت. تا ما بەخۆشی و شادمانییەوە ژیا و گوزەرانی کرد. بێجگە لەوە ڕێی باشیشی بۆ وەچەکانی خۆی بەجێهێشت. ئیتر ئەوان نەکەوتنە هەڵەوە وەک ئەوڵای باپیریان و شاسواری باپیرە گەورەیان، شێخ بیانچەوسێنێتەوە.

## هەواڵی چەمچەماڵ

* شەوی سێ شەممەی ڕابردوو ئاهەنگێکی حەفتەیی لەلایەن مامۆستا و شاگردەکانی خوێندنگای شەوییەوە گێڕرا، بۆ ڕابردوومان و تەماشاکردن جێنوشینی چەمچەماڵ و گەلێک فەرمانبەران هاتنە خوێندنگاکە. ئاهەنگەکەی پڕ بەزم و خۆش دەرچوو.
* یەکێک لە شەکر فرۆشەکانی ناوچەی چەمچەماڵ هەندێک فروفێڵی لە چاییەکەیدا کردبوو، جێنوشینی چەمچەماڵ بڕیاری دا بچێتەوە کەرکوک چاییە ناپوختەکەی لەلای بازرگانی کۆمەڵە (تاجر الجملة) بگۆڕێتەوە. خۆ ئەگەر هات و فروفێڵی خۆی دەرچوو، ئەوا جێنوشین لەسەر ئەوە سزای پێویستی خۆی دەداتێ.
* جێنوشینی چەمچەماڵ دەستی کرد بەخەملکردنی دەغڵودانی جووتیارەکانی ناوچەی چەمچەماڵ. لەبەر ئەوەی زۆر بەدڵسۆزییەوە دادیان دەپرسێت، بەدڵەوە هەموو چەمچەماڵییەکان سوپاسی دەکەن.
* لە لادێی (قادرکەرەم)ەوە (ڕەشید ئاغای گۆڵباخ) لەگەڵ چەند ئاغایەکی تری هۆزی زەنگەنەدا بۆ دیدەنی جێنوشینی چەمچەماڵ هاتنە بازێڕی چەمچەماڵ. لەبەر ئەوەی لە ڕیزی سەرۆک هۆزە دڵسۆزەکانی کورد دەژمێردرێن لە کانگای دڵمانەوە خۆش هاتیان لێ دەکەین.
* لەم ڕۆژانەدا کووتاڵ فرۆشەکان پاشماوەی کووتاڵەکانیان هێنایە ناوچەکەمان. ئەوانەی لە جاری پێشوودا بەشی خۆیان وەرنەگرتبوو ئاگاداریان دەکەین، بێن بەشی خۆیان لەو کووتاڵە وەربگرن.

## ئەمە مەتەڵە و بیدۆزنەوە!

* ناوی، دێیەکە، لە ناوچەی چەمچەماڵدا ژمارەی پیتەکانی حەوتە.
  پیتی: (١، ٢، ٣، ٤، ٥)ی واتاکەی گەورەییە.
  پیتی: (٣، ٢، ٤، ٥)ی واتاکەی بانگ کردنە.
  پیتی: (٣، ٢، ٧، ١، ٤، ٥)ی چەشنە لێ سەندنێکە.
  پیتی: (٦، ٧، ٤)ی لە هەموو نووسراوێکدا هەیە.
* ئەمە چییە؟: قەڵای گەچین ڕێ نییە تێی چین.
* (پاداش):

هەر کەسێک لە شاگردانی خوێندنگای شەوی ئەم مەتەڵانە هەڵبهێنێ، یەکەمەکەیان (نووسراوێکی کوردی)ی پێ دەدرێت.

## هەواڵی دەرەوە

* لەم ڕۆژانەدا کاربەدەستی کاروباری ناوخۆ و، کاربەدەستی کار و فەرمان و گوێزانەوە و، کاربەدەستی کاروباری کۆمەڵایەتی هاتنە کەرکووک و داخوازییەکانی کرێکارەکانی هاوبەشیی نەوتی کەرکووکیان بەجێ هێنا.
* هاوبەشییەکی بازرگانی کە لەسەر دەستی (عەلی کەمال و جەمیل مەدفەعی) و چەند کەسێکی عێراقی تر و (مەنسور فەهمی پاشای میسری)دا هەڵدەسووڕێت خەریکن شاری (بەغدادی تازە) لە وێنەی (میسری تازە)، لە نزیک شاری بەغدادی ئێستەوە، لە شوێنی (تل محمد)دا دروست دەکەن. دەسمایەی ئەم هاوبەشییە گەیشتۆتە یەک ملیۆن دینار.
* میری بڕیاری داوە ئاوی پاک و خاوێن لە هەموو گوند و بازێڕ و شارەکاندا ڕابکێشێ. بۆ پێکهێنانی ئەم مەبەسەیش داوای چەند ماکینەیەکی ئاوی کردووە، کە لە شاری (لەندەن)ەوە بهێنرێتە عێراق. ئێمەیش ئاوات دەخوازین ناوچەکەی ئێمەیش لەم کارە فەردارە بەشی خۆی دەست بکەوێت.
* لەسەر ئەو گفتوگۆیەی کە جێنوشینی چەمچەماڵ لەگەڵ کاربەدەستی ئابووری عێراق بەڕێز (بابە عەلی شێخ مەحموود)دا کردبووی لە بابەت چاندنی تووتنەوە لە لادێی ئەنجەلەردا، لەم ڕۆژانەدا لەلایەن کارگێڕی تووتن فرۆشی سلێمانییەوە پرسیاری ئەو زەوییانە کراوە کە لەو لادێیەدا تووتنی تێدا دەچێنن، تاکو لەلایەن میرییەوە بڕیاری لەسەر بدرێت.
* (شاکر ئاغای هورمزی) کە کارگێڕی دەسندەی کەرکووک بوو، فەرمانەکەی هەڵگیرا.
* دەنگوباس وایە کە فەرمانڕەوایی لە ١٩٤٦/٨/١٥دا کۆمەڵە کووتاڵێکی تر دابەش دەکات بەسەر دانیشتووانی عێراقدا، بۆ ئەمەی هەژار و لێقەوماوانیش لەم جەژنەدا بەپۆشتەییەوە بگەڕێن. جا ئێمەیش بەهیوای ئەوەین لەم ڕۆژانەدا کووتاڵ فرۆشەکانمان داوا بکرێن بۆ وەرگرتنی بەشە کووتاڵی ناوچەکەمان.

## پرسە و پێت بڵێم

* نەخوێندەوارێک: منیان کردووە بەئەندامی کۆڕی کاروبار هەڵسووڕاندن. براکەیشمیان کردووە بەئەندامی کۆڕی شارەوانی. هەردووکیشمان ناشی و نەخوێندەوارین، لەم کارانەدا شارەزا نین. هەر ئەوەندەمان لە دەست دێت بڕیار مۆر بکەین. ئێمەیش ئەوە بەچاکتر دەزانین کە جێنوشینی چەمچەماڵ فەرمان بدات لە جێی ئێمە دوو کەسی خوێندەوار دابنرێت.
* ڕۆژنامەی چەمچەماڵ: قسەکەتان لە جێی خۆیدایە. هەوڵ دەدەین دوو کەسی خوێندەواری باش لە جێگاتان دابنرێن.

* خوێندەوارێک: لەبەر ئەوەی ناوچەی چەمچەماڵ بەجۆرێکی تێکرایی لە زۆر بابەتی کشتوکاڵدا شارەزانین ئێمە وای بەباش دەزانین کە لە هەر دێیەکەوە کوێخایەک یاخود تێگەیشتوویەک بێتە چەمچەماڵ، تا لەسەر دەستی چەند فەرمانبەرێکی شارەزادا شێوەی تازەی کشتوکاڵیان فێر بکرێت. ئەویش بۆ ئەمەی جۆرە شینایییەک لەم ناوچەیەدا بلاوببێتەوە.

* رۆژنامەی چەمچەماڵ: هەر کاتێ (رێبەری کشتوکاڵی) چەمچەماڵ فەرمانەکانی خۆی لە کەرکوک تەواو کرد و هاتەوە، ئەم خواستەتان جێبەجێ دەکەین.

***

# چەمچەماڵ

ژمارە: (٥)

رۆژ: ١٩٤٦/٧/٢٩

## کۆمەڵایەتی

چۆن خۆت خۆش دەوێ، خەڵکیشت وەها خۆش بوێ

پێت خۆشە، لە شیرین خەودابیت و بەقاووقیژ و تەقەتەق لە خەو خەبەرت بکەنەوە؟ یان لەبەر دڵی میوان یاخود خاوەن فەرمانێکی ملۆزم خەوت لێ خەوزە بکەن؟ پێت خۆشە، لە گەرمەی خۆش رابواردنێکی خێزانیدا، یاخود هی برا و یاراندا بیت و، لە پڕ یەکێکی نەنگەویست و نەناسراو، بەهەڵمەتە کاسەیی، ئەو کۆڕە خۆشەتان لێ تێک بدات؟

پێت خۆشە کە گفتوگۆ دەکەیت لەگەڵ یەکێکدا، لەولاوە خەڵک هەڵبدەنێ و گفتوگۆکەتان لێ تێک بدەن؟ پێت خۆشە، بەقاووقیژ و دەنگەدەنگ و چەنەبازی سەرەوت لێ بشێوێن و، نەهێڵن لە ماڵێدا، لە چایخانەدا، لە رێگادا، لە سەیرانگەهدا، یان لەهەر شوێنێکدا بین، کامی ژنێکی پڕ ئاسوودەیی و بێ دەنگی و نەرمونیانی بکەیت؟...

حەز دەکەیت بەزۆر شتت پێ بخۆن، بەزۆر بتنوێن، بەزۆر ژنت پێ بهێنن، بەزۆر شتت پێ بکڕن یان پێت بفرۆشن؟ ئەگەر تۆ ئەمانەت پێ خۆشە لەگەڵتدا بکرێت، ئەوا قەی ناکات تۆیش ئەمانە لەگەڵ کەسانی تردا بکە. ئەگەر ئەمانەیشت پێ ناخۆشە لەگەڵتدا بکرێت، ئەوا تۆیش ئەم جۆرە شتانە لەگەڵ هیچ کەسێکدا مەکە.

سەربەستی لە خەڵک بار مەکە. بام خودا سەربەستی لە تۆ بار نەکات. سەربەستی شتێکی ناوازە و تاکانەیە، لەبەر ئەوە هەر وەک سەربەستی خۆت دەپارێزیت سەربەستی کەسانی تریش بپارێزە. تا دەتوانیت لە گفتوگۆدا نەرم و زرنگ و مەندبە. هەر ئەوەندە دەنگ هەڵبڕە کە گوێگرەکانت گوێیان لێت بێ. بەکورتی هەرچی دڵی کەسانی تر نازار دەدات مەیکە. بام کەسانی تر دڵت نازار نەدەنەوە. چونکە

پێشینان گوتوویانە: «کابە برووخێنە و دڵێ مەڕەنجێنە!!».

## هەڵهێنانی مەتەڵەکان

هەڵهێنانی مەتەڵەکانی ژمارەی پێشوو بەم جۆرەیە:

مەتەڵی یەکەم: ناوی گوندە (گەورەدێ)یە.

مەتەڵی دووەم: (هێلکە)یە.

## بۆ ئاگاداری

بۆ خوێندەوارەکانمان

تکایە هەر خوێندەوارێک لە باریدا هەیە وتاری بەکەلکمان بۆ بنێرێت، بینێرێت، ئێمە بەسوپاسەوە بۆی بلاودەکەینەوە.

«ڕۆژنامەی چەمچەماڵ»

## کشتوکاڵ

نووسینی: نەجات عومەر

هەوڵ و کۆشش سەرچاوەی خۆشگوزەرانییە

مامەی لادێیی! بەو ئیشە بچووکەت یاخود بەو ژینە تاڵەی هەتە، واز مەهێنە. ئەگەر لە مەیدانی کشتوکاڵدا هاتیتە کایەوە، تەنیا بەچەشنە شینایییەکەوە خۆت خەریک مەکە. بەڵە زەوییەکەتدا لۆکە، کەتان، کونجی، پەتاتە، نیسک، نۆک، ماش، سەوزەیش بەرهەم بهێنیت. لە جیاتی ئەوەی لە زەوییەکەتدا، یەک ڕەنگ تۆ، لە هەموو ساڵێکدا بچێنیت، بیکە بەنۆرە، هەر ساڵە یەکێک لەو تۆوانەی بۆم ژماردیت بچێنە. چونکە لەلایەکەوە زەوییەکەت پڕ پیت و فەڕ دەکەیت. لەلایەکی تریشەوە بەرهەمی هەموو جۆرە پێشکەش بەخۆت و خێزان و کەسانی تر دەکەیت. لە زەوییە ئاودارە بەپیتەکانتدا هەموو جۆرە دار و درەختێک بڕوێنە، وەک: قۆخ، هەنجیر، هەنار، سێو، قەیسی، ترێ، هەڵووژە، باهیف (بادام)، گوێز، توو، چنار، بی و، ئەو چەشنە دار و درەختانەی لە زەوییەکەتدا دەڕوێت و بەکەڵکی خۆت و نیشتمانەکەت دێت. جا ئەگەر گوێت لەم ئامۆژگارییەی ئێمە گرت. ئەوا خۆت و خێزان و گەلەکەت کەلک لە بەرهەمەکانت دەبینن و بەبەختیارییەوە دەژین.

# ڕەوشت و خوو

### بەرتیل

بەرتیل ئەمەیە کە بەرامبەر بەوەی پێویستییەک بۆ یەکێک بکرێ فەرمانبەرەکە پارە لە خاوەن فەرمانەکە وەربگرێ. ئەوی بەرتیل دەدا و ئەوی بەرتیلیش وەردەگرێ، (یاسا) هەردووکیان بەسزا دەگەیێنێ. ئایینیش هەروەها، هەردوو لایانی، گوناهبار کردووە، خودا لە ڕۆژی دواییدا بەسزایان دەگەیێنێ. ئەوەی ڕاستییە بیڵێم، (بەرتیل) ئێمەی داڕزاندووە، ئەوەندەی نەماوە بڵێم شیرازەی هەموو کار و فەرمانێکمانی هەڵوەشاندووە لە زۆر جاردا وای لێ هاتووە، هەرچی فەرمانێکی کەوتبێتە لای فەرمانڕەوایی جارێ لە پێشدا دەست دەبات بۆ گیرفانی، ئینجا دەتوانێ بڵێت: ئەم فەرمانەم بۆ دەچێتە سەر یان نا. بەڕاستی (بەرتیل) هەڕەشە لە هەموو ژیان و گیان و سامانی هەموو لایەکمان دەکات، سەرەوت و ئارامی لە دڵماندا نەهێشتۆتەوە. بەرتیل دەردێکی کۆنە، تووشی کۆمەڵایەتی بووە. هیچ دەمێک نەبووە، بەرتیل تێدا پەیدا نەبووبێ. هیچ گەل و فەرمانڕەواییەکیش نەبووە و نییە بەرتیلی تێدا نەبێ. ئەوەندە هەیە بەرتیل لەناو هەموو فەرمانڕەواییەکدا وەک یەک بەتین و کاریگەر نییە. کەم و زۆری کەوتووە لە ناویاندا. بەپێی بڵاوبوونەوەی خوێندەواری و پێگەیشتوویی و تێگەیشتوویی بەرتیلیش لەناو ئەو فەرمانڕەواییانەدا کەم بۆتەوە. هەروەها بەپێی ئاسانی و گرانی باری ژیان، یاخود بەپێی هەرزانی و گرانی بەرتیل (کەم) و (زۆر) بۆتەوە. پێویستە ئەوەیش بزانین کە بەرتیل: هەڕەشەکردن و سەرزەنشت کردن، یاخود ئامۆژگاری کردن و لێدان و پێوەندکردن و کوشتن چارەی ناکات. هۆی ئەمەیش ئەوەیە کە بەرتیل لە کزبوونی دڵ و دەروون و بەدخوویییەوە پەیدا دەبێ. دڵ و دەروون و گیانی بەرزیش بەخۆڕایی کز نابن. گرانی و هەژاری و دەستکورتی و گرانیی باری ژیان، لە توانییاندا هەیە زۆربەی مرۆڤ بخەنە سەر ئەوەی بەپێچەوانەی (یاسا) و (ئایین) و (کرداری شیرین)، کاری نابەجێ بکەن، بۆ ئەمەی بژین و گوزەران بکەن، ئینجا لێرەدا بۆ ئەمەی خاوەن کار و فەرمان، کار و فەرمانەکەی جێبەجێ ببێ، دەچێت بەرتیل دەدات. فەرمانبەری میریش دەچێت بەرتیل وەردەگرێت. واتا دەردی هەردوولایان ترسی دەستکورتی و هەژارییە.

ئینجا لەم ناوەدا دەوڵەمەندە گەورەکان و فەرمانبەرە دەوڵەمەندەکان دەمێننەوە کە لێیان بدوێین. ئەمانەیش لەبەر ئەوە بەرتیل وەردەگرن و دەیدەن، کە لەناو کۆمەڵگادا بۆژۆ بوون، یاخود چاولێکەری و بەدخوویی خۆیان خستوونییەتە سەر ئەو خراپەیە. هەر گەل و فەرمانڕەواییەکیش بیەوێ باش بژی، پێویستە چارەی (دەردی بەرتیل) بکات. ئەویش بەم جۆرە دەبێ کە ژینێکی پڕ لە خۆشگوزەرانی و ئاسان بۆ هەموو کەس پێک بهێنرێ، هەر لەدایکبوونییەوە تا مردنی. بەتەنیشت ئەوەیشەوە خوێندەواری، واتا زانست و زانیاری و پەروەردەکردن بەڕەوشت و خوویەکی پاک و جوان و بڵندەوە، لە ناویاندا بڵاو بکرێتەوە. هەروەها دادگاهانی شارەزا و دەسپاک و دڵسۆزیش لە هەموو لایەکی نیشتمانەکەماندا دابمەزرێنرێن بۆ بەرەنگاری کردنی بەرتیل و سزادانی بەرتیل دەر و بەرتیل خۆران، بێجگە لەوانە خەستەخانەیەکی دەروونیش دابمەزرێنرێ بۆ چارەکردنی ئەوانەی بەرتیل دەدەن یاخود بەرتیل دەخۆن!...

## پێبکەنە...

پاراستنی باخچەی شارەوانی

کابرایەک: ئەرێ ئەم باخچەیە تا دێت دار و درەختەکەی لەناودەچێت، شارەوانیش بەم هەموو هەڕەشەکردن و ترسان و پەنگ پێدانەوە کە بەخاوەن مەڕ و ئاژەڵەکانیان دەکات کە مەڕ و ئاژەڵەکانیان بەرنەدەنە ناو باخچەکەوە، هەر چارەیان ناکات، ئەی کەواتە چارە چییە بۆ پاراستنی ئەم باخچەیە ؟!...

کابرایەکی تر: زۆربەی هاونیشتمانەکان بەتایبەتی خاوەن ئاژەڵ و مەڕ و بزنەکان، هێندە زۆردار و کەمتەرخەم و یاسا شکێنن، لە کاتێکدا کە شارەوانی پەرژینیشی بۆ باخچەکە کردبوو، دیسانەوە نەیتوانی زاڵ بێ بەسەریاندا. تا پێیان کرا لە دار و تەلبەندی پەرژینی باخچەکەیان دزی. ئەوانە بەئاژەڵ مەڕ و بزن بەرەڵڵاکردنیش وازیان نەهێناوە، منداڵەکانیشیان دەنێرنە ناو باخچەکەوە پەلوپۆی دار و درەختەکان دەشکێننەوە، بەخودا بەلای منەوە هەر (شارەوانی) باخچەکە بفرۆشێ یاخود لەناوی بەرێ و بیکات بەدووکان و بازاڕ چاکترە، چونکە گەلێک ئەمەندە زۆردار و کەمتەرخەم بێ بۆ گەلکی گشتی شایستەی ئەوە نییە کە شارەوانی باخچە و شتی باشی وای بۆ دروست بکات!؟.

کابرایەکی تر: من چارەم بۆ ئەمە دۆزیوەتەوە. وا باشە فەرمانڕەوایی (باڵبازخانە)یەک لەناو باخچەکەدا دروست بکات و، هەموو دەم بەهێزی یاساوڵ و باڵبازەوە باخچەکە بپارێزێ. ئەی ئێوە دەڵێن چی؟!.

کابرایەکی تر: نە بەخودا ئەمەیش باش نییە. بڕواناکەم فەرمانڕەوایی وا بکات. چونکە تا ئێستا لە هیچ لایەکدا باخچەی شارەوانی بەم جۆرە نەپارێزراوە. ئەمەیش بێجگە لەوە کە بۆ فەرمانڕەوایی دەبێتە بارێکی گران و، پارەیەکی زۆری دەوێ، پاراستنی باخچەکە لەم شێوەیەدا دەبێتە ئەنگی و گەنگییەک بۆ فەرمانڕەوایی و گەلەکەمان.

کابرایەکی تر: نازانم ئێوە چۆن لەم کەینە و بەینەیە دەکۆڵنەوە. ئەی ئەوە فەرمانڕەوایی نییە، باخچەکە باخچەوانێکی هەبوو، لێی سەندۆتەوە؟ چاک هەر ئەوەیە، هەر (شێخ)ێک بەم زووانە مرد، بهێنین، لەناو ئەم (باخچە)یەدا بینێژین. چونکە نەتەوەکەمان ئەمەندە ڕێز لە (شێخان) دەگرن، لەبەر (گۆڕی شێخەکە) کەسیان دەست بۆ باخچەکە نابات!؟.

## هەواڵی چەمچەماڵ

* ئاهەنگی حەفتەیی لەلایەن شاگردانی خوێندنگای شەوی چەمچەماڵەوە لە شەوی سێشەممەدا کە بەر ١٩٤٦/٧/١٦ دەکەوێت گێڕرا، بۆ بینینی ئەم ئاهەنگە کۆمەڵێک لە فەرمانبەرەکانی ناوچەی چەمچەماڵ هاتبوونە خوێندنگاکەمان. لە کانگای دڵەوە سوپاسیان دەکەین.

* ڕۆژی ١٩٤٦/٧/١٥ (شێخ عەبدولکەریمی قادرکەرەم) لەگەڵ کوڕەکانی بۆ چاوپێکەوتنی جێنشینی چەمچەماڵ هاتنە بازێری چەمچەماڵ. ڕۆژی دوایی گەڕانەوە جێی خۆیان. خودا پایەدار و بەرزیان بکات.

* لەلادێی ئەغجەلەردا لە ڕۆژی ١٩٤٦/٧/٢٥دا شەڕە تفەنگێک لە ناوەند چەند دزێک و پیاوێکی خاوەن ماڵدا ڕووی دابوو. لە ئەنجامدا دزێک و پیاوێک بێ گوناه کوژرابوون. چەند کەسێکیش بریندار کرابوون. دەسگای باڵباز کەوتۆتە پرسیارەوە بۆ ئەمەی زۆردار و دزەکان بدۆزرێنەوە و، ڕەوانە بکرێنە بەردەم دادگاه تا سزای خۆیان ببینن.

* یاریدەدەری باڵبازی چەمچەماڵ، (عەبدولسەمەد) گوێزرایەوە یاریدەدەرێتی باڵبازی خاکی هەولێر. لە شوێنی ئەو (حوسێن عەونی) لە خاکی هەولێرەوە گوێزراوەتەوە بۆ چەمچەماڵ.

* شەوی هەینی کە بەر ١٩٤٦/٧/٢٦ دەکەوێت ئاهەنگێکی گەورە لەلایەن شاگردانی خوێندنگای شەوی و ڕۆژی و مامۆستاکانیانەوە گێڕرا، جێنشینی چەمچەماڵ و فەرمانبەرەکان و ژن و پیاوی چەمچەماڵ هاتبوونە سەیری. بەڕاستی ئاهەنگێکی پڕ بەزم و ڕەزم دەرچوو، لە کانگای دڵمانەوە سوپاسیان دەکەین.

* بەبۆنەی مانگی ڕۆژووەوە (جێنشینی چەمچەماڵ) بەدانیشتووانی چەمچەماڵی ڕاگەیاند کە ئیتر دەهۆڵ و زوڕنا، یاخود دەف و تەنەکە، نابێ لێ بدرێن لە کاتی بەربانگ، یاخود پارشێودا، بۆ مەبەستی هۆشیارکردنەوەی ڕۆژووانەکان لە خەو، لە بریتی ئەو شتە پڕوپووچانە کە بابەتی دڕندەیی و مێشک وشکێتی، بام بانگدەری مزگەوت لە بانگی شێوان و پارشێودا بەدەنگێکی خۆش و بڵند بۆ چەند ناوێک بەهەندێک هۆنراوەی ئایینی و پاڕانەوەی چاکە خوازانە لە خودا، ئاواز بەرز بکاتەوە و بخوێنێ، ئینجا لە کاتی خۆیدا بانگی خۆی بدات. واتا ڕۆژووانەکان بەو ئاوازە خۆشە هۆشیار بکاتەوە، بۆ ئەمەی بتوانن فەرمانی ئایینی خۆیان ببینن. جێنشینی چەمچەماڵ لە چەند مەلا و پیاوێکی پەسەند کرد. هەموویشیان دەریانبڕی کە دەهۆڵ و زوڕنا لەگەڵ ئایینی پاکی ئیسلامدا ڕێک ناکەوێ و، بەتایبەتی لە مانگی ڕۆژوودا بەکارهێنانیان گوناهی تێدایە.

هەڵبەت خوێندەوارانی چەمچەماڵ لە بیریان نەچۆتەوە، کە جێنشینی چەمچەماڵ، لە دوو مانگ لەمەوپێشەوە هەر بەجارێک (دەهۆڵ) و (زوڕنا) و (لۆتی گەری)ی لە بازێری جەمچەماڵدا بەربەست کرد. هەروەها (دەف)یش کە زۆرتر ئەوانە بەکاری دەهێنن کە بەناوی ئایینەوە دیانەوێ دەستی ناشی و نەزان و بەسەزمانەکانمان ببڕن، جێنشینی چەمچەماڵ ڕێگەی لێ بەستووە، جا لەبەر ئەوە تکا دەکەین، دانیشتووە بەڕێزەکانی چەمچەماڵ چاویان بکەنەوە و، چاک لە خراپ و، پاکیش لە پیس جوێ بکەنەوە. چونکە ئەوەی ئێمە دەمانەوێ تەنیا کەلک و سوودی ئەوانە.

* دوێنێ یەکێک لە بەندییەکانی چەمچەماڵ لە بەندیخانە خۆی دەرباز کرد. دەستبەجێ باڵبازەکانمان ڕایان کرد بەدوایدا و هونەرمەندانە گرتیانەوە. سەرای چەمچەماڵ پێشاوی نییە. لەبەر ئەوە هەم بەندییەکان و هەم باڵبازەکان کەوتوونەتە ئەرک و ئازارەوە. جا هەڕاکردنی بەندییەکەی دوێنێش لەم

ڕوودەو ڕووی داوە. لە دوو سێ مانگ لەمەوپێشەوە دەسگای باڵبازی چەمچەماڵ، لە فەرمانڕەوایی، داوای دروستکردنی چەند پێشاوخانەیەک لە سەرای چەمچەماڵدا دروست بکرێن، تا جارێکی تر کارەساتی وەک ئەو بەندییە ڕوونەداتەوە.

## پەندی پێشینان

* نان ئەو نانەیە، ئیمڕۆ لە خوانە.
* کە دادپەروەری لە ئارادابوو گورگ و مەڕ پێکەوە ئاو دەخۆنەوە.
* دار هەڵبڕیت، سەگی دز دیارە!
* نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ کوشتیار.
* دەرگای بەدخوویی، گرێژنەکەی شلە، هەر کە پاڵت پێوەنا، زوو دەکەوێتە سەر پشت!...

***

## چەمچەماڵ

ژمارە: (٦)
ڕۆژ: ١٩٤٦/٨/٥

## ڕەوشت و خوو

ترسنۆکیمان!...

کورد کە زۆر بەنازایی بەناوبانگە، لەزۆر شتدا دەردەکەوێ ترسنۆکە! لە ڕاستیدا بەجۆرێکی تێکڕایی کورددوارییەکەمان لە کاروباری شارستانێتیدا ترسنۆکە. هەرە هۆی دواکەوتنیشمان ئەمەیە کە ئەنگییەکی گەورەیە و لەسەرمان نووسراوە. تەماشا دەکەیت گەورەکانمان: واتا سەرۆکی هۆزەکان و دەوڵەمەندەکانمان، کە پیاوێکی تێگەیشتووی خوێندەواری ئەناسیاو بێتە ماڵیان، هێندە ڕێزی لێ ناگرن، نازیشی ناکێشن. بەڵکو ئەوەندەی تفەنگ بەشانێکی خوێڕی بەگوێی ناکەن و یارمەتی نادەن. کەچی بەهەموو تواناییەکیانەوە زمانلووسی بۆ (شایەر) و (لۆتی) و (هەتیوچە) و (بەدگۆ)کان بەکاردەهێنن و، بەجگار یارمەتی و دەستبلاوییان بۆ دەنوێنن! جا کە لێیان دەپرسیت بۆچ ئەمەندە ناشێتی دەکەن؟ دەڵێن: ئێمە لە دەم و زمانی ئەوانە دەترسین. بەڵام خوێندەوار و تێگەیشتووەکان نازارمان نادەن، لێیان ناترسین. ئینجا ئەم ترسنۆکییە، کە لە پیاوە گەورەکانمانەوە ڕوودەدات، بووتە هۆی چاوترساندنی ماوەی دانیشتووانی ناوچەکە و، پەرەسەندنی ژمارەی لۆتی و هەتیوچە و ناکەسبەچە و شایەران. ئەنجامی ئەمەیش بەوە گەیشتووە کە بەدخوویی و چەوتی و بێ ئابڕوویی لە ناوماندا بلاوبۆتەوە. کاشکی پیاوە گەورەکانمان، ئەوەندەی بۆ نازاردانی پیاوی چاک و بەسەزمان خێران، نیو ئەوەندەیش بۆ تەمێ کردن و لەناوبردنی ئەو لۆتی و شایەر و هەتیوچانە ئازا بوونایە.

براگەل! لوتی و شایەر و ناکەسبەچە و هەتیوچە، چی لە دەست دێ لێتانی بکات قسەی هەڵبەستراو و بەیت و بالۆرەی پڕوپووچ نەبێ؟ کە ئێوە خۆتان ڕاست و دروست بن، ئەو تەرحە بەند و باوانە چ کارێک لە ئێوە دەکەن؟...

لە جیهاندا هیچ پێغەمبەر و پیاوچاکێک نەبووە، کە لەلایەن هەزاران هەتیوچە و شایەر و لوتییەوە، قسەی ناشیرین و توانج و پلاریان تێ نەگیرابێ و بۆ هەڵنەبەسترابێ ئایا چییان بەسەرهات؟...

ئایا لە سەرکەوتن و سەربەرزی و خۆشەویستی خودا و مرۆڤیان هیچ کەم بووەوە؟...

## دەسگای دەسندە

لە عێراقدا و بەتایبەتی لە کوردستانی عێراقدا هەموو شتێک بەپێچەوانەی خاکەکانی ترەوە دێتەدی. لە خاکەکانی تردا کە بەبۆنەی شەڕی جیهانییەوە دەسگای دەسندە (تموین) دامەزرێنرا، نەتەوەکانیان کەوتنە خۆشی و ئاسوودەییەوە. هەر کەسە بەئاسانی بەشی خۆی لە کەلوپەل و خواردەمەنی بەردەکەوت، هەر کەسە بەبەشی خۆی -زۆر بووبێ یان کەم- خۆ ڕاهێنا. نە بەرتیل کەوتە ناو ناوانەوە و نە فروفێڵ پەیدابوو، نە بێکەس و هەژار ڕەنجەڕۆ بوو، نە دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار کردی بەتاڵان. بەخۆشی و ئاسوودەییەوە شەڕی گەورەی جیهانییان بردە سەر تەنانەت زۆر شتیش نرخی لە دەدا یەکی نرخی پێش شەڕ بەرزتر نەبووەوە. کەچی لە خاکی ئێمەدا، بەپێچەوانەوە، لە هەر شوێنێکدا، چ لە فەرمانبەر و چ لە کەسانی تر چەند کەسێک بەسەرپەرەی شت وەرگرتن و دەفتەری سەرژمێر دەرهێنانی هەڵبەستراو کوڵێک دەوڵەمەند بوون و، هەزاران بێکەس و هەژارانیش بێ بەش مانەوە لە هەموو شتێک. هەزاران ڕیسوابوون لەسەر کەینەوبەینەی دەسندە. هەزاران سەرگەردان بوون بەهۆی (دەسندە)وە. بەهەزاران و بەکلووریش کارەساتی درۆ و فروفێڵ و زۆرداری و دزێتی و فرۆشتنی نهێنی و گرانجانی لە ناوماندا ڕووی دا. بڕوا ناکەم، داخەکەم، تا چەند ساڵێکی تریش کردەوە و ڕەوشتی بەرز و شیرین لەناوماندا جێی خۆیان بگرنەوە!...

ئەمەیش هەمووی لە ڕووی ئەوەوە پەیدابوو، کە لە سەرەتای کاردا (دەسگای دەسندە) درایە دەست پیاوی شپرزە و نەشارەزا و بەدخوو. ئیتر لەوەدوایش کار لە کار ترازا و بەهیچ هەوڵ و کۆششێک نەخرایەوە سەر باری چاکی و بەکەلکی. بۆ گەلێکی پاشکەوتووی وەکو ئێمە، وای هەڵدەگرت، زۆرتر کاروباری (دەسندە) لە شێوەیەکی گۆترەییدا بکرێ، نەک بەدەفتەری سەرژمێر و تۆمارکاری.. وای هەڵدەگرت فەرمانڕەوایی باڵی بازرگانان و شتفرۆشان ئاوەها نەبەستێ، کە ناچاریان بکات بۆ گوزەرانی خۆیان دەست بدەنە بەرتیلدان و گرانجانی و نهێن فرۆشی. بەڵکو وەک جاران ڕێیان بداتێ بەئارەزووی خۆیان بکڕن و بفرۆشن. بەڵام خۆیشی لە هەموو شوێنێکدا بەرپەرەکانێی لەگەڵدا بکردنایە و، بەهۆی ئەو بەرپەرەکانێیەشەوە، ناچاری بکردنایە بەنرخێکی هەرزان شتومەک بەکەسانی تر بفرۆشن. جا نازانین کەی فەرمانڕەوایی ئەمەی بەبیردا دێ؟!...

# پێ بکەنە!...

گەرمای کەرکووک

* بەگم! ئەم لاپەڕەی کەلوپەل وەرگرتنە کە لە ناوەند من و نووسیاری بەرهەمدا کراوە. پەسەندی بفەرموو وا مرۆی بکە، تا ئیمڕۆ بڕۆم بۆ کەرکووک و لەوێیشەوە بچمە شوێنی تازەم، بۆ (تووزخورماتوو).
* جێنوشین: پێویستە چاوەڕوانی بکەیت تا نووسیاری بابەتی کێشکراوی تووزخورماتوو دێتە ئێرە، لاپەڕەی کەلوپەلت لێ وەردەگرێت. تۆ ناشێ لەگەڵ نووسیاری بەرهەمدا ئەو لاپەڕەی کەلوپەلە بدەیتە دەست.
* نووسیاری بابەتی کێشکراو: کەواتە ڕێم بدە دەچمە کەرکووک، فەرمانی گوێزرانەوەکەم هەڵبوەشێنمەوە. چونکە ئەگەر نووسیاری بابەتی کێشکراویش بێتە ئێرە من (لاپەڕەی کەلوپەل)ی نادەمە دەست، تا فەرمانەکە هەڵدەوەشێنەوە و من لێرە دەهێڵنەوە!.
* باشە من ڕێت دەدەم بچیتە کەرکووک، بەڵام تۆ دوێنێ لە کەرکووک هاتوویتەوە، هەر وا زوو گەرمای کەرکووکت لەبیر چووەوە؟!.

فەرمانی هەڵبەستراو

* شێخی داربەروو: بەگم! توخودا لێم توورە مەبە و، ئەم فەرمانانەیشم زوو جێبەجێ بکە!

جێنوشین: ئەم دوو سکاڵایە کە بەدەست تۆوەن:

١- هیچیان هی خۆت نین.

٢- ئەوانە بۆ کارگێڕی سەنگاو نووسراون. کەچی تۆ بۆ منت هێناوە. ئەگەر فروفێڵیان تێدا نەبووایە لە پێشدا پیشانی کارگێڕت دەدان. ئەگەر تۆ پیشانی کارگێڕت داوە بۆ چ ئەو شتێکی لەسەر نەنووسیوە بۆ من؟

٣- بۆچ خاوەن سکاڵا مۆری سکاڵاکەی خۆی نەکردووە؟

٤- بۆچ پوولی (٤٠) فلسی بەسکاڵانەوە نییە؟

٥- من جاری پێشوو پێم نەگوتیت کەس ناهێڵم فەرمانی کەسێکی تر بکات و، سەرژمێرنامە و سەرپەڕەی وەرگرتنی شتومەکی کەس نادەم بەکەسێکی تر؟ یاشێخ! بۆچ بەگوێم ناکەیت؟!...

* شێخی داربەروو: ها ئەوە نامەی مەلا کاکە (حەمە)ی خزمتە بۆم هێناویت.
* جێنوشین: بگرە ئەوا من لە هەر پێنج گوناهەکەت کە ناوم بردن خۆش بووم و لێت توورە نەبووم. ئەی لەمەت توورە نەبم. کە بەم مانگی ڕۆژووە، بە(شێخ)ێک و (مەلا)یەک، دەتانەوێ فەرمانی هەڵبەستراو و تەڵەکەبازی بەمن بکەن؟!...

## کۆمەڵایەتی

سامانی دەوڵەمەندەکانمان

نووسینی: نەجات عومەر

گەلێک کەس لە دەوڵەمەندەکانمان بەشی زۆری سامانەکانیان لە ڕێی هیچ و پووچدا بەخت دەکەن، بێ ئەوەی سوودێک بەنیشتمانەکەی خۆیان ببەخشن بێجگە لەوە دەیشبنە هۆی لە ڕێ دەرکردن و لەخشتەبردنی گەلەکەی خۆیان. دەچن دەست دەکەن بە(تەکیە) دروست کردن و (خانەقا) دامەزراندن و نان و چێشت بەشینەوە، تەمەڵ و تەوەزەلان لە چوارگۆشەی شارانەوە کێش دەکەن بۆ لای خۆیان. کابرای دەوڵەمەندیش کە ئەوە دەکات و دەبینێ، وا دەزانێت بەپێی ئایینەکەی خۆی گەورەترین چاکەخوازی دەنوێنێ بەرامبەر هەژار و لێقەوماوان. بەڵام ئەمە بەراستی وانییە. چونکە تەکیەکەی مامەی دەوڵەمەند بووەتە هۆی پاشخستنی ناوچەکەی و تەمەڵکردنی گەلەکەی. هەر بەم چەشنە چوارلای نیشتمانەکەمان بەم جۆرە شتانە گیراوە. ئەگەر بێتو ئەو پارەیەی بۆ تەکیە و نان و خوانی داناوە تێیاندا بەخت بکات، بەختی بکات بۆ ڕازاندنەوەی ناوچەکەی خۆی، بەدروستکردنی خانووی جوان و باخچەی پڕ لە دار و درەخت و گوڵ و ڕاکێشانی ئاوی ڕۆشن و هێزی کارەبا و، ئاشی مەکینە و دەستگیرۆیی کارگەران بەهۆی ئەم کار و فەرمانانەوە، ناوچەکەی خۆی دەڕازێنێتەوە وە تەمەڵەکانیش دەست دەکەن بەکار و فەرمان کردن و، بەرامبەر بەرەنجەکەیان و تێکۆشانەکەیان ڕۆژانەکانیان وەردەگرن. بەم چەشنە سوودێکی باش دەبەخشێت بەگەل و نیشتمانەکەی خۆی. ئایینەکەیشمان بەئاشکرا بۆی ڕوون کردووینەتەوە کە بۆ ئەمەی مرۆڤ خۆی و خێزانەکەی بەبەختیارییەوە بژین، پێویستە لە کرد و کۆشش و کار و فەرمانکردن دوانەکەون. کەواتە ئیتر دەوڵەمەندەکانمان لەبەرچی ئەم هەژارانە فێری خوازەڵۆکی و سووکی دەکەن؟. ئەوەندە هەیە ئەم شتانەی لە پێشەوە ناوم بردن بەیەک دەوڵەمەند پێک نایەن. بەڵکو بەیاریدەی هەموو دەوڵەمەندەکانەوە پێک دێن. جا لەبەرئەوەی خاکەکە و گەلەکەی ئێمەیش زۆر دواکەوتوون، ئەوا من ئەمانەم خستە بەرچاوتان. لە جیاتی ئەمەی چەند کەسێک کەلک لە سامانەکانتان وەربگرێت، بام ناوچەکەتان بەگشتی سوودی لێ ببینێت. چونکە ئەوەی بۆ پیاو دەمێنێتەوە هەر ناوە. جا ئەگەر بەقسەتان کردم ئەمە چاکترین ڕێگایە بۆ بەرزبوونەوەی ناو و ناوبانگتان.

## هەواڵی چەمچەماڵ

* شەوی سێ شەمەی ڕابردوو ئاهەنگێک لەلایەن شاگرد و مامۆستایانی خوێندنگای شەوییەوە گێڕرا. جێنوشینی چەمچەماڵ و فەرمانبەرەکان بۆ گوێگرتن و ڕابواردن هاتنە خوێندنگاکەوە زۆر سوپاسیان دەکەین.
* یاریدەدەری باڵبازی تازە (حوسێن عەونی) هاتە سەر فەرمانەکەی، لەپێناو بەکەڵک هاتنی ناوچەکەماندا لە خودا داوای سەرکەوتنی دەکەین.
* لەم ڕۆژانەدا دزەکان چەند ماڵێکیان کردۆتەوە (بڕیوە)، دەسگای باڵبازی چەمچەماڵ زۆ بەپەرۆشەوەیە بۆ بەربەستکردنی ئەم جۆرە کارەساتانە.

* لە ئەنجامی کۆشـشـی جێنوشـینی چەمچەماڵدا، پەنجا تەنەکە نەوتی ڕەش هێنرایە چەمچەماڵ و، دەسگای تەندروستی دەستی کرد بەپرژاندنی بەسەر جۆگەلەکە پیسەکانی ناو ئاواییدا.
* هەروەها بەهۆی هەولی جێ نوشینی چەمچەماڵەوە، فەرمانبەرێکی تەندروستی لەگەڵ دەرمانێکی زۆر گەیشتە ناوچەکەمان، بۆ ئەمەی بەسەر لادێییەکانی ناوچەکەدا دابەش بکرێ و، ئەو نەخۆشییانەی لە گوندەکاندا بلاو بوونەتەوە لەناو ببرێن.
* لەم ڕۆژانەدا چەند کەسێک لە کوتاڵ فرۆشەکانی ناوچەی چەمچەماڵ چوون بۆ هێنانی کوتاڵ، هیوادارین لەم ڕۆژانەدا بگەڕێنەوە و دەست بکەن بەدابەشکردنیان.
* بەر کۆلانەکان ئەوەندە گلێش و پیساییان تێدا لەم ڕۆژەوە هەموو دەم سەرۆکی شارەوانیی چەمچەماڵ (جێنوشین) لەناکاو دێتە ناو کۆلانەکانەوە دەیانشکێنێ، هەر کەسێ بەرماڵی پاک نەبوو، دەینێرێتە بەردەم دادگاە سزای خۆی بدرێتێ. لەبەر ئەوە بەپێویستمان زانی دانیشتووانی بازێڕی چەمچەماڵ ئاگادار بکەین. هیوادارین لە پێناو پاک و خاوێنی بازێڕەکەیاندا یارمەتی شارەوانییەکەی خۆیان بدەن و خۆیان تووشی سزا نەکەن.
* لەم ڕۆژانەدا جێنوشینی چەمچەماڵ لەگەڵ سەرۆکی شارەوانی سلێمانیدا بەتەلەفۆن گفتوگۆی کرد، بۆ ئەوەی ناوچەکەمان لە بەفر بێ بەش نەمێنێتەوە، دوایی بڕیاریان دا هەر ڕۆژەی پێنج تا دەقالب بەفر بۆ چەمچەماڵ بنێرن. لەبەر ئەوە جێنوشین بەفر فرۆشەکانی چەمچەماڵی بانگ کردە لای خۆی، پێی گوتن کە لەمەودا لە بەفرهێنانی خۆیان دوا نەکەون.
* خاوەنی گۆڤاری فورات هاتە چەمچەماڵ بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ جێنوشینی چەمچەماڵدا لە بابەت کرینی گۆڤارەکەیەوە. لە ئەنجامدا چەند کەسێک لە دانیشتووانی چەمچەماڵ بڕیاریان دا ببنە کڕیاری گۆڤارەکەی. جێنوشینی چەمچەماڵ سوپاسیان دەکات.

## هەواڵی دەرەوە

* میری بڕیاری دا: مانگانەیەک بەفەرمانبەرانی میری بدرێ. نیوەی لەم ڕۆژانەدا دەدرێ. نیوەکەی تریشی لە جەژنی قورباندا.
* سەرەک کاربەدەستی ئێران لەم ڕۆژانەدا وازی لە فەرمانەکەی هێنا.
* بەناوی پاراستنی کاروبار و کەلکی خۆیانەوە، ئینگلیزەکان هێزێکی زۆریان لە هیندستانەوەی هێناوەتە شاری (بەسرە)، وا دیارە مەترسییان لە ئێرانییەکانی دەوروبەری (هاوبەشی نەوتی ئابادان) هەیە، کە زیان بەهاوبەشییەکەیان بگەیێنن، تا ئەگەر تەنگەتاوکران، بەو هێزە، هاوبەشییەکە لە ئێرانییەکان بپارێزن.
* فەرمانڕەوایی عێراق بڕیاری داوە کە خانوویەکی باش بۆ (خوێندنگای ناوەندی) لە شاری (دهۆک)دا دروست بکات.
* دانیشتووانی شاری (زاخۆ)، داوای کردنەوەی خوێندنگایەکی تری سەرەتاییان لە فەرمانڕەوایی کردووە.

* لەم ڕۆژانەدا بوومەلەرزەیەکی بەجگار کاریگەر لە بازێری (پێنجوین)دا ڕووی دابوو. لە پاش ئەوە لە ماوەی (٢٤) ساتدا (٣٠) بوومەلەرزەی تر ڕووی دابوو. (٢٤) خانووی بەجۆرێک هەژاندبوو لە کەلکی نیشتەنی خستبوون. دانیشتووانی ئەوێ لە تاواندا چووبوونە ناو باخەکانەوە.

* هەروەها لە (سلێمانی)یشدا بوومەلەرزەیەکی توند ڕووی دابوو.

* لە ناوچەی (شارباژێر)یشدا چەند بوومەلەرزەیەک ڕووی دابوو، بەڵام کەس زیانی پێ نەگەیشتبوو.

* فەرمانڕەوایی عێراق، بۆ بەربەستکردنی (نەخۆشیی لەرزوتا) شارەزایەکی ئینگلیزی لە ئەورووپاوە هێناوەتە بەغداد، ئەویش وا خەریکی ڕێکخستنی کاروبارە، تا بەم زووانە دەست بکات بەنەهێشتنی نەخۆشییەکە، لە هەموو عێراقدا، بەتایبەتی لە بەشی خوارووپدا کە سەرچاوەی ئەم نەخۆشییەیە.

* لە ئەنجامی گفتوگۆیەکی تەلەفۆنیدا، (سەرۆکی تەندروستی خاکی کەرکووک) بەڵێنی دا کە فەرمانبەرێکی تەندروستی بنێرێتە چەمچەماڵ، بۆ بەربەستکردنی نەخۆشیی لەرزوتا (مەلاریا) لە ناوچەکەدا. تا ئێستا (١٣) گوند دەرمانی بەسەردا دابەش کراوە. ئەم فەرمانبەری تەندروستییەیش لە پاشماوەی گوندەکاندا تیماری نەخۆشەکان دەکات.

## گرەوی گۆرانی گوتن

لە شەوی سێشەممەی داهاتوودا ئاهەنگێکی تایبەتی لە خوێندنگای شەوی چەمچەماڵدا لەلایەن (یانەی فەرمانبەرانی چەمچەماڵ)ەوە دەگێڕرێ. تکایە هەر کەسێ دەنگ خۆش و گۆرانی بێژە، لە دوو ڕۆژ لە پێش دەستپێکردنی ئاهەنگەکەوە ناوی خۆی لای (مامۆستا نەجات عومەر) بنووسێ، تا لە شەوی ناوبراودا بێتە کۆڕی گرەوی گۆرانی گوتنەکەوە.

هەر کەسێک لەم گرەوەدا یەکەم دەرچوو، لەلایەن (یانەی فەرمانبەران)ەوە پاداشتێکی (٢٥٠) فلسی دەدرێتێ. تۆ ئاگاداری جاڕ درا.

## ئەمانەمان لا ناخۆشە!...

* کە دەبینین شاگرد کەبابچی و چایچی و چێشتخانە، هەموو چڵکن و پڵکن، بەدەست و پلێکی پیس و پۆخڵ و، دەم و چاوێکی پڕوپووشاوییەوە، خواردەمەنیمان بۆ دەهێنن.

* کە شتێکمان لێ دەقەومێت، یان تووشی نەخۆشی و خەفەتبارییەک دەبین، هەر کەسێ پێمان دەگات، ناسیاو و، نەناسیاو ئەمەندە پرسیارمان لێ دەکەن، هێندەی تر خەفەتبار و، لێقەوماو دەبین.

* کە دەبینین حاجییەکانمان کاتێ لە حەج دێنەوە، دەیانەوێ دەمودەست ئەوەی لە حەجدا بەختیان کردووە، بەگرانجانی لە خوێنی هەژار و داماوانی دەربهێننەوە!...

* کە دەبینین هەندێ کەس بەزۆر خۆی لە فەرمانبەرانی کاربەدەست هەڵدەسوێ و، شانازی بەسەر بێ دەست و هەژاراندا دەکات و، بەفروفێڵ و چاوڕاو، دەستی ئەوانیش و فەرمانبەرەکانیش دەبڕێ.

ژمارە: (٧)

ڕۆژ: ١٩٤٦/٧/١٢

## خودات لەگەڵ بێ

نووسینی: نەجات عومەر

پەردەیەکی ماتی بەری ئاسمانی گرت و، تیشکی ڕووناکی لە (چەمچەماڵ) بڕی. پشکۆ ئاگرێکی بڵێسەدار و بەتین، جەرگی گەورە و بچووکی هەڵقرچاند. فرمێسکی خوێناوی چاوی ژن و پیاوی پڕ کرد. هێزی ئەژنۆی هەمووانی شکاند. ئەمانە هەموو لەو کاتەدا ڕوویان دا، کە گوێزانەوەی جەنابی (شاکر فەتاح) بەگ بیسترا. داخەکەم لەبەر بەدبەختی چەمچەماڵ و خەڵکەکەی، خودا پێی ڕەوا نەبینین کە ئەو گەورەییان بکات و، لەم کاتە پڕ تەنگ و چەڵەمەیەدا لێمانی دوورخستەوە.

غەمگینی و دڵ بریندار‌ی هێزی دەست و بیرمی بڕی تا بتوانم سکاڵای دڵی خۆم و گەلە هەژارە بۆ زاتی ناوبراو بکەم. چونکە ئەو لەو ڕۆژەوەی تەشریفی هاتووەتە ئەم ناوچەیە، بەشەو و بەڕۆژ تێ دەکۆشێ بۆ پێشخستن و خۆشگوزەرانی خەڵکەکەی. (شاکر فەتاح)ی ئیداری، شاکر فەتاحی وڵات و گەلپەروەر، شاکر فەتاحی مەعارفپەروەر، پشتیوانی هەژاران و لێقەوماوان، برا و دڵسۆزی هەمووان، سەرنووسەری ڕۆژنامەکەمان، ئەوا تکا خوازیمان لێ دەکات. جا نازانم بەچ شێوەیەک بەرامبەر ئەم هەموو هەوڵ و کۆششەی سیاسی خۆم و خەڵکی ئەم ناوچەیەی پێشکەش بکەم. لەگەڵ ئەمەیشدا تکام وایە لای یەزدانی گەورە کە هەرگیز دڵشکست و بەنازار نەبێ. هەمیشە هەر لە پایەداری و لەش خۆشی و بەرزیدابێ. ئیتر خودات لەگەڵ بێ، برای گەورە و دڵسۆز و هونەرمەندمان.

## بەدبەختی ڕۆژنامەکەمان

نووسینی: دەستەی نووسەران

بۆ ڕۆژی ڕەش تەنیا چرایەک بوو کە حەفتەی جارێک چەمچەماڵی ڕۆشن دەکردەوە و، تێ دەکۆشی بۆ ورياکردنەوەی بیری لادێیە بەسەزمانەکانمان. لە هەموو شەوێکی سێ شەمواندا، فەرمانبەران و خەڵکی ناوچەکەمان لە خوێندنگای شەویدا کۆدەبوونەوە. بەئاهەنگ و بەزمی خۆش هەموو باسەکانیمان دەخستە مێشکی نەخوێندەوارەکانەوە. بەڵام بەجیابوونەوەی جەنابی شاکر فەتاح بەگ کە سەرپەرشتی ڕۆژنامەکەمانی دەکرد و سەرنووسەری بوو، داخەکەم ئەو چرایەمان کوژایەوە. ئەمەیش لەبەر بەدبەختی و کەساسی گەلە نەخوێندەوارەکانمانە. جا ئێمەیش بەرامبەر بەم هەموو کۆششەی لە کانی دڵمانەوە تکای کامەرانی و خۆشگوزەرانی زاتی ناوبراو دەکەین.

«دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی چەمچەماڵ»

# ڕووناکیی ناوچەکەمان

نووسینی: عەبدولقادر محەمەد

لێیان پرسیم: ئەوە خەڵکی چەمچەماڵ بۆ چ وا ڕەشپۆش و پەشۆکاون؟...

گوتم: براکانم ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ڕووناکی بەخشی ناوچەکەمان لێمان جیادەبێتەوە. گەورە و بچووکی چەمچەماڵ کەوتوونەتە دڵتەنگی و پەستییەوە. چونکە ئەو کۆششەی جەنابی (شاکر فەتاح) بەگ دەیکرد بۆ ئەم گەلە بەسەزمانەمان، هەتا ئێستا هیچ کەسێک وا بەپەرۆشەوە نەبووە. داخەکەم درەنگ دۆزیمانەوە و زوویش ونمان کرد. بەلام بڵێین چی؟... هیچ دەسەڵاتێکمان نییە، ئەوە نەبێ: تکای لەش خۆشی و سەربەرزی لە یەزدانی گەورە بکەین.

# هەواڵی چەمچەماڵ

* ڕۆژی ١٩٤٦/٨/٦ کاربەدەستی بەرگریی عێراق و سەرۆکی سەردانی لەشکری عێراق ڕۆیشتن بۆ سلێمانی. لە ١٩٤٦/٨/٢٧دا گەڕانەوە بەغدا.
* نووسیاری شت کێشکردنی چەمچەماڵ (عەلی تکریتی) گوێزرایەوە بۆ لادێی تووزخورماتوو. لە جێی ئەو نووسیاری شت کێشکردنی تووزخورماتوو گوێزرایەوە بۆ چەمچەماڵ.
* داخی گرانمان جەنابی شاکر بەگ فەتاح گوێزرایەوە بۆ ناوچەی هەڵەبجە. جێنوشینی (مەخموور)، نازم سەعید وەنداوی، گوێزرایەوە بۆ چەمچەماڵ.
* شەوی سێ شەممەی ڕابردوو کە بەر ١٩٤٦/٨/٦ دەکەوێ ئاهەنگی حەفتەیی خوێندنگای شەوی چەمچەماڵ گێڕرا. جێنوشینی چەمچەماڵ و فەرمانبەرەکانیش هاتبوونە خوێندنگاکە.
* یاریدەدەری باڵبازی چەمچەماڵ و فەرمانبەرەکانیش هاتبوونە خوێندنگاکە.
* یاریدەدەری باڵبازی چەمچەماڵ (حوسێن عەونی) بۆ ئەوەی لە جێی کارگێڕی باڵبازی کەرکووک فەرمان ببینێ چووە کەرکووک.
* لەم ڕۆژانەدا گرانی داکەوتبووە ناو بازاڕی چەمچەماڵەوە. بۆ بەربەستکردنی ئەم گرانییە شارەوانیی چەمچەماڵ بڕیاری نرخی دەرکرد بۆ هەموو چەشنە سەوزە و میوەیەک ئێمەیش ئەوا دووکاندارەکان بەم جارە ئاگادار دەکەین. هەر کەسێک بەپێی نرخی بڕیار لەسەر دراو لەو بابەتانە نەفرۆشێت سزا دەدرێت.
* بۆ یانەی فەرمانبەرانی چەمچەماڵ (عارف ئاغای هەمەوەند)، (٥٢)داری خانووی پێشکەش کرد. ئێمە لە کانگای دڵمانەوە سوپاسی بەخشندەیی دەکەین.

# هەواڵی دەرەوە

* لەسەر بابەتی هەرای کرێکارەکانی هاوبەشی نەوتی کەرکووک کارگێڕی باڵباز و یاریدەدەری کارگێڕی باڵبازی کەرکووکیان بانگ کردۆتە بەغداد. هێشتا ئەنجامی ئەمە دەرنەکەوتووە.

* لەبەر ئەوەی چەرچییەکان بەناو گوندەکاندا بلاوبوونەتەوە، گەلێک شت نرخیان گران بووە، وەک: گەنم و جۆ و ڕۆن. فەرمانڕەوایی عێراق بڕیاری داوە (١٥٠.٠٠٠) تەن جۆ بفرۆشێ بەئەورووپا. وا دیارە ئەم چەرچییانەیش هەر بۆ ئەورووپاییەکان ئەم دەغلودانانە دەکڕن.

* لەلایەن فەرمانبەرەکانی دەسگای بەندەری (بەسرە)وە چەند دزییەکی گەورە، گەورە لە سامانی میری کراوە. لەسەر ئەوە دەستی گەلێک فەرمانبەری ئینگلیز و عێراقییان لە فەرمان کێشاوەتەوە. فەرمانڕەوایی بەتوندییەکەوە لە پرسیش دایە.

* فەرمانڕەوایی عێراق خەریکە لە ئەورووپادا کڕیار بۆ تووتنەکانمان دەدۆزێتەوە. ئەمە شتێکی باشە، کاشکی سەری بگرتایە.

* فەرمانڕەوایی عێراق، ئەم ساڵ لە هەر خاوەن دەغڵێک نیوەی دەغڵەکەی واتا (گەنم)ی لێ دەکڕێتەوە. نرخی ئەم ساڵی گەنم لە نرخی پاری کەمترە. بەڵام ئەم ساڵ لە پار زۆرتر گەنم لە جووتیارەکان وەردەگیرێ.

* لە هەموو لایەکی عێراقەوە، هاوارە لەدەست دابەش نەکردن و نەبوونی شەکر و چا. ئەوا نیوەی مانگ تێپەڕی، نازانم کەی شەکر و چا دابەش دەکرێ؟!.

* فەرمانڕەوایی ئێران گوتوویەتی: ئاسایشی ئێران لە ئەستۆی ئێمە دایە. ئێمە ڕێ نادەین ئینگلیزەکان بەناوی پاراستنی کاروباری (هاوبەشی نەوتی ئابادان)ەوە پەل بهاوێژنە ئێرانەوە. پێویستە ئینگلیزەکان لەشکرەکەیان لە شاری (بەسرە)وە بکێشنەوە بۆ هیندستان.

* لەلایەکەوە لە ناوەند جوولەکەکان و عەرەبدا، لەلایەکی تریشەوە لە ناوەند جوولەکە و عەرەب و ئینگلیز و ئەمریکاییەکاندا، لەسەر کەینەوبەینەی (فەلەستین) دەمەقاڵێ لە گەرمەدایە. عەرەبیش و جوولەکەیش، هەر لایە دەیەوێ (فەلەستین) بەتەنیا بۆ خۆی بێنێتەوە!...

## پێ بکەنە

زمان بڕین

برا گەورە: کوڕم تۆ بۆ چ دەهێڵیت خەڵک ئەمەندە گلەییت لێ بکەن؟... تۆزێ زمانی خۆت بگرە، وریایش بە دڵی کەست لێ نەیەشێت. هەموو شەوێک لە جێگاکەتدا، سەرزەنشتی خۆت بکە لەسەر ئەو قسانەت کە دڵی خەڵکت پێ ئازار داوە. لەوەیش دڵنیابە کە بەرەبەرە زمانت لەگەڵ خەڵکدا باش دەبێت و، ئیتر خەڵکیش خۆشی دەوێیت. تێگەیشتیت؟!.

برا بچووک: گەورەم خودا ئاگادارە من هیچ لە دڵماندا نییە. خەڵک خۆیان خراپن. ئەگینا من زمانم پاکە و لەگەڵ خەڵکیشدا چاکە. ئەوان بەخۆڕایی قسەم بۆ هەڵدەبەستن. ئەوەتا ئەو ڕۆژە کاک (ن...) دزداشەیەکی لەبەر کردبوو -لەم کۆڕەدا کاک (ن...) خۆشی دانیشتبوو- چووبووە بازاڕ، کەچی خەڵکی چەمچەماڵ پێیان دەگوت: «سەیریکە سەگبابە بەدزداشەوە دێتە بازاڕ!...».

براگەورە: بابە هیچمان لە هیچا... زۆر دەترسم ئەگەر لەسەری برۆم، هەروەک سەر و گوێلاکی کاک (ن...)ت کوتایەوە، سەر و گوێلاکی منیش بکوتیتەوە. برۆ باوکم برۆ، خودات لەگەڵ بێ. بەس نەبوو بەناسانی لە دەست زمانت رزگارم بوو!...

سالە کەری باوکی حەمە کەر

سالەکەر: گەورەم لە ڕێی خودادا بکەرەوە فریام (حەمەکەر)ی کورم بۆ تەمێ بکە. هیچم ناداتێ. بەسەری تۆ (کەر)ەکە هی منە. کەچی کرێی کەرەکە خۆی دەیخوات!...

جێنوشین: من لە میانی (کەر) و (کەر) و (کور)ی تۆدا داماوم. نازانم چیتان لێ بکەم. ئەمە چەند جارە من ناوبژیتان دەکەم و ئێوە تێک دەچنەوە؟...

هەر وا چاکە بچیتە لای دادگەر ئەو تۆڵەت لە (حەمە کەری کور)ات بۆ بسێنێ و گیانت بەوەرگرتنی کرێی کەرەکەت شاد بکات!.

سالەکەر: ئێی!... دیارە تۆیش بەشی خۆت دەزانیت!. ئافەرین جێنوشین بەگ. دەی لە کۆڵ خۆتم بکەرەوە و فڕێم بدەرە سەر دادگەرا؟...

## زانستی گشت لایی

هەمەوەند

هەمەوەند کە ئێستا هەژار و داماو و لێقەوماو کەوتوون لە ناوچەی چەمچەماڵ و ناوچەی بنکەی سلێمانی، کاتی خۆی، واتا تا سی سالێک لەمەوپێشیش لە هەرە دەوڵەمەندتر و بەچنگتر و لەرووتر و سەربەرزتری هۆزەکانی کوردستانی عێراق بوون. هیچ هۆزێک بەڵکو هیچ لەشکری فەرمانڕەواییەک نەبووە خۆی لەبەریاندا ڕابگری. ئازایی و دلێریی هەمەوەند، سەربەرزی و مەردایەتییان، میوان پەرستی و پاراستنی لێقەوماو و بێ دەسەڵاتیان، خوداناسی و نامووس پەرستییان، لەناو هەموو لایەکدا ناوبانگی دەرکردووە و تا دێت دەنگیش دەداتەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا کە فەرمانڕەوایی (بابان، عوسمانی، ئێران) پاشان (بەریتانیا) لەگەڵ هۆزەکانی دەوروپشتیان وەک (جاف و، تالەبانی و، زەنگەنە و، جەباری و، شوان و، شێخ بزەینی و، شێخانی بەرزنجە) بەتاک تاک و بەگەلەکۆمەکی شەڕیان لەگەڵدا کردوون و تەنگەتاویان کردوون و، لە پێناوی شەڕ و شۆڕی هەموو دەمێدا هەموو دەم ماڵوێرانی و سەرگەردانییان بەسەر هاتووە... لەگەڵ ئەمانەیشدا هەمووی، هێشتا هەمەوەندەکان خووڕەوشتی مەردانەی باوک و باپیریان بەر نەداوە. هەرگیز دەستیان بۆ نامووسی کەسێک نەبردووە. هەرگیز ئافرەتێک یان ڕووت نەکردۆتەوە. هەرگیز نەیانهێشتووە نوێژ و ڕۆژوویان بچێت، تەنانەت لە کاتی تەنگ و چەڵەمەیشدا. هەمەوەند، سەربەستێ، سەر دانەواندن نازانن، هەر کەسێ ئازاریان بدات دوو چەندانە ئازاری دەدەنەوە، بێ باکن. سڵ لە کەس ناکەن. دوژمن هەرچەندێ گەورەتریش لە خۆیان و، زیانیان هەر چەندێ فرەبێ، چاویان ناترسێ دەچن بەگژیدا، تا تۆڵەی خۆیانی لێ نەکەنەوە و بەدۆستایەتی ئاشت نەبنەوە، تا تۆڵەی خۆیانی لێ نەکەنەوە و بەدۆستایەتی ئاشت نەبەوە، وازی لێ ناهێنن.

بەگژداچوونی کەسوکاریان لە دەوری (کرماشان) کە هۆزی (هەمەوەندی گەورە) ئێستایش لەوێن، ناچاری کردن، لە نزیکەی (٢٥٠) ساڵ لەمەوپێشەوە خاکی باوک و باپیری خۆیان بەجێ بهێڵن و بێنە ئەم ناوچەیە بیکەن بەنیشتمانی خۆیان.

ناشێتی و نەزانی فەرمانبەرانی فەرمانڕەوایانی ئەوسا، ناچاری کردوون بچن بەگژ فەرمانڕەواییەکاندا و، دوور بکەونەوە لە گوندەکانی خۆیان و، بکەونە دەستکورتی و هەژارییەوە، کە لە ئەنجامدا ناچاری کردن بۆ ژیاندنی خۆیان، دەست بدەنە جەردەیی و کاروان ڕووت کردنەوە، ئەگەر فەرمانڕەواییەکانی ئەوسا دادپەروەر و خوداناس و ژیر بوونایە گەلێک کەلکیان لەم ڕەوشت و کردەوە بەرزانەی هۆزی هەمەوەند وەردەگرت و دەگەیاند بەگەل و نیشتمانەکەیان ئەوەیش تەنیا بەوە پێک دەهات کە ڕێزیان لێ بگرتنایە و خۆشەویستییان بەرامبەر بنواندنایە و چاک بوونایە لەگەڵیان.

## لێرە و لەوێ

### حەقەکان

خۆ پەرستان و پوولپەرستان هێندە دەستکاریی (ئایینی پاکی ئیسلام)یان کرد و، بۆ کەلکی ناپوختەی خۆیان، ئەم کوردەوارییە بەسەرزمانانەیان چەواشە کرد و، بەهەموو جۆرە فڕوفێڵێک ڕووتاندیاننەوە، دواییەکەی ئەم تەکیە و خانەقا و پرچ و ڕیش و تەپڵ و دەف و بەشیر سەربڕین و شاپڵیتە خواردن و شێخ و خەلیفە و دەروێش و مریدیان پەیدا کرد و، (ڕێڕەوی نەقشبەندی)یان گۆڕی و خستیانە شێوەی (ڕێڕەوی حەقە) وە (ڕێڕەوی حەقە)یش کە تلپەی (ڕێڕەوی نەقشبەندی)یە، ئەگەر هیچی لێ نەڵێین، ئەوە دەڵێین کە بووەتە هۆی بێ کار و فەرمانی و، گێژ و وێژی و ناشێتی و نەزانی، لەبەر ئەوە یەکێکە لە هەرە دوژمنەکانی گەل. کۆشش و خەبات بکەین ئەمانەی بوون بەحەقە بیانخەینەوە سەر ئایینە پاکەکەی ئیسلام. وەک بۆمان دەرکەوتووە (ڕێڕەوی) حەقە، کە بەم جۆرە بەنهێنی گیراوە و شارراوەتەوە و لە حەقەکان بەولاوە، ناهێڵن کەس تێی بگات، چووەتە سەر ڕێڕەوی (ئیسماعیلی)یەکان کە هەرچییەک خۆشی پێگەیاندن لایان ڕەوا بووە! شێخەکانیان بەهەشت و دۆزەخیان بۆ دانابوون، لە پێشەوە بەنگ و تریاکیان داوە بەدەروێش و مریدەکانیان تا بێهۆشیان کردوون، ئینجا هەر فرمانێکیان ئارەزوو بووە پێیان سپاردوون و، دەروێشەکان بەکارتێکردنی ئەو بێهۆش دارووانە، دەستبەجێ فەرمانەکانیان بۆ جێبەجێ کردوون. زانست وا پیشان دەدات ئەوی ئەو جۆرە دەرمانانەی بدرێتێ هەرچی پێ بڵێیت بەقسەی دەکات، بام زیان و نەمانی خۆیشی تێدابێت. چونکە بەتەنشت ئەو دەرمانانەوە، کە هۆش و خواستی مرۆڤیان پێ کز دەبێ، دەتوانرێ بەهۆی نواندنی موگناتیسییەوە یاخود چاوبەستەوە کار لەوانە بکرێ، هەر کارێکیان پێ بسپێررێ پێیان ڕابپەڕێنرێ. پاشان کە هاتنەوە هۆشی خۆیان هەرچییەکیان پێ گوتراوە و پیشان دراوە لە بیریان دەچێتەوە. ئێمە ئەوەمان بۆ دەرکەوتووە کە حەقەکانی ئێمە لەلایەن شێخەکانیانەوە لە هەموو کۆبوونەوەیەکیاندا دەرمانێکیان دەرخوارد دەدرێت بێجگە لەوە وەک چاومان پێ دەکەوێ زۆر لە حەقەکان چاویان هەموو دەم ئەبڵەق و کزە!... زۆریشیان کز و بێ هێز و ستێ. لە

دەنگی بەرز دادەچلەکێن. ئەمانە هەموویان نیشانەی خواردنی بێهۆشدار و یاخود دەرمانانی بێهۆش کردنن.

حەقەکانی چەمچەماڵ لە نزیکەی (٣٥) گونددا دانیشتوون. ئەمانە بەزیندان کردن و لێدان چارە ناکرێن. تەنیا شتێک کە بیانخاتەوە سەر ڕێی ڕاست ئەوەیە کە شێخ و سەرکردەکانیان لێ دوور بخرێنەوە. ئینجا خوێندنگایانیان بۆ بکرێتەوە، تێیاندا بخوێنن و فێری کار و پیشەسازی بن، کارگەیشیان بۆ بکرێتەوە تا بەرەنجی شانی خۆیان نانی خۆیانی تێدا پەیدا بکەن و بیروباوەڕی زانست و هونەر و پیشەسازی بچێتە مێشکیانەوە، بۆ ئەمەی ئەو مێشکانەیان لە بیروباوەڕی پڕوپووچ پاک بکاتەوە و، کردەوەیشیان بەو پێیە پێ بگۆڕێ و بەرەو پێشکەوتنیان ببات. جا خۆزگە ئەم ئاواتەمان دەهاتە دی.

## جوێ بوونەوە

براگەل! خەڵکە باشەکەی چەمچەماڵی خۆشەویست! خودا وەهای ویست کە لێتان بپچڕێم و جیابمەوە. لەم ژینە پڕ گەشایش و خۆشییە، کە لەناو ئێوەدا ڕام دەبوارد بێ بەش بێنمەوە. لەناو ئێوەدا میوانێکی برا بووم. بەڵکو لە ئێوە زۆرتر خۆم بەخاوەن ماڵ دەزانی. ئێوەیش خانەخوێیەکی بێ هاوتام بوون. تا ماوم خۆشەویستی و نەژادی و یارمەتیتانم لەبیر ناچێتەوە، ئەم چەند مانگەیش کە لە ناوتاندا بووم، داخەکەم، خەوێکی خۆش بوو، نەیانهێشت تەواوبێ، خەبەریان کردمەوە. هەتا سەر ئەم چەند مانگە، لە ئاسمانی ژینمدا، وەک ڕۆژ دەدرەوشێتەوە. لە هەموو دڵمەوە ویستم بەرامبەر بەم خۆشەویستی و یارمەتییەتان بەکەڵکتان بێم و پێشتان بخەم و سەرتان نەگەیشتم. خودا ڕۆژگار بەکوێرەوەرییەوە بکوژێ کە ئاوەها مانەوەی منی لەناو ئێوەدا جوانەمەرگ کرد!...

من لەم کاتەدا کە فرمێسکی جوێبوونەوە لە بەردەمتاندا هەڵدەڕێژم، بەخودای پاک و بێ هاوتاتان دەسپێرم، کە بەگەورەیی خۆی پارێزگاریتان بکات و لە دەست مۆتەکە و ڕمۆزنی ڕۆژگار ڕزگارتان بکات. هەروەها یارمەتی منیش بدات کە جارێکی تر بێمەوە ناوتان و بەساڵان لەگەڵتاندا ڕاببوێرم. بەڵام لە ژیانێکی لە ئێستا ئاسوودەتر و گوزەرانێکی خۆشتردا بتانبینمەوە. لە کانی دڵەوە سوپاسی نەژادی و جوامێری و پیاوەتی هەموو لایەکتان دەکەم. تکاداریشم لە خودا کە هەموو دەم بەکامەرانی و سەرفرازیتان بگەیێنێ. هەروەها تکادارم کە لە پاش من و لە بریتی من یارمەتی (کاک نەجات عومەر) و کاک (قادر محەمەد) و کاک (مەحموود) و کاک (عەونی) و کاک (عەلی) بدەن، بام هەر وەکو تا ئێستا بۆ سەربەرزی و پێشکەوتنی ئێوە هەوڵی مەردانەیان داوە، لەمەو دوایش هەروەها هونەرمەندی خۆیان بنوێنن. ئیتر بەخوداتان دەسپێرم براکان.

براتان: شاکر
«شاکر فەتاح»
جێنوشینی چەمچەماڵ

# هەڵەبجە

لە پاییزی ساڵی ١٩٤٦دا گەیشتمە هەڵەبجە.[1] ئاژاوەی ناوەند بەگزادەکانی جاف و دەستە و دایەرەی (شێخ مەحموودی مەزن)، کە لەسەر زەویوزار و دەسەلات بوو، لە ئارادابوو. هەردوولا دۆستم بوون. حەزم نەدەکرد لایەنی هیچ لایەکیان بگرم. حەزیشم نەدەکرد کەلکی گشتی بۆ کەلکی ئەوان ژێر بخەم. (ئەورۆڵی)یەکان کە تیرەیەک بوون لە (جاف)، بەرەنگاری بەگزادەکانی جافیان دەکرد. بووبوونە هاوپەیمانی شێخەکانی سلێمانی. شەڕوشۆڕ لەسەر زەویوزار و دەسەلات و کەلکی تایبەتی بوو، نەک لەسەر کەلکی گشتی. ئاژاوە لەناویاندا پەیدابوو. زۆرداری دەستی پێ کرد. بوو بەمقۆمقۆ و دادکردن. زۆری نەمابوو ببێتە شەڕێکی خوێنین. داوام لە فەرمانڕەوایی کرد، ڕێم بدات گەورەکانی هەردوولا سزا بدەم، بۆ ئەمەی هەڵلا هەڵنەگیرسێ. ڕێی نەدا. ناچار بووم لەسەرۆکە بچکۆلەکانی هەردوولا بگرم و سزا بدەم. بەو ڕەنگە چەکدارەکانی هەردوولام بلاوە پێ کرد و، ئاسایش گەڕایەوە سەر دۆخی جاران. ئەم کارساتە دەنگی دایەوە. گەل زۆری پێ خۆش بوو. بەڵام بەگزادەکانی جاف پێی تووڕە بوون. هەروەها دەستەی شێخەکانی سلێمانیش ئەمەیان زۆر پێ ناخۆش بوو. چونکە ئەم کردەوەیە، بەرپەرچی دەسەلاتی هەردوو لایانی دەدایەوە، کەلکی بۆ ئەتەوە تێدابوو، کەلکی بۆ ئەوان تێدا نەبوو!.

بەگزادەکانی جاف، تێکڕا هەموویان لە بەغدا، کۆبوونەوە و چوون بۆ لای کاربەدەستی کاروباری ناوخۆ، دادیان لە دەست من کردا... هەرچەندە ئەو تاوانانەی ئەوان دابوویانە پاڵم، بەدرۆ دەرچوون، بەڵام ئەو پشکنێر (مفتش)ەی ناردبوویان بۆ پرس و لێکۆڵینەوە بەرتیلێکی وای لێ وەرگرتبوون، کە ناچارم بکات بەرەنگاری ئەویش بکەم. دوایی لەسەر پێشنیاری ئەو پێشکێنەرە، سێ مانگی پێ نەچوو، گواستمیانەوە بۆ شاری سلێمانی. منیش لە پێش جوێ بوونەوەمدا، سوپاسێکم نارد بۆ بەگزادەکانی جاف، بەبۆنەی گوێزانەوەکەمەوە، لە جێیەکی زۆر خراپەوە بۆ جێیەکی زۆر باش!.

دیارە ئەمە تەوس بوو. هەندێک کەس پێکەنین!. ئەمە بوو بەسەرچاوەی وتارێکی خۆشەویست بۆ من، لە شێوەی پەخشانێکی هونەریدا، ناوم نا: «بژێت ئەی دوژمنم»، لە ساڵی ١٩٤٧دا لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بلاوکرایەوە. پاش چەند ساڵێک کرا بەعەرەبی و لەگەڵێک ڕۆژنامەدا بلاوکرایەوە!.

ئەم کارساتە، دڵی نیشتمانپەروەران و هەژارانی لە بەگزادەکانی جاف زۆر ورووژاند. بەڵام منی زۆر خۆشەویست کرد لایان. کاتی جوێ بوونەوە، بەرێزێکی زۆرەوە ڕەوانەیان کردم.

زۆرداری هەندێک لەو بەگزادانە لە مسکێنەکانیان، کەم تەرخەمیی هەندێکیشیان لە لێپرسینەوەی دەرد و ئازاری کرمانجەکانیان و، یارمەتی نەدانیان، هەروەها ناکۆکی ناو بەگزادەکان خۆیشیان، بووبوو بەهۆی دەسەلات پەیداکردنی شێخەکانی سلێمانی لەناو جافەکاندا.

(١) لەم کارە ئیدارییەی مامۆستادا بۆ جاری چوارەمە دەچێتەوە ئەو دەڤەرە؛ دوو جار بۆ خورماڵ و دوو جار بۆ هەڵەبجە.

لەو شەش مانگەدا کە لەویّ بووم، توانیم ئاسایش بپارێزم. خۆشبەختانە هیچ کەتێک یاخود کارەساتێکی خوێناوی، لەناو هەردوولادا، ڕووی نەدا. بەڵام داخەکەم، چەند مانگێک لە پاش جویّ بوونەوەم لە (هەڵەبجە) چەند کەتن و کارەساتێکی نەنگ و ناشیرین و خوێناوی لەناویاندا ڕووی دا: گەلێک پیاو کوژران، گەلێک خەرمان و پاوان سووتێنران، گەلێک ماڵ و دووکان دزران. هەردوولا تووشی زیانێکی زۆری سەر و سامان بوون. ئەوساکە (بەگزادەکان) بۆیان دەرکەوت: کە ئەو قایمقامەی هێنایانە جێی من و، خۆیان بۆ خۆیان دورستیان کرد، بەزەبری بەرتیل، هەردوو لایانی فرۆشت بەپارە، بێ ئەمەی تۆزێک خۆی ماندوو بکات بەپاراستنی گیان و سامانی هیچ لایەکیانەوە!. وەک زانیم، هەموویان پەشیمان ببوونەوە لەو خراپەیەی لەگەڵ مندا کردبوویان!. پێیان لێ نابوو کە منیان باش نەناسیبوو، ئێستاکە بۆیان دەرکەوت کە من بێ لایەن بووم، بۆ ئەوانیش و بۆ شێخەکانیش! لەبەر ئەوەی کۆنە دۆستم بوون، زۆریان لە سلێمانی هاتنەلام و دڵنەواییان کردم!. هەروەها هەندێک لە کوڕە شێخەکانی (بیارە)یش زۆرداریان لە ئاواییەک کرد، بەمەبەستی داگیرکردنی زەویوزاری فەرمانڕەوایی کە لە بن دەستیاندابوو. بەهانە هانەی ئەوان ئاواییەکە تاڵان کرا و، دوو کەسیشی لێ کوژرا، لەلایەن کوردەکانی ئێرانەوە کە هێرشیان هێنابووە سەر ئەو گوندە. (دادگا) و (باڵبازخانە)ی هەڵەبجە هیچیان بۆ ئەو مەسکینە کڵۆڵانە نەکرد، ناچار بووم بەدەسەڵاتەکەی خۆم جەزرەبەیان پێ بگەیێنم. تا تۆڵەی ئەو هەژارانەیان لێ بکەمەوە. باش بوو تاڵانییەکانیان بۆ گێڕایەوە و، خوێنەکانیشیان بۆ سێندرا و، دەسەڵاتی شێخەکانیشیان لەسەر لابرا. ئەم کارەساتەیش دەنگی دایەوە. شێخەکان لای (گەل) بەدناو بوون. بەڵام منیان زۆرتر چوو بەدڵدا. شێخەکانیش چوونە دادکردن لە دەست من بۆ (بەغدا)، بۆ لای جێگا بەرزەکان! منیش دەنگم نەکرد تا ماندووبوون. کە هاتنەوە مژدەم دانێ کە بڕیارەکانی من لەلایەن کاربەدەستی ناوخۆ[1]، خۆیەوە، پەسندکراون!. ئەوانیش هیچیان بۆ نەماوەتەوە ئەوە نەبێ کە سەر بۆ دادپەروەریە بچەمێننەوە! باش بوو، ژیر بوون، زوو هاتنەوە سەر ڕێ. منیش تا پێم کرا ڕێزم لێ گرتن!

(پێنجوین) بەهۆی بوومەلەرزەوە تەواو وێران و شپرزە ببوبوو[2] خۆشبەختانە لەگەڵ ئەو لیژنەیەدا کە دامەزرابوو، بەگوڕجی چارەی گیروگرفتەکانیم کرد. لەمەدا فەرمانڕەوایی زوو کەوتە فریایان. یارمەتییەکی باشی دان. گوندییەکانمان دامەزراندەوە. یامەرتی هەژارەکانیانمان دا. گەلێک ساختمانی پێویستمان بۆ دروست کردن، بۆ نوستن و بازاڕ و فەرمان بینین. لە سایەی خوداوە (پێنجوین) لە دەست ڕەو و شپرزەیی و زیانێکی گەورە ڕزگارکرا. هەروەها گیروگرفتی شەکر و چاپی و کووتاڵ فرۆشتن کە بە هۆی هەندێک بازرگانی خراپەوە پەیدا ببوبوو، چارەکرا. ئەو بازرگانە خراپانەم لابرد، هی باشم خستە

(١) واتە: الإدارة الداخلية العامة- وزارة الداخلية.

(٢) پێنجوین ناحیەیەک بوو سەر بەقەزای هەڵەبجە، لە ٨ی ئابی ١٩٤٦ بوومەلەرزەیەکی بەهێزی را لێی دا کە زیانێکی زۆری گیانی و ماڵی لەو شارە دا، میری یارمەتییەکی چاکی خەڵکەکەی دا، ئەمیر عەبدولئیلای وەسی گورج سەردانی شارە وێرانەکەی کرد، لە کوردستان و عێراقەوە پەیتا پەیتا کۆمەکیان بۆ دەنارد... ئیتر ئەمانە بوونە هۆی بارسووکی سەر شانی خەڵکە داماوەکەی.

جێگایان. هەروەها دەسگای (تموین - دەستە)یشم تەنگەتاو کرد، بۆ ئەمەی بەپاکی و دروستی و گورجییەوە کاروباری نەتەوە بەڕێوە ببات. لەم کاتەدا فەرمانڕەوایی (کۆمەڵە)ی کوردستانی ئێران لەناوبرابوو[1]. ئینگلیزەکان گیز و هوورپیان دەهات بەناو ناوچەی (هەڵەبجە) و سنووردا شەویکیان یەکێک لە بەگزادەکان دوو ئینگلیز لەوانە و هەندێک لە بەگزادەکان و منیشی بانگ کردبوو بۆ ماڵی خۆیان، بۆ نانخواردن. لەوێدا بەئینگلیزەکانم گوت: «ئەگەر ئێوە دەتانەوێ (یاسای بەشداریی - الشیوعیة) لە ئێرانەوە نەیێتە ناو ناوچەی هەڵەبجەوە، ئەوا هەرچی زەوییەکی میری هەیە لەم ناوچەیەدا دابەشیان بکەن بەسەر جووتیارە هەژارەکاندا. هەروەها یارمەتیشیان بدەن بەپارە و بەماکینە و بەتۆ و، بەشتی تر. ئەم بەگزادانە هەموو دەوڵەمەندن. گوندیان زۆرە. پێویستییان بەزەویوزاری میری نییە. بەڵام کرمانجەکانیان هەژارن، هیچیان نییە. ئەوانە پێویستییان بەزەویوزار و یارمەتی و دادپەروەری هەیە».

بەگزادەکان ئەم قسانەیان پێخۆش نەبوو. بەڵام ئینگلیزەکان قسەکانیان لای خۆیان نووسی. پاشان ئەو قسانەی خۆم بەنووسراویش نارد بۆ پارێزگاری سلێمانی و، داوای پشتگیریشم لێ کرد لای کاربەدەستانی میری... بەڵام ئەوساکە ئەو قسانە زۆر بەخراپی دەدرانە قەڵەم! هەر کەسێ بیکردایە، دەیانکرد بەئەندامی دەستەی بەشداری (کۆمۆنیستی)!... لەگەڵ ئەمەیشدا کارەسات دەریخست کە قسەکەی من لە جێی خۆیدا بوو، چونکە پێنج ساڵی پێ نەچوو، فەرمانڕەوایی خۆی دەستی کرد بەبەشینەوەی ئەو زەویوزارانە بەسەر کرمانجە هەژارەکان و ئەوانەدا کە لە دانگی ئەواندا بوون!.

داخەکەم لە هەڵەبجەدا زۆر نەمامەوە تا بتوانم بەدڵی خۆم ڕەنجی تێدا بدەم. زۆر پێشنیازم پێشکەش کرد بۆ جوێ کردنەوەی (پێنجوێن) لە هەڵەبجە و دامەزراندنی (لادێی هەڵەبجە) لە گوندی (عەبابەیلێ)دا و، گواستنەوەی بنکەی (لادێی وارماوا) بۆ گوندێکی نزیکتر و باشتر. بەڵام ئەوانە لە پاش جوێ بوونەوەی من بەچەند ساڵێک جێبەجێ کران.

(۱) مەبەستی ڕووخانی کۆماری کوردستانە لە مەهاباد کە لە ۱۹٤٦/۱/۲۲ ئاڵاکەی هەڵکرا و بانگەشەی بۆ کرا، لە ۱۹٤٦/۱۲/۱٥دا هێزەکانی ئێران بەپاڵپشتی و ڕەزامەندی هێزە نێودەوڵەتییەکانی ئەو ڕۆژە هەرمیان بەو کۆمارە کوردییە هێنا و ڕێبەرانیشیان لە سێدارە دان. تەنیا هێزێ کە کەوتە بەربەرەکانی و مقاومەکردنی لەشکری ئێرانی و ئەو عەشایرانەی ببوونە پیاوی حکومەت، بارزانییەکان بوون، کە لە دوای شەڕ و پێکدادانێکی زۆر لەگەڵ جاش و جەیشی ئێراندا بۆ بەرگریکردن لەو کۆمارەی بەگورگانخواردو و درا، بەناوبانگترین ئەو شەڕانەش: شەڕی کوجار ۱۹٤۷/۳/۱۳، بەرەی شنۆ و نەغەدە ۱۹٤۷/۳/۱۸، قارنە لە ناوچەی خانە ۱۹٤۷/۳/۲٤، هەڵەج ناوچەی مەرگەوەڕ، بەری زدر لە ۱۹٤۷/٤/۳ کە بارزانیی نەمر تیایدا بریندار بوو، لە ۱۹٤۷/٤/۱۹دا هێزە بارزانییەکان دێنەوە خاکی عێراق، لە ۱۹٤۷/٥/۲٥ دەگەنە گوندی (یای) لە کوردستانی تورکیا، دیسان لە ۱۹٤۷/٥/۲۷ دێنەوە گوندی (جیرمی) لە کوردستانی ئێران، لە ۹-۱۹٤۷/٦/۱۱ شەڕی گەورەی چیای سۆز و دەشتی ماکۆ کە تیایدا لەشکری ئێران ۲۷۱ سەربازی لێ بەدیل گیرا لە ۱۹٤۷/٦/۱۸ دوا کەسێ کە لە بارزانییەکان لە ناوی ئاراس پەڕیەوە نێو خاکی سۆڤیەت مستەفا بارزانیی نەمر بوو.

لە ساڵی ١٩٤٧دا گوێزرامەوە (سلێمانی). ئەو کاتە سلێمانی نزیکەی (٣٤٠٠٠) کەسێک دەبوو. پاشکەوتوو بوو لە ئاوەدانیدا. پێشکەوتوو بوو لە هۆش و بیروباوەڕی نیشتمانیدا[1].

هەستم پێ کرد فەرمانڕەوایی باوەڕی بەمن نییە. چونکە بەدۆستی (گەل)ی دادەنام! نەیاندەکردم

(١) ئەو ساڵە و دواتر، لە ئاسمانی جووڵانەوەی سیاسی سەر گۆڕەپانی کوردەواریدا، هەورەکان وردە وردە دەڕەوینەوە و ڕووکارەکانی تێکۆشان کەم کەم باشتر بەدیار دەکەوتن و ئاسۆی ئایندەیان دەستنیشان دەکرد، ساڵێ ئەبوو کە کۆماری کوردستان لە مەهاباد ڕووخابوو، دڵسۆزان و تێکۆشەرانی ئەودیو و لەگەڵ ئەوانەی ئەمدیو کە بەشداری دامەزراندنی ئەو کۆمارەیان کرد، پەرەوازە ببوون و زۆریش لە زیندانەکانی ئێران خزێنرابوون. تام و چێژی ئەو پانزە مانگە سەربەستییە خەباتگێرانی مەست کردبوو، کەچی هەڵاولەراوانی چوارچرا و چوار ئەفسەرە قارەمانەکانی ١٩ی حوزەیران هێندەی دی خەڵکی جۆش دا بۆ دیاریکردنی ڕێگای خەباتێکی ڕزگاری نەتەوەیی ڕێکوپێکتر لە جاران؛ جا بۆیە تێکۆشان بۆ سەربەخۆیی و ئازادی لە دووبەرەدا خۆی دەبینیەوە -لە کوردستانی عێراقدا: بەرەی بیری کۆمۆنیستان و بەرەی بیری نەتەوەیی.

ئازار و مەینەتییەکانی ئەو کاتە و ئاوارەبوونی بارزانیان لە سۆڤیەتدا. وای لە زۆر لە کادیرانی بەرەی یەکەم کرد کە پاڵدەنە ناو دووەمەوە کە لە پێکهێنانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا خۆی بینییەوە -١٦ی ئابی ١٩٤٦-. هەتا حزبێکی ئازادیە فرلوانی وەک -هیوا-ش لەو کۆمەڵەیەدا توایەوە... ڕۆشنبیران و شاعیرانیش لە جاران زیاتر لە ڕووداوەکاندا دەتوانەوە؛ بڕوانە پیرەمێردی ئەمر لە ١٩٤٧دا چی دەڵێ:

عشرەت هاوارە، .........

کەوتووە ئاراس ئاو بێ بوارە
ڕێم نییە منیش شوێن ئەوان بکەوم
پیرم، هەنگاوێک بنێم نەکەوم
لێرەش وا کەوتووم بەدەم دەردەوە
لە ئێشی دووری و ئاهی سەردەوە
دوکتۆر دەوای تۆم ناوێ، لێم گەڕێ
بەڵکو بەئاهم دەوران وەرگەڕێ
یا وا وەرگەڕێ.. ئێڵم سەرکەوێ
یا زرمەی تۆپی زەرڕەی بەرکەوێ
ئەوساکە دوعای من وا گیرابێ
لە خانەی خاکا، ئاواتم ئابێ
ئینجا ئەڵقێنم بدەن بەکوردی
بڵێن ئاواتت هاتە جێ. مردی

سا بۆیە سلێمانی لە بیروباوەڕی نیشتمانیدا پێشکەوتووبوو... وەک مامۆستا دەڵێ.

بەجێنوشینی موتەسەڕیف یەک جار نەبێ ئەویش لە ماوەی دوو ساڵدا! زۆرتر کارگێڕی باڵبازەکان (مدیر الشرطة)، یان ئەوانەی لە ڕەوشت و خووی ئەواندا بوون، دەکران بەموتەسەڕیفی سلێمانی یاخود بەجێنوشینی موتەسەڕیفی سلێمانی. هەرچەند لە دڵدا ئەم زۆرداریەم لا ناخۆش بوو، بەڵام ڕۆژگار دەریخست کە ئەو بڕوا پێ نەکردنەیان، بۆ من زۆر بەکەڵک بوو! چونکە دەبوو: یان تێک بچم لەگەڵ فەرمانڕەواییدا، یاخود تێک بچم لەگەڵ (نەتەوە)دا. ئەو کردەوە ئەنگانەی ئەو موتەسەڕیفانە دەیانکرد دەربارەی (نەتەوە) بەمن نەدەکرا! بێجگە لەوە، ئەم بارە، بوو بەهۆی ئەوەی خۆشەویستی ناوەند من و (نەتەوە) بەهێزتر ببێ!. لە هەڵبژاردنی (کۆڕی نەتەوە - مجلس الأمة)دا کە لە ساڵی ١٩٤٨دا کرا، ئەوەندەی پێم کرا، سەربەستی نەتەوەم پاراست. هەرچەندە (پارت) و (ڕزگاری)[١] زۆر بەربەرەکانێی یەکتریان دەکرد لە هەڵبژاردنەکەدا، بەڵام ماوەم بەهیچ لایەکیان نەدا، کار بکاتە سەر سەربەستی هەڵبژاردنەکە. ماوەیشم نەدا شەڕی خوێنێن لە ناویاندا بقەومێ. هەروەها ماوەیشم نەدا بەفەرمانبەرەکان بێ فەرەکان تەق و هووڕ لە هیچ لایەکیان بکەن. ئەوانەی سەر بەهیچ دەستەیەکیش نەبوون، ئەوانەی سەر بەفەرمانڕەواییش بوون، هەمیان سەربەستییانم پاراستبوو لە هەڵبژاردنەکەدا... کە هەڵبژاردنەکان پلەی یەکەم و دووەمیان تەواو بوو، هەموو کەس، تەنانەت دەستە (حزب)ە نهێنییەکانیش دەستخۆشییان لێ کردم و گلەییان نەبوو... تەنیا چەند کەسێکی دەسەڵاتدار نەبێ بۆڵەبۆڵیان کرد و، تاوانباریان کردم لای فەرمانڕەوایی، کەس گلەیی نەبوو! لەگەڵ ئەمەیشدا فەرمانڕەوایی، وای بۆ دەست دەدا، کە سەرزەنشتم بکات و هەڵم بدات بۆ جێگایەکی وەکو «شێخان» کە دواکەوتووترین و ناخۆشترین ناوچە بوو لە خاکی (بادینان)دا. هەرچەندە کردم و کۆشام، (شێخ مەحموودی مەزن) لەگەڵ هەمەوەندەکاندا ڕێک نەکەوتەوە... پیاوخراپ هەبوون لە دەس پێوەندان و لە فەرمانبەرانی فەرمانڕەوایی، هەرچی من دامەزراند، ئەوان هەڵیاندەوەشاندەوە! ئەو ڕێککەوتنە کە زۆر بەئاسانی سەری دەگرت، تەنیا بەچاوپۆشینێکی (شێخی مەزن) و دەست هەڵگرتنێکی لە چەند پارچە زەوییەک، بۆ هەمەوەندەکان جێبەجێ دەبوو، بەدگۆیان وایان لە (شێخ مەحموود) کرد، هەمەوەندەکانی لە خۆی کردە دوژمن!. داخەکەم ئەو دوژمنایەتییە، ئەمەندە توند بوو و، ئەمەندە درێژەی سەند، لە پاش گوێزرانەوەی من لە سلێمانی، بووە هۆی ڕوودانی گەلێک کارەساتی پڕ لە خەم و ئازار، کە تا ئێستاکەیش لە بیرنەچوتەوە!

هەمەوەندەکان کەوتنە گلەیی لە من!. لەوەدا ماف بەلای ئەوانەوە بوو، چونکە من بەناوی ئەوەوە کە لە هۆزی ئەوان بووم، ناچارم کردن بچنە لای (شێخ) و ئاشت ببنەوە لەگەڵی... شێخ ئاشت بووەوە و، بەڵێنیشی دامێ کە زەوییەکانیان بداتەوە... بەڵام بەڵێنی خۆی بەجێ نەهێنا! چوار مانگ چاوەڕوانیم بەهەمەوەندەکان کرد و لەژێرەوە تێکۆشام لای شێخ کە بەڵێنەکەی بەجێ بهێنێ. داخەکەم شێخ بەگوێی نەکردم. لە شەرمەزاریدا، نامەیەکم نووسی بۆ شێخ: کە لەسەر ئەوە، ئەوا بڕیارم دا خۆم تەفروتوونا بکەم لە سلێمانی... شێخ پیاوێکی دڵپاک بوو... بەڵام کزبووبوو بەدەست دەس و پێوەندەکانیەوە، کە بەئاسانی دڵیان تێک دەدا... کە نامەکەی منی خوێندبووەوە، گوتبووی ڕاست دەکات. دەستی کردبوو بەگریان!

(١) مەبەستی (حزبی تەحەڕوڕە) کە کۆمۆنیستەکان بوون.

زۆری پێ نەچوو، چوومە بەغدا. تێکۆشام بۆ گوێزانەوەم بۆ جێیەکی دوور، بەو مەرجەی بتوانم دادپەروەریی تێدا بکەم و، درووغی تێدا بڕیندار نەبێ. بەهۆی فروفێڵبازیی فەرمانڕەواییەوە! لەو کاتەدا داوای بەرزبوونەوە (ترفیع)یشم کردبوو... بەڵام کاربەدەستی کاروباری ناوخۆ (عمر نظمي)[1]م توندوتیژ هاتە پێش چاو! کاتێکم زانی گوێزراومەتەوە بۆ ناوچەی (شێخان)، بەرزبوونەوەکەیشم دواخراوە بۆ چەند مانگێکی تر!. هەرچەندە لە سلێمانی دڵم گوشرابوو بەهۆی زۆرداری فەرمانڕەواییەوە کە نەیدەهێشت داد (عدالت) و دروستی (نظام) و کەلکی گشتی لە ڕێگای خۆیانەوە بڕۆن! کە نەیدەهێشت فەرمانبەر پێویستی سەرشانی خۆی بەرامبەر بە(خودا) و بە(نەتەوە) بهێنێتە جێ!. کە پشتی زۆرداری دەگرت! کە خەمی سەربەرزی و پێشکەوتنی (گەل)ی نەبوو! هەرچەندە فەرمانڕەوایی لە سلێمانیدا بەم ڕەنگە دەجوولایەوە و، بەم ڕەنگە دڵم ئازاری پێ دەگەیشت! بەڵام بەهۆی نووسین و خوێندنەوەوە، ئەو دڵەم زۆر جار لە ئازار ڕزگاری دەبوو. ترووسکەی هیوای ژیانێکی دواڕۆژی خۆشیشی تێدەکەوت!. ئازار و هاواری نەتەوە و ئاواتی دواڕۆژیم لەگەڵ ڕێگای چارەکردنی زۆر لەگیروگرفتەکانی، لە چوار نووسراودا پیشان دا.

لە ساڵی ١٩٤٧دا (پرشنگ) و (شەبەنگەبەرۆژ)[2]، لە ساڵی ١٩٤٨دا (گەورەپیاوان) و (هاوڕێی منداڵ)[3]م لە چاپ دا و بڵاوم کردنەوە. نیشتمانپەروەران و خوێندەوارانی کورد لە هەموو لایەکەوە پیرۆزباییان لێ کردم، هانیان دامە سەر نووسین. بەڵکو هەندێکیان یارمەتییان دام لە بڵاوکردنەوەیاندا... بۆ یادگار نامەی چەند کەسێکیانم هەڵگرتووە. لە مێژووناسان و نووسەرانی کورد: (امین زکی، محمد علي عوني، رفیق حلمي)، لە بوێژ و وێژەوانانی کورد! (فایەق بێکەس، شێخ محەممەدی خاڵ، عەلائەدین سجادی)، لە فەرمانبەرانی گەورەی زانیاری: (عەبدولمەجید حەسەن)، (عەزیز محەممەد)، (ساڵح سەعید)، (حوسێن ڕەشوانی) و (جەمیل ڕەشید عەمادی) و گەلێ دۆست و برای بەڕێزی ترەوە ئەو هاندان و تیژکردنانەم دی، کە هەتا دەمێنم بەدڵ سوپاسیان دەکەم.

هەروەها لەو ماوەیەدا کە لە سلێمانی بووم، گەلێک وتارم نارد بۆ گۆڤارە کوردییەکان: (گەلاوێژ) و (نزار). ئەمانە هەموو خۆشەویستییەکیان خستە ناو دڵی من و کوردەوارییەوە... منیش پێیانەوە دڵشاد و بەختیار بووم. شاگردانی خوێندنگاکان، یەک دوو جار داوایان لێ کردم خۆم بکەمە بەنوێنەری سلێمانی لە کۆڕی نەتەوەدا... خۆم لە دەست ڕاپسکاندن! لە ساڵی ١٩٥٣ و ١٩٥٤دا، لە یەک دوو خۆپیشاندانی

(١) ئەمە هەر ئەو عومەر نەزمییەیە کە لە ١٩٣٦دا لە موسڵ بانگی مامۆستای کردبوو و ئامۆژگاری کردبوو کە خۆی بکاتە (مدیر ناحیە) و پەیمانیشی دابوویە کە هاریکاری دەکا.

(٢) پرشنگ: کۆمەڵێ دەرد و کێشەی ناو کۆمەڵی کوردەواری، چاپخانەی معارف، بەغدا ١٩٤٧ شەبەنگەبەرۆژ: کۆمەڵە چیرۆکێکی کۆمەڵایەتی ڕیالیزمی، چاپخانەی معارف، بەغدا ١٩٤٧.

(٣) گەورەپیاوان: بەسەرهات و باسی کۆمەڵێ لەناوداران و گەورەپیاوانی ناو مێژووی کورد و هاوڕێی منداڵ: کۆمەڵێ باسی مێژوویی کورد، کۆمەڵایەتی، خووڕەوشت... بۆ منداڵان لەگەڵ وێنەی ڕەنگاوڕەنگ، چاپخانەی معارف، بەغدا ١٩٤٨.

گشتیدا، له بەغدادا، شاگردە کوردەکان داوایان کردبوو له فەرمانڕەوایی کە بمکات بەکاربەدەست (وەزیر)ێک له کاربەدەستەکان! خۆم ئاگام لەمە نەبوو[1]. فەرمانڕەوایی له پاش ماوەیەکی زۆر گلەیی لێ کردم و زۆری نەمابوو تاوانبارم بکات بەبەشداری (کۆمەنیستی)یەوە! بەپەلە پرۆسکێ ڕزگارم بوو. بەڵام کاری کرد له دوارۆژی فەرمانبەریم.. له مافی خۆم بەشبراویان دەکردم!. له ساڵی ١٩٥٤دا، له خوێشاندانێکدا، دانیشتووانی سلێمانی داوایان کرد بکرێم بە(سەرۆکی شارەوانی)... پێم گوترا بیکەم.. نەمکرد!.

ئەمانە هەمبوو نیشانەی خۆشەویستیی (گەلی کورد) بوون بۆ من، کە تا دەمێنم بەتاسوقەوە باسیان دەکەم و، بەسەربەرزییەوە له خانەی دڵمدا بەسرپاسێکی بێ پایانەوە دەیانپارێزم.

## شێخان

له ١٩٤٨/١١/١٢دا، بەدڵشکاوییەوە سلێمانیم بەجێ هێشت... له ١٩٤٨/١١/١٣دا گەیشتمە (شێخان). ڕۆژەکەی سارد و نسرم و کەوە ڕۆژبوو. کردی بەتەپوتۆز و ڕەشەبا. غوونەیەکی گەردولوولی ڕۆژگاری بەرامبەرم پیشان دەدا. (شێخان) خۆی کە (عین سفنی)یشی پێ دەڵێن، پێنج سەد ماڵێک دەبوو... زۆربەیان (یەزیدی) و نزیکەی سەد ماڵێکیشیان (مەسیحی) و (ئیسلام) بوون. بەڵام ناوچەکە هەمووی، نزیکەی (٢٥,٠٠٠) کەسێکی تێدابوو. نیوەیان (یەزیدی) و ئەوانی تریشیان (ئیسلام) و (مەسیحی) بوون. له (شێخان - عین سفنی)دا چەند دووکانێک و یەک دوو چایخانەی کزم تێدا دی. کڵێسایەک و مزگەوتێکی ناتەواو و، چەند قسێک کە یەزیدییەکان نوێژیان تێدا دەکرد، تاکە خوێندنگایەک، نەخۆشخانەیەک کە بێ پزیشک بوو، هەبوو[2]. نە ڕێگای قیرتاوکراوی هەبوو، نەڕێگای قیرتاوکراویش بە(مووسڵ)یەوە بەستبوو. بنکەیەکی زۆر دواکەوتوو له ناوەدانیدا، هەژار دەردەدار.

(١) ماموستا کەریم زەند، بێ ئەوەی من لێی بپرسم، له باسی شاکر فەتاحدا بۆم (پێنج شەممە ٢٠٠٢/٦/٦) وتی: هێند لەلای قوتابی و خەڵکی پەسەند بوو له خۆپیشاندانێکی بەغدا، کوردەکان ئەو داوایەیان بەرز کردبۆوە: شاکر فەتاح بکرێ بەوەزیر.

(٢) هەر بۆ ئەوەی قەبارەیەکی ئەو قەزایە (لەو ڕۆژگاریدا) بزانین، گوڵبژێرێک له کتێبەکەی (عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی) دەربارەی ئەو قەزایە دەخەینە ڕوو: «سەرۆکی ئێزیدییەکان له موسڵدا نازناوێکی تایبەتی هەیە؛ ئەویش (میری شێخان)ە، وە له گوندی باعەدرە دادەنیشن، له نێزیک ئەم گوندەش زیارەتگای شێخ عودەی بن موسافیری لێیە و ساڵانە دێن بۆ زیارەتی.

ژمارەی گوندەکانی ئەم قەزایە ٣٠٠ گوندە، مەرکەزی قەزاکە (عین سفنی)یە کە پێنج میل له باعەدرەوە دوورە، سێ ناحیەشی هەیە: عین سفنی، القوش بەپاڵ شاخی قوشەوە، بەعشیقە بەپاڵ شاخی بەعیشقەوە نێزیک بەشاخی مەقلوب؛ له گوندە بەناوبانگەکانی ئەم ناحیەیە گوندی بەحزانییە کە شوێنی سەرۆکەکانی ئێزیدییەکانە». (عبدالرزاق الحسني، موجز تأريخ البلدان العراقية، مطبعة النجاح، بغداد، ١٩٣٠، ص ١٤٠ - ١٤١).

نەخوێندەوار بوو. هێزی ئەلەکتریکیشی تێدا نەبوو. پرۆژەی ئاوەکەیشی نارێک و ناپوختە بوو. لە هەموو ناوچەکەدا، سێ خوێندنگای تریش هەبوون. خەریک بوون دوانیان دابخەن، لەبەر کەمی شاگرد، بەهۆی سەرپەرشتی نەکردنی جێنوشین و کارگێڕی زانیاری و کەمتەرخەمی (ئاغای شەرەفان) و (میری شێخان)ەوە. بەڵام لە گوندی (ئەلکوش - القوش)دا، کە گاوور بوون، دوو خوێندنگای زۆرباش و گەورە و پێشکەوتوو هەبوون، بێجگە لە خوێندنگای کڵێسا. تەنانەت پزیشکی ناوچەکەیش لە (ئەلکوش)دا دادەنیشت، نەک لە شێخاندا، کە لە پاشەجاردا من هێنامە بنکەی ناوچەکە. ئەویش لە پاش نامەکاری و تێکۆشانێکی دوور و درێژ!... «ئەلکوش» گوندێکی گەورەی پێشکەوتووبوو. بارستایی دەرامەت و خوێندەواری و تەندروستییان لە هی ئیسلامەکان و یەزیدییەکانیش گەلێک بڵندتر بوو. نزیکەی (٦٠٠) شەش سەد خێزانێکی تێدابوو. بەکشتوکاڵ و دەستکرد و بازرگانییەوە دەژیان.

لە ناوچەکەدا دوو جۆرە کڵێسا هەبوون: هی (کاتۆلیک) و هی (ئۆرتۆدۆکس). هەریەکە لەسەر رێیەک دەڕۆیشتن. هی کاتۆلیکەکان پێشکەوتووتر بوو. هەروەها لە ناوچەکەدا هەندێ (ئاسووری)یش هەبوون. گەلێک دێهاتی (شێخان) بووبوونە هی (موسڵییەکان). (عەبدوڵڵا ئاغای شەرەفانی) سەرۆکی هۆزی شەرەفان هەموو دەم لە گێرەوکێشە و بەربەرەکانێدا بوو لەگەڵ ئەو (موسڵی)یانەدا!... جەزرەبەی بەهەندێکیان گەیاندبوو. هەروەها یەزیدییەکانیش لەسەر خاکی باووباپیران، گرفتاری هاتوچۆی دادگاه و فەرمانڕەوایی بووبوون، لە بەرەنگاریی کردنی (موسڵی)یەکاندا. لەبەر ئەوە ناحەزی و دوژمنایەتییەکی نهێنیم هەست پێ دەکرد لە ناوەند ئەو کوردانە و (موسڵی)یەکاندا. کوردەکان دەیانگوت: «موسڵییەکان ئەم هەموو زەوییانەیان بەفرۆفێڵ لە دەست کردوونەوە!». (زێدیکی)یەکان کە زۆربەیان کۆچەر بوون، بووبوون بەدوو بەشەوە: بەشێکیان لەگەڵ (شەرەفان)، بەشەکەی تریشیان لەگەڵ (یەزیدی)یەکاندا بوون. بەڵام هەموو لایەکیان دادیان بوو لە دەست فەرمانبەرانی خراپ، لە کۆنەوە تا ئەوسا. یەزیدییەکان بەئاشکرا دەیانگوت: «ئێمە حەز لە فەرمانڕەوایی کورد دەکەین. چونکە هەر ئەوانن کە بەزەییان پیاماندا بێتەوە و رێزمان لێ بگرن». لە راستیدا هەر سێ دەردەکە: (هەژاری، نەخوێندەواری، نەخۆشی) لەگەڵ هۆزی ئەو دەردانەدا کە (زۆرداری) بوو بەئاشکرا لە شێخاندا هەست پێ دەکرا. نزیکەی ساڵ و نیوێک پتر لەناویاندا مامەوە. هەموو دەرد و ئازار و ئاواتیانم لە پارێزگاری (موسڵ)، بەڵکو لە هەموو فەرمانڕەوایی ئاشکرا کرد. تەنانەت بەهۆی رۆژنامەکانی (موسڵ) و (بەغدا)یشەوە ئەو شتانەم دەرخست. لە ئەنجامدا ئەو خوێندنگایەی بەختراپی لە گوندی (مرێبا)دا داخرابوو بەفەرمانڕەواییم کردەوە. خەریک بوون خوێندنگاکەی (باعەدرە)یش دابخەن، کە لە بنکەی (میری شێخان) یاخود (میری یەزیدییەکان)دا بوو. باش بوو فریاکەوتم. نەمهێشت ئەویش دابخەن. هەروەها بەڵێنی کردنەوەی دوو خوێندنگای تریشم بۆ یەزیدییەکان وەرگرت. ئەو خوێندنگایانەیش کە هەبوون، یاخود داخرابوون و کرانەوە، پێتاکم بۆ شاگردە هەژارەکانیان کۆ کردەوە. «خوێندنی بەزۆر - التعليم الاجباري»م لە گوندی (باعەدرە) و (مرێبا)دا دامەزراند. لەمانە هەم (عەبدوڵڵا ئاغا) سەرۆکی هۆزی (شەرەفان)، هەم (تەحسین بەگی عەلی بەگ) میری شێخان یارمەتییەکی باشیان دام و، بەدڵیش سوپاس و رێزی خۆم پێشکەش کرد.

بەهۆی یارمەتیی دانیشتووانی ناوچەکەوە، (سەیرانگاه - منتزە)یکم لەسەر «سەرچاوە» لە بنکەی شێخاندا دامەزراند. ئەستێرکێکی ڕازاوە بە(گوڵ) و چەند (وێنە)یەکی بەزماوی ڕەنگاوڕەنگ و دەستکرد، لەگەڵ کۆرەپانێک بۆ دانیشتن. لە ئاهەنگێکی گەورەدا، لە ساڵی ١٩٤٩دا، پێشکەش بە(گەل)م کرد. لەوێدا وتار خوێندرایەوە، هەڵپەڕکێ کرا، چای و جگەرە و میوە و خواردەمەنی پێشکەش کرا. سوپاسێکی یەزیدییەکان و ئەوانی تر کە یارمەتییان دابوو کرا. ئیتر لەوەپاش، جاروبار، ئاهەنگی تایبەتی و گشتیمان لەو سەیرانگایەدا دەکرد.

***

بەجۆرێکی توندوتیژ بەرەنگاریی دزی و زۆرداری ناو هۆزەکانم کرد. خۆشبەختانە ئاسایش و، باوەڕکردن بەدادی فەرمانڕەوایی، بەتەواوەتی، جێگیر بوو. هەروەها چەند فەرمانبەرێکی دز و بەرتیلخۆریشم تەفروتوونا کرد. پزیشکێکیشم بۆ شێخان سەند.

داخەکەم لەبەر دەستکورتی فەرمانڕەوایی، بەهۆی شەڕی فەڵەستینەوە، ماوە نەدەدرا، هەموو پێشنیازەکانم جێبەجێ بکرێن لە شێخاندا، وەک: پرۆژەی ئەلەکتریک و، ئاو و، قیرتاوکردنی ڕێگای (شێخان - مووسڵ) و، قیرتاوکردنی شەقامەکانی ناو شێخان خۆی. وەک سەرنجم دا پاش جوێ بوونەوەم بەشەش ساڵ دەستیان پێ کرابوو! بەڵام یانەیەکم بۆ فەرمانبەران کردەوە. بۆم پڕکردن لە نووسراوی نایاب نایاب و بابەتی گەمە و یاری و پێکەنین و ڕادیۆیەک. بەم یانەیە، دەرگایەکی خۆشی و کامەرانی لە فەرمانبەران کرایەوە. لە شێخاندا دوو بەرهەمی وێژەییم دانا: یەکێکی نووسراوی (مامۆستا) یەکێکیشی گەلالەی نووسراوی (یەزیدییەکان و ئاینی یەزیدی). لە ساڵی ١٩٦٩دا نووسراوی (یەزیدییەکان و ئاینی یەزیدی) تەواوکرا و لە چاپ درا[1] هەرچەندە لە شێخاندا هەندێ ئەرک و ئازاری تایبەتیم هاتە ڕێ بەهۆی مردنی باوکی ژنەکەم و، خاڵمەوە و، بەهۆی سووتانی خانووەکەمان و، نەخۆشی خێزانەکەمەوە، هەروەها بەهۆی دووری شێخان لە ڕابواردنێکی شارستانییەوە... بەڵام وەها هۆگری دانیشتووانی ناوچەکە و فەرمانبەرانی ناوچەکە بووبووم، وەک خێزانێک لەگەڵیاندا گوزەرانم دەکرد. پڕ بەدڵیش هەستم بەکامەرانی و خۆشەویستی دەکرد!.

کاتێ گوێزرامەوە، (میان خاتوون)، میرژنی یەزیدییەکان بۆی نووسیم کە ئامادەیە بۆم تێبکۆشێ تا بەغدا، بۆ ئەوەی لە شێخاندا بمهێڵنەوە... دانیشتووانی ناوچەکە و فەرمانبەران زۆر پێیان ناخۆش بوو کە لێیان جیا ببمەوە. چ ئەوان، چ فەرمانبەران بەوپەڕی ڕێزەوە، پاش ئاهەنگ و وتارێکی زۆر، تا سنووری ناوچەکە ڕەوانەیان کردم، تا دەمێکی دوور و درێژیش نامەکاری لە ناوەند من و گەلێکیاندا مابوو. بەڵام ئەو خۆشەویستییەی لە دڵماندا جێگیر بووبوو، ئێستایش ماوە نەبڕاوەتەوە.

(١) ئەم کتێبەی مامۆستا لەگەڵ هەندێ کەموکورتیشدا بەسەرچاوەیەکی گرنگ و باوەڕپێکراو دادەنرێ لە بارەی ئێزیدی و باوەڕەکەیانەوە، لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی وردە. (یەزیدییەکان و ئاینی یەزیدی، چاپخانەی کامەران. سلێمانی ١٩٦٩).

## ئاکرێ

لە ١١/٦/١٩٥٠دا گەیشتمە (ئاکرێ). ئەو کزەبا فێنکەی لە شاخە بەرزەکانی (ئاکرێ)وە دەهات، لەگەڵ چاونەندازە جوانەکانی شاخ و باخەکانی و، ڕێکوپێکی شارەکە و، دڵتەڕی دانیشتووەکانی، ماندوێتی ڕێگایان لەبیر بردمەوە. زۆر دڵخۆش بووم بەشارستانێتی ئاکرێ. ئەو ئێوارەیە بەملکەچییەکەوە کڕنووشی سوپاس و ئەوازشم کێشا بۆ خودا کە بۆ ئەو، شوێنە خۆشەی گوێزامەوە. ئاکرێ (١١٠٠) ماڵێک و (٥٠٠٠) کەسێکی تێدابوو. ژمارە سەری هەموو ناوچەکەیشی (٣٥,٠٠٠) کەسێک دەبوو. بازاڕ و دووکانێکی باشیشی تێدا دامەزرابوو. بەهۆی ئەو (٥٠٠) سەربازەوە کە لەوێ جێگیر بووبوون، هەروەها بەهۆی هاتوچۆی زێباری و بارزانییەکانەوە بۆ ئەوێ بازاڕەکەی لە گەڕدابوو. بارستایی ژیانی دانیشتووەکانی لە هی هەموو باژێڕەکانی تری بادینانم باشتر هاتە پێش چاو. دانیشتووەکانی هەر چەندە ئاکۆکی و بەربەرەکانێیان لەناودا هەبوو، بەهۆی هۆزایەتی (بارزانی) و (سورچی) و (زێباری) و (هەرکی)یەوە، بەڵام ڕەوشت و خوویەکی شارستانیم تێدا دەدین. پیاوی بەچنگ و زرنگ و وریام زۆر تێدا دەدی. هەموو تینووی پێشکەوتن بوون. داوای بەهێزکردنی پرۆژەی ئاو و، ئەلەکتریک و، کردنەوەی خوێندنگا و، پاک و خاوێنی شەقامەکان و کردنەوەی ڕێگایان دەکرد بۆ ئاکرێ و بۆ بنکەی لادێیەکان. تا لەوێدا بووم، هەستم بەخۆشەویستی و یارمەتییان دەکرد. وایان لێ کردبووم، خۆم بەیەکێک دەزانی لەوان. ئەو ژیانە خۆشەی لەوێدا ڕامبوارد لە هیچ ناوچەیەکدا ڕام نەبواردووە! لەگەڵ ئەمەیشدا کە خۆم زۆر ماندوو دەکرد لە ئاکرێدا، بەڵام چونکە لە دانیشتووەکانی ئاکرێوە پشتیوانی و ڕێزگرتن و خۆشەویستیم دەدی، ئەو ماندبووبوون و ئەرک و ئازارەم نە دەهاتە پێش چاو. بۆ هەر جێگایەک دەچووم لە دەرەوەی ناوچەی ئاکرێ، سوپاسگوزاری و خۆشەویستی و ڕێزگرتنی دانیشتووانی ئاکرێیان بەرامبەر بەمن دەگێڕایەوە. تەنانەت لە ڕۆژنامەکانی (موسڵ) و (بەغدا)یشدا ئەو هەستە نەژادانەی خۆیان بەرامبەر بەمن دەردەبڕی. کاتێک گوێزرامەوە لە ئاکرێ، چوار پێنج ئاهەنگی گەورە گەورەیان بۆ کردم. مانیان گرت لە چوونە فەرمان. تەلگرافیان نارد بۆ کاربەدەستانی (موسڵ) و (بەغدا). خۆپیشاندانیان کرد: هەر بۆ ئەمەی فەرمانڕەوایی پەشیمان بکەنەوە لە گوێزاندنەوەم و، بمهێڵێتەوە لە ئاکرێ!. هەتا خۆم تکایەکی زۆرم لێ نەکردن، بڵاوەیان لێ نەکرد و نەچوونەوە ناو دووکانەکانی خۆیان و، وازیان لە تەلگراف ناردن نەهێنا!. هەندێکیان دەیانویست پەیکەرم بۆ بکەن. هەندێکیان دەیانویست وێنەیەکی گەورەم لە یانەکەیاندا هەڵبواسن و، ناوی کار و کردەوەکانمی لەژێردا بنووسن. هەندێکیان دەیانویست خۆم بکەم بەئاکرێیی و، لە دەمگای سەرژمێر (دائرة النفوس)ی ئاکرێدا خۆم ناونووس بکەم. هەندێکیان دیارییان بۆ هێنام. کە چوویشمە ناوچەکانی تر، هەموو ساڵێک سەرۆک و تێگەیشتووەکانیان سەریان لێ دەدام، یان نامەکارییان لەگەڵ دەکردم. لە هەر کوێیەک بگیرسامایەوە ئاکرێییەکی لێ بووایە، ناسیاو بووایە، یان نەناسیاو، سەری لێ دەدام بۆ خۆ پێ ناسین و نواندنی خۆشەویستی. لەم ڕەوشتە بڵندانەی ناوچەی ئاکرێوە تێگەیشتم کە چەند ئەمانە نیشتمانپەروەرن و، حەز بەدۆستایەتی و چاکە دەکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە حەز بەدۆستایەتی و چاکەیان دەکەن.

پاش گـوێزانەوەم بۆ (ئامـێـدی)، تا چەند مـانگێکیش هەرچەند جـۆێ بوونەوەی خـۆم لە ئاکـرێ بیردەکەوتەوە، گریانم دەهات، خەفەتم دەخوارد، ئاواتم دەخواسـت زوو بەزوو بچمەوە ناویان.

تکام وایە لە خوێندەواری بەڕێز وا تێنەگات کە ئەمەندەم درێژە دا بەقـسـەکردن، مەبەسـتم خۆنرواندن بێ. تەنیا مەبەسـتم ئەوەیە ڕاسـتی ڕەوشت و خووی دانیشـتووانی ئاکرێ پیشان بدەم بۆ هەمووان؛ تا ئەو درۆ و دەلەسـە و چاوڕاوانەی لەم بەسـەزمـانانە کراوە و لە زۆر کۆنەوە دەکرێ، بۆ پیـاوی دەروون پاک دەربکەون.

هەروەها فەرمانڕەواییش باوەڕ بەنووسـینی فەرمانبەرە خراپەکان نەکات و، ئەم کلۆڵانە لەمە بەولاوە دوا نەخات و لە پێشـخـسـتنیـاندا کەمتـەرخەمی نەکات! تەنانەت بەم نیازەوە و بۆ ئەم مەبەسـتەیش، بەباشم زانی نووسـراوێک لەسـەر ئاکرێ بنووسمەوە. لە ١٩٥١/١/١٥دا نووسـراوەکە تەواوبوو. لە یانەی ئاکرێدا هەر هەفتەی چەند لاپەڕەیەکیم بۆ دانیشـتووانی ئاکرێ دەخوێندەوە. لە ڕۆژنامە عەرەبییەکانی (بەغداد) و (مووسـڵ) و (هەولێر)یشدا، بەش بەش بڵاوم دەکردنەوە. خۆشبەختانە لە پاش سـاڵ و نیوێک من و دانیشـتووانی ئاکرێ، توانیمان ڕاستی ئازار و ئاواتی ناوچەی ئاکرێ لە فەرمانڕەوایی، بەڵکو لە هەموو لایەکی عێراق بگەیێنین. هەموو لایەکیش بخەینە سەر یارمەتیدانی ئاکرێ!.

بەهۆی ئەو یارمەتییانەوە: (سـەیرانگای کانی زەر)، (بەهەشتی منداڵان)، (سـەیرانگای سـیپە)، (سـەیرانگای سـەری گری)، (سـەیرانگای سـەرا)، (یانەی فەرمانبەران)م لە ئاکرێدا بۆ خۆش ڕابواردن و کەلکی دانیشـتووانی شاری ئاکرێ و میوانانی ناوچەکە دروست کرد و دامەزراند. هەریەکێ لەم پرۆژانەم لە ناو ئاهەنگێکی گەرم و گوڕ و پڕ بەزم و ڕەزمدا، بەسـوپاسـێکی زۆرەوە پێشکەشی گەل دەکرد. لە (یانە)کەدا، تێکڕا هەموو هەفتـەیەک وتار دەخوێندرایەوە بۆ وریاکردنەوەی دانیشـتووان. هەندێ جار (چیرۆکی لاسـایی) پێشـکەش دەکرا. ئەندامـەکانی یانەکە، هەریەکەیان بەئارەزووی خۆی لە یەکێ لە لیژنەکانی یانەکەدا هاوبەش دەبوو و، کاتی خۆی بەخۆشـیـیەوە لە یانەکەدا دەبرە سـەر. لە یانەکەدا: گۆرانی، سـاز و ئاواز، هەڵپەڕکێ، نووسـراو خوێندنەوە، یاریی واغێنی تازەبابەت و، شەترەنج، تاوڵە، دۆمینە، پینگ پۆنگ، نیشانشانەوە و، گەلێک شتی تر لەلایەن ئەندامەکانەوە کاتیان پێ ڕادەبوێررا. قومار قەدەغەکرابوو. بەڵام خواردنەوەیەکی بەئەندازە و خواردن هەبوو.

یانەکە کرابووە مامۆسـتایەک بۆ ئەندامەکان، بووبووە پێشـڕەوێک بۆ هەموو دانیشـتووانی ناوچەکە. هەموو لای کێش دەکرد بۆ چاکە و پیاوەتی و نیشـتمانپەروەری و بەکەلک هاتنی ناوچەکە بەتایبەتی. لەگەڵێک لاوە دیاری و نووسـراو و گۆڤار و ڕۆژنامەکانی بۆ دەنێررا، تەنانەت لە (بەغدا) و (بەسـرا) و (مووسـڵ)یشـەوە. لەسـەر خواسـتی من، هەندێ لە دەوڵەمەندەکانی ئاکرێ و سـەرۆک هۆزەکان، هەندێ سـاختمانی پێویـسـتیـان دروست کرد بۆ حەواندنەوە و، بۆ خۆشتن: ڕێگایان کردەوە و تەختیـان کرد بۆ کەلکی گشتی. هەموو جار لە ڕۆژنامە هەفتەییـیەکەماندا، (ئاکرێ)، کە بەدەسـت دەمنووسـییەوە و بەیەک دانەیش دەردەچوو، سـوپاسی ئەو جۆرە پیاوە باشانەم دەکرد و، تیژم دەکردنە سـەر چاکەی گشتیی.

ئەم ڕۆژنامـەیە لە (سـەیرانگای سـەرا)دا هەڵدەواسـرا بۆ خوێندنەوەی هەمـووان. نزیکەی دوو سێ

مانگێک خەریکی وریاکردنەوەی دانیشتووانی ناوچەکە بووم لەگەڵ هاندانیان بۆ چاکەی گشتیی. پاشان لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی وازم لێ هێنا[1]. لە بریتی ئەوە لە یانەکەماندا -پاش دامەزراندنی لە ساڵی ١٩٥١دا- نووسراوی (ئاکرێ)م دانا و، وەک لەوە پێش گوتم، چ لە کۆبوونەوەکاندا، چ لە ڕۆژنامەکانی (بەغداد) و (مووسڵ) و (هەولێر)دا لاپەڕەکانیم بڵاو دەکردەوە. بەپارەی شارەوانی و فەرمانڕەوایی و یارمەتی دانیشتووانی ناوچەکە، پێنج ڕێگا لە ئاکرێدا کرایەوە، دوو هەزار مەترەک ژێراب دروست کرا. بەپارەی فەرمانڕەوایی کە لە ئەنجامی تەقەللایەکی زۆردا دەستکەوت، چەند ڕێگایەکی گشتی کرایەوە لە ناوەند ئاکرێ و بنکە لادێیەکاندا: (بجیل) و (بەردەڕەش) و (ئامادە). پرۆژەی ئاو و ئەلەکتریک بەهێز و فراوان کران لە ئاکرێدا. هەروەها بەفەرمانڕەوایی بڕیار دەرکرا کە (ئاکرێ) بکرێت بەبنکەیەکی هاوینەهەوار، میوانخانە و چایخانە و باخچە و ڕێگا و گەلێ شتی تری تێدا دروست بکرێ: کە بەو هۆیەوە دانیشتووەکان دەرامەتیان پێش بکەوێ. هەروەها پێنج خوێندنگایش لە ناوچەکەدا، کرانەوە. لە پاش مانەوەیەکی نزیک بەدوو ساڵ، داخەکەم لە (ئاکرێ)وە گوێزرامەوە بۆ (ئامێدی). بەفرمێسکێکی خوێنین و دڵێکی خەمگینەوە جیابوومەوە. دەمویست زۆرتر بمێنمەوە تا ئەو پرۆژانەی مابوون تەواویان بکەم. پێویست ناکات دووبارەی بکەمەوە، کە دانیشتووانی ئاکرێ و ناوچەکەی لە خۆم دڵتەنگتر بوون بەم گوێزانەوەیە[2].

لە پێش ئەوەی قسەکەم تەواو بکەم، پێویستە پیشانی بدەم کە بەهۆی یارمەتی هەندێک سەرەک هۆزانەوە ژمارەیەکی زۆر لە تاوانباران، کە لە دەست دادگا ڕایان کردبوو، خۆیان دا بەدەستەوە و، درانەوە بەدادگا، بۆ ئەوەی کێشەکانیان بیڕێنێتەوە. لە ئەنجامی کۆششێکی زۆردا، ئاسایش و ئارام و ئاشتی هەموو ناوچەکەی گرتەوە.

حەز دەکەم دووبارە سوپاسی گەرم و گوڕی تا سەرە بۆ دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێ تازە بکەمەوە، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە لەگەڵمدا ماندووبوون و ئەرک و ئازاریان چێشت، لە پێناوی گەلکی ناوچەکەدا، بێ ئەوەی چاویان لە سوپاس یاخود لە پاداشتێکەوە بێ!.

(١) دواتر ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامەیە کە بەدەستنووس بوو، مامۆستا بەپێشەکییەکی خۆیەوە لە ١٩٨٤دا بەچاپی گەیاند. (ڕۆژنامەی ئاکرێ - شاکر فەتاح، چاپخانەی الحوادث، ١٩٨٤، بەغدا). بەڵام لە ئەسڵدا ڕۆژنامەکە خۆی بەعەرەبی دەرکراوە، مامۆستا بۆ لە چاپدانەوەی گێڕاویەتە سەر کوردی لەگەڵ لابردنی چەند بابەتێکدا.

(٢) هەر بۆ نموونەی ڕادەی خۆشویستنی خەڵکەکەی ئاکرێ، لەناو پەڕەکانی ڕۆژنامەی ئاکرێ (دەستنووسەکەی) ئەم پارچە شیعرەم دۆزییەوە لە پەڕەکاغەزێکدا بوو، خاوەنەکەی (سەدرەدین) ناوێک بۆ مامۆستای نووسیوە. منیش وەک خۆی و هەر بەو ڕێنووسە دەیخەمە پێش چاو:

بۆ سعادەتی قائیمقام آکرێ پێشکەشە...

یاخوا بەخێربێی صد جاران مالی آوا

جێگەی بو مە جوان کردن لەناو باغو دەراوا =



= دورجن آوە تولوکرد لەناو باغی گورلوا
قضا همو کیف خوش بو هتا مندالی ساوا
ایستاش خریکی بکە لە هنداوی سرای
نزارەتی چند خوشە برام بری دنیای
همو جیگەی دز ابون لە پیش هاتن او زاتە
ایستا همو مصیفن خودای بدە بخاتە
بەخوی پیاوی چاکە گوی ناداتە غاما
چند مشروعیش دانان وکی نادی و حماما
إیشوکاری پیداکرد لیورد تو چپلاق
نذافتی دست پی کرد هتا گەیشتە حلاق

«صدرالدین»

لە ژمارە (٧)ی ڕۆژنامەکەدا ئیشارە بەو هەڵبەستە دەدات کە لەلایەن (شێخ سەدرەدین شێخ بەدیع
ئەلسورچی)یەوە نێرراوە، بەڵام شیعرەکەی بڵاو نەکردۆتەوە.

# ئاگرێ

ژمارە: (١)
ڕۆژ: ١٩٥٠/٧/١٥

## پیشکەشکردنی ڕۆژنامەی ئاگرێ

براگەل! دانیشتووانی بەڕێزی ناوچەی ئاگرێ!

بەناوی خودای گەورە و میهرەبانەوە دەست پێ دەکەین. دوای ئەوە حەز دەکەین ئاگادارتان بکەین، کە (سەرۆکایەتیی شارەوانیی ئاگرێ) هەستی پێ کرد، هیچ (ڕۆشنبیرییەکی ئاراستەکراو) لە ناوچەی ئاگرێدا لە ئارادا نییە. لەبەر ئەوە بڕیاری دا هەموو بەیانییەکی شەممان، لە هەموو هەفتەیەکدا، ئەم (ڕۆژنامەی ئاگرێ)یەتان بەیەک دانە، بەدەستنووس بۆ دەربهێنێ و لەناو (سەیرانگای فەرمانبەران)دا، کە لەبەر دەرکی سەرادایە، لەسەر تەختەیەکی چوارچێوەدار بۆتانی هەڵبواسێ. ئەویش بۆ ئەمەی کەڵک و خۆشی لێ وەربگرن. شارەوانی ئاگرێ دەستەیەکی لە فەرمانبەران پێک هێناوە، بۆ ئەمەی لەژێر سەرپەرشتی خۆیدا ئەم ڕۆژنامەیە دەربهێنن. دەستەی نووسەران شتی وا دەنووسن کە ڕاستەوڕاست پەیوەندیی بەکەڵک و چاکەی دانیشتووانی ناوچەی ئاگرێوە بێت. هەروەها لە شێوەیەکی ڕۆشنبیرانەی

نارِاستەکاردا خۆیان خەریک دەکەن بەچارەسەرکردنی گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمەکانی ناوچەکەوە. بێجگە لەوە هەر دەنگوباسێک خۆش بێ و بەکەلک بێ بۆ نەوان، نەوەیان پێشکەش دەکەن. بەلام لە زرنگکاری (سیاسەت) نادوێن. لێکۆڵینەوەی ناوازە و نایابیشیان بۆ دەنووسن. ئێمەیش لە خودا دەپاڕێینەوە، یارمەتی سەرۆکایەتی شارەوانی ئاکرێ بدات، بەئامانجی خۆی بگات، کە ئەویش سەرکردایەتیکردنی دانیشتووانی ناوچەکەیە و نارِاستەکردنیانە بۆ ژیانێکی وەها کە پڕی بێ لە کامەرانی و خۆشگوزەرانی و تەندروستی و سەرکەوتن و سەربەرزی.

کەواتە با باوەڕ بەخودا بکەین و، لەسەر فەرموودەکانی ئەو برِۆین بەرێوە، بۆ ئەمەی بگەین بەئامانجمان. بێگومان ئەگەر وەهامان کرد و، دانیشتووە بەرِێزەکانی ناوچەی ئاکرێش یارمەتیان داین لە پێشکەوتنی خۆیاندا، بەئاواتی خۆمان دەگەین. ئیتر دەست لەدەست و هێز لە خوداوە براکان.

ئاکرێ: ١٩٥٠/٧/١٥

شاکر فەتاح

(سەرۆکی شارەوانی ئاکرێ)

(جێنوشین)

پێغەمبەر فەرموویەتی

«بۆ جیهانەکەت وا تێبکۆشە هەروەک هەتا سەر بژیت. بۆ پاش مردنیشت وا تێبکۆشە هەروەک سبەینێ بمریت».

(محەممەد پێغەمبەر)

## هەواڵی ناوخۆ

جێنوشینی نوێ

جێنوشینی نوێ (قائیمقام)، شاکر فەتاح لە رۆژی ١٩٥٠/٦/١١دا پاش نیوەڕۆ دەستی کرد بەفەرمان هێنان. هەموو فەرمانگە (دائرة)کانی بنکەی ناوچەکە و بنکەی لادێیەکانی پشکنی. نامەیەکی دوور و درێژی نارد بۆ بارەگای پارێزگاری موسڵ، هەرچی پێویستییەکی ناوچەکە هەبوو داوای لێ کرد بۆی جێبەجێ بکرێ. جا ئەنجام بەچی گەیشت لە کاتی خۆیدا خوێندەوارانی رۆژنامەکەمانی لێ ئاگادار دەکەین.

## مانگی رۆژووی پیرۆز

مانگی رۆژووی ئەم ساڵ مانگێکی پڕ پیت و فەڕ بوو بۆ بازێڕی (ئاکرێ). چونکە هەر ئەوەندە (سەرۆکایەتیی شارەوانیی ئاکرێ) داوای یارمەتی و پشتگیریی کرد لە دانیشتووانی شارەکە، چ فەرمانبەران و، چ کەسانی تر، هەموویان بەکوڵی دڵەوە دەستیان کرد بەیارمەتیدانی، لە پێکهێنان و

ڕاپەڕاندنی پرۆژەکانیدا کە بۆ پێشخستنی ناوچەکە لە بابەت (ئاوەدانی) و (ڕۆشنبیری) و (تەندروستی)یەوە بڕیاریان لەسەر دراوە. جا لەم مانگە پیرۆزەدا ئەم پرۆژانە تەواو بوون:

١- پیسی و پۆخڵی ناو کۆڵان و شەقامەکانی شاری (ئاکرێ) تا ئەندازەی ٨٠٪ یان پاک کرانەوە لەمەدا فەرمانبەرەکانی شارەوانی و بەڕێوەبەرایەتی و باڵبازی و دادگەری و دانیشتووانی شاری ئاکرێ یارمەتییان داین.

٢- پاک و خاوێنی ناو چایخانەکان و میوانخانەکانیش چ لە ڕووی خواردنیانەوە و خواردنەوەیانەوە پێک هێنرا.

٣- دەست کرا بەداپۆشینی جۆگەلە پیسەکان کە (٩٠٠) گەز درێژەبنەوە. تا ئێستاکە (١٤) گەزیان لێ داپۆشراوە.

٤- باخچەیەکی گشت لایی، بۆ خۆش ڕابواردنی دانیشتووانی ناوچەکە، لەبەر دەرکی سەرادا دامەزرێنرا، پێوانەی ڕووی (١٥٠) گەزی چوارگۆشەییە. فەرمانبەرانی (بەڕێوەبەرایەتی) و (شارەوانی) و (ئاو و کارەبا) و (کشتوکاڵ) و (زانست) لەمەدا یارمەتییان دا.

٥- ئەو ڕێگا سەختەی کە کەوتووەتە ناوەند ماڵەکانی شاری ئاکرێ و (کانی زەر)ەوە، تەخت کرا. لەمەدا فەرمانبەرانی بەڕێوەبەرایەتی و شارەوانی و باڵبازخانە و دانیشتووانی شاری ئاکرێ یارمەتییان دا.

٦- لەسەر سەرچاوەی (کانی زەر) سەیرانگەهێک دروست کراوە لەسەر شێوەیەکی نوێ. ناوی نرا (سەیرانگای کانی زەر). ئەمەیش بۆ کەلک و خۆش ڕابواردنی دانیشتووانی شاری ئاکرێ و ناوچەی ئاکرێیە. لە مەیشدا فەرمانبەرانی بەڕێوەبەرایەتی و شارەوانی و باڵبازخانە و ئاو و کارەبا و دانیشتووانی ئاکرێ یارمەتییان دا.

(شارەوانیی ئاکرێ)یش: لە کانگای دڵیەوە سوپاسی جوامێری و مەردایەتی هەموو ئەو کەسانە دەکات و ڕێزیان پێشکەش دەکات.

## لەناوبردنی نەخوێندەواری

هەر ئەوەندە جێنرشین پێشنیازی خۆی خستەڕوو لە بەردەم مامۆستاکان: (سالح کەریم خان) و (جەمیل سەبری) و (عەبدولڕەحمان عەبدوڵلا)دا، لە بابەت لە ناوبردنی نەخوێندەوارییەوە، هەر سێ برای بەڕێز بەڕوویەکی خۆشەوە، ئەو فەرمانە نیشتمانییەیان گرتە ئەستۆی خۆیان. بەڵێنیان دا بەشەو لە ساختمانی خوێندنگای سەرەتایی ئاکرێدا، وانا بەنەخوێندەوارەکان بڵێنەوە، بێ ئەمەی هیچ پاداشێک داوا بکەن. هەر لە یەکەم هەفتەیشەوە بەڵێنەکەی خۆیان جێبەجێ کرد. شارەوانیی ئاکرێیش لەسەر ئەرکی خۆی هێزی کارەبای بۆ ڕاکێشا و نرخی کارەباکەیان مانگ بەمانگ ئەو دەیدات. ئێستاکە لەم خوێندنگا شەوییەدا کە بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری دامەزرێنرانە (٤٢) شاگرد دەخوێنن، کە پیشەیان جۆربەجۆرە.

بێگومان ئەم خۆبەخت کردنە گەورەیە کە ئەو مامۆستا بەڕێزانە پێشکەشی نیشتمانەکەی خۆیانی

دەکەن، ئەنجامی زۆر باشی لێ پەیدا دەبێ بۆ ئەو نەخوێندەوارانەمان و، بۆ هەموو لایەکیش. لەبەر ئەوە کار و کردەوەی ئەم مامۆستایانە چ لەلایەن دەسگای بەڕێوەبەرایەتییەوە، چ لەلایەن دانیشتووانی شارەکەوە، بەرێز و خۆشەویستییەوە پەسند کراوە. ئێمەیش لە خودایان دەوێ پاداشیان بداتەوە و، لە ژیانیشیاندا سەریان بخات، تا زۆرتر بەکەلکی نیشتمانەکەیان بێن.

## جەژنە پیرۆزی

بەبۆنەی جەژنی مانگی رۆژووی پیرۆزەوە، (رۆژنامەی ئاکرێ) جەژنە پیرۆزێ لە هەموو دانیشتووانی (ناوچەی ئاکرێ) دەکات. لە خودایشی دەوێ هەموو دەم لە خۆشی و کامەرانیدا بن.

## یانەی فەرمانبەران

(جێنوشینی ئاکرێ) هەستی پێ کرد، کە فەرمانبەرەکانی ئاکرێ، داماون لەسەر جێگایەکی شایستەی خۆیان، کە بتوانن تێیدا بحەسێنەوە و، بەخۆشییەوە راببوێرن و، کەلک و چاکەیشی لێ وەربگرن. لەبەر ئەوە داوای لە پارێزگای موسڵ کرد، داوا لە کاربەدەستی (وەزارەت)ی کاروباری ناوخۆ بکات، رێ بدات، یانەیەک لە ئاکرێ دابمەزرێترێ ناوی بنرێ (یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ). بەڵام فەرمانبەرە هۆشیارەکانی ئاکرێ، چاوەڕوانی هاتنی رێگەدانەکەی کاربەدەستی کاروباری ناوخۆیان نەکرد، بێت بۆ کردنەوەی یانەکەیان زووبەزوو لەناو خۆیاندا پارەیەکی باشیان کۆکردەوە، (٢٢) تەختی دانیشتنی رەنگاورەنگ و جۆربەجۆر و جوان دروستکراویان کڕی، لەگەڵ هەندێک یاری و چەند مێزێک و کۆمەڵێک نووسراودا. ئەویش هەر بۆ ئەمەی هەر لە ئێستاوە خۆیان ئامادە بکەن بۆ کردنەوەی یانەکەیان. شارەوانی ئاکرێیش جێگایەکی ناوازە و نایابی هاوینەی بۆ یانەکەیان ئامادەکرد لە سەرچاوەی (کانی زەر)دا بەکرێ دەیانداتێ. ئەوەیش بەباش دەزانین بیڵێین کە یاسای یانەکەمان (قومار) بەربەست دەکات لە یانەکەدا. بەناو دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێیشدا، لە رێگای وتاردان و، وتوویژ و، ئاهەنگ و لاسایی کردنەوە و، گرەوی زانستی و ئابووری و تەندروستییەوە رۆشنبیری بلاودەکاتەوە. کە کاتی خۆیان هات ئەنجامەکان بلاودەکەینەوە.

## دەوڵەمەندەکانی ئاکرێ رێگای چاکەی گشتی دەگرنەبەر

لە ئەنجامی گفتوگۆیەکی کورتدا کە (سەرۆکی شارەوانیی ئاکرێ) کردی لەگەڵ (دەوڵەمەندەکانی ئاکرێ)دا، وەک (حاجی جومعە) و (خورشید ئەفەندی) و (عەبدوڵلا چیچۆ) و (کەریم خان) و (سەعیدی حاجی شەریف) و (عەبدوڵلای حاجی سادق) و (حاجی حامید)، ئەو مرۆڤە بەرێزانە بڕیاریان دا هەریەکەیان شتێک دروست بکات، وەک: (ساختمانێک بۆ سینەما)، (گەرماوێکی نوێ)، (ساختمانێک بۆ یانەی فەرمانبەران)، (ئۆتۆمبیل خانەیەک)، (چاپخانەیەکی باو)، لەگەڵ (پێنج خانوو)دا بۆ نیشتەجێی فەرمانبەران. تەنانەت بڕیاریشیان دا کە لە پاش ئەم جەژنی رۆژووە، دەمودەست دەست پێ بکەن. ئەمەیش لە سەرێکەوە بۆ ئەوەی فەرمان بۆ بێ فەرمانان بدۆزنەوە و هەژاران بەو

فەرمانانە ببووژێنەوە و، لە رووی (کۆمەڵایەتی) و (ئابووری) و (تەندروستی)یشەوە کەلک و خۆشی بەدانیشتووانی ناوچەکە بگەیێنن، کە لەسەر ئەو بابەتانە لە دەمێکەوە داماون. ئێمەیش لە کاتی خۆیدا ئەنجامی بەڵێنەکانی ئەو دەوڵەمەندە بەرێزانە بۆ خوێندەوارانی رۆژنامەکەمان دەگێڕینەوە. لە کانگای دڵیشمانەوە سوپاسی ئەو دەوڵەمەندانە دەکەین و، لە خودایش دەخوازین کە لە بەجێهێنانی گفتەکانیاندا سەریان بخات.

***

## ئاگری

ژمارە: (٢)
رۆژ: ١٩٥٠/٧/٢٢

## هەواڵی ناوخۆ

**سەرۆک هۆزەکان رێگای چاکەکردن دەگرن**

ئاراستەبوونی سەرەک هۆزەکانی ناوچەی ئاگرێ و خانەدانەکانی بەرەو کردەوە و کاری بەکەلکی نیشتمانی، لە رۆژی ئیمڕۆدا، جێگای دڵخۆشی و شانازییە. (محەممەد ئاغای زێباری) و (شێخ تەقیی سورچی)، هەریەکەیان بەجیا، داوای کردنەوەی خوێندنگایەکی کردووە لە گوندەکەی خۆیدا، لە ناوچەی ئاگرێدا. لە پاش ئەمەی تێگەیێنران: ساختمان و کەلوپەلی پێویست بۆ هەردوو خوێندنگایەکی، پێویستە لەلایەن دانیشتووانی گوندەکانیانەوە بەخۆرایی پێشکەش بەفەرمانڕەوایی بکرێن، ئینجا خوێندنگاکانیان بۆ دەکرێنەوە، هەردووکیان گفتیان بەجێنوشین (قائیمقام)ی ئاگرێدا کە ئامادەن ئەو خواستانە خودا و ئەوانیشی کرد ئەو دوو خوێندنگایەیش: یەکێکیان لە گوندی (بجیل) دەکرێتەوە کە بنکەی لادێی (سوورچی)یە. یەکێکیشیان لە گوندی (دینارتە) دەکرێتەوە کە کەوتووەتە (دۆڵی ئەهلە)وە و، لەلادێی (بیرکەپرە) دایە کە (هۆزی زێباری)ی تێدا نیشتەجێ بووە. رۆژنامەکەی ئێمەیش بەشی خۆی سوپاسیان دەکات و، لە خودایش دەپاڕێتەوە، دەست بداتە باڵیان بۆ کەلک و چاکەی نیشتمانەکەیان.

## چاککردنەوەی کوشتگە

کە سەرۆکی شارەوانی ئاگرێ کوشتگە (مەجزەرە)کەی ئاگرێی دی رووخاوە و پیسە و، بەکەلکی گیانلەبەر سەربڕین نایەت. هەروەها کە سەرنجی دا کوشتیار (قەساب)ەکان گیانلەبەرەکانیان لە خانووەکانی خۆیاندا سەردەبڕن، دەمودەست دەستی کرد بەچاککردنەوەی جێگای کوشتگەکە و، هەر شتێکیش پێویست بوو بۆ پاککردنەوەی رۆژانەی کوشتگەکە بۆی بڕیاردا ئەمەیش بۆ ئەوەی کوشتگەکە بچێتەوە سەر دۆخی جارانی و، بەکەلکی ئەوەیش بێت کە مەڕ و بزن و گا و مانگای تێدا سەرببڕن. ئەمە لەلایەکەوە. لەلایەکی تریشەوە بەکوشتارەکانی راگەیاند، کە هەر کاتێ چاککردنەوەی کوشتگەکە تەواو بوو، پێویستە دەمودەست گیانلەبەرەکانیان لەوێدا نەبێ سەرنەبڕن، ئەگینا دەدرێنە دەست دادگاە سزایان بدات.

## لە سندووقی پرسیار و پێشنیازەوە

پێشنیازی کاک ڕەئووف شەریف

١- پێشنیازم وەهایە کە (ڕۆژنامەی ئاگری) چەند لاپەڕەیەکی تری بخرێتە سەر.

٢- پێشنیازم وەهایە کە ڕۆژنامەی ئاگری چاپ بکرێ و زۆر دانەی لێ دەربهێنرێ، تا کەسانێکی زۆرتر کەلکی لێ وەربگرن.

١٩٥٠/٧/١٥

ڕۆژنامەی ئاگری:

پێشنیازەکەت دەخەینە بەردەم دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکە و (کۆڕی شارەوانی)، تا لێی بکۆڵنەوە و بڕیارێکی لەسەر بدەن. دوایی لە ئەنجامیش ئاگادارتان دەکەین.

پێشنیازی عەونی مستەفا

پێشنیازی من وایە کە بۆڕیەی ناو ڕابکێشن بۆ گەڕەکەکەی ئێمە، (قاپەکی)، چونکە لەسەر ئەوە داماوین.

ڕۆژنامەی ئاگری:

فراوانکردنی پرۆژەی ناوی ئاگریّ لێکۆڵینەوەی تێدا دەکرێ. ئێمەیش ئێسرۆ خەریکین و، بایەخیشی پێ دەدەین. هیوادارین هەر لەم ساڵەدا ئاواتمان بێتەدی. خودا یارین گەڕەکەکەی ئێوەیش ئاوێکی پاک و ڕوونی دەست دەکەوێ.

## پێکەنینی ئاگری

یەکێک لە دادگەرەکان لە هاوڕێیەکی خۆی تانجییەک داوا دەکات، بۆ ئەمەی ڕاوی پێ بکات. کەچی هاوڕێکەی سەگێکی زەلامی پێشکەش کرد!... دادگەرەکەیش لێی هاتە زمان. بەڵام دادگەرەکە پیاوێکی ڕژد و دەست قووچاو بوو. لەبەر ئەوە هاوڕێکەی بێ پەروا پێی گوت: «تۆ سەرت سوڕ نەمێنێ لەم گردەوەیەی من، چونکە من هەموو شتێکم لێک داوەتەوە. چونکە تۆ ئەوەندە دەست قووچاویت، ناهێڵیت ئەوەندە خواردن بدرێ بەسەگەکەت کە تێری پێ بخوات. کە وات کرد ئەویش دەداتە بارێکی و بنێسی. زۆری پێ ناچێ دەبێتە تانجی»!...

## لە کۆڕی ئەتەوەدا

دووکاندار: کاکەی گەسک لێدەر چۆنیت؟

گەسک لێدەر: ئەوەتی (جێنوشینی تازە) هاتۆتە ئاگرێ، من سەردوتم بەخۆمەوە نەدیوە. چونکە ئەو

هەرگیز لەوە وازناهێنێ کە شەقامەکان و کۆڵانەکان و سەیرانگەهەکانمان پێ پاک بکاتەوە. بەڵام لە پێش هاتنی ئەودا، هەموو گەسک لێدەرەکان، لە سەروەت و خۆشیدا بووین. فەرمانمان بکردایە و فەرمانمان نەکردایە کەسێک نەبوو چەند و چوونمان لەگەڵدا بکات. بەڵام ئەم جێنوشینە بەجگار تەنگەتاوی کردووین، لەسەر هەموو شتێک، گەورەبێ یان بچووک، چەند و چوونمان لەگەڵدا دەکات. هەر ئەوەندە سستییەکی لە ئێمە دی، یاخود کەم و کورییەک، بەگژماندادێ. ئەوەندە توندوتیژە لەگەڵماندا، هەر دەڵێی ڕەشەبایە و هەڵدەکات بەسەرماندا. خودا بەگەورەیی خۆی، زوو بەزوو، ڕزگارمان بکات لە دەستی.

دووکاندار: هاوڕێی خۆشەویستم! وا نییە. تۆ بەهەڵەدا چوویت. چونکە ئەم جێنوشینە، کە خۆشی سەرۆکی شارەوانییە لە ئاکرێدا، بۆ کەڵکی خۆی نییە کە ئەم کار و فەرمانانەمان پێ جێبەجێ دەکات، بۆ کەڵکی گشتییە، کە هەموو کەڵکێکی دانیشتووانی نیشتمانەکەمان دەگرێتەوە.

گەسک لێدەر: خاڵۆی دووکاندار بەسیەتی لەسەرکردنەوەی ئەو وا دەردەکەوێ جێنوشین تۆیشی چەواشە کردووە. تۆیش بوویت بەنیشتمانپەروەر!... لە خودام دەوێ تۆیش چەند ڕۆژێک لەژێر دەستیدا فەرمان ببینیت، ئینجا تێدەگەیشتیت کە ئەم جێنوشینە هەڵدەگرێت لەسەری بکەیتەوە یان نا!...

دووکاندار: منیش لە پێشدا وەکو تۆ بووم. لەسەر ئەوە دڵم لێی شکا کە توندوتیژانە لەسەر کردەوەکانم چەند و چوونی لەگەڵدا دەکردم. بەڵام کە تەواو لە کردەوەکانی وردبوومەوە بۆم دەرکەوت. کردەوەکانی ئەو ڕەوان و کردەوەکانی من ناڕەوان بۆم دەرکەوت: ئەو لە ڕووی دڵسۆزییەوە، چەند و چوونی لەگەڵدا دەکردم و ئازاری دڵی دەدام. ئەو دەویست لە خەوی ناشیتی و نەشارەزانی خەبەرم بکاتەوە و، بەم خاتە سەر پەیڕەوی کردنی ئەو دەستووری سەرکەوتنانەی کە خودا بۆ مرۆڤی داناوە پێیان سەربکەوێ. وەک تێکۆشان و ڕاستی و دڵسۆزی و بیرکردنەوە لە کار و فەرمان هەڵسووڕاندن. جا لەبەر ئەوە من خۆم، پێی لێ دەنێم دڵم بەرامبەری ئەو هیچی تێدا نەماوە، بەڵکو خۆشیشم دەوێ.

گەسک لێدەر: جا کە وابێ، ئایینی خۆت بۆ خۆت و، ئایینی خۆیشم بۆ خۆم. واتا هیچمان لە هیچ!...

## لە سرووشی گوڵانەوە

گوڵ مامۆستای مرۆڤە

* چەکمەجەکەی خۆی کردەوە، یادنامەکەی خۆی دەرهێنایە دەرەوە، ئەمەی تێدا خوێندەوە:

«لەبەر ئەوەی گوێم نەدابووە (یاسای خودایی) و پێچەوانەی بەندەکانی ئەو جوولابوومەوە... لەبەر ئەوەی لەسەر بیروباوەڕی ناشیانە و ڕێژگاوی خۆم ڕۆیشتبووم بەڕێوە... سەرگەردانیم زۆر بەسەرداهات... خەم و خەفەتێکی زۆریم تووش هات... ئەنجامیشم بەوە گەیشت، تووشی هەژاری و نەخۆشی و دڵتەنگی بووم... بەڵام بەهۆی ئەوانەوە وریابوومەوە و چاوم کردەوە و گەلێک شتیش فێربووم و کردەوە و کاریشم ڕوویان کردە چاکی!... لە ڕاستیدا ئەو زیان و نەخۆش و ئازارانەی کە تووشم هاتن کارێکی وەهایان لە دڵ و دەروونم کرد: هەرچی چەکێکی زۆرداری و ناشیتی و ڕێژگاویم پێ بوو فڕێم دان... لە جیاتی ئەوانە خۆم

بەخوداناسی تەواو شارەزایی ڕاستەقینە و، کردەوە و کاری گەورە و بڵند چەکدار کرد... زۆری پێ نەچوو ژیانم بەتەواوەتی گۆڕرا: خەم و خەفەتەکەم گۆڕرا و بوو بەکامەرانی. نەخۆشییەکەم گۆڕرا و بوو بەتەندروستی. سەرنەکەوتنەکەیشم گۆڕا و بوو بەسەرکەوتن.

* تۆیش هەر تەماشای گوڵەباخ بکە. باش لێی ورد ببەرەوە بۆت دەردەکەوێ: (خودا) بەهەموو دڵنەرمی و دڵسۆزی و ڕووخۆشییەکییەوە، بەهەموو جوانی و کردەوە ڕەنگینییەکییەوە، لەو گوڵەباخەدا بەبەرجەستەییەوە دیارە.

* گوڵەکان کردەوە و کاری جوانیان زۆرە:

گوڵەکان دڵیان بەهەموو کەس دەسووتێ، حەز بەچاکەی هەموو کەس دەکەن. لەبەر ئەوە جوانی و ڕازاوەیی و بۆنە خۆشەکەی خۆیان وەک یەک پێشکەشی هەموو کەس دەکەن. جا ئەو گوڵانە بەو کردەوە و کارانەیان ئەم وانایانەمان فێر دەکەن:

کەسمان لە کەسمان هیچ نەگرێتە دڵ. کەسمان چاو بەکەسمان هەڵنەهێنێ. کەسیشمان کەسی ترمان دڵتەنگ نەکات.

ئەویش هەر بۆ ئەمەی لە ژیانماندا هەست بەبەخشندەیی و گەورەیی خۆمان بکەین.

* گوڵەباخ مامۆستایەکی جوان و شەنگ و شۆخە. ڕووخۆش و بەخشندە و ژیرە. ئازایە و، دڵی پڕ لە خۆشەویستییە و، کردەوە ڕەنگینە و، دادپەروەرە. لە فەرهەنگەکەی ئەودا جیاوازی لە ناوەند گەورە و بچووک و، دەوڵەمەند و هەژار و، دۆست و دوژمندا نییە. نە ترسی لە دڵدا هەیە و، نە خۆپەرستی. ئەڤینی لە دڵدا هەیە و نە ئارەزووی تۆڵەسەندنەوە. چاویشی لەوەوە نییە پاداشی درێتێ یاخود کرێ وەربگرێ. ژیانی ئەو پڕە لە خۆشەویستی و دڵپاکی و ئارەزوو بەخشین بۆ کەڵکی گشتی.

ئەوەی گرنگە لە کردەوە و کارەکانی گوڵەکاندا ئەمانەیە: بێ گوناهی و پاک و خاوێنی ڕووخۆشی و گەش و جوانی و خۆشەویستی هەمووان.

جا هەر لەبەر ئەم کردەوە و کارانەیانە کە گوڵەکان لەلایەن هەموو کەسێکەوە خۆشەویستی و ڕێز و پایەیان پێشکەش دەکرێ.

* هەرچی هەنگە گرفتاری ئەڤینی گوڵانە. ئەویش لە خۆیدا کردەوە و کاری جوان و ڕەنگین و بەکەڵکی هەیە. دەچێ ئەو ئاوانەی لە دەمی ئازدارەکانی خۆی وەردەگرێ، کە ئەو گوڵانەن، لە لەشی خۆیدا دەیانسازێنێ و پوختەیان دەکات و دەیانکات بەو هەنگوینەی کە پێشکەشمانی دەکات و، بەسایەی ئەوەوە کە دەیخۆین لە گەلێک دەرد و نەخۆشی چاک دەبینەوە.

* جا ئەگەر تۆیش دەتەوێ ببیتە (مرۆڤێکی تەواو) و، لە ژیانتدا تەندروست و کامەران و سەرکەوتوو بیت، تۆیش خۆت وەک (گوڵ) لێ بکە: خۆت بکە بەخوداناسێکی تەواو و، خاوەن ڕەوشت و کردەوەیەکی باش کە بەکەڵکی هەموو کەس بێت.

# ئاگری

ژمارە: (٣)
ڕۆژ: ١٩٥٠/٧/٢٩

## دەنگوباسی ناوخۆ

سەرۆکەکان کەوتوونەتە سەر ڕێگای چاکەکردن

* لەسەر خواستی (جێنوشینی ئاگری)، (شێخ تەقی سورچی) نۆ خانووی بۆ فەرمانبەرانی (بجیل) و باڵبازەکانی ئامادە کردووە کە خۆیان و خێزانیان تێیاندا بێن بەنیشتەجێ. فەرمانبەرەکانیش بڕیاریان داوە لە بڕانەوەی وەرزی ئەم هاوینەدا خێزانەکانیان بگوێزنەوە بۆ ئەوێ. وەک زانیومانە کرێی ئەو خانووانە مام ناوەندین.
* (سەدیق ئاغای زێباری) داوای کردنەوەی خوێندنگایەکی کردووە لە گوندی (شۆرش)دا. گفتیشی داوە ساختمانیش و کەلوپەلی پێویستیش بۆ خوێندنگاکە ئامادە بکات لە کاتی کردنەوەیدا. حەزیش دەکات (یاسای خوێندنی بەزۆر) لە گوندەکەیدا بەکاربهێنرێت. جێنوشینی ئاگریش لای پارێزگای موسڵ خواستەکانی سدیق ئاغای پشت گرت (ڕۆژنامەی ئاگری) ئافەرینی ئەو گیانە پاک و چاکەی هەردوو لایان دەکات. لە خوایش دەپاڕێتەوە پشتیوانیان بێ تا سەردەکەون لە کۆشش و خەباتیاندا.

پیتاکی سوپاس کراو

* (شێخ عوبەیدوڵڵا) کە فەرمانبەری سامانی تەرخانکراو (ئەوقاف)ی ئاگرێیە (١٦) ستوونی تەختەی پێشکەش کردووە بە (سەیرانگای کانی زەر).
* (کاک عەبدولڕەحمان مستەفا)یش کە کارگێری سامانی ئاگرێیە (٦) کۆڵەکەی داری پێشکەش کردووە بۆ ئەو سەیرانگایە.
* (شێخ تەقی سورچی)یش (٩) بار قامیشی بۆ سەیرانگایەکە ناردووە.
* (کەریم خان)یش کە ئەندامی کۆڕی شارەوانیی ئاگرێیە نزیکەی (٣٥٠) شەتڵی گوڵی جوان جوانی بەدیاری ناردووە بۆ (باخچەی بەردەمی سەرا) و (سەیرانگای کانی زەر) لەگەڵ کۆمەڵێک قامیشدا.

ڕۆژنامەی ئاگری

شارەوانیی ئاگری و ئەو ڕۆژنامەیەیش سوپاسی ئەو پیاوە بەڕێزانە دەکات. هەبژین بۆ بەخشندەیی و پیاوەتی و نیشتمانپەروەرییان.

بەرزبوونەوەی فەرمانبەران

لەسەر خواستی (سەرۆکایەتیی شارەوانیی ئاگری)، (پارێزگای موسڵ) پەسندی کرد: ئەم

فەرمانبەرانەی شارەوانیی ئاکرێیە مانگانەکانیان بەرز بکرێتەوە: (عەبدولوەهاب) نووسیاری شارەوانی، (ناسر) چاودێری شارەوانی، (تاهیر) دەرگەوانی شارەوانی. جا لەبەر ئەوەی ئە پیاوانە فەرمانی خۆیان بەجێ هێناوە، ئێمەیش پیرۆزباییان لێ دەکەین هیواداریشین کە لەمەودوا زۆرتر فەرمانی خۆیان بەجێبهێنین و چاکتریش ڕەوشتی باش و کارگوزاریی خۆیان بەکاربهێنن لە پێناوی کەلک و چاکەی شارەوانیی ئاکرێدا.

سەیرانگای کانی زەر

(سەیرانگای کانی زەر)، لە پاش ئەوەی، لە دوای جەژن، گەلێک چاکتر لە پێشووی خۆی ڕازێنرایەوە و ڕێک و پێک خرا، تەواوبوو. لە ٢٩/٧/١٩٥٠دا (سەرۆکایەتیی شارەوانیی ئاکرێ) بەبۆنەی تەواوبوونیەوە ئاهەنگێکی گێڕا. (٦٤) کەس لە بانگ کراوان، کە بەنوێنەری دانیشتووانی شاری ئاکرێ دانرابوون لە ئاهەنگەدا ئامادە بووبوون بەڵام دوو ئەوەندەیش کە سانیتر هاتبوون، لەودیو سەیرانگاهەکەوە دانیشتبوون، کە بانگ نەکرابوون. ئاهەنگەکە ناوازە و نایاب بوو. دڵی دانیشتووانی زۆر خۆش کرد. سۆزی دەروونی هەموو لایەکیانی یەک خستبوو. گەلێک وتاری تێدا خوێندرایەوە. گەلێک گۆرانی خوێنکا و گۆرانی کوردی تێدا گوترا. چار جگەرە و میوە و بسکوتیش بەسەر بانگ کراوەکاندا دابەش کرا، ساز وناوازی ڕادیۆکەیش دڵی هەمووانی خۆش دەکرد. جوانترین چاوئەندازی جێ ئاهەنگەکە ئەوە بوو کە کۆمەڵ کۆمەڵ منداڵان لەم لاو لەولای سەیرانگاکەوە لەسەر کەڵەبەردەکانی شاخەکەی ئاکرێ دانیشتبوون، لە کاتی گۆرانییە کوردییەکاندا ئەوانیش هاوبەشی بانگکراوەکانیان دەکرد لە چەپڵەڕێزاندا. ئەوانە هەر لە دەسکە گوڵێکی زیندوویان دەکرد کە خرابنە ناو ئینجانەوە و لەناو کەڵەبەردەکانی شاخەکەی ئاکرێدا دانرابن. ئاهەنگەکە هەر لە ساتی شەشەوە هەتا ساتی حەوت و نیو درێژەی سەند. بەڵام هەندێک لە فەرمانبەرەکان نەیانتوانی ئەو جێگە خۆشە بەجێ بهێڵن. هەر لەوێدا مابوونەوە هەتا نیوەشەو. وتاری سەرۆکی شارەوانی (شاکر فەتاح) پوختەکەی ئەمە بوو: یارمەتی دانیشتووانی شاری ئاکرێ و فەرمانبەرەکانی ئاکرێی سوپاس و پەسەند و ئافەرین کردبوو لە دروستکردن و پێکهێنانی (سەیرانگای کانی زەر)دا. هەروەها سەیرانگاکەیشی پێشکەش بەدانیشتووانی شاری ئاکرێ و ناوچەکە کردبوو. تکایشی لێ کردبوون، هەتا هەن دەستی یارمەتی درێژ بکەن بۆ (شارەوانیی ئاکرێ) تا بتوانێ پرۆژەکانی تریشی ڕاپەڕێنێ، وەک (جێ مەلەی کانی زەر) و (سەیرانگای سیپە) و (سەیرانگای سەری گری) و (بەهەشتی منداڵان) و (تەختکردن و قیرتاوکردنی ڕێگەکانی ناو شاری ئاکرێ).

وتارەکانی ئەوانی تریش بەکورتی ئەمە بوون: سوپاس و ئافەرینی خۆیان و دانیشتووانی ئاکرێیان پێشکەش بە(سەرۆکی شارەوانیی ئاکرێ) کردبوو. تێریشیان کردبووە سەر ئەوەی شاری ئاکرێ بەیارمەتیی دانیشتووانی شاری ئاکرێ و فەرمانبەرانەوە ئاوەدان بکاتەوە و پێش بخات.

(سەیرانگای کانی زەر)یش بریتییە لە سەکۆیەکی بەردەڵان کە سێ گەزێک لە زەوی بەرزبۆتەوە.

پێـوانەکـەی (١٥٠) گـەزی چوار گـۆشـەیی پەرژینێکی داری جـوانی ڕەنگاوڕەنگی بەهەر چوار لایدا بۆ دروست کراوە. لە ناوەڕاستیشدا ئەستێرکێکی کەمەرەیی تێدا دروست کراوە کە ئاوە سازگارە ساردەکەی (کانی زەر) دەڕژێتە ناوی. ئەشکێڵی ئەستێرکەکە هەشت گەزە. قووڵیی ئەستێرکەکە نیو گەزە. بەدەوری سەکۆکەدا لە شێوەیەکی چوارگۆشەدا، جۆگایەکی خنجیلانە لە بەرد و چیمەنتۆ دروست کراوە گوڵی جوانی ڕەنگاوڕەنگی تێدا ڕوێنراوە، پەرژینە دارەکەی دەیانپارێزێ. لە ناوەڕاستی ئەستێرکەکەدا ستوونێکی کەمەرەیی دروست کراوە. ئەشکێڵەکەی گەزێکە. بڵندی ستوونەکەیش لە بنکی ئەستێرکەکەوە نیو گەزە. لەسەر ڕووی ئەم ستوونەیش گوڵێکی سووری گەورەی دەستکرد چەقێنراوە کە لە تەنەکە و تەختە و تەل دروست کراوە. ئەمەندە و سەیرانگاکەیش کەپرێکی سێ گەز چوارگۆشەیی لە قامیش بۆ دروست کراوە لای ڕۆژهەڵاتی گرتۆتەوە. بێجگە لەوە جێگاکە پڕ کراوە لە چرای کارەبایی ڕەنگاوڕەنگ و تەختی دانیشتن و ڕەفە و مێز بۆ ئەمەی ئەوانەی دێنە سەیرانگاکە، سەروتی لەش و هۆش و گیانیان دەست بکەوێ. پێویستە ئەوەیش بڵێین کە جێگای سەیرانگاکە وا هەڵکەوتووە شاخ و باخەکانی ئاکرێ دەوریان داوە و، چاوئەندازەکانیشیان یەجگار جوانە. کەشەکەیشی خۆش و فێنک و سازگارە. شارەوانیی ئاکرێ چەندی لە دەست هات هونەر و کاری ڕەنگینی تێدا بەکارهێنا، بۆ ئەمەی بیکاتە جێگایەکی خۆش و پەسەند. تا دروستی کرد و دایمەزراند (٩٠) دینارێکی تێدا بەخت کرد. ئەمە بێجگە لە یارمەتیی (٢٥٠) کرێکار کە بەخۆڕایی فەرمانیان تێدا دەکرد و، یارمەتی هەموو فەرمانبەران و فەرمانبەرانی دەسگاکانی شارەوانی و ئاو و کارەبا و باڵبازخانە و سوپا و زانست و کشتوکاڵ کە لە نرخ نایەن. پێش ئەمەی قسەکەمان تەواو بکەین دەبێ ئەوەیشمان لەبیر نەچێ کە لە پێش دەمی سەیرانگاکەوە لە بۆرییەکی گەورەی ئاستەوە (٥٥) پلوسکی ئاوە ڕوونە پاکەکەی سەرچاوەی (کانی زەر) لە بەرزاییەکانی سێ گەزییەوە هەڵ دەداتە خوارەوە، کە دیمەنە جوانەکەی نرخ و سەربەرزی بەخشیوە بەو چایخانەیەی لە خوارەیەوە کراوەتەوە. چایخانەکە کە هی پیاوێکی هەژارە بەهۆی ئەم دیمەنە جوانەوە هاتوچۆی زۆرتر بۆ دەکرێ لە جاران. واتا دەرامەتی خاوەنەکەی گەشەی پێ کردووە.

«ڕۆژنامەی ئاکرێ»یش:

پیرۆزبایی لە دانیشتووانی ئاکرێ و ناوچەی ئاکرێ دەکات بەبۆنەی پەیدابوونی ئەم سەیرانگایەیانەوە.

پێڕەویی ئاهەنگی کانی زەر:

ئاهەنگەکە لە ساتی شەشەمی ئێوارەی ڕۆژی شەمەی ١٩٥٠/٧/٢٩دا دەستی پێ کرد. پێڕەوییەکەی بەم جۆرەبوو:

١- وتاری شاکر فەتاح، سەرۆکی شارەوانی ئاکرێ.

٢- گۆرانی خۆش هاتن، لەلایەن شاگردەکانی خوێندنگای سەرەتایی ئاکرێوە.

٣- وتاری موحەممەد ساڵح کەریم خان، کارگێری خوێندنگای ئاکرێ.

٤- گۆرانییەکی کوردی خۆماڵی لەلایەن شاگردەکانی خوێندنگاکەوە.

٥- پشوویەک بۆ ئەمەی چا و میوە بدرێن بەمیوانەکان.
٦- وتاری جەمیل سەبری، مامۆستای خوێندنگای ئاکرێ.
٧- گۆرانی لەلایەن دەستەی گۆرانیبێژانی خوێندنگاکەوە.
٨- وتاری عەبدولکەریم مستەفا، نووسیاری دادگاه
٩- گۆرانییەکی کوردی خۆماڵی لەلایەن دەستەی گۆرانییەوە.
١٠- وتاری محەممەد تەیب، خوێندنکاری زانستگای ئەندازیاری.
١١- ساز و ئاوازێکی رادیۆ.
١٢- وتاری دوایی لەلایەن فوئاد یووسف، ئەفسەری سەربازگرتنەوە.

سەرنج: لە دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە (مامۆستا خالید) دادگەری پێشوو، دوای ئەویش (ڕەشید عالی) منداڵێکی خوێندنگا وتاریان دا. هەردوولایان قسەکانیان وەک هی ئەوانەی پێشوو بوون.

وتارەکەی سەرۆکی شارەوانی:

برا گەورە بەڕێزەکان! دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێ!

بەناوی خودای پاکی بێ هاوتاوە ئەم ئاهەنگە دەست پێدەکەم. دوای ئەوە سوپاسی خۆم و دەسگاکەم پێشکەش بەئێوەی بەڕێز دەکەم کە ماندوێتیتان خستۆتە بەر خۆتان و هاتوونەتە ئاهەنگەکەمان ئێستایش دەمەوێ بەدڵێکی خۆشەوە (سەیرانگای کانی زەر)تان پێشکەش بکەم. ئەمە سەیرانگای خۆتانە. لێتان پیرۆزبێ. پڕ بەدڵ لە خودایش دەپاڕێمەوە، کە بیکاتە جێگای دڵخۆشی و سرەوت و خۆش گوزەرانیتان. هەرچی سەیرانگای کانی زەرە هی خۆتانە و دەدرێتەوە بەخۆتان. گیانی خۆتانی تێدا دیارە و، خۆشی دڵیشتانی تێدا ئاشکارە. منیش هەرگیز یارمەتی و پشتگیریی ئێوەم لە بیرناچێتەوە کە بۆ شارەوانییەکەی خۆتان داوتانە و کردووتانە لە کاتی دروستکردنیدا. ئەو شێوەی کار و دروستی و مەردایەتی و چست و چالاکییەی لەو کرێکارانەم دی کە بەخۆڕایی کاریان بۆ دەکردین و هاتبوون بۆ یارمەتیمان گەڕەکەکانی (چوستەیی) و (گۆزاوا) و (جوولەکان) و (گاوران)ەوە، هەروەها ئەوەیش کە چاوم پێکەوت: لە خەبات و تێکۆشانی فەرمانبەران و، فەرمانبەرانی دەزگاکانی شارەوانی و ئاو و، کارەبا و، باڵبازخانە و، سوپا و، زانست و، کشتوکاڵ و، سەرۆکی گەڕەکەکان و، خانوو دروستکەرەکان و، دارتاشەکان و، بەردشکێنەکان.. هەموو دەم لەبەرچاومدان. هەرگیز لە بیرم ناچنەوە. هەتا دەمێنم وەک یادگارێکی تەژادی پڕ کامەرانی لە دڵمدا دەیانپارێزم چونکە لە هەموو ژیانی خۆمدا کەم هی وام چاو پێکەوتووە. لەبەر ئەوە، سەرم بەرزەبێتەوە بەوە، کە لە کانگای دڵمەوە سوپاسی خۆم و شارەوانی پێشکەشی ئێوەی بەڕێزم بکەم. هەروەها جێگای شادمانیشمە کە لە خودا بپاڕێمەوە هەموو دەم سەربەرز و کامەران و سەرکەوتووتان بکات.

برا گەورەکان!

ئەم پرۆژەیەی یەکێکە لەو پرۆژانەی شارەوانییەکەمان بڕیاری داوە بیانکات بۆ ئاوەدانکردنەوەی

ناوچەکەمان. ئامانجیشی ئەوەیە (شاری ئاکرێ) بکات بە(هاوینەهەوار)ێکی ناوازە و نایابی ئەم سەردەمە، بۆ ئەمەی پێش بکەوێ و گەشە بکات و دانیشتووەکانیشی بکەونە خۆشگوزەرانییەوە. بەم پێیە ئەم (سەیرانگا کانی زەر)ە بۆ ئەو ئامانجە بەهەنگاوێک دادەنرێت. لەبەر ئەوە هیوادارم دانیشتووە بەرێزەکانی ناوچەی ئاکرێ هەر لەسەر یارمەتیدان و پشتگیری کردنی خۆیان برۆن بۆ شارەوانییەکەی خۆیان، تا ئەم ئامانج و ئاواتمان بهێنەدی.

ئەمەندە و دەیشمەوێ لە بابەت بەکارهێنانی ئەم سەیرانگایەوە چەند قسەیەک بکەم. ئێمە دامانناوە: سەیرانگاکە بۆ ماوەی دە سات بۆ دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێ بکرێتەوە. واتا لە ساتی حەوتەمی بەیانییەوە تا ساتی پێنجەمی ئێواری. بەمەرجێ ڕۆژانی چوارشەمووی هەموو هەفتەیەک هەر بۆ (ئافرەتان) تەرخان بکرێ. شارەوانییش لە هەر کەسێک بێتە ناو سەیرانگاکەوە پەنجا فلس دەسێنێ. بەڵام ئەوانەی ئەندامن لە (یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ)دا شارەوانیی ئاکرێ، مانگانەیەک لە یانەکەیان دەسێنێ، ئەویش بۆ ئەوەی بتوانن لە سەیرانگاکەدا ڕابوێرن بۆ ماوەی شەش سات. واتا هەر لە ساتی پێنجەمی ئێوارێوە تا ساتی یانزەهەمی شەو. مەبەسی شارەوانیش لە کۆکردنەوەی ئەم پارانە ئەوەیە بتوانێ پرۆژەکانی تریشی پێ ڕاپەڕێنێ، وەک (جێ مەلەی کانی زەر) و (سەیرانگای سیپە) و (سەیرانگای سەری گری) و (بەهەشتی منداڵان) و (تەختکردنی ڕێگاکانی ناو شاری ئاکرێ) و گەلێک پرۆژەی تر.

ئەمەندە و دووبارە سوپاسگوزاری خۆم، لە کانگای دڵەوە پێشکەش ئێوەی بەرێز دەکەم و، لە خودایشم دەوێ: دوارۆژێکی پڕ لە کامەرانیتان پێ ببەخشێ.

(شاکر فتاح)
سەرۆکی شارەوانیی ئاکرێ

فەرمانبەرەکان دەستیان داوەتە چاکەکردن:

ئەفسەری سەربازگرتن، سەرۆکی یەکەم (فوئاد یوسف) دە دیناری پێشکەشی (یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ) کرد، بەناوی ئەوەوە کە خودا کوڕێکی نوێی پێ بەخشیوە. ئەو بەمە خۆی لە میوانداری فەرمانبەرەکانی برای ڕزگار کرد. بەڕاستی کارێکی باشیشی کرد. ئەندامەکانی یانەکە سوپاسی خۆیان پێشکەش کرد ئێمەیش بەشی خۆمان سوپاسی دەکەین. لە خودایشمان دەوێ کوڕە خۆشەویستەکەی بۆ بپارێزێ و، لەسەر ئەم ڕێبازە پێشکەوتنخوازەیش پشتگیریی بکات. دەستەی بەڕێوەبەرایەتی یانەی ئاکرێ بڕیاریان دا هەندێک پارەی خۆشیانی بخەنەسەر و بەو دوو پارەیە (ڕادیۆ)یەک بکڕن بۆ یانەکەیان، تا بیکەن بەیادگارێک بۆ ئەم کردەوە باشەی ئەفسەر. هەروەها بڕیاریشیان داوە ڕادیۆکە ناو بنێن (ڕادیۆی یوسف)، بەناوی منداڵە ساواکەیەوە، تا ڕێز و خۆشەویستی خۆیانی بۆ دەرببڕن.

## پێکەنینی ئاگری

پیتاکی پارانەوە:

(یەکێک لە فەرمانبەرەکان): شارەوانیی ئاگریّ (جیّ مەلەیەکی نویّ) دروست بکات، ناوی دەنیّ (جیّ مەلەی کانی زەر). وا دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێیش خەریکن یان بەفەرمانکردن یان بەپارە یارمەتیی شارەوانی بدەن. ئەی (دادگەری بەڕێز) تۆ چ پیتاکێکی پێشکەش دەکەیت؟

خالید ئەفەندی دادگەر: من کە مەلە نەکەم چ پیتاکێکی پێشکەش بکەم؟

سەرۆکی شارەوانی: پیتاکەکەی تۆیش ئەوە بێ بپاڕێیتەوە لە خودا ئەوانەی مەلە دەکەن لە ئاوەکەدا نوقم نەبن!...

ئافەرین بەچەند فلس دەچیّ؟!:

سەرۆکی شارەوانی: ئافەرین (یوسفی گەسک لێدەر)، تۆ ئیمڕۆ باش فەرمان دەکەیت!...

یوسفی گەسک لێدەر: ئافەرین بەچەند فلس دەچیّ؟! منیش دەتوانم پێت بڵێم ئافەرین. تۆ پارە بەدەریّ و پێم بڵیّ: قورزەڵقورت!...

سەرۆکی شارەوانی: ئەوە چاکە دینارێک بۆ تۆ، ئەی ئێستا دەتەویّ چیت پیّ بڵێم؟!.

یوسفی گەسک لێدەر: ئێستاکە قەی ناکات. هەزار جار پێم بڵیّ ئافەرین!...

## لە سندووقی پرسیار و پێشنیازەوە:

دانانی تەخت و کارەبا لە باخچەکەدا:

بۆ کاک محەممەد شەریف، سەرۆکی یەکەم:

لەسەر پێشنیازەکەی ئێوە (کۆڕی شارەوانیی ئاگریّ) بڕیاری دا: دوو تەختی تەختەی گەورە کە هەشت کەس بتوانن لەسەر دانیشن لەگەڵ سیّ چرای کارەبای ڕەنگاوڕەنگ و، جێگایەک بۆ دانانی ڕادیۆ، لەناو باخچەکەی بەردەرکی سەرادا -باخچەی فەرمانبەران- دابنیّ. هەرچی دەنگە گەورەکەی ڕادیۆیە (میکرۆفۆن) بەپێویستمان نەزانی دابنێین چونکە ڕادیۆکانی هەردوو چایخانەکان نزیکی باخچەکەن. ئاگادارێشتان دەکەین کە بڕیارەکانی شارەوانی زوو بەزوو جێبەجیّ کران.

دیدەنی تایبەتی لە فەرمانگەکانی میریدا:

(ئاگریّ: ک. ق.):

بیستوومە جێنوشینی تازە نایەویّ دیدەنی تایبەتی بکریّ بۆ دەسگاکانی میری!... ئاخۆ ئەمە ڕاست بیّ؟ ئەگەر ڕاستە بیانووی چییە؟.

ڕۆژنامەی ئاگریّ:

لەبەر ئەوەی (جێنوشینی نوێ) کاتی داناوە بۆ دیدەنی تایبەتی لە ماڵی خۆیدا، هەروەها هەموو رۆژێک دەتوانرێ لەلایەن دۆستان و هاورێکانیەوە لە (سەیرانگای کاتی زۆر) یاخود لە (باخچەی فەرمانبەران)دا ببینرێ، ئیتر حەز ناکات هیچ کەسێک لەوانە لە دەسگای میریدا سەری لێ بدات بۆ دیدەنی تایبەتی. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە کاتێکی زۆری بۆ بگەرێتەوە لە فەرمانگەکەیدا، بۆ ئەمەی کاروباری فەرمانرەوایی و دانیشتووانی ناوچەکە، بەتایبەتی هی هەژارەکانیان راهی بکات، کە هی وایان تێدایە لە رێگایەکی دوورەوە دێتە ئاکرێ. بێجگە لەوە هۆیەکی تریش هەیە. ئەویش ئەوەتا یەکی فروفێڵی ئەو چەواشەکارانە بخات، کە بەدرۆ دێن بۆ دیدەنی فەرمانبەرەکان لە دەسگاکانیاندا و کاتی زۆریان بەخۆرایی لێ داگیر دەکەن بەبیانووی خۆشەویستییەوە، کەچی لە راستیدا بۆ ئەوە دێنە لای ئەو فەرمانبەرانە تا دانیشتووە بەسەزمانەکانی ناوچەی ئاکرێ چەواشە بکەن بەوەی خۆیان وا بنوێنن لای ئەوان کە خاوەن میانەن و دەسەلاتیشیان هەیە لەناو ئەو دەسگایانەدا. بۆ ئەمەی لە پاشدا بتوانن ئەو بەسەزمانانە بچەوسێننەوە بۆ کەلکی ناپوختەی خۆیان. ئێمەیش ئەی خاوەن پرسیار هیوادارین کە تۆ لەو جۆرە کەسانە نەبیت!...

***

## ئاکرێ

ژمارە: (٤)
رۆژ: ١٩٥٠/٨/٥

## دەنگوباسی ناوخۆ

سەرۆکەکان رێگای چاکیان گرتۆتەبەر:

* (سدیق ئاغای شۆش) دەستی کرد بە بەختکردنی ئەو رێگایەی لە ناوەند (شۆش) و (ئاکرێ) دایە، بۆ ئەمەی ئۆتۆمبیل بتوانێ بەئاسانی بەناویاندا بروات. بێجگە لەوە بەڵێنیشی داوە بەجێنوشینی ئاکرێ: (ئۆتۆمبیلێک) و (مەکینەیەکی کارەبا) و (رادیۆ)یەک بکرێ بۆ کەلک و چاکەی دانیشتووانی گوندەکەی خۆی و ئەوانەی دێن بۆ دیدەنی بۆ (شۆش).
* هەر یەکێک لەمانە: (شێخ ئەنوەر قەییوم) و (شێخ تەقیی سورچی) و (سدیق ئاغای شۆش)، لەسەر خواستی (جێنوشینی ئاکرێ)، تاوانبارێکیان لەوانەی لە دادگەری رایانکردبوو، دایە دەست میری، بۆ ئەمەی دادگاه تەماشای کێشەکانیان بکات.
* (شێخ ئیبراهیم) کە سەرۆکی گەرەکی (گۆراوا)یە لە شاری ئاکرێدا لە بەردەمی (جێنوشینی ئاکرێ)دا بەڵێنی دا کە لەگەڵ پیاوە ناسراوەکانی گەرەکەکەیدا هەوڵ بدات، ئەو تاوانبارانەی لە گەرەکەکەی خۆیدا دزێتی دەکەن لە دژی هەندێک خێزانی هەژار بیاندۆزێتەوە و بشیانداتە دەست میری. ماوەی بەڵێنەکەی (شێخ ئیبراهیم) لە رۆژی ١٩٥٠/٨/١٠دا تەواو دەبێ. بەپێی ئەو بەڵێنە دەبێ یان ئەو

کەلوپەلانەی دزراون بدرێنەوە بەخاوەنەکانیان، یاخود دانیشتووانی گەڕەکەکەی جەریمە دەکرێن بایی چەند دزراوە لێیان دەستێنرێت. ئەنجام بەچی گەیشت خوێندەوارانی ئەم ڕۆژنامەیە ئاگادار دەکەین.

* پیری (خەلیل ئاغا) لەگەڵ چەند کەسێکی گەڕەکی (چوستەیی)دا چوونە سەیری (سەیرانگای کانی زەر). ئەوەیش هەر بۆ ئەمەی: کەلکێک بەگەنجینەی شارەوانیی ئاکرێ بگەیێنن.

* هەتا ئێستاکەیش (کەریم خانی محەمەد سالح) هەر لە پارمەتیدانی (سەیرانگای کانی زەر)یە، پەیتا پەیتا بەئینجانە و گوڵە جوانەکانی باخچەکەی خۆی دەنێرێ.

* ئێمەیش بەناوی (شارەوانی) و (جێنژنشینی)یەوە سوپاسی ئەم پیاوە بەڕێزانە دەکەین، داوای سەرکەوتنیشیان لە خودا دەکەین بۆ کەلکی گەل و نیشتمانەکەیان.

## لە سندووقی پرسیار و پێشنیازەوە:

* (لاوێکی ئاوارە): پێیان گوتووم شەپقە لە شاری ئاکرێدا لەسەر نەکەم، ئەوەک دانیشتووانی ئاکرێ توانج و پلارم تێ بگرن ئێوە لەم بابەتەوە چی دەفەرموون؟...

ڕۆژنامەی ئاکرێ:

وا دیارە تۆ بەهەڵەدا چوویت، هەرگیز بڕوا مەکە (دانیشتووانی ئاکرێ) کە هەر کەسەیان خەریکی کار و فەرمانی خۆیەتی، دەستیان بپەرژێت سەرنج لە کاروباری تایبەتی تۆ و کەسانی تر بدەن. لەبەر ئەوە شەپقەی خۆت لەسەر بکە و، نەیەت بەمێشکتدا کە کەس لە دانیشتووانی ئاکرێ ڕەخنەت لێ بگرێ. ئێمە وامان دێتە پێش چاو، کە تۆ بۆیەکا شتی وەهات بەبیردا دێت، لەو ناوچەیەدا کە گەورە بوویت و پەروەردە کراویت تووشی (ترس) بوویت، چونکە زۆر کەسی تریش لە ئێمە وەهای بەبیردا دێت، لەو ناوچەیەدا کە گەورە بوویت و پەروەردە کراویت تووشی (ترس) بوویت. چونکە زۆر کەسی تریش لە ئێمە وەهای بەسەر داهاتووە بەڵام دانیشتووانی ئاکرێ، هەر لەبەر ئەوەی کە خۆیان زیرەکن و لێهاتوون، هەر توانج و پلار لەو کەسانە دەگرن کە زیانیان پێ دەگەیێنن هەرچی (شەپقە)یشە، خۆی لە خۆیدا، هەروەک هەموو جلوبەرگێکی تر، بەهۆی پێویستی گیانی و نانی و ژیانەوە پەیدا بووە، ئەمەیش پەیوەندییەکی بەکاروباری ئایینەوە نییە. ڕاستی قسەکەیشمان بەوەدا دەردەکەوێ، کە گەلێک لە سەپان و جووتیارەکانمان لە مێژەوە هەتا ئێستاکەیش هەر شەپقە لەسەر دەکەن، لە پێش ئەمەی کەسێکیان لە ڕۆژئاواییەکان دیبێ شەپقەی لەسەر کردبێ. کەچی ئەوان لە هەموو کەسێکیش زۆرتر بەئایینەکەی خۆیانەوە نووساون. هەر بەناوی تاقی کردنەوەیشەوە خۆم لەم ڕۆژانەدا شەپقەم لەسەر کرد، لە کەسێکی ئاکرێییەوە توانج و پلارم تێ نەگیرا. ئەی خۆتان سەرنجتان نەداوە لە لاوەکانی ئاکرێ، بەسەری ڕووتەوە بەناو شەقامەکانی ئاکرێدا دەسووڕێنەوە، تەنانەت کلۆچە (چاکەت)ەکانیشیان لەبەر ناکەن؟ ئەو لاوانە باکیان نییە لە توانج و پلار، تەنانەت ئەگەر هەبێتیش!... دەستووری گشتی ئەمەتا: هەموو کەسێک مافی هەیە بەسەربەستییەوە چی لەبەردەکات، بیکات، بەمەرجێ ئازاری کەس نەدات و زیانیش بەکەس نەگەیێنێ. لەسەر هەموو کەسێکیش پێویستە ڕێز لەم مافەی بگرێ. ئیتر ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە، ترس

و لەرز لە دڵی خۆمان دەربکەین و، لە شتی پڕوپووچ نەسلەمێینەوە، تا چەند هەنگاوێکی تر پێش بکەوین؟!. خۆ تۆیش یەکێکی وەک ئێمە نەی لاوا!...

* (محەمەد تەیب)، شاگردێکی زانستگای ئەندازیاری:

من تووشی دوودڵی بووم: نازانم ئایا هەر لە زانستگای ئەندازیاریدا بمێنمەوە باشترە یاخود بچمە (زانستگای فڕین)ەوە. ئێوە لەم بابەتەوە چی دەفەرموون؟

ڕۆژنامەی ئاگری:

بەپێی لێکۆڵینەوە و لێ وردبوونەوەیەک کە کردوومانە لە بابەت دڵ و دەروونی تۆ و لێهاتوویتەوە هەروەها کە تەماشای دوارۆژی خۆت و کەلک و چاکەی ئاگریّ دەکەین، وامان پێ باشترە کە هەر لە (زانستگای ئەندازیاری)دا بمێنیتەوە. چونکە ناوچەی ئاگریّ و ئاگریّ خۆیشی پێویستییەکی زۆری هەیە بەئاوەدانی. ئەندازیاریش هەروەک پەزیشکایەتی و کشتوکاڵ و بەیتاڵی دوارۆژێکی گەورەیان هەیە لە هەرێمی باکووردا کە ئێستاکە داماوە لەسەر شارەزا و پسپۆرانی ئەو زانست و هونەرانە.

* (هەژارێک): ئێوە پرۆژەی (سەیرانگای کانی زەر)تان تەواو کرد. بەڵام سێ کاری تریش ماون کە زۆر گرنگن. تکایە خەمی ئەوانەیش بخۆن تا زووە جێبەجێ بکرێت:

١- کوتەکێک لە دەستی دزەکان بدەن. چونکە لەم ڕۆژانەدا دزی لەناو جەرگی شاری ئاگریدا زۆر دەکەن.

٢- نرخی گۆشتمان بۆ کەم بکەنەوە.

٣- یاساوڵی خۆرشت کە ناوی (عەلی قۆڵچی)یە، دەستیاوی هەموو دووکاندارێکی بەسەرەوە هەیە. بەڵام دووکاندارەکان تا ئێستا نەیانوێراوە داوای وام (قەرز)ەکانیانی لێ بکەنەوە. ئێمەیش تکاتان لێ دەکەین کارێکی وا بکەن: (عەلی قۆڵچی) پێش ئەمەی بگاتە شاری (ئامێدی) کە بۆ ئەوێ گوێزراوەتەوە، وامەکانمان بداتەوە.

* ڕۆژنامەی ئاگری:

١- ئەوەندەی پەیوەندی بەتاوانی دزینەوە هەیە، ئێمە لەوساوە کە هاتووینەتە ئاگریّ هەتا ئێستا پێیەوە خەریکین ڕیشەی دەربکێشین بەم زووانە مژدەی ئەنجامی باشتان پێ دەگەیێنین. لەم بابەتەوە تەماشای ستوونی یەکەمی ئەم ڕۆژنامەیە بکەن.

٢- هەرچی نرخی گۆشتەکانە لەگەڵ سەرۆکی گەڕەکەکان و پیاوە شارەزاکانیان وتووێژمان لەسەر کردن. ئەوان وایان بەباش زانی بڕیارەکە دوابخرێت بۆ وەرزی پایز، تا مەڕ و ماڵات لەگەڵ هۆزە ڕەوەندەکاندا دەگەڕێنەوە لە کوێستان.

٣- هەرچی دەستیاوەکانی دووکاندارەکانیشە کە لەسەر یاساوڵی خۆرشت کەڵەکەبوون و تا ئێستا نەیداونەتەوە بەخاوەنیان، ئێمە پێرێ بەهۆی جاردەری شارەوانییەوە جارمان بۆ دووکاندارەکان دا کە: «هەر کەسێک وامی لەسەر (عەلی قۆڵچی) هەیە بێتە لامان. پیشانمانی بدات کە ڕاست دەکات، ئەوساکە ئێمەیش کارێکی وا دەکەین وامەکەی دەست بکەوێتەوە».

بەلام وا دیارە (مامەی هەژار)، تۆ لەو ساکەوە کە بۆ یەکەم جار ئاگانامە (ئیخباریـە)کەی خۆی بۆ ناردووین بەناوی «جوولەکەی رەنجەرۆ»وە، (ئایین)ەکەی خۆت گۆڕیوە، ئایا لە دوای ئەم (ئاگانامە)یەت بەڵێنمان دەدەیتێ نەچیتەوە سەر ئایینەکەی پێشووت؟!...

## ئاکرێ داوای کردنەوەی خوێندنگایەکی ئاوەندی دەکات

لە ئاواتە هەرە گەورەکانی دانیشتووانی شاری ئاکرێدا یەکێکیان: (کردنەوەی خوێندنگایەکی ئاوەندی)یە کە لە شاری ئاکرێدا بکرێتەوە. ئەمەیش سەبارەت بەوەیە کە ژمارەیەکی زۆر لەو شاگردانەی خوێندنی سەرەتاییان تەواو کردووە، لەبەر دەستکورتی باوکیان نەیانتوانیوە تا ئێستا خوێندنەکەیان تەواو بکەن لە خوێندنگا ئاوەندییەکانی شارەکانی تردا کە لەو دیو ناوچەی ئاکرێوەن. کە (جێنوشینی نوێی ئاکرێ)یش لە نزیکەی دوو مانگ لەمەو پێشەوە گەیشتە ئاکرێ، دانیشتووانی شاری ئاکرێ داوایان لێ کرد: کاربەدەستانی بخاتە سەر ئەوەی خوێندنگایەکی ئاوەندی لە شاری ئاکرێدا بکەنەوە. جێنوشینی نوێیش دەستی کرد بەلێکۆڵینەوەی پێشنیازەکەیان و، گفتوگۆکردن لەگەڵ کاربەدەستاندا. دوایی لەگەڵ باوانی شاگردەکاندا لە هۆڵی شارەوانیدا کۆبووەوە و، لە بابەت ئەم کێشەیەوە وتووێژی لەگەڵ ئەوان و چەند پیاوێکی ناسراوی شارەکەدا کرد. لە ئەنجامی کۆڕەکەدا، بڕیاریان دا: وا داوا بکەن کە (خوێندنگایەکی ئاوەندیی خۆماڵی) لەلایەن (کۆمەڵی مامۆستایان)ەوە بکرێتەوە، بەمەرجێ (کارگێڕیی زانستیی خاکی مووسڵ) سەرپەرشتی و چاودێری بکات. بەپێی ئەم بڕیارە باوانی (٢١) شاگرد سکاڵانامەیەکیان، پێشکەشی (جێنوشینی ئاکرێ) کرد، داوای کردنەوەی (خوێندنگایەکی ئاوەندی)یان کرد بەڵێنیشیان دا کە هەریەکەیان مانگانەیەکی (٧) تا (١٠) دیناری بدات بە(فەرمانگەی خوێندنگا)کە بەرامبەر ئەوە بەکوڕەکانیان بخوێنن. (جێنوشینی ئاکرێ)یش پشتگیریی خواستەکەی کردن و سکاڵانامەکەی ناردن بۆ (پارێزگای مووسڵ)، لەگەڵ بیروباوەڕی خۆیدا لە بابەت شێوەی راپەراندنی خواستەکەیانەوە و پیشاندانی ئەوەیش کە پێویستە لەلایەن هەموو کاربەدەستەکانەوە وەک هی (زانست) و (کاروباری ناوخۆ) و (بەرگری) و (داد) و (کاروباری کۆمەلایەتی)یەوە ئەم کارەیان بۆ ئاسان بکرێ. چونکە کردنەوەی خوێندنگاکە پێویستی بەرێدانی ئەو کاربەدەستانی (وەزارەت)یانە هەیە بۆ ئەمەی ساختمانی خوێندنگای سەرەتایی ئاکرێ و کەلوپەلەکانی بەکاربهێنرێن. هەروەها فەرمانبەرەکانیان بەمانگانەیەکی دیاریکراو دابەزرێنرێن بۆ وانا گوتنەوە لەو خوێندنگای ئاوەندییەدا کە دەیانەوێ بکرێتەوە. گەلێک لەوانەی فەرمانبەران لە ناوچەکەدا و، دەرچووی زانستگاکانی عێراقن و خاوەنی توانایی زانستین لە وانا گوتنەوەدا، بەڵێنیان دا کە خوێندنگاکە کرایەوە وانای تێدا بڵێنەوە. هەروەها (جێنوشینی ئاکرێ) لە چەند فەرمانگەیەکی خاوەن پەیوەندی لەگەڵ ئەم پرۆژەیەدا گفتی وەرگرت کە پشتگیریی ئەم خواستە بکەن و کۆشیش بکەن بۆ سەرگرتنی. هەروەها (جێنوشینی ئاکرێ) بڕیاری داوە کە لە دەوڵەمەندانی ناوچەکە ئەوەندەی پێویست بێ پارە کۆبکاتەوە، بۆ ئەمەی لە جیاتی ئەو شاگردە هەژارانەی نەیانتوانیوە (سکالانامە)کە مۆر بکەن، لەبەر هەژارییان، پارە بدات بەفەرمانگەی خوێندنگا تازەکە کە کرایەوە.

ڕۆژنامەی ئاگری:

ئێمەیش داوا لە خودای گەورە و میهرەبان دەکەین دەستی یارمەتی بۆ ئەم هەموو کەسانە درێژ بکات، تا ئەم خواستە گشتییە گەورەیەیان بۆ بێتە دی.

## پێکەنینی ئاگری

بەرتیل:

(خاوەن فەرمان): من دەمەوێ کەلک و چاکەیەکم لە فەرمانگەمدا پێ بگات، کە پێچەوانەی یاسان. دەیشمەوێ لای یەکێک لە فەرمانبەرەکان زوو جێبەجێ بکەم، ئایا پێم ناڵێیت چۆن (بەرتیل)ەکەمی پێشکەش بکەم؟

(کابرای شارەزا): لەبەر ئەوەی (بەرتیل) دەکەوێتە ناو ڕیزی دڵدارییەوە، لام وایە (بەرتیلدان)یش هەر دەبێ بەپێی ئەو دەستوورە بێت کە لە کۆڕی (دڵداری)دا بەکاردەهێنرێت. ئەویش بریتییە لەم بابەتانە: (تەماشاکردنێک، زەردەخەنەیەک، خۆشی و چلۆنی کردنێک، گفتوگۆ کردنێک، پەیماندانێک بۆ بەیەکگەیشتن، ئینجا بەیەکگەیشتن). منیش لە خودام دەوێ: نەهێڵێ کارەکەت سەر بگرێ!.

ئایینی خۆی گۆڕیوە

(یوسفی گەسک لێدەر): تکایە بمخەرەوە سەر ڕێکخستنی باخچەکانی شارەوانی.

(سەرۆکی شارەوانی): بۆ چ تۆ ئایینی خۆت گۆڕیوە؟!. وازت لە پەرستنی (ئیبراهیمی دەرگەوان) هێناوە و، دەستت داوەتە پەرستنی (خودای ئیبراهیم)؟...

(یوسفی گەسک لێدەر): بەڵێ.

(سەرۆکی شارەوانی): کەواتە، بۆ چ لەسەر پەرستنە تازەکەی خۆت نامێنیتەوە، تا خۆت ڕزگار بکەیت لە پەرستنی (ئیبراهیم)؟!

کرێ لەسەروو هەموو شتێکەوەیە

(خاوەن ساختمان): مامەی دارتاش وەرە بزمارێک دابکوتە بەسەر ناوچەوانمدا!...

(دارتاش): بۆ چ بزمار بەسەر ناوچەوانتدا دابکوتم؟

(خاوەن ساختمان): تا هەندێک لە مێشکم لەناوبچێ و بتوانم بەرگەی کرێ زۆرەکانت بگرم!...

(دارتاش): بەلام ئەوەیشت لەبیرنەچێ، کە داکوتانی بزمارەکەیش کرێی پێ دەوێ. چونکە من دەبێ بچم و بێمەوە بۆ ئەو شوێنەی بزمارەکەی لێ دەکڕم. خۆ ئەوەیش دیارە کە لەم ڕۆژانەدا نرخی بزمار زۆر بەرز بۆتەوە!...

***

# ئاکرێ

ژمارە: (٥)
ڕۆژ: ١٩٥٠/٨/١٢

## هەواڵی ناوخۆ

ئاسایش

باڵبازخانەی ناوچەکەمان و، بنکەکانی لادێیەکان، کە لەژێر دەستیدان، لە تەنگەتاوکردنی ئەو تاوانبارانەدا کە یاخی بوون لە دادگاە، بۆ مەبەسی گرتنیان، چست و چالاکییەکی باشیان نواندووە، چونکە لەم دوو مانگەی دواییەدا ژمارەیەکی باشی لەو تاوانبارە سامناکانە و ئەو سەریازە دەربازبووانەی گرتووە، ئێمەیش سوپاسی فەرمانبەرانی باڵبازخانە و فەرمانبەرەکانیان دەکەین کە فەرمانی سەرشانی خۆیان بەباشییەوە بەجێ دەهێنن هەروەها هیواداریـن دوای پاشماوەی ئەو تاوانبارانەیش بکەون بەڵکو بیانگرن، چونکە ئەوانە لە دەمێک ساڵەوەیە سەروتی گشتییان تێک داوە!.

## ناوی شاری ئاکرێ لە ڕۆژنامەکاندا

ژمارەکانی دوایی ڕۆژنامەکانی (الحوادث) و (النضال) و (الزمان)مان وەرگرت کە لە مووسڵ و بەغداوە هاتبوون، هەموویان لە بابەت ئاهەنگی پێشکەشکردنی (سەیرانگای کانی زەر)ەوە، بەنەتەوە، دوابوون کە لە ڕۆژی ١٩٥٠/٧/٢٩دا گێڕرابوو. جا چونکە ئەو چەند دێرانە لەلایەن چەند کەسێکی تێگەیشتووی کردەوە جوانی براکانی ئاکرێمانەوە نووسرابوون، بۆ ئەوەی شارەوانیی ئاکرێ دڵخۆش بکەن و تیریشی بکەنە سەر کردنی کار و فەرمانی تر بۆ کەڵکی گشتی، شارەوانیی ئاکرێ لە کانگای دڵیەوە ڕێز و سوپاسیان پێشکەش دەکات.

پرۆژەکانی ئاو و کارەبا

لە پاش ئەمە نامەکاری ناوەند جێنوشینی ئاکرێ و فەرمانگە بڵندەکان لە بابەت پرۆژەکانی ئاو و کارەبا و ساڵێکی خشت بوو نووستبوو، وا لەم ڕۆژانەدا سەرلەنوێ دەستی پێ کردۆتەوە. هیواداریـن کە خوێندەواران لە ئەنجامی خۆش ئاگادار بکەین.

نەخۆشخانەی ئاکرێ

کاربەدەستی کاروباری کۆمەلایەتی بڕیاری داوە (نەخۆشخانە)یەک لە شاری (ئاکرێ)دا دابمەزرێنێ.

## سووڕانەوەی فەرمانبەرانی تەندروستی بەناو گوندەکاندا

جێنوشینی ئاکرێ لەلایەن فەرمانگە بڵندەکانەوە ڕێ دراوە هەر مانگەی دوو جار فەرمانبەرانی تەندروستی بنێریت بۆ ناو گوندەکانی هەر لادێیەکان، واتا: (بیرە کەپرە) و (سوورچی) و (عەشائیر و

سەبعە)، بۆ ئەمەی ئەو گوندیی نەخۆشیی کاریگەریان تێدا بلاوبۆتەوە نەخۆشەکانیان دەرمانیان بدرێتێ. ئەوەندە هەیە هەر جارەی دوو ڕۆژیان زۆرتر پێ ناچێ. پێویستە ئەوەیش ئاشکرا بکەین کە بۆ هەموو جارێک چوونە دەرەوە بۆ گوندەکان، سەرۆکی ئەو گەندانە خواردن و جێگای نووستن و گوێزانەوەی فەرمانبەرەکان دەخەنە سەر ئەستۆی خۆیان، تا گەنجینەی میری بەرستەی هاتوچۆی ئەو فەرمانبەرانە ئەرکی نەکەوێتە سەرا...

تاوانبارێک خۆی دەداتە دەست دادگاه

(عومەر عوسمان) کە لە پێش مانگدا ژنەکەی خۆی کوشتبوو، لە دەست دادگاهیش خۆی دەرباز کردبوو، هات و خۆی دایە دەست جێنوشینی ئاکرێ. ئەمەیش ناردیە کن دادگاهی ئاکرێ تا تەماشای کێشەکەی بکات.

دەستکەوتی سەیرانگای کانی زەر

دەستکەوتی (سەیرانگای کانی زەر) کە بەرەو ڕووی گەنجینەی شارەوانیی ئاکرێ دەکرێتەوە، لە(٩) ڕۆژی یەکەمی مانگی گەلاوێژ (ئاب)ی ١٩٥٠دا گەیشتە ١٤،٧٥٠ دینار. پێویستە پێیشی لێ بنێین کە زۆربەی ئەم پارەیە ئەم پیاوانە داویانە: (جەواد ئاغای زێباری) و، (شێخ کەرۆزی سوورچی) و، (خەلیل ئاغای ئاکرێیی) و (شێخ کەبیری سوورچی) و (شێخ جارولّلا) و (سەبری ئەفەندیی سۆرانی). ئێمەیش لە کانگای دڵمانەوە سوپاسی پیاوەتیی ئەو پیاوە بەڕێزانە دەکەین.

پرۆژەی سەیرانگای سپە

بەم زووانە دامەزراندن و دروستکردن و ڕێکخستنی (سەیرانگای سپە) تەواو دەبێ. ئەمەیش سێهەم پرۆژەیە کە شارەوانیی ئاکرێ ڕایدەپەڕێنێ. دەستەی کارگێری یانەی ئاکرێ بڕیاری داوە لەم هەفتەیەدا ئاهەنگێک بەبۆنەی پەیدابوونی ئەم سەیرانگایەوە بگێرێ پارەی ئاهەنگەکەیش لەسەر یانەکە دەبێ. ئەمەیش بۆ ئەوەیە ڕێز بگرێت لە خاوەنی (جێگاکەی سپە) کە ناوی (سەلیم حاجی ئیبراهیم)ە. ئەم ڕێزگرتنەیش بۆ (کاک سەلیم) لەبەر ئەوەیە کە لەسەر خواستی شارەوانیی ئاکرێ و لەژێر سەرپەرشتیکردنی ئەودا سەیرانگاکەی سپەی دروست کردووە و پێک هێناوە!.

یانەی فەرمانبەران ڕێگای چاکەکردن دەگرێ

(یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ) دەستی کرد بەکردارە ڕۆشنبیرییەکانی خۆی. دەستەی کارگێرانی، بڕیاریان دا: زنجیرەیەک وتاری ڕۆشنبیری ئامادە بکەن، تا لە ڕۆژانی دوشەممەی هەموو هەفتەیەکدا لە (سەیرانگای کانی زەر)دا یەکێکیان بخوێندرێتەوە. ئەمەیش بۆ ئەوەی فەرمانبەران و دانیشتووانی ئاکرێ ئاراستە بکرێن بۆ کار و کردەوەی چاک و ڕۆشنبیری. یەکەم وتار لە ئێوارەی دوشەممەی هەفتەی ڕابردوودا خوێندرایەوە. کۆمەڵێکی گەورە لە فەرمانبەران و دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێ لەوێدا

کۆبووبوونەوە، گوێیان لێ دەگرت. دەستەی بەڕێوەبەرانی یانەکەمان چەند پێشنیازێکیان لەلایەن گوێگرەکانەوە درا بەگوێدا. ئەوەیش لە بابەت گەشەپێکردن و ڕێکخستنی ئەم جۆرە ئاهەنگە ڕۆشنبیرییانەوە بوو. بەڕێوەبەرەکانی یانەیش بڕیاریان دا لە هەفتەکانی داهاتوودا جێبەجێیان بکەن. بێجگە لەمە بەڕێوەبەرەکان بڕیاریان دا چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیەک بکڕن بۆ ئەمەی ئەندامە بەڕێزەکانی یانە بیانخوێننەوە و لێیانەوە کەلکەوەر بن.

(ڕۆژنامەی ئاکرێ)یش پیرۆزبایی لە ئەندامانی یانەی ئاکرێ دەکات و لەگەڵ سوپاسی گەرم و گوڕیدا داوای سەرکەوتنیان لە خودا دەکات.

کاتی فەرمانکردن لە سەیرانگای کانی زەر

(سەرۆکایەتیی شارەوانیی ئاکرێ) بڕیاری دا کاتی فەرمانکردن لە سەیرانگای کانی زەردا بەم جۆرە لێ بکرێ؛ بۆ ئەمەی سەیرانکەرە بەڕێزەکان زۆرتر کەلکی لێ وەربگرن:

١- لە ساتی حەوتەمی بەیانییەوە تا ساتی حەوتەمی ئێوارێ لە هەموو ڕۆژانی هەفتەدا دەکرێتەوە بۆ دانیشتووانی ناوچەی ئاکرێ.

٢- لە ساتی حەوتەمی ئێوارێوە تا ساتی پانزەهەمی شەو دەکرێتەوە بۆ فەرمانبەران و ئەندامانی یانەی ئاکرێ.

٣- ڕۆژانی یەکشەمە و چوارشەمە تەنیا بۆ ئافرەت تەرخان دەکرێ.

٤- ڕۆژەکانی تریش بۆ پیاوان تەرخان دەکرێ.

ڕۆژنامەی ئاکرێ گەشە دەکات

وا پێویست بوو کە (ڕۆژنامەی ئاکرێ) لەلایەن دەستەی نووسەرانەوە گەشەی پێ بکرێت. لە ژمارەی چوارەمییەوە کرا بەدوو دانە. دانەیەکی (لە سەیرانگای کانی زەر)دا هەڵدەواسرێ. دانەیەکیشی لە سەیرانگای فەرمانبەراندا کە لەبەر دەرکی سەرادایە هەڵدەواسرێ.

## یانەی فەرمانبەران

## هاوینەهەوارەکانی ئاکرێ دەناسێنێ بەهەموو دانیشتووانی عیراق

(کاک محەممەد یوسف) کە کاروباری (سامانی تەرخانکراوی شێخ عەبدولقادری گەیلانی) لە ئاکرێدا هەڵدەسووڕێنێ، دەستی کرد بەئامادەکردنی کۆمەڵێک وێنەی فۆتۆگرافی ڕەنگاوڕەنگی چاوئەندازە جوانەکانی ئاکرێ. (دەستەی بەڕێوەبەرانی یانەی ئاکرێ)یش بڕیاریان دا چەند کۆمەڵێک لەو وێنە ڕەنگینانەی لێ بکڕێ بەو نیازەی بەنامەی تایبەتییەوە ڕەوانەیان بکات بۆ پیاوە ناودارەکان و ناسراوەکانی هەموو لایەکی عێراق. تا شارەزای لێهاتوویی هاوینەهەوارەکانی ئاکرێ بن، کە هەر لە بەهەشت دەکەن. ئێمەیش ئاواتەخوازین ئەم کردارە جوانەی یانەی ئاکرێ سەر بگرێ و کاربەدەستانی فەرمانڕەوایی عێراق بخاتە سەر ئەو بڕیارەی کە شاری (ئاکرێ)یش بکرێت بەمەڵبەندێکی

هاوینەهەواری، وەک (شەقلاوە) و (پیرمەم) و (سەرسەنگ) و (حاجی هۆمەران).

بەناوی (شارەوانیی ئاکرێ)وە سوپاسی (یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ) دەکەین، کە ئەم ئەرکە گرنگ و گەورەیەیان گرتۆتە ئەستۆی خۆیان. خودا سەریان بخات.

## لە سندووقی پرسیار و پرس و پێشنیازەوەب

بۆ مام هەژار:

(جێ نوشینی ئاکرێ) بایەخی دا بەپێشنیازەکانت. دوازدە وامی بۆ دووکانداردەکان لە پاساوڵی خۆرشت (عەلی محەممەد) سەندەوە و دایەوە دەست خاوەنیان. لە (جێنوشینی زاخۆ)یش بەڵێنی وەرگرت بەتەلەفۆن کە لە نزیکەی مانگێکدا وامەکانی تریش لە (عەلی محەممەد)، وەربگیرێت و بنێرێنەوە بۆ خاوەنەکانیان.

* هەرچی کەلوپەلە دزراوەکانیشە لە گەڕەکی (گوژراوا)دا، (شێخ ئیبراهیم)ی سەرۆک، تۆڵەی بۆ لێ دزراوەکە کردەوە، (دە) دیناری دایە. هەروەها دزەکانیشی ئاشکرا کرد لە میری. وا بالبازخانەیش خەریکی دۆزینەوەیانە، تا بیانگرێ و بیاندات بەداگاه.

## پێکەنینی ئاکرێ

فاتیحە بۆ گیانی ماسییەکان

جێنوشین: ئەو ماسییانەی داوام لێ کردن بینێرن بۆ سەیرانگای کانی زەر چییان لێ هات؟

کارگێڕی لادێی سوورچی: من (٣٤) ماسیم گرت و خستمنە ناو جامێک ئاوەوە، بۆ ئەمەی بیانێنێرم بۆ ئەستێرکەکەی کانی زەر. کەچی کە سەیرم کردن لە بەیانیدا هەموویان مردبوون.

جێنوشین: ئاخۆ ماسییەکان لەبەر بێ خۆرشتیی خۆیان مردبوون، یان لەبەر خۆرشتیی ئێوە؟

کارگێڕ: چارەنووسیان وا بوو کە بمرن.

جێنوشین: کە وابێ، ئەوا منیش، یاریدەدەری بالبازخانەی ناوچەی ئاکرێتان بۆ دەنێرم، تا لە جیاتی من (فاتیحە) بۆ گیانی ماسییەکانتان بخوێنێ!...

حەسەنی دارتاش

حەسەنی دارتاش: من ناتوانم دارتاشی بکەم، چونکە ئەو ڕۆژەی چووە تەختە بکڕم بۆ خاوەنی سیپە، دوو چەرخە (پایسکل)یەک خۆی لێدام، خستمی و هەردوو دەستیشم بریندار بوون.

سەرۆکی شارەوانی: ئەو ڕۆژە بیرت بەوەوە خەریک نەبووبێ، دەستی (سەلیم ئیبراهیم) بیڕیت، کە پارەی دابوویتێ تەختە بکڕیت بۆ پرۆژەی سەیرانگای سیپە؟

حەسەنی دارتاش: نە... بەڵام نیازم وایە هەر پارەیەک بدەم بەپزیشک و دەرمان بۆ چاککردنەوەی

دەستەکانم و، هەر پارەیەکیشم لەدەست چوو، بەهۆی ئەوەوە، پەکی کارکردنی خستووە، لە خاوەنی سیپەی بستێنم، لەگەڵ کرێی دارتاشییەکەمدا.

مستەفا شینۆ

خوێندکارێکی نایینی: من دەمەوێ زوو بەزوو ببم بەمەلا و مێزەر لەسەر بنێم. بۆ ئەوە ڕێگایەکم پیشان نادەیت؟

پیاوێکی شارەزا: برۆ ئەو خانووەی (مستەفا شینۆ) بەکرێ بگرە کە لە گەڕەکی (گۆڕاوا) دایە، پێنج وردیلە (دەقیقە)ی پێ ناچێ دەتکات بە(خاوەن مێزەر)!...

خوێندکار: تێ ناگەم چی دەڵێیت! مەبەست چییە؟

شارەزا: هەر کەسێک ئەو خانووە لە (مستەفا شینۆ) بەکرێ بگرێت، ناچار دەبێ دەمودەست دەچێ بەگژیدا. ئیتر زۆری پێ ناچێ سەری بەکوتەکی (مستەفا شینۆ) دەکەوێ. کە سەریشی شکا، بەناچاری دەچێتە لای برینپێچ. ئەویش بەکەلافەیەک پەڕۆی سپی سەری دەپێچی. ئیتر ئەویش دەبێتە خاوەن مێزەرێکی وەها کە لە مێزەری مەلاکان گەورەتر و سپی تر بێ!

## فەرموودەی گەورەپیاوان

* ژن هەیە و ژانیش هەیە.
* ژن مارەکردن، هەرچەندە تووشی دەردی سەریت دەکات، بەڵام ناچارییە، هەر دەبێ ژنت بێ.
* هەر کارەساتێک ڕووی دا، لە ژنەوە ڕوو دەدات.
* تەماشای دەم و دووی کرندە بەبوو مەکە ماڵت وێران دەبێ.
* چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاوەوە.

***

## ئاگری

ژمارە: (٦)
ڕۆژ: ١٩٥٠/٨/١٩

## هەواڵی ئاگری

سەیرانگای سیپە

لە ڕۆژی دووشەممەی ڕابردوودا کە ١٩٥٠/٨/١٤ دەگرێتەوە، لە ساتی پێنج و نیوی ئێوارێدا، (یانەی فەرمانبەرانی ئاگرێ) بەبۆنەی تەواوبوونی (پرۆژەی سەیرانگای سیپە)وە و، پێشکەش کردنیەوە بەدانیشتووانی ناوچەی ئاگرێ، لەلایەن سەرۆکی شارەوانییەوە، ئاهەنگێکی گێڕا. کۆمەڵێکی گەورە کە

لە هەموو چینێک هەڵبژێرابوون و، نوێنەری دانیشتووانی ناوچەکە بوون هاتبوونە ئاهەنگەکە سەرۆکی شارەوانیی ئاکرێ (شاکر فتاح) و، خوێندکارێکی زانستگای ئەندازیاری (کاک محەمەد تەیب)، وتاریان خوێندەوە. لە ئاهەنگەکەدا چەند جارێک شاگردانی خوێندنگای ئاکرێ گۆرانی خۆشخۆشیان گوت، شوێنەکەیان وەک دەستەگوڵ ڕازندبووەوە. لە شوێنێکی تری ئەم ڕۆژنامەیەدا وتارەکان نووسراونەتەوە، لەگەڵ پێڕەویی ئاهەنگەکەدا. لە دوای پێشکەشکردنی ساردەمەنی و مێوە، (جێنوشینی ئاکرێ) وتاری هەفتەیی خۆی دا لە بابەت گەورە پیاوێکی مرۆڤپەروەر و باوداهێنەر و مەرد و چست و چالاکەوە کە ناوی (بەرنار ماکفادن)ە. ئاهەنگەکە لە ساتی حەوتەمدا تەواو بوو. میوانەکان بەم (سەیرانگا)یە تازەیەیان زۆر دڵخۆش بوون و سەریان بەرز بووەوە.

هەرچی (سەیرانگای سیپە)یە، بریتییە لە تاڤگەیەکی ئاو، کە لە بەرزاییەکی سی پێییەوە، دەڕژێتە خوارەوە، ناو دۆڵێک، کە کەوتۆتە ناوەند دوو باخی داری بەردارەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا کە جێگاکەی خۆشە و لە هاوینیشدا فێنکاییەکی پەسەندی تێدا دەست دەکەوێت، سیپە ئەوەندە بەرەڵلاکرابوو، پیاو لە ناویدا هەستی بەدڵتەنگی و ناسازی کەشەکەی دەکرد، بەهۆی تەڕ و تووشییەکەوە. هەروەها پیسی قوڕ و چڵپاوەکەی و، تەختە ڕزیوە بۆگەنەکانی خاوەن چایخانەکانی خاوەن چایخانەکەیش کە لەوێدا دایانابوون، تا ئەندازەیەکی زۆر لە خۆشی و جوانی شوێنەکەی کەم کردبووەوە ئیتر هەر ئەوەندە ئەو پێشنیازەی شارەوانیی ئاکرێ بۆ سیپەی دانابوو، جێبەجێ کرا، ئەوانەی دەهاتنە ناو (سەیرانگای سیپە)وە لە دەست تەڕ و تووشی و پیس و پۆخڵی و دڵتەنگی ڕزگاریان دەبوو. چونکە لە گۆڕەپانەکەی سیپەدا: ئەستێرکێکی کەمەرەیی گەورە لە بەرد و چیمەنتۆ دروست کرا، لە شێوەیەکی ئەندازیاری ناوازەدا، ئەشکێڵەکەی پێنج گەزە و بەرزییەکەی نزیکەی سێیەکە گەزێکە... لە دیوی دەرەوەی ئەستێرکەکەوە (١٦) پلوسکە ئاو دێتە دەرەوە، لە شێوەیەکی بێ دەنگ و سەنگ و مەند و زرنگانەدا، بەرەنگاری قیژ و هووڕ و، هاژەووژەی ئاوی تاڤگەکە دەکات، کە خێرا بەتوندوتیژییەکەوە دەڕژێتە ناو ئەستێرکە گەورەکەوە. لەم بەر و لەوبەری ئەستێرکە ناوەکەیشەوە دوو ڕێبازی پان و پۆڕ، لە چیمەنتۆ و بەرد دروست کراوە، جۆگەلەیەکی کەمەرەییش کە بەدەوری ئەستێرکەکەدا خولی خواردووە کەوتۆتە ناوەندیانەوە. هەر وەک سەرنجیش دەدرێ ئەستێرکەکە هەر لە لەتە سێوێک دەکات کە بنکەکەی بەسنگی شاخەکەوە نووسابێ، کە سەروو بەرزاییەکەی ئەوە و تاڤگەکە دەڕژێتە خوارەوە. لەوپەڕی بنکی ئەستێرکەکەیشەوە جۆگەلەیەکی بچووک، کە لە بەرد و چیمەنتۆ دروست کراوە، بەجۆرێکی وا ڕاکێشراوە کە لە شێوەی چڵەدارێکدایە و سێوەکەی پێوە شۆڕبۆتەوە. ئینجا ئەم جۆگەلە لارە کە بەئەستێرکەکەوە نووساوە خۆی دەگەیێنێتە جۆگەلەیەکی ڕاستی گەورەتر لە خۆی، کە بەناو هەموو تەختی زەوییەکەی بەر (تاڤگەی سیپە)دا ڕێگا دەبڕێ، هەرچی ئاوێکی تاڤگەکە و ئەستێرکەکە هەیە بەناویدا تێپەڕ دەکات تا دەگاتە ئەو شێوەی لەودیو باخی سیپەوەیە. بێجگە لەمە لە بەرزاییەکی سێ گەزیدا، لەودیو ڕێباز تەنشتی ڕاستی ئەستێرکەکەوە سەکۆیەکی گەورە و فراوان دروست کراوە. پەرژینێکی جوانی ڕەنگاوڕەنگ چوارلای گرتووە. کەپرێکی پان و پۆڕی بەسەرەوەیە سێبەر دەکات بۆ ئەو میوانانەی دێنە ناوی.

پێڕەوی ئاهەنگی کردنەوەی سەیرانگای سپیە

١- وتاری سەرۆکی شارەوانیی ئاکرێ (شاکر فەتاح)

٢- وتاری کاک محەممەد تەیب لەجیاتی دانیشتووانی شاری ئاکرێ.

٣- لە ناوەند گوێگرتن لە ساز و ئاواز و گۆرانی (خوێندنگایی) و (گۆرانیی کوردی)دا، پێشکەشکردنی جگەرە و چا و بسکویت و میوە بۆ میوانەکان.

٤- وتارێکی (شاکر فەتاح) لە بابەت ژیانی (ماکفادن)ەوە کە بەباوکی (پەروەردەکردنی لەش) و (پەزیشکایەتی سرووشتی) دادەنرێ لە هەموو جیهاندا.

٥- تاوێک گوێگرتن لە ساز و ئاوازی ناو ڕادیۆ.

٦- براندنەوەی ئاهەنگەکە بەچەند وشەیەک لەلایەن سەرۆکی یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێوە.

وتاری شاکر فەتاح

برا بەڕێزەکان!

من بەوە سەرم بەرز دەبێتەوە کە (سەیرانگای سپیە) پێشکەشی ئێوەی بەڕێز بکەم. (سەیرانگای سپیە) سێهەم پرۆژەمانە کە شارەوانی ئاکرێ، بەیارمەتی دانیشتووانی شاری ئاکرێ و فەرمانبەرانی ئاکرێ و، تەواوی کردووە. لەبەر ئەوە بەناوی (شارەوانی ئاکرێ)وە سوپاسێکی گەرم و گوڕ و پەسندکردنێکی تەواوی مەردایەتی و یارمەتییەکەی ئێوە پێشکەش دەکەم. لە خودایش دەپاڕێمەوە کە بەهۆی ئەم (سەیرانگا)یەوە خۆشی و خۆشگوزەرانی بەهەمووتان بگەیێنێ. بەم بۆنەیەوە وام پێ خۆشە کە (کاک سەلیم ئیبراهیم) خاوەنی سپیەتان پێ بناسێنم. من بەناوی (شارەوانیی ئاکرێ)وە سوپاسی یارمەتیی دەکەم. چونکە کارێکی چاکی بۆ خۆی و بۆ ئێوە ڕاپەڕاند. خۆی لە پێکهێنانی ئەم پرۆژەیەدا زۆر ماندووکرد و، پارەیەکی زۆریشی بەخت کرد. ئێمەیشی زۆر دڵخۆش کرد، کە بەقسەی کردین و لەژێر سەرپەرشتی شارەوانیدا ئەم پرۆژەیەی هێنایە بەرهەم. ئێمە هەرچەندە، بەناوی شارەوانیی ئاکرێوە، دەستیاو و یارمەتیان بۆ دانا کە وەریان بگرێ بۆ پێکهێنانی ئەم پرۆژەیە، بەڵام ئەو خۆی وای پێ خۆش بوو، کە هەموو پارەیەکی پێویست بۆ ئەم پرۆژەیە بخاتە سەر خۆی. چوو نزیکەی پەنجا دینارێشی دەستیاوی وەرگرت و، بەپێی ڕێپیشاندانی شارەوانیی ئاکرێ و، ئامۆژگارییەکانی، پرۆژەکەی جێبەجێ کرد. ئەمەیشم زۆر پێ خۆشە، کە (کاک سەلیم) ئێستاکە دڵی بە(سەیرانگای سپیە) زۆر خۆشە، کەچی لە سەرەتای کاردا بەرێچی شارەوانیی ئاکرێی دەدایەوە لەسەر پێکهێنانی. ئەو، وا ئێستاکە خەو بەدوارۆژێکی پڕ کامەرانییەوە دەبینێ، چ بۆ سەیرانگاکەی و، چ بۆ خۆی و، چ بۆ ئێوە هەمووتان چونکە لە دڵی خۆیدا بڕیاری داوە ئەم ساڵ بێتەوە، زۆرتر ڕێکوپێکی بخات و باشتریش بیرازێنێتەوە، تا کارێکی وا بکات دانیشتووانی دراوسێکانی شاری ئاکرێ لە هاویناندا بێنە ئاکرێ و بیکەن بەهاوینەهەوارێک بۆ خۆیان تێیدا ڕابوێرن. جا لەبەر ئەوە منیش تکاتان لێ دەکەم هەمووتان یارمەتی (کاک سەلیم) بدەن و پشتگیری بکەن، تا زۆرتر تیژ بێتە سەر جێبەجێکردنی نیاز و بڕیارەکانی خۆی.

هەروەها تکایش لە خاوەن زەوییەکانی شاری ئاکرێ دەکەم، ئەوانیش وەک ئەم پیاوە مەردە دڵفراوانە بکەن و، هونەری خۆیان بۆ کەلکی خۆیان و نەتەوە و نیشتمانەکەیان بنوێنن.

لە برانەوەی وتارەکەمدا لە خودا دەپاڕێمەوە: ئەم (سەیرانگای سپە)یەتان لێ پیرۆز بکات و، ژیانیشتان پڕ بکات لە سەرکەوتن و کامەرانی و خۆشگوزەرانی، براکانم.

وتاری کاک محەممەد تەیب

گەورە بەڕێزەکانم!

(پرۆژەی سپە) سێهەم سەیرانگایە کە (جێنوشینی ئاکرێ) بەڵێنی پێ داین بۆمانی جێبەجێ بکات. لە ڕاستیدا لە ماوەیەکی کەمدا جێبەجێی کرد. دیارە هەر کاروبارێک بایەخی تەواوی پێ بدرێت و، بەراستی کۆششی تێدا بکرێت، زوو بەزوو جێبەجێ دەبێت.

گەورەکانم!

دانیشتووانی شاری ئاکرێ، هەموویان، سوپاسی (جێنوشینی ئاکرێ) دەکەن، کە فەرمانی دا بە(خاوەنی سپە) لەم شێوە ڕەنگینەدا سەیرانگای سپە ئاوەدان بکاتەوە و، بیکات بەجێگایەکی خۆش ڕابواردن بۆ ئێوەی بەڕێز. ئەم ئاهەنگە گەورەیەیش کە بۆ (کاک سەلیم) دەگێڕێ، لەسەر ئامۆژگاری جێنوشینی ئاکرێ بووە. دامەزراندنی ئەم سەیرانگایەیش هەنگاوێکی ترە لە کۆڕی پێشکەوتن و ئاوەدانکردنەوەی ئاکریدا، کە جێنوشین لە پێڕەوییەکەی خۆیدا بڕیاری داوە بیکات بۆ ئەمەی شاری ئاکرێ پێش بکەوێ و برازێتەوە تا وای لێ دێت بکرێت بە(هاوینەهەوار)ێکی شەنگ و شۆخ. شاری ئاکرێیش شانازی دەکات، کە پیاوێکی وەهای تێدا گەورەبێ و، هەموو دەمێکیش خەریکی کاروباری چاکەخوازانە بۆ کەلکی گشتی، کە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا هەر پرۆژەیەکی ویست جێبەجێ بکات.

گەورەکانم!

جوانی هەیە لە سووروشتەوەیە و، جوانیش هەیە مرۆڤی هونەرمەند بەرهەمی دەهێنێ. جاری وا هەیە ڕێوشوێنێک کە دادەنرێ و، ساختمانێک کە دروست دەکرێ و، هونەرمەندییەک کە دەنوێنرێ و بیرێکی باش کە پیشان دەدرێ و، باوێکی ئاوازە و نایابیش کە دادەهێنرێ، لەوانەیە کە (جوانی سووروشتی) لە کانگاکەیەوە بهێنێتە دەرەوە و، لە شێوەیەکی وا شەنگ و شۆخدا دەری بخات، کە دڵ کێش بکات بەسایەی چاوبەست (سیحر) و هونەرەکەیەوە.

گەورەکانم!

ئای کە دڵ چەند پێی خۆشە، ئەم پرۆژەی سێهەمە بەدوای دەستە خوشکەکەیدا (سەیرانگای کانی زەر)دا دێت، لە جوانی و لە شەنگیدا. ئەم تاڤگەیە، کە لەو بەرزاییەوە دەڕژێتە خوارەوە، هەر دەڵێی هەنگوینی سپییە و لەە شانە دێتە دەرەوە. ئەم ئاوە ئاوێکی ڕوون و سازگار و پاکە هە لە مێژەوە بەناو چیمەن و لالەزار و دار و درەخت و کشتوکاڵدا دەکشێ و دەڕژێتە سەر ئەم کەڵەبەردە مێژووییانە، لە شێوەیەکی جوان و دڵسۆزانەدا. کزەبایەکی فێنکیشی پێ پەیدا دەبێت، گوڵی خەواڵوو لە خەو خەبەر

دەکاتەوە و، دڵ و مێشکیش دەخاتە گەڕ هەرچی خورە و هاژەکەیشێتی پرسی پێ ناوێ. چونکە بریتییە لە ساز و ئاوازێکی سووروشتی، کە زۆر شیرین و ڕەنگینە و، دڵی گوێگران دەبزوێنێ چاونەندازی تافگەکەیش چاوی سەیرکەران دەگەشێنێتەوە کە ئاوەکە دەڕژێتە ناو ئەم ئەستێرکە ئاوازەیەوە، هەڵدەپەڕێ و بەزم و ڕەزم دەکات، تا ڕووی ئاوەکە دەست دەکات بەشەپۆڵدان و، دڵی مرۆڤ لە خۆشیاندا پێی گەشکەدار دەبێ.

گەورەکانم!

(جێنوشینی ئاکرێ)یش هەر ئەوەندە ئەم شوێنەی دی، بیری دامەزراندنی سەیرانگایەک لە سیپەدا کەوتە مێشکییەوە جا هەروەکو خۆتان بەچاوی خۆتان دەبینن، هەموو بیر و دڵ و دەروونی خۆی و خۆتان تێدا بەخت کردووە تا هێناویەتە ئەم شێوەیەوە، کە دەبوو گەلێک ساڵ لەمەوپێش ئەم بایەخە بە(سیپە) بدرایە. لە ڕاستیدا تافگەی سیپە ئێستاکە بووەتە تافگەی ڕاستەقینە. چونکە بۆتە مەڵبەندێکی سەروەت و ئارام و دڵخۆشی بۆ هەمووان. ئێمەیش کە (دانیشتووانی ئاکرێ)ین، مافمان هەیە بە(تافگەی سیپە)وە شانازی بکەین. هەروەها پێویستیشە لەسەرمان، لە کانگای دڵمانەوە، ئاواتی سەرکەوتنی دڵسۆزانە و سوپاسی بێ‌ن خۆشی خۆمان پێشکەشی (مامۆستا شاکر فەتاح) بکەین. تافگەکەیشمان سەری بەرزبۆتەوە کە پیاوێکی وەک ئەو چاکەخوازەی دەسکەوتووە و، خەمی دەخوات و، پەروەردەی دەکات و، چاودێری دەکات، بۆ کەڵکی گشتی. ئیتر سوپاس گەورەکانم!

## پێکەنینی ئاکرێ

ئێوە چۆن بن هی وا دەبێتە گەورەتان

مەلا عەبدولخالق: من لە (سەیرانگای کانی زەر) هیچم دەست نەکەوت تەنانەت ئەو دەرامەتەیش کە لە چاپخانەکەی تەنشتێوە بۆم هات لە دەستم چوو.

جێنوشینی ئاکرێ: کاک مەلا! ئەمەی تۆ دەیڵێیت نان کوێری نییە بەرامبەر خودا؟!

مەلا: نە،. نان کوێری نییە. قسەی ڕاست بوو کردم.

جێنوشینی ئاکرێ: ئەگەر لە قسەکەت پەشیمان نەبیتەوە، دەتخەمە بەردەم ئەو دادگایەی کە چەند و چوونی لەگەڵ (جەواد ئاغا)دا کرد.

## لە سندووقی پرسیار و پرس و پێشنیازەوە

* فەرماندەی تیپی سەربازی ئاکرێ:

هەندێک لە ئەفسەرەکان لە نرخی چوونە ژوورەوەی منداڵان بۆ ناو (سەیرانگای کانی زەر) بۆڵەبۆڵ دەکەن. چونکە ئەوانە لەگەڵ دایکەکانیاندا دەچنە ئەوێ. ئایا ئاکرێ منداڵان تا تەمەنی سێ ساڵان لەو نرخی چوونە ژوورەوەیە ببەخشن. منداڵانی تریش هەتا تەمەنی دە ساڵان ئیوە نرخیان لێ بستێنن؟

رۆژنامەی ئاکرێ:

تکایە جاڕی شـارەوانیی ئاکـرێ کـە لـە ڕۆژی ١٥/٨/١٩٥٠دا بڵاوی کردۆتەوە بخـوێننەوە. چونکـە شـارەوانی لەوێدا منداڵانی بەخشیوە لە پارە لێ وەرگرتن هەتا تەمەنی نۆ سـاڵان. واتا تەنیا لە تەمەنی دە سـاڵییەوە لێیان وەردەگیرێ.

* یەکێکیان:

دەڵێن دۆستایەتی لەگەڵ (جێنشینی ئاکرێ)دا یەجگار گرانە. ئایا ئەمە ڕاستە؟

* ڕۆژنامەی ئاکرێ:

دۆستایەتی لەگەڵ (جێنشینی ئاکرێ)دا زۆر ئاسانە. بەڵام بۆ یەکێکی وەک ئێوە هەتا بڵێیت گرانە!... چونکە مەرجی دۆستایەتی لەگەڵ (جێنشینی ئاکرێ)دا ئەوەیە: دەبێ ئەوەندە سەرت بەرزبێ و، ڕێز لە خۆت بگریت، واز لەوە بهێنیت کە دەسەڵاتی ئەو بەکاربهێنیت بۆ کەلک و چاکەی ناپوختەی خۆت. ئاخۆ کاکەی (یەکێکیان) پێت دەکرێ لەسەر ئەو مەرجە دۆستایەتیی لەگەڵ بگریت؟

---

## ئاکرێ

ژمارە: (٧)

ڕۆژ: ٢٥/٨/١٩٥٠

## هەواڵی ناوخۆ

دەستکەوتی سەیرانگای کانی زەر

دەسـتکەوتی (سـەیرانگای کـانی زەر) لە ڕۆژی ١٠/٨/١٩٥٠ وە هەتا ڕۆژی ٢٠/٨/١٩٥٠ گەیشتۆتە ٧.٩٠٠ دینار.

لە سەیرانگای سەری گریدا

دامەزراندن و دروستکردنی (سەیرانگای سەری گری) لەم هەفتەیەدا تەواو دەبێ. ئەم (سەیرانگای سەری گری)یەیش چوارەمین سەیرانگایە کە شارەوانیی ئاکرێ لەم ساڵەدا دروستی کردووە. وەک زانیومانە وتارەکانی یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ کە لە ڕۆژی دووشەممەی داهاتوودا دەخوێندرێتەوە، لەم سەیرانگایەدا دەخوێندرێتەوە. ئەمەیش بەناوی ڕێزگرتنی سەیرانگاکەوەیە. بابەتی وتارەکەیش ئەمەیە: (ئاراستەکاران)، کە لەلایەن کاک (فەتحوڵڵا عەنانی)یەوە دەدرێ. هەروەها: (تێکچوونی باری ئابووریی ئاکرێ)یە کە لە (کاک عەلائەدین سەعید)ەوە دەدرێ. کاتیش ساتی شەشی ئێوارەیە. جێگاکە (٤٠) کەس دەگرێ. هەر کەسێ دێت دڵمان خۆش دەکات و سەرمان بەرز دەکاتەوە.

**وتارەکانی هەفتەی پێشوو**

* لە هەفتەی پێشوودا بەڕێز (بوولس شێخۆ)، مەترانی ئاکرێ، لە (سەیرانگای کانی زەر)دا وتارێکی بەنرخی دا لە بابەت ئەودەوە کە بەچاوی خۆی دیویتی لە ئێراندا.
* هەروەها بەڕێز (فەتحوڵلا عەنانی)، فەرمانبەری پۆستەخانەی ئاکرێ وتارێکی دا لەژێر ناوی (پۆستە کارێکی مرۆڤانەیە). جا لەبەر ئەوەی ئەوانەی گوێیان لێ دەگرتن کەڵکێکی زۆریان لە هەردوو وتارەکە وەرگرت، ئێمە لە کانگای دڵەوە سوپاسیان دەکەین. تکایشیان لێ دەکەین ئەندامانی یانەکەمان لەم جۆرە وتارە باشانە بێ بەش نەهێڵنەوە.

**بەهەشتی منداڵان**

شارەوانیی ئاکرێ کەرستەی پێویستی ئامادە کردووە بۆ دامەزراندن و دروستکردنی سەیرانگایەکی تازە کە تایبەتی بۆ منداڵان دانراوە ناوی ناوە (بەهەشتی منداڵان). لەم سەیرانگایەدا تەنیا ئەو منداڵانە وەردەگیرێن کە تەمەنیان لە سیانزە ساڵ کەمترە. جێگای سەیرانگاکە بەرامبەر (بەهەشتی منداڵان)ە کە لەبەردەم سەرای ئاکرێ دایە. لەناو (بەهەشتی منداڵان)ەکەدا گەلێک یاری گەورە گەورە دادەنرێ وەک (جۆلانە) و (ئەسپەدارینە) و (یاری تەرازوو) و (یاری سەرکەوتن و خۆخلیسکاندنە خوارەوە). بێجگە لەوانە (نووسراوخانە)یەکی بچووکیشی تێدا دادەنرێ بۆ منداڵان، لەگەڵ (ڕۆژنامەیەکی هەفتەیی وێنەدار)دا کە شارەوانیی ئاکرێ، بەسەرپەرشتی پارمەتی (خوێندنگای سەرەتایی ئاکرێ)وە دەری دەهێنێ. ئەویش بۆ ئەمەی خەمی کاروباری منداڵەکان بخوات و بەکەڵکیان بێت و ئارایشتەیشیان بکات بۆ کردەوەی چاک و ڕەوشتی جوان و سووروشتی مەردانە. هەروەها لەم (بەهەشتی منداڵان)ەدا (ڕادیۆ)یەک دادەنرێ بۆ ئەمەی گۆرانی و ساز و ئاوازی خۆش بدرێ بەگوێی منداڵەکانماندا. بێجگە لەوە (دەسگایەکی ڕادیۆی منداڵانەیش) کە خۆیان دەیبەن بەڕێوە لە بەهەشتەکەیاندا دادەمەزرێنرێ، ئەویش هەم وەک یارییەک خۆیانی پێوە خەریک دەکەن، هەم وەک خوێندنگایەکی فێرکردنی بەڕێوەبردنی کاروباری ڕادیۆگەری شتی لێوە فێر دەبن. هەروەها لەو (بەهەشتی منداڵان)ەدا باخچەیەکی بچکۆلە دادەمەزرێنرێت کە دەکرێتە چیمەن و لالەزارێک بۆ منداڵەکان. ئەم باخچەیە بریتی دەبێ لە تیلماسکێکی چوارگۆشەیی لە شێوەی جۆگەلەیەکی باریکدا کە هەر چوار لای (بەهەشتی منداڵان)ەکە دەگرێتەوە. لە ناویشەوە دەکرێتە چیمەنێک کە دەورەی ئەستێرکێکی بچووک دەدات لە ناوەڕاستی باخچەکەدا. ئەم ئەستێرکە بچکۆلەیە لە شێوەی گوڵە نێرگسێکدا لە بەرد و چیمەنتۆ دروست دەکرێ، بەڵام لە شێوەیەکی گەورەدا. ئەشکێڵی ئەستێرکەکە گەزێک دەبێ. قووڵیشی سێیەکە گەزێک دەبێ. وەک گوڵە نێرگسیش ڕەنگ دەکرێ. لە ناوەڕاستیدا لە پلوسکێکدا ئاو دێتە دەرەوە، پەخشان دەبێ بەسەر گوڵە نێرگسەکەدا، لە لاسکە سەوزەکەیەوە کە دەوری گوڵەکەی داوە ئاوی ئەستێرکەکە دەچێتە دەرەوە ناو جۆگەلەیەک کە لە شێوەیەکی کەمەرەییدا دەوری ئەستێرکە کەمەرەییەکەی داوە. لەو جۆگەلەیەشەوە ئاوەکە بەجۆگەلەیەکی ژێر زەویدا لە بنی چیمەنەکەوە دەڕوات بۆ ناو جۆگەلەی گوڵەکان بەناویاندا دەسووڕێتەوە ئاویان دەدات.

مەبەسیش لەم (بەهەشت)ە پەروەردەکردنی (منداڵانی ئاکرێ)یە لەگەڵ فێرکردنیاندا چ لە رووی لەشیانەوە، چ لە رووی هۆشیانەوە چ لە رووی گیانیانەوە. تا مرۆڤێکی (خواپەرست)یان لێ پەیدا ببێ، نەک مرۆڤێکی (خۆپەرست). ئێستاکەیش (دەستەی بەڕێوەبەرانی خوێندنگای سەرەتایی ئاکرێ) لەگەڵ (سەرۆکی شارەوانیی ئاکرێ)دا لە لێکۆڵینەوەی ئەوەدان چ جۆرە دەستوورێک دابنێن بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری (بەهەشتی منداڵان)ەکە. بەڵام تا ئێستا ئەم بڕیارانەیان دەرکردووە:

١- هەر منداڵێک دەیەوێ کەلک و خۆشی لە (بەهەشتی منداڵان)ەکە ببینێ، تا برانەوەی ئەم مانگی گەلاوێژ (ئاب)ە ماوەی هەیە. پێویستە خۆی لای بەڕێوەبەرایەتیی خوێندنگای ئاکرێ ناونووس بکات.

٢- هەر منداڵێک لە چوار ساڵ کەمتربێ و تەمەنیشی لە دوانزە ساڵ زۆرتربێ لە بەهەشتەکەدا بەئەندام وەرناگیرێت.

٣- هاوبەشی کردنی ئەم بەهەشتە بێ پارەیە، بەخۆڕاییە بۆ هەمووان.

٤- منداڵانی نەخۆش و چڵکن و پڵکن و پنتی و خوێری لە بەهەشتەکەماندا وەرناگیرێن.

هەموو رۆژێک یەکێک لە مامۆستا بەڕێزەکانی خوێندنگای سەرەتایی ئاکرێ سەرپەرشتی (بەهەشتی منداڵان)ەکە دەکات. لە ساتی چوارەمی ئێوارێوە بەهەشتەکە دەکەوێتە گەڕ تا ساتی حەوتی ئێوارێ. ئەمەیش بۆ ئەوەیە یارمەتی منداڵەکان بدەن و رێگایان پیشان بدەن لە یارییەکانیاندا، لەگەڵ رۆشنکردنەوەی بیر و هۆشیان و، ئاراستەکردنیان بۆ کەلک و خۆشی وەرگرتن لە ساز و ئاواز و گۆرانی و رادیۆی ئاکرێ و چاوگەشاندنەوە بەچاوئەندازە جوانەکانی بەهەشتەکەدا و راهێنانیان بەهەڵسووڕاندنی کاروباری بەهەشتەکەوە بەدەستی خۆیان. بێجگە لەوە بۆ کەلک وەرگرتن لەو رۆژنامە و گۆڤار و نووسراوانە کە لە نووسراوخانەکەیاندا دانراون و تایبەتێن بەخۆیان. ئەم سەیرانگایە لە برانەوەی ئەم مانگەدا تەواو دەبێ. ئاهەنگێکی گەورەیشی بۆ دەکرێ. جا لەبەر ئەمەی (بەهەشتی منداڵان)ەکەمان کەلکی زۆر دەبێ بۆ منداڵەکان و خێزانەکانیشمان و، بەخوێندنگایەکی (ئەفلاتوونی) دادەنرێ، واتا: «لە رێگای یاری و خۆش رابواردنەوە منداڵ فێری رۆشنبیری دەکات و بەرەوشت و خوو و کرداری بلندیشەوە پەروەردەی دەکات و رای دەهێنێ»... ئێمە لە دانیشتووانی بەڕێزی ئاکرێ تکا دەکەین: هەر لە ئێستاوە ناوی منداڵەکانی خۆیان لای فەرمانگەی خوێندنگای ئاکرێ تۆمار بکەن، بۆ ئەمەی ببنە ئەندامی ئەم (بەهەشتی منداڵان)ە، و لە کەلک و خۆشی بێ بەش نەمێننەوە.

## سەرۆکەکان رێگای چاکەکردنیان گرتۆتەبەر

* (شێخ کەبیری شێخ قەیوە) و (شێخ تۆفیقی شێخ عوبەیدوڵڵا)، کە هەردووکیان لە هۆزی سوورچین، هەریەکەیان (تاوانبار)ێکی هێنا و دایە دەست جێنشینی ئاکرێ و بۆ ئەمەی بدرێتە دەست دادگاه، کێشەکەیان کە زۆر گرنگ و سامناکە ببڕێنێتەوە.

* (شێخ کەبیر) و (شێخ جاروڵلا) کوڕانی (شێخ قەیوومی سوورچی) پێکەوە سکاڵایەکیان پێشکەشی

جێنوشینی ئاکرێ کرد، داوای کردنەوەی خوێندنگایەکیان کردووە لە میری، لە گوندی (کەلاتی)دا. ئەم دوو پیاوە بەڵێنیشیان داوە، هەر کاتێک فەرمانڕەوایی بڕیاری دا خوێندنگاکە بۆ گوندەکەیان بکاتەوە، هەرچی پێویستی خوێندنگاکە بێ وەک ساختمان و کەلوپەل لەسەر ئەرکی خۆیان پێشکەشی میری بکەن.

* دانیشووانی گەڕەکەکانی (گۆڕاوا) و (قاپەکی) کە لە شاری ئاکرێدان ژمارەیەکی زۆر کرێکاریان بەخۆڕایی پێشکەشی شارەوانیی ئاکرێ کرد، بۆ ئەمەی یارمەتی بدەن لە دامەزراندن و دروستکردنی (سەیرانگای سەری گری)دا، لەگەڵ تەختکردنی ئەو ڕێگایەدا کە لە شارەوە بۆ سەر (سەری گری) دەچێ. سەرۆکەکانی هەردوو گەڕەکەکە (شێخ ئیبراهیم) و (مستەفا مەلا جەلیل) خۆیان سەرپەرشتی کرێکارەکانیان دەکەن.

* خاوەن ڕێز (کاک مستەفا عەبدولقادر) فەرماندەی تیپی سەربازی ئاکرێ پەنجا بار قامیش و چوار سەربازی ڕەوانەکرد بۆ شارەوانیی ئاکرێ، تا لە دامەزراندن و دروستکردنی (سەیرانگای سەری گری)دا یارمەتیی بدەن.

* بەڕێز (شێخ سەدرەددینی شێخ بەدیعی سوورچی) هۆنراوەیەکی خۆی کە بەزمانی کوردی هەڵبەستووە، ناردوێتی بۆ (جێنوشینی ئاکرێ)، بۆ ئەمەی جێنوشینی و شارەوانیی ئاکرێ تیژ بکاتە سەر لەسەر ڕۆیشتن لە ئاوەدانکردنەوەی شاری ئاکرێ و ناوچەی ئاکرێدا.

* بەناوی جێنوشینی ئاکرێ و شارەوانیی ئاکرێوە، سوپاسی ئەم پیاوە بەڕێزانە دەکەین، کە گیان پاک و کردەوەی چاکیان پیشانی هەمووان دا بۆ کەلکی گشتی. خودا وێنەیان زۆر بکات.

## پێکەنینی ئاکرێ

لە ناوەند هەردوو برادا

وشکەبرا: تۆ بۆ چ مانگانەکەت بەرز بکرێتەوە و، من بۆ چ مانگانەکەم بەرز نەکرێتەوە؟
برای ڕووخۆش: تۆیش وەک من (مەی) بخۆرەوە تا مانگانەکەت بەرز بێتەوە!...

لە ناوەند فەرمانبەری سامانی تەرخانکراو و سەرۆکی شارەوانیدا

* فەرمانبەری سامانی تەرخانکراو: من لەو باوەڕەدام ئەو زەوییەی ئێوە (بەهەشتی منداڵان)ی لەسەر دادەمەزرێنن، هی دەسگای سامانی تەرخانکراوە، نەک هی شارەوانی!...

* سەرۆکی شارەوانی: منیش لەو باوەڕەدام ئەو زەوییەی ئێوە کەپری چایخانەکەتان لەسەر دامەزراندووە هی شارەوانییە، نەک هی دەسگای سامانی تەرخانکراو!...

* فەرمانبەری سامانی تەرخانکراو: ئەمەی ئێوە دەیڵێن ڕاستە. بەڵام ئاخۆ لەسەر ئەوە، لێپرسینەوە، یەخەی من ناگرێت؟!

* سەرۆکی شارەوانی: ئەم هەموو ساڵانەی پێشوو ئەم زەوییە، گوێدرێژ و گا و مەڕ و بزنی تێدا دەبەسترایەوە، ئێوە هیچ لێپرسینەوەیەک ڕووی تێ نەکردن. کەواتە ئەگەر ئێرە بکرێ بەسەیرانگای (بەهەشتی منداڵان) لێپرسینەوە بۆچ دەبێ ڕووتان تێ بکات، بەتایبەتی ئەگەر جێگاکە گۆڕەپان بێ و لەسەر چەقی ڕێگابێ کە مافی ڕەوای شارەوانییە هەموو دەسگایەکی خۆی تێدا دابمەزرێنێ؟ بەواتایەکی تر: لای ئێوە (یانەی گیانلەبەران) چاکترە، یان (بەهەشتی منداڵان)؟!.

***

## ئاگری

ژمارە: (٨)
ڕۆژ: ١٩٥٠/٩/١

## هەواڵی ئاگری

سەرۆکەکان ڕێگای چاکەکردنیان گرتۆتەبەر

* (شێخ تەقی سوورچی) سێ تاوانباری دایە دەست جێنوشینی ئاگری.
* (شێخ کەبیری شێخ قەییومی سوورچی) تاوانبارێکی دا بەدەست جێنوشینی ئاگری.
* (مامۆستا سەعیدی فێرکار) و (مامۆستا محەمەد ساڵح کەریمخانی کارگێڕی خوێندنگای ئاگری) و (کاک سلێمان ئەزیف) یاریدەدەری نووسیاری جێنوشین، هەریەکەیان چەند کۆڤارێکی بەدیاری نارد بۆ (یانەی فەرمانبەرانی ئاگری).
* ئەم پیاوە بەڕێزانەی لە خوارەوە ناویان نووسراوە هەریەکەیان پارەی بەخشیوە بە(سەیرانگای بەهەشتی منداڵان)، بۆ ئەمەی پێی دروست بکرێ و دابمەزرێنرێ. کۆمەڵەی پیتاکەکان گەیشتە چل دینار و نیو. ئەوەی شایانی باسە سێ کەس لەو فەرمانبەرانە لەوانەن کە لە جیاتی ئەمەی ئاهەنگ بکەن بەناوی بەرزبوونەوەی مانگانەکانیانەوە، یاخود لەدایکبوونی منداڵەکانیانەوە، یان سەرکەوتنیان لە تاقیکردنەوەدا، ئەو پارانەیان داوە:

| فلس | دینار | |
|---|---|---|
| ... | ١٠ | کاک خورشیدی حاجی عەبدال |
| ٥٠٠ | ٧ | کاک کەریم خانی محەمەد ساڵح |
| ٥٠٠ | ٧ | کاک عەبدوڵلا چیچۆ |
| ... | ٢ | کاک عەبدولڕەحمان عەبدوڵلا |
| ٥٠٠ | ١ | کاک مستەفا مەلا جبرائیل |
| ٥٠٠ | ١ | کاک دەرویش لوتفی |

| | | |
|---|---|---|
| کاک زوبەیر ئەحمەد | ١ | |
| کاک مەلا ئەحمەدی پێش نوێژ | ١ | |
| کاک محەممەد شەریف یوسف | ١ | |
| کاک مامە محەممەد | ١ | |
| کاک عەبدورەزاق حاجی سادق | ١ | |
| کاک سەلیم مەلا عەزیز | ١ | |
| کاک شەریف مەحموود | ١ | |
| کاک جومعە سالح | ١ | |
| کاک قاسم نانەوا | ١ | ٠٠٠ |
| کاک شێخ ئیبراهیم | ١ | ٥٠٠ |
| کۆی گشتی | ٤٠ | ٥٠٠ |

ئێمەیش لە ناخی دڵمانەوە سوپاسی ئەو پیاوە مەردانە دەکەین کە لە کاتی تەنگانەدا دەستی شارەوانییەکەی خۆیان دەگرن، بەمەبەستی ئاوەدانکردنەوەی نیشتمانەکەیان.

کڕینی ترێ

چەند کڕیارێکی ترێی ڕەش لە شاری موسڵەوە هاتوون بۆ ئاکرێ. نیازیان وایە سێ بار ترێی ڕەش بکڕن. ئێمەیش تکا لە خاوەن ڕەزەکانی ئاکرێ دەکەین چەندیان لە دەست دێ پارمەتییان بدەن، تا ئەوانیش و کەسانی تریش تێژ بکەنە سەر کڕینی بەرهەمەکانی ئاکرێ، بۆ کەلکی باری ئابووری گشتی.

لە سەیرانگای سەری گریدا

لە ڕۆژی ١٩٥٠/٨/٢٨ (سەیرانگای سەری گری) کرایەوە و بەو ناوەوە ئاهەنگێکی گەورەی بۆ گێڕرا. وتارە هەفتەییەکانی (یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ)یش لەوێدا دران. ئەوانەی لەوێدا کۆبووبوونەوە پەسندیان کردن.

(سەیرانگای سەری گری)یش بریتییە لە سەکۆیەکی (١٠٠) گەز چوارگۆشەیی کە لە زەوی دوو گەز بەرزبۆتەوە. لە شێوەیەکی وایشدا دروست کراوە، بەشێکی نیوە کەمەرەیییە و، بەشێکیشی چوار لایی. ئەم سەکۆیەیش لەسەر چەند کەلەبەرێکی گەورە دروست کراوە، کە کەوتوونەتە سەر پۆپەی ئەو گردەی لە ناوەڕاستی ئاکرێدایە بەپەراوێزێکی گوڵ و ڕێحانەی جوان و ڕەنگاوڕەنگ و ڕەنگین دەورە دراوە. لە ناوەڕاستی سەکۆکەدا ئەستێرکێکی چوارگۆشەیی دروست کراوە، لە شێوەیەکی ئەندازەیی شەنگدا، بەکاشی ڕەنگاوڕەنگ داپۆشراوە. کەپرێکی گەورە کە لە قامیش دروست کراوە سێبەر بۆ ئەم (سەیرانگای سەری گری)یە دەکات، ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەمەیە کە ئەم سەیرانگایە لە خوارووی کەناری شاخەکەوە بۆ ماوەیەکی (١٥٠) گەزی، ئاو و کارەبای بۆ ڕاکێشراوەتە سەرەوە. ئەمەیش یەکەم جارە کە باسکی ئەم گردە لە ژیانی خۆیدا ئاو و کارەبا بەخۆیەوە دەبینێ. سەیرانگایەکە بەچرای ڕەنگاوڕەنگ و

جوان رازێنراوەتەوە بەشەو لە دوورەوە وەک مرواریـەک دەنوێنن کە پرشنگ بەهەموو لایەکدا دەدات. سەیرانگایەکە دەروانێت بەسەر باخ و بێستانە ئاوەدانەکانی ئاکرێدا کە ژمارەیان لە پێنج سەد تێپەڕ دەکات. هەروەها زۆربەی خانووەکانی ئاکرێیش و، بەشێکی گەورەی زەوی و شاخی لادێیەکانی (عەشائرولـەبعە) و (سوورچی) و ناوچەکانی تەنیشت (موسڵ و، شێخان و، ڕەواندز و، هەولێر)ی لێوە دیارە. دانیشتووانی شاری ئاکرێیش گرفتاری ئەڤینی ئەم سەیرانگایە بوون ئێواران و شەو دێنە سەیری و هەتا بگرێت تێیدا دادەنیشن. جا چونکە ئەم (سەیرانگای سەری گری)یە بەسایەی یارمەتیی دانیشتووانی گەڕەکەکانی (گۆڕاوا) و (قاپەکی) و فەرمانبەرانی ئاو و کارەبا و سەربازی و کشتوکاڵەوە، تەواو بووە، (شارەوانیی ئاکرێ) پڕ بەدڵ سوپاسی پیاوەتی هەموو لایەکیان دەکات. خودا پاداشتی چاکە و مەردایەتییان بداتەوە.

## لەسندووقی پرسیار و پرس و پێشنیازەوە

کردنەوەی سندووقێک بۆ پارە کۆکردنەوە

* ع.ش. ئاکرێیی: تکا دەکەم هەوڵ بدەن سندووقێک بۆ پارە کۆکردنەوە لەلایەن فەرمانڕەواییەوە، لە شاری ئاکرێدا بکرێتەوە. چونکە باری ئابووریمان پێویستی پێی هەیە.

* ڕۆژنامەی ئاکرێ: لە بابەت خواستەکەتەوە لێکۆڵینەوە دەکەین و، هەرچییش پێویست بێ دەیکەین. سوپاسیشت دەکەین کە بایەخ دەدەیت بەکەلک و چاکەی نیشتمانەکەی خۆت.

کردنەوەی باخچەیەک بۆ منداڵان

* سەرۆکی یەکەم یوونس: تکایە باخچەیەک بۆ منداڵان بکەنەوە، تا ڕزگاریان بکەن لە دەست تەنگوچەڵەمە و خراپی کۆڵانان و ناو بازاڕ.

* ڕۆژنامەی ئاکرێ: تکایە بێنە ئاهەنگی کردنەوەی (بەهەشتی منداڵان)، کە لە ڕۆژی دووشەممەی داهاتوودا دەکرێ. چونکە شارەوانیی ئاکرێ دەمێکە پێشنیازەکەی ئێوەی جێبەجێ کردووە. بەڵام ئاخۆ ئێوەیش ئامادەن چەند بابەتێکی یاری پێشکەش بەو (بەهەشتی منداڵان)ە بکەن تا منداڵەکان کەلکیان لێ ببینن و دڵیان خۆش بێ؟!...

سەرنج

* چەند پێشنیازێکمان بۆ هاتووە لە بابەت ئەم شتانەوە:

١- لە (سەیرانگای کانی زەر)دا پەردە و بەرماڵی نوێژ دابنێین.

٢- ئەم ڕۆژنامەیە بە(چاپی تایپ ڕایتەر) چاپ بکەین.

٣- نیشانەی وا دابنێین لەسەر ڕێگای کانی زەر کە بیری پیاوان بخاتەوە ئەو ڕۆژانەی ژنان دێنە ئەوێ، نەچنە ئەوێ.

* بەداخەوە ئەو پێشنیازانەمان پێ جێبەجێ ناکرێت، ڕەنگە خاوەنەکانیان خۆشیان هۆی ئەمە بزانن.

# ئاگری

ژماره: (٩)
ڕۆژ: ٨/٩/ ١٩٥٠

## هەواڵی ئاگری

فەرمانبەرەکان لەسەر ڕێگای چاکەکردنن

* لە ماوەی ئەم دوو هەفتەیەی ڕابوردوودا مامۆستای بەڕێز (جەمیل سەبری) لە خەبات و تێکۆشانێکی بەجگار پڕ ئەرک و گرنگدا بوو، چێژگەی سەرەوتی نەکرد. چونکە هەر خەریکی مەشق پێکردن و ڕاهێنانی منداڵەکانی خوێندنگای ئاگری بوو، فێری (وتاردان) و (لاسایی کردنەوە) و (یاری) دەکردن. بۆ ئەمەی ئامادەبین بۆ ئاهەنگی کردنەوەی (بەهەشتی منداڵان) لە شاری ئاگریدا. هەر خۆیشی بوو کە چوو بۆ مووسڵ و کەرەستەی پێویستی بۆ دروستکردن و دامەزراندنی (سەیرانگا)کە کڕی.

* (یانەی فەرمانبەرانی ئاگری) بەبۆنەی کردنەوەی سەیرانگای (بەهەشتی منداڵان)ەوە، لە ڕۆژی دووشەمەی ڕابوردوودا، لەسەر ئەرکی خۆی، ئاهەنگێکی گێڕا. ئاهەنگەکە زۆر ناوازە و نایاب بوو، چونکە نوێنەرانی هەموو چینەکانی دانیشتووانی شاری ئاگری تێدا بانگ کرابوو، لەگەڵ هەندێک میوانی تردا کە لە شاری مووسڵەوە هاتبوون وەک (کارگێری زانستیی مووسڵ) و چەند کەسێکی تر لە فەرمانگەکەی. دانیشتووانی شاری ئاگریشی کە لە ڕۆژی ئاهەنگەکەدا بەچاوی خۆیان کەلکی (بەهەشتی منداڵان)ەکەیان دی، زۆر دڵشاد و کامەران بوون. چونکە لەلایەکەوە (یاری)یەکانیان دی. لە لایەکی تریشەوە (نووسراوخانە) و (ڕۆژنامەی منداڵانی ئاگری) و (ڕادیۆی منداڵانی ئاگری) و (ڕادیۆ) و (باخچە) و (گوڵەنێرگس)ە دەستکردەکەی و تافگە ئاوەکەیان دی کە لە دەمی گوڵە نێرگسەکەوە دەهاتە دەرێ. هەروەها ئەو تەختانەیشیان چاو پێکەوت کە لەناو باخچەکەدا دانرابوون بۆ کاتی ماندوو حەسانەوەی منداڵەکان و خۆ خەریک کردنیانەوە بەخوێندنەوەی ئەو نووسراو و گۆڤارەی بەتایبەتی بۆ خۆیان دانراوە. ڕەنگە ڕەنگینترین شت کە لەناو ئاهەنگەکەدا بەرچاوی میوانەکان کەوتبێ ئەوە بێ کە منداڵەکان لاسایی (ڕادیۆی جیهانی)یان دەکردەوە، لەناو وێستگە بچکۆلەکەی خۆیاندا کە ناویان ناوە (وێستگەی ڕادیۆی منداڵانی ئاگری). چونکە ئەوانیش وەک هەموو ڕادیۆکانی جیهان کە پیاوان دەیبەن بەڕێوە، (هەواڵی ئاگری) و (گۆرانی منداڵان) و (چامە)یەک و (وتار)ێکیان لە ڕادیۆکەی خۆیاندا بڵاوکردەوە. ئەوەی شایانی باسە (کارگێری زانستیی مووسڵ) و (پشکنێرەکان)ی دڵیان زۆر بە(بەهەشتی منداڵان)ەکە کرایەوە و، ستایشی ئەو و خەباتی دەستەی بەڕێوەبەرانی خوێندنگای ئاگری، بەتایبەتی هەوڵ و تێکۆشانی مامۆستای بەهرەدار (جەمیل سەبری)یان ئافەرین و پەسند کرد. سەرۆکی شارەوانیی ئاگرییش لەو هەڵسەنگاندنەدا پشتگیری کردن. ئەمەندە و (کارگێری زانستیی مووسڵ) بەڵێنی دا (ڕادیۆ)یەک و هەندێک (نووسراو) و (گۆڤار)ی تایبەتی بەمنداڵ بەدیاری بۆ (بەهەشتی منداڵان)ەکەمان بەدیاری بنێرێت.

ئێمەیش بەشی خۆمان سوپاسی ئەو جۆرە پیاوە بەڕێزانە دەکەین کە لە سەرەوە ناومان بردن. ئەوانە نیشتمانپەروەری و چاکەیانفان لەبەرچاوە، کە یارمەتیی پرۆژەکانی شارەوانیی ئاکرێیان داوە. داوا لە خودایش دەکەین هەتا دەمێنن هەر بەسەربەرزی و کامەرانییەوە ڕابیوێرن.

* (نوێنەری فەرمانگەی نەتەوە یەکگرتووەکان) بەم زووانە دێتە ئاکرێ بۆ ئەمەی لەگەڵ (جێنشینی ئاکرێ)دا ڕێوشوێن دابنێن بۆ چارەسەرکردنی (نەخۆشیی لەرزوتا) لە ناوچەکەماندا. بەخۆشی بێت.

## پێکەنینی ئاکرێ

لە ناوەند هەردوو برادا

برا وشکەکەیان: مەبەس لە وشەی «وشک» چییە؟

برا ڕووخۆشەکەیان: مەبەس ئەوەیە خۆت وشک کردۆتەوە لە پرسان!...

ساز و ئاواز و نیسکێنە

یەکەم کەسیان: کە سەرنجم دەدەم لە خۆم شتێکی سەیرم دێتە بەرچاو. ئەویش ئەوەتا هەرچەند نیسکێنە دەخۆم پاش ماوەیەک ئارەزووی گۆرانی گوتن دەکەم!...

دووەم کەسیان: کەواتە بۆ چ هەتا چل ڕۆژێک چێشتی نیسکێنە ناخۆیت تا ببیتە گۆرانیبێژێکی تەواو؟

یەکەم کەسیان: ئەمە ڕێوشوێنێکی باشە پیشانی دەدەیت. بێگومان بەگوێت دەکەم. بەڵام خوشکی خۆم منیش ئەوساکە لەسەر یارێکی گۆرانبێژ دادەمێنم. ئەی تۆیش بۆ چ خەریکی خواردنی چێشتی نیسکێنە نابیت تا ببیتە گۆرانیبێژێکی ئافرەتی تەواو؟!

* دڵخۆشی هێزە. دڵتەنگی گوناهە تۆیش خۆت مەکە بەگوناهبار.

* چاکترین کەس ئەوانەنە کە لە کاتی خۆیدا فەرمان دەکەن، کە لە کاتی خۆیدا یاری دەکەن. بەڵام تێکەڵیان ناکەن.

* هەر بۆ ژیانی جیهانی خەبات مەکە. هەر بۆ ژیانی پاش مردنیش خەبات مەکە. بۆ هەردوو ژیانەکە خەبات بکە.

* تۆ چۆن بیر لە دواڕۆژی خۆت بکەیتەوە وەهات لێ دێت. لەبەر ئەوە هەر لە ئێستاوە بیر لەسەرکەوتن بکەرەوە تا لە ژیانتدا سەرکەوتوو بیت.

## پیرۆزیی ئاهەنگی کردنەوەی بەهەشتی منداڵان

جێگا: (بەهەشتی منداڵان)ە، بەرامبەر سەرای ئاکرێ.

ڕۆژ: لە ساتی شەشەمی ئێوارێدا، ڕۆژی دووشەمە ٤/٩/١٩٥٠.

١- وتاری سەرۆکی شارەوانیی ئاکرێ، شاکر فەتاح.

٢- وتاری کارگێڕی خوێندنگای سەرەتایی ئاکرێ محەممەد سالح کەریم خان.

٣- گۆرانی (خۆش هاتی) لەلایەن شاگردەکانی خوێندنگای ئاکرێوە.

٤- وتاری مامۆستای خوێندنگای ئاکرێ جەمیل سەبری.

٥- ساز و ئاوازێک لەلایەن (ئێستگەی ڕادیۆی منداڵانی ئاکرێ)یەوە. دابەشکردنی ساردەمەنی و خواردەمەنیی تر بەسەر میوانەکاندا.

٦- گفتوگۆیەکی چەند منداڵێکی کچ و کوڕ لەلایەن (ئێستگەی ڕادیۆی منداڵانی ئاکرێ)وە.

٧- براندنەوەی ئاهەنگەکە بەچەند قسەیەکی (سەرۆکی یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێ).

## وتاری سەرۆکی شارەوانی ئاکرێ

برا گەورە بەڕێزەکان!

بەناوی (خودای گەورە و میهرەبان)ەوە دەست پێ دەکەم. بەناوی (شارەوانیی ئاکرێ)وە (بەهەشتی منداڵان)تان پێشکەش دەکەم. ئەمەیش سەیرانگای پێنجەمە کە لەم هاوینەدا پێشکەشی ئێوەی بەڕێزی دەکەم. جا لەم کاتەدا کە پیرۆزباییتان لێ دەکەم و، داوایش لە خودای پاکی بێ هاوتا دەکەم لێتانی پیرۆز بکات: لە خۆتان و لە منداڵەکانتان، سوپاسی گەرم و گوڕی شارەوانی و خۆمتان پێشکەش دەکەم. ئێمە تا دەمێنین چاکەی هەموو چینەکانی دانیشتووانی شاری ئاکرێ و ناوچەکەمان لەبیر ناچێتەوە، هەروەها هی فەرمانبەرانی شارەوانی و ئاو و کارەبا و زانست و کشتوکاڵ، کە بەدڵ و بەدەست یارمەتی شارەوانییان دا لە بەرهەمهێنانی ئەم پرۆژەیەدا. لەبەر ئەوە لە خودامان دەوێ: تەندروستی و کامەرانی و سەرکەوتن بەهەموویان ببەخشێ و گەشەیش بەمەردایەتی و نیشتمانپەروەرییان بدات.

برا بەڕێزەکان!

ئێمە مەبەستمان لە دروستکردنی ئەم (بەهەشتی منداڵان)ە ئەوەیە کە منداڵەکانتان لە ڕووی لەش و هۆش و دڵ و دەروون و چێژکەیانەوە بەجۆرێکی ڕابهێنین و پەروەردە بکەین کە ببنە مرۆڤی تەواو و، کە گەورەیش بوون بەکەڵکی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆیان بێن. واتا لە (خۆپەرستی)یەوە بیانگرێزینەوە بۆ (خوداپەرستی). بەهۆی ئەو یارییە گەورانەدا کە تێیماندا داناوە و، ئەو چاوئەندازە جوانانەوە کە لە گوڵ و چیمەن و ئەستێرکە ئیرگسینەکەی و تاڤگە بلندەکەیەوە پێکهاتوون و چاویان دەگەشێنینەوە، هەروەها بەهۆی (ئێستگەی ڕادیۆی منداڵانی ئاکرێ) و (ڕادیۆ)کەی و چرا ڕەنگاوڕەنگەکانی و (نووسراوخانە)کەی و (نووسراوان) و (گۆڤار) و (ڕۆژنامەی منداڵانی ئاکرێ) بەیارمەتی و سەرپەرشتی (کارگێڕ و مامۆستایانی خوێندنگای ئاکرێ)وە دەتوانێ بەو ئامانجەی خۆی بگات. جا ئەگەر (بەهەشتی منداڵان)ەکەمان لە باری ئێستایدا گەلێک کەموکوڕی هەبێ، خودا یار بێ کۆشش و خەبات دەکەین ئەو

کەموکوڕییانە تەواو بکەین. سەرکەوتنیشمان هەر بەسایەی خوداوە دەبێ. ئەوەی منیش بەتایبەتی تکاتان لێ دەکەم ئەوەیە، کە ئێوەی بەڕێز یارمەتیمان بدەن لە پەروەردەکردن و ڕاهێنانی منداڵەکانتاندا، کە دەمانەوێ لەسەر دەستوورێکی نوێ ئێمە -واتا دەسگای شارەوانی و خوێندنگای ئاکرێ- بڕۆین بەڕێوە. چونکە هەر کردەوەیەک لە ئێوەوە ڕوو بدات و پێچەوانەی ئەو دەستوورە بێت کە ئێمە پەیڕەویی دەکەین، ڕەنجەکەمان بەبادا دەدات. ئەوساکەیش کەس زیانی پێ ناگات منداڵەکانمان نەبێ. چونکە ئەگەر خودا نەخواستە و ڕووبدات، هەموویان لە لەش و گیان و دڵ و دەروون و ڕەوشت و کردار کز و لاواز دەردەچن. بەڵام من ئێوەم وا دیوە هەتا توانیوتانە یارمەتی شارەوانییەکەی خۆتان داوە لە هەموو ڕۆژەیەکیدا. لەبەر ئەوە بڕوام وەهایە کە لەم کۆڕەیشدا یارمەتیمان دەدەن.

ئیتر ئەمەندە و جارێکی تریش سوپاسی یارمەتییە بەنرخەکانتان دەکەمەوە خودا بتانهێڵێ و بۆ کەلکی گشتی و سەربەرزیتان:

## ئێستگەی ڕادیۆی منداڵانی ئاکرێ
## (ئێرە ئاکرێیە)

ئێستگەی ڕادیۆی منداڵانی ئاکرێ: دەنگوباس و ساز و ئاواز و گۆرانی و لاسایی کردنەوە و وتووێژەکانی خۆی لەسەر شەپۆلێک بلاو دەکاتەوە کە درێژایی پەنجا بستە و ژمارەی لەرینەوەکانیشی (خودا) نەبێ کەس نایزانێ. ئەوەیش لە ساتی شەش و نیوی ئێوارەی ڕۆژی دووشەمەوی هەفتەیەکدا بلاو دەکاتەوە.

خانمەکان! گەورەکان!

وا پێڕەوی ئەم هەفتەیەمانتان پێشکەش دەکەم، کە وەک خوارەوەیە:

١- دەنگوباسی ئاکرێ.

٢- گۆرانییەکی خوێندنگایی لەلایەن تیپی گۆرانیی خوێندنگای ئاکرێوە.

٣- چامەیەک لەلایەن منداڵێکەوە کە ناوی (فەوزیلوەکیل)ە.

٤- وتارێک لەلایەن منداڵێکەوە کە ناوی (نەجدەت بەدیع)ە.

ڕۆژنامەی ئاکرێ:

ئێمە وامان پێ خۆش بوو کە بتوانین هەموو وتارەکان چ هی مامۆستا بەڕێزەکان و، چ هی منداڵە خۆشەویستەکانمان لێرەدا بلاو بکەینەوە. بەڵام داخەکەم لەبەر بچووکی ڕۆژنامەکەمان ئەوەمان بۆ نەچووە سەر. لەبەر ئەوە تکا لەو مامۆستا و منداڵانە دەکەین کە بمانبەخشن. ئەوەندە هەیە ئێمە بەشانازییەوە وتارەکانیانمان خستە ناو دووتوێی بەرگی ڕۆژنامەکەمانەوە، وەک یادگارێکی مێژوویی خۆشەویستی (کوردەواری) لە نووسراودانەکەماندا دەیانپارێزین چونکە بۆ دواڕۆژێکی ڕۆشنبیری بەکەلک دێن.

بێجگە لەوە، حەز دەکەین پەنجەیش بکێشین بۆ ئەوەی، کە وتارەکانیان (بەکورتی): باسی کەلک و چاکەی (بەهەشتی منداڵان)ەکەیان دەکرد، لەگەڵ پێشکەشکردنی سوپاس و پەسندکاریاندا بۆ شارەوانیی ئاکرێ، بەرامبەر ئەم پرۆژەیە و پرۆژەکانی تری کە لەم چەند مانگانەدا بۆ کەلک و چاکەی ناوچەی ئاکرێ رایپەڕاندوون.

* ئێتر لە بڕانەوەدا ئێمەیش لەگەڵ (ڕادیۆی منداڵانی ئاکرێ)دا دەڵێین:
* «هەر بژین منداڵان»...
* «هەر بژین ئەوانەیش کە بۆ پێشکەوتنی منداڵان تێدەکۆشن».
* هەر بژین (زانست) و (هونەر) و (کردەوە) و (ڕەوشت) و (خوو)ی باش و (خوودان ناسی).

***

## ئاکرێ

ژمارە: (١٠)
رۆژ: ١٩٥٠/٩/٥

### دەوڵەمەندەکان و سەرۆکەکان ڕێگای چاکەیان گرتۆتەبەر

* (شێخ ڕەقیبی سوورچی) یەکێک لە تاوانبارە ڕاکردووەکانی دایە دەست (بەڕێوەبەرایەتیی لادێی سوورچی). بەڵێنیشی داوە هەردوو تاوانبارە ڕاکردووەکانی تریش بهێنێت بۆ میری، لەسەر خواستی (جێنوشینی ئاکرێ).
* (حاجی جومعە) و (عارف ئاغا) و (عەبدوڵلا چیچۆ) دەستیان کرد بەدروستکردنی ئەو خانووانەی بەڵێنیان دابوو بەجێنوشینی ئاکرێ دروستی بکەن. (کەریم خان سالح)یش کەرەستەی بۆ خانووەکەی ئامادە کردووە، بەڵام هێشتا دەستی بەدروستکردنی نەکردووە. ئەمانە لەو دەوڵەمەندانەن کە بەڵێنیان دابوو بەجێنوشینی ئاکرێ خانوو دروست بکەن و بۆ فەرمانبەرانی ئاکرێ کە پێیان بەدرێن بەکرێ.
* (ئەحمەد ئاغای زێباری) و (مەحموود ئاغای زێباری) هەریەکەیان چەند سەربازێکی بەجێماوی ڕەوانە کرد بۆ فەرمانگەی سەربازی، بۆ ئەمەی کاروباریان هەڵبسووڕێنن.
* (مەحموود ئاغای زێباری) و (ئەحمەد ئاغای زێباری) و دەستە و دایەرەی هەردوو برا، کە ئاکۆکییان کەوتبووە ناوەوە، سایەی کۆششی خزمەکانیانەوە (شێخ تۆفیقی سوورچی) و (جەواد ئاغای زێباری) و (شەوکەوت ئاغای زێباری) ئاشت بوونەوە. هەرچی کێشەیەکیان لە ناوەندا پەیدابووبوو چارەسەر کران، کە کێشەی گوندی (چار بۆت)یش یەکێکە لەوانە.
* دەسگاکانی تەندروستی بڕیاریان داوە نەخۆشی لەرزوتا لە لادێی (بیرە کەپرە)دا، لەسەر شێوەی (چارەسەرکردن)، لەم ساڵەدا لەناو ببەن. بەڵام لە ساڵی داهاتوودا، لەسەر شێوەی (خۆپاراستن) نەخۆشییەکە لەناو دەبەن.

ڕۆژنامەی ئاکرێ:

ئێمە گیانپاکی و کردەوە چاکی ئەو پیاوە بەڕێزانەی لەسەرەوە ناومان بردن پەسەند دەکەین. سوپاسیشیان دەکەین کە خەریکی کەلکی گشتین.

میوانەکان و سەیرانکەرەکان ئاکرێیان بەدڵدا دەچێ

لەم دوو هەفتەی دواییەدا چەند کەسێکی گەورە و ناسراو هاتنە دیدەنی ئاکرێ، وەک: (سەرۆکی پشکنێرەکانی دادگاە) (نوێنەری کۆڕی نەتەوە یەکگرتووەکان لە نەهێشتنی نەخۆشیی لەرزوتادا) لەگەڵ ژنەکەی و، (کارگێڕی ئاشنایەتیی بەریتانیا لە موسڵدا) و، چوار دادگەری موسڵ و، کارگێڕی سامانی تەرخانکراوی موسڵ. ئەم پیاوانە لە پاش ئەمەی تێر و پڕ سەیرانگایەکانی ئاکرێ و باخە جوانەکانیان دی، بەسەرپەرشتیی سەرۆکی شارەوانی ئاکرێ و دەستەی بەڕێوەبەرانی یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێوە، هەست و بیروباوەڕی خۆیان بەخۆشی و جوانییەوە دەربڕی بەرامبەر هاوینەهەوارەکانی ئاکرێ و، سەیرانگایە تازەکانی، بەتایبەتی (بەهەشتی منداڵانی ئاکرێ). هەروەها دانیان بەوەیش دانا، کە بایەخدانی شارەوانیی ئاکرێ و فەرمانڕەوایی عێراق و، پیاوە گەورەکانی ئاکرێ، بەڕێکخستنی ئەم هاوینەهەوارانە، بەجۆرێکی وەها کە بگەنە ئەو ئەندازەیەی ئەوانەی دێن بۆ هاوینەهەوارەکانی ئاکرێ بەتەواوەتی تێیدا بحەسێنەوە، بەکارێکی گەورە و گرنگ و پێویست دادەنرێ. چونکە سەیرانکەران و ئەوانەیش بەدوای هاوینەهەواراندا دەگەڕێن، ئەم ساڵ بێتەوە ژمارەیەکی زۆریان دێنە ئاکرێ. ئەو پیاوانە لە پاش ئەمەی چەند وێنەیەکی ئاکرێیان گرت، هی چاوئەندازە جوانەکانی، بەدڵێکی خۆش و سوپاسەوە گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان. بەڵێنیشیان داین، کە ئەوەندەی لە دەستیان بێت، ڕاستیی جوانی هاوینەهەوارەکانی ئاکرێ لە هەموو کەس بگەیێنن و هەوڵیش بدەن: کاربەدەستانی میری بخەنە سەر ئەوەی بایەخ بەشاری ئاکرێ و ڕێکخستنی بدات تا بیکاتە بنکەیەکی تر لە هاوینەهەوارەکانی کوردستان.

دیاریی پەسەند

* لاوی بەنرخ و هونەرمەند (ئەدواردول برنووتی) کۆمەڵێک لە وێنە جوانەکانی ئاکرێی بۆ دەسگای ئەم ڕۆژنامەیە بەدیاریی ناردبوو کە بەوێنەگرەکەی خۆی گرتبوونی. پڕ بەدڵ سوپاسی دەکەین.
* (مامۆستا سالح کەریم خان)، کارگێڕی خوێندنگای سەرەتایی ئاکرێ، دەسکە گوڵێکی دەستکردی پێشکەشی دەسگای (بەهەشتی منداڵان) کردووە. سوپاسی نیشتمانپەروەریی دەکەین.

کردەوەیەکی شەنگ

(کاک محەممەد یوسف) جێنشینی سامانی تەرخانکراوی شێخ عەبدولقادری گەیلانی، ژمارەیەکی زۆری لە چاوئەندازە جوانەکانی ئاکرێ و سەیرانگایە تازەکانی، لە شێوەیەکی ڕەندین و ڕەنگاوڕەنگدا ئامادە کردووە، بەو مەبەسەی بنێرێتە بۆ شارەکانی عێراق، تا هەموو لایەک تێ بگەن خودا چ جوانییەکی

سورووشتی بەناکرێ داوە بێجگە لە باخە پڕ میوە و سەوزەکانی و کەشە خۆشەکەی و دانیشتووە پێشکەوتووەکانی. ئەویش بۆ ئەمەی بێنە هاوینەهەوارەکانی ئاکرێ و بەو بۆنەیەشەوە دانیشتووانی ئاکرێ گوزەرانیان باشتری لێ بێ، بەهۆی بەکرێدانی باخەکانیانەوە و بەرهەمە هەموو جۆرەکانیانەوە. ئێمە ئەم کردەوەیەی (کاک محەممەد یوسف) زۆر پەسند دەکەین و سوپاسی دەکەین بۆ نیشتمانپەروەریی. جا لە خاوەن کردەوە جوانەکانمان، هیوادارین، کە پشتی ئەم پیاوە بەرێزە بگرن و، هەریەکەیان چەند وێنەیەکی لەم وێنە جوان و ڕەنگاوڕەنگانە لێ بکڕێ و، بەبۆنەی جەژنە پیرۆزێوە بیانێرێت بۆ هاورێ و کەسوکاری خۆی کە لە شارەکانی دراوسێدان، تا ئاگادارین لە شەنگ و شۆخی ئاکرێ و جوانی هاوینەهەوارەکانی، بۆ ئەمەی تیژیان بکاتە سەر هاتن بۆ ئاکرێ و ڕابواردنی هاوینەکەیان لە باخە خۆشەکانی ئاکرێدا، کە بەوە گوزەرانی ئاکرێییەکان خۆشتری لێ دێ.

## پێکەنینی ئاکرێ

پیرێژنەکانیش بەهەشتێکیان دەوێ بۆ خۆیان!...

پیرێژنێک: خۆزگە شارەوانییەکەتان (بەهەشت)ێکی تایبەتی بۆ ئێمەیش دادەمەزراند وەک (بەهەشتی مندالآن)، ئەی سەرۆک! ئێمەتان بۆچ لەو یارییانە بەش براو کردووە؟

سەرۆکی شارەوانیی ئاکرێ: ئێوە کە مێردەکانی خۆتان کردووە بەیاری، بەدەست خۆتانەوە، لام وایە پێویستتان بەو یارییانە نییە!

## لەسندووقی پرسیار و پرس و پێشنیازەوە

پەرچڤەکردنی وتارەکان

* ئاکرێ: فەرمانبەری پۆستە، فەتحوڵلا عەناتی: تکایە ئەو وتارانەی بەزمانی (کوردی) دەخوێندرێنەوە لە یانەی فەرمانبەرانی ئاکرێدا پەرچڤەی بکەن بەزمانی عەرەبی بەتەواوی، تا هەموو لایەک کەلکی لێ وەربگرن.

* ڕۆژنامەی ئاکرێ: لە ڕاستیدا ئێمە پێویستیمان بەپێنووسێکی پەرچڤەکردن هەیە بۆ (زمانی کوردی)یش و (زمانی عەرەبی)یش، تا کەلکی بۆ ڕۆڵەکانی هەردوو زمانەکە بێ کە لە ناوچەکەی ئاکرێدا بەهۆی فەرمانبەری میرییەوە کۆبوونەتەوە، بەتایبەتی کە وتارێکی گرنگ دەدرێت لەوانەی پەیوەندییان بەدانیشتووانی ناوچەکەوە هەیە. ئێمەیش تکامان وایە ئەوانەی توانایی پەرچڤەکردنیان هەیە لە هەردوو زمانەکەدا، لە خاوەن پێنووس و بلیمەتەکان بێنە لامان، تا ئەم فەرمانە گرنگەیان پێ بسپێرین. جا هەر کاتێ ئەو جۆرە کەسانەمان دەستکەوت، خودا یاریێ ئاواتەکەی تۆ دەهێنینە جێ.

چارەسەرکردنی نرخی ئەوت و، مزی لە ئەندازە بەدەری پارە و، ئاوبڕین.

* ڕۆژنامەی ئاکرێ: لەبەر ئەوەی ئەم ڕۆژنامەیە خۆی دەپارێزێ لەوە ئابڕووی هیچ کەسێک ببات، تکامان وایە خۆتان بێنە لامان و، لە ڕووی ئەو کەسانەیشدا کە خۆتان ناوتان بردوون و، بەدناوتان

کردوون بەخراپەکردن لەگەڵ دانیشتووانی ناوچەکەدا، چ زانیارییەک و شارەزاییەکتان هەیە پێمانی بڵێن، تا ئێمەیش بتوانین لە شێوەیەکی مەردانە و دادپەروەریی و دەروون پاکیدا چارەسەری ئەم کێشانە بکەین. ئەگینا ئەگەر وانەکەیت، نامەکەت بەبەدگۆیی دەدەینە قەڵەم. پشتگوێی دەخەین!.

* ئاکرێ: سەبری سۆرانی، ١٠/٩/١٩٥٠:

١- پێویستە جێگایەکی تایبەتی دیاری بکرێ بۆ وەستانی چوارپێکان بەبارەکانی سەرپشتیانەوە. ئەوانەیش کە لەسەر ڕێبازەکان میوە دەفرۆشن بەربەست بکرێن. لەسەر ڕێبازەکانیش لە دەرەوەی دووکانەکان ماوە نەدرێ بەکەس گۆشت هەڵبواسن و بیفرۆشن.

٢- نابێ بهێڵرێت ئۆتۆمبیلەکان لەسەر شەقامەکان بوەستن، لە دەرەوەی ئەو جێگایانەدا، کە بۆ وەستانی ئۆتۆمبیل دانراون.

٣- دەبێ ئەو کەسەی وەرگرتنی باجی شارەوانی خراوەتە ئەستۆی، بەربەست بکرێ لە وەرگرتنی (١٠) فلس لە هەموو بارێکی دار یاخود قامیش یان شتانی تر، کە ئەوانە پێچەوانەی یاسان.

٤- دەبێ (گاور) و (جوولەکەکان)یش بەربەست بکرێن لەوەی کە بچنە ناو جێ پێشاوی مزگەوتەکانەوە کە هەر بۆ خۆ پاککردنەوە دەچنە ئەو شوێنانە، نەک بۆ خوداپەرستی.

* ڕۆژنامەی ئاکرێ: ئێمەیش وا بەڕێزەوە وەرامی خواستەکانت دەدەینەوە:

١- ئەوەی لە خواستی یەکەمتدا پێشنیازت کردووە هەموویان جێبەجێ دەکەین، بەڵام پاش ئەمەی ئەو زەوییەمان تەخت کرد و ڕاست کردەوە کە هی شارەوانییە و، تۆیش لە چەند ساڵێکەوە دەستت بۆ درێژ کردووە بێ ئەمەی مافێکت تێیدا هەبێ. بێجگە لەوە کە چایخانەکەیشت دەخەینەوە ناو سنووری خۆی، کە هەتا ئێستا لە سنووری خۆی دەربازت کردووە.

٢- هەر کاتێ ئێوە گەراجێکتان دروست کرد بۆ وەستانی ئۆتۆمبیل، ئێمەیش هەموو ئۆتۆمبیلێک بەربەست دەکەین لە وەستان لەناو شەقامەکاندا. چونکە تا ئێستا لە ئاکرێدا گەراج دانەنراوە دروستیش نەکراوە.

٣- هەروەک چەند جارێک لەمەوپێش پێمان گوتوویت، باج وەرگری شارەوانی زۆرداری لە کێ کردووە، با ئەو کەسە بێتە لامان تۆڵەی بستێنین.

٤- لە بابەت بەربەستکردنی گاور و جوولەکەکانەوە بۆ جێ پێشاوەکانی مزگەوتەکانی ئاکرێ، تۆ خۆت دەتوانیت لای فەرمانگەی خۆیان، سکاڵایان لە دەست بکەیت. چونکە ئەو بەربەستکردنە پەیوەندیی بەفەرمانی شارەوانیی ئاکرێوە نییە!.

## جەژنتان پیرۆز بێت

جەژنی کوشتنی (قوربان) بەر ڕۆژی شەمە دەکەوێت لە ٢٣/٩/١٩٥٠دا. (ڕۆژنامەی ئاکرێ)یش ئەمە بەهەل دەزانێ: پیرۆزبایی لە هەموو موسوڵمانانی ناوچە بەڕێزەکەی (ئاکرێ) دەکات. لە خودای پاکی بێ

هاوتایش دەپارێنەوە، هەموو ڕۆژێکیان لێ بکات بەجەژن. چی بێ لە ئێوە نهێنی بێ، ڕۆژنامەکەمان کە جەژنی مانگی ڕۆژووی ڕابوردووی دەستی کرد بەبلاوبوونەوە، لە ١٥/٧/ ١٩٥٠دا نووسرایەوە وا لەم جەژنە پیرۆزەیشدا واز لە بلاوکردنەوە دەهێنێ. ئەمەیش لەبەر ئەوەیە کە لە (ڕاگەیاندنی نامەکەی خۆی) بووەوە، کە بریتی بوو: لە «ناراستەکردنی دانیشتووە بەڕێزەکانی ناوچەی ئاکرێ بۆ چاکەی گشتی». ئەمەیش بەوەدا دەرکەوتووە کە ئەو کردەوە و کارەنیشتمانییە نەژادانەی دانیشتووانی ناوچەکە تواندوویانە و، ئەو ڕۆژە ڕاستەقینەیان ئەوان پێشکەشیان کردووە بۆ کەلکی گشتی، هەموویان لەسەر لاپەڕەکانی ئەم ڕۆژنامەیە تۆمار کراون. هەر لەمەیشەوە ئەوە دەرکەوتووە کە هۆش و گیان و دڵ و دەروونی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە، زیندوو بۆتەوە و، لە خەویش خەبەری بۆتەوە. ڕاپەڕیوە و دەستی کردووە بەلابردنی گەرد و تۆزی تەمەڵی و بێ کارەیی، کە سالآنی سالآن بوو، بەهۆی سەرگەردانی و کارەساتی ناهەمواری ڕۆژگارەوە، بەسەر دڵ و دەروون و هۆشیدا کەڵەکە بووبوو. لە ڕاستیدا، ڕۆژنامەکەمان، هەر لە ژمارەکانی سەرەتایەوە، کە هەستیت پێ کرد لەم ناوچەیەدا: بلیمەتییەکی تەواو و، تێکۆشانێکی بێ هاوتا و، لێهاتوویییەکی گەورە هەیە، بۆ پێشکەوتن و سەربەرزی، کە لەوەپێش، لەبەر زۆر و ستەمی ڕۆژگار نەیانتوانیبوو دەربکەون، سەرسام بوو، کە بەچەشنی گڕە ئاگرێکی بچووک، چرای بیر و هۆشیانی داگیرساند و بیر و هۆشیانی کردە ڕووناکییەکی وەها، کە خاوەن هۆش و گۆشەکانی گەشکەدار کرد و، چاوی دڵڕەش و چاو هەڵهێنەرەکانیشی کوێر کرد کە چاویان بەرایی نەدەدا ببینن ناوچەکە پێش بکەوێ و، ئەویش بەشی خۆی خۆشگوزەرانی و کامەرانی و سەربەرزی و سەرکەوتنی دەست بکەوێ. چونکە کاتێکمان زانی: ڕۆشنبیرەکانی ناوچەکە دەستیان کرد بە(بەرەنگاری کردنی نەخوێندەواری) و (بلاوکردنەوەی ڕۆشنبیری) بەناوی دانیشتووانی ناوچەکەدا، لە ڕێگا: وانا گوتنەوە و وتار خوێندنەوە و دەرخستنی ڕاستی لە بابەت ناوچەکەوە بۆ هەموان. دەوڵەمەندەکانی ناوچەکەیش دەستیان کرد بەدروستکردنی گەلێک ساختمانی ناوازە و نایاب وەک: گەرماوی باو و، یانەی نوێ و، خانوو حەساندنەوەی فەرمانبەران و، دامەزراندنی سەیرانگاه.

سەرەک هۆزەکانیش لە پێناوی ئاسایشی گشتیدا دەستیان کرد بەهێنانی تاوانبارە دەربازبووەکان بۆ دەرگای دادگاهی میری، هەرچی هەژارەکانیش بوون، بەکار و فەرمانکردن، دەستگیرۆییان کردن، کە بەرامبەر بەوە هیچ پارەیەکیان لێ داوا نەکردن. هەندێک لە دەوڵەمەندەکانیش یارمەتییەکەیان ئەوە بوو پیتاکیان بۆ کردن، چ بەکەرەستە و چ بەپارە.

جا چونکە ئێمەیش بەچاوی خۆمان دەبینین بیروباوەڕی چاکەکردن لەناو کاروباری (ئاوەدانی) و (ڕۆشنبیری) و (پێشکەوتنخوازی)دا بەرجەستە بووە و بەئاشکرا دیارە، ئیتر بەپێویستی نازانین لەمە بەولاوە ئەم ڕۆژنامەیە دەربکەین. لە جیاتی ئەوە یانەکەمان خەریکی (لاسایی کردنەوە) و (وتاردان) و (نووسراو پێشکەشکردن) و(گەشەپێکردنی هونەرە جوانەکان) و (وەرزش) و (گەشەپێکردنی دەستکرد) و (نووسراو دانان) دەبێ بۆ کەلکی هەموان. ئیتر بۆ خودا گەورە سوپاسێکی زۆرمان پێشکەش دەکەین، کە بەزەیی پیاماندا هاتەوە و یارمەتیی داین لە خەباتماندا، لە میهرەبانی و خۆشەویستی ئەویش

دەپارێـــنەوە کە یارمەتی (ناوچەی ئاکرێ) بدات هەر لەسـەر کار و کردەوە چاکە نەژادەکانی خۆی بڕوات بەڕێوە.

لە جیاتی دەسـتەی نووسـەران
(ئاکرێ): ١٩٥٠/٩/١٥
شاکر فەتاح
سەرۆکی شارەوانیی ئاکرێ

***

# ئامێدی

لە ١٦/٥/١٩٥٢دا گەیشتمە (ئامێدی). ئامێدی خۆی هەر (٤٥٠) ماڵێک دەبوو. کەچی وەک دەڵێن لە کاتی (میرنشینی بادینان)[1]دا بریتی بووە لە (٤٥٠٠) ماڵ!... ئەوساکە ئاوەدان و دەوڵەمەندبووە. پڕ بووە لە پیشەسازی و بازرگانی و خوێندەواری. لە پاش ئەوە گەلێک سەرگەردانی بەسەردا هاتووە، تا گەیشتۆتە ئەوپەڕی هەژاری و وێرانییەوە. ناوچەکەیش کە بریتی بوو لە سێ لادێ: (ئامێدی) و (بەرواری باڵا) و (بێبۆ)، چەند دێیەکی ئەبێ تۆزێ ئاوەدان بوون و، گوزەرانیان باش بوو، دێهاتەکانی تری لەوپەڕی هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواریدا دەژیان. نزیکەی (٤٥,٠٠٠) کەسێک لە ناوچەکەدا دانیشتبوون. لەمە نزیکەی (١٥,٠٠٠) کەسێک فەلەی ئاسووری و کلدانی، ئەوانی تریش کوردی موسوڵمان بوون. خۆشبەختانە فەرمانڕەوایی بنکەیەکی هاوینەهەواری ناوازەی لە (سەرەنگ)دا و بنکەیەکی تریشی لە (سوارەتووکە)دا دامەزراندبوو. لە هاویناندا ئەو دوو جێگایە لەگەڵ (سۆلاف)دا گەشی و خۆشی و گوزەران و هاتوچۆیان تێدەکەوت. هەروەها بەهۆی تێکۆشانی موتەسەڕیفی (موسڵ)ەوە کە ئەو دەمە (سەعید قەزاز) بوو، ئامێدی گەلێک پارەی بۆ تەرخان کرابوو، بۆ دروستکردنی سێ خوێندنگا و، پێنج خانوو و، کردنەوەی ڕێگایەک و، تەختکردنەوەی چەند ڕێگایەکی کاروانی و، قیرتاوکردنەوەی ڕێگایەک. ئەم فەرمانانە دڵمی پڕ کردبوو لە کامەرانی. چونکە ژمارەیەکی باش لە هەژارانی پێ دەکەوتە کار و، ناوچەکەیشی پێ پێش دەکەوت. لە پاش گەڕان و پشکنین، نووسراوێکم نارد بۆ موتەسەڕیفی (موسڵ): ئازار و هاواری ناوچەکە و پێویستم پیشان دا. هەرچەندە موتەسەڕیف و (پشکنێری بەڕێوەبەرایەتی)[2] بەگورجی و بەدڵ پێشنیازەکانیمان پەسند کرد و پشت گرت. بەڵام داخەکەم تا ئەو پێنج مانگ و نیوەی لەوێ بووم، بەهیچ ئەنجامێک نەگەیشت. ناوچەی ئامێدی

(١) میرنشینی بادینان لەو میرنشینە کوردییە دێرینانە بوو کە لە نێوان میرنشینەکانی بۆتان، هەکاری و سۆراندا فەرمانڕەوایی دەکرد، زۆرتر گیروگرفتی لەگەڵ موسڵدا لەسەر ئەوەبوو کە دەبێ و ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەو پەیوەندداربێ، بەڵام زیاتر لەگەڵ بەغدا پەیوەندی هەبوو. (پێ ڕەش) دەڵێ: لە چەرخی ١٣ز. ئەم میرنشینە پەیدا بووە، نزیکەی شەش سەدە و نیو تەمەنی بووە، یانی لە دەوڵەتی عەبباسی زیاتر ژیاوە، بەڵام لۆنگریک دەڵێ: حەوت سەدە ژیاوە. ئەم، بەحوکمی شوێنەکەی تا ڕادەیە دوور بوو لەو دەردەسەرییانەی کە میرنشینێکی وەک سۆران یان بابان یان ئەردەڵان کە پێوەیان دەناڵاند: ئەوەش هاوسنووریان بوو لەگەڵ ئێران کە ئەیارێکی گەورەی عوسمانییەکان بوو. ئامێدی پایەتەختی میرنشینەکە بوو. میرەکانیان بەگشتی دادپەروەر و ڕوو لە خوا و حەز بەتەبا بوون، ئێزدییەکان و مزوورییەکان کە لەگەڵ یەک ناکۆک بوون، ببوونە سەرچاوەیەکی ئاڵۆزی بەردەوام بۆیان، بەڵام ئێزدیان لە سایەیاندا ئاسوودە بوون. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا میر محەممەدی ڕەواندز ١٧٩٠ – ١٨٣٧ لە ئەنجامی گەلێ هۆکاری جیاجیادا و لە ١٨٣١دا پەلاماری ئەو میرنشینەی دا و جەمسەرەکانی ترازاند. هەرچەندە؛ دوای خۆبەدەستەوەدانی میری سۆران بەلەشکری عوسمانی، کەمێ ئەو میرنشینە کەوتەوە بووژانەوە، بەڵام بۆ هەتا هەتایە خۆی نەگرتەوە و... نەما.

(٢) مەبەست (مفتش الاداری)یە کە ئەو کات کەسێکی شارەزا و لێهاتوو بووە لە وەزارەت.

بەهەشتێکی کوردستانە. لە مامۆستایەکی سویسرەیم بیست دەیگوت: «ناوچەی ئامێدی لە خاکی سویسرە خۆشترە». داخەکەم ئەم بەهەشتە لە چاو خۆیدا زۆر پاشکەوتووە و وێران بووە. هێشتا ڕێگای ئۆتۆمبێل بۆ بنکەی لادێیەکانی نەکرابووەوە. بێ ڕێگایی زۆربەی دێهاتەکانی شپرزە کردبوو. لە نەخۆشی و نەخوێندەواری و هەژاریدا، سەرگەردان بووبوون. تەنیا شەش حەوت خوێندنگایەک هەبوو لە هەموو ناوچەکەدا. لە شاری ئامێدی خۆیدا پرۆژەیەکی کزی ئاو هەبوو. بەڵام پرۆژەی کارەبا نەبوو. کەچی لە سەرسەنگدا پرۆژەی ئاو و کارەبا هەبوون. ئامێدییەکان بووبوون بەدوو بەرەکی: وەک خۆیان دەیانگێڕایەوە، بەربەرەکانێی (شێخی بارزان) و (شێخی بامەڕنی) شاری ئامێدی و ناوچەی ئامێدی کردبوو بەدووکەرتەوە، کە هەموو دەم کارەساتی شەڕوشۆڕ و کردەوەی ناپەسەند لەناویاندا ڕووی داوە. نیشتمانپەروەرەکانیان پڕ بەدڵ، لەم بارە وەڕس بووبوون و قینیان لێی دەبووەوە. خۆشبەختانە خودا یاریدەی دام، توانیم بنەماڵەی (حاجی شەعبان) و بنەماڵەی (حاجی عەبدولعەزیز) یەک بخەمەوە، بۆ ئەوەی ئامێدی لەو سەرگەردانییە ڕزگاری بێ[1] هەستم پێ کرد، زۆربەی دانیشتووانی ئامێدی، ئەمەیان پێ خۆش بوو. بەڵام پوول پەرستەکانی ئامێدی و بامەڕنی ئەمەیان زۆر لا ناخۆش بوو. ئیتر ئەوەندەی پێ نەچوو گوێزرامەوە بۆ (شەقلاوە). بەدەم نەخۆشی و کزی و لاوازی و دڵتەنگییەکی چەند مانگییەوە، کە لە داخی گیروگرفتی هەمەڕەنگەی ناوچەی ئامێدی تووشم بووبوون، لە ڕۆژێکی سارد و سڕ و تۆف و باراندا لە ئامێدی جیابوومەوە بۆ (شەقلاوە)!

(١) پێ ڕەش لە (بارزان وحركة الوعي القومي)دا لە دەمی سدیق ئەلدەمەلوجییەوە کە ئەو کاتە لە ١٩٠٤ وەکیلی قایمقامی ئامێدی بووە، دەڵێ: «الأخبار تدور حول مجيء الشيخ عبدالسلام البارزاني بقوة عظيمة الى العمادية ليحتلها ويقيم فيها حكومة كردية ويقتل موظفي الحكومة ويقضي على البيت الفلاني والفلاني، يخرب تكية بامرني ويستولي على دهوك وزاخو ويفعل كذا وكذا....
والناس صنفان، صنف يتمنى مجيئه بفارغ الصبر وهم بيت حاجي عبدالعزيز آغا صهر الشيخ عبدالسلام.
أ. ب. وآخرون يرتعدون خوفاً وهم بيت المفتي والمدرس وحاجي شعبان آغا، هؤلاء مع مشايخ بامرني...
أخيراً حضر الشيخ في ١٩٠٥/١٢/٢٢ مع قوة تبلغ خمسمائة مسلح من الزيباريين والمزوريين والشيروانيين يقودهم -فقي عبدالرحمن- ونزل ضيفاً على صهره الحاج عبدالعزيز آغا العمادي وسارع أغوات العمادية الموالون للشيخ وغيرالموالين الى أخذ أعوانه ضيوفاً الى بيوتهم ولم يظهر مايعكر صفو الأمن. وكان الشيخ بها مالدين قد حضر العمادية بناء على دعوة سبقت له من الشيخ عبدالسلام وقد إجتمع به نحوا من ساعتين على انفراد حيث تلقاه الشيخ بحفاوة واحترام وقبل يده وقد قابله -بها مالدين- بالمثل).
(پێڕەش: بارزان وحركة الوعي القومي، ١٩٨٠، مطبعة (؟)، ص ٩٤ - ٩٥)
ناکۆکی نێوان ئەو عەشایرانە لە هەر جێیەبێ شتێکی ئاساییە و ئەگەر دەستی پیی ناحەزان و داگیرکەرانی کورد تووڕەکە خست نەکاتەوە، زۆر بەئاسانی چارەسەر دەکرێ، وەک ئەوەی کە دەمەلۆجی دەیگێڕێتەوە.

## شەقلاوە

کە لە ٣/١١/١٩٥٢دا گەیشتمە (شەقلاوە)، شپرزەبووم بەدەست کزی و لاوازیی و دڵتەنگییەوە. بەڵام لە پاش یەک دوو مانگێک هێز و هەرەتم سەندەوە و، هەستم بەتەندروستی و دڵخۆشی کردەوە. شەقلاوە، تازە کرابوو بەبنکەی ناوچە و، جێگای جێنوشین (قائمقام). جێگایەکی ناوازە و جوان و، خۆشی هاوینەهەوار بوو. هەزارماڵێکی تێدا دەبوو. لەمانە سێ سەد ماڵیان دیان (مەسیحی) بوون. بەهەموو ناوچەکە بریتی بوو لە سێ لادێ، پێنج خوێندنگا، سێ نەخۆشخانە (مستوصف)، چوار بنکەی پالیاز هەبوو. لێرەیشدا: زۆرداری و، هەژاری و، نەخوێندەواری و، نەخۆشی فەرمانڕەوا بوون. لەگەڵ ئەمەشدا خۆشبەختانە ڕێگایەکی قیرتاوکراو بنکەی هەر سێ لادێکەی بەیەکەوە بەستبوو. لەناو شەقلاوە خۆیشیدا یەک دوو شەقامی قیرتاوکراو هەبوو. پرۆژەی ئاو و ئەلەکتریک لە شەقلاوەدا نەبوون. بەڵام لە لادێی (سەلاحەدین)دا هەبوون. ئەم (سەلاحەدین)ە بنکەی لادێیەکە بوو[1]. فەرمانڕەوایی بنکەیەکی هاوینەهەواری جوان و نایابی لێرە و لە شەقلاوەدا دامەزراند بوو. هاوینان ئێرە[2] و شەقلاوە پڕ دەبوون لە سەیرانکەران، کە لە هەموو لایەکی عێراقەوە ڕوویان تێدەکردن. لە پاش پشکنین و لێکۆڵینەوەیەکی زۆر بەچەند نامەیەک دەرد و ئازار و پێویستی ناوچەی شەقلاوەم بۆ فەرمانڕەوایی پیشان دا. ئینجا دەستم کرد بەفەرمان بینین: پرۆژەی ئەلەکتریکی شەقلاوە ساختمانی بۆ کرا. پاشان ماکینەکانی تێدا دامەزرێنرا شەش حەوت کیلۆ مەترەک قیرتاوی شەقامەکانی شەقلاوە کرا. یانەیەک بۆ فەرمانبەران کرایەوە، کە وەک یانەکەی (ئاکرێ): گۆرانی و، ساز و ئاواز و، لاسایی کردنەوە و، هەڵپەڕکێ و، وتار خوێندنەوە و، نووسراو خوێندنەوە و، یاریی واڵیتینی تازەباو و، پینک پۆنگ و، تاوڵە و، دۆمینە و، شەترەنج و، دونبەڵەی تێدا دەکرا. بنکەی لادێی شەقلاوەم گوێزایەوە گوندی (هیران). لادێیەکە ناونرا (خۆشناو). ئەمەیشم بۆ ئەو مەبەستە دامەزراند، کە بەرەنگاری زۆرداری هەندێ لە دەرەبەگەکان و ڕێژگاوی هەندێ لە شێخەکانی پێ بکەم، کە دەمێکی دوور و درێژ بوو دانیشتووانی ناوچەکەیان چەوساندبووەوە و، ڕووتاندبووەوە و، فێری دیلی و بەندەییان کردبوون، بۆ دوژمنانی کوردەواری!. هەروەها خوێندنگایەکی ناوەندی (متوسطە) و، سێ خوێندنگای سەرەتایی بۆ گوندەکان و، خوێندنگایەکی شەوی بۆ شەقلاوە کرانەوە. ڕێگای (هەریر) و (باتاس) و، ڕێگای (شەقلاوە) و (هیران)، هەروەها لەناو (شەقلاوە) خۆیدا چەند ڕێگایەک کرانەوە و، دەست کرا بەبەردڕێژکردن و قیرتاوکردنیان. چەند ساختمانێک لە (هەریر) و (سەلاحەدین) و (شەقلاوە)دا تەواوکران بۆ خوێندنگا و خەستەخانە و حەوانەوە. لە (هیران)یشدا خەستەخانە و خوێندنگا و سەرا کرانەوە. وەک سەرنجم دا شەقلاوە و ناوچەکەی ڕزیوی دەستی زۆرداری دەرەبەگ بوو. کارەساتی سامناک و خوێناوی و نەنگ و ناشیرین لە دانیشتووانی ناوچەکە زۆر ڕووی دابوو. میرەکانی شەقلاوەیش هەندێکیان هەر سەر

(١) مەبەستی (مرکز الناحیة)یە.

(٢) یعمانا: (سەلاحەدین)ە.



بەدەسەڵاتدارانی فەرمانڕەوایی بوونبوون، هەر لە سەردەمی (عوسمانی)یەکانەوە تا ئەو دەمەی من تێیدا بووم. هەرچەندە ڕەوشت و خووی هۆزایەتییان بەرامبەر بێگانە و میوان پەسەند بوو، بەڵام زۆرداریییان بەرامبەر بەناوچەکە ئاشکرا و دیاربوو. خوێندەوارەکان و نەخوێندەوارەکان، هەردوولایان لە ژێرەوە بەرەنگاریییان دەکردن. خۆشبەختانە، بەزۆر و بەخواهیش توانیم، تا ئەندازەیەکی باش ڕێگای سەربەستی و ئازادی و کامەرانی بۆ دانیشتووانی ناوچەکە بکەمەوە و، ئەو ترس و شل و شێواوییەی هەیانبوو، لێیان دوور بخەمەوە! هەستم کرد، میرەکان، هەندێکیان ئەمەیان پێ خۆش نەبوو. لە ژێرەوە، کنەیان دەکرد. بۆ هەلێک دەگەڕان من لە ناوچەکە دوور بخەنەوە. لە پاش نزیکەی دوو ساڵێک، هەوڵ و تەقەلا، بەهۆی موتەسەڕیفێکی بەد و چاو برسییەوە، توانییان وا لە فەرمانڕەوایی و کاربەدەستانی باڵابکەیێن، کە مانەوەی من لەوێدا باش نییە. هەڵیان دام بۆ (شێخان)!... منیش مانم گرت، نەچووم! خۆشبەختانە لەو کاتەدا کاربەدەستی کاروباری ناوخۆ، (سەعید قەزاز) گەڕابووەوە عێراق[1]. هەموو کەینەوبەینەیەکم تێگەیاند! لە پاش ئەوەی لە بنجوبناوانی ئەم زۆرداریییە تێگەیشت، منی نارد بۆ جێگایەکی زۆر ناوازە و باش، کە ئەویش (ئاکرێ) بوو! بەشێنەیی جەزرەبەیشی بەتاوانبارەکان گەیاند!.

من هەموو دەم، بڕوام بەخودا و بەدادپەروەری خودا و بەڕاستی و دووروستی هەبووە. هەر لە دوورەوە لەبەر چاوم بوو کە ڕۆژێک دێت، ئەو دوژمنانی چاکە و مرۆڤایەتی و نەتەوانە، تووشی دەرد و مەرگ و

(١) لەو ساڵەدا ١٩٥٤ سەعید قەزاز دوای ئەوەی لە ١٩٥٠ - ١٩٥٣ موتەسەڕیفی موسڵ بوو کرا بەوەزیری (کاروباری کۆمەڵایەتی)، بەڵام پاش چەند هەفتەیەک وەزارەت دەستی لە کار کێشایەوە کرا بە(مدیر موانيء العام)، زۆر لەمەشدا نەمایەوە چونکە ئینگلیزەکان دەیانویست لووت بژەندنە کاروباری ئەو دامەزراوە گرنگەوە، جا خۆی دەستی لە کار کێشایەوە، لەو ماوەیەدا قەزاز سەردانێکی ئەمریکای کرد، لەو سەردانەیدا گەورەترین و شکۆدارترین پێشوازی لێ کرا. لەلایەن ئەو جالیە مەسیحییە تلکێفییانەی لە ولایەتی - دیترۆیت-دا بوون، ئەوەش لەبەر ئەو خزمەتە گەورەیەی کە قەزاز بەشارەکەیانی گەیاندبوو، لە دیجلەوە ئاوی گەیاندە شارەکە: ئەو پرۆژەیەی ساڵەهابوو دوادەخرا و خەڵکەکەی داماوی بێ ئاوی بوون. جالییەکە (بەزۆر) دیارییەکیان دا بەسەر قەزازدا، ئۆتۆمبێلێکی (شفرۆلێت).
بۆ زیاتر بڕوانە: (جرجيس فتح الله، رجال ووقائع في الميزان، حوار أجراه صحيفة خبات، دار آراس للنشر هەولێر، ٢٠٠١، ص ١٦٢-١٦٦).

سەرگەردانی خۆیان دەبن! پاش ئەو دەربەڕاندنەی من، چوار ساڵی نەخایاند، شۆڕشی ١٤ی میوەخۆش (تەمووز)ی ساڵی ١٩٥٨ ڕووی دا. دانیشتووانی ناوچەکە لە دەرەبەگ و شێخە خراپەکان ورووژان. فەرمانڕەواییش تێی سرەواندن. سەر و سامان و ئابڕووی گەلێکیان چوو! کابرای پارێزگاریش بەڕوو ڕەشییەوە، دەرکرا و، سەری خۆی هەڵگرت، چوو بۆ ئێران، تا ئێستاش (ساڵی ١٩٦٢) سەری بەعێراقدا نەکردۆتەوە! [1][*] پێش ئەوەی شەقڵاوە بەجێ بهێڵم لە ١٤/١٠/١٩٥٤دا، چ لەلایەن (گەل)ەوە، چ لەلایەن فەرمانبەرانەوە گەلێک ئاهەنگ و زەماوەندم بۆ گێڕا. دیارییەکی یادگاریشم لەلایەن یانەی فەرمانبەرانەوە درایە، کە بریتی بوو لە گوڵدانێکی زیو، ناوی ئەندامەکانی لێ هەڵکەندرابوو، لەگەڵ پێشکەشکردنەکەیدا بەمن. هەروەها بەڕێزەوە ڕەوانەیان کردم تا هاوینەهەواری (سەلاحەدین). داخەکەم زۆر پرۆژە هەبوون هێشتا ڕێگا نەدرابوو دەست پێ بکرێن، یاخود نەپەرژام تەواویان بکەم؛ وەک پرۆژەی ئاو و، دروستکردنی گەرماوی باو و، قیرتاوکردنی ڕێگا و شەقام و، دامەزراندنی (نامەخانەی گشتی) و (ئاوازەگاهی ئەمین زەکی) و(باخی گشتی) و (ئەستێرک و سوورکی مەلەکردنی گشتی) و (باخچەی منداڵان). ئێستایش تا دەمێنم خۆشەویستی دانیشتووانی ناوچەی شەقڵاوە لە دڵمدا دەپارێزم. تا سەریش بەشانازییەوە، یادی برایەتییان دەکەم. هیچ ساڵێکیش نییە جار و دووجار لە هاویناندا سەریان لێ نەدەم...

## ئاکرێ

لە ١٥/١٠/١٩٥٤دا گەیشتمەوە (ئاکرێ). گەلێک دۆست و ئاشنا هاتبوون بەپیرمەوە. منیش کڕنووشی سوپاس و نەوازشم بۆ خودای پاکی بێ هاوتا کێشا و، بەسەربەرزی و کامەرانییەوە چاوم بە(ئاکرێ) و بەدانیشتووانی ناوچەی (ئاکرێ) گەشایەوە. نە من نە دانیشتووانی ئاکرێ، کەسمان بڕوامان نەدەکرد، کە من جارێکی تر بگەڕێمەوە ناویان. لە پڕ ئەم ئاواتی چەند ساڵەیەمان هاتە دی. ئەمە شتێکی زۆر خۆش و سەیر بوو، بەلامانەوە. سەرمان لێی سوڕمابوو! چونکە بەهیوا نەبووین، فەرمانڕەوایی ئەوەی لە دەست بوەشێتەوە!.

ئەم جارەیش بەناوچەکەدا گەڕامەوە و ئازار و ئاواتیانم لە فەرمانڕەوایی گەیاند و، داوای زۆر شتم لێ کرد کە بۆیان بکات. هەروەها ئەو گیروگرفتانەیش کە بەخۆم چارەدەکران زوو بەزوو دەستم کرد بەچارەکردنیان. «یانەی فەرمانبەران» و «سەیرانگای سپیە» و «سەیرانگای سەراه» و «بەهەشتی منداڵان»، کە لە پاش ڕۆیشتنی منەوە بەرەڵڵا کرابوون و تێکچووبوون و، وێران کرابوون، هەر چواریانم، دووبارە ئاوا کردەوە و، پۆشتە کردەوە و، ڕازاندەوە. هەندێ ساختمانی تازە و گرنگیشم لە «یانەی

(*) ئەم بەشەی نووسراوەکە لە سەری ساڵی ١٩٦٢دا نووسراوە.

(پەراوێزەی سەرەوە ماموستا داناوە).

(١) بەپێی ئەو (إعلان)انەی کە لە گۆڤاری هەتاوردان: ژمارە (٣) ساڵی (١)ی حوزەیرانی ١٩٥٤ وە ژمارەکانی بەرەوژوور هەتا ١٩٥٦، موتەسەڕیفی هەولێر لەو ساڵانەدا (ئیسماعیل حەقی ڕەسوڵ) بووە.

فەرمانبەران» و «سەیرانگای سیپە»دا دروست کرد و خستمە سەریان بەڵام «سەیرانگای کانی زەر» و «سەیرانگای سەری گری»م بەوێرانی هێشتەوە بۆ ئەوەی لە هەلێکدا لەسەر بنچینەیەکی پتەوتر و گرنگتر و جوانتر دایانمەزرێنمەوە. خۆشبەختانە هەندێ پارە دەستکەوت. لە «سیپە»دا دوو گازینۆ و ئەستێرکێکی نوێ و دوو ژوور و گەراجێکی هاوینە و، چەند ژوورێکی خۆشتن و خۆپاککردنەوەم دروست کرد. هەروەها حەوت دووکان و گەراجێکی تریشم لە نزیک سەراوە دروست کرد. قیرتاوی چەند کۆڵان و شەقامێک کرا. لە یانەی فەرمانبەرانیشدا: ئەستێرکێکی مەلەکردن و، ژوورێکی خۆ پاککردنەوە و، شانۆیەکی لاسایی کردنەوە، بەهەموو ترۆتفاقێکیەوە دروست کرا. نووسراودانێکی بۆ کرا، لەگەڵ هەندێ نووسراوی ناپاب و، یاری تازەبابەتدا. تەلەفزۆنی بۆ دامەزرێنرا. بنمیچەکانی چینکۆیان پێدا گیرا و، هەموو دیوارەکانی سەرلەنوێ تەڕاوی ڕەنگاوڕەنگ کرانەوە. هەروەها ڕابواردنی یانەکە، لەسەر شێوەیەکی گرنگتر و خۆشتر لە جاران دەست پێ کرایەوە. زۆری پێ نەچوو: وتار، گۆرانی، ساز و ئاواز، لاسایی کردنەوە، وێنەکێشان، مەلەکردن، نووسراو خوێندنەوە، یاریکردن (نەک قومار) لە یانەکەدا ژیایەوە و لە جاران زۆرتریش گەشەیان کرد! پاش هاتنم بۆ (ئاکرێ) بەنزیکەی مانگێک لەلایەن (خوێندنگای دووەمەوە)، ئاهەنگێکی زۆر بەڕێز و گەورە کرا، بەبۆنەی هاتنەوەی منەوە بۆ (ئاکرێ). پڕ بوو لە گۆرانی و، ساز و ئاواز و، لاسایی کردنەوە و، یاری و، وتاری بەنرخ لەلایەن (کارگێری زانیاری - مدیر المعارف) و (کارگێری خوێندنگای دووەم) و هەندێ شاگرد و چەند کەسێک لە دانیشتووانەوە. بەڕاستی کە نەژادی و ڕێز و خۆشەویستی (دانیشتووانی ئاکرێ)م دەهاتە پێش چاو. دڵم گەلێک پێیان گەشایەوە. بەتایبەتی ئەو خوێندنگایە دەستنێژی خۆم بوو، لە ساڵی ١٩٥١دا دام مەزراندبوو، لەگەڵ چوار خوێندنگای تر لە گوندە گەورەکانی ناوچەکەدا. لە خۆشیدا، زۆری نەمابوو، گەشکەدار ببم! فرمێسکی کامەرانی ڕژایە ناو چاومەوە! بەسوپاسێکی گەرم و گوڕ و ملکەچانەوە پێشتری بخەم لە جاران. خۆشی ئەو شەوەم هەرگیز لە بیر ناچێتەوە! هەرچەندە لە (ئاکرێ)دا، ئاهەنگی نەژادانەم لەوەپێش زۆر بۆ کرابوو، بەڵام ئەو شەوە چێژێکی تری دەدا! ئەو بەهەشتی ژیانەی کە دوو ساڵ بوو، بەئاواتییەوە بووم لە (ئاکرێ)دا دەستم بکەوێتەوە، لەو شەوەدا دەستم کەوتەوە! لە دڵدا هەزار جار سوپاسی خودای پاکی بێ هاوتام کرد، کە ئەو سەربەرزی و، خۆشەویستی و، کامەرانییەی، لەو شەوەدا پێ بەخشیم!



داخەکەم لە ئاکرێدا چ خۆم، چ خێزانم بەڕێزە، چەند جارێک نەخۆش کەوتین، چەند جارێک کەوتینە گێژاوی خەم و خەفەتەوە. بەڵام بەزۆری، ژیانێکی پاک و پوختە و پڕ لە کامەرانیمان ڕادەبوارد.

باوکم مرد، ژنەکە، بەنەخۆشییەوە تا یەک دوو مانگێک چووەوە بۆ سلێمانی. شێرکۆی کوڕم لێمان جیابووەوە بۆ خوێندن لە سلێمانیدا لە بەدگۆیانیشەوە گەلێک کۆسپ و بەرهەڵست کەوتنە بەردەم مانەوەم لە ئاکرێ!. بەڵام ئەم ڕەشەبا و گێژەڵووکەی ڕۆژگارانە نەیانتوانی من لە کامەرانی بخەن. پیاوەتی و خۆشەویستی دانیشتووانی ئاکرێ هەموو ئەرک و ئازار و ناخۆشییەکیان لە بیر دەبردمەوە!.

بۆ دروستکردنی چەند ساختمانێک بۆ خوێندنگا و نەخۆشخانە و نیشتەجێیی لە دێیەکاندا بەڵێنم

وەرگرت. زۆری پێ نەچوو دەست بەزۆریان کرا. بنکەی (لادێی بیرەکەپرە)م گواستەوە بۆ (دینارتە). بنکەیەکی باڵبازیم لە گوندی (باکرمان)ەوە گواستەوە بۆ گوندی (شۆش). چەند فەرمانبەرێکی خراپ و، چەند سەرەک هۆزێکی جانەوەرم جەزرەبە پێگەیاند و تەفروتوونام کردن. دەستەیەکی ڕاو و ڕووتکەر و سەرکێشیش هەبوون لە شەش مانگ لە پێش هاتنی منەوە بۆ ئاکرێ، ئاژاوەیان خستبووە ناو ناوچەکەوە، کەسوکاریانم بانگ کرد، دڵنیام کردن بەدادپەروەری، وازیان لە چەتەیی هێنا و خۆیان دا بەدەستەوە. لە پاش ئەوەی گیروگرفتەکانیانم لەگەڵ ئاغاکانی زێباری خزمیاندا چارەکرد، دامن بەدادگا بۆ براندنەوەی تاوان و کێشەکانیان. بەم کردەوانە هەستێکی نوێی (دادپەروەری) و (ڕاستی) و (دروستی) و (ئاسایش) و (ئارام) سەرلەنوێ، لە ناوچەکەدا بووژایەوە. یانەکەمان سەرکردەیی چاکی و پاکی بڵندی دەکرد بۆ (گەل). لە ڕێگای لاسایی کردنەوەی چیرۆک و، وتارخوێندنەوە و، ئامۆژگاریکردن و، چاکەکردنەوە لەگەڵ هەژاران و خوێندەواراندا، (گەل)ی ئاراستە دەکرد بۆ چاکەی گشتی.

یەک دووجار ویستیان بمگوێزنەوە. بەڵام فریاکەوتم نەمهێشت. هێڵایانەوە. نزیکەی ساڵێک و پێنج مانگی تر لە (ئاکرێ)دا مامەوە! پێم زانی کە ئیتر لەوە بەولاوە، ناتوانن لە (ئاکرێ)دا بمهێڵنەوە!. هەروا بەسەر پاڵ شاخەکەی لای ماڵی خۆمانەوەدا گەڕامە خوارێ تا گەیشتمە (سەیرانگای سیپە). چاوێکم بەپرۆژەی سیپەدا گێڕا کە لە تەواوبووندا بوو... وەستاکە لەسەر ئامۆژگاری من پەرژینەکانی و دەرگاکەی بەڕەنگی (شین) و (سپی) و (زەرد) و (سوور) ڕازاندبووەوە... هێواش هێواش بەکزییەکەوە بەناو ساختمانەکاندا گەڕام لای تافگەکەی سیپەوە، کە لە قەڵبەزێکی سی پێ بڵندییەوە بەتەوژم هووڕژمی دەهێنایە خوارەوە: تۆزێک ڕاوەستام. سەیرێکی ئەو چاونەندازە جوان و ڕەنگینەی سیپەم کرد، بەو هەموو باخ و شاخەکانەوە کە گرتبوویانە باوەشیان سەیرێکی سنگی شینی بێ گەردی ئاسمانیشم کرد بەپەلە هەورە ڕەنگاکانیەوە. کەشەکەی کەشی ناو جەرگەی زستان بوو. شوێنەکەی سارد و سڕ و تەڕ و تووشی بوو. لە پڕ تەزوویەک بەلەشمدا هات! کسپەیەک لە جەرگمەوە هات! بەزەییم بەخۆم و ئاکرێ و گەلەکەمدا دەهاتەوە!. فرمێسک پەڕییە ناو چاوەکانمەوە! دیاربوو دڵ و دەروونم وورووژابوون! ڕووم کردە دەرگاکەی سیپە، ماڵئاوایی لێ بکەم! کەس لەوێ نەبوو، خۆم نەبێ... لە پڕ دامە پرمەی گریان و، هەست و بیروباوەڕی خۆم لەسەر زمانی ڕەنگەکانی دەرگاکەی سیپە، بەم جۆرە دەربڕی:

«ڕەنگی شین»: ڕۆژگاری خراپ هەموو لایەکی لێ گرتووین و تەنگی پێ هەڵچنیوین.

«ڕەنگی سپی»: بەڵام دڵێکی پاکی واشمان هەیە کە هەروەک بەفرە سپییەکەی شاخە بڵندەکانمان بێگەردە. چونکە پڕە لە باوەڕکردن بەخودای پاکی بێ هاوتا.

«ڕەنگی زەرد»: بەدڵنیاییەکیشەوە لەو هیوایەداین کە بەم زووانە ڕۆژی ئازادیمان گزنگ دەدات.

«ڕەنگی سوور»: دەماری مەردایەتیشمان ئەمەندە توانایە، کە بەڕەنگاری هەموو گیروگرفتێک ببێ و چارەشی بۆ بدۆزێتەوە و، ئاواتە گەورەکانی نیشتمانیشمان بهێنێتە دی.

ئەمە لە ١٩٥٦/٢/٢٤دا ڕووی دا...

سەرم كزكرد و هێواش هێواش بەناو شەقامی ناو باخەكانی ئاكرێدا ڕۆیشتم، پاشان بەلاپاڵی شاخەكەدا هەڵگەڕامەوە، تا گەیشتمەوە ماڵێ...[1] كە هاتمەوە ماڵێ هەندێ دیاریم لەلایەن یانەی فەرمانبەرانی ئاكرێ وە پێشكەش كرابوو كە بریتی بوون لە بیست نووسراوی نایاب و نووسراودانێكی دەستكردی ئاكرێ و، سێ وێنەی گەورەی ڕەنگاوڕەنگی دیمەنە جوانەكانی ئاكرێ و، یاریەكی ناوازەی تازەبابەت، لەگەڵ سوپاسنامەیەك و پێشكەشكردنێكی دیارییەكان بەمۆری كارگێڕانی (یانەی ئاكرێ)وە. منیش سوپاسێكی ملكەچانەی خودای پاكی بێ هاوتام كرد. فرمێسكی كامەرانیش لە چاوەكانمەوە گلۆر بوونەوە. لە خۆشیاندا دەستم كرد بەگریان!

ئەم جارەیش بەم ڕەنگە لە(ئاكرێ)یان جوێ كردمەوە. نەخۆشی و ماندوویێتی، تەواو كاریان تێ كردبووم... ئەمەیشت ئاهەنگم بۆ بكەن.. لەناو دۆست و ئاشنایەتی ناوچەكەدا تا سنووری ناوچەكە، بەڕێز و خۆشەویستییەوە بەڕێ كرام... لە ڕێگادا جارێكی تریش سوپاسی یەزدانی گەورەم كردەوە، كە بۆ دووەم جاریش لە (ئاكرێ) بەشادمانی و سەربەرزی و خۆشەویستی (گەل)ەوە جوێ بوومەوە.

## دهۆك

لە ١٩٥٦/٣/٨دا لە (ئاكرێ) جوێ بوومەوە و بۆ ڕۆژی دوایی چووم بۆ (دهۆك). دهۆك شارێكی خنجیلانەی جوانكیلانە بوو. باخاتێكی زۆری تێدابوو، كە چاكترین میوەی كوردستانی لێوە ڕەوانە دەكرا بۆ شارەكانی عێراق. نزیكەی (٨٠٠٠) هەشت هەزار كەسێكی تێدابوو. لەمانە نزیكەی هەزار كەسێكیان (كلدانی) و (ئاسووری) بوون. تاك و تەرا ماڵە عەرەب و ماڵە توركمانیشی تێدابوو. ئەوساكە سێ لادێی هەبوو. بەڵام وام بەباش زانی لادێی (مزووری)ی لێ جوێ بكەمەوە و بیدەم بەناوچەی (شێخان). فەرمانڕەوایی ئەم پێشنیازەی منی پەسەندكرد و جێبەجێ كرا. هەروەها بنكەی لادێی (دهۆك)م لە دهۆكەوە گوێزایەوە بۆ (سێمێل). بەم دوو فەرمانە ناوچەی (دهۆك) لەلایەكەوە، لادێی (مزووری) و لادێی (دهۆك)یش لەلایەكی ترەوە كەوتنە ئاسایش و ئاسوودەییەوە لەبەر ئەوە دانیشتووەكانیان زۆریان پێ خۆش بوو. بەڵام دەرەبەگەكانی مزووری، شێخ و ئاغاكان، ئەمەیان زۆر پێ ناخۆش بوو، زۆر تێكۆشان ئەم دوو فەرمانە تێك بدەن. بەڵام سەری نەگرت بۆیان!.

بۆ دهۆك هەندێ پارەم داواكرد، كە شارەكەی پێ ڕێك و پێك بخەم. نەیاندا! ئاژاوە و چاوەڕاو دەستدرێژی كە لە ناوچەكەدا بەئاشكرا دیاربوون و، زیانێكی زۆریشیان دابوو لە گیان و سامانی

(١) لێرەدا زۆر پێویستە سەرنجی ئەو گەڕانەی ئەو ڕۆژەی مامۆستا بدەین كە وەك قایمقامێكی دەڵەرەكە و بەرپرسێكی حكوومەت، ئاوا (بەتەنیا) سەرۆكاری پرۆژەكانی بكات كە لە شارەكەدا بەڕێوە دەچوون بەبێ یاوەرێ. پاسەوانێ یان حیمایەیەك (بەقسەی ئەمڕۆمان)... هەڵوێستەیەك لە بەرامبەر ئەمەدا ڕاستی هەموو ئەو باسانەی دەردەخات كە نووسیمنی، خۆشەویستی خەڵكەكە بۆی، دڵسۆزی و پەرۆشی و خزمەتگوزاری ئەمیش بۆیان، هەموو بوونەتە باشترین قەڵغان و سوپەر و حیمایەیەك بۆی تا وای لێ بكەن وەك كەسێكی خەڵكی شارەكە بەوپەڕی دڵنیاییەوە تیایدا بێت و بچێت.

دانیشتووەکان. بەرەبەرە هۆیەکانیم دۆزییەوە و، چارەم کردن. هەندێک لە فەرمانبەر و دەرەبەگ و دەسوپێوەندەکانیان جەزرەبەیان پێ گەیێنرا. داوای چەند خوێندنگایەک و چەند ساختمانێکم کرد بۆ خەستەخانە و، نووسراوخانە و حەوانەوە. داخەکەم تا لەوێ بووم هیچیان جێبەجێ نەبوون. ناوچەی دهۆک دارزابوو بەدەست زۆرداری فەرمانبەرانی خراپ و دەرەبەگ و شێخەکانیەوە. هاواری بوو لە دەست سەرمایەدارانی (موسڵ) و فڕوفێڵی ئینگلیزەکان! کارەساتی سامناک و خوێنینی زۆری تێدا ڕوودابوو[1].

لەبەر ئەوە ڕەوشت و خووی بڵندم کەم تێدا دەدی. هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی تێدا فەرمانڕەوابوو. دوو خوێندنگای سەرەتایی کوڕان و، خوێندنگایەکی سەرەتایی کچان و، خوێندنگایەکی دووهەمین (ثانوی) لە شاری دهۆکدا هەبوون. هەروەها حەوت هەشت خوێندنگایەکی تریش لە گوندەکانی تریدا هەبوون. بێجگە لەوە سێ نەخۆشخانە (مستوصف)یش لە ناوچەکەدا هەبوون. بەچل هەزار کەس دوو ڕێگای قیرتاوکراویان هەبوو، ناوچەکەیان دەبڕی. بەڵام زۆربەی گوندەکان بێ ڕێگای تەختکراو بوون.

هەوڵم دا کێڵگەیەکی باو (مزرعة حديثة) لە گوندی (سندۆر)دا بکرێتەوە. بەڵام سەری نەگرت. چەند ساختمانێک بۆ سەرا و خانووی جێنشین (قائمقام) و کارگێڕی لادێی (سێمێل) بەدەستەوە بوون. کە من گوێزرامەوە بۆ (زاخۆ) لە تەواوبووندا بوون.

لە دهۆکدا کە ناوچەکەی پارچەیەک بوو لە بەهەشتەکانی کوردستان، گەشتوگوزارم زۆر کرد. بەڵام هەمیوو دەم کز و لاواز بووم، تونند و تووڕە بووم، جار جار هەڵەم دەکردا. لەبەر ئەوە جارجار نەبێ، کەم دڵم خۆش دەبوو! کارەساتی نەنگ و ناشیرین و سامناکم زۆر دی.

ئازاری خۆشیان زۆر دا! هەرچەندە سەرکەوتم بەسەر دوژمنەکانی (گەل)دا بەڵام دڵم لە ژیان زۆر شکا! باش بوو بەڕێز و شیرینیەوە لێیان جیابوومەوە! هەرچەندە هەندێ کاروباری ناوچەکە، بەڵکو خاک

(١) ئەو بەربەرەکانییانەی دانیشتووانی دەڤەرەکە لە داگیرکەرانی ئینگلیزیان دەکرد هەر لە ١٩١٩-وە کە لە زاخۆ ئەفسەری سیاسی کوژراو لە ١٤ی تەمووزی هەر ئەو ساڵەدا هێرش برایە سەر لەشکری ئینگلیز لە ئامێدی - کاپیتن ولی و ماکدۆناڵد و سیر هـ. تروب- و چەند سەربازێک تیا کوژرا. لە ٤-١٩٣٣/٨/١١ کە وەزارەتی ڕەشید عالی گەیلانی و مەلیک غازی سوپایان بەردایە دەڤەری دهۆک و ناحیەی سێمێل، بەدەیان خەڵکی بێ تاوانی تیادا کوژراو و بریندارکران و گیران. هەروەها لە شۆڕشی بارزانی دووەمیشدا دەڤەری دهۆک بەشێکی زۆری لەو کوترەوەری و ناهەقییەی حکومەت دەیکرد، بێ بڕابوو: لە ١٩٤٥/٨/١٩ حوکمی عورفی لە ناوچەکەدا ڕاگەیانرا و ئەو قەزایانە (عەمادیە و دهۆک و عەقرە و ڕەواندز)ی هەموو گرتەوە، کە (مجلس العرفي) لە ١٩٤٥/١٢/١ حوکمە ناعادیلانەکانی خۆی بەسەر گەورەپیاوان و خەڵکی ئەو دەڤەرانەدا دەسەپاند: بەئیعدام و تەبعدی و حوکمی جیاجیای دی... هتد. ئەم کارە خوێناوییانەی حکومەت لەو دەڤەرەدا، نابێ چاوەڕوانی کاردانەوەی چاکی لێ بکرێ و بارێکی دەروونی ئاسایی لەلای خەڵکەکەی لێ بخولقێ.

(لوا٠)ی (موسل)یش کز و نارێک دەڕۆیشت بەڕێوە، بەهۆی کاربەدەستانی خراپی (موسل)ەوە کە بووبوو بەهۆی کزبوونی گیانی (کوردایەتی) و (نیشتمانپەروەری) و چەوساندنەوەی دانیشتووانی ناوچەکە، بۆ کەلکی ناپوختەی هەندێ سەرمایەداران و دەرەبەگانی (موسل) و هەندێ فەرمانبەرانی خراپ کە بۆ کەلکی ناپوختەی ئەوانە دەجوولانەوە... هەرچەندە ماوەیەکی کەم نەبێ نەمامەوە لە دهۆکدا، کە هەر دە مانگێک دەبوو... بەلام توانیم گیانی مرۆڤایەتی و کوردایەتی لە دهۆکدا زیندوو بکەمەوە، بۆ بەرەنگاری کردنی زۆرداری ئەو جۆرە پیاوخراپ و بەدکردارانە... قومار، کە یانەی فەرمانبەران و چایخانەکانی دهۆکی داگیر کردبوو، قەدەغەم کرد... لە جێی ئەو نووسراوخانەیەکی ڕێک و ناوازەم دامەزراند لە (یانەی فەرمانبەران)دا، پڕم کرد لە نووسراوانی نایاب نایابی کوردی و عەرەبی. ماوەی خواردنەوەیشم نیوا و نیو کەم کردەوە. لە بریتی ئەوانە باخچە و یاریی واغێتی تازەباو و پینگ پۆنم بۆ دانا. دەستەی بەڕێوەبەرایەتی یانەکەم لابرد. لە جێی ئەوان دەستەیەکی خاوەن بیر و هۆش و نیشتمانپەروەرم دانا. دەستێکی تازە کردنەوەیشم هێنا بەسەر ساختمانی یانەکەدا. ڕابواردنی ناو یانەکەیش لە (قومار) و (خومار)ەوە گۆڕاو، بەرەبەرە ڕووی کردە زانست و هونەر و ساز و ئاواز بۆ کەلک و خۆشی گشتی. گیانێکی پاک و چاک و بلند لەیانەکەدا ژیایەوە، کە گەلی ئاراستە دەکرد بۆ چاکەی گشتی. بەرامبەر بەم گیانە تازەیە، دوژمنانی گەل، دز و درۆزنان و ناپاکان، لە ناوچەکەدا ناچار مان فسیان دایەوە[1]. چونکە ڕوورەشی نەبێ هیچی تریان بۆ نەمایەوە!.

لەلایەن دۆستان و یانەی فەرمانبەران و خوێندنگای دووەمینەوە، گەلێک ئاهەنگم بۆ کرا... زۆر بەڕێزەوە فەرمانبەران و برادەرانی دهۆک ڕەوانەیان کردم تا سنووری (زاخۆ). ئەو کاتە ڕۆژی دووەمی سالی نوێی ١٩٥٧[2] بوو، کە بەتیشکە نەرم و گەرم و پڕ خۆشەویستییەکەی تیشکی سەرمای سەختی زستانی دەشکاند سەرم کرد بە(زاخۆ)دا... دلم پڕی بوو لە پارانەوە لە خودا، کە لە زاخۆدا سەرم بخات!.

## زاخۆ

لە ١٩٥٧/١/٢دا گەیشتمە زاخۆ. (زاخۆ) شارێکی زۆر کۆنی کوردستانە. تەمەنی وەک دەڵێن، دەگەڕێتەوە بۆ (٢٥٠٠) سال پێش ئێمرۆ. زۆ جوانکیلانە و خنجیلانە. هاتە پێش چاو. نزیکەی (٨٠٠٠) هەشت هەزار کەسێکی تێدا دەبوو. لەوانە هەزار کەسێکیان گاور و ئەرمەنی بوون. لە ناوچەکەدا کە بریتی بوو لە سێ لادێ: (گولی) و (سندی) و (سلێڤانی)، نزیکەی (٤٠,٠٠٠) کەسێک هەبوو. سێ گوندێکیان کلدانی و ئاسووری و ئەرمەنی بوون. لە زاخۆدا: دوو خوێندنگای سەرەتایی کوڕان و، خوێندنگایەکی سەرەتایی کچان و، خوێندنگایەکی مندالان (أحداث) و، خوێندنگایەکی ناوەندی (متوسطة) هەبوو! لەلادێکانیشیدا دە خوێندنگایەک هەبوو. خوێندنگایەکی ناوەندی کچانم بۆ سەندن، لەگەل سێ خوێندنگای سەرەتایی بۆ گوندەکان. خۆزشتم بۆ هەر سێ

(١) فسیان دایەوە: ناچارمان دانیشتن، وازیان هێنا. بۆ سووککردن بەکاردێ.

(٢) بەمانا: ١٩٥٧/١/٢

خوێندنگاکەی شاری (زاخۆ) سەند. پیتاکم بۆ شاگردە هەژارەکان کۆ کردەوە. پیتاکم بۆ سەرگەردانەکانی لافاوی شاری (سلێمانی) لێ کۆکردنەوە.

ئەو ترس و سامەی کەوتبووە ناو دڵی فەرمانبەران و دانیشتووانی ناوچەکەوە، بەهۆی فەرمانبەرانی خراپ و دەربەگێکی درندەوە، لام برد. بەرەبەرە بارستایی گوزەران و سەربەستی بیروباوەڕم لە ناوچەکەدا بڵند کردەوە. ژینی ناو (زاخۆ)م زۆر خۆش دەهاتە پێش چاو. چونکە دەمتوانی دەستی هەژار و داماوی کوردەکانی ناوچەکە و کوردەکانی دراوسێ لە کوردستانی تورکیا بگرم و، یارمەتییان بدەم بۆ گوزەرانێکی باشتر... زاخۆ، کە لەوە پێش ناوبانگی دەرکردبوو، بەتاڵاوە و پشێوییەوە و، گەلێک جار کارەساتی ئەنگ و خوێناوی تێدا ڕوو دەدا، هۆیەکەی ئەوەبوو، فەرمانبەرانی خراپ پشتی زۆرداریان دەگرت! لە سایەی خوداوە ئەو ساڵ و حەوت مانگەی تێیدا بووم، (زاخۆ) مەند و بێ دەنگ و پاک و پوختە و سەربەرزانە بەکامەرانییەوە گوزەرانی دەکرد.

کە (زاخۆ)م بەجێ هێشت، دڵم پڕ بوو لە ڕێز و ستایش بەرامبەر دانیشتووەکانی... ئێستایش لە دڵمدا، جێگای هەرە پەسەندم بۆ کردوونەتەوە. خۆشەویستی و یارمەتییانم بۆ گەلکی گشتی هەرگیز لە بیر ناچێتەوە!.

ژینی (زاخۆ)م زۆر پێ خۆش بوو. پڕ بوو لە میوانداری و گەشتوگوزار و سەیران... لێرەدا توانیم (٢٦) وتاری خۆم بنێرم بۆ گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان، کە بڵاویان کردنەوە. لێرەدا توانیم دوو نووسراوی تر بنووسم: (ژینی نوێ) و (ئافرەتی کورد). نووسراوی (ئافرەتی کورد)م لە چاپ دا و بڵاوم کردەوە. کە هەڵبژاردنی ئەندامی کۆڕی نەتەوە دەستی پێ کرد، سەربەستی تەواوم دایە دەست (گەل). لە ئەنجامدا ئەوی گەل ویستی ئەوەبوو بەئەنداد. بەڵام تا ئەمە پێکهات، بەهۆی بەدکاری هەندێ ناغاوە، ناوچەکە کەوتبووە سەر ئاگر. زۆری نەمابوو شەڕێکی خوێنێ بقەومێ لە ناوەند هۆزەکاندا... باش بوو بەسایەی خوداوە ئاگرەکە کوژایەوە. کەسیشی تێدا نەسووتا. دوژمنەکانی گەل نەبێ، کە ئەو چەند ئاغایانە بوون!

هەروەها لە دوو سێ هەڵبژاردنی تریشدا بۆ (شارەوانی) و (بەڕێوەبەرایەتی - الأدارة)، توانیم ڕێ بدەم بەسەربەستییەکەوە جێبەجێ بکرێن... چەند ساڵێک بوو پێیان دەگوتم ببمە سەرۆکی شارەوانی (سلێمانی)... لە ساڵی ١٩٥٤دا هەم فەرمانڕەوایی، هەم گەل، حەزیان بەم فەرمانە دەکرد بیکەم... بەڵام لەبەر هەندێ هۆی گشتی و تایبەتی، داخەکەم نەمتوانی ئارەزووی هەر دوولایان جێبەجێ بکەم! بەڵام لە ساڵی ١٩٥٨دا بەرهەڵست نەما لەبەردەمدا بێجگە لەوە، لافاوی سلێمانیشی بەسەردا هاتبوو، کە هەستی بزواندبووم بۆ چوونەوە بۆ سلێمانی بۆ بەشداریکردن لە ئاوەکردنەوەیدا... هەمیسان لەبەر ئەوەی حەزم دەکرد چەند ساڵی دواییم لە سلێمانیدا فەرمان ببینم، بۆ ئەوەی تێبکۆشم بۆ گەلکی گشتی، بۆ ئەوەی بۆ دوارۆژی خۆیشم جێگایەک خۆش بکەم؛ تا کە (٢٥) ساڵەکەی فەرمانبەریم تەواوکرد، لە ساڵی ١٩٦١دا واز لە فەرمان بێنێ بهێنم و، هەموو هێز و توانایەکم بخەمە سەر بڵاوکردنەوەی (زانیاری) و (وێژە) و (هونەر) بەناو خاکی کوردستاندا... بەهیوای ئەمانەوە نووسیم بۆ کاربەدەستی کاروباری ناوخۆ (سەعید قەزاز) کە ئامادەم خواستەکەی ساڵی ١٩٤٥ی جێبەجێ بکەم.

که له هاوینی ساڵی ١٩٥٨دا چوومەوە سلێمانی، موتەسەڕیفی سلێمانی (عەبدولموتەلیب ئەمین)[١]، زۆر پیاوانە نازی گرتم و خواستی لێ کردم کە ببمە سەرۆکی شارەوانی سلێمانی. هەروەها گەلێک نیشتمانپەروەران و تێکەیشتووانی سلێمانیش ئەو خواستەیان لێ کردم... پڕ بەدڵ سوپاسی خودام کرد کەوا بەرێز و خۆشەویستی و سەربەرزییەوە ئاواتەکەم هاتە دی. بەسوپاسەوە خواستەکەیانم بەجێ هێنا... بۆ دوو ساڵ سەرۆکایەتی شارەوانی سلێمانیم بەڵێن دا... پاش گەڕانەوەم بۆ زاخۆ، ئەوەندەی پێ نەچوو، فەرمانی گوێزرانەوەم لە ١٩٥٨/٧/١٣دا دەرچوو... بەڵام بۆ بەیانی شۆڕشی ١٩٥٨/٧/١٤ لە بەغدادا بەرپابوو! نەیانهێشت بگوێزمەوە بۆ سلێمانی تا ١٩٥٨/٧/٣٠.

## سلێمانی

بۆ چەند رۆژێک لە شەقلاوە و هاوینەهەوارەکانی (پیرمام) و (گەلی عەلی بەگ)دا پشوویەکم دا. لە ١٩٥٨/٨/٤دا گەیشتمە (سلێمانی).[٢] گەلێک لە دووکاندارەکان و تێکەیشتووانی شار ویستبوویان بێن بەپیرمەوە... بەڵام من رێم نەدان... وام هاتەپێش چاو: گەل زۆر شادمان بوو بەکارەساتی چواردەی میوەخۆش (تەمووز)ی ١٩٥٨. چونکە (کورد) کرابوو بەهاوبەشی (عەرەب). ئەمە بەپێی دەستووری نوێی کۆماری عێراق بوو.[٣] هەموو لا بەهیوای خۆشی و سەربەرزییەکی گەورە بوون بۆ (گەلی کورد)! هەموو لا گەشکەدار بووبوون... چێژکەی سەربەستی و ئازادییان دەکرد، کە ساڵانی ساڵ بوو نەیاندیبوو! کارەسات دەری خست، نە دانیشتووانی شار، نە فەرمانبەرانی فەرمانڕەوایی، پارەمەتییەکی راستەقینەیان لە دەست نەدەهات بۆ شارەوانی سلێمانی!... بەڵکو بەپێچەوانەوە بەرەنگاریم لە

(١) عەبدولموتەلیب ئەمین ئەلهاشمی: لە دوای (لواء عومەر عەلی) لە ١٩٥٧/٥/١٨ وەک موتەسەڕیف لە سلێمانی دەستبەکار بوو هەتا ١٩٥٨/٩/٤ کە کردیانە بالیوزی عێراق لە تاران، هادی رشید چاوشلی کە ماوەیەک لە قەزا و ناحیەکانی سلێمانیدا قائیمقام و مودیر ناحیە بوو، بەدوایدا بووە موتەسەڕیف... لە دەستپاکی و کارشوناسی و پەیڕەوکردنی دادپەروەریدا نموونەیەکی درەوشاوەی ئەو پیاوە نیداریە کوردانە بوون لەو سەردەمەدا.

(٢) ئەگەر سەرنج دەین، لەوەبەر، مامۆستا هەر کە لە شوێنێکەوە گوێزراوەتەوە بۆ شوێنێکی دی، هەر ئەو رۆژەی لە کارەکەی پەیوەندی پچڕاندووە بۆ رۆژی دوایی لە شوێنە نوێیەکەی بووە! بۆ نموونە: (لە ١٩٤٨/١١/١٢دا سلێمانیم بەجێ هێشت... لە ١٩٤٨/١١/١٣ گەیشتمە شێخان. لە ١٩٥٤/١٠/١٤ شەقلاوەم جێ هێشت و لە ١٩٥٤/١٠/١٥ گەیشتمە ئاکرێ. لە ١٩٥٦/٣/٨ لە ئاکرێ جوێ بوومەوە و بۆ رۆژی دوایی چووم بۆ دهۆک...).

(٣) هەر لە رۆژانی ئەوەڵی رووداوەکەوە کاربەدەستان و سەرکردە تازەکانی عێراق زوو زوو لە بۆنە و خۆپیشاندانەکاندا جەختیان لەسەر (برایەتی، هاوبەشی) کورد و عەرەب دەکردەوە لەە نیشتمانەدا. دوایی کە دەستووری کاتیش دانرا لە بەندی سێیدا وا هاتبوو کە کورد و عەرەب هاوبەشن لەم نیشتمانەدا. بەڵام دوای ئەو بەندە دەیانوت عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەبی!!... رۆژانی داهاتووش ناڕاستی و درۆی ئەو لاف و گەزافانەی دەرخست.

هەردوولایانەوە چاو پێکەوت، بێجگە لە کەمتەرخەمی!. هەروەها دەستە (حزب)ەکان و ڕێکخراو (منظمة)ەکان و کۆمەڵ (جمعیة)ەکان کەوتبوونە بەربەرەکانێی یەکتری، هەریەکەیان دەیویست پەنجە بخاتە کاروباری شارەوانییەوە، بۆ کەلکی خۆی!.

هەروەها لە فەرمانبەر و کرێکار و سەرکردەکانی شارەوانی خۆیدا، لە ئەندامەکانی کۆڕی شارەوانیدا، زۆری وا هەبوو بێجگە لەوەی بەکەلکی شارەوانی نەدەهات، زیانی زۆریشی لێ دەدا!... ئەمە بێجگە لە سەرچڵی و هەڵەشەیی و چەپ و گوپ و کەڕ و گێچەڵی زۆربەی ئەوانەی کاریان دەکەوتە شارەوانییەوە، یاخود کاریان فڕێ دەدرایە شارەوانییەوە!. ئەمانە هەموو، لەگەڵ ناشیێتی و خۆپەرستی و هەمووانیدا بووبوون بەهۆی سەر ئێشە و ماندووبوون و دڵشکاندنی من، لەبەر دواخستن و تێکدانی فەرمانەکانی شارەوانی!... لەبەر ئەوە لە لایەکەوە هەوڵ و تەقەلام دەدا، بەپێی توانایی خۆم، کاروبارەکانی شارەوانی و پرۆژەکانی هەڵبسوورێنم، لەلایەکیشەوە ڕەنجم دەدا و تێدەکۆشام بەرەنگاری خراپەی ئەو تاک و تەرا و کۆمەڵ و دەستانە بکەم!

لە سایەی خوداوە بەسەر زۆر گیروگرفتدا زاڵ بووم. بەڵام لەش و هۆش و دەروونم بەجارێک کەوتنە ئازا و هاوارەوە!... لە ئەنجامدا ناچاربووم، هەوڵ بدەم کە لە شارەوانی جوێ ببمەوە!.

ئەمە لای تاریکی و ژیانی سلێمانیم بوو...

بەڵام لەلای ڕووناکیدا، گەلێک شتی خۆش و بەنرخ و گرنگم دی... هونەر و وێژە لە سلێمانیدا گەشەیان کرد و پەرەیان سەند و، کاریان کردە گیانی هەمووان. هەژار، ئافرەت، سەربەستی بیروباوەڕی کوردایەتی، خەبات بۆ پێشکەوتن و، ئازادی و، کامەرانی، دەرکەوتن و بەرکەوتن و، سەرکەوتن.

گەلێک ڕۆژنامە و گۆڤار و نووسراوی کوردی پەیدا بوون و هاتنە ناوەوە... گەلێک ئاهەنگی ئاوازەی گۆرانی و ساز و ئاواز و هەڵپەڕکێ و لاساییکردنەوەی کوردی کرا و، ئافرەت بەتەنیشت پیاوەوە لەو ئاهەنگانەدا کۆ دەبوونەوە بۆ تەماشاکردن و کارگوزاری. گەلێک ڕێکخراوە و دەستە و کۆمەڵ هاتنە کۆڕەوە. خۆپیشاندان، کۆبوونەوە، وتار خوێندنەوە، بەبۆنەی ڕۆژە گرنگەکانی گەلەوە زۆر بەجوانی و ڕێکوپێکی و ڕازاوەییەوە ساز دەکران...

(نەورۆز)ی ساڵی ١٩٥٩ و ١٩٦٠، گەیشتە ئەوپەڕی گەورەیی و جوانی و ڕازاوەیی.

ئێراوانی لاوانی کورد، ئافرەتانی کورد، خوێندەوار و بەناوبانگانی کورد، بۆ نواندنی بیروباوەڕی کوردایەتی، گەیشتنە ئەم پەڕ و ئەوپەڕی جیهان... بەهۆی ئەو خوێندنکارانەوە کە لە ئەورووپا دەیانخوێند، (کورد) توانی خۆی بەهەموو جیهان بناسێنێ، توانی بۆ ئازادی و سەربەستی و مافی خۆی تێبکۆشێ.

# هاتنی بارزانی بۆ سلێمانی[1]

لە پاییزی ١٩٥٨دا، کە پێشەوا (مەلا مستەفای بارزانی) لە خاکی سۆڤیەتەوە گەڕایەوە کوردستانی عێراق. سەرێکی لە سلێمانیش دا. ئەو بەپیرەوە چوونەی بۆ ئەو کرا. ئەو ماندوونەبوونەی لەو کرا، ئەو ئاهەنگەی شارەوانیی سلێمانی بۆ ئەوی کرد... بۆ کەس نەکرابوو! ئەتەوە بەجارێک خرۆشابوو، گەشکەدار بووبوو، نەیدەزانی لە خۆشیدا چۆن بجوولێتەوە و چی بکا!

بەهۆی وێنەکێشێکی هونەرمەندی کوردەوە،[2] وێنەیەکی ڕەنگاوڕەنگی گەورەمان بەمەلا مستەفا بارزانی پێشکەش کرد: وریایی کوردی سلێمانی و نەوازشیانی بۆ (بارزانی) و (مەلا مستەفا بارزانی) پیشان ئەدا، لەگەڵ ئاواتی گەلدا... لە ئاهەنگەکەیدا، وتارێکم خوێندەوە... ساز و ئاوازی کوردایەتی، گیانی دەبووژاندەوە... دەتگوت لە ئاسمانەوە فریشتە دەبارێ... دار و بەرد پڕی بووبوو لە خۆشەویستی و نەوازش بۆ (مەلا مستەفای بارزانی) و کورد و کوردستان!...

ڕۆژەکەی خۆش بوو... بەهەزاران کوڕ و کچ، پیاو و ژن، خوێندەوار و نەخوێندەوار، دەوڵەمەند و هەژار، گەورە و بچووک ڕژابوونەوە ئەو ناوە، چاویان بکەشێتەوە! لەگەڵ (مەلا مستەفا بارزانی)دا بەچەند کۆبوونەوەیەک لە یانەی فەرمانبەران و ماڵی (شێخ لەتیفی شێخ مەحموودی مەزن)دا کامەران و سەربەرز بووم... کە ڕێی تا (قلیاسان) ڕەوانەمان کرد، یەکتریمان ماچ کرد و جوێ بووینەوە.

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی بەنرخ و پڕ کامەرانی بوو... دڵمان پڕی بوو لە هیوا و ئاواتی بەرز بۆ دواڕۆژێکی نزیک بۆ کوردستان...

لەو ڕۆژەدا بەم بۆنەیەوە گەلێک سوپاسی (عەبدولکەریم قاسم)م کرد کە بوو بەهۆی گەڕانەوەی (مەلا مستەفا بارزانی) و بارزانییەکان.

لە پاییزی ساڵی ١٩٥٨دا دار و بەردیش پڕی بووبوو لە خۆشەویستی و ڕێزگرتن بەرامبەر (کورد) و (کوردستان)!. دەتگوت لە ئاسمانەوە فریشتە دەبارێ. لە زستانی ساڵی ١٩٥٩دا دەستەیەک لە ڕۆشنبیرە گەورەکانی (یەکێتی سۆڤیەت) هاتن بۆ سلێمانی. پێنج کەس بوون: دوو ژن و سێ پیاو. بەناوی شارەوانییەوە هەندێ نووسراوی کوردی و گوڵی دەستکرد و کڵاو و کەڵاش و پانیەرز و شەکرشکێنی دەستکردی کوردەواریم پێشکەش کردن. هەندێکی بۆ خۆیان، هەندێکیشی بۆ (ئامەخانەی لینینگراد)... هەروەها لە ئاهەنگێکی شیودا کە کارگێڕی زانیاری سلێمانی بۆی کردبوون، لە پاش ئەوەی هەستم پێ کرد میوانەکان ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانە دەکەن بۆ برایەتی و یەکێتی (کورد) و (عەرەب)، هەروەها هەستێکی جوان پیشان دەدەن بەرامبەر بە(کورد)... منیش بەناوی دۆستایەتی (کورد) و

(١) ئەم باسەی هاتنی سەرۆک بارزانی بۆ سلێمانی لەو پاکنووسەیدا نەبوو کە لە ١٩٨٨دا ئامادەی بڵاوکردنەوە کرابوو: لە دەستنووسە ئەسڵییەکەیدا (دەفتەری ژمارە -٣-) دەرمهێنایەوە.

(٢) زۆرم پرس کرد لە بارەی ئەو هونەرمەندەوە، بەڵام بەداخەوە شتێکی ئەوتۆم دەسگیر نەبوو. زیاتر مەزندەی مامۆستای هونەرمەند (جەمال بەختیار) یان بەهەشتی (ئەنوەر تۆفیق) دەکرێ.

(یەکێتی سۆڤیەت)ەوە تۆشێکم بۆ کرد و، سوپاسم پێشکەش کردن و، خۆش هاتنیشم لێ کردن..

ڕۆشنبیرەکان، لەلایەن دەستە (حزب)ەکان و کۆمەڵەکان و ڕێکخراوەکانەوە، نەوازشیان پێشکەش کرا، لەگەڵ دیاریدا... چ لە پیرەوەچوونیاندا، چ لە بەڕێکردنیاندا، ئەوپەڕی ڕێزیان لێ گیرا و، خۆشەویستییان پیشان درا... یەکێک لەو ڕۆشنبیرانە، سەرۆکی ئەکادیمیی (لینینگراد) بوو. یەکێکیشیان سەرۆکی زانستگای (تاشقەند) بوو. یەکێکیشیان ژنێک بوو، کاربەدەستی زانیاری (پەشکیرستان) بوو. ئەمانە هەموویان بەدڵخۆشییەوە گەڕانەوە. وتارە باشەکانیان، چونکە کەلکی بۆ (کورد) تێدا بوو، دڵی دوژمنانی کوردی خۆش نەکرد! لەبەر ئەوە، هەر ئەو شەوە تۆماری وتارەکان بەمەکینەی تۆمارکردنەکەوە[1]، دزرا و لەناوچوو، کەس نەیزانی ئێستایش و ئەوسایش بۆ کوێ چوو! ئەم کارەساتە دڵی گەلێک کەسی شکاند!. دیارە ئۆباڵ بەئەستۆی ناپاکەکانی خۆمانە، کە لەو سەردەمەدا بۆ بێگانە ئیشیان دەکرد!.

میوانەکان هەستیان پێ کرد (کۆمۆنیستەکان - دەستەی بەشدارییەکان) و (پارتییەکان)ی کوردەواری لەناو خۆیاندا ناکۆکن. ئەمەیش نیشانەیەکی مەترسییە بۆ (کورد و کوردستان)، بۆ (عێراق)، بۆ ئازادیخوازانی جیهان! پاش ئەوەی گەڕانەوە خاکی (یەکێتی سۆڤیەت)، چاوەڕوان بووم نامەیەکیان لێ وەربگرم بەرامبەر بە(شارەوانی سلێمانی). هیچیان دیار نەبوو!... بەڵام وەکو لە پاشدا زانیم گەلێک ئامۆژگاری بۆ کۆمۆنیستەکان هاتبوو لە یەکێتی سۆڤیەتەوە. لە پاش چەند مانگێک کۆمۆنیستەکان تا ئەندازەیەک وازیان لە دەستدرێژی و هەڵەکردن بەرامبەر بە(پارتی) و بەرامبەر بە(کوردایەتی) هێنا[2]! بەڵکو خۆیان کێش دەکرد: دڵی (کوردەواری)یەکە ڕابکێشن.

لە زستانی ساڵی ١٩٦٠دا ڕێ درا بە(پارتی دیموکراتی کوردستان) دابمەزرێ.[3] کوردەوارییەکە، لەو ڕۆژەدا ئەمەندە گەش ببووبووەوە، دەتگوت کوێرەوەری هەزاران ساڵەی لە بیرچۆتەوە... دار و بەرد پێدەکەنی، بەزم و ڕەزم و، گۆرانی و هەڵپەڕکێ و، وتار و، پیرۆزبایی کردن لە لکی (پارتی سلێمانی)دا، شارەکەی هێنابووە ئەوپەڕی کامەرانییەوە. ڕۆژنامەی (خەبات) کە زمانی پارتییەکان بوو،

(١) بەمانای: -آلة التسجیل - مسجلة.

(٢) ئەم سەرەتای ئازادی کارکردنەی کۆمۆنیستەکان بەتایبەت و گەلانی عێراق بەگشتی، کەم تەجرەبەیی لەو بوارەدا، بەداخەوە زۆر بەگران لەسەر ڕۆڵەکانی گەلانی عێراق کەوتەوە، ئەمە جگە لە هەوڵ و کۆششی دەوڵەتانی دەرەوە و هاوسنوور بۆ تێکدانی ڕیزەکانی گەل. لەو ڕۆژانەدا ڕێتسی ئازەش تروشی چەواشەکارییەکی وا ببوو کە بەلایەکدا خۆی ساغ نەدەکردەوە. کۆمۆنیستەکانی ئەو کاتە خۆیان بەخاوەن ماڵ دەزانی، لە هەموو شتێکدا کوێخاییان دەکرد و بەگژ هەموو بۆچوون و تەقەللایەکی نەتەوەییدا دەچوونەوە، سا کوردی بوایە یان عەرەبی، هەر بەو ئەندازەیەش بەعسی و قەومییە عەرەبەکان.. جا لە کوردستاندا بەزۆری ململانێکە لە نێوان ئەو دوو تەوژمەدا بوو.

(٣) پارتی دیموکراتی کوردستان لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦ەوە دامەزرابوو لە کارکردنی نهێنیدا بوو، پەلوپۆی باش داکوتابوو، ڕاستتر ئەوەیە لەو بەروارەدا لەلایەن میرییەوە بەڕەسمی ڕێگای کارکردنی بەئاشکرای پێ درا.

گەیشتە ئەوپەڕی چاکی و سەربەستی... لەناو هەموو ڕۆژنامەکانی عێراقدا سەری بڵندکردەوە... لە هەموویشیان زۆرتر پەسەند و خۆشەویست بوو لای خوێنەواران[1]! پاشان گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)[2]یشیان دەرچوو، کە گەیشتە پایەیەکی هەرە بڵند لەناو گۆڤارەکانی کۆن و نوێی کوردیدا... ئەوەندەی پێم کرا، وتارم بۆ هەردوولایان نارد... پارتییەکان بەم کردەوەیەم زۆر دڵخۆش بوون... بەبۆنەی (جەژنی نەورۆز)ی ساڵی (١٩٦٠)ەوە: «نووسراودانێک و، دوو مێز و شەش کورسی و ژمارەیەکی زۆر نووسراوانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزیم بۆ ناردن». نووسراودانەکە لەسەر ڕەنگڕێژی (تخطیط) خۆم لەلایەن ئاسنگەرێکی سلێمانییەوە دروست کرا. لە شێوەیەکی هونەری زۆر ناوازەدا نەخش و نیگاری تێ خرا و، ڕەنگاوڕەنگ کرا. شێوە و بەژن و باڵا و ڕەنگەکانی نووسراودانەکە، جوانی و ڕازاوەیی نەورۆز و بەهاری کوردستانی بەئاوات و هیوای کوردەوارییەوە پیشان دەدا، لەگەڵ پشتبەستنی ڕاپەڕینی کورد بەزانست و هونەر و بیروباوەڕی مرۆڤایەتییەوە... ئەم دیارییانە بایی سەد دیناری ئەو سەردەمە بوون. نووسراوەکان لەسەر ئارەزووی پارتییەکان خۆیان کرا... بەڵام نووسراوە کوردییەکان خۆم بۆم هەڵبژاردن... ئەم دیارییانە، بەپارەی (شارەوانی سلێمانی) کران، بەناوی شارەوانییشەوە پێشکەش بە(بارەگای پارتی لە سلێمانی) کران... پارتییەکان ئەمەیان زۆر پێ خۆش بوو، بەتایبەتی و بەئاشکرا سوپاسی خۆیان بۆ شارەوانی و من پێشکەش کرد... هەروەها بەبۆنەی ئەو نەورۆزەوە درەختەکانی باخی گشتی و شەقامە گەورەکانی ناو شارمان بەگڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ ڕازاندەوە...

لە ئاهەنگی نەورۆزدا کە بەشێوەیەکی زۆر گرنگ و جوان لە دەرەوەی شاری سلێمانیدا کرا، نزیک بەکارێزی (شێخ مەحموودی مەزن)[3]، گەلێک وتاری بەنرخ و گەلێک هەڵپەڕکێ و ڕەشبەڵەکی کوردی و گەلێک گۆرانی و ساز و ئاواز و لاسایی کردنەوەی «سوارانی مەریوان»[4] و پیاوە گەورەکانی کورد پیشان دران... نزیکەی دە هەزار کەسێک هاتبوون بۆ سەیر، بەپیاوان و ژنانەوە.

ئەو ڕۆژە پارتییەکان سێ جار ناوی منیان برد و سوپاسیان کردم لەبەردەم سەیرانکەرەکاندا. یەکێک

(١) خەبات: سیاسی ڕۆژانە، لە بەغدا دەردەچوو، ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانە، ژمارە یەکی لە ٤ی نیسانی ١٩٥٩ دەرچوو، دوا ژمارەی لە ٢٨ی مارتی ١٩٦١ دەرچوو، بەهەمووی (ئەو سەردەمە) ٤٦٢ ژمارەی لێ دەرچوو. خەبات ئێستاش هەفتانە بەردەوام لە دەرچووندایە بەعەرەبی.

(٢) ڕۆژی نوێ: گۆڤارێکی ئەدەبی سیاسی کۆمەڵایەتی، لێپرسراوی جەمال شاڵی و سکرتێری کامەران موکری بووە، ژمارەیەکی لە مارتی ١٩٦٠ و بەهەمووی ١٨ ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە، ئەو گۆڤارە سەنگ و بەهای تایبەتی خۆی هەبوو لەناو خوێندەواراندا ئەویش بەهۆی ئەو ڕێبازە ئەتەودییەی کە گرتبووی، پارتی دەری نەدەکرد، بەڵام بەهۆی ڕێبازەکەیەوە زۆر کەس بەبڵاوکراوەیەکی ئەویان دەزانی. مامۆستا سەرجەم ١٥ وتاری کۆمەڵایەتی و چیرۆکی تیادا بڵاوکردۆتەوە.

(٣) ئەو کارێزە بە: تووی مەلیک ناسراوە، کۆمۆنیستەکانیش لە گردی مامەیارە بوون.

(٤) ئەوە لاساییەکی (دوانزە سواری مەریوان) بوو کە لە ڕاستیدا تەنیا نمایشێکی ئەو دوانزە سوارەبوو نەک چیرۆکەکەی پیرەمێرد بێ و کرابێتە شانۆگەری.

لەو سوپاسانە هی «پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران» بوو بەرامبەر ئەو هەوڵ و تێکۆشانەم کە (١٧٠) کەسی ئاوارەی کوردەکانی ئێرانم لە سەرچنار حەواندەوە و نزیکەی (١٣٠٠) هەزار و سێ سەد دیناری ئەو سەردەمەیشم بۆ کۆکردنەوە. لەو ڕۆژەدا زۆر سەرە بەرزبووەوە کە ئەتەوەکەم لەسەر زمانی پارتییەکان خۆشەویستی پیرۆزی خۆی بەرامبەرم نواند... زۆر شاد و کامەران بووم بەو ڕاپەڕاندنە جوانەی ئەوڕۆژەکە.
سوپاسی یەزدانم کرد و بەڕۆژێکی ژیانم ژمارد. هەروەها، خۆشبەختانە، توانیم بەهۆی شارەوانییەوە یارمەتی گەلێک خوێندنگا و ڕێکخراوانی تر بدەم وەک: (خوێندنگای هەژار و هەتیوان)، (ئافرەتانی کوردستان)، (باخچەی منداڵان)، (کۆمەڵی پاراستنی) مافی ئافرەتانی عێراق/ لقی سلێمانی[1]، (کۆمەڵی هونەرە جوانەکان)، (کرێکارانی کوردستان)، (کرێکارانی عێراق/ لقی سلێمانی)[2].

لە زستانی ساڵی ١٩٥٩دا، (کرێکارانی کوردستان)، لەسەر خواستی خۆیان، لە یەکەم ئاهەنگیاندا وتارێک و پارچە هۆنراوەیەکم خوێندەوە. لە ئاسراوانی شار و فەرمانبەران و کاربەدەستانی فەرمانڕەوایی (لە سلێمانیدا) و کرێکاران، نزیکەی چوار سەد کەسێک بانگ کرابوون... پارتییەکان و بانگکراوەکان گشتیان، بەقسەکانم و هۆنراوەکانم دڵخۆش بوون... کردیان بەچەپڵە ڕێزانێکی دوور و درێژ... ئەوساکە، لەلایەکەوە تورکمانەکان، لەلایەکی تریشەوە کۆمۆنیستەکان لە ژێرەوە هان دەدران لە دژی کوردایەتی[3]!.
چ کۆمۆنیستەکان، چ پارتییەکان هێشتا ڕێ نەدرابوون، بەئاشکرا فەرمان ببینن. بەڵام فەرمانڕەوایی دۆستیان بوو... بەرەنگاری نەدەکردن! لە وتارەکەمدا داوای یەکێتی (پارتی) و (کۆمۆنیستەکان)م کردبوو، لەبەر گەلکی گشتی. ئۆباڵی ئاژاوە و هەڵەکانی ناو شاری سلێمانی و هەڵەبجەم خستبووە سەر ئەستۆی ئەوان!. داوای چارەکردنی ئەو گیروگرفتانەم لێ دەکردن، بۆ گەلکی گشتی! لە دواییدا بۆم دەرکەوت، هەردوو لایان بەقسەکانم داچڵەکی بوون! پارتییەکان هاتنە لام ئامۆژگارییان کردم... بەڵام کۆمۆنیستەکان لە قسەکانم دڵگیر بووبوون. تا چەند مانگێکیش لە ژێرەوە لێم دەدوان. هەندێ جار لێم دەوروژان، هەندێ جاریش بەئاشکرا بەرەنگارییان دەکردم! بەڵام من خراپەیانم بەچاکە بەرامبەری کرد. دوایی کە کارەساتە خوێنینەکانیان لە هەموو عێراقدا بەرەنگاری کرا، کە فەرمانڕەوایی عێراق ڕووی لێ وەرگێڕان و، ڕێی نەدان (دەستەی کۆمۆنیستی) دابمەزرێنن دوایی کە ئەمانەیان لێ قەوما، کۆمۆنیستەکان

(١) ئەم ڕێکخراوی ئافرەتانە (رابطة الدفاع عن حقوق المرأة العراقية) بوو کە سەر بەکۆمۆنیستەکان بوو.
(٢) بڕوانە: بەهۆی دووکەرتیبوونی ڕیزەکانی گەلەوە بۆ بەرەیەک سەر بەپارتی و یەکێکی دی سەر بەکۆمۆنیستەکان، هەتا ڕێکخراوە سیللیەکانیش کەرت ببوون: ئافرەتان، کرێکاران، قوتابیان، جووتیاران.. هتد. کە لە ڕاستیدا ئەدەبوو وایێ، بەڵکو ڕابەرایەتی هەر یەکێ لەو ڕێکخراوانە بەدەست سندوقی دەنگدانە و لەوێدا یەکلایی دەبێتەوە، ئەمە ئەگەر ئێمە خۆمان بەگەلێکی شارستانی و کۆمەڵێکی مەدەنی بزانین.. بەڵام لە ئەوها حاڵەتێکدا، ئەوا: (ئۆخەی ئۆخەی، هەر کەس بۆ خۆی!)
(٣) مامۆستا مەبەستی لەوەیە کە: تورکمانەکان لە کەرکووک و ناوچەکانیاندا و کۆمۆنیستەکانیش لە سلێمانی و شار و دەڤەرە کوردەکاندا دژایەتی کوردایەتیان دەکرد و دیارە هەریەک لەو دوولایە ڕووکاری سیاسی و ئامانجی جیاوازی هەبوو، ئەگینا لە سلێمانیدا تورک هەر نەبووە.

پەشیمان بوونەوە! ئینجا بەپێچەوانەی جارانەوە: لێم دەهاتنە پێشەوە، خۆیان لێ نزیک دەخستەوە، ڕێزیان لێ دەگرتم!... تەنانەت هەندێکیان لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی خۆیاندا سوپاسیان دەکردم و، ڕێزیان بەرامبەرم پیشان دەدا!.

لە ڕاستیدا من نەمدەویست لە فەرمانەکەمدا، لایەنی هیچ لایەک بگرم. دەمویست تەنیا لایەنی ڕاستی و دروستی و پاکی و دڵسۆزی بگرم، لەگەڵ کارگوزاریدا... هەموو جارێ بەفەرمانبەرەکانم دەگوت: «من ڕێز لە هەموو بیروباوەڕێک دەگرم. بەڵام ئەوی باش نەبێ بۆ شارەوانی جەزرەبەی پێ دەگەیێنم. ئەوی باش بێ بۆ شارەوانی پاداشتی دەدەمەوە». هەروەها، خۆشبەختانە، توانیم لە باخەڵی خۆیشم یارمەتی گەلێک کۆمەڵ و دەستە و ڕێکخراوان بدەم، وەک: (پارتی دیموکراتی کوردستان) و (ئافرەتانی کوردستان) و (نامەخانەی گشتی). دیسانەوە توانیم نووسراوەکەم (ژینی نوێ)[1] لە چاپ بدەم. گەلێک وتاریش بۆ گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکان بنێرم، وەک: (نەورۆز) و (ڕۆژی نوێ) و، (شەفەق) و (ژین) و (بڵێسە) و (خەبات) و (کوردستان). توانیم هاوبەشی گەلێک لیژنەی (زانیاری) و (وێژەیی) بکەم، چ لە سلێمانی و، چ لە هەردوو (کۆنگرەکانی مامۆستایانی کورد لە شەقڵاوە)دا: وەک (مێژووی کورد) و (زمانی کوردی) و (زاراوەی نیشتمانی) و (خوێندنەوەی کوردی)...

داخەکەم گەلێک هەوڵم دا بۆ دامەزراندنی (کۆمەڵی نووسەرانی کورد)، سەری نەگرت! فەرمانڕەوایی ئەوسا، ڕێی نەدا! هەروەها توانیم نووسراوی (فێربوونی زمانی کوردی و عەرەبی) پوختە بکەم و ئامادەی بکەم بۆ چاپکردن.. توانیم کەرەستەی نووسراوێکی نوێیش کۆ بکەمەوە: لە هەڵبژاردەی وتارەکانم، ناوم نا: (هاواری پێشکەوتن)[2]... ئەم کردەوانە، هەموویان، خۆشەویستییان دروست دەکرد لە ناوەند من و نەتەوە خۆشەویستەکەمدا؛ لەبەر ئەوە، وەک چرایەکی پرشنگدار وا بوون دڵمیان ڕۆشن دەکردەوە و، هەستم بەئازادی و کامەرانی دەکرد.



ئەو شتانەی بۆم ڕاپەڕێنران لە سلێمانیدا، لەو سێ ساڵ و نیوەدا، کە فەرمانم تێدا بینی، بەهەموو گیروگرفتێکەوە کە هاتنە بەردەمم، بەهەموو کەم و کوڕییەکیانەوە، کە ڕەنگە هەیانبووبێ، تا دەمێنم، سەرچاوەیەکی خۆشی و کامەرانیمن... ئەمانە هەر چەندە کەمیش بووبن لە چاو پێویستی شارەکەدا، بەڵام لەناو هەموویاندا، گیانی خۆمی تێدا بوو، هەست و بیروباوەڕی خۆم، لە پێشیانەوە بوو، سەرکردەیی دەکردن. لەو ماوەیەدا کە لە سلێمانی بووم، ئەمانە دروست کران: «بیست و پێنج کیلۆمەترە زێڕابی

(١) ژینی نوێ: کۆمەڵێ نووسین و چیرۆکی کۆمەڵایەتییە بەمەبەستی تێکۆشان بۆ ژینێکی نوێ، چاپخانەی مەعارف، بەغدا ١٩٥٩.

(٢) هاواری پێشکەوتن: کەرەسە و بابەتەکانی ئەم کتێبە کە مامۆستا لەو ساڵەدا کۆی کردوونەتەوە (بریتییە لە ٣١ وتاری کۆمەڵایەتی و سیاسی) ماوەتەوە هەتا ساڵی ١٩٧٩ کە ئەمیندارێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان، بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری لە زنجیرەی (٦)ی چاپکراوەکانیدا بەچاپ گەیاندووە، دار الحرية للطباعة، بغداد.




کارتەکەی ئەبوزێد مستەفا سندی

گەورە و ناوەنجی و بچووک. پانزە کیلۆمەترە شەقامی قیرتاوکراو. چوار بازاڕی باو. سێ باخی گشتی، دوو پیشانگای گوڵ. سوڕک و ئەستێرکێکی باو. گازینۆیەکی باو. ساختمانێکی گەورە (کە گیرا بەکرێ بۆ ناوازەخانە - مۆزەخانە)ی سلێمانی. ساختمانێکی گەورە (کە گیرا بەکرێ بۆ دەسگاکانی فەرمانڕەوایی). ساختمانێک بۆ ئۆتۆمبیلەکانی شارەوانی و حەواندنەوەی ئاگرکوژێنەوەکان. ساختمانێکی باوی گەورە بۆ کوشتیخانە (قەسابخانە). ساختمانێک بۆ کۆبوونەوە و لاساییکردنەوە (تمثیل) لەم ساختمانیانەی فەرمانبەراندا.

بێجگە لەمانە، هەندێ فەرمانی بچووکتریش جێبەجێ کران، وەک: «دروستکردنی دوو دیوار بۆ باخچەی یانەی فەرمانبەران، لەگەڵ هەیوانێکی درێژدا. دروستکردنی دیوارێک بۆ باخچەی سابوونکەران. ڕەنگکردنی دیواری باخچە بچکۆلەکانی ناوەند گۆڕەپانەکان. ڕەنگکردنەوەی پەرژینەکانی باخە گشتییەکان. ڕەنگکردنەوەی دیوارەکانی دەر و ناوەوەی ساختمانی شارەوانی و، میوانخانەی شارەوانی. ڕازاندنەوەی باخی گشتی و شەقامەکان بەهەندێ گڵۆپی گەورە گەورە و، ڕەنگاوڕەنگ.

لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششمدا: پرۆژەی گواستنەوە (مشروع نقل الركاب) لەلایەن فەرمانڕەواییەوە دامەزرا. شارەوانی (١٠.٠٠٠) دە هەزار دیناری بەدەستی دا و دا بەپارێزگەی سلێمانی، بۆ ئەمەی پرۆژێک زووتر دابمەزرێ.

هەروەها (مديرية الأعاشة العامة)م خستە سەر بڕیاردان بۆ دامەزراندنی چوار فڕنی ئۆتۆماتیکی بۆ نەستوورک (صمون) دروستکردن.

(٨٤) هەشتا و چوار دۆنم زەویم وەرگرت لە (کاربەدەستی سامان - وزارة المالية)، بۆ سێ پرۆژە:

یەکەم: بۆ دابەشکردنی زەوی بەسەر فەرمانبەر (مستخدم) و دانیشتووە هەژارەکاندا، تا لەسەر ئەرکی خۆیان خانووی لەسەر بکەن.

دووەم: بۆ دابەشکردنی زەوی بەسەر فەماتبەرەکاندا کە شارەوانی خۆی خانوویان بۆ بکات و، پێیان بفرۆشێتەوە.

سێهەم: بۆ دامەزراندنی هەموو کارگە و گەراج و تەویلەکان تا لە شار دوور بخرێنەوە.

هەروەها بنچینەم دامەزراند بۆ دروستکردنی ساختمانێکی پێنج نهۆمی باو بۆ شارەوانی خۆی. زەویم بۆ کڕی و ئامادەم کرد، پارە و نەخشەیشم بۆ ئامادەکرد و دام بەقۆنتەرات و دەستی پێ کرا[1] هەروەها بناغەم دامەزراند بۆ قیرتاوکردن و دروستکردنی زێرابە گرنگەکانی ناو شار کە نزیکەی (١٣٥,٠٠٠) سەد و سێ و پێنج هەزار دیناری ئەوسای دەگرتەوە... داخەکەم تا لە شارەوانیدا بووم، دەست بەمەیان نەکرابوو... بەڵام دەست کرا بەقیرتاوکردنی هەندێ شەقام و دروستکردنی هەندێ ڕێباز (شوسە) و زێرابی تر. لە (١٩٦١/٨/١)ەوە کەوتمە پشوودانێکی دوور و درێژەوە، لەبەر هەندێ کارەساتی گرنگ کە ڕووی دا، ناچار بووم ئارام بگرم تا دەگوێزرێمەوە[2]... لە ١٩٦١/١٢/٢٤دا جیابوومەوە لە شارەوانی سلێمانی. بەفەرمانی (پشکنێری کارگێری - مفتش إداري)، کە لە کاربەدەستی کاروباری ناوخۆدا بوو،[3] لە ١٩٦١/١٢/٢٥دا دەستم کرد بەفەرمان بینین.



سلێمانیم بەجێ هێشت و دامە دەست خودا و، پارامەوە لێی کە چاودێری بکات. لەلایەکەوە دڵتەنگ بووم بەوەی کە نەمتوانی بەمەندی و بێدەنگییەوە، تێر و پڕ، بەدڵی خۆم، بەکەڵکی شارەکەم بێم... گێژەڵووکەی ڕۆژگار و، بەدکاری هەندێک لە خۆمان، ناچاری کردم لەو نیشتمانە نازدارەم جوێ ببمەوە... داخەکەم لە کاتێکدا جوێیان کردمەوە، نەشتەر لە دڵی هەمووان درابوو. نیشتمان وێران و نەتەوەییش پەرێشان بووبوو. مۆتەکە و ڕەمۆزنی زۆرداری سواری سنگی شادمانیمان بووبوو. ئەو گەشی و خۆشییەی ساڵان مابوو، نە ئەو هیوا و ئاواتەی جاران!. تەم و تاریکایی ئاسمانی لێ داگیرکردبووین! دەنگمان بەخودادا نەبێ، بەکەسدا نەدەگەیشت!. لێرەدا بەجۆرێکی گەورە و ئاشکرا دێوی هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری، دداني لە کوردەواری ڕیچ کردبووەوە... ناپاکی و کەموکوڕی و کردەوە نەنگی هەندێکمان بەئاشکرا دەردەکەوت!.

(شۆڕشی کوردی عێراق)، کە لە پاییزی ساڵی (١٩٦٠)ەوە سەرەتای دەرکەوتبوو، لە

(١) ئەو ساختمانەی ئێستا بۆتە (ئوتێل ئاشتی) بەرامبەر کارگەی جگەرە.

(٢) مەبەستی: بەرپابوونی شۆڕشی (١١ی ئەیلوولی ١٩٦١)ە لە پێناوی بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانی کورد و جێبەجێکردنی بەندی سێ لە دەستووری کاتی عێراقدا.

(٣) (مفتش الأداري في وزارة الداخلـة) ئەمە ئەو پلە و ناونیشانە بووە کە مامۆستای بۆ گواستراوەتەوە لە بەغدا.

١٩٦١/٩/١١دا بەگەورەیی و بەرجەستەییەوە لە هەموو کوردستانی عێراقدا خۆی پیشان دا! (پارتی دیموکراتی کوردستان)، لە ژێر سەرکردەیی پێشەوا (مەلا مستەفای بارزانی)دا سەرپەرشتی ئەم شۆڕشە گەورەیەی دەکرد. دێهات و شارمان وێران کران، کوڕ و کچ و پیر و منداڵمان بەبۆمبا و گوللە کوژران، لەسەرباز و باڵبازەکان و فەرمانڕەواییش زیانێکی زۆر گەورە لە گیان و سامان کەوت... ئەم کارەساتە ناخۆش و سامناکانە لە جیهاندا دەنگیان دایەوە... دڵی هەموو ئازادیخوازانی جیهانیان بڕژاند...

ئا لەم کاتە گرنگەدا بوو، کە منیش وەک گەلێک، بەر چەپۆکی ڕۆژگار کەوتم. ئازاری دڵم درا. زیان لە دەرامەتم کەوت. کەوتمە تەنگ و چەڵەمەی گرتن و تەفر و تووناکردن و ئازاردانەوە... فەرمانبەری خراپ، کە لە خاکی کوردەواریدا کنەیان دەکرد، ناوەندی (فەرمانڕەوایی)[1] و (کوردەواری)یان تێکدا!... نە داد و هاوار، نە تکا و پاڕانەوە، نە ڕاوێژ و گفتوگۆ... هیچێک لەمانە نەیتوانی ناوەندی فەرمانڕەوایی و گەل ڕێک بخاتەوە! داخەکەم دواڕۆژی هەردوو لا کەوتە دەست گوللە و ڕۆژگار...

لەم کاتەدا بوو کە من لە شارەوانیی سلێمانی جوێ بوومەوە. خزم و دۆست و ئاشناکانم بەسەریێوە دی. لە فەرمانبەرەکانی شارەوانییش ماڵئاواییم کرد. لە گفتوگۆیانەوە هەستم پێ کرد. لە جوێ بوونەوەم دڵ شکاون... لەگەڵ ئەوەیشدا لە چاو بەدکرداری ڕۆژگاردا، ئەم گوێزانەوە و، فەرمانی تازەیەمیان بەباش دەزانی، پیرۆزباییان لێ دەکردم! پێش ئەوەی قسەکەم ببڕێنمەوە، پێویستە پێی لێ بنێم کە من لە بابەت ڕابواردنی تایبەتی و گوزەرانی خۆمەوە زۆر خۆشم ڕادەبوارد!... ئەمە ڕاستە تا هەشت مانگێک، لەبەر بێ جێگایی ئەو خانووەی بەکرێ تێیدا بووم، هەروەها بەهۆی نەخۆشی دایکمەوە و، ئازار و هاوار و گەڕ و گێچەڵیەوە لەگەڵ خاو و خێزان و خزمدا کە نزیکەی دوو ساڵ بوو پێوەی دەتلامەوە... پاش ئەوە بەهۆی مردنی دایکمەوە کە زۆر گریاندمی بۆ ژینی و مردنی... ئەمە ڕاستە بەهۆی ئەم شتانەوە گەلێک کات بەدڵتەنگی و کزی و بێ دەسەڵاتییەوە گوزەرانم دەکرد، بەڵکو ژیانم وا لێ تاریک بووبوو، جاروبار بیرم لە کوشتنی خۆم دەکردەوە. ئەمانە ڕاستن... بەڵام لەوە بەولاوە، بەمیوانداری و سەیران و، گەشتوگوزار و ئاهەنگ و زەماوەند و سینەما و خوێندنەوە و، ڕادیۆ و ژیانی خێزانییەوە: شەو و ئێواران و ڕۆژانی پشووم ڕادەبوارد.

بێجگە لەوە، خۆشبەختانە، توانیم کوڕەکەم، (شێرکۆ)، خوێندنگای دووەمین پێ تەواو بکەم. شێرکۆم دی بەڕووسووری و سەرفرازییەوە، ڕەوا نەکرا بۆ خوێندن، بۆ (چیکۆسلۆفاکیا)، لەسەر ئەرکی فەرمانڕەوایی... پڕ بەدڵی خۆم، خانوویەکی نایابم دروست کرد لە جێگەیەکی ئاوازەدا. بەسەروەت و سەربەستییەوە، بەدڵخۆشییەوە لەگەڵ خێزاندا تێیدا دەحەسامەوە توانیم خانووەکەم، بەهەندێ کەلوپەلی جوان و ڕەنگین و نایاب بڕازێنمەوە. لەگەڵ دۆست و خزمان و هاودڵ و دەروونان‌دا، بەخۆشییەوە تیاماندا ڕادەبوارد. مانگانەکەم بەرزبووەوە، دەرامەتم چاکتربوو. بەسایەی خوداوە توانیم جێگایەکی خۆشەویست و بەڕێز لە دڵی زۆربەی دانیشتووان، بەتایبەتی لە دڵی تێگەیشتووان و، نیشتمانپەروەراندا، بۆ خۆم

(١) ناوەندی فەرمانڕەوایی: دەسەڵاتی بەرزی حکوومەت لە بەغدا -مرکز الحکم-.

بکەمەوە. لەسەر ئەو پێڕەوییەی لە ساڵی (١٩٥٧)دا، دامنابوو، بۆ دواڕۆژم: توانیم جێگا خۆش بکەم بۆ دواڕۆژێکی نزیک، کە واز لە فەرمانی فەرمانڕەوایی بهێنم، بەو مەبەستەی هەموو کاتێکم و هەموو هەوڵ و تەقەللایەکم تەرخان بکەم بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و هونەر و وێژە لەناو (کوردەواری)دا، لە ڕێگای چاپکردنی نووسراو و، بڵاوکردنەوەی وتار، لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا و، خوێندنەوەی وتارەوە لە کۆڕەکاندا...

جیابوومەوە... سلێمانیم سپارد بەخودا... لێشی پاڕامەوە، کە بەزوویەکی زوو بمگەڕێنێتەوە بۆ سلێمانی، بۆ ئەوەی واز لە فەرمانی فەرمانڕەوایی بهێنم و، ئەو ژینە پەسندە ڕابیوێرم[1].

## بەغدا (١٩٦١/١٢/٢٥ - ١٩٦٤/٦/١٣)

هەرچەندە ژیانی پڕ ئەرک و ئازاری بەغدام لە پێشدا پێ ناخۆش بوو، بەڵام وردە وردە خۆم پێوە ڕاهێنا، تا وام لێ هات نە باکی گەرماکەی هاوینیم بوو، نە باکی سەرماکەی زستانی، نە باکی هاتوچۆ دوور و درێژەکانی، کە بەخۆڕایی کات و پارەیەکی زۆریان لە دەست پیاو دەدا. من هەرچەندە لە شێوەی ژیانی دانیشتووانی ئەوێش دڵشاد نەبووم، بەڵام دام و دەسگایەکی وام بۆ خۆم دامەزراند، کە لەو زیان و تەنگوچەڵەمانەیش تا ئەندازەیەکی گەورە ڕزگارم بوو. خودایش وای کرد: لە یەکەم ساڵ و بەشێکی تری ساڵی دواییدا، پەیتا پەیتا سەرکەوتن و پێشکەوتن و خۆشگوزەرانیم دەهاتە ڕێ، بۆ وێنە ژیانێکی پڕ لە خزمایەتی و کوردایەتیم تێدا ڕابوارد، کە پڕی بوو لە خۆشەویستی و ڕێزگرتن و یارمەتی. گەلێک ئاهەنگ و گەلێک سەیران و گەلێک بابەتی تری خۆش ڕابواردنم تێدا چێشت، کە لەمانە خێزانەکەم لە زۆربەیاندا بەشداربوو. لە هەندێ جاری تریشدا لەگەڵ خزمەکان یاخود هاوڕێ خۆشەویستەکانمدا، کاتی خۆش خۆشمان دەبردە سەر. بەکورتی ژیانێکی ڕێکوپێکی ئاوازە و نایاب و ڕازاوەم ڕادەبوارد. هەر لەم ماوەیەدا بوو کە کردیانم بەسەرۆکی لیژنەیەک بۆ دانانی (خوێندنەوە - القراءة)یەکی نوێ بەزمانی کوردی بۆ ئەوانەی دەیانەوێ کوردی فێربن. هەروەها کردیانم بەمامۆستایەک لە (زانکۆی بەغدا) کە لە زانستگای وێژەدا، لە (بەشی کوردی)یەکەیدا (ڕێزمان) و (زانستی زمان) و (نرخی وێژەیی) و (وێژەی کوردی)م دەگوتەوە. من دڵم بەم زانستگایە زۆر خۆش بوو. شاگردەکانم بەکوڕ و کچی خۆم دەزانی. هەریەکەیان (شێرکۆ)یەک بوون بۆ من دڵم زۆر پێیان دەکرایەوە، چاوم زۆر پێیان دەگەشایەوە. بووبوونە هاوڕێی خەباتم. بەڵام داخەکەم ئەم خۆشییە هەر هەتا پاییزی ساڵی ١٩٦٣ ژیا. ئیتر لەوە بەدواوە بەهۆی تەڵەکەبازی دوژمنانی کوردەوە، کە کوردی خۆشنەیان تێدابوو، (بەشی کوردی)یەکەمان کەوتە مەترسی لەناوچوونەوە! بەرەنج و تەقەلایەکی زۆری من و چەند کەسێکی تر ئینجا ڕزگار کرا. بەڵام وەک پێشووی خۆی نەمایەوە. بەنوشوستییەوە گوێزرایەوە بۆ (پەیمانگای زمان = معهد اللغات)، کە ئیتر بەجارێ دڵم لێی هەڵکەندرا و، پاش ساڵێک لە کۆڵ خۆمم کردەوە. ئەو کاتە ڕۆژی ١٩٦٤/٦/١٣ بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا، زانستگاکە بۆ من جێگایەک بوو، بۆ دەربڕینی بیروباوەڕ و، بڵاوکردنەوەی گیانی

(١) تا ئەم بەشەی نووسراوەکەم، لە ناوەند ١٩٦١/١٢/٢٥ و ١٩٦٢/١/١٧دا نووسراوە. (ش. ف)

کوردایەتی بەناو شاگردەکاندا. ئەگەر تەڵەکەبازی هەندێ مامۆستا و چەواشەکردنی هەندێ خوێندکار لە ئارادا نەبووایە، کە هەموو دەم بەهۆی ئەوانەوە بەشە کوردییەکەمان پڕ بووبوو لە ئاژاوە و کەمتەرخەمی و ناپاکی و پووچکردنەوەی خوێندەواری، نیازم وابوو تا چەند ساڵێکی تریش لەوێدا بمێنمەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا توانیم دڵی گەلێک مامۆستا و خوێندکارە باشەکان بەخۆمەوە بنووسێنم. ئێستایش کە یەکتر دەبینینەوە، چاومان بەیەکتر دەگەشێتەوە...

هەرچی فەرمانەکەی خۆیشم بوو لە کاربەدەستی کاروباری ناوخۆی (وزارة الداخلیة)دا سوپاس بۆ خودا، تا ڕۆژی ١٩٦٣/٢/١٠ بەجوانی و ئاسانییەوە بۆم دەبرایە سەر. خۆشەویستییەکی گەرم لە ناوەند من و سەرۆکەکانغدا هەبوو. جێگای باوەڕیان بووم. بەڵام لەناکاو، بێ گوناه و بێ تاوان، هەر لەبەر ئەوەی کە کورد بووم و، کوردێکی وایش بووم، کە بەدڵی ئەوان نەبووە، لە ١٩٦٣/٣/١٣دا، کردیانم بە(بێ فەرمان - متقاعد). بەڵام خودایش کە کاری دادپەروەری لە جیهاندا، بەپەنجەی ئەو هەڵدەسووڕێ، نەیهێشت ئەو کاربەدەستە خراپە لە زۆرداریدا زۆر بمێنێتەوە، لە پاش نۆ مانگ سەر ئەنگرتی کرد. نەک هەر ئەمە ڕیسوا و تەفروتوونایشی کرد![1] بەڵام من دەمێک بوو ئەم ڕۆژەم، بۆ خۆم، دەهاتە بەرچاو. لەبەر ئەوە هەر لە ساڵی (١٩٥٧)ەوە خۆم بۆ ئامادەکردبوو!... نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو ئاواتیشم بۆ ئەم ڕۆژە دەخواست! ئەی من نەبووم کە دوو جار لە ساڵی (١٩٦٠) و (١٩٦١)دا داوام کرد: وازم لێ بهێنن، کە لە فەرمانی فەرمانڕەوایی خۆم دەربهێنم؟! لەبەر ئەوە کە فەرمانی لە فەرمان دەرهێنانەکەیان دامێ، خۆم نەشڵەژاند، کەسم لەلا نەبوو، هەڵسام و سێ جار فەرمانەکەم ماچ کرد و سوپاسی خودایشم کرد، کە بێ وەی بەو ڕۆژە خۆشەی گەیاندم!... هەر ئەو ڕۆژە، بڕیارم دا، کە نەهێڵم ئەم جەژنی ئازادییەم، بەفیڕۆ لە دەست بڕوات. هەتا دەمێنم وەک جەژنێک، سەیری ڕۆژانی پاشماوەی ژیانم بکەم. تا دەتوانم بەخۆشییەوە بژیم. هەر بەوەندەیش واز نەهێنم، خۆشی بۆ کەسانی تریش پێک بهێنم. هەرچەندە جاروبار کسپەیەک لە جگەرمەوە دەهات، کە بەو جۆرە زۆر و ستەمیان لەگەڵ کردم و، بەناڕەوا لە فەرمانی میری دەریان هێنابووم. هەرچەندە هەستم بەنامەردی و نالەباری و سپڵەیی گەلێک کەس دەکرد و، بەڕوویەکی ساردەوە لەگەڵمدا ڕەوشتیان دەکرد و، لا تریسکە لێم ڕادەوەستان و، بەلابردنەکەم تووکەی سمێڵیان دەهات، بەڵام خۆم نەژاکاند، بەڵکو خێزانی خۆیشم خستە سەر ئەو بیروباوەڕەی کە دەبێ تا دەمێنین سەربەرزانە و مەردانە و بەکامەرانییەوە بژین... دەبێ سەربەست بژین... خودناسان بژین... دەبێ خەمی خۆش ڕابواردنی خۆیشمان هەبێ و، خەمی دڵخۆشکردن و بەکەڵک هاتنی کەسانی تر و، نەتەوەییشمان هەبێ... خۆ ئێمە ماوین و نەمردووین تا لە ڕاژە (خزمەت) پێشکەش کردن بکەوین؟ بۆ چ هەر فەرمانی فەرمانڕەواییە کە فەڕەبەخش بێ بۆ خۆمان و بۆ هەمووان؟! هەروەها باوەڕم هێنا، کە

(١) لێرەدا مەسەلە تەفروتووناکردنی تەنیا ئەو کاربەدەستە زۆرداری ١٩٦٣ نییە کە زیانی گیانی و ماڵی و دەروونی بەسەدانی وەک مامۆستا گەیاندووە -وەزیری ناوخۆی ئەو کاتە-، بەڵکو ئەو ڕژێمە خوێناوییە بوو کە لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣دا چارەنووسی وڵاتی کەوتە دەست و سەرەنجامیش هەر خۆیان یەکتریان سەرەونگوم کرد.

ڕۆژی جیابوونەوەم لە فەرمانی میری بەلەدایکبوونێک دابنێم بۆ خۆم! ئەوەندە هەیە من منداڵێکی وام کە تەمەنم پەنجا ساڵ بێ! کەواتە باشتر دەتوانم لە منداڵێتییەکەی جارانم خۆشی لە ژیانم ببینم. چونکە جیهانم بینیوە و چاکتریش لە ژیان شارەزام! کەواتە بۆ ئەم ڕۆژە نەکەم بەجەژن؟! ئەی پاشماوەی ژیانیشم بۆ چ نەکەم بەجەژن؟! کە ئەم گفتوگۆیانەم لەگەڵ خۆم و خێزانم و کەسوکار و دۆست و یاردا دەکرد، تاسەیەکی شادمانی و سەربەرزی بەدڵمدا دەهات... بەرەبەرە خۆشی سەربەستی و ئازادی تازە دەستکەوتووم لەبەرچاودا بەرجەستە دەبوو... جاروبارێک ئەبێ نامەردی و بێ باری و سپڵەیی هەندێ کەسان کە ڕوویان لێ وەردەگێڕا، دڵی دەشکاندم و، کۆستکەوتوویی خۆمم بیر دەکەوتەوە، ئیتر پاشماوەی کاتەکانم بەلەش سووکی و چالاکی و ئارامی دڵ و گیانەوە ڕادەبوارد!

ئەی ئەوە من نەبووم کە لە ساڵی ١٩٥٧دا بڕیارم دا لە ساڵی ١٩٦١دا خۆم لە دەست فەرمانڕەوایی میری ڕزگار بکەم؟! من ناڵێم فەرمانبەری میری خراپە... بەڵام کە فەرمانبەر هەستی کرد زۆرداریی لە ئارادا هەیە و، کەس دادی ناپرسێ، لە گیانی خۆی وەڕس دەبێ... بەڵام ئەگەر دادپەروەری لە ئارادا هەبێ، فەرمانبەری میری لێی چاکتر نییە، چ بۆ تاک و چ بۆ نەتەوە.

هەر ئەو ڕۆژەی فەرمانی جیابوونەوەکەم وەرگرت لە فەرمانبەری میری، بۆ ئێواری کردم بەئاهەنگ و زەماوەندێکی خێزانی... ڕووم کردە خودا و داوای ڕێگاپیشاندانم لێ کرد، بۆ گوزەرانی پاشماوەی ژیانم... وەرامی خودایی درایەوە. سوپاسم کرد. ڕاست و ڕەوان و سووک و ئاسان بوو... پڕ مژدە هاتە بەرگوێم... پەیڕەویم کرد و پێی بووژامەوە!. هەر هاوینی ئەو ساڵە چێشکەی سەربەستی نوێی خۆمم کرد. گەشتێکی خۆشی دوو مانگێکم کرد بۆ کۆمەڵێک لە شارە گەورەکانی جیهانی پێشکەوتوو... (لەندەن) و (پاریس) و (ڕۆما) و (ئەتینا) و (ڤیانە) و (ئامستردام) و (فرانکفۆرت) و (مۆنیخ) و (زۆریخ) و (ئەستەمبۆڵ) و (بەیروت) و (شام)م دی... تێیاندا ڕامبوارد... پڕ بەسییەکانم گزەبا فێنکەکەی ئازادییم هەناسەدا... پڕ بەچاوەکانیشم بەرهەمی شارستانێتی و پێشکەوتوویی جیهانم دی...

## پاریس[1]

لە ١٩٦٣/٨/٨دا بەفڕۆکە گەیشتمە پاریس، باران ئەباری، ساردبوو.

لە ١٩٦٣/٨/٩دا چوومە (ناوازەگاهی لۆڤەر) و (کەنشتەی سانت لویس)... زۆر وێنەی مێژوویی و ساختمان و پەیکەر و نووسراوی زۆر کۆنم دی لە هەردووکیاندا.

پاش بوو دوو هاوڕێی ئەمەریکاییم بۆ پەیدا بوو، برا و خوشکێک بوون. یارمەتییان زۆر دام لە دۆزینەوەی جێگاکاندا... زۆر دڵیان خۆش کردم. دڵم بەوێنە و نیگارەکان زۆر کرایەوە، ناوازەبوون.

لە ١٩٦٣/٨/١٠دا بەئۆتۆمبیل، لەگەڵ ٣٠-٤٠ کەسێکدا چووم بۆ گەڕان بەناو شاری پاریسدا، جێگا بەناوبانگەکانیمان پیشاندایین؛ لەوانە (قوللەی ئیڤل) و (کەنیشتەی نۆتردام) و (گۆڕستانی ناپلیۆن و جەنەراڵە بەناوبانگەکانی فەرەنسە) و (گەڕەکی شانزیلیزیە) و (هەندێ لە باخە گەورەکان و ڕووباری سین و ناو بازاڕی دوگال).

لە تەنیشتمەوە ئافرەتێکی جوان و نازەنین و ڕووخۆشی ئینگلیزی (ئەمەریکایی) دانیشتبوو، تا گەشتەکەمان تەواو کرد بووە هاودەمم.

فەرەنسییەکان هەرچەندە لە ئینگلیزەکان دڵتەڕترن و جوانی دەپەرستن، بەڵام چونکە (هەست) بەرێوەیان دەبات، زۆر جار دڵ دەشکێنن، لەم کاتەدا، وەک هەستم پێ کرد حەز لە ئینگلیزەکان ناکەن، لەبەر ئەوە هەرچی بەئینگلیزیش بدوێ ڕووی نادەنێ. جاری واش هەیە دڵی بێگانە دەشکێنن.

کەچی لە لەندەن بەپێچەوانەوە، شیرینی کردبووم لەگەڵ گەشتوگوزارکەراندا لە هەموو جێیەکدا دەدی، لێرە[2] هاوڕێیەکی یۆنانیم لەگەڵدابوو، لە پاسەکەدا بەخێرایی دڵیان شکاند!

فەرەنسییەکان پوول پەرستن، لە پێناوی پارەدا واز لە هەموو خوو و ڕەوشتێکی بڵند ئەهێنن، بەکورتی کە بێگانە ئەبینن دەیانەوێ بیڕووتێننەوە. لەبەر ئەوە لە پاریسدا هەموو شتێک لە چاو شارە گەورەکانی تری ئەورووپا، گرانترە.

لە پاریسدا، بەتێکڕایی وەک شارە گەورەکانی تری ئەورووپا کە تا ئێستا چاوم پێیان کەوتووە، بایەخ بەپاک و خاوێنی زۆر ئەدەن، لەگەڵ ئەمەشا لە پیسایی سەگ و پارچەی کاغەز و جگەرە لە شەقام و شوێنە گشتییەکاندا ڕزگاریان نەبووە، ئەمە جگە لە گەڵای درەختەکانیش.. من وام دەزانی لە ئەورووپادا مێش و مێشوولە نابینم، کەچی لە هەموو جێیەک دێن.

ئەوی سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبو کە لە گەلێ چێشتخانە و دووکانی خواردەمەنیدا، گۆشت و میوە و

(١) لێرەوە: لە ١٩٦٣/٨/٨ هەتا ١٩٦٣/٨/١٩. ئەم یادداشتانە بەجیا لە دەفتەرێکی بچووکی قەبارە ٨ × ١٣سم بەناوی (یادگاری شاکر فەتاح -٢-)دا بوو، وا لێرەدا تێهەڵکێشی دەکەین بەپێی زنجیرەی باسەکان. دیارە دەفتەری ژمارە (١) کە بزرە باسی لەندەنی تێدایە.

(٢) مەبەستی هەر لە پاریسە کە تیایدا گەڕاون.

خواردەمەنی تر ناخەنە ناو شووشە بەندەوە، بۆ مێش و مەگەزی بەرەڵلا دەکەن، کە ئەمە لە شوێنێکی وەک ئەم شارە پێشکەوتووانەدا نەدەبوو ڕووی بدایە.

لە پاریس هەستم بەگەشی و دڵتەڕی و جوانیپەروەرییەکی زۆر دەکرد، بەتایبەت لە شوێنە گشتییەکانیاندا. هەروا سەربەستی، بەڵکو بەرەڵلایی لێرە زۆرترە لە چاو شارەکانی تردا. لێرە زۆرتر بایەخ بەخۆش ڕابواردن دەدەن و بازاڕی داوێنپیسی تەواو لە گەرمدایە؛ ئەمەش یەکێکە لە کەتنەکانی یاسای سەرمایەداری... ئەگین حەیف نییە ئافرەت بسووڕێتەوە بەدوای کڕیاری نابروویدا؟!

وا دیارە فەرمانڕەوایانی فەرەنسا خەمی خۆشگوزەرانیان نەخواردووە بۆ گەلەکەیان، بۆیە گرانی لە هەموو شتێکدا پاڵ ئەنێ بەنابرووی ئافرەتەوە کە خۆی هەرزان کات.

ئاسایش و ئارامی و یاسا لە پاریسدا وەک شارەکانی تر وان.

لە ١٩٦٣/٨/١١دا بەناو دارستانی (بۆلۆنی)دا گەشتێکم کرد، یەجگار دارستانێکی گەورەیە، جگە لە چەند شەقامێکی قیرتاوکراو کە بەناویدا دەڕوا. کۆڵان و ڕێچکەکانی تری هەروا وەک خۆیان هێڵراونەتەوە، لێرە ئاسایش ئەمەندە بەرپایە ئەو هەموو کورسییانەی لەملا و لەولادا کە دانراون، کەسێک نییە بیاندزێ یا دەستیان بۆ ببات. دارەکان شەنگ و شۆخن، بنیان هەموو چیمەنە، پاش ئەوەی کاتێکی تەواو بەناویدا ڕۆیشتم گۆمە درێژکۆڵە جوانەکەیم دۆزییەوە، کە لام وایە دەستکرد بێ.

گۆمەکە گەورەیە، دیوار بۆ قەراغەکانی کراوە، تەلبەندێکی ناسکیش کراوە؛ بۆ ئەوەی منداڵ نەکەوێتە ناوی، لە ناوەڕاستیشیدا دوورگەیەکی خنجیلانەی تیا دایە، بەچیمەن و گوڵزار و دارستان ڕازاوەتەوە، بەسەر گردۆڵکەکەیەوە کەپرێکی بچووکی تیایە.

گۆمەکە پڕە لە بەلەم، بۆ سواربوونی گەشتیاران کراون، جگە لە گالیسکە و عەرەبانەی ئەسپ کە لەناو دارستانەکەدا گەشتیاران دێنن و دەبات، ڕێگاکانی تەرخان کراون بۆ سواری ئەسپ و گالیسکە و ئەوانەی بەپێ پیاسە دەکەن.

لە گوێ گۆمەکەش کورسییەکی زۆر ڕیزکراوە بۆ حەسانەوە، لە پشت گۆمەکەوە جێگایەکی حەسانەوەی نایابم دۆزییەوە، خواردن و خواردنەوەیەکی چاکی تێدابوو، دەر و ژووری سپی بوو، ژوورەوەی بەجامخانە و ئاوێنە و ئاوێزە و کەلوپەلی حەسانەوەی نایاب ڕازێنرابۆوە، تەواو پاک و خاوێن بوو... ڕۆژەکەی کەوەڕۆژ بوو، سارد و سڕ... دوای ماندووبوونێکی تەواو پەنام بردە ئێرەکانێ. بەڕاستی شوێنێکی وا ڕازاوە و نایاب لەناو دارستانێکی وا شەنگ و شۆخدا کە بڕوانێ بەسەر ئەو گۆمە جوانەدا، بەسەر ئەو گوڵزار و سەیرانکەرانەدا، بەسەر مراوی و سوێنە و کۆتر و باڵندانەدا... زۆری نەبرد ماندوویەتییەکەمی لەبیر بردمەوە.

ترسی بارانم هەبوو؛ کە بڕزمەوە تەڕم کات، داواە لە خوا کرد ڕۆژ دەرخات، زۆری نەبرد ڕۆژ دەرکەوت، چاوئەندازەکان و دڵی گەشتکەرانی پڕ کرد لە ژیان و گەشی و خۆشی.

سوپاسی خوام کرد کە نزاکەی گیرا کردە و دڵمی پڕ لە کامەرانی کرد. ئەم ڕۆژە بۆ من لە ڕۆژە

تاقانەکانی ژیانم بوو، پاش سرەوت و نانخواردنێکی پوختە و خۆش گەڕانێکی ترم بەدەوری گۆمەکەدا کرد، سەیرێکی ناو ئاوەکە و چاوەندازەکانی دارستانەکەم کرد، کوڕ و کچ و ژن و پیاو خۆشییان لە خۆدانە بەر تیشکی ڕۆژەکە و گەڕانی ناو ئاوەکە و سەر سەوزە گیا و ناو دارستانەکە دەبینی، کزەبایەکی فێنکی کوێستانیش دەیبووژاندمەوە... سوپاسی خوام کرد، بەناو دارستانەکەدا بەگەڕان هاتم و دواجار بەشەمەندەفەری ژێر عەردا گەڕامەوە.

لێرەدا لە خۆم دەپرسی: ئاخۆ کەی مرۆڤایەتی فەرمانڕەوا دەبێ، تا هەموو گەلێک (وەک ئەم سەیرانکەرانەی کە خۆشی ژیان و جوانی سروشت و شارستانێتی پێشکەوتوو یەکی خستوون بێ ئەوەی بیر لە پشم و قین و بەربەرەکانی و دوژمنایەتی بکەنەوە) یەک کەوتنایە و وەک برا بەخۆشی بژیانایە، نە بەربەرەکانی ڕەگەز و ئایین و نیشتمان هبایە و نە سنووری جوێ جوێ و پارەی جوێ جوێ و زبانی جوێ جوێ و فەرمانڕەوایی جوێ جوێ و گومرگی جوێ جوێ هبایە... هەموو جیهان وەک برا ئازادانە بژیانایە؛ نە داگیرکەر هبایە و نە داگیرکراو، نە گەلی ئاغا هبایە و نە گەلی نۆکەر... هەموو جیهان لەژێر ئالای یەک فەرمانڕەواییدا بژیانایە، هەموو گەلانی جیهان بیانتوانیبا یەک زبان و یەک پوولی پۆستە و پارە و یەک نیشتمان و یەک بیروباوەڕی مرۆڤایەتی بیبردنایە بەڕێوە!؟

سەیرانکەرەکان لە هەموو خاک و ڕەگەز و ئایینێکی جیاوازیان تێدا بوو، کەچی لەم شوێنە جوانەدا بەخۆشی دەژیان، شوێنەکە ڕازاوە بوو ڕۆژەکەی نموونەیەک بوو لە دەستکردی دەستی کردگار، منێکی ئاوارە و بێ چارەی کورد زبانێکیش مافم هەبوو کە ئەم ئەندێشانەم بەکەللەدا بێت. دوورە ئەم ئاواتەم وا زوو بێتە دی.

بەڵام ئەو ڕۆژەی کە کاربەدەستانی جیهان ژیر دەبن، ئەمە بەئاسانی پێکدێ، چونکە ئەمە خەوی مرۆڤایەتییە، ئامانجی خوا و مرۆڤایەتییە هەر دەبێ بێتە دی.

١٩٦٣/٨/١٢ لێت ئاشارمەوە، لە پاریسدا بەتەنیشت جوانی و ناسکی و ڕازاوەیی شارەکەوە ئەم ناشیرینی و ئەنگی و کەموکوڕیانەشم چاو پێ کەوت... کە نەدەبوو لە شارێکی وەک پاریسدا ببینرانایە:

١- بەهۆی کورسی و مێزی چاخانەکانەوە کە لەسەر شۆستە تەسکەکانی شەقامە مەزنەکاندا دایاناون، ئەو ڕێبوارە بێشومارانە تەنیا جێیەکی تەسکیان بۆ دەمێنێتەوە کە پیا تێپەڕن.

من کە لە شارەوانی سلێمانی بووم زۆر بەرەنگاری ئەم خووە ناشرینەم دەکرد، لە پاش سێ ساڵ هەوڵدان لەگەڵ دووکاندارەکاندا داخەکەم شۆستەکان هەروەکو خۆیان مانەوە، دووکانداران لە ڕێبوارانیان داگیر دەکرد، دوایی ناچار بووم دادگایەکی تایبەتیم بۆ چارەکردنیان دامەزراند کە کەلکێکی زۆری بەخشی بەشارەوانی و شارەکە، بەڵام لە پاش جوێ بوونەوەم لە شارەوانی بەچەند مانگێک شۆستەکان وەک خۆیان لێهاتەوە!

٢- لەسەر ئەم شۆستانە خواردن و خواردنەوەم چاوپێکەوت، سەرم سوڕما لە دڵتەڕی دانیشتووەکانی کە چۆن لەسەر ئەو شۆستانە کە عەردەکەیان پڕە لە قنە جگەرە و کاغەز و وردە بابەتی ناشیرین و پیس،

بەبەرچاوی ئەو هەموو ڕێبوارانەوە لەناو ئەو قرە قری ئۆتۆمبیل و دەنگە دەنگی، ڕێبوارانەدا، ئاوا ئەو شتانە بخۆن و بخۆنەوە.

٣- من بازی بێ ئابڕووانە بەئاشکرا لەسەر شەقام و کۆڵانەکان دەکرێ و فەرمانڕەوایی گوێی ناداتێ، ئایا ڕەوشتی بڵندی کۆمەڵایەتی دەبێ وەها کەمتەرخەمی لەگەڵدا بکرێ؟

٤- لێرەش سەگ زۆر خۆشەویستە، هەرچەندە لێرە کەمترە چاوپێکەوت لە چاو شارەکانی تری ئەورووپا، بەڵام جاری وا هەیە جگە لە پیسکردنی شەقام و ڕێگاکان، تەنانەت لە چێشتخانەکانیشدا کچۆڵەی هەرزەکار، یا پیرەژنی ئێسک قورسی سەر لەقیو، بەهۆی سەگەکانیانەوە سەروتی خەڵکی تێک دەدەن، لە شارەکانی ئەورووپادا پیرەژنی وام دیوە چوار سەگی پەت کردووە و بەناو ئەو شۆسە تەنگەبەرانەدا ڕێبوارانی بێ سەروت دەکرد!

٥- لە پاریسدا، زیاتر لە شارانی تر کوێر و سواڵکەرم تیا بینی.

هەموو جار لە ڕۆژنامەکاندا دەخوێنینەوە کە ڕۆژئاواییەکان بەئێمە دەڵێن: «کێوی، دڕندە»، کاربەدەستانیش دواکەوتوویی ڕۆژهەڵاتیان دەکردە بیانوو بۆ داگیرکردنی... جارەها وێنەی سواڵکەر و شڕوپڕەکانیان پیشان دەدەن، لە نووسراو و ڕۆژنامەکانیاندا، بۆ ئەوەی پاشکەوتوویمان بخەنە ڕوو، تا بوترێ ڕۆژئاوا ڕۆژهەڵات داگیر ناکات و پێی ئەگەیەنێ!!

تێ ناگەم، لە ئەورووپادا کە ئەم کەموکوڕیانە بێ، جگە لە درۆ و دەلەسە و پوول پەرستی و زۆرداری کاربەدەستانیان؛ کە زۆر دوورن لە پێشکەوتنی ڕاستەقینە و مرۆڤایەتی ڕاستەقینەوە... ئایا ئیتر دەبێ ڕۆژئاوا ڕووی بێت داوای پێگەیاندنی ئێمە بکات یاخود داگیرکردنمان؟

لە لەندەندا و لە زۆر شاری ئەورووپادا (کۆمەڵی پاراستنی مافی گیانلەبەران) هەیە، کەچی (١٥) ملیۆن کورد لە دەست زۆرداری فەرمانڕەواکانی دەناڵێنێ و هاوار دەکات، فەرمانڕەواییەک نییە کە بەدڵ و بەگیان لای لێ بکاتەوە و دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکات.

بڕوام وایە شارستانێتی ڕۆژئاوا سەرەوخوار دەڕوات؛ چونکە بریتییە لە پوولپەرستی و دوورە لە خواپەرستی، ئەو شارستانێتییەی بەکەڵکی ئێمە بێت، ئەمە نییە، ئەوەیە کە پڕ بێ لە گیانی مرۆڤایەتی و خواپەرستی، هەوڵدات بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لە دەست هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی و زۆرداری. ئێمە هەر بەو جۆرە شارستانییەتە دەگەین؛ بەڵام داخەکەم ڕێگاکەمان هێشتا دوورە.

ئێمڕۆ کراسێکی وتوودراوم لە پۆستەوە وەرگرت کە لەلایەن پیرەژنێکی وتوودەری ئینگلیزەوە لە لەندەنەوە بۆم نێرابۆوە.

سەیر نییە ئەمەندە سەر ڕاستی و کار دروستی و مەردایەتی کە لەسەر ئەرکی خۆی بەپۆستەدا بۆم ڕەوانە کات، چونکە نەیتوانیبوو لەسەر بەڵێنەکەی خۆی لە ١٩٦٣/٨/٧دا بمداتەوە.

ئەم ئافرەتە سزای خۆیدا. چونکە نەیتوانی لە کاتی دیاریکراودا کراسەکەم بداتەوە؛ بەڕووخۆشییەکەوە گوتی: تۆ خەمت نەبێ بچۆ بۆ پاریس من بەپۆستدا بۆت دەنێرە.

لەگەڵ سەرسوڕمانێکی زۆردا، بەڕاستی دڵم بەم کردەوە جوانە گەشایەوە، لە دڵەوە سوپاسێکی گەرمم

بۆ ئەو ئافرەتە ڕووسوورە ڕەوانە کرد. ئێمڕۆ ئێواری[1] چوومە کن (د. کامەران عالی بەدرخان)[2] کە لە دەمێکەوەیە لە پاریسە، دەمێکیشە سەرکردەیی نەتەوەی بزووتنەوەی ویژەیی کوردی دەکات، هەموو دەمێکیش لە خەبات و تێکۆشاندایە بۆ چارەکردنی گیروگرفتە سیاسییەکانی کوردستان.

زۆر بەڕووخۆشی و نەژادییەوە برمییە ماڵەوە.

د. کامەران هەرچەندە تەمەنی لە شەست ساڵان تێپەڕیوە بەڵام هێشتا ئێسک سووکی و زرنگی و هەڕەتی لاوێکی نیشتمانپەروەری تیا دەبینرێ.

بەچاوپێکەوتنەکەم زۆر دڵخۆش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەیدەناسیم، کە خۆمم پێ ناساند دڵی خۆی بۆ کردمەوە، هەموو ڕازێکی بەئاشکرا پێ گوتم، زۆری پێ نەچوو ژنێکی شەنگ و شۆخی گەش و جوانی هاتە ژوورەوە: چایەکی خستە بەردەمم.

د. کامەران گوتی: ئەمە ژنمە.

دەستی گوشیم و بەڕووخۆشی و پەرۆشییەکی زۆرەوە هەواڵی کوردستانی لێ پرسیم. د. کامەران و ژنەکەی (کە پۆڵەندییە) یەکتریان زۆر خۆش دەوێ، بۆیە خۆشەویستی کوردەواریش لە کامەرانەوە پەڕیوەتە ناو دڵی ژنەکەیەوە...

ژنەکەی گوتی: من هەموو ڕۆژێ لە خوا دەپاڕێمەوە کە کوردستان بگاتە ئاواتی خۆی.

پێم گوت: کامەران بەگ لە جێی باوکی هەموو کوردێکە، تۆش دایکی هەموومانی.

چەند وشەیەکی کوردی کە لە کامەرانەوە فێر بووبوو بۆ دڵخۆشی کردنی من لە دەمی هاتە دەرێ، دوای تاوێک بەجێی هێشتین.

لە قسەکانی د. کامەرانەوە تێگەیشتم کە زۆر کەس لە ڕۆشنبیران و کاربەدەستانی ڕۆژئاوای کردۆتە دۆست و پشتیوانی کورد، گەلێک خاوەن ڕۆژنامەی فەرەنسی و ئەڵمانی و بەریتانی و ئەمریکی پشتی کورد دەگرن لە چارەسەرکردنی گیروگرفتە سیاسییەکانیدا.

گوتی: بەبرا کوردەکانم بڵێ من سەربازی ئەوانم، هەموو دەم دەمەوێ لە خەباتدا بم بۆ ئەوەی کورد بەئاواتی خۆی بگات، پار دوو جار چوومە ئەمریکا، بەم زووانەش نیازم وایە بچم بۆ بەریتانیا و ئیرلەندە و ئەمریکا، بۆ ئەوەی لەوێ چاوم بەهەندێ کاربەدەستان و ڕۆژنامەنووسەکان و ئەندامانی

(١) هەر ئێوارەی ڕۆژی ١٩٦٣/٨/١٢.

(٢) د. کامەران ئالی بەدرخان: کە لە دوای پەروازەکردنی خانەوادەکەیان بەدەستی تورکەکان لەگەڵ جەلادەتی برایدا هاتە بەرلین و لێرە هەشت ساڵ مایەوە و دکتۆرای لە زماندا هێنا، بەڵام جەلادەت لەبەر نەبوونی گەرایەوە و چوونە ناو شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران ١٩٢٥ دوایی بۆ میسر بۆ لای سووریای برای و باوکی، لێرەوە بۆ سوریا. د. کامەران لە ئەورووپا مایەوە، لە ڕیزەکانی خۆیبووندا بەردەوام لە کاردابوو، دوایی هاتە پاریس و بووە مامۆستای زانکۆ لە سۆربۆن.. پێشتر و لە جێی خۆیدا شتێکمان لە بارەی ئەو بنەماڵە تێکۆشەرەوە نووسی.

پەرلەمانەکانیان بکەوێ... لەگەڵ ڕۆشنبیرەکانیاندا تا ئێستا (٣٥) فەرمانڕەواییمان دەستکەوتووە، بەڵێنیان داوێتێ کە لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان جۆرە کۆمەکییەک بکەین، لە بابەت چارەکردنی گیروگرفتەکانی کوردستانەوە، کە لە مانگی ئەیلوولی ١٩٦٣دا گفتوگۆی لەسەر دەکرێ.

بەڵام پێویستە لەسەرمان کە هەوڵدەین ئەو ژمارەی (٣٥) فەرمانڕەواییە بگەیەنینە (٦٠) فەرمانڕەوایی، بۆ ئەوەی قسەمان سەر بگرێ... جا من بۆ ئەمە دەڕۆم، بەپێویستیشی دەزانم یەک دوو کەس لە نوێنەری گەلەکەم لەگەڵ خۆم بەرم. دوایی گوتی: ئەم کارانە بەبێ پارەیەکی زۆر بەڕێوە ناچن، بۆیە ناچاربووم کە پارچە زەوییەکی خۆم خستۆتە بارمتە (رهن)ەوە تا بتوانم ئەو سەفەرانەی پێ بکەم.

لێم پرسی: ئایا هیوات هەیە بەم زووانە کوردستان ڕزگاری ببێت لە دەست ئەم تەنگوچەڵەمەیەی کە تێیدایە؟

گوتی: هەرچەند ئەمە بەندە بەڕۆژگار و تێکۆشانی خۆمانەوە، بەڵام هیوام زۆرە کە ئەخایەنێ بەئاواتی خۆمان بگەین و بکەوینە کامەرانی و ئازادییەوە.

پرسیم: ئایا ڕاستە لە زانستگای سۆربۆن زمان و وێژەی کوردی دەڵێیتەوە.

گوتی: بەڵێ، بەس نییە زمانی کوردی لە پاریسدا ناسراوە و جێگای خۆی گرتووە... من لە سۆربۆن هەشت قوتابیم هەیە، هەر هەفتەی شەش کات -سەعات- کوردییان پێ دەخوێنم.

دەمێک بوو بەئاواتەوە بووم ئەو نیشتمانپەروەرە گەورەیە ببینم، بەڵام قەت بەبیرما نەدەهات کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕێم بکەوێتە پاریس و لێرە چاوم پێی بکەوێ... سوپاس بۆ خوا ئەو ئاواتەم هاتە دی، نزیکەی سەعات و نیوێکم لەگەڵدا بردە سەر. تا ئەمێنم خۆشی ئەم چاوپێکەوتنەم لەبیر ناچێ.

١٩٦٣/٨/١٣ ئیمڕۆ کەمەکێ نەخۆشم، وا دیارە من و کورێنیان نەوتووە، سەرما تەواو کاری لێ کردووم، کەچی پاریسی واش هەیە بەکراسێکی تەنکەوە دەگەڕێ یا بەستەنی دەخوا. لە ڕاستیدا لەوەتەی هاتوومەتە پاریس کەم ڕۆژ نەبێ، یا هەورە یان باران.

١٩٦٣/٨/١٤ ئیمڕۆ گەیشتمە (فرانکفۆرت) کە یەکێکە لە شارە بەناوبانگەکانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا، هەرچەندە نەخۆش بووم بەڵام ڕۆژەکەی خۆش بوو، ئوتێلەکەم Gloria لە جێیەکی نێزیک لە ناو بازاڕ و باخی گشتی و شوێنەکانی سەرنجڕاکێشەوە بوو، لێرەدا هەستم کرد بەدڵتەڕی و ڕێکوپێکی و جوانی (لەش و کردەوەی) ئەڵمانەکان.

پاکی و خاوێنی و جوانیم بەئاشکرا لە شەقامەکان و شوێنە گشتییەکاندا هەست پێ کرد. دڵم زۆر بەپێشکەوتوویی شارەکە گەشایەوە.

ئێوارە لە گازینۆیەکی سێ نهۆمی دانیشتم، بەر هەیوانەکەی دەیڕوانی بەسەر ڕووبار و باخچەیەکی جواندا. جوانی و خاوێنی و شەنگ و شۆخی جێگاکە دڵی پیاوی دەڕەوانەوە، دەیبووژاندەوە.

ئەم شارە جێگای کارخانە و بانکە بەناوبانگەکانی ئەڵمانیایە، ژمارەی دانیشتووانی خۆی دەدات لە ٧٠٠,٠٠٠ هەزار کەس.

هەر ئێوارە، بەو گەورەیی و شۆخییەوە پەیکەری (گۆتیە)[1]ی شاعیرم دی، ئەم پەیکەرە لە بەرامبەر چیمەن و لالەزارێکی ڕازاوەدا بوو، ئەڵمانەکان (گۆتیە) بەگەورەترین بویژ و شاعیری خۆیان دادەنێن، لە (ڤیەننا)ش هەر پەیکەری ئەو پیاوە مەزنەم دی... ئەوروپایی ڕێزی بویژ و ڕۆشنبیرەکانی خۆیان زۆر دەگرن، ئاخۆ کەی ئێمە دەگەینە ئەوان لەم ڕێزگرتنانەدا؟!

١٩٦٣/٨/٥ چوومەوە ئەو گازینۆیەی لە سەرەوە ناوم برد، ئەڵمانەکان کە گرفتاری جوانی و ڕازاوەیی و پاکوخاوێنین، بەپیر و لاو و کچ و ژنەوە لەو ناوەدا بوون.. جار جار باران دەباری، هەموو ئاسمانی تاریک دەکرد، بەڵام ڕۆژ کە دەردەکەوت جوانی ئەو چیمەن و لالەزار و دارودرەخت و گەڕان و سەیرانکەران و نانخواردن و ڕابواردنی ئەو کوڕ و کچ و پیر و جوانانەی دەردەخست... لێرەدا دوو سێ کاتێکم بەخواردن و خواردنەوەوە ڕابوارد[2]، بەڕاستی ئەو کاتانە بەخۆشترین کاتەکانی تەمەنی دادەنێم.

لە باتی پزیشک، ئەخۆشییەکەی خۆمم بەم شتە جوانانە چاک دەکردەوە.

پاش نیوەڕۆکەی لەگەڵ سێ چل گەشتیارێکدا بەناو شاری فرانکفۆرتدا گەڕاین، بردیانینە خانوو و ناوازەگاهی گۆتییە؛ بەم خانووەدا وا دیارە لە باوک و باپیریەوە بۆی ماوەتەوە، هەرچەند رووخاوە و سەرلەنوێ لەسەر هەمان نەخشەی خۆی دروست کراوەتەوە، خانووەکە چەند نهۆمێک بوو، بریتی بوو لە (٢١) ژوور، پڕ بوو لە کەلوپەلی ناو ماڵەکەی کە تەمەنیان بۆ ساڵی ١٧٤٩ دەگەڕێتەوە ودیا بگرە بەر لەو مێژووەش. سەیر ئەوەیە ئەو کورسی و مێز و دۆلاب و سۆپا و سەعات و وێنە و نووسراو و شتە سەیرانە کە ئێستاش وێنەیەکی جوان و ناوازەن، هیچیان لێنەهاتووە، هەروەک خۆیان ماونەتەوە.

گۆتیە لە خێزانێکی دەوڵەمەند بووە، کەچی بووەتە یەکە بویژی ئەڵمانیا، پاشان بووەتە وەزیر لە (ڤەیمار)، بۆیەکا ئەم هەموو کەلوپەلە جوان و سەیر و بەنرخانەی بووە... تەنیا سەعاتە زۆر گەورە و

(١) یۆهان گۆتێ: (٢٨ی ئابی ١٧٤٩- ٢٨ی ئازاری ١٨٣٢) شاعیر و نووسەر و زانا و پیاوی دەوڵەتی ئەڵمانی، بەسومبولی بیر و هەستی نەتەوەیی دادەنرێ لەلای هاونیشتمانیانی لە فرانکفۆرت لەدایک بووە، خانەوادەیەکی ڕۆشنبیر بووە، لە لایپزگ و ستراسبورگ خوێندنی قانون و مێژووی تەواو کرد، لە ١٧٧٣دا یەکەم شانۆنامەی نووسی، دوای ئەم ڕۆمانی (ئێش و ئازارەکانی ڤێرتێر). لە ١٧٧٦ دەبێتە ڕاوێژکاری دۆقی ڤایمەر، لە ١٧٨٦ گەشتی ئیتاڵیا دەکات، ١٧٩٢ بەشداری شەڕی فەرەنسا دەکات، ١٧٩٤ دۆستایەتییەکی توند پەیدا دەکات لەگەڵ نووسەری بەناوبانگ (شیللەر)، ١٨٠٤ بەوەزیفە دەچێتە کۆشکی قەیسەر و پلەی ڕاوێژکاری دەدرێتێ، ١٨٠٨ گۆتێ و ناپلیۆن لە شاری (ئێرفۆرت) چاویان بەیەکتر دەکەوێ داوەتی پاریسی دەکات، ١٨١٣ لەگەڵ ئەلکسەندەری یەکەم، قەیسەری رووس یەکتر دەبینن، ١٨١٥ لە کۆنگرەی ڤیان گۆتێ دەبێتە وەزیری دەوڵەت، لە ١٨١٦ کریستیانای خێزانی دەمرێ، ١٨٣١ فاوست تەواو دەکات.. ژیانێکی پڕ لە بەرهەم و ڕووداو و کار و فەرمان و هەل بەدەستهێنان بۆ خۆشەویستی و چاوڕراو بۆ ئافرەتی شۆخو ئیلهامبەخش، لەمەدا گۆتێ کەمی نەکرد.

(٢) وەک دەزانین ماموستا مەبەستی لە (خواردنەوە) کهول و بیرە نەبووە، چونکە بەدرێژایی تەمەنی بەلای ئەو جۆرە خواردنەوانەدا نەچووە.

بالابەرزەکەی ئەمڕۆ بیفرۆشن، ملیۆن دینار زۆرتر دەکات چونکە تایبەتە و وێنەی نییە.

پاشان چووینە باخێکی گەورە و زۆر ناوازە و ڕازاوە و جوان Palmeugaiten لەم باخەدا دەستی مرۆڤ و دەستی سروشت زۆر بەڕەندی و شۆخ و شەنگی لەگەڵ چەند سورک و ئەستێرک و گۆم و تاڤگەیەکدا ڕەنگینیان کردبوو. ساختمانێکی گەورەش لە ناوەڕاستیدا کرابوو، بەشێکی بریتی بوو لە جامخانەیەکی زۆر گەورە کە هەمەڕەنگە گوڵ و گژوگیا و درەختی تیا پەروەردە کرابوو، باخەوانی ئەم جامخانەیە کچێکی شەنگ و شۆخ بوو.

بەشێکی تری ساختمانەکە دانرابوو بۆ چێشتخانە و چایخانە و مەیخانەیەکی زۆر گەورە، دەستەیەکی گەورەش سازلێدەر بوون کە بەناوازە خۆشەکانیانەوە دڵی پیاویان دەکردەوە.

نزیکەی هەزار کەسێک لەو باخەدا بوون، هەموو ئالا و والا و گەش، شادمانی لە ناوچەوانیان دەدرەوشایەوە، یەکێک وتی ئەم باخە تەمەنی لە دووسەد ساڵ پترە.

نیو کاتێک لێرە ماینەوە، قەشەیەکی ئەمریکاییم لە تەنیشتەوە سوار بوو، تا سێو و هەرمێکانی خوارد لای لێ نەکردمەوە، کە لێ بۆوە دەستی بەقسەکردنێکی بێشومار کرد... زۆر باش لێی گەیشتم کە لە خواناسیەوە دوورە؛ چ لە کردەوە و چ لە زانستی ئاینیدا!!، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە تەمەنی لە دەوری شەست ساڵیدا بوو، هێشتا ناوی (عێراق)ی نەبیستوو، نەیدەزانی ئاخۆ محەمەد پێغەمبەر (د.خ) نێرراوی خوایە و ئیسلامەتی کەی سەری هەڵداوە... هەر مەراقی ئەوەبوو بزانێ گاورەکانی عێراق چەند کەسن...!! باش بوو خۆم لە دەست ڕاپسکان ئەگینا سەیرانی ئەو باخە خۆشەی لە دەست دەدام.

پاش ئەو دوو شوێنە، بەناو شەقامە گرنگەکاندا گەڕاین، لە دوورەوە (هۆڵی شار) و (پەرلەمانی کۆن) و هەندێ کەنیشتەی بەناوبانگ و میوانخانە و زانستگای فرانکفۆرت و ناوچەی بازاڕ و گەلێ ساختمانی گەورەیان نیشاندایان. فرانکفۆرت بەڕاستی شارێکی پاک و جوان و ناوازەیە دڵ و گیان تیا دەحەسێتەوە.

١٩٦٣/٨/١٦ ئیمڕۆ نەخۆشییەکەم تەواو بوو، بەڵام لە بەیانیدا لە خەوێکی ناخۆش ڕاپەڕیم، تا چەند کاتێک ئاژاوەی خستە ناو دڵ و دەروونمەوە؛ وا دیارە نەخۆشییەکەم کاری کردبووە سەر دەمار (أعصاب)ەکانم. داوای شێرکۆی کوڕم کرد لە (میونیخ)ەوە، دەستم نەکەوت، ویستم پێی بڵێم کە بەیانی بەئاسماندا دەگەمە لای.

پاش تاوێک هاتمەوە سەرخۆم، جۆرە خۆشی و دڵنیاییەکی ناکا و کەوتە دڵمەوە، خۆم پێ نەگیرا، لەبەر خۆمەوە بەهەم هەم گۆرانیم دەوت، بەشەقامەکاندا دەگەڕام، لەو دووکان و بازاڕە جوانانەم دەڕوانی، دوو پارچە خشڵم بۆ ژنەکەم کڕی... دیسانەوە خەونەکەم بیر کەوتەوە، قوڵپەی گریان گەیشتە قوڕگ و چاوەکانم، بەتایبەتی کە خۆشەویستی و دڵسۆزی باڵی پێوە بنێ دڵی پیاو دەگەشێنێتەوە، سەری بڵند دەکات، بۆیە ئەم دیارییانەی بۆ دایکی شێرکۆم کڕین دڵی خۆش کردم هەستم بەبەختیاری کرد. کە ئەوەتەی لێی جیابوومەتەوە بۆ ئەورووپا هیچ ڕۆژێک نەبووە یادی نەکەم و چاکەکانی نەهێنمە بەرچاوم و

ئاوات ئەخوازم کە لەگەڵما بووایە.

ئەڵمانەکان هەرچەندە زۆری شەنگ و شۆخ و جوان و زەلام و بەتەندروستن، بەڵام کەمەکێ گرژی و توندی لە دەموچاو و گفتوگۆیاندا دەبینم، گەلێکی کارگوزار و سەر ڕاست و هونەرمەندن، کە پیاو دەیانبینێ لە شێوە و سیمایاندا هەست بەسامێک دەکات بۆیە زۆر کەس بەوشک و ڕەقیان تێ دەگات.

ئەو شتانەی کە ئینگلیزەکان بەدەروون فراوانی و ڕووخۆشی و پێکەنینەوە چارەی دەکەن، ئەڵمانەکان بەتووڕەییەوە بەرامبەری دەکەن، لەبەر ئەوە دەتوانم بڵێم: ئینگلیزەکان بۆ (سیاسەت) و ئەڵمانەکان بۆ (سەربازی) ئافریدەکراون.

ئینگلیزەکان لەگەڵ دۆستایەتی و دوژمنایەتی شتێکی ناوکێشیان هەیە ئەویش هەڵکردنە لەگەڵ ئەم و ئەودا، بێ ئەوەی بشڵەژێن و ماوە بدەن بەدوژمنایەتی، بەڵام وام بۆ دەردەکەوێ ئەڵمانەکان ئەو شتە ناوەنجییەیان نییە، یان دۆستایەتی دەکەن یان دوژمنایەتی.

بەکورتی ئینگلیزەکان ژیرترن، هەرچەندە ئەڵمانەکان لەلایەنی تردا بەسەر ئەواندا زاڵن، یاخود پێشیان کەوتوون وەک: دەستکرد، داهێنان، ساز و ئاواز و هونەرەکانی تر، هەروا سەربازی و جەنگاوەری... سا هەر لەبەر ئەم سروشتەیە کە ئەڵمانەکان لە سیاسەتی دەرەوەیاندا ژێرکەوتوون کەچی ئینگلیزەکان تەنانەت لە شکستیشیاندا هەر بەئەنجامی سەرکەوتنیان گەیشتوون.

ئەڵمانەکان لە ئینگلیزەکان جوانتر و کارگوزارترن، دڵتەڕ و زیرەکترن بەڵام خوێنگەرم و سادە سروشتن، ئینگلیزەکان خوێنساردترن، ژیرترن بەئارامترن.

بروام وایە گەلی کورد، لە سروشتدا لە ئەڵمانەکان دەکەن، هەرچەندە لە گەلەکانی دراوسێ خواناستر و کارگوزارتر و دڵتەڕتر و زیرەکترە، بەڵام داخەکەم خوێنگەرمی و سەرگەرمی و کەللەڕەقییەکەیان تا ماوەیەکی دوور و درێژ دووریان دەخاتەوە لە یەکگرتنی ڕاستەقینە و گەیشتن بەئامانجی هەرە گەورەیان کە سەربەستی و ئازادی و سەربەخۆییە. دەبێ لە مێژوومانەوە فێربین کە: ژیان زۆرتر پێویستی بەژیری و مەندی و جەنگاوەری ئارام هەیە، بەسەرچڵی و هەڵەشەیی و جەنگاوەری هیچمان بۆ ناچێتە سەر.

کەواتە دەبێ لە پێش هەموو شتێکا لەگەڵ خوێندنی پێویستدا، خەریکی خۆڕاهێنانیش بین بەژیری و مەندی و زرنگی و ئارامییەوە، بۆ ئەمەی هەموو گیروگرفتێکمان بەهۆش چارە بکەین، نەک بەئارەزووی دڵ کە زۆر جار بەهەڵەدا دەچێ.

***

ئێستا کە ئەم یادداشتە دەنووسم لە گازینۆیەکی ڕازاوە و پاک و جوانی فرانکفۆرتدام، ساز و ئاوازە خۆشەکانی ئەڵمانیا دڵم ڕۆشن دەکاتەوە؛ چاوئەندازی پەیکەری گۆتێش لەو باخچە ئاوازەیەوە کە لەبەر دەمیدایە... چاوەکانم ڕۆشن دەکاتەوە... ئەڵمانەکان بەبەردەممدا دێن و دەچن، ئاخۆ دەزانن کە من خەفەت بۆ کاولی ئەوان و کوردەواری پێکەوە دەخۆم؟

هەردوو لامان یەک دەردمان هەیە. ئەگەر هەڵەم کردبێ لە بیرەکانما: ئاواتی ئەم ساز و ئاواز و

جوانییانەیە، تاوانی گۆتیەی خۆیانە... کە بەھەموویان سەرخۆشیان کردم، منیان دووبارە خستۆتەوە ئاسمانی ئەندێشەوە.

---

ئێوارە چوومە ناو باخچەیەکی ڕازاوەی تروە، پەیکەری (شیللەر)[1]م بەشەنگ و شۆخییەوە دی کە وەستابوو؛ ئەمیش لە بوێژە بەناوبانگەکانی ئەڵمانیایە و هەڵدەگرێ کە ڕێزی وای لێ بگیرێ.

١٩٦٣/٨/١٧ ئیمرۆ گەیشتمە (میونیخ)، داخەکەم نە لە فرانکفۆرتەوە و نە لە میونیخەوە بەتەلەفۆن شێرکۆی کوڕم دەست نەکەوت. ناچار لە ٨/١٨دا چووم بۆ جێگاکەی، لەوێش نزیکەی دوو کات گەڕام بەڵام نەمدۆزییەوە، گوتیان لەگەڵ هاوڕێکانیدا بۆ چیکۆسلۆڤاکیا گەڕاونەتەوە[2]. هەردوو ڕۆژەکە (١٧-٨/١٨ - ٦.ب) بەداخی نەبینینی شێرکۆوە تلامەوە، هەڵەم کرد، دەبوو پێشتر بەتەلەفۆن نەبەستایە، هەر لەوێوە تەلەگرافێکم بۆ بناردایە چاکتر بوو.

جگە لەم ڕووداوە پڕ ژانە، سەرما و سۆڵە و بارانی میونیخیش لەگەڵ بای توند و ناپیاوەتی کارگێڕی Studeuten Stadt کە یارمەتی نەدام تا بەتەلەفۆن قسە لەگەڵ شێرکۆ بکەم وە بەڵێنەکەشی بۆ تەلەفۆنی ئێوارەش بەدرۆ دەرچوو... لەگەڵ داخستنی دووکان و بازاڕ بەهۆی پاشنیوەڕۆی شەممە و ڕۆژی یەکشەممەوە... ئەمانە هەمووی ئەمەندە دڵمیان هێنایە ژان، دوو سێ جار هەستی باوکایەتیم جووڵا و وروژا... کەوتمە گریان.

چ لە لەندەن و چ لێرەوە دوو نامەم نارد بۆ شێرکۆ؛ کە لە میونیخ چاوەڕێم بکات، وا دیارە یان نامەکانی پێ نەگەیشتووە یاخود پێی گەیشتووە و ناچار بووە بڕواتەوە، کە فەرمانەکەیان لە میونیخ لە ١٩٦٣/٨/١٥دا تەواو بووە.

بەهەموو ڕەنگ، دووربینیم بکردایە بەم شێوەیە ڕەنجەڕۆ نەدەبووم لە بینینی شێرکۆدا؛ جا نازانم تاوانی شێرکۆش لە چ ئەندازەیەک دایە کە لە دوای کۆنگرەکەیان بۆ چ دوو ڕۆژ ئارامی نەگرت تا باوکی ببینێ؟!

لەم دوو ڕۆژەدا هەندێ جێگا گەڕام، وەک: باخچەی ماکسیمیلیان، پەیکەری گۆتییە، باخی گشتی هۆف، ناوازەگاهی ڕۆژهەڵات و هیندییە سوورەکان، هەواری قوتابیانی زانستگای مونیخ.

مونیخ شارێکی گەورەیە، نزیکەی ملیۆنێک و دوو سەد هەزار کەسی تیا دەژی... لە ئۆتۆمبیلچیەکەم پرسی: ئەڵمانەکان لە بارەی شۆڕشی کوردستانەوە چی دەڵێن؟

(١) شیللەر: (١٧٥٩ - ١٨٠٥) شاعیر و نووسەر و مێژوونووسی بەناوبانگی ئەڵمانی، شیعرەکانی نموونەی خەم و کوێرەوەری ژیانێکی پڕ لە ناسۆرن، مێژوونامەی (شەڕی سی ساڵە)ی نووسیوەتەوە، (دارجگەرەکەی تیل) یەکێکە لە نووسینە جوانەکانی. هاوڕێی گۆتێ بووە.

(٢) د. شێرکۆی کوڕی پێی وتم کە بەر لەو مێژووە ئەوان بۆ کۆنگرەی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا هاتبوونە میونیخ و ئاگای لەوە نەبووە کە باوکی دێتە ئەوێ.

گوتی: ئێمە نامانەوێ لەم بارەیەوە هیچ بیروباوەڕێک نیشان بدەین، هەر ئەوەندەیە لە ڕۆژنامەکانماندا جاروبار دەنگوباسی شۆڕشی کوردەکان و کۆنگرەی شاگردە کوردەکان دەخوێنینەوە.

ئێرەش وەک فرانکفۆرت ڕازاوە و پاک و دڵتەڕە، بەڵام ئەو سەرمایەی لێرە دیومە مەگەر لە هەرە ڕۆژی ساردی زستانی کوردستاندا دیبێتم... دڵم هەر لای شێرکۆ بوو، گوتم تۆ بڵێی خوا ئەوم بۆ بنێرێ و جەژنم بێ بەدوو جەژن؟! داخەکەم ئەمە ڕووی نەدا.

١٩٦٣/٨/١٩ پوولپەرستی لە ئەورووپادا گەیشتۆتە ڕادەیەک لە جێگا گشتی و هەندێ جێی تایبەتیشدا، لەوانە پارە ئەستێنن کە بۆ خۆپاککردنەوە دەچن بۆ پێشاوەکان... پیاوێ یا ژنێ لەبەر دەرکی پێشاوەکەدا وەستاوە و پارە وەردەگرێ، ئەمە لە پاشماوەی کردەوەکانی زۆرداییە کە لە خۆپەرستی کاربەدەستاندا تەماشای مافی مرۆڤ نەکراوە ویستراوە گەل بڕوتێننەوە تا هەرچۆنێ بێ پارە گردکەنەوە؛ بۆ بەزم و ڕەزم و شەڕوشۆڕەکانیان... بۆ خۆنواندن و کەش و فش، ئەمانە چ باکیانە کە نەهێڵن هەژارێکی بێ پارە فەرمانی تەندروستی خۆی بەجێ بهێنێ لەناو ئەو پێشاوانەی بەپارەی گەل کراون.

من لەو دەروون و دڵە تێناگەم کە شتی وا ناڕەوا دەدۆزێتەوە بۆ ڕووتاندنەوەی گەل!، فەرمانڕەواکانی ئەورووپا بەملیۆن و بەملیار پارە بەخت دەکەن لە دروستکردنی شەڕوشۆڕ و چەکی جەنگا کە هەموویان کاولکەری جیهانن... کەچی بەزۆری دەزانن یەکێک فەرمانی تەندروستی خۆی بەبێ پارە لە پێشاوێکی بەجگار کەم نرخی فەرمانڕەواییدا بەجێ بهێنێ.

ئەمەتا پێشکەوتنی ڕۆژئاوا، دروستکردنی مانگ و بۆمبای ئەتۆمی لە کوێ و باج سەندن لە تەنگەتاوان لە کوێ؟!

تکا لە خوێندەوارانی خۆشەویست دەکەم کە ببەخشن لە درێژەپێدان بەم بابەتە ناخۆشە ناشرینە، لێرەدا تەنیا مەبەستم ئەم بابەتە خۆی نییە، مەبەستم چرووکی بنچینەی سەرمایەداری ڕۆژئاوا و زۆرداری شارستانییەتی... خستنەڕووی ئەمەیە لە بارەی (مافی مرۆڤایەتی)یەوە. گوتراوە (مشتێ نموونەی خەرواریکە) منیش دەڵێم: ئەم کردەوە نەنگە نموونەی گەلێک کردەوەکانی تری ڕۆژئاواییەکانە. دەبێ یاسایەکی تر بدۆزرێتەوە، دووربێ لە پوولپەرستی و خۆپەرستی یاسای سەرمایەداری، هەروا دووریش بێ لە زۆرداری دیکتاتۆرییەتی یاسای (هاوبەشی - إشتراکیة) کە مرۆڤ وەک کەلوپەلێک سەیر دەکات؛ نە بیروباوەڕی بۆ دەهێڵێتەوە نە سەربەستی، نە سروەت نە ئارامی دڵ، چونکە هەر یاسایەک بێ ئەگەر لەسەر بنچینەی مرۆڤایەتی و خواناسی و ڕاستیپەرستی و کردەوەی مەردانە دانەمەزرێ، نەک بەکەڵکی کوردەواری بەڵکو هەموو دانیشتووانی جیهانیش نایەت.

سارد و سڕی ئەمڕۆ هەموو کەسێکی خستۆتە کونەوە، مونیخییەکان خۆشیان پێی لێ دەنێن کە ئەمە سەرمایەکی ناکاوە، ئێستاکە کاتی ئەم سەرمایە نییە، دەبوو گەرم بووایە.

ئیمڕۆ هەندێ لە مونیخییەکانم تاقی کردەوە، لە زۆریانەوە گیانی یارمەتی و ڕووخۆشی و کردەوەی شیرنم دی، ڕاستییان گوتووە کە هیچ بێشەیەک بێ شێر نابێ.

ئێوارە ڕۆژ دەرکەوت و بایەکەی کزبوو، گەشاوەیی کەوتە دڵەوە، بەناو بازاڕێکی گەورەدا گەڕام، سەرنجم دا هەموو شتێک گرانە لە توانای زۆر کەسدا نییە یا ناکڕێ.

لە ئۆتۆمبیلچییەکم پرسی مانگی چەندت دەست دەکەوێ؟

گوتی: نزیکەی (٦٠) پاوەنی ئینگلیزی.

پرسیم: خانووی خۆتت هەیە؟

گوتی: نا، لە کرێ دانیشتووم.

پرسیم: چۆن بەم پارە کەمە و خۆت و حەوت هەشت سەر خێزانەوە، گوزەران دەکەیت؟

گوتی: ئەگەر هەر مووچەکەی خۆم بووایە مەمرەومەژی پێی دەژیاین، بەڵام چونکی ژنەکەشم و هەندێ لە منداڵەکانیشم کار دەکەن، دەتوانین چاکتر بژین، دەتوانین تەلەفزیۆن و گرامەفۆن و هەندێ بەرگ و پۆشەنی باش و کەلوپەلی ناو ماڵ بکڕین.

ئۆتۆمبیلچییەکە زۆر پاک و ڕووخۆش بوو، جگە لە ئەڵمانی ئینگلیزیشی زۆرباش قسە دەکرد، وریا و شارەزا بوو لە کارەساتی ناو ئەڵمانیا و جیهان، لە بارەی ئەڵمانیا و سویسرەوە گەلێ پرسیارم کرد، زۆر بەگوڕجی و ڕاستی وەرامی دەدامەوە، تەنانەت گیانی یارمەتی و پیاوەتیشم تیا دی، لە کێشەی کوردیش شارەزابوو.

داخەکەم لە لادێکاندا نەبێ، لە هیچ شارێکی کوردستاندا لە باوک بەولاوە کەس لە خێزاندا فەرمان نابینێ و نان پەیدا ناکات. بۆیە بارستایی ژیانمان زۆر نزمە، زۆربەمان زۆر بەشپرزەیی و کەساسی دەژین، لە کاتێکدا کە کچ و کوڕێکی ئەڵمانی هەم دەخوێنێ و هەم فەرمانیش دەکەن بۆ ژیانی خێزانەکەیان و کامەرانییان، دەبینی کوڕە کوردێک یا کچە کوردێک لە خوێندنەکەی بەولاوە هیچی تر ناکات، تەنانەت کە خوێندنیشی تەواو کرد دەستی یارمەتی بۆ خێزانەکەی درێژ ناکات، دیسانەوە دەست لە باوکی پان دەکاتەوە تا بیخاتە سەر مووچەکەی، ئافرەتیش هەر بەگەسک لێدانی ناو ماڵ و چێشت لێنان و جلشتن و میوان بەڕێکردن و منداڵ بەخێوکردنەوە خەریکە. لە زیندانی ناو ماڵەکەی بەولاوە جاروبار نەبێ ماوەی بۆ نامێنێتەوە بچێتە دەرێ.

بەڵام ئافرەتی ئەڵمانی ئەک خۆی بەو شتانەوە خەریک ناکات؛ نان لە دەرەوە دەخۆن، جل لە دەرەوە دەشۆن، خانووەکەشیان بریتییە لە دوو سێ ژووری بچووک... پاککردنەوەی زۆر نابات، میوانداریشی لە چاخانە و چێشتخانەدایە، ئەگەر بکرێ.

بۆ منداڵەکانیشی دایەنگا و بەهەشتی منداڵان هەیە تا گەورە دەبن لەو جێگایانە بەخێو دەکرێن... کەواتە هەموو دەم وەک پیاو دەتوانێ بخوێنێ و لە جیهان بگات، فەرمان بینێ و پارە پەیدا کات و باش بژی.

بەڵێ، هەر گەلێک خوو بداتە خوێندن بۆ پێشخستنی نیشتمانەکەی تێ بکۆشێ، بەزانست و هونەر و کردەوەی بڵند، بارستایی ژیانی وەک ئەمانە بڵند دەبێتەوە.

بەڵام ئەوەش هەیە، چ فەرمانڕەوایی ئەڵمان و چ کۆمەڵایەتی پێشکەوتووی ئەڵمان، لە هی ئێمە ناکەن. ئەوان ئارام و ئاسایش و فەرمان و هەموو هۆی ژیانێکی گشتی بڵندیان بۆ تاک (فرد)ێکیان ئامادە کردووە، بۆیەکا وا بەسەر هەموو گیروگرفتێکی ژیانیاندا زاڵ بوون، ئەو گیروگرفتانەی ئینگلیز و ئەمریکا و ڕووسی دوژمنیان لە دوای شەڕی جیهانی دووەمەوە بۆیان دروست کردوون.

ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ئەمەندە دەوڵەمەند بووە، دەستیاو دەدات بەئەمریکا، داوای نیو ملیۆن کرێکار دەکات لە جیهان بۆ کارگەکانیان!

ئەمە ڕاستە، هێشتا لە دەست ئەو فەرمانڕەواییانە ڕزگاری نەبووە، بەڵام گەلێکی وا زیندوو، بەمەرجێ نەگەڕێتەوە سەر بیروباوەڕی نازی هیتلەری، زوو یەک دەگرێتەوە و دەشگاتەوە بەئامانجی سەربەخۆیی تەواوی خۆی.

(شێرکۆ)ی کوڕیشم لە (چیکۆسلۆڤاکیا)وە هاتە لام بۆ (ڤیانە). سێ ساڵ بوو (شێرکۆ)م نەدیبوو، چەند ڕۆژێکی پڕ شادمانیم لەگەڵ دابوو... کە تەماشام کرد گەورە بووبوو. ڕەوشت و سرووشتیشی گەشەی کردبوو. سوپاس بۆ خودا خەریکی خەباتی نیشتمانی بوو... نەک هەر دڵی (پارتی دیموکراتی کوردستان) دڵی خوێندکارەکانی هاوڕێشی بەخۆیەوە نووساندبوو... بەمانە چاوەکانم گەشانەوە... دڵ و دەروون و هۆشم بووژانەوە.

کە گەڕامەوە بەغدا وام بەچاک زانی، هەر بۆ ئەمەی (پەیمانگەی زمانی کوردی)یەکە پەکیان نەکەوێ لەسەر من، بۆ ساڵێکی تریش لە بەغدادا بمێنمەوە... مامەوە. بەڵام ئەرک و ئازارێکی زۆرم چێشت!.

لەم ماوەیەدا پێنج نووسراوم گۆڕییە سەر زمانی کوردی... بەڵام لە ١٩٦٤/٦/١٣دا لە بەغدا، بەتەواوەتی جیابوومەوە... خێزانەکەمم بەکەلوپەلی ناوماڵەوە ڕەوانە کردەوە بۆ (سلێمانی)... خۆیشم هەر ئەو ڕۆژە بەفڕۆکە چووم بۆ (تاران)... نزیکەی (١٨) ڕۆژێکم لە سەیرانگەکانی (ئێران)دا بەخۆشییەوە ڕابوارد. لە سەرەتای مانگی میوەخۆش (تەمووز)ی ١٩٦٤دا گەیشتمەوە (سلێمانی).

ئۆخەی ئاواتەکەی ١٩٦٢/١/١٧م هاتە دی: دەرگام بۆ کرایەوە، کە هەموو کاتێک و هەموو هێز و توانایییەکم تەرخان بکەم بۆ ڕاژە (خدمەت)ی (زانست) و (هونەر) و (وێژەی کوردی). ئەو دەمە نۆ مانگ بوو (پرۆژەی خوێندەواری کورد)[1] لەدایک بووبوو.

(١) ئەمە یەکەم جارە مامۆستا ناوی ئەم پرۆژەیە لە یادداشتەکانیدا دێنێ... بەمە بێ لە مانگی تشرینی دووی ١٩٦٣دا بڕیاری ئەم پرۆژەیەی داوە و بیری لێ کردۆتەوە.

کاتێ گەیشتمەوە سلێمانی، قرچەی هاوین بوو. یەکەم فەرمانی کە ڕامپەڕاند ئەوەبوو، خانووەکەم بەکرێ گرتەکە چۆڵ کرد و دەستم کرد بەچاککردنەوە و، تەڕاودان[1] و، ڕەنگکردنەوە و، ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی خۆی و باخچەکەی، بێجگە لەوە چەند دەستکارییەکم تێدا کرد، تا بوو بەخانوویەکی لە جاران جوانتر و نایابتر، بەڕەنگێکی وەها کە بەتەواوەتی دەچوو بەدڵمدا. هەروەها دەستم برد بۆ ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی ژووری جامخانەکەم کە بۆ نووسراوخانە و جێ ئارامی گیان و دڵ و هۆشم و سرەوت و نووسین و خوێندنەوەم ئامادە کردبوو. نووسراوەکانم پۆشتە کردەوە و، پوختە کردەوە و، بژار کرد. سەرلەنوێ ڕێکم خستەوە. هەندێکم لێ بەخشین بە(نووسراوخانەی گشتیی سلێمانی) کە نزیکەی (٥٠٠) پێنج سەد نووسراو و گۆڤاری گرتەوە و، نووسراودانێکیان بۆ خۆیان داگیر کرد، کە بەناوی منەوە لەوێدا دیاری کرا. هەندێکیشم لە نموونەی نووسراو و گۆڤار و ڕۆژنامە و دەستنووسی کۆن بەخشی بەنووسراوخانەکەی (ناوازەخانەی سلێمانی - متحف السليمانية)، بۆ ئەوەی ببێتە ناوکێک بۆ ناوازەخانەی نووسراوانی کوردی لە دواڕۆژدا. ئەمیش لە (٥٠٠) پێنج سەد دانەیەکی تێپەڕاند کە زۆربەیان ڕۆژنامە بوون. لە ڕاستیدا بایەخێکی زۆرم دا بەڕێکخستن و ڕازاندنەوە و پۆشتەکردنەوەی ئەم جامخانەیەم، تا وام لێ کرد، بوو بەسەرچاوەیەکی خۆشی و کامەرانی و سەربەرزی و چالاکی و بەکەڵک بۆ خۆم و (کوردەواری) هەرچی بیرەوەری و سرەوت و ئارامیێکی خۆشم بەرکەوتبێ، لەوێدا دەستم کەوتووە، چونکە هەموو ناوازەکاری و بابەتێکی خۆش ڕابواردنی خۆم لەوێدا دەدی و بیر دەکەوتەوە، هەر لە هەرەتی منداڵیمەوە تا هەرەتی پیاوەتیم. جار بەجار ئەندامانی خێزانەکەیشم بەبۆنەی شەوە پیرۆزەکانی مانگی ڕۆژووەوە لەم ژوورەدا کۆ دەکردەوە. هەر شەوە تاوێ بەشێک لەو نووسراوانەی لەسەر (زەردەشت) و (محەممەد) و (موسا) و (عیسا) و پیاوچاکەکانم نووسیبوو، بۆم دەخوێندنەوە. بەدڵخۆش بوونی ئەوان بەختیار دەبووم. ژنەکەم و کچێکی بچکۆلە کە لە ڕێی خودادا وەک کچی خۆمان بەخێومان دەکرد،[2] زۆر بەو چیرۆکە خۆشانە دڵیان خۆش دەبوو، بەدڵ گوێیان لێ دەگرت. کە لەو و لە خێزانەکەم دەپرسی: تێگەیشتن؟ دەیانگوت: بەڵێ... کەچی کە دەمگوت: دەبیگێڕنەوە پێدەکەنین و

(١) تەڕاودان یان تەڕاوکردن: زۆر جار مامۆستا ئەم وشەیەی بەکارهێناوە، کە لە ڕاستیدا (تەڕاو) بۆ خانووی گڵ دەبێ، ساڵانە یا یەک دوو ساڵ جارێ تەڕاوی دەدەن، ئەویش بەگڵەپی وەک دۆخاو شل دەگیرێتەوە و بەگسکێک یا پارچە قوماشێک دەیدەن لە دیوارەکە. لە شێوەی (ئەتر)کردنی ئەمڕۆکە بەچیمەنتۆ و لمی بێژراوە بەزبری دەکرێ. مامۆستا ئەو وشەیەی بۆ بۆیەکردنەوەی خانوو بەکارهێناوە کە زۆر گونجاو و لەبارە.

(٢) جەمیلەخانی هاوسەری لە هەینی ٢٠٠٢/٦/٧دا باسێکی دوور و درێژی ئەو کچەی بۆ گێڕامەوە. بەکورتی ئەمەیە کە: (سێ ساڵ بوو باوکی مردبوو، خوشک و برایەکی تری هەبوو، دایکەکەیان نەیدەتوانی بەخێویان کات.. خەڵکی ناوچەی ماوەت بوون، من ئەمەیانم گرتە لای خۆم و خوشک و براکەشی برانە دوو ماڵی تری خزمان، ناومان نا (ڕێزان) خستمانە قوتابخانە، زیرەک و وریا و ژیر، وەک منداڵی خۆمان خۆشمان دەویست، ڕوحمان بەسەر سەریەوە بوو، پلەی ئامادەیی تەواوکرد و لە پەیمانگەی هونەری سلێمانی وەرگیرا، کە زانکۆ=

هەرچەندیان دەکرد بەتەواوەتی بۆیان نەدەگێڕایەوە! منیش پێدەکەنیم.. گەلێک شەوی زستانمان بەو جۆرە خۆش ڕادەبوارد. جا هەر لەم ژوورەدا بوو کە (٩٥) نووسراوەکانی تریشم گۆڕییە سەر زمانی کوردی. هەندێ جاریش لە ژوورەکانی تردا، یاخود لەبەر هەیوانەکان و ناو باخچەکەماندا خەریکی گۆڕینی ئەو نووسراوانە دەبووم. کاتی فەرمانکردنی ڕۆژانەم خۆی دەدا لە چوار سات... هەندێ جاری وایش هەبوو، خۆی دەدا لە شەش سات! جاری وایش هەبوو، خەوم پێ نەدەگیرا، لە ڕۆژانی هەینی و جەژنەکانیشدا، لە شەویشدا فەرمانم دەکرد! فەرمانەکەم ئەمەندە پێ خۆش بوو، هەرچەند لە دانان یاخود پەرچڤەکردنی نووسراوێک دەبوومەوە، هەستم بەشادمانی و سەربەرزییەکی گەورە دەکرد. چونکە ئەمە ئاواتی ساڵانی ساڵم بوو. جا چونکە دەمزانی (کوردەواری)یەکەمان، پاشکەوتووە و داماوە لەسەر ئەم جۆرە نووسراوانە، هەرچەند نووسراوێکم تەواو دەکرد، هەستم بەکامەرانییەکی زۆر دەکرد. هەروەک لە خودایەوە پاداشێکی گەورەم درابێتێ وا بوو... بەرەبەرە چووە دڵمەوە: ئەم کارەی بەدەستمەوەیە کە بریتییە لە «پرۆژەی خوێندەواری کوردە»، بەرز و پیرۆزە... ڕۆژێک دێ تیشکی گەلێ و چاکە و فەری بەگشت لایەکی (کوردستان)دا پرشنگ دەدات.

***

پاش ئەوە، لە ماوەی دوو سێ ساڵێکدا کەلوپەلی ناو ژوورەکانیشم پۆشتە کردەوە و، تازە کردەوە، بەجۆرێکی وەها کە دڵیان کێش دەکردم. من خانووەکەم بۆیە وەها دەرازاندەوە، تا هەموو دەم هەست بەجوانی و بەسەروت و ئارامی دڵ و گیانم بکەم.. تا بتوانم هەموو هێز و توانایییەکم بۆ فەرمانی نوێم تەرخان بکەم. واتا بۆ ئەم کارە کە ناوم نابوو: «پرۆژەی خوێندەواری کورد»[1].

## ساڵی ١٩٦٥

ئەم ساڵەم زۆر بەخۆشی و سەرکەوتنەوە ڕابوارد. بەجۆرێکی تێکرایی پیرۆوییەکەم بەجێ هێنا:

باخچەکەی ناو ماڵم ڕێکخست و ڕازاندمەوە. قالییەک و نووسرادانێک و هەندێ بابەتی جوان و ناوازە و یادگاری گشتەکەم کڕی. مانگانەی ژنەکەم دوو دینار زیاتر کرد، چەند جارێک دیاریشم بۆ کڕی. پارەم بەشێوەوە بەسەر هەژار و لێقەوماو و داماواندا، دەستی هەندێ دۆستی دەستکورتیشم گرت بەدەستیا و پێدانیان. شەست نووسراوی خوێندنگاکانم پێشکەش بەنووسراوخانەی گشتی سلێمانی کرد.

= گوێزرایەوە ئەو بەشەی ئەوان بەر حیللە کەوت. باوکی -شاکر فەتاح- ڕازی نەبوو بەتەنیا بچێتە ئەوێ، بەفەرمانبەر دایمەزراند و دوایی داماو بەشوو، دوو کوڕی هەیە: (ڕێڤین و ڕێژین) یەکیان لە کۆلیجی پزشکییە... دوعای خێریان بۆ دەکەین).

(١) لێرەوە یادنامەی ساڵی ١٩٦٦ دێت کە لە ناو دەستنووسەکانیدا دەفتەرێکی بچووکی ٦ × ١٠سم (٤٨) لاپەڕەییم دۆزیەوە، لەوە دەچێ پەڕەکانی کۆتایی فەوتابن. چونکە تەواو نییە، دەفتەرەکە بە:چاوگێڕانێک بەساڵی ١٩٦٥دا دەست پێ دەکات و دێتە سەر کۆمەڵێ (پێڕەوی) بۆ ساڵی ئایندە کە هیوادارە تا بتوانێ جێبەجێیان بکات.. لاپەڕەکانی ئایندە لەو دەفتەرەن ١٩٦٦/٨/٢٠.

گەشتێکی زۆر خۆشم کرد بەناو تورکیادا، هەندێ شتم بۆ یادگار تێدا کڕی. لە باتی (١٢) نووسراو (٢٢) نووسرام گۆڕیە سەر زمانی کوردی، یادنامەیەکیشم لەسەر گەشتەکەی تورکیا نووسیوە. ژمارەیەکی زۆر گەورەم لە نووسراوانی گرنگ و خۆش و بەکەلک خوێندەوە. هەرچەندە هەندێ ئاژاوە کەوتە مێشک و دەروونمەوە؛ بەهۆی کردەوەی خراپی هەندێ لە خزمانەوە، بەڵام بەرامبەریان چاکەم کرد... دوایی زاڵ بووم بەسەر چارەنووسی خۆمدا و کەوتمەوە ژیانێکی پاک و پیرۆز و خۆش و بڵندەوە. ژیانی خێزانیم بڵندتر کردەوە، هەروا ژیانی کۆمەڵایەتیشم فراوانتر لێ کرد، دۆستایەتی و خزمایەتیشم بەهێزتر کرد.

هەرچەندە لەم دواییەیەدا بەهەر هۆیەکەوەبێ باری ئابووریم ڕوو لە نوشوستی بوو، بەڵام ئەمەشم چارەسەر کرد و بگرە برێ پارەشم پاشەکەوت کرد.

خوایە سوپاست دەکەم کە لە چاو باری ئاڵۆزی وڵاتدا ئەم ساڵەم وا بەخۆشی و کامەرانی بردە سەر.

## پێڕەوی[1]

١- دڵی چاک... زمانی چاک... کردەوەی چاک.

٢- ژینێکی پڕ خۆشەویستی و بەرز و پیرۆز.

٣- نواندنی خۆشەویستی بەرامبەر بەخوا و بەنەتەوە، بەرامبەر بەخێزان و خۆ، بەرامبەر بەکەسوکار و دۆست و یار.

٤- گەشتێکی خۆش بۆ جێگایەکی دوور.

٥- وەرگێڕانی دوانزە نووسروای ناوازە و گرنگ و بەکەلک بۆ سەر زمانی کوردی.

٦- کڕینی قاڵییەک و هەندێ شتی ناوازە و جوان بۆ ماڵ.

٧- ڕێکخستنی باخچەکەی ناو ماڵ و ڕازاندنەوەی.

٨- فراوانکردنی دۆستایەتی و ئاشنایەتی، بەهێزکردنیان.

٩- دەستگرتنی هەژار و داماو و لێقەوماو.

پیاوەتیکردن، مەردایەتی نواندن، تێکۆشین بۆ بڵندکردنەوەی نەتەوە و نیشتمان.. خواناسین بەڕاستی.

* خوایە یارمەتیم بدەیت ئەم بەڵێنانەم بەجێ بهێنم.

شاکر

١٩٦٦/١/١

(١) لەوە دەچێ ئەمە وەک پرۆگرامێک بۆ خۆی دانابێ تا لە ساڵی شەست و شەشدا بەپێی توانا جێبەجێیان کات.

١٩٦٦/١/١

- ئەمڕۆ بەیانی لە چاپخانەکەدا دەستم کرد بەگۆڕینی نووسراوی ژیانی (شێخ محەمەد عەبدە) بۆ کوردی.
- دوانزە پەرداخ و دۆلکەیەک و سینییەک و شەکردانێک و شەش چڵ گوڵ، وەک دیاری، کڕیم، تا بەبۆنەی خانووە تازەکەیەوە پێشکەش (تاهیر بێکەس)[1]ی بکەم.

ئەم کورە برای (فایەق بێکەس)ی بوێژە، خۆیشی بوێژە، سەرگەردانی زۆر بەسەردا هاتووە، هاوڕێی منداڵیمە، هاتوچۆم دەکات. منیش حەزم کرد بەم بۆنەیەوە دڵی خۆشکەم. چوومە سەردانی قەشەی سلێمانی بۆ جەژنە پیرۆزە. بەبۆنەی جەژنی سەری ساڵەوە، شەوی ڕابردوو ئاهەنگێکی بچووکی سادەم لە چاپخانەکەمدا ساز دا، چاوی خۆم بەبینینی (٢٣) نووسراوەکەی بەرهەمی ساڵی ١٩٦٥ ڕۆشن کردەوە. چیرۆکی ژیانی (محەممەد پێغەمبەر- د.خ) بۆ ژنەکەم و ڕێزانی کچە بچکۆلە خوێندەوە.

ساتێ بەگفتوگۆی خۆش، هەندێ بەشەوچەرە خواردنی، هەندێ بەپاڕانەوە لە خوا کە ئەمساڵی (١٩٦٦)مان لێ پیرۆز کات... هەروەک سوپاسی خوا دەکەم بۆ ژنە خۆشەکەی پارمان ئاوهاش دەپاڕێمەوە کە ئەمساڵیش، ساڵی ١٩٦٦ بەخۆشی بەسەر بەرین، نیشتمانەکەمان لە تەنگوچەڵەمە و ئاژاوە ڕزگاری بێ و بەئاسوودەیی و سەربەرزیشەوە بژین.

١٩٦٦/١/٢١

لەم مانگەدا نووسراوێکی ئایابم گۆڕیە سەر زمانی کوردی.

١٩٦٦/٣/١٢

گەشتێکی حەوت ڕۆژیم بۆ شاری بەغدا کرد، لەوێ دۆستایەتی و خزمایەتیم تازە کردەوە، چەند ڕۆژێکی زۆر خۆش و ئایابم ڕابوارد، لە هەموو لایەکەوە خۆشەویستیم هەست پێ کرد، هەندێ دیاریشم بۆ خێزانەکەم کڕی.

لە ١٩٦٦/٣/١٩دا گەڕامەوە.

(١) کاک تاهیر بێکەس (١٩١٥ - ١٩٩١/٤) فەرمانبەرێکی ئەدارای سەربەرز بوو، ژیانێکی سەختی بردە سەر، کە من ناسیم لە یەکێ ئاوەندی بووم، لە گەڕەکی شێخان بووە دراوسێمان، دوو ژنی هێنابوو، یەکەمیان مردبوو، سێ کچی لێی هەبوو: پەری کە بەگەنجی مرد، نیشتمان و شەوبۆ، لە دووەم تەنیا بەرزانی هەبوو کە بووە پزیشک و ئێستا لە وڵاتی (سوید)ە... شیعرەکانی پڕ بوون لە هەستی جوان و ئاسک بۆ خۆی وەک مرۆڤ و بۆ کورد و کوردستانەکەی، جار جار لە ژیندا بڵاوی دەکردنەوە. ئەوکاتەی مامۆستا ئەو دیاریانەی بۆ بردووە، لە گەڕەکی ئیسکان خانوویەکی تازەی وەرگرتبوو، لەوێدا مایەوە تا کۆچی دوایی کرد.

١٩٦٦/٣/٢١

بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە ئەو دیارییەم پێشکەش بەژنەکەم کرد، پارەشم بەسەر دەسوپێوەند و کچە بچکۆلەکەشدا بەشیەوە. بەبۆنەی ئەم جەژنەوە کردم بەیاسایەک بۆ خۆم کە هەموو ساڵێک دانیشم بۆ جەژنە پیرۆزە. چەند هاورێیەک هاتنە لام بۆ جەژنە پیرۆزە، زۆر خۆشم ڕابوارد.

بەهۆی ئەو چەند ڕۆژەی لە بەغدا و نەورۆزی خۆمانەوە سەردوتم و بەتەواوی حەسامەوە و بووژامەوە، خوای گەورە سوپاست دەکەم. لە برانەوەی مانگی گوڵان -مایسی ١٩٦٦دا ژمارەی ئەو نووسراوانەی گۆڕیومنەتە سەر زمانی کوردی گەیشتە ٣٠ نووسراو. لەمانگی خەرمانان- حوزەیران ١٩٦٦دا کاروباری گەشتەکەم بۆ تورکیا تەواوکرد و سازم دا.

١٩٦٦/٧/٥

لە شەمەندەفەردا بووم بۆ تورکیا و لە ٧/٨دا گەیشتمە ئەستەمبۆڵ. لەم گواستنەوەیەدا تا گەیشتمە ئەستەمبۆڵ تووشی زۆر گیروگرفت و بێ خەوی و بێ سرەوتی بووم... بەڵام بەسایەی خوای گەورەوە بەسەر هەموویاندا زاڵ بووم، خوا گەلێک کەسانی نەناسیاوی بۆ ڕەخساندم لە عەرەب و لە تورک، یارمەتیان دام بۆ ئەوەی کەلوپەل و پارەو جانتاکانم بەئاسانی دەستکەوێتەوە. لەبەرەبەیاندا گەیشتمە ئەستەمبۆڵ، بێگومان دەستکەوتنەوەی ئەو کەلوپەلانە...[1] و کورتیبیانەم نییە، کاتێکم زانی ماندوویتی و برست بڕان کارێکی زۆریان تێ کردم... تووشی هەندێ تووڕەیی و دڵ ئێشەیش بووە.

١٩٦٦/٧/٢٣

لەم ڕۆژەدا گواستمەوە بۆ دورگەی (یالاوە) بۆ بووژاندنەوە و سرەوت، بەڕاستی خۆم لە بەهەشتێکی ناو سروشتدا دەدی، دوو ڕۆژی زۆر خۆشم تیادا ڕابوارد. لە جوانی و ڕازاوەیی و پاک و خاوێنی میوانخانە و شوێنەکانی ناو دورگەکە یەجگار دڵم سردوتی پێکەوت، لەشم بەتەواوی حەسایەوە.

لێرەدا ئاواتم خواست کە خێزانەکەم لەگەڵدابووایە، لە دڵی خۆمدا بڕیارم دا ساڵێک بیهێنم بۆ ئەم بەهەشتی سروشتە. تا ئەویش لەگەڵمدا هاوبەش بێ، بەڕاستی ئەم جۆرە جێگایانە چاکترین جێگان کە پەیوەندی ناوەند ژن و مێرد خۆشتر و بەهێزتر بکەن. چونکە هەر بیرەوەرییەکی بۆ دوارۆژ لێ هەڵگرن، مایەی بەختیاریانە.

دایکی شێرکۆ ژنێکی شیرین و نازەنینە، مافی بەسەرمەوە هەیە کە بۆ ئەم جێگا پاکە خۆشانەی بهێنم، تا ئەویش لە شادمانیدا هاوبەشیم بکات.

(١) لێرەدا چەند پەڕەیەک لە دەفتەرەکە بزر بووە، دیارە یادداشتەکانی ئەستەمبۆڵی لێ فەوتاوە.

۱۹٦٦/۷/۲۵

گەیشتمە شاری (بورسە)، لێرەدا سەرەوتێکی گیانی و حەسانەوەیەکی لەشم دەستکەوت، بەڕاستی چوار ڕۆژی زۆر خۆشم تێدا ڕابوارد کە هەمدیسان لێرەشدا دایکی شێرکۆم بیرکەوتەوە، حەزم کرد لێرەشدا لەگەڵماندا بوایە.

۱۹٦٦/۷/۲۹

گەیشتمە (ئەنقەرە) پێنج ڕۆژێکی خۆشم تێدا ڕابوارد، بەڵام تێیدا نەخۆشکەوتم. باش بوو خواوراستان زوو فریای خۆم کەوتم.. لە پاش یەک دوو ڕۆژ چاک بوومەوە.

ژیانی ئەمجارەی تورکیام ئاسانتر بۆ هەڵسوورا لە جارەکانی تر: چونکە زۆرتر شارەزابووم و چاکتریش تێکەڵ بەژیانی کۆمەڵایەتی ئەوێ بووم.

ئەمە ڕاستە تەنگوچەڵەمە و نەخۆشی و ئەرک و ئازارم زۆر تێدا دی، بەڵام لە چاو ئەو خۆشیانەدا کە لەوێدا چەشتم هەرگیز نایەنە پێش چاوم.

۱۹٦٦/۸/۳

بە(ئۆتۆبوس) چووم بۆ (بەیروت)، بەڕاستی لە ڕێگادا تووشی دواکەوتن و نەنووستن و بێ سەرەوتی و وردە ناخۆشی زۆر بووم. بەڵام لەو دوو شەو و دوو ڕۆژەدا کە بەڕێگاوە بووم گەلێک شوێنی تازەم دی: وەک (ئەسکەندەرونە) لە تورکیادا و (لاذقیة) لە سوریەدا. بێجگە لەوە گەلێک چاوەندازی سروشتی جوانیشم چاوپێکەوت، دوایی پاش نیوەشەوێکی درەنگ گەیشتینە بەیروت، لە دوای ئەوەیش بەکات و نیوێک ئینجا میوانخانەیەکم دەستکەوت، لە گوندی (عالیة).

دوایی لە کاتی چواری پاش نیوەشەودا توانیم سەرێ بکەمە سەر سەرین. ماندوویەتی و نەنووستن و نەخواردن بەجارێک برستی بڕیبووم، بەڵام بەسایەی خواوە توانیم بەهەشت ڕۆژێک ژیان لە دێهاتەکانی (عالیة و بحمدون و بومانا) و شاری بەیروتدا بێنمەوە سەرخۆم. چاوەندازە جوانەکانی (لوبنان) و خۆشەویستی گەرمی هەندێ خزمان کە لەوێدا بوون لەگەڵ کزەبا فێنکەکەی و میوانخانە ڕێکوپێک و جوان و ڕازاوەکانی ئەو شوێنانە سەرەوتێکی گیانی و بووژانەوەیەکی لەشیان پێ بەخشیم.

ژیانی ئەمجارەم لە لوبناندا زۆرتر خۆش بوو. خۆم نەچەوساندەوە، تەنیا بەخۆشڕابواردنێکی ئاسایی و مامناوەندی وازم هێنا.

تا دەهات بیرەوەریم بۆ ناو نیشتمان و خێزان گڕی دەسەند. حەزم دەکرد هەتا زووە بچمەوە بۆ ماڵەوە تا بەدیدەنیان شادبم... هەر لە دووەم ڕۆژەوە نامەیەکی ترم بۆ خێزانەکەم نووسی، لەگەڵ خزمەکاندا یادی دایکی شێرکۆ و باسی هاتنەوەی شێرکۆمان کرد لە ئەورووپا.

١٩٦٦/٨/١٣

گواستمەوە بۆ (عمان) لە خاکی (ئەردەن)دا؛ شارێکی بچکۆلانە و پڕ بزووتنەوەی بازرگانیم هاتە پێش چاو.

بایەکەی فێنک بوو، نزیکی دوو ڕۆژێک تیایدا مامەوە، خاکی ئەردەن نزیکی دوو ملیۆن کەسێکی تێدایە، (عەممان) کە پایتەختێتی نزیکی چوار سەد هەزار کەسێکی تێدایە.

١٩٦٦/٨/١٥

گەڕامەوە بەغدا، بەیانی پاش هەتاوکەوتنێکی درەنگ گەیشتینە ئەوێ. سێ ڕۆژێک لە بەغدادا مامەوە، هەرچی گەرما و بۆنی ناخۆش و گێژ و وێژییەک هەیە تیاما دی.

١٩٦٦/٨/١٩

نزیکی چێشتەنگاو بەنیشتمانە خۆشەویستەکەم کوردستان شادبوومەوە. کە هاتمەوە ماڵەوە وەک سەرلەنوێ تەمەنم تازە بنووسرێتەوە وابوو؛ کڕنووشی ئەوازشم بۆ خوای گەورە کێشا (برد -١.ب)؛ کە بەخاکی باووباپیر و خانووە خۆشەویستەکەم و خێزانە نازدارەکەمی شاد کردمەوە.

خێزانەکەم لە خۆشیدا گەشکەدار بوون، لە پاش چەند کاتێک حەسانەوە لەناو خێزان و باخچەکەی ماڵدا، ماندوویێتی ئەو ڕێگا دوور و درێژانەم لەبیر چووەوە. خەرپ خەوم لێکەوت، بەئاسوودەیی تا بەیانی.

بەبۆنەی گەشتەکەمەوە هەندێ دیاری ناوازەم بۆ ژنەکەم و منداڵەکە هێنابوو، پێشکەشم کردن، هەروا شەش دینارێشم دانابوو ببیەشمەوە بەسەر هەژار و لێقەوماواندا، دەستم کرد بەدابەشکردنی ئەوەیش.

خوای گەورە سوپاس بۆ تۆ کە ئەم گەشتە خۆشەم کرد و بەخۆشیش کامەران بوومەوە بەخێزانەکەم.

١٩٦٦/٨/٢٠

ئەمجارە کە لە ئەستەمبوڵ بووم نووسراوێکم بەدیاریی پێشکەش کرا لەلایەن شاگردێکی کوردەوە: (دەستووری زمانی کوردی تێدا پێشان درابوو بەزمانی تورکی).

لە ساڵی ١٩٦٥دا لە چاپدراوە. نووسراوەکە لەلایەن (کەمال بادیللی) ناوێکەوە دانراوە. خۆی نوێنەری شاری (ئۆزفە)یە لە کۆڕی نەتەوەیی تورکیادا.

بێجگە لەوە خۆیشی پشتیوان (محامی)یە. دەستوورەکە شێوەی کرمانجی هەڵبژاردووە، بەڵام بەجۆرێکی گشتی باسی زمانی کوردی و شێوەکانی زمانی کوردی و ناوچەکانی زمانی کوردی و مێژووی نووسینی کوردیش دەکات.

هەرچەندە نووسـراوەکـەم هەمـووی بۆ نەخـوێنـدراوەتەوە و لە تورکی شـارەزایەکی وانیم: بەڵام بەپێی بابەتەکانی کە لە پێرستی نووسراوەکەیدا لێیان دەدوێ، نرخێکی گەورەی هەیە، چ لە ڕووی زمانەوە چ لە ڕووی باری زرنگکاریی (سیاسی)ی کوردی تورکیاوە. چونکە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە گیانی کوردایەتی لە تورکیادا زیندووە و دەیەوێ لەسـەر بنچینەیەکی زانسـت و[1]... بێجگە لەوە، هەموو ئێواران و هەموو ڕۆژانێکی هەینیش پێشوازی میوانانم دەکرد... هەروەها هاتوچۆم بۆ لای خزم و دۆست و یارانیش دەکرد... نووسـراوانی سـەر بەکـوردایەتیم دەخـوێندەوە... گـوێم لە ڕادیۆ دەگـرت... سـەیری تەلەفـزیۆنم دەکـرد... هاوینانیش سـەیران و گـەشـتـوگـوزارم دەکرد بۆ دەرەوەی کـوردسـتـانی عـێراق، کـە لەم مـاوەیەدا بەهۆی پێشروەوە، خۆی دا لە حەوت جار. (ئێران) و (تورکیا) و (میسـر) و (ئوردون) و (چیکۆسلۆڤاکیا) و (ڤیانە) و (یەکـێتی سـۆڤـیەت)یشم دی... تا ئەندازەیەک بەهاوینەهەوارەکـانی کـوردسـتـانیش چاوم گەشایەوە... بەڵام بۆ هەر کوێیەک دەچووم، فەرمانی سـەرشانم بەرامبەر «پرۆژەی خوێندەواری» لەبیر نەدەچوو. دەمودەست کارەساتی ڕۆژانەی خۆمم لەناو ئەو خاکانەدا، دەنووسییەوە، کە نیازم وایە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە یادنامەی ئەو گەشتوگوزارانەیش دە پانزە نووسراوێکی خنجیلانە ئامادە بکەم و، بیانخەمە سەر پرۆژەکەم.

جا ئەم جۆرە ژیانە پڕ لە سەربەستی و ئازادی و کامەرانییەم لە توانایەدا هەبوو، بێ ئەرک و ئازار، لە ماوەی چوار ساڵێکدا (پرۆژە)کەم بەئاسانی و دڵشادییەکەوە پێ تەواو بکات... لە پاییزی ساڵی ١٩٦٧دا، لە ڕۆژنامەی (برایی)دا ژمارە (ع: ٢١٤ = ک: ٢٩) و (ع: ٢١٥ = ک: ٣٠)، بۆ هەمووانم ئاشکرا کرد کە «پرۆژەی خوێندەواری کورد» سەد نووسراوی لە زمانانی بێگانەوە، گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی. پیرۆزبایی لە نەتەوەی کورد دەکەم. پاش ئەوەیش بەچەند ڕۆژێک ئاهەنگێکی بچکۆلەم بەم بۆنەیەوە گێڕا... ئەمە وتارەکەیە کە لەگەڵیدا ناوی هەر سەد نووسراوەکە لە (ڕۆژنامەی برایی)دا بڵاوم کردەوە[2].

(١) بەداخەوە لێرەدا یادداشتەکانی ئەو دەفتەرە بچووکە تەواو دەبێ، بەهۆی فەوتاندنی پەڕەکانی کۆتاییەوە.

(٢) ناوی ئەو نووسـراوانە هەمـوویان بەدانراو و پەرچڤەکراوەوە، بەچاپ کراو و چاپ نەکراوەوە لە نووسـراوی (مێژووی پرۆژەی خوێندەواری کورد)دا تۆمارکراون، کە لە ساڵی ١٩٨٤دا لە گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»دا ژمارە (١٠٢) بڵاوکرایەوە. (ش. ف)

# پرۆژەی خوێندەواری کورد

نووسەری: شاکر فەتاح

* ئامانجی ئەم پرۆژەیە پێشکەشکردنی خۆرشتی گیان و زاخاوی مێشک و ڕۆشنکردنەوەی دەروونە، بۆ خوێندەوارانی کورد. بزواندنی دەماری مەردایەتی خوێندەوارانی کوردە، بۆ فەرمانکردن. لە کۆڕی نیشتمانپەروەریدا بۆ پێشکەوتنی کوردەواری.
* هەروەها گەشەکردنی وێژە و زمانی کوردییە، کە پەل بۆ ناو هەموو زانست و هونەرێک بهاوێژێ و تێیدا بلاو ببێتەوە. دروستکردنی خوێندەوارییەکی بالایە و، نووسراوخانەیەکی نوێیە، کە بۆ هەموو لکێکی ژیان کەلکی لێ وەربگیرێ.
* پرۆژەکە بریتییە لە سەد نووسراوی هەلبژاردە و ناوازە، لە بەرهەمە هەرە گرنگ و هەرە بەناوبانگەکانی ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات، کە دابەشکراون بەسەر (١٧) زنجیرە نووسراوی جۆ جۆردا.
* نووسراوەکان بەپوختەی خوێندەواریی کۆن و نوێی جیهان دەژمێردرێن.
* نووسراوەکان هەموویان لەلایەن (شاکر فەتاح)، خۆیەوە گۆڕاونەتە سەر زمانی کوردی، بەشێوەیەکی وایش نووسراونەتەوە، کە هەموو کەس بەئاسانی تێیان بگات و، خۆشی و کەلکیشیان لێ وەربگرێت. (شاکر فەتاح) لە پاییزی سالی ١٩٦٣دا دەستی بەم پرۆژەیە کردووە. لە پاییزی سالی ١٩٦٧دا تەواوی کردووە.
* ئاواتی هەرە گەورەی خاوەن پرۆژەکە ئەمەیە کە دەستی بڕوا و بتوانێ ئەم سەد نووسراوە لە ماوەی سالێکدا لە چاپ بدات و بلاویشیان بکاتەوە. تا زووتر کەلک و چاکەیان بەنەتەوەی (نەژادی کورد) بگات.
* بەلام داخەکەم ئەمە لە وزەی ئەودا نییە. چونکە چاپکردنی سەد نووسراوەکە بەلای کەمەوە (٧٠٠٠) دیناری دەوێ. هەروەها دە چاپخانەی وایشی دەوێ کە هەریەکەیان، هەر مانگە نووسراوێک لەم نووسراوانە لە چاپ بدات. نووسراوەکانیش هەرچەندە زۆربەیان بچووکن و، ئەوەندەی نووسراوەکانی کۆنی خۆمن، بەلام هەندێکیشیان گەورەن و، خۆیان دەدەن لە دوو سەد، سێ سەد لاپەڕە و پێش لە وێنە و نیگار.
* لە خاکە پێشکەوتووەکاندا باو وایە: نووسەر هەر دانانی نووسراو، یان پەرچڤەی نووسراوی لەسەرە. ئەو خۆی بەچاپکردن و بلاوکردنەوەی نووسراوەکانیەوە خەریک ناکات. نووسراوەکانی دەداتە دەست دەزگاکانی چاپەمەنی. ئەوانە لە پاش پەسەندکردنی نووسراوەکانی، بۆی لە چاپ دەدەن و، نرخی ئەرکی نووسراو و نووسینەوەکانیشی پێشکەش دەکەن. ئیتر نووسەرەکە لە جیاتی ئەوەی خۆی بەچاپکردن و بلاوکردنیەوە خەریک بکات و، پارە لە دەم مال و مندالی خۆی بگێڕێتەوە بۆ چاپکردنی نووسراوەکانی، خۆی بەدانانی نووسراوانی تر یاخود بەپەرچڤەکردنی نووسراوانی ترەوە خەریک دەکات.

لەمەدا ئەویش و دەزگای چاپەمەنییەکانیش و نەتەوەیش سوود وەردەگرن. بەڵام داخەکەم لای ئێمە هەموو ئەرکێک بەسەر شانی نووسەرەوەیە![1].

* جا لەبەر ئەم هەموو هۆیانە و لەبەر کەڵکی گشتی، ناچارە بۆ هەموو هاونیشتمانە بەڕێزەکانی بڵاو بکەمەوە: کە من ئامادەم لەگەڵ هەموو نیشتمانپەروەر و کۆمەڵێکی بەڕێزدا رێک بکەوم بەشیرینی، لەسەر چاپکردنی نووسراوەکان، هەموویان، یاخود هەندێکیان، تا پرۆژەکەمان بەگورجی بکەوێتە گەڕ و، بەزوویی تەواو بێن: تا کەڵک و فەری بەزوویی، بەناو کوردەواریدا بڵاو ببێتەوە.

* ئەی خوێندەواری بەڕێز! (پرۆژەی خوێندەواری کورد) پرۆژەی خۆتە. پرۆژەی نەتەوەی خۆتە. تۆ چەند یارمەتی بدەیت، ئەوەندە یارمەتی خۆت دەدەیت. ئەوەندە یارمەتی کوردەواری دەدەیت. کە داماوە لەسەر ئەم جۆرە پرۆژانە.

* ئەگەر ئەم پرۆژەیە بەهەرەوەز جێبەجێ بکرێ هەر ساڵێکی پێ دەوێ. بەڵام ئەگەر خۆم بەتەنیا دەستی پێ بکەم، بیست و پێنج ساڵی پێ دەوێ!.

* وا ڕستەی ناوی هەر سەد نووسراوەکەم لە خوارەوە نووسی. تکایە نیشتمانپەروەرانی بەڕێز، لە بابەت چاپکردنیانەوە بیروباوەڕی خۆیانم بۆ بنووسن.

سا دەست لە دەست و هێز لە خوا[2]



من لەم ماوەیەدا پارچە زەوییەکم لە کاربەدەستی کاروباری ناوخۆ، وەک فەرمانبەرانی تر، بەنرخێکی هەرزان لە بەغدادا کڕی. لە ساڵی ١٩٦٧دا خانوویەکم لەسەر دروست کرد. ئەمە دەسمایەیەکی ساڵانەی (٣٠٠) دیناری پێ بەخشیم. جا لەم پارەیە هەر ساڵەی (٢٤٠) دینارم تەرخان کرد بۆ چاپکردنی چەند نووسراوێک لە نووسراوانی پرۆژەکەم تا لە ماوەی (٢٥) ساڵێکدا تەواو دەبن.

* لە ساڵی ١٩٦٦دا کە هێشتا پرۆژەکەم تەواو نەبووبوو. نەخۆشییەکی گرانم گرت. هۆی ئەمەیش جەربەزەیی خۆم بوو، کە لە گەشتە درێژەکەی (تورکیا) و (سووریە) و (لوبنان) و (ئەردەن)دا، کورتێنیم کرد و، لە ئەندازەبەدەر خۆم ماندوو کرد. جا پێویست بوو سرووشت جەزرەبەم پێ بگەیێنێ. شەش مانگێکی پێوە خەریک مام، ئینجا چاک بوومەوە. پزیشکەکان مەترسیی شێرپەنجەیان لێ دەکردم. بەڕێز

(١) لە ساڵی ١٩٦٧دا وا بوو. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا چەند دەزگایەکی ڕۆشنبیری کوردی لە عێراقدا پەیدا بوون، دەستیان کرد بەدەستگیرۆیی نووسراو دانەران و پەرچڤەکاران، کە تا ئەندازەیەکی گەورە و کەڵکیان بەخشی. (ش. ف)

(٢) لە پاش ساڵی ١٩٦٧. بەنووسراوەکانی خۆمەوە کە دامنابوون و، بەو نووسراوانەوە کە پەرچڤەم کردبوون، ژمارەی نووسراوانی پرۆژەکەم گەیشتە ١٧١ نووسراو. لەمانە (١٢٠) نووسراوی پەرچڤەکراو بوو. (٥١) نووسراویشی لە دانانی خۆم بوو. لە هەردوو جۆرەکە تا ئێستا کە ساڵی (١٩٨٨)ە، ژمارەی نووسراوانی چاپکراو گەیشتۆتە (٨٦) نووسراو. (ش. ف)

(عەبدوڵلا لوتفی حاجی عەلی ئاغا)ی خاڵۆزام[1] لە نەخۆشییەکەمدا زۆر بەتەنگمەوە بوو. (٢٥) رۆژی خشت لە ماڵی خۆیاندا هێشتمیانەوە. خۆی و خێزانەکەی کە ئەویش کچی خاڵم بوو، ئەوپەڕی ئەوازش و میوانداریـیان بەرامبەرم پیشان دا، کە هەتا دەمێنم ئەو چاکەیەیانم لە بیر ناچێتەوە. خودا دڵیان بەبەهەشت شاد بکات. چاکەیان بۆ هەمووان زۆر بوو. لە خزمەکان و دۆستەکانی تریشمەوە خۆشەویستیم زۆر دی، بەتایبەتی (جەلال ئاغای حاجی سەعید ئاغا)ی[2] خاڵۆزام و (کاک نوری ڕەشید)[3]ی ئامۆزازام خودا پاداشیان بداتەوە. جا لەناو ئەم جۆرە خۆشەویستییانەدا، هەستم بەشادمانییەکی ئەوتۆ دەکرد، کە پەلەی دەکرد لە چاکبوونەوەکەمدا... بەڵام تا چاک بوومەوە پزیشک و پزیشکایەتیم لەبەر چاوکەوت. چونکە چاو برسێتی و، پوولپەرستی و، فروفێڵبازی و دڵڕەقیم لە زۆربەیاندا چاوپێکەوت بێجگە لە ناشێتی! ئەگەر بەگوێی خۆمم بکردایە و خۆم لە هیچ پزیشکێک نەگەیاندایە، هەر بەسرەوت و، خۆش ڕابواردن و، خۆرشتی سورشتی و، وەرزش و، خۆدانەبەر رۆژ و هەڵمژینی بای پاک و هەدا بەخۆدان، خۆم چاک بکردایەوە، بۆ من گەلێک چاکتر دەبوو. بەڵام خێزان و خزمان وازیان لێ نەهێنام، تا تووشی داوی پزیشک و دەرمان خواردنیان کردم! هەروەک کاتێکی زۆرم بەخۆڕایی لە دەست چوو، پوولێکی زۆریشم بەفیڕۆ ڕۆیشت، ئەرکێکی زۆریشم هاتەبەر و کەوتە سەر کەسانی تر...

خوداوڕاستان نەخۆشییەکەم، وەک پزیشکەکان گوتیان، وا دەرنەچوو... خووم دایە تەندروستیم و، بەدڵفراوانییەکەوە بەرگەی نەخۆشییەکەم گرت... سوپاس بۆ خودا چاک بوومەوە... دووبارە دەستم کردەوە بەپڕۆژەکەم تا هەر سەد نووسراوەکەم تەواو پەرچڤەکرد.

* هاتنەوەی (شێرکۆ)ی کوڕیشم لە (چیکۆسلۆڤاکیا)[4] لە ساڵی ١٩٦٧دا و تەواوکردنی

(١) عەبدوڵلا لوتفی: (؟ - ١٩٧٢) کوڕی حاجی عەلیاغای مەلاک بووە لە سلێمانی، ئامەخانی حاجی سەعید ئاغا خێزانی بووە، منداڵیان نەبووە، خانەدان و خاوەن موڵک بووە، لە ناوەندی بیستەکانەوە لە بەغدا دادەنیشت، کۆمپانیای جگەرەی (تورکی) هی ئەو بوو.

(٢) جەلال ئاغای حاجی سەعید ئاغا: (١٩١٦ - ١٩٩٠) باوکی ئەندامی مەجلیسی مەبعوسانی عوسمانی و ئەعیانی عێراقی بووە، تاجیر و خاوەن موڵک بووە، خوشکی ئەم خێزانی عەبدوڵلا لوتفی بووە، لە نێوان ١٩٥٨ - ١٩٦٣ بەڕێوەبەری کۆمپانیای چیمەنتۆی سەرچنار بووە، چوار کوڕ و دوو کچی لە پاش جێماون: لەوانە کەمال و خەبات، پەری و گوڵزار.

(٣) نوری ڕەشید: (١٩١٢ - ١٩٩٢) خاڵۆزای دایکی مامۆستا بووە، چوار کوڕ و دوو کچی بووە: ڕەشید، دلێر، دلاوەر و دانا، د. دولبەر.

(٤) د. شێرکۆ: لە سەعات ٢.٥ی دوای نیوەڕۆی ٢٧/١٠/١٩٤٢ لە قادرکەرەم لەدایک بووە، قۆناغەکانی خوێندنی (بەپێی ئەو شوێنانەی کە باوکی لێیان فەرمانبەر بووە) لە: شەقڵاوە، ئاکرێ، دهۆک و سلێمانی تەواو کردووە، لە ١٩٦٦ لە چیکۆسلۆڤاکیا دبلۆمی لە هەندەسەی میکانیکدا هێناوە، لە ١٩٦٧ چۆتە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و ماستەر و دکتۆرای لە (دینامیکی سیارات)دا هێنا. ئێستا مامۆستایە لە کۆلیجی ئەندازەی زانکۆی سلێمانی. ژنی هێناوە و کوڕ و کچێکی هەیە.

خوێندنەکەی، لەوێ بە(پلەی سەربەرزی)[1]یەوە، یەجگار دڵی من و دایکی خۆش کرد. بەڵام هیچی وا نەمایەوە. هەرچەندمان کرد، بەگوێی هیچمانی نەکرد... دڵی هەڵپچوڕکاندین. چووەوە بۆ ئەورووپا بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی بۆ (پلەی دوکتۆرا)، لە ئەندازیاریی ئۆتۆمبیلدا... ئەم جیابوونەوەیەی ئەو زیان و ئەرک و ئازارێکی زۆری بۆ من و دایکی پەیداکرد. چونکە زۆری پێنەچوو، کەوتە تەنگ و چەڵەمەوە بۆ پارە پێگەیشتن و بەخوێندندا گەیشتن لە ئەڵمانیا و چیکۆسلۆڤاکیادا... دوایی خودا کردی و بەسەرفرازییەوە لە پاش رەنجێکی پتر لە ساڵ و نیوێک، لە (بەرلینی رۆژئاوا)دا گیرسایەوە و، دەستی کردەوە بەخوێندنەکەی[2].

## مانگی یەکی ۱۹٦۸

لەم مانگەدا ئەم نووسراوانەم بژارکرد و پوختەکرد و پێشەکیم بۆ هەموویان دانا و ناردمن بۆ بەغدا، تا میری رێ لەسەر چاپکردنیان بدات، بۆ ئەمساڵ ئەم نووسراوانە لە «پرۆژەی خوێندەواریی» ئەمانەن:

(سوکرات، گاریباڵدی، ڤیڤالیرای، مادام کوری، لویس پاستور) لە مانگی رەشەمێی (۱۹٦۸)دا نووسراوی (مەم و زینی)یشم بژارکرد و قاڵکرد و پێشەکیم بۆ دانا.

نان بۆ گەل: لەسەر خواست و پێشنیاری من، سەرۆکی شارەوانی سلێمانی[3] لیژنەیەکی دروست کرد لە من و چەند کەسێک و خۆی بۆ لێکۆڵینەوەی هۆی گیروگرفتی نان کە بەگەل دەفرۆشرێ.

لە ئەنجامی کۆبوونەوەدا راوێژی خۆمان پێشکەش بە(متصرفیة) کرد بۆ بەربەستکردنی دزێتی و کەمتەرخەمی و ناپوختەیی لە کولێرە و سەموون فرۆشتندا، هەروەها بۆ ئاسوودەکردنی کولێرە و سەموون کڕین بۆ دانیشتووانی شار. پێشنیازمان وا خستە بەرچاو کاربەدەستانی کە پێویستە بەشی ئاردەکە زۆرتر بکرێت، چەند کولێرەخانەیەکی تازەیش بکرێتەوە لەلایەن شارەوانی و دەزگای ژیاندن (دائرة الأعاشة)ەوە تا هەموو دانیشتووانی شار بەئاسانی و پوختەیی هەموو رۆژێک کولێرە و سەموونیان دەستکەوێ. ئەم کارە لە مانگی رەشەمێدا جێبەجێ کرا.

(۱) واتە بەپلەی -امتیاز-.

(۲) لە دوای ئەمەوە بەشێک لە یادداشتەکانی سەرەتای ساڵی ۱۹٦۸ دێت کە بەجیا لەناو دەستنووسەکانیدا لە دەفتەرێکی بچووکدا نووسیبوونی: لە (مانگی یەکەی ۱۹٦۸)ەوە دەست پێ دەکات هەتا ۱۹٦۸/۳/۲۷ کە لە گەشتەکەی بۆ قاهیرە دێتەوە سلێمانی. بەداخەوە ئەم دەفتەرەش هەندێ کەم و کورتی هەیە؛ ئەویش بەهۆی چەند پەڕەیەک کە لێی کراوەتەوە... لە شوێنی خۆیدا دەستنیشانی دەکەین.

(۳) ئەو کاتە ۱۹٦۸، مامۆستا جەمال عەبدولقادر بابان سەرۆکی شارەوانی سلێمانی بوو، لە ۱۹٦۷/۱۲/۲۳ هەتا ۱۹٦۹/۱۰/۱۰.

## ١٩٦٨/٣/١

لەم ڕۆژەدا لە سلێمانی جیابومەوە. لە ١٩٦٨/٣/٢دا چاوم ڕۆشن بوودوە بەبینینی نووسراوەکەم (زەردەشت) کە بەچاپکراوی دیم، لە بەغدا. نووسراوەکە جوان چاپ کرابوو، وێنەی (زەردەشت) بەبەرگەکەیەوە جوان دەرچوو بوو، لە بەرگەکەی تریشیدا وێنەیەکی بچووکی خۆمی لێدابوو، لەگەڵ چیرۆکی ژیانم و خەباتماندا لە پێناو پێشخستنی ویژەی کوردی و بلاوکردنەوەی خوێندەواری بەناو کوردەواریدا. (نوری عەلی ئەمین)[1] کە فەرمانبەرێکە لە کارگێری گشتی خوێندەواری کوردی، پیاوانە بەسەر چاپکردنی نووسراوەکەوە وەستابوو، پێویستە سوپاسی بکەم و پاداشتی بدەمەوە لەگەڵ کارگێر کاک (عەزیز محەمەد)دا... خوایە سوپاست دەکەم چونکە نوخشەی (پرۆژەی خوێندەواریی)م بەچاپکراوی دی. هەر ئەمڕۆ ١٩٦٨/٣/٢ چوار وتاری ترم نارد بۆ ڕۆژنامەی (برایی) تا بلاوبکرێتەوە. وتارەکانی بریتین لە: شۆڕشەکانی ئەمریکا و چین و ڕوسیا و شۆڕشەکانی ١٨٤٨، ئەم وتارانەیش لەگەڵ دوو وتاری تردا کە لە ساڵی ١٩٦٧دا ناریبوومن لە بابەت (شۆڕشی هیندستان و لینکۆلن)ەوە، لە نووسراوی (شۆڕشەکانی جیهان)ەوە دەرمهێنابوون؛ کە نووسراوێکە لە نووسراوەکانی (پرۆژەی خوێندەواری).

## ١٩٦٨/٣/٣

بەفڕۆکە گەیشتمە (مسر)، لە (قاهیرە) دابەزیم و (٢١) ڕۆژ مامەوە؛ لەگەڵ (مستەفا فەقێ ڕەشید)[2] و (خالیدی خاڵ)[3]دا کە هەردووکیان هاوڕێمن... زۆر خۆشمان ڕابوارد.

(١) نوری عەلی ئەمین: (١٩٢٢ چەمچەماڵ) لە چەمچەماڵ و پێنجوین و سلێمانی خوێندوویەتی، (دار المعلمین)ی لە بەغدا (١٩٤٢) تەواو کردووە، لە زۆر شار و شارۆچکەکانی کوردستاندا مامۆستایی کردووە، دوای ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ گواستراوەتەوە بۆ بەغدا و لە دیراسەی کوردی کاری کردووە... لە ١٩٨٠ خانەنشین کراوە، ئەندامێکی کارای چالاکی کۆڕی زانیاری کوردییە، پسپۆڕێکی لێهاتووی زمانەوانی و ڕێزمانی کوردییە. زیاد لە شەش کتێبی لەسەر ڕێزمانی کوردی هەیە و گەلێ وتاری بەنرخیشی هەر لەو بابەتەدا لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندایە، ئێستا ٢٠٠٢ لە بەغدا دادەنیشێ و بەردەوامە لە خزمەتی زمانی کوردیدا.

(٢) مستەفای فەقێ ڕەشید: لە ١٩٢٥ دا لە سلێمانی لەدایک بووە، کۆلیجی حقوقی تەواو کردووە، لە ١٩٦٢ لە سلێمانی حاکم بووە، ئەو ساڵە لەگەڵ مامۆستا پێکەوە ئەو سەفەرەی قاهیرە دەکەن، وەک مامۆستا خالید خاڵ دەڵێ: کە هاتن، من لەوێ دەمخوێند، جێگا و ڕێگاو بۆ پەیداکردن و بۆ گەرانی زۆر جێگا لە تەکیاندا بووم؛ ئێستا لە لەندەن دادەنیشێ.

(٣) خالید محەمەد خاڵ: لە ١٩٣٣ لە سلێمانی لەدایک بووە، کوڕی زانای گەورە مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵە، لە یەکێتی سۆڤیەتی ئەوسا و میسر خوێندوویە، ماستەری هەیە لە (تەکنۆلۆژیای شیرەمەنی)، لە پەیمانگە و کۆلیجەکانی بەغدا و سلێمانی و هەولێر مامۆستا بووە، ساڵی ١٩٧٤ بەشداری ڕاستەوخۆی کردووە لە شۆڕشی ئەیلولدا، ئەندامێکی چالاکی لیژنەی بالای دانانەوەی زانکۆی سلێمانی بووە، کراوەتە ڕاگری کۆلیجی کشتوکاڵ لەو زانکۆیە، ئێستا مامۆستایە هەر لەوێ.

لەم ماوەیەدا دوو ڕۆژیشمان لە (ئەسکەندەریە)دا ڕابوارد، لەوێ (قادر شالی)یش کە هاوڕێ و خزمە بوو بەهاوەڵمان و پێکەوە خۆشمان ڕابوارد.

زۆربەی شوێنەوارە کۆنە بەنرخەکانی قاهیرە و ئەسکەندەریە گەڕام، وەک: (قصر العابدین، قلعة صلاح الدین، مسجد صلاح الدین، متحف محمد علي الكبير، متحف محمد علي الصغير، المتحف المصري، أهرامات الجيزة، أبوالهول، متحف قصر فاروق في الأسكندرية، حديقة الحيوان، البرج والقناطر الخيرية) و هەندێ باخچەی جوانیشم دی.

بێجگە لەوانە چوویشمە چەند سینەمایەک و تەماشاگاه و لاسایی خانە (دار التمثيل) و ئۆپەرا و (الفنون الشعبية، المسرح القومي) لەگەڵ چەند کۆگایەکی گەورە و بەناوبانگی ناوبازاڕ.

بەجۆرێکی گشتی میسرم پێشکەوتوو هاتە پێشچاو لە زۆر ڕووەوە وەک: پیشەسازی، باخچە ڕازاندنەوە، دروستکردنی ساختمانی گەورە و نایاب، ساز و ئاواز و گۆرانی، لاسایی کردنەوە، سینەما، شەقام، بازاڕ، بابەتی خوێندنەوە، میوانخانە و چێشتخانە.

بەڵام لە ڕووی گیانەوە میسرم زۆر دواکەوتوو هاتە پێش چاو، درۆ و فیشاڵ، چەواشەکردن و دەستبڕین، زۆرداری کردن، ڕووکەشی، درۆ و خۆهەڵکێشان، بێ دەنگبوون بەرامبەر زۆردار، داوێنپیسی، بێ ئابڕوویی، خوازەڵۆکی، دزی، جەردەیی، کەمتەرخەمی فەرمانبەران لە فەرمانبێنیندا... ئەمانە هەموویم بەئاشکرا چاوپێ کەوت، زۆر خەفەتم خوارد بۆ گەلێکی گەورە و گرنگ وەک گەلی میسری کە لە سەرەتای مێژووەوە خاوەنی شارستانێتی بووە، ئاوا بەم ڕەنگە کردەوە و ڕەوشتی بڵندی بەردابێ و خووی دابێتە پوولپەرستی.

لە دوو کەسی کوردم بیست کە ماوەیەک لە میسردا ژیابوون، دەیانگوت: بۆ پیاوێکی سەربەرز و مەرد گرانە بتوانێ لە میسردا بژی.

لەلاوێکی میسریم بیست دەیگوت: میسر لە پێش پەنجا ساڵدا ئافرەتەکانی سەربەستییان نەبوو، کاروباریان بەدەست گەورەی خێزانەوە بوو، بەڵام ئێستاکە میسر لە گێژاوێکی گۆڕان و گەشەکردندایە، ئافرەت سەربەستییەکی تەواوی وەرگرتووە، هەروەک لە میسردا ئافرەتی خراپ هەیە لە خاکەکانی تریشدا ئافرەتی خراپ هەیە.

لە ئافرەتێکی بەساڵداچووی داوێنپاکی دەروونخاوێنی میسریم بیست دەیگوت: من چونکە داوێنی خۆم دەپارێزە لە پیسبوون، هەموو دەم لەناو ئەم کۆمەلایەتییەدا (کۆمەڵەدا - ا.ب) گیروگرفتم دێتە بەر. تەنانەت فرمانێکیشم هەبوو لە (فرۆکەخانە) ئەویشم لە دەست چوو؛ چونکە وەک کچەکانی تری ناو فرۆکەخانەکە خۆم تەدەدا بەدەست ئەفسەرەکانمانەوە!!

لە لاوێکی عەرەبی عێراقیم بیست کە لە قاهیرەدا دەیخوێند، دەیگوت: لەگەڵ ئەمەیشدا کە میسرییەکان لە (جەمال عەبدولناسر) زۆر دڵشکاون لەسەر ئەوەی کە تووشی ئەم شکستی جەنگەی عەرەبی و ئیسرائیلی کردوون، بەڵام ئەتەوەی میسر بەتایبەتی شاگردەکانی خوێندنگا خۆشیان دەوێ.

حەز لە قەومییەتی عەرەبیش دەکەن. کەچی وەک لە شاگردێکی زانستکۆ (زانکۆ- ا.ب)ی قاهیرەم بیست کە خۆی کوردە: ١٤٠٠٠٠ شاگردی زانستکۆ بۆیەکانا چەند رۆژێک مانیان گرت و نەچوونە زانستکۆوە؛ چونکە کردەوە و نەنگی فەرمانڕەوایی (عەبدولناسر)یان ڕیسوا کرد، کە بەم دەردەی گەیاندن: ٢٧٠٠٠ هەزار سەربازیان لە جەنگی عەرەب و ئیسرائیلدا لێ کوژراوە، نزیکی ٤٠٠٠٠ هەزار کەسێکیش بریندار کراوە، کە عەبدولناسر بەدەمی خۆی گوتوویەتی ٨٠٪ سەدی هەشتای لەشکری میسر لەو شەڕەدا لەناوچوون.

دەیگوت: شاگردەکان داوای ئازادی و سەربەستی گەلیان دەکرد... داوای ڕووخانی فەرمانڕەوایی (عەبدولناسر)یان دەکرد. ڕاستییەکەیشی ئەمەیە: عەبدولناسر لە ڕووی پیشەسازییەوە تێکۆشانێکی زۆری نواندووە، میسری ئێستا پێویستی نەماوە بەبابەتی خواردن و پۆشین و کەلوپەلی ناو ماڵ، هەموو شتێک خۆی دروستی دەکات، ئەوەندە هەیە گرانییەکی زۆر لە میسردا هەیە، کە لەگەڵ دەرامەتی تاک و تەراکانی گەلی میسری ڕێکناکەوێ[1]. هەروەها گیروگرفتی نیشتەجێ هەیە، ناپاکی و کەمتەرخەمی لەناو فەرمانبەراندا بەئاشکرا دیارە. وا بۆ نموونە هەندێ لەو ڕووداوە نەنگ و ناشرینانە دەخەینە پێشچاو:[2]

ا- یەکێک لە مەڕسەربڕەکان تا سێ ساڵ و نیو گۆشتی سەگی بەمیسرییەکان فرۆشتووە لە قاهیرە، ئینجا هەستیان پێ کرد و گرتیان.

ب- لەناو پۆستەخانەی قاهیرەدا کۆمەڵێکی نهێنی پەیدا ببوو تا ماوەیەکی زۆر پوولی پۆستەیان لە نامەکان دەکردەوە، پێش ئەوەی مۆری پۆستەخانەی لێ بدەن؛ پوولەکانیان دەفرۆشت و نامەکانیان دەسووتاند، کە هاوار هەڵسا لە هەمووان ئینجا لە پاش شەش مانگ هەستیان پێ کرد و کۆمەڵەکەیان گرت.

ئێستاکەش هەتا بەبەڵێنەوە نامە نەنێرێ کەس لە خۆی دڵنیا نییە کە نامەکەی دەگات بەکەسوکارەکەی.

(١) دیارە مەبەستی لەوەیە کە: لەگەڵ دەرامەت و داهاتی فەردێکی میسری ڕێکناکەوێ.

(٢) دەبوو مامۆستا خۆی دەرکی بەوە بکردایە کە وڵاتێکی (ئەوکاتەی ئەو لەوێ بووە) کەمتر لە ساڵێک بوو گەورەترین و کوشندەترین جەزرەبەی عەسکەری و ئابووری لەلایەن دەوڵەتی ئیسرائیلەوە لێدرا، جەنگی حوزەیرانی ١٩٦٧ کە ناوزەد کرا بە -جەنگی شەش ڕۆژە-، ئەو زیانە ماددی و مرۆڤانەیەی کە خۆی باسی دەکات، ئەو تێکشکانە ئابووری و دەروونییەی دووچاری میسر و میسرییەکان هات، کارێکی وای کرد (جەمال عەبدولناسر)ی سەرۆکی میسر لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە هەموو ئۆباڵەکەی بخاتە ئەستۆی خۆی و دان بەو تێکشکانە دابنێ و بڕیاری دەست لەکارکێشانەوەی خۆی ڕاگەیەنێ. دیارە ئەوەش سەرەنجامی ئەو سیاسەتە تاکڕەوی ملهوڕییە بوو کە میسر گرتبووی و سواری سەری خۆی ببوو. شێوازی هێز و توندڕەوی و عەسکەرتاریەتی کردبووە تاکە ڕێگا بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان. جا لە وڵاتێکی ئاوادا دەبێ چی چاوەڕوان کرێ لەو گەلەی لە ماوەی شەش ڕۆژدا خرایە سەر دووڕیانێکی پڕ لە مەینەتی و داماوی و ناسۆری؛ کاردانەوەکانیشی ئەوانەیە کە مامۆستا نموونەیان لێ دەخاتە ڕوو.

ج- تا ماوەیەکی درێژ دراوی مسی سوور لە بازاڕدا نەما، تا وای لێ هات وردە نەما، لە جیاتی وردە پوولی پۆستە بەکاردەهێنرا، لە قاهیرەدا. پاشان دەرکەوت کە کۆمەڵێکی نهێنی پەیدا بووە ئەو پوولە سوورانە کۆ دەکاتەوە، پاشان دەیتوێنێتەوە و دەیکات بەکلیلی دەرگا و بەنرخێکی گرانیش دەیفرۆشن.

کە لە هەموو لایەکەوە هاوار هەڵسا ئینجا هەست بەکردەوە نەنگەکانی ئەو کۆمەڵە نهێنییە کرا و سزادران.

د- خۆیشم لە ڕۆژنامەی (الاخبار الیوم)ی قاهیرەدا خوێندمەوە کە داوێنپیسی گەیشتۆتە ڕادەیەکی بەجگار گەورە، بەجۆرێکی وەها کە ڕۆژ بەڕۆژ کچە میسرییەکان پێیان هەڵدەخلیسکێن و تووشی داوێنپیسی دەبن. ئەم داوێنپیسییەیش نەک هەر کیژە هەژارەکان، کیژە دەوڵەمەندەکانیشی گرتۆتەوە، ڕۆژنامەکە گەلێک کارەساتی دیاریکراوی بەنموونە هێنابووەوە؛ یەکێک لەوانە ئافرەتێکی دەوڵەمەندی بەنموونە هێنابووەوە کە مانگی ۱۰۰ جونەیهی دەستدەکەوێ، کەچی لە پاش ئەوەی مێردەکەی لە فەرمانی میری دەرهێنراوە ویستوویەتی وەک جاران بژی.. لەبەر ئەوە داوێنپیسی کردووە!

ڕۆژنامەکە داوای چارەکردنی ئەم بارەی کردبوو، لە فەرمانڕەوایی عەبدولناسر.

هـ- هەروەها لە ڕۆژنامەی (اخبار الیوم)ی قاهیرەدا خوێندمەوە کە کوڕێک داوای لە دایکی خۆی کردووە پەنجا قرۆش (نیو دینار)ی بداتێ، دایکەکەشی نەیداوەتێ، کوڕەکەش لە تۆڵەی ئەوەدا دایکەکەی خۆی داوەتە بەر خەنجەر و کوشتوویەتی؟!

و- خالیدی خاڵ بۆی گێڕامەوە گوتی: ئەگەر پیاو وریای خۆی نەبێ کۆمەڵێکی گەورە و نهێنی گیرفان بڕ هەیە، گیرفان دەبڕن، بەفڕوفێڵ بێ یان بەئاشکرا؛ کە تووشی یەکێک بوون ناهێڵن لە دەستیان دەربچێ تا گیرفانی دەبڕن، یاخود پارەی لێ دەدزن یان تالانی دەکەن!

ز- بۆیاخچی، دەرگەوانی ئەپارتمانەکان، وردەفرۆش، ڕۆژنامەفرۆش، شاگردی چاپخانە و چێشتخانەکان، هەندێک لە ئۆتۆمبیلچی و کوڵهەڵگرەکانیش... وەک خۆم لێم دیبێ. تا پێیان بکرێ بەزمانلووسی بێ یان بەچاوڕاو، بەفڕوفێڵ بێ یان بەبێ ئابڕوویی، بەپاڕانەوە بێ یاخود بەزۆرەملێ... لە کۆڵ پیاو نابنەوە تا پارەی لێ دەپچڕن یاخود دڵی ئازار دەدەن!

ئەمە مشتێک بوو لە خەروارێک لە کردەوە و ڕەوشتی میسرییەکان کە زۆربەی نەتەوەکە لەم بابەتەن. ئەمەیش ناڕەوایە کە بڵێم لە میسردا پیاو و ژنی چاک نییە، ئێمە نابێ ناوی ئەو گەورەپیاو و گەورە ژنانەی میسرمان لەبیر بچێتەوە کە خەباتیان کردووە بۆ نەتەوەکەی خۆیان تا لەدەست ئەو ناڵەبارییە نەتەوەکەی خۆیان ڕزگار بکەن، لە کۆڕی زانست و وێژە و هونەردا، لە کۆڕی زرنگکاری و پیشەسازیدا گەلێک پیاوی گەورە گەورە لە میسردا پەیدا بووە: (سعد زغلول، شيخ محمد عبده، مصطفى كامل، سلامة موسى، احمد عرابي پاشا، عباس محمود العقاد، عائشة تيمور، مصطفى أمين، علي أمين، قاسم أمين، أم كلثوم و يوسف وهبي...) لەو جۆرە پیاوانەنە، لەو جۆرە ژنانەن.

بەڵام شوێنی میسر وا هەڵکەوتووە کە هەموو دەم چاویان لێ بڕیوە، داگیرکەرانی: (عەرەب و عەجەم و

تورک و مەمالیک، ڕۆم و یۆنان و ئینگلیز و فرەنسا ) ئەم نەتەوەیەیان لەکەلک خستووە... لەبەر ئەوە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆر و دوور و درێژی پێ دەوێ لەگەڵ یاسایەکی ڕاست و دروست و دادپەروەرانە کە ئەم کارە بخاتە ئەستۆی خۆی تا ئەم نەتەوەیە وای لێ بێ خۆی ڕزگار بکات لە دەست زۆرداریی خۆی و دەروونی ناپەسەندی خۆی و کردەوەی ئەنگی خۆی... تا وای لێ دێ بێتە گەورەی دەروون و دڵی خۆی و بژێتەوە و ببووژێتەوە ئینجا دەست بکات بەچارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی خۆی لە کۆڕی هەژاری و نەخوێندەواری و نەخۆشی و زۆرداریدا. لەم فەرمانڕەوایییەی عەبدولناسر کە پتر لە پانزە ساڵە لە ئارادایە[1]، میسرییەکان لە هەژاری و نابووتی و سەرشۆڕی و پەشێواوی بەولاوە هیچیان بۆ نەماوەتەوە، بەهۆی جەنگی عەرەب و ئیسرائیلەوە بایی ٣٠٠٠ ملیۆن دۆلار سامانی لە دەستچوو، بێجگە لەوە لە خاکەکەشی بەشی زۆر گرنگی کەوتە دەست ئیسرائیل و مەترسیی ئیسرائیلەوە.

٨٠٪ لەشکرەکەی لەم جەنگەدا لەناوچوو، نە کرێکار و نە جووتیار، هیچ لایەکیان باری ئابووریان ڕووی نەکردە چاکی، دەوڵەمەندەکان و دەستەڵاتدارەکانیشیان ڕەویان کرد بۆ دەرەوەی میسر یان پارەکانیان دەرباز کرد. کەواتە نەتەوەی میسر ئەم شۆڕشەی جەمال عەبدولناسری بەکاری چی هات؟! پێشکەوتنی پیشەسازی بەکەلکی چی دێ ئەگەر دەستکەوتی (کەس) بەشی خواردن و نووستن و گوزەرانی نەکات؟!

کە نەتەوە ئازادیی نەبوو هەستی خۆی دەربڕێت چ لە کۆڕی نەتەوەدا چ لەناو کۆبوونەوەکاندا چ لەناو ڕۆژنامە و گۆڤار و نووسراوەکاندا، ئەم شارستانێتییە بەکاری چی دێ؟!

کەواتە شاگردەکانی زانستگۆ مافیان هەیە ئازار و هاواری نەتەوەکەیان لە شێوەی مانگرتن و نومایشدا پیشان بدەن، دژی فەرمانڕەوایییە...[2] خاکی ئیسلامیان داگیر دەکرد، (سەلاحەدین) ئیسلامەکانی پاراست و بووژاندنیەوە و سەریشی بەرزکردنەوە. میسرییەکان، بەتایبەتی زانا خاوەن دەروونەکانیان[3] پێ لەم چاکانەی سەلاحەدین دەنێن، بەڵام داخەکەم فەرمانڕەوایییەکانی عەرەب بەتایبەتی میسر هیچ ئەو چاکانەی سەلاحەدینیان لەبەرچاو نەبووە و نییە[4]. نە چاکەیەکی کوردیان دایەوە، نە یارمەتییەکیان دا لە دەست زۆرداریی داگیرکەران ڕزگاری بکەن، نە هەستێکی پاکیشیان دەربڕی بەرامبەر کەینە و بەینەی شۆڕشەکانمان؟!.

(١) شۆڕشی میسر کە ڕژێمی پاشایی لابرد و شێوازی بەڕێوەچوونی وڵات گۆڕا بۆ جەمهووری، لەلایەن دەستەی ئەفسەرانی ئازادەوە (ضباط الاحرار) لە سوپای ئەو وڵاتەدا لە ٢٣ی تەمووز -یۆلیۆ- ١٩٥٢ بەرپابوو، سەرکردەکەیان لیوا (محەممەد نەجیب) بوو. جەمال عەبدولناسر یەکێک بوو لە ئەندامانی ئەو دەستەیەی کە دواجار توانی بێتە ڕیزی پێشەوە و جڵەو بگرێتە دەست.

(٢) لێرەدا وەک دەردەکەوێ یەک دوو پەڕەی دەفتەرەکە ون بووە.

(٣) خاوەن دەروونەکان: واتا خاوەن ویژدانەکان (اصحاب الضمائر).

(٤) نەک ئەمە، بەڵکو زۆریشیان دان بە(کوردیەت)ی ئەو سەرکردەیەدا نانێن!!.

**١٩٦٨/٣/٢٤**

ئەمڕۆ بەفڕۆکە گەڕامەوە بەغدا، لە شامدا نانی چێشتەنگاوم خوارد، لە بەغدا دوو سێ ڕۆژ و شەوی خۆشم ڕابوارد.

**١٩٦٨/٣/٢٧**

گەیشتمەوە نیشتمان، چاوم بەسلێمانی و خانووەکەم و خێزان و خزمان و دۆست و هاودەمان ڕوون بووەوە. گەشتێکی خۆشم ڕابوارد کە هەرگیز ئەو خۆشییەم لەبیر ناچێتەوە... لەش و دڵ و گیانم بووژایەوە.

سوپاس بۆ خوای گەورەی بێ هاوتا کە بەبێ وەی، بەشادمانییەوە گەڕامەوە خاکەکەی خۆم[1].



هەر لە ساڵی ١٩٦٨دا بەناوی (پرشنگ)ەوە نووسراوخانەیەکم کردەوە، نووسراوخانەکەم، تا ڕێکخستن و ڕازاندنەوەی تەواو بوو، شەش مانگێکی خایاند. سوپاس بۆ خوا؛ بووە سەرچاوەیەکی کەلک و چاکە و کامەرانی بۆ خۆم و بۆ کوردەواری. هەوڵم دا بەهۆی نووسراوخانەکەمەوە ڕێز لە نووسراوی کوردی و لە نووسەرانی کورد بگرم و دەستیشیان بگرم، یاخود یارمەتیان پێشکەش بکەم[2]، لە هەموو لایەکەوە زانایان و نووسەران و ڕۆشنبیرانی کورد، لەناسیاو و لە نەناسیاو، کە دەهاتنە سلێمانی، هەروەها ئەوانەی لە سلێمانی بوون، سەریان لێ دەدام و، گفتوگۆی وێژەیی و زانستییان لەگەڵدا دەکردم. هەندێکیان بێجگە لە پیرۆزبایی لێ کردنم، یارمەتیشیان دەدام. هەروەها لاوە ڕۆشنبیرەکانی سەر بەوێژە و زانستیش، بەکوڕ و کچیانەوە دەهاتنە لام، بۆ پیرۆزبایی، بۆ گفتوگۆ و ڕاوێژ و پرسیار... (پرۆژەی خوێندەواری کورد) و نووسراوانی کەسانی تر... جێگاکەیشی خۆش هەڵکەوتبوو، فراوان و پاک و پوختە و ڕازاوە بوو، ڕێک و پێک و دروست بوو. میوانەکان دەیانگوت: «بووەتە یەکەم نووسراوخانەی خاکەکەمان. سەری نیشتمانەکەمانی پێ بەرز بۆتەوە»، چونکە بێجگە لە نووسراوفرۆشتن، بابەتی نووسین (قرطاسیة) و خواردەمەنی ناو قوتوو و، دیاری ناوازە و، وێنەی

(١) تا ئێرە و ئەو بەشەی ناو دەفتەرە بچووکەکە تەواو بوو.

(٢) نووسەری ئەم پەراوێزانە یەکێک بوو لەو قوتابیانەی کە زۆر کەڕەت سەردانی ئەو نووسراوخانەیەی دەکرد و لەگەڵ یەک دوو برادەردا بەهەست و ئەستانەوە گوێڕادێری ئامۆژگارییەکانی مامۆستا دەبووین و لە یادمە کە نامیلکەی (ئەشتەرد کولەکەی...) لە نووسینی مامۆستا ئەبەزم بۆ یەکەم جار لەوێ چاو پێکەوت و دانەیەکی دامێ. خۆ کە ١٩٦٨ سەردانی چیکۆسلۆڤاکیای کرد و گەڕایەوە، چووین بۆ خۆشهاتنەوەی، بەدرێژی باسی دابەزینەکەی لەشکری سۆڤیێتی بۆ کردین و بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەکەی (دۆپچێک) لەو وڵاتە. لەوەدا دیارییەکی دامێ (هەڵۆیەک لە کاتی بزاڵی فڕیندا) لە دارێکی بەڕووی جوان تاشراوە و تا ئێستاش لەلام ماوە.

کوردەواری و کوردستانی جوان و نایاب و، زەوی و، جگەرەیشی دەفرۆشت. هەروەها بێ پارە سەنن، بەخۆڕایی، وتار و، وەرامدانەوەی پرسیار و، سەرپەرشتی کردنی نووسراو دانان و، گفتوگۆ و ڕاوێژ پێشکەش کردن و، گەلێک ڕاژە (خدمت)ی تری پێشکەش بەخوێندەوارانی کورد دەکرد... چونکە ئامانجی نووسراوخانەکە پارە دەستکەوتن نەبوو، کە ئەویش هەر بۆ چاپکردنی نووسراوەکانی پرۆژەی خوێندەواری کورد بەکاردەهێنرا... هەروەها کۆڕێکی وێژەیی و زانستیش بوو، بۆ نووسەران و زانایان و شاگردانی وێژە و زانست و هونەری جوان. نووسراوی هەر نووسەرێکی کوردیشم دەفرۆشت. نیوەی مزی خۆم لێ هەڵدەگرت. واتا ١٠٪ی نرخەکەیم لێ هەڵدەگرت، کە لە نووسراوخانەکانی تر ٢٠٪ و ٣٠٪ یان هەڵدەگرت. بەم ڕەنگە ئەم نووسراوخانەیەیش بووبووە جێگایەکی خۆشی و شادمانی و سروەت و ئارام، بۆ هۆش و دڵ و دەروونم.. لەوەتی کراوەتەوە تا ئێستا (١٩٧٠/١٢/٣١)، (٥٦) وتارم نووسیوەتەوە، کە هەندێکیانم لە شوێنە گشتییەکاندا خوێندۆتەوە، نووسراوێکی گەورەم داناوە. پانزە نووسراویشم لە هی پرۆژەکەم لە چاپ داوە. پارمەتییەکانیشم بۆ خوێندەوارانی کورد، گەیشتوونەتە خاکەکانی دەرەوە، بۆ (قاهیرە) و (پراغ) و (تاران)، بێجگە لە کوردستان.

* لەسەر خواستی هەندێ لە خوێندەوارانی کورد، (نووسراوە چاپکراوەکانی پێشووم) و (نووسراوە چاپ نەکراوەکان)یشم خستە سەر پرۆژەکەم. بەهەمووی کردیە (١٢٥) نووسراو.

# نووسراوە چاپكراوەكان

ئەمە ناوی ئەو نووسراوانەیە كە لە ناوەند ساڵەكانی ١٩٣٣ و ١٩٥٩دا لە چاپم داون:

| | | |
|---|---|---|
| ١- خانووی تازە | نووسینی كامل گەیلانی | پەرچڤەكراو |
| ٢- فەرهەنگۆک | = = | |
| ٣- پرشنگ | = = | |
| ٤- شەبەنگە بەرۆژ | = = | |
| ٥- شەبەنگە بەرۆژ | = = | |
| ٦- گەورە پیاوان | = = | |
| ٧- هاورێی منال | = = | |
| ٨- ئافرەتی كورد | = = | |
| ٩- ژینی نوێ | = = | |

* لەو سەد نووسراوەیش كە گۆڕیومنەتە سەر زمانی كوردی، لەگەڵ نووسراوێكی خۆمدا كە تازە دامناوە -ساڵی ١٩٦٨- ئەمانەم لە ناوەند ساڵەكانی ١٩٦٧-١٩٧٠ لە چاپم داون:

| | |
|---|---|
| ١- زەردەشت | نووسینی ئەحمەد ئەلشتاوی |
| ٢- سوكرات | = ئەفلاتوون |
| ٣- دیڤالیرا | = سین نوڤولین |
| ٤- گاریبالدی | = هەنری تۆماس |
| ٥- لویس پاستێر | = دانالی |
| ٦- مادام كوری | = دانالی |
| ٧- چیرۆكی مەم و زین لە تەرازوودا | = شاكر فەتاح[1] |
| ٨- كۆمار | = ئەفلاتوون |
| ٩- چارلسی یەكەم | = سێر پاتریک هاستینگز |
| ١٠- سوسیان ئەنتۆنی | = هنری و داناتۆماس |
| ١١- ڤۆلتێر | = دانا ولی تۆماس |
| ١٢- یەزیدییەكان و ئایینی یەزیدی | = شاكر فەتاح |

* ئەمەش ناوی ئەو نووسراوانەیە كە خۆم دامناون و هێشتا لە چاپ نەدراون:

| | |
|---|---|
| ١- گەشتی شارباژێر | نووسینی شاكر فەتاح |
| ٢- گەشتی پێنجوین | = شاكر فەتاح |

(١) ئەم نووسراوە، لە ڕاستیدا بریتی بوو لە پێشەكییەک بۆ نووسراوی (مەم و زین) كە (محەممد سەعید ڕەمەزان) بەپەخشانی عەرەبی دایناوە. (ش. ف)

٣- = = هەڵەبجە و هەورامان = شاکر فەتاح
٤- = = سرۆچک = شاکر فەتاح
٥- = = ئاکرێ = شاکر فەتاح
٦- مامۆستای زمانی کوردی و عەرەبی = شاکر فەتاح
٧- ئاوێنەی ژینم = شاکر فەتاح
٨- خوێندنەوەی نوێ = شاکر فەتاح
٩- هاواری پێشکەوتن = شاکر فەتاح
١٠- کۆمەڵە ڕۆژنامەی خورماڵ = شاکر فەتاح
١١- کۆمەڵە ڕۆژنامەی باسەرە = شاکر فەتاح
١٢- کۆمەڵە ڕۆژنامەی چەمچەماڵ = شاکر فەتاح
١٣- کۆمەڵە ڕۆژنامەی ئاکرێ = شاکر فەتاح
١٤- بەلقیس کچەشای سەبە، = شاکر فەتاح
١٥- گفتوگۆ بەکوردی و ئینگلیزی = بەرلیچ، لە تورکی و ئینگلیزییەوە کراوە بەکوردی و ئینگلیزی[1] بەم پێیە، من هەر لە سەرەتای ژیانمەوە تا ئێستا، (٢١) نووسراوم لە چاپ داوە.

* بەم ڕەنگە ئەم هەشت ساڵەی پاش جیابوونەوەم لە فەرمانی میری، لە کامەرانی و کارگوزاری و سەربەرزیدا ڕابوارد. ڕۆژ بەڕۆژ لە پێشکەوتن و سەرکەوتن و بەرکەوتندا بووم. ئەگەر خەمێکم هەبووبێ بۆ خۆم نەبووە. بۆ گشت بووە، کە لە سەردەمی (شۆڕشی گەورەی کورد)دا، زۆربەی کوردەوارییەکەمان لەوپەڕی تەنگانە و سەرگەردانی و ناخۆشیدا بوون، جار و بارێکیش کە شەڕ دەوەستا لە ناوەند (شۆڕش)ەکە و (فەرمانڕەوایی)دا، بۆ چەند مانگێک پشوومان دەدا. کەمێک دەحەساینەوە. لەم ماوەیەدا بەتایبەتی لە شارەکانماندا دەستدرێژی و چەپ و گوپ و ڕیزە کارەساتێکی تەنگ و ناخۆش ڕوویان دا، دەستی فەرمانڕەوایی خراپ و هەندێ لە خێزییەکانی خۆمانی تێدا بوو، کە مێژووی کورد شەرم دەکات بیانگێڕێتەوە!... بەڵام کە گەیشتینە ١١/٣/١٩٧٠ ئاشتی و ئاسایش دامەزرایەوە،[2] ئەتەوە دەستی

(١) داخەکەم بەهۆی کارەساتی ڕۆژگارەوە ئەم دوو نووسراوەی دواییان (١٤، ١٥) لەناوچوون. لە ساڵەکانی ١٩٣٣ و ١٩٣٤دا کرابوون بەکوردی. (ش. ف)

(٢) لەو ڕۆژەدا ڕێککەوتننامەکەی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بەڕابەرایەتی بارزانیی نەمر و حکومەتی عێراقی کە حزبی بەعسی عەرەبی بەڕێوەی دەبرد مۆرکرا و بۆ خەڵکی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا لەلایەن سەرۆکی عێراقی ئەحمەد حەسەن بەکرەوە خوێندرایەوە، ئەو ڕووداوە گرنگی و بەهای لەوە دابوو کە بۆ یەکەم جار بوو حوکمێکی عەرەبی عێراق لە چوارچێوەی ڕێککەوتننامەیەکی ڕەسمیدا دان بەمافی نەتەوەیی کورد دابنێ و حوکمی زاتی دەستنیشان کرێ.. ئەو ڕاگەیاندنە لە ناوەخۆ و دەرەوەی عێراقدا کاردانەوەیەکی نیجابی چاکی بەخۆوە گرت، بەهۆیەوە کوردستانی عێراق بەتایبەتی و عێراق بەگشتی پێیان نایە قۆناغێکی نوێی خۆشگوزەرانی و ئاوەدانی و بەرەو پێشەوەچوونەوە.

کردەوە بەحەسانەوە... لە جیاتی شین و گریان و هاوار، هەڵپەڕکێ و گۆرانی و ساز و ئاواز پەیدابوون... لە هەندێ ڕووەوە بووژاینەوە و گەشەمان کرد... چونکە فەرمانداری خۆیی (حکمی زاتی) سێنرا و دەستی پێ کرد. ڕۆژی سەربەستی کۆبوونەوە و، ئاخاوتن و نووسین گرنگی دا و هەموولایەکی ڕۆشن کردەوە... چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیەک و گەلێک نووسراوی کوردی چاپ کران و کەوتنە پێش دەم هەموان. تەلەفزیۆن و ڕادیۆش بەو پێیە گۆڕان و چاکتریشیان لێ هات... بەر لەم گرانی داکەوتبوو. چونکە سنوور لە کوردەواری بەسترابوو. باجی فەرمانڕەوایش فرەتری لێ هاتبوو... بازرگانیش کزبوو... هەڵپەرستی و چەپ و گوپ و هەڵپە بۆ سایە و پایە و مایەی ناڕەوا. هەروەها چاوڕاو و تەڵەکەبازی تەشەنەیان کردبوو هەندێ لە دڵڕەشەکان دەستیان کردبوو بەکنەکردن و داونانەوە و ئاژاوگەری... بارستایی ڕەوشت و خوو نزمایەتی دەرکەوتبوو... هاوار و فەریاد دەستی پێ کردبوو... نەتەوە وریا بووەوە. ڕەنج و تەقەللا و خەبات بۆ کەلکی گشتی تینیان سەندەوە، کە هیوا وا دەکرێ لە ساڵانێکی زوودا ژینمان باشتری لێ بێتەوە.

لەم ساڵەی دواییدا، ئاهەنگ و زەماوەندێکی زۆر کرا بەبۆنەی ١١ و ٢١ی مانگی نەورۆز (ئازار)ەوە. شادمانی گشت لایەکی گرتەوە. لە هەموو لایەکەوە پیرۆزبایی لەگەڵی کورد کرا. (یەکێتی نووسەرانی کورد)، (کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد) دامەزرێنرا.

بۆ (کۆڕی زانیاری کوردی) یاسا دەرکرا... بۆ دامەزراندنی (زانستگای ویژەی کوردی) لە (زانکۆی سلێمانی)دا بڕیار درا... بۆ دەرهێنانی گۆڤاری (برایەتی)[2] و گۆڤاری (پەیام)[3] و گۆڤاری (زانیاری)[1] و گۆڤاری (هەولێر)[2] و گۆڤاری (نووسەری کورد)[3] و ڕۆژنامەی (التآخي)[4] و

(٢) برایەتی: سەرەتا وەک گۆڤارێک لە سلێمانی دەردەچوو، بەهەشتی ڕەمزی قەزاز سەرپەرشتی دەکرد، دوایی چووە بەغدا و بووە پاشکۆی (التآخي) بەهەفتانە و خوالێخۆشبوو ڕەفیق چالاک سەرپەرشتی دەکرد. لە ١٩٧٤/١/١دا بۆ یەکەم جار لە مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا ئەم هەفتەنامەیە بووە ڕۆژانە و هەتا شەڕ لە نێوان شۆڕشی کورد و حکوومەتی بەغدادا هەڵگیرسایەوە دەردەچوو.

(٣) پەیام: لەو ڕۆژگارەدا گۆڤارێک نەبووە بەم ناوەوە، بەڵام یەکێتی قوتابیانی کوردستان گۆڤارێکیان هەبوو بەناوی (پەیامی قوتابیان)ەوە. دەبێ ئەوبێ.

(١) زانیاری: گۆڤارێکی زانیاری گشتی بوو، ئیمتیازی د. عەزیز ئەمین و ئەنعەت نادر، سکرتێری نووسین: د. ساماڵ مەجید فەرەج، ژمارەیەکی لە ئەکتۆبەری ١٩٧٠دا لە بەغدا دەرچوو، یەکەم گۆڤارێکی تایبەت بووە بەزانیاری ڕووتەوە و ئاستێکی بەرزی هەبوو، هەشت ژمارەی لێ دەرچووە.

(٢) هەولێر: گۆڤارێکی ڕۆشنبیری بوو شارەوانی هەولێر مانگانە دەری دەکرد، بەکوردی و عەرەبی، محەممەد مەولوود سەرنووسەر و بەڕێوەبەری سەعدی محەممەد ئەمین دزەیی بووە، لە مایسی ١٩٧٠دا ژمارەیەکی دەرچوو لە حوزەیرانی ١٩٧٢دا دوا ژمارەی دەرچووە.

(٣) نووسەری کورد: گۆڤاری ئەدەبی، یەکێتی نووسەرانی کورد لە بەغدا دەری دەکرد، سەرنووسەر د. مارف خەزنەدار بوو. ژمارەیەکی لە مارتی ١٩٧١دا دەرچوو، هەتا ساڵانی کۆتایی هەشتاکانیش بەردەوام بوو؛ بەڵام بەچەند خولێکی جیاوازدا تێپەڕی و ئەم دەست و ئەو دەستی دەکرد.

(٤) التآخي: ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سیاسی گشتی بوو بەعەرەبی لە بەغدا دەردەچوو، خاوەنی ئیمتیاز حەبیب محەممەد کەریم و سەرنووسەر شەهید دارا تۆفیق بوو، ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان و شۆڕشی کوردبوو.

ڕۆژنامەی (ژین)[1] و، دامەزراندنی ڕێکخراوەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان) ڕێ درا... بارەگاکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان) لە هەموو ناوچەکانی خاکی کوردستان و خاکەکانی تری عێراقدا، بەشەنگ و شۆخییەوە خۆیان دەرخست و دەستیان کرد بەفەرمانکردن.

منیش لە (یەکێتی نووسەرانی کورد)، لقی سلێمانیدا، کراە بەئەندام و هەڵبژێرام و بووم بەجێنوشینی سەرۆک[2] لەم ساڵی (١٩٧٠)یەدا (٥٦) وتارم لە بابەت ویژە و مێژووی کورد و کۆمەڵایەتی کوردەوارییەوە نووسییەوە. هەندێکیان چاپ کران و، هەندێکیشیان خوێنرانەوە...

پەیوەندیم لەگەڵ برادەرانی (پارتی دیموکراتی کوردستان)دا تازە بووەوە و بەهێزتری لێ هات... لە بابەت (شۆڕشی کورد)ەوە وتارێکم لەبەردەم (٧٠) حەفتا مامۆستا و میم وەستا[3] دا خوێندەوە، لە گۆڤاری (برایەتی)یشدا بڵاوم کردەوە.

(نوێنەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان) چەند جارێک هاتنە لام و، ڕوویان لێ نام کە ببمە سەرنووسەری گۆڤارە نازدارە ناودارەکەیان (ڕزگاری) کە دەیانویست سەرلەنوێ دەری بهێننەوە[4].

هەروەها سەرپەرشتی کردنی هەردوو چاپخانەکەی (پارتی دیموکراتی کوردستان)یشیان بەمن سپارد، کە لە (سلێمانی)دان و، هێشتا نەکەوتوونەتە گەڕ... هەردوو خواستەکەیانم بەسوپاسەوە خستە سەر چاوم و بەڵێنم بۆ بەجێ هێنانیان پێ دان...

لە تەلەفزیۆنی (کەرکووک)دا، دوو وتارم لەسەر (زێوەر و مەلا کاکە حەمە)[5]دا لای دڵسۆزان

(١) ژین: ڕۆژنامەیەکی ویژەیی هەفتانە لە سلێمانی دەردەچوو، خاوەن ئیمتیاز و بەرێوەبەری نووسینی خوالێخۆشبوو کاکەی فەللاح بوو، سەرنووسەری بەهەشتی عەبدولقادر بەرزنجی، ژمارە یەکی لە ١٠/١٢/١٩٧١دا دەرچووە.

(٢) لە ١٠/١٢/١٩٧٠ یەکێتی نووسەرانی کورد لقی سلێمانی دامەزرێنرا و لە ئەنجامی هەڵبژاردنی دەستەی بەرێوەبەردا مامۆستا شێخ محەمەد شێخ عەلی شێخ ئەمین خاڵ ١٩٠٤-١٩٨٩ هەڵبژێردرا بەسەرۆک، مامۆستا شاکر میرزا فەتاح ئەحمەد بەجێگری سەرۆک و حەوت ئەندامی تر. بەڵام پاش چەند مانگێک مامۆستا خاڵ لە سەرۆکایەتی و ئەندامەتی خۆی کشانەوە.

(٣) میم وەستا: کە گەڕامەوە بۆ دەستنووسە ئەسڵەکە، دەفتەری ژمارە (٤) لاپەڕە (٢٠٧) بۆم دەرکەوت کە مەبەستی (مامۆستای ئافرەت)ە چونکە نووسیویە: ... (٧٠) مامۆستا و مامۆستای ژندا. بەڵام وشەی (ژن)ەکەی کوژاندۆتەوە و لەسەرییەوە (میم وەستا)ی نووسیوە، وشەکە دیارە و دەخوێنرێتەوە.

(٤) ڕزگاری: کاتی خۆی، بەر لە دەرچوونی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠، ئەم گۆڤارە لە سلێمانی دەردەچوو، بەبڵاوکردنەوەی ڕێککەوتننامەکە وەستا، دیارە دوایی ویستراوە سەرلەنوێ بیخەنەوە گەڕ و دەری بکەنەوە.

(٥) دوایی بابەتی ئەو دوو وتارە تەلەفزیۆنییە، کرانە دوو نامیلکە و (مەلا کاکە حەمە) لە ١٩٧٢ لە چاپخانەی کامەرانی لە چاپ درا. خۆیشی لەلاپەڕە (٣١)دا ئاماژە بەوە دەکات کە لە ١٦/١١/١٩٧٠دا لە تەلەفزیۆنی کەرکووکەوە خوێندراوەتەوە. (زێوەر)یش لە ١٩٧٤ دیسان لە چاپخانەی کامەرانی لە چاپ درا.

پەسەندكران. لە سلێمانییشدا دوو وتارە لە كۆبوونەوە گشتییەكاندا لەسەر (شێخ سەلام) و (فائق بێكەس) خوێندەوە. وتارێكیشم لە كاتی هەڵبژاردنی ئەندامانی (یەكێتی نووسەرانی كورد)دا لە سلێمانی و، دامەزرانیدا دا... شەش وتاریشم بۆ مامۆستایان و میم وەستایانی سلێمانی لەسەر مێژووی (زەردەشت) و (یەزیدی) و (شۆڕشی كورد) و (كەریم خانی زەند) خوێندەوە... هەشت وتارم نارد بۆ گۆڤاری (برایەتی) كە هی (پارتی دیموكراتی كوردستان) بوو لە بەغدادا، دووانیان لێ بلاوكرانەوە، شەش وتاریشم نارد بۆ گۆڤاری (سلێمانی)[1]، یەكێكی لێ بلاوكرایەوە... دوو وتاریشم نارد بۆ ڕۆژنامەی (ژین) لە سلێمانی، هەردووكی بلاوكرایەوە. وتارێكیشم نارد بۆ گۆڤاری (پەیام) كە هی (یەكێتی قوتابیانی كوردستان)ە هێشتا بلاونەكرابوونەوە. سێ نووسراویشم لە نووسراوەكانم، لە هی پرۆژەكەم لە چاپ دا: (چارلسی یەكەم) و (سۆسان ئەنتۆنی) و (ڤۆلتێر)، بێجگە لە بەشی زۆری نووسراوی (یەزیدییەكان و ئایینی یەزیدی) كە چاپكردنی كەوتبووە ئەم ساڵەوە.

هەر لەم ساڵەدا بانگیان كردم بۆ ڕاوێژكردن لەسەر دامەزراندنی (كۆڕی زانیاری كوردی - المجمع العلمي الكردي) لە بەغدادا. ئەمەیش سوپاسی خودای دەوێ، كە لە پاش هەشت ساڵێك جیابوونەوە لە فەرمانی میری، گەلێك فەرمانی ئازادم بۆ خۆم دۆزییەوە، كە نەك هەر سەرچاوەی كامەرانیم بوون، بەڵكو دەرامەتیشمیان ئەمەندە بەرز كردبوەوە، كە مانگانەكەم نزیك بەمانگانەی فەرمانبەرێكی گەورەی دەگرتەوە... بەواتایەكی ڕۆشنتر ئەو مانگانەیەی لە فەرمانڕەوایی وەرم دەگرت، هەندێ ساڵ ئەوەندەیشم بەرەنجی شانی خۆم پەیدا دەكرد... ئەو كارانەی بەدەستمەوە بوون، هەرچەندە تا ئەوسا لە فرۆشتنی نووسراوەكانم و فرۆشیاری نوسراوخانەكەم سوودی پارەم دەست نەكەوتبوو، بەڵام چونكە بێ وەی بەكەلك و چاك بوون بۆ هەمووان، خودای گەورە لە چەند لایەكی تریەوە دەرووی فەر و چاكەی لێ دەكردمەوە. كە دەتوانم بڵێم سەرم بەو ئەنجامە بەرز بووبووەوە و، دڵیشم شادمان ببوو. بەواتایەكی تر خودا هەروەك بۆ (ئیبراهیم پێغەمبەر) ئاو ئاگرەكەی كرد بەفێنكی بەهەشت، بۆ منیش «هەرچەندە من ڕایەم ناكەوێ خۆم لەگەڵ پێغەمبەرێكی وا دا بەراورد بكەم» ئەم ئاو جەرگی شۆڕشەی لەم هەشت ساڵەدا كرد بەژینێكی پڕ لە سەربەرزی و كامەرانی، كە هەتا دەمێنم كڕنووشی سوپاس و ئەوازش و بەندەیی بۆ دەكێشم.

## سلێمانی (١/١/١٩٧١ - ٣٠/٩/١٩٧٧)

* لەم ماوەیەدا (٨) نووسراوم دانا. (١٦) نووسراوم پەرچڤەكرد. (٤) نووسراویشم لەگەڵ لیژنەدا پەرچڤەكرد بۆ (دەسگای خوێندنی كوردی). (٢٩) وتارم لە گۆڤار و ڕۆژنامە كوردییەكاندا بلاو كردەوە. (١٠) نووسراویشم چاپ كرد. (٢) وتارم لە تەلەفزیۆندا دا. (٥٠) وتارم لە ڕادیۆی كوردیدا

(١) سلێمانی: بلاوكراوە (لە شێوەی گۆڤاردا) شارەوانی سلێمانی لە تەمووزی ١٩٦٨ەوە مانگانە بلاوی دەكردەوە، سەرنووسەری جەمال بابان، بەهەشتی محەمەد مستەفا كوردی بەڕێوەبەری نووسینی بوو، گۆڤارەكە كۆمەڵێ باسی كۆمەلایەتی و ئەدەبی و تەندروستی و مێژوویی چاكی گرتبووە خۆی.

بلاوکردەوە.

* لە بەهاری ١٩٧١دا وازم لە نووسراوخانەی (پرشنگ) هێنا و، نووسراوخانەیەکم لە گۆشەیەکی جیاکراوەی خانووەکەی خۆمدا دامەزراند، ناوم نا: (نووسراوخانەی پرۆژەی خوێندەواری کورد). لێرەدا لە پاش چەند مانگێک فرۆشتنم تەنیا بۆ نووسراوەکانی خۆم تەرخان کرد. زۆربەی کاتی خۆم بەنووسراو دانان و نووسراو پەرچقەکردنەوە بەخت دەکرد.

دوای لە ١٩٧٧/٩/٣٠دا بەبۆنەی دامەزرانمەوە لە (ئەنجوومەنی پاسادانانی کوردستان)دا، لە هەولێر نووسراوخانەکەم داخست.

* لە بەهاری ساڵی ١٩٧٣دا وتارێکم لەسەر (پرسە)دا، لە هۆڵی (زانکۆی سلێمانی). پێشنیازم کرد کە هەڵبگیرێ. لە ساڵی (١٩٦٨)یشدا ئەو وتارەم لە گۆڤاری (سلێمانی)دا بڵاوکردبووەوە و، دوا بەدوای ئەوە وتووێژم لەو بابەتەوە لەگەڵ گەلێک رۆشنبیراندا کردبوو. دیسانەوە ئەو وتارەم لە ساڵی ١٩٧١دا لە کۆڕی «نووسەرانی کورد»ی لقی سلێمانیدا خوێندبووەوە. خۆشبەختانە لەگەلێک لاوە پێشنیازەکەم پەسند کرا. مامۆستایانی بەرێز (کەریم زەند) و (١٥) مامۆستای پیاو و، (مەلیحە مەلا کەریم) و (١٥) میم وەستا و، خودالێخۆشبوو (شێخ مستەفای شێخ مەعروفی قەرەداخی) و گەلێک لە ئەندامانی (پارتی دیموکراتی کوردستان)، بەکوڵی دڵەوە پێشنیازەکەمیان پەسەند کرد. دوایی کاربەدەستانی ئەوسا، بەهۆی لیژنەیەک لە زانایانی ئایینییەوە دەستیان کرد بەجێبەجێ کردنی پێشنیازەکەم. ئەنجامیش بەوە گەیشت لای پیاوان باری گرانی پرسەکە گەلێک سووک کرا. بەڵام لای ژنان، هەرچەندە دەست بەسووککردنی کرا، بەڵام کە چەرخ گۆڕا، ئافرەتەکان پاشگەزبوونەوە. خۆزگە کاربەدەستان پێشنیازەکەمیان بەتەواوەتی جێبەجێ دەکرد و، ئەم پرسەیەیان بەیەجگاری هەڵدەگرت کە زۆرداریەکی زۆری تێدایە بۆ خاوەن پرسەی کڵۆڵ و سەرگەردان. چونکە ئەرک و ئازارەکەی و پارە بەختکردنەکەی لە ئەندازەبەدەرە و، پشتی ئابووری ماڵە مردوو دەشکێنێ![1]

* لە مانگی نەورۆزی ساڵی ١٩٧٤دا بۆ (کۆنگرەی پەرچقەکردن لە بەیروت)دا بانگ کرام. لە ١٩٧٤/٣/١١دا بەشداریم کرد لەگەڵ چوار مامۆستای کوردی تردا. لە کۆنگرەکەدا بایەخێکی زۆریان بە(ئێمەی کورد)دا. چوار رۆژی خۆشمان لەگەڵدا رابوارد. لە هەموو لایەکی جیهانەوە هاتبوون.

بەهەموومان (٣٥) کەس کۆبووبووینەوە. گەلێک وتاری بەنرخی تێدا درا. گەلێک لە نووسراوەکانی خۆمم بردبوو، پیشانم دان. شەوی دوایی کە ئاهەنگێکی ئاوازەیان بۆ کردبووین، گەلێک گۆرانی و

(١) رێڕەوی مێژوویی خستنەڕووی ئەو پێشنیازە، بەپێی ئەم باسەی مامۆستا، ئاوایە:
١- لە ١٩٦٨ لە گۆڤاری (سلێمانی)دا بڵاوی کردۆتەوە.
٢- لە ١٩٧١ لە کۆڕێکی یەکێتی نووسەرانی کورد، لقی سلێمانی، خوێندوویەتیەوە.
٣- لە ١٩٧٣ لە هۆڵی زانکۆی سلێمانی کۆڕێکی بۆ گرتووە و تیایدا خوێندوویەتیەوە.



شاکر فەتاح لە ساڵی ١٩٧٠دا

ئاوازی بەنرخی کوردیم لەسەر تۆمارکارێک (مسجلەیەک) بەگوێدا دان. بەتاسوقێکەوە گوێیان لێ دەگرت. گۆرانییەکان کوردی و نیشتمانی بوون.[١]

* چەند جارێک گەشتی خۆشم کرد بۆ (لوبنان) و (تورکیا) و (میسر) هەر جارە مانگێکم پێ دەچوو. یادنامەکانی خۆم لەسەر دەنووسینەوە. چەند نووسراوێکی نایابیشم لە بابەت کوردەوە دەستکەوت و کڕیم.

* لە بەهاری ١٩٧٤دا، داخەکەم شەڕ و شۆڕ لە ناوەند (فەرمانڕەوایی عێراق) و (شۆڕشگێڕانی کورد)دا دامەزرایەوە. دڵسۆزانی (کورد) و (عەرەب) زۆر هەوڵیان دا ئەم شەڕە تازە نەبێتەوە. داخەکەم سەری نەگرت. لە بەهاری ١٩٧٥دا شەڕەکە کوژایەوە. ئاسایش و ئارام سەرلەنوێ لە کوردستاندا دامەزرایەوە جێی داخە کە زیانێکی زۆر گەورە لە هەردوولا کەوت.

* لە بەهاری ١٩٧٤دا، دەست کرا بەدامەزراندنی (فەرمانداری خۆیی کوردستان - ئۆتۆنۆمی

(١) وەک مامۆستا کەریم زەند لە پێنج شەممەی ٢/٦/٦ ٢٠٠دا بۆی باس کردە و هەروا وەک بەشێک لە یادداشتەکانی (تۆماری تەمەن -٤-) نووسیویە، وتی: «لە ڕاستیدا ئەو کۆنگرەیە وەک دەوروبەرەکیش وابوو، ٢٠ ڕۆژی خایاند، لە زۆر وڵاتی جیهانەوە بەشداران بانگهێشت کرابوون. وا بزانم کۆنگرەکە لەلایەن -جمعیة الکتاب المقدس- و کۆڕی زانیاری ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە ڕێکخرابوو، کوردەکان: شاکر فەتاح، کەریم زەند، د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی، قەشە یوسف پەری لە پاریسەوە هاتبوو، د. ئیحسان فوئاد و د. کامەران بەدرخان، کە ئەم دووانەی دوایی نەهاتبوون. گەلێ وتار و محازەرەی بەکەڵک دەربارەی وەرگێڕان بۆ ئامادەبووان درا، شاکر فەتاح لە وتەی کۆتاییدا وتی: من ساوایەکی نوێم لە کۆمەڵگایەکی دەولیدا تازە لەدایک بووم، ناوم کوردە، نوێژم بۆ بکەن. شوێنی کۆنگرەکە لە ڕۆشەی بەیروت. ئوتێلی (بۆریڤاج) بووە».

کوردستان). بەرەبەرە هەموو دەسگاکانی جێی خۆیان گرت و دامەزران. هەروەها فەرمانبەرەکانیشیان پەیدا کردن. (ئەنجوومەنی یاسادانانی کوردستان) و (ئەنجوومەنی راپەڕاندنی کوردستان) لەلایەن (ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی عێراق)ەوە هەڵبژێرران و دامەزران. ئەم خولە سێ ساڵی خایاند.

* لە هاوینی ساڵی ١٩٧٥دا کرام بەئەندامێک لە (ئەنجوومەنی گەلی سلێمانی - مجلس الشعب في السليمانية)دا. دوایی کرام بەئەندامێک لە دەستەی کارگێڕانی ئەنجوومەنەکەدا. لە برانەوەی ساڵی ١٩٧٦دا کرام بەسەرۆکی ئەنجوومەنەکە. ئەو ماوەیەی لە ئەنجوومەنەکەدا بووم، لەگەڵ کۆمەڵێکی گەورەی رۆشنبیرانی سلێمانی و ناوچەکانی کۆبوونەوەمان دەکرد.

* من ئەمەندە لە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنەکەدا ئەمامەوە، چونکە لە ١/ ١٠/ ١٩٧٧دا کرام بە ئەندامی (ئەنجوومەنی یاسادانانی کوردستان) و (جێگری سەرۆکی ئەنجوومەن)ەکە. ئیتر بەپێی یاسای ئەنجوومەنی تازەم لێی جیابوومەوە.

## هەولێر (١/١٠/١٩٧٧ - ١٥/١١/١٩٨٠)

* لە ١/ ١٠/ ١٩٧٧دا لە یەکەم کۆڕی (ئەنجوومەنی یاسادانانی کوردستان)دا هاوبەشیم کرد. لەبەر ئەوەی تەمەنم لە تەمەنی هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنەکە زۆرتر بوو، کردیانم بەسەرۆکی کۆڕەکە، تا هەڵبژاردنی ئەندامانی سەرۆکایەتی و، سوێندخواردنی ئەندامەکان کە بەسەر راستییەوە فەرمان ببینن و، ناوی ئەندامەکان خوێندرایەوە و زانرا کێ هاتووە و کێ نەهاتووە، فەرمانم تێدا بینی. ئیتر کە (سەرۆک) و (جێگری سەرۆک) و (رازنووس) هەڵبژێرران، من سەرۆکایەتییەکەی خۆمم دایە دەست سەرۆکی هەموو دەمی[1]. جا لەبەر ئەوەی خۆیشم بووبووم بەجێگری سەرۆک، لەلای دەستی راستی سەرۆکەوە دانیشتم، ئەم خولە تازەیە سێ ساڵ دەخایێنێ.

* شاری هەولێر، شارێکی مێژووییە، تەمەنی خۆی دەدا لە (٤٠٠٠) چوار هەزار ساڵ. ئێمەی کورد شانازی دەکەین بەوەوە کە توانیویتی، بەرامبەر ئەو هەموو گێژەلووکانەی رۆژگار و، ئەو هەموو هێرشانەی، کە داگیرکەران کردوویانەتە سەری، خۆی ئەمەندە ساڵان بپارێزێ و نەهێڵێ وێران ببێ و، لەناو بچێ. هۆی ئەمەیش ئەوەیە کە (هەولێر) هەموو دەم پیاوی گەورە گەورەی پێ گەیاندووە، لە زانایان و، وێژەوانان و، زرنگکاران و، هونەرمەندان و، جەنگاوەران. ئەوانە توانیویانە بەهێز و هەرەت و نازایی و مەندیی و زرنگی و، نەرمی خۆیان، نیشتمانەکەیان بپارێزن. تەنانەت ئەگەر ئازار و زیانیشی پێگەیشتبێ توانیویانە سەرلەنوێ بیبووژێننەوە و گەشەی پێ بکەنەوە. لە سایەی خودا و کۆششی خۆیانەوە، ئیمڕۆ (هەولێر) گەیوەتە ئەوەی بووەتە پایتەختی (فەرمانڕەوایی خۆیی کوردستان). ئەمە گەلێک ساڵە لە پێشکەوتن و گەشەکردن و پەرەسەندنایە. تەنانەت ژمارەی سەری دانیشتووانی شاری (هەولێر) دە ئەوەندەی ژمارەی سەری خۆی لێ هاتووە کە لە ساڵی ١٩٤٧دا بوویەتی. جا لەبەر ئەمەی رۆشنبیران و کارگوزارانی کورد لە هەموو لایەکەوە رەویان بۆ کردووە و، روویان تێ کردووە هێوا وا

(١) هەموو دەمی: هەمیشەیی (دائمی).

دەکرێ، لە دامەزراندنی شارستانێتییەکی گەورە و گرنگ و پیرۆزدا، (هەولێر) بەزوویەکی زوو سەر بکەوێ.

* لە ١٥/١١/١٩٨٠دا خولی ئەندامێتیم لە ئەنجوومەنەکەدا تەواو بوو. سەرم لە دۆست و برادەرانی (هەولێر)دا و، مالئاواییم لێ کردن. لە خودام دەوێ هەموو دەم خۆیان و شارەکەیان و (ناوچەی کوردستان) لە سەربەرزی و شادمانی و خۆشگوزەرانیدا ببینم و، لەگەڵ جیابوونەوەمدا ئەوپەڕی ڕێز و سوپاسیان پێشکەش دەکەم.

## سلێمانی (١٦/١١/١٩٨٠ - ٣١/١٢/١٩٨٨)

* دوو مانگ لە پێش جیابوونەوەمدا لە هەولێر، خانووەکەی سلێمانیم بەکرێ گرتەکە چۆڵ کرد، سەرلەنوێ تەراوم دایەوە و، تازەم کردەوە و، پۆشتەم کردەوە و ڕازاندمەوە. ئینجا خێزانم بەکەلوپەلەکانەوە ناردەوە سلێمانی. ئەم جارە لەسەر شێوەیەکی لە جاران جوانتر و ڕێک و پێکتر ژوورەکانم ڕازاندەوە. بایەخێکی زۆرم دا بەژووری فەرمانکردنم، کە هەر لەوێشدا میوانانم پێشوازی دەکرد. لەسەری سالی (١٩٨١)ەوە دەستم کردەوە بەفەرمانکردن. ئەو دەسگایانەی داوای یارمەتییان لێ کردم، یاخود بانگیان کردم بۆ کۆبوونەوە و میهرەجانەکانیان، یان پرسیاریان لێ کردم، کاروباریانم بەدڵخۆشییەکەوە ڕاهی کرد. ئەوانیش یاداشتیان دامێ و یارمەتییان دام لە پرۆژەکەمدا. بەم بۆنەیەوە بەپێویستی دەزانم سوپاسی گەرم و گوڕم پێشکەش بەدەسگای (ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی) و (دەسگای خوێندنی کوردی) و (دەسگای ڕۆشنبیری و لاوان) بکەم لەگەڵ دەسگای (کۆڕی زانیاری عێراق / دەستەی کورد).

* ئەو کار و فەرمانانە و، ئەو بەرهەمانەی لەم ماوەیەدا پێشکەشی کوردەواریم کردووە ئەمانەن: (٤١) نووسراوم چاپ کردووە. (٥) پێنج وتارم خوێندۆتەوە بۆ جەماوەران لە (سلێمانی) و (هەولێر) بۆ هەردوو دەسگاکەی نەوجەوانانی کوڕان و کچانی شاری سلێمانی هەریەکە (٥٢٦) پێنج سەد و بیست و شەش نووسراو، بۆ (١٤) چواردە نووسراوخانەی گشتی تریش هەریەکە (٢٦) بیست و شەش نووسراوم بەدیاری پێشکەش کردووە. لە (١٣) سیانزە میهرەجان و کۆڕیشدا ئامادە بووم بۆ گوێگرتن بۆ دایەنگایەکیش لە سلێمانیدا چەند یارییەکم بۆ مندالان پێشکەش کردووە. (٦٠) دیناریشم بەشێوەتەوە بەسەر هەژارانی ناو پەککەوتەخانەی سلێمانیدا. بەکۆمەڵ بۆ چەند دەسگایەکیش نووسراوەکانی خۆم بەدیاریی ناردووە، چ لە کوردستانی عێراقدا، چ لە ئەورووپادا. (٨) هەشت نووسراویشم داناوە. (١) یەک نووسراویشم لەگەڵ لیژنەیەکدا پەرچڤە کردووە بۆ دەسگای (خوێندنی کوردی).

* لە مانگی مشتاخان (ئەیلوول)ی سالی (١٩٨٠)وە شەڕ دەستی پێ کرد لە ناوەند فەرمانڕەوایانی (عێراق) و (ئێران)دا. ئەم شەڕە بێجگە لەوەی کەلکی بۆ هیچ لایەکیان تێدا نییە، زیانێکی یەجگار زۆریشی لە گیان و سامانی هەردوو لایان داوە. ئەمە ڕاستە گەلێک لە دەولەتەکان و دەسگاکانی جیهان کەوتنە ناوەند هەردوولایانەوە، ناوبژیان بکەن و، شەڕەکە بکوژێننەوە، یاخود هەر هیچ نەبێ بیوەستێنن،



لەبەردەم قەڵای بیبلۆس - بەیروت هەندێ لە ئەندامانی کۆنگرە. شاکر فەتاح لە ناوەڕاستدا، لای ڕاستی کەریم زەند، لای چەپی قەشە یوسف پەری

بەڵام چونکە دەوڵەتە گەورەکان کەلکی ناپوختەی خۆیان لەم شەڕەدا دەبچڕن. تا دێت ئاگری شەڕەکە خۆش دەکەن. هەندێکیشیان بەیارمەتی نهێنی چەک و بابەتی جەنگ هەردوو لایان پێکەوە تیژ دەکەنە سەر شەڕکردن.

داخەکەم کوردستانەکەی ئێمەیش چ لە ئێراندا و چ لە عێراقدا بەشی هەرە گەورەی کاولبوون و سەرگەرادنی و کوشتاری لەم شەڕەدا پێ براوە. جا نازانم کەی دەروون و دڵ و هۆشی جیهانی زیندوو دەبێتەوە و، خەبات دەکات بۆ ئەوەی ئەم جەنگە ڕابوەستێنێت و، ئەم دوو دەوڵەتە دراوسێیە و، ئەم دوو نەتەوە هاوئایینە بخاتەوە ئاسایش و ئارام دۆستایەتییەوە؟!.

* ئەمە (٦٢) شەست و دوو ساڵە بەسەر (پرۆژەی خوێندەواری کورد)دا تێپەڕیوە. تا ئێستا پرۆژەکەش (١٢٠) نووسراوی کردووە بەکوردی. (٥١) نووسراوی داناوە. واتا (١٧١) نووسراوی ئامادە کردووە بۆ چاپکردن. لەمانە (٨٦) نووسراوی چاپ کردووە. (٢٠٤) وتاریشی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردۆتەوە. (١١٢) وتاریشی لە ڕادیۆی کوردیدا داوە. (٨) وتاریشی لە تەلەفزیۆنی کوردیدا بڵاوکردۆتەوە. بۆ (١٢) نووسراوخانەی گشتیش لە کوردستانی عێراقدا هەریەکە (٥٢٦) نووسراو و گۆڤاری بەدیاری پێشکەش کردووە.

* هەر کەسێ پێویستی بەشارەزایی زۆرتر هەیە لە بابەت (پرۆژەی خوێندەواری کورد)ەوە، تکایە تەماشای نووسراوی (مێژووی پرۆژەی خوێندەواری کورد) بکات کە لە ژمارە (١٠٢)ی مانگی



**لە بەهاری ١٩٧٤ - لوبنان - کۆنگرەی بەرچقە**

مامۆستا کەریم زەند و شاکر فەتاح

میوەخۆش (تەمموز)ی ساڵی ١٩٨٤دا بلاوکراوەتەوە.[١] ئیتر نەمەندە و لە خودام دەوێ لە ساڵی ١٩٨٥دا هەموو لایەکمان دڵخۆش بکات بەموژدەی ئاشتی و ئاسایش و ئارامی گشتی، تا ساڵی ١٩٨٥ لە هەموو کوردێک و لە هەموو مرۆڤێکی سەرزەمین پیرۆز بێت[٢].

(١) مەبەستی گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ)یە کە دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی کوردی لە بەغدا دەری دەکات.

(٢) ئەم پەرەگرافەی دوایی لە پاکنووسی یادداشتەکانیدا نەبوو، بەڵکو لەو دەفتەرە دایە کە سەرەتا نووسیویە.

# کۆتایی

ئەم بەشە بەدەست و خامەی مامۆستا شاکر فەتاح نییە، کاری ئەو لێرەدا تەواو دەبێ. لەناو پاشماوە و بیرەوەری و دەستنووسەکانیدا شتێکم بەرچاو نەکەوت کە پەیوەند بێ بە رۆژانێک دوای ١٩٨٨/٣/١٢، ئەو ڕۆژەی کە وتارەکەی لە کۆڕەکەی هەولێردا خوێندەوە و بووە مایەی سەری.

جا بۆ بەدیارخستنی چۆنێتی کۆتایی ئەو کاروانە دوور و درێژەی ژینی، چۆنێتی وردوخاشبوونی ئەو ئاوێنەی ژینەی، دەبێ بکەوینە پرس و ڕای ئەوانەی ڕاستەوخۆ ئاگاردا بوون بەو ڕووداوەوە یان ناڕاستەوخۆ شتێکیان دەربارەی زانیوە.

بەر لە هەموو شتێ دەبێ ئێمە ڕادەی (ڕاستی و گومان) لەو گێڕانەوانە لە بیر و هەڵوێستەکانی ڕابردووی مامۆستاوە هەڵێنجین، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو شریتی عومرەی کە هەر لەو کاتەوەی گەنجێکی تازە پێگەیشتووی کەم تەجرەبە بووە: هەستی، بیری، هیوا و ئامانجی، خواست و ئارەزووی ئایندەی، چۆن بوون؟ بەچ ڕووکارێکدا ئاراستەیان دەکرد و دەستنیشانی هەنگاوەکانی ئایندەیان دەکرد.

ئەو لە هەرزەکارییەوە هەموو ڕووداو و کردەوەیەکی بەسەنگ و تەرازووی (بەرژەوەندی نەتەوە و نیشتمان) دەپێوا، دادپەروەری و ئازادی و ئازادی ڕادەربڕینی کردبووە سەرەتایەک بۆ هەنگاونانی نەتەوە بەرەو بەختەوەر، تێکۆشانیش لەم پێناوەدا لای شاکر فەتاح بەشێوازێکی دوور لە توند و تیژییەوە (لاعنف) بوو، پەپوولە و فریشتە ئاسا، بەبێ دەنگ و هێمنانە کاری بۆ دەکرد... لە کوێ دەرفەت بڕوایە، هەل بڕەخسایە، ئەو لە دەستی نەدەدا و بەپێی توانا کاری بۆ دەکرد.

خۆ کە بڕیاری بەشداریکردنیشی داوە لەو کۆڕە فیکریەدا، ئەوە هەر لەو بنەما پاک و دڵسۆزانەوە بووە: دەرفەتێکە و ڕەخساوە، لە جێیەکی ئاوادا و بەئامادەبوونی کەسانی نیزیک لە مەرکەزی قەرار یان لەوانەیە هەر لەو مەرکەزەدابن... بۆ داوا و خواستی خەڵکەکە نەگەیەنێ؟... دەقاودەق هەروەک لە ١٩٤٠دا میری بەقسەی نەکرد کە قوتابخانەیەک لە خورماڵدا بکاتەوە، ئەو خۆی بڕیاریدا کە قوتابخانەیەکی شەو بکاتەوە، بەتوانا و کەرستەیەکی زۆر ساکار، بەیارمەتی یەک دوو خێرۆمەندی شارۆچکەکە... مۆمێکی داگیرساند. هەر بەو جۆرەش لە ١٩٨٨/٣دا دیسان لەو شەوە دەیجووردا ویستی مۆمێکی دی داگیرسێنێ، بەشکو ترووسکاییەکەی بیدات لە چاوی ئەوانەی لە بەرزییەوە وەستابوون. ئەمە بەمەنتیقی بیری ئەمڕۆی ئەوانەی بڕوایان بەهەڵتەکاندنە بنەڕەتییەکە هەیە: کارێکی بێ سەمەرە و هیچی لێ ناکەوێتەوە، چونکە زەمینەیەکی لەبار و پتەو و پێداویستییەکانی داگیرساندنی ئەو مۆمە لە ئارادا نییە... جا (فوو)ی سەرسەختێ دەیکوژێنێتەوە.

باشە خۆ هەر هەمان تەجرەبە لە دنیای ئەوانیشدا هەیە و هەبوو: لۆمۆمبای شەهید، گیڤارای جوانەمەرگ، زەففاری لە تینووا خنکاو، زۆر دوور نەڕۆین: کۆماری ١٩٤٦ی کوردستان، پێشتر شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و دەرسیم و...

ئەگەر ئەو مۆمانە، لەو شەوە زەنگانەدا، بەشاکر فەتاحیشەوە خەفە کران و کوژێنرانەوە، بەڵام خۆ بوونە چراوگێ بۆ داهاتوو، ئایندە، لاپەڕەکانی مێژووی ئەو نەتەوەیەیان پرشنگدارتر کردووە، هۆکارێکن بۆ جۆشدانی گیانی لە خۆبوردن و تەقەللای بەردەوام.

کەواتە ئەو پیاوە (لەو ڕۆژە و لەو شوێنەدا) ئەقڵی لە دەست نەدابوو، هۆشی لای خۆی بوو کە بەشداری کرد و دوایی ئەو داخوازییە ڕەوایانەی دا بەگوێی هەمواندا... ئێمە ئەمەمان یەکلایی کردۆتەوە، ئەو ئامادەش نەبوو کە لەوەی وتوویە پەشیمان بێتەوە، کەواتە خۆی بۆ هەموو پێشهات و کارەسات و سزایەک ئامادە و موهەییا کردبوو.

مامۆستا کەریم زەند کە ئەندامی یەکێتی نووسەرانی سلێمانی ئەو ڕۆژە بووە، لەگەڵ مامۆستادا دەبێ، دەڵێ: بەر لە ساڵێک، یانی ١٩٨٧، کاربەدەستانی ئۆتۆنۆمی لە هەولێ گێرانی کۆڕێکی ئاوهابوون، پەیوەندییان بەم و بەوەوە دەکرد کە نیازی شتێکی وایان هەیە، ئەو ساڵە ١٩٨٨ توانیان کارەکە ئامادە کەن.

(کاروان) گۆڤاری ئەمینداریێتی ڕۆشنبیری و لاوانی حوکمی زاتی، لە ڕیپۆرتاژی خۆیدا بۆ ئەو کۆڕە وا دەنووسێ: «سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندنی ناوچەی کوردستان، لە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٣،١٢ یەکەمین -دیداری فیکری- ساز کرد. بۆ باسکردن و شیکردنەوەی ئەو فەرمایشت و وتە ئاراستەکردنانەی سەرۆکی فەرمادە سەدام حوسێن خوابیپارێزێ، دەربارەی گەلی کورد و دەزگای ئۆتۆنۆمی لە ناوچەی کوردستاندا.

ئەم دیدارە ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان بەهاوکاری لەگەڵ یەکێتی ئەدیبان و نووسەرانی کورد ڕێکیان خستبوو»[1]. ئەو ڕۆژە، سەعات دەی بەیانی، هۆڵەکە جمەی دەهات لە ئامادەبووان، زۆر لەوێ بوون،... گەورەیی شاکر فەتاح لەوەدایە کە یەکێک بوو لە بەشداربووان و بابەتی هەبوو، دوای وتارە تەقلیدییەکان بۆ کردنەوەی کۆڕەکە ئەو یەکەم کەس بوو کە دەبوو باسەکەی پێشکەش بکات و وا ئێستا ئێمە بەشکۆوە ناوی ئامادەبوون و بەشدارییەکەی دێنین! بەڵام هەیە، بەدەیان، کە لەو بەیانییەدا و دواتریش ئامادەبوون بەڵام کە لێیان دەپرسی خەجاڵەتی دەیانگرێ، بەدەستیان بێ هەرچی ئەو ژمارانەی (کاروان)ە کۆی کەنەوە، بەرەسەکانیشەوە هەمووی بسووتێنن، تا نە ناو و نە وێنەیان نەمێنێتەوە.

بەڵام کە دەڕوانینە ڕیپۆرتاژەکە نە ناو نە وێنەی (شاکر فەتاح)ی تێدا نییە... لێرەدایە جیاوازی نێوان ئەو و کەسانی تر.

(... سەعات ١٠ی بەیانی شەممە ١٩٨٨/٣/١٢ لە هۆڵی ئەنجوومەنی یاسادانانی ناوچەی کوردستان لە هەولێر، لەژێر دروشمی -باوەڕمان بەئۆتۆنۆمی هەرگیز لاواز نابێ- بەچاودێری بەڕێز سیروان

(١) کاروان، گۆڤار: ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ژمارە (٦٣) ئازار و نیسانی ١٩٨٨، ل: ٤-١٣.

عەبدوڵڵا حوسێن جاف، سەرۆکی ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندن کاروباری ئەو دیدارە فیکریە دەست پێ کرا.[1] ... بەئامادەبوونی وەزیرانی دەوڵەت: عەبدوڵڵا ئیسماعیل، هاشم عەقراوی، ئەرشەد زێباری و ئەحمەد عەبدولقادر ... هتد).

مامۆستا کەریم زەند دەڵێ:[2] دوای وتارەکان، یەکەم باس کە ڕێگا درا پێشکەش کرێ، باسەکەی مامۆستا شاکر بوو. زۆر لەسەرخۆو ئاسایی باسەکەی خوێندەوە، باری ژیانی گەلی کورد لە دووتوێی وتەکانی سەرۆکەوە پڕۆژە ئاوەدانییەکان و دامەزراوەکانی حوکمی زاتی و... دوایی هێنایە سەر کۆمەڵێ (داخوازی) کە خۆشی و بەختەوەری گەل و ناوچەکەی لێوە بەدی دەکرێ:

١- تصالحوا مع ثوار الأكراد.

٢- إعادة القرى...

لێرەدا یەکێ لە دەسەڵاتداران هەستا و وەستاندی، لۆمەی کرد کە چۆن وا دەڵێ و ئەوانە بە(ثوار) ناودەبات، ئەوانە بەکرێگیراوی ئاغاکانیانن. مامۆستا وتی: «سوڵح لەگەڵ ئاغاکانیان دەکەن بۆ لەگەڵ ڕۆڵەکانی خۆتانی ناکەن؟»

لە هۆڵەکەدا بوو بەدەنگە دەنگ، شڵەژان، پیاوانی میری پەست و نیگەران، لە ڕیزەکانی دواوە هەبوو گەش و دڵخۆش، هەریەک لە بەرپرسان قسەیەکی دەکرد، مامۆستاش وەک هەمیشە بزەیە سەر ڕووی لاوازی گرتبوو، بێ دەنگ، چاوی بەئامادەبواندا دەگێرا، بێ ئەوەی بەوردی گوێ بۆ یەکێ لەو قسەکەرانە شل کات.

د. نافع ئاکرەیی هەستا و وتی: برایینە، ئەمە دیموکراتییەتە، با قسەی خۆی بکات.

سەلاح شوانیش دوای ئەو وتی: حوسنی نیەتە، بۆ لە خۆمانەوە تووڕەبین و هەڵچین.

مەلا ماتور (عەبدوڵڵا ئیسماعیل وەزیری دەوڵەت) هەستا کۆمەڵێ قسەی باشی کرد، وەک بیەوێ ئاوێک بکا بەو ئاگرەی کرایەوە.

سیروان جاف ڕووی کردە محەممەد ئەمین ئەحمەد ئەمینداری ڕۆشنبیری و لاوان، پرسی: ئەمە چۆن تێپەڕیوە؟ موسڵح جەلالی، بەڕێوەبەری گشتی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی هەستا و وتی: نقاش بوومستێ، ئەم باسە لەناو باسەکانی ئەم ئەدوەیە دەربێنن.

منیش هەستام و بەناوی نووسەرانی کوردەوە داوام کرد کە قسە بکەم، ئەوەی کۆڕەکەی بەڕێوە دەبرد ڕێگای دام، وتم: «سراة القوم... أيتها السرياة المثليات قدمنا الى المؤتمر هذا ومنبره في هذا المنتدى وهو مهرجان المريد بعنه وخبمته وبضاهمه... وورثه هو العراق العظيم.

(١) دیارە کە بەعەرەبی ئەمە ناونیشانی بوو: (الندوة الفكرية الخاصة بأحاديث السيد الرئيس القائد صدام حسين حول الشعب الكردي ومؤسسات الحكم الذاتي تحت شعار: إيماننا بالحكم الذاتي لا تزعزع) (سەرچاوەی پێشوو)

(٢) چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا کەریم زەند. لە پێنج شەممەی ٦/٦/٢٠٠٢ سلێمانی.

وان رواده ومن دخله فهم آمنون بمقتضى قانون الدولة، المسؤلة عن جميع أبنائها أبنما كانوا. سواء كانوا في الداخل والخارج وعن أبناء جبالها وسهولها وسهوبها وحتى عن الشاهرين السلاح بوجهها... فما جئنا إليه مادحاً بل داعياً للخير والبر والسلم عاجلاً أم آجلاً.

وآملاً بأن نعيد عليه دوماً... تعاظم ذنبي بموقفي هذا وان قورنته بعفوكم فكان عفوكم أعظما».

داوایان لێ کرد لەو قسانەی دوایی پەشیمان ببێتەوە، لەناو قاعەکە، بەڵام وتی: پەشیمان نیم... نەتانهێشت تەواوی کەم.

بۆ ئێوارە چوون بۆ ئوتێلەکە بۆ لای، داوای لێبوردن و پەشیمانیان لێ کرد، بەڵام ئەو لە پەڕەیەکدا بۆی نووسیبوون کە: من شاکر فەتاحم بەهەمموو ئەقڵ و هۆشی خۆمەوە ئەو قسانەم کردووە و کەس لەوە بەرپرس نییە. لێشی پەشیمان نیم. ئیمزای دەکا و دەیداتە دەستیان.

دانیشتنەکانی تری ئەدوەکە دەهات و ئامادە دەبوو، بەڵام قسەی نەدەکرد، کە هاتیەوە سلێمانی، هیچ خۆی نەشڵەژان و ئاسایی چۆوە ماڵەوە.

لەم ڕووەوە مامۆستا خالید شێخ محەممەد خاڵ لە نووسینێکیدا کە تایبەت بەم یادداشتانە بۆی ئامادە کردم دەڵێ:

«... لەژێر چاودێری تاقمێک لەکاربەدەستە بەعسیە کوردەکان و چەند کاربەدەستێکی بەعسی عەرەب بۆ لێدوانی دوو باسی سەرەکی، لە هەولێر سیمنارێک ڕێکخرا، باسەکان ئەمانە بوون:

١- کورد لە ویژدانی سەرۆکدا.

٢- گۆڕانکاری لە ئۆتۆنۆمی کوردستاندا لە وتەکانی سەرۆکدا.

مامۆستا شاکر فەتاح یەکێک بوو لەو نووسەرانەی کە داوای لێ کرابوو کە لەسەر ئەم دوو بابەتە باسێک بنووسێ و بیخوێنێتەوە.

وا دەردەکەوێ مامۆستا شاکر فەتاح پێشەکی لە دڵی خۆیدا بڕیاری دابوو کە هەنگاوێکی گەورە بنێ، وە مەسەلەکی گرنگ لە هەرە مەسەلە ئاڵۆزەکانی کورد کە هەموو دەمانزانی و زۆر کەس نەیدەوێرا باسی بکا لە ترسی میری، ئەو بیتەقێنێتەوە لە سیمنارەکەدا.

ئەم بڕیارەی مامۆستا ئێجگار قورس و سامناک بوو، لەو ڕۆژەدا، پیاوێکی ئازا و بەجەرگ و دڵسۆزی دەوێست، بۆ خاک و گەلەکەی، کە بتوانێ لە کۆڕێکی وادا بەئاشکرا بیڵێ، کە ئەنجامیش وەکو هەموو ئەیزانن ژیانی مامۆستای ئەبەزمان بوو کە لە ڕێی ئەو چەند وشەیەدا بەختی کرد.

بەبۆچوونی خۆم، مامۆستای شەهیدمان لە دڵپاکی و تا ڕادەیەک کورتبینی و بۆچوونێکی ناتەواوی خۆیەوە وای ئەزانی ئەگەر باسەکەی بەستایش و پیاهەڵدان بەسەر سەرۆکی کۆماردا دەست پێ بکات، بەرپرسیاریی کاولکردنی کوردستان و ئەم سەرگەردانییەی کە تێی کەوتووین بخاتە ئەستۆی کاربەدەستانەوە بێ ئەوەی سەرۆک کۆمار تاوانبار بکات... بەم چەشنە ئەتوانێ کارێکی وا بکات کە ڕاستەوخۆ ئەو پێشنیازانەی کە لە وتارەکەیدا ئامادەی کردبوو ئەگەر بیخاتە بەردەم کاربەدەستان -کە

بێگومان بەدڵیان نابێ و دەبێتە هۆی ڕق و کینەیان بەرامبەری- لەوانەیە چاوپۆشی لێ بکەن و سزای نەدەن... دەگونجێ ئەم کارەساتانەی بەکورد کراوە سەرۆک کۆمار ئاگای لە هەمووی نەبێ، لەوانەشە دوای ئەم کۆڕە سەرۆک ڕای بگۆڕێ و کارێکی وا بکا کە ئەنجامەکەی سوودێکی بۆ میللەتی کورد تێدابێ -با کەمیش بێ-.

مامۆستا وتارەکەی خوێندەوە، لە کۆتاییدا داوای کرد کە: لەگەڵ شۆڕشگێڕە کوردەکاندا ڕێککەون و دێهاتەکان ئاوەدان بکەنەوە و خەڵکی بگەڕێننەوە جێگاکانی خۆیان!

هۆڵەکە شڵەژا و بوو بەدەنگەدەنگ و ناڕەزایی دەربڕین، وتارەکەیان پێ بڕی و بەرەنگاری بوون و بەرهەڵستییەکی توندیان کرد. کوردە بەعسییەکان لەم قرەقرەدا دەنگیان زۆر زۆلاڵ بوو؛ هەزار بەردیان دابوو بەپشتی عەرەبە بەعسییەکاندا، بەتایبەتی (ئیبراهیم زەنگەنە)ی پارێزگاری هەولێر کە بەدەنگێکی بەرز قیژاندی و وتی: - ئەگەر ئەوان - کە مەخسەدی پێشمەرگەکانە- ڕۆڵەی گەل و شۆڕشگێڕبن کەواتە ئێمە خاین و پیاوخراپین.

شاکر فەتاحیش وادیاربوو چاوەڕوانی ئەمەی نەدەکرد، بەتایبەتی کە داخوازییەکانی هەموو ڕاستن و ئەنجامیشی خزمەتی گەل و میرییی تێدایە، بۆیە دەمی بوو بەتەڵەی تەقیو و حەپەسا و زۆر سەری سوورمابوو لەم وەزعەی کە دروست ببوو. ناچار بۆ بەرگری لە خۆی پێی وتن:

- ئێوە لەگەڵ ئاغاکانیاندا بەردەوام داوای ڕێککەوتن دەکەن، ئیتر بۆچی لەگەڵ ڕۆڵەکانی خۆتاندا ڕێ ناکەون. نیازی لە (ئاغاکان) ئێران بوو کە بەلای میرییەوە پێشمەرگە سەربەون و هەردوولا شەڕ دژی عێراق دەکەن و بۆیە ئێرانیان بەئاغایان دەزانی.

لەوانەی ئامادەی ئەم کۆڕە بوون تەنها سیانیان قسەی باشیان کرد: خوالێخۆشبوو دکتۆر نافیع ئاکرەیی و کەریم زەند کە بەرگرییان کرد لە مامۆستا و دەریانبڕی کە دیموکراتییەت ڕێ دەدا بەدەربڕینی بیروڕا لە کۆڕێکی وادا کە هی ئەدیبانە. هەروا (عەبدوڵلا ئیسماعیل)یش کە ئەو ساتە وەزیر بوو، ناسراو بە(مەلا ماتۆڕ)؛ ئەویش هێندێ قسەی ساکاری کرد کە تا ڕادەیە بەرگری تێدابوو و ڕۆڵی بوو لە خاوکردنەوەی ئامادەبووان. مامۆستا (موسلح جەلالی) کە ڕێزی هەبوو بۆ شاکر فەتاح داوای کرد کە لێدوان بوەستێنن و کۆبوونەوەی ئایندە بکەوێتە بەیانی. دوو ڕۆژی تریش کۆڕەکە بەردەوام بوو بەبەشداربوونی هەمووان، یەکێک لەوانە شاکر فەتاح بوو، دوایی هەرکەسە گەڕایەوە بۆ جێی خۆی.

دوای حەفتەیەک، کاربەدەستانی ئەمن لە سلێمانی، چوون بۆ لای شاکر فەتاح و لاپەڕەی کار - صحیفة الأعمال-یان پێ پڕ کردەوە و داوایان لێ کرد کە پەشیمان بێتەوە لەو قسانەی کە وتوونی. بەڵام پەشیمان نەبۆوە.

دوو ڕۆژ دوای ئەمە لە نیوەشەودا ئابلوقەی ماڵیان دا و بردیان. هەر ئەوەندە فریاکەوت فایلی باسەکەی بێنێ، وای دەزانی کە لێدوانی لەگەڵ دەکەن، نەیزانی دەیەن بۆ گرتن و کوشتن.

شایانی باسە دوای گرتنی مامۆستا شاکر هەوڵێکی زۆر درا کە بەربدرێ. بەتایبەتی لەلایەن

نووسەرانی سلێمانی و بەغداوە، مامۆستا (نوعمان ماهیر ئەلکەنعانی) کە جێگری سەرۆکی نووسەرانی عێراق بوو هیممەتێکی باشی کرد لەم ڕووەوە بەڵام بێ سوود بوو. لەم ماوەیەدا لیژنەیەک لە سێ ئەندام دانرا، دووانیان ئەمین سری بەعسی هەولێر و دهۆک بوون، سێیەمیشیان لێپرسیراوێکی بەعسی گەورە بوو، دەگوتیچ لە بەغداوە هاتبێ. ئەمانە کەوتنە پۆستکەندە -تحقیق-کردن لەگەڵ (محەممەد بەدری) کە لە یەکێتی نووسەران بوو، دەربارەی وتارەکەی شاکر فەتاح پرسیاری زۆری لێ کرا، پێیان وت کە واز لەم مەسەلەیە بێنێ چونکە هیچ سوودێکی نییە، وەرامەکانی شاکر فەتاحیان پیشان دا کە تیایاندا هەڵوێستی خۆی ڕوون کردۆتەوە و پەشیمان نابێتەوە لە قسەکانی. هەروا لە (سەلاح شوان و سەعید یەحیا خەتات)یش پرسیار کرا؛ چونکە ئەم دووانە ئەندامی ئەو لیژنەیە بوون کە سەیری بابەکانیان دەکرد بەرلەخوێندنەوەی. کاربەدەستان، هەموو، ترسیان بەرامبەر بەو چەند وشەیەی کە شاکر فەتاحێکی تەمەن نزیک هەشتا ساڵی وتی، لێ نیشتبوو. جا بزانە نرخی وشەی ئازا و ئازاد -الكلمة الشجاعة والحرة- لەوەدایە کە دەبێ لە کاتێکدا بدرکێنرێ کە زۆر کەسانی تر لە ترسدا نەوێرن دەری برن، جگە لەوەی ئەوەی دەیڵێت دەبێ پیاوانە و مەردانە ئامادەش بێت بۆ تەحەمولی بەرپرسیارییەکانی وشەکانی.

بۆیە لەم جۆرە کاتانەدا وشەی ئازاد نرخی زۆر بەرزە چونکە سانسۆری لە سەرە و لەژێر مەترسیدایە، بۆیە زۆر کاریگەرە چ لای دوژمنانی وشەی ئازاد و چ لای دۆستانی. بەشەرەکەش لە کۆتاییدا بەهەڵوێستەکانی دەنرخێنرێ، بەپێچەوانەش لە بارودۆخێکدا کە مەترسی لە وتنی وشەی ئازاددا نەبێت، ئەوسا وشەی ئازاد ئەو نرخەی نامێنێ؛ چونکە هەموو کەسێک دەتوانێ بەئەوپەڕی سەربەستییەوە بیڵێت بێ ئەوەی هیچ لەسەری بکەوێ و بەرپرسیار بێت لە ئەنجامی وشەکانی.

شاکر فەتاح کە تەمەنی نزیک هەشتا ساڵ بوو توانی بەچەند وشەیەکی پرشنگداری ئازادی کاریگەر ئامادەبووان بهەژێنێ و موچرک بە لەشیاندا بێنێ...

ئەو شەهیدی سەربەستی وشە و بیرە لە ڕێی گەل و نەتەوەکەیدا وە وەک قارەمانێکی لەخۆبوردووی خۆڕاگر پەشیمان نەبووەوە، چونکە باوەڕی بەو قسانەی بوو و دەیزانی دەبێ ژیانی بەخت کا لە سەری، هەروەک بەختی کرد، بەئەوپەڕی سەربەرزی و دڵنیاییەوە، بەنەتەوەکەی.

ئەم زانیارییانەم لە بەشێک لەوانەی کە ئامادەی ئەو کۆڕە بوون کۆکردوونەتەوە، وە ماوەیەک خۆم هیلاک کرد بەگەڕان بەشوێن هەواڵی ئەو سیمینارە، دەتوانم بڵێم بەئەمانەت ئەم ڕاستییانەتان دەخەمە بەردەم.

خالید محەممەد خاڵ

٢٠٠٢/٧/٣ سلێمانی

کە ورد دەبینەوە لەم دوو گێڕانەوەیە هیچی وایان جیاوازی نییە، تەنیا وردەکارییەکی کەم نەبێ لە ڕێڕەوی ڕووداوەکاندا. شایەدین بۆ پاکی و دڵسۆزی و نیەت خاوێنی ئەو پیاوە، بۆ جوامێری و دڵسووتاوی بەنەتەوەکەی و پێداگرتنی تا دوا هەناسە لەسەر ئەو دوو قسە هەقەی کە کردنی.

له ماڵەوە، لەلای هاوسەرەکەی چۆن بووە؟

جەمیلە خانی هاوسەری دەڵێ[1]: «هیچی نەوت، یەک دوو ڕۆژ هەستم دەکرد کەسانێک دێن بۆ لای، لەوانە نەدەچوون کە جاران دەهاتن: دۆست و هاوڕێ و نووسەران».

لێم پرسی، وتی: ئەوانە نووسەرانن... هیچی وا نییە.

بەڵام من کەوتمە گومانەوە، ڕۆژێ زۆرم بۆ هێنا، وتی:

«ڕاستییەکەی، دایکی شێرکۆ، ئەوانە پیاوانی حکوومەتن، لە هەولێر یەک دوو قسەم کردووە، دێن گوایە پەشیمان ببمەوە، بۆیان بنووسم». لێرەوە دڵم ترسا و ئیتر بەتەمای کارەسات بووم.

شەوی ١٩٨٨/٣/١٨ سەعات دوانزەی شەو لە دەرگا درا، من چووم بزانم کێیە، کە ڕوانیم عەسکەر لەناو حەوشە و سەر دیوارەکاندان، بردیان... بۆ پێنج دەقیقە بردیان، بەڵام هەرچەند سەر و سۆراغمان کرد لە سلێمانی، کەرکووک، هەولێر، و بەغدا نەبووە». دوایی، دوای شەش مانگ ئاگادار دەکرێن بەنەمانی.

شاکر فەتاح چۆن پەپوولە ئاسا هاتە دنیاوە، تەنیا... ئاواش تەنیا و بەبێ دەنگ ون کرا و بزە هەمیشەییەکەی سەر ڕووی نەبێ کە لە ئەندێشەی دۆست و هاوەڵان و ئاسیاوانیدا چەسپ ببوو هیچی دی جێ نەهێشت[2]. ماوەیە دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵ و دەنگی شەهیدکردنی مامۆستا، کامیل ژیری شاعیر و کەسایەتی نەتەوەیی دڵسۆز، ئێش و ئازارە پەنگخواردووەکانی ناو ناخی دەروونی بەم چامەیە خستە ڕوو، لە یەکێ لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی (هاوکاری)یشدا ئەو ساڵە بڵاوی کردەوە... بەسوپاسەوە لە (ڤیستیڤاڵی مەحوی)دا لە هەولێر، ڕۆژی ٢٠٠١/٨/٢٧ دایێن و جێگای خۆیەتی لەم کۆتاییەدا پێشکەشی کەین:

(١) چاوپێکەوتن لەگەڵ جەمیلە خاندا. هەینی ٢٠٠٢/٦/٧ ماڵی خۆیان، سلێمانی.

(٢) تۆلستۆی هەرچێکی دەوت و دەنووسی دژی قەیسەر نیکۆلای دووەم و حوکمە ئیستیبدادییەکەی، کەسێک لە پیاوانی دەوڵەت خۆیان تێنەدەگەیاند، بەڵام زیندانی و ئەشکەنجە و دوورخستنەوە بۆ سیبریا و مردن، بەشی قوتابی و مووریدەکانی بوو. جا بڕیاری دا: «أن يذهب إلى أقصى الطريق بان يوجه الأهانات الى القيصر نفسه، كي يقتص منه أخيراً. ولو مرة واحدة. فينفى ويدان ويكفر علنياً عن ثورة إيمانه وتمرده، لكن قيصر يرد على الوزير الذي تقدم إليه الشكوى: - أرجو ألاّ يمس ليون تولستوي بأذى. فأنا لا أنوي أن أجعل منه شهيداً. ولكن هذا هو بالضبط ماكان يريده تولستوي في سنواته الأخيرة. أن يصبح شهيداً كي يثبت للبشر صدق عقيدته واخلاصها. هذا هو بالضبط مايرفض القدر أن يمنحه أياه. ص: ١٥٣)، (بۆ زیاتر: ستيفان سفايج: ليون تولستوي...، ترجمة فؤاد أيوب، دار اليقضة العربية. سنة ومكان الطبع؟). ئەمە تەنیا بۆ بەراورد و تێڕامان!!

## پەردەیەک لە چیرۆکی دڵدارێکی کۆن

کۆنە دڵدارێ بەپێوانەی خۆی بەپەرۆشەوە
لە ناخی بیر و هەست و هۆشەوە
کڵێی بیرۆکەی نارامبوونێکی تازەی نایەوە
بەباوەڕەوە، بۆ پیاهەڵدانی تاکە یارەکەی
بۆ ڕۆژانێکی پڕ دژوارەکەی
لە ناهەنگێکدا، بەزاتێکەوە[1] هاتە کایەوە
وتی: منی مەم
خاتوو زینەکەم
گەرچی بێ بەشە
ناشرین نییە: گوڵێکی گەشە
هەر تەنیا ئەوە ئەوینی دڵدار
خاوەنی وشە و پەیام و بڕیار
بەڵێ ژینەکەم
خاتوو زینەکەم
لەناو بیر
لە شادەمار و ڕەگی پیرما
هەر دێت و دەچێ
تا بێ دەچەسپێ
نامەی پیرۆزە، واتای ڕەوایە
جێگەی هیوایە
لە پایزیشدا وزەی ئەوینە
پشکۆی ئاگرە و گوڕوتینێکم دەداتەوە بەر
ئەوا ئەمجارەش تێهەڵەچمەوە
بەبێ کرولەکە بانگی بۆ دەدەم
پڕ بەپڕی دەم
یا دەمی تینووم ئەنێمە دەمی
یا هەلاجێکی تری ئەم چەرخەش ئەیسپێری سەر
پەپوولەی ئەوین وەکو هەڵۆیەک

(١) بەزاتێکەوە: بوێرانە، بەچاوقایمییەوە

دای لە شەققەی باڵ بۆ سەر سەکۆیەک
ڕوانی ئاهەنگی دڵدارانێکی بێ دەزگیرانی دڵ مردووانە
ڕوانی نێو نیگای چاوی بێ برۆی ئەویندارانی ڕاکردووانە
ڕوانی شاییە، بێ بووکی تازە
ڕوانی چۆپیە، بەبێ ئاوازە
ڕوانی تابلۆکان بەناوەڕۆویی پیشاندراون
ڕوانی بینەران بەگوێرەی باڵا داچەقێنراون
سەری بێ سەری شێوە دەروێشی دێنن و دەبەن:
گوایە لە کاری خامەی ڕەنگینی دەستی هونەرمەند!
ڕوانی بێ بۆنی گوڵی دەسکردی کاغەز و پەڕۆ
هەناسە مژین، هەناسەدانە
بۆ سەرنجێکی ڕەزامەندێتی
لە بێ بۆنەشدا، بزەی دەسکرد و چەپڵە ڕێزانە

***

ئەویندارەکە پێشی خواردەوە
لە داخی باوی ئەوینی نامۆ خۆی تەقاندەوە
بوو بەوانەیەک بۆ ئەوینداریی
پەتی ڕاڕایی و گرێی دەروونی پێ ڕەواندەوە
سەکۆکەی هەژان
بزربوو لە چاو...
شانۆنامەکە کۆتایی پێهات
بەبێ ئەنجامی گەشی دڵداری
داخرا دەرگای هۆڵی کش و مات

بەڵام بۆ ئەو نەتەوە و خاکەی کە لە منداڵییەوە خۆشی دەویستن، زۆری بەجێ هێشت، نموونەی ئینسانێکی لە خۆبووردە و چاوقایی بۆ نەوەکانی دوای خۆی بەرجەستە کرد، سووربوون لەسەر ڕاستی و هەقپەرستی هەتا مردن.

بەداخەوە، ئەو هەتا ساڵانی کارکردنیشی لە فەرمانگەکانی میریدا، زۆر جار دووچاری کەللەڕەقی و کەسانی سەرسەخت و زۆردار دەبۆوە، بەڵام ئەمجارەیان، بەرامبەرەکەی ڕاوبۆچوونەکان لە ناخی مێشکیدا وا خڵتەی گرتبوو کە دەشی بڵێین: «ليست الخطورة في أن يختلف إثنان حول مسألة إنقدح لكل منهما فيه دليل مقنع، وإنما الخطورة كل الخطورة في أن يتحول الرأي في العقل إلى عصبية مستكنة في النفس».[1] شاکر فەتاح هێشتا قوتابییەکی شەشی سەرەتایی بوو کە دەیوت: «وام لێ هات لە دوای

خودا کەسی ترم لە -نەتەوەی کورد- خۆشتر نەدەویست. لە ڕاستیدا- کوردایەتی-م دەپەرست، بڕیارشم دا: هەتا دەمێنم سامان و گیانم لە پێناو کامەرانی و پێشکەوتن و سەربەرزیی -کورد-دا بەخت بکەم...

لەم کاتەدا کە ساڵی ۱۹۲۷ بوو، تەمەنم لە چواردە ساڵیدا بووە[٢].

درورود بۆ ئازایی و لەخۆبووردنت.

درورود بۆ گیانی ماندوو و پاکت، بۆ گۆڕی ونت لە هەر جێیە بێ.

(١) محمد سعيد رمضان البوطي، فقه السيرة: مقدمة الطبعة الثانية، ص ١٢.

(٢) شاکر فەتاح، ئاوێنەی ژینم، تافی منداڵیم.

# سەرچاوەکان


* ١- د. كوردستان موكرياني: زاري كرمانجي، دەزگەی چاپ و بلاوكردنەوەی موكريان، هەولێر ٢٠٠٢.

٢- فەلەكەددين كاكەيي، مەحمود زامدار: دەستنووسێكی شاكر فەتاحی شەهيد، چاپ و بلاوكردنەوەی وەزارەتی رۆشنبيری، هەولێر ١٩٩٨.

٣- محمد فتح الله گولن: قەدەر لە رووناكی قورئان و سوننەتدا، گۆڕينی: فاروق رەسول يەحيا، چاپخانەی ئازە، هەولێر، ٢٠٠١.

٤- شاكر فەتاح: خەباتی رۆشنبيران، چاپخانەی الحوادث، بەغدا ١٩٨٤.

٥- جمال خەزنەدار: رابەری رۆژنامەگەری كوردی، بەڕێوبەرايەتی گشتيی رۆشنبيری كوردی، وەزارەتی راگەياندن، بەغدا ١٩٧٣.

٦- جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەكەم، بەشی دوو، دەزگەی رۆشنبيری و بلاوكردنەوەی كوردی، وەزارەتی راگەياندن، بەغدا ١٩٩٨.

٧- د. كەمال مەزهەر ئەحمەد: مێژوو، بەغدا، ١٩٨٣، من منشورات دار آفاق عربية.

٨- ئەكرەمی مەحمووودی سالحی رەشە: شاری سلێمانی، بەرگی دوو، دەزگەی رۆشنبيری و بلاوكردنەوەی كوردی، وەزارەتی رۆشنبيری و راگەياندن، بەغدا ١٩٨٩.

٩- غەفووری ميرزا كەريم: كۆمەڵی زانستی...، چاپخانەی دار الجاحظ، بەغدا ١٩٨٥.

١٠- مستەفا عەسكەری: بزووتنەوەی هەقە، چاپخانەی علاء، بەغدا ١٩٨٣.

* ١١- بورسيف بورسوف: الواقعية اليوم وأبداً، وزارة الأعلام بغداد ١٩٧٤.

١٢- محمد علي الصابوني: تفسير آيات الأحكام، ج(١) دار الأحسان للنشر، طهران (سنة الطبع؟).

١٣- محمد بن أبي الحسن بن الحسين النيسابوري: وضع البرهان في مشكلات القرآن، السفر الأول، دار القلم، دمشق ط(١)، ١٩٩٠.

١٤- د. عبدالملك عبدالرحمن السعدي: شرح النسفية في العقيدة الأسلامية، ط(١) دار الأنبار، بغداد ١٩٨٨.

١٥- العميد شكري محمود نديم: الجيش الروسي في حرب العراق، ط(٣) مطبعة العاني، بغداد ١٩٧٤.

١٦- فؤاد حمه خورشيد (ترجمة): العشائر الكردية، مطبعة الحوادث، بغداد ١٩٧٩.

١٧- مجموعة من الأساتذة: العراق في التأريخ، دار الحرية للطباعة بغداد ١٩٨٣.

١٨- مجموعة من الأساتذة: أطلس العالم، مكتبة لبنان: طبعة جديدة، بيروت ١٩٩٨.

١٩- عبدالرزاق الحسني: موجز تأريخ البلدان العراقية، مطبعة النجاح، بغداد ١٩٣٠.

٢٠- جرجيس فتح الله: العراق في عهد قاسم، ج(٢) دار نبز للطباعة والنشر، سويد ١٩٨٩.

٢١- پێ ڕەش: بارزان وحركة الوعي القومي، (مطبعة ؟) ١٩٨٠.
٢٢- جرجيس فتح الله: رجال ووقائع في الميزان، حوار أجراه جريدة خبات، دار آراس للطباعة والنشر، هەولێر، ط(١)، سلسلة (٦٧) ٢٠٠١.
٢٣- محمد سعيد رمضان البوطي: فقه السيرة، دار الفكر، ط(٦) بيروت ١٩٧٧.

## گۆڤار و ڕۆژنامەکان

* ١- ڕۆشنبیری نوێ: دەزگەی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوی کوردی بەغدا، وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن:
ژمارە: ١٠٢ تەمووزی ١٩٨٤
١٠٣، ١٠٤ ئاب و ئەیلوولی ١٩٨٤
١٠٥ تشرینی یەکی ١٩٨٤
١٠٦ کانوونی یەکی ١٩٨٥: عوسمان شارباژێڕی کاروانی ١٧٨٤-١٩٨٤ی مۆسیقا و گۆرانی لە سلێمانی.
٢- ڕۆشنبیری نوێ: بڵاوکراوە بەڕێوەبەرێتی گشتی ڕۆشنبیری کوردی، بەغدا، وەزارەتی ڕاگەیاندن: ژمارە (٣٩) تەمووزی ١٩٧٥، جەمال بابان: مێژوویەکی لەبیر چووەوە.
٣- هاوکاری، ڕۆژنامە: دەزگەی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، وەزارەتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن، بەغدا: ژمارە (١١٥٠) لە ١٩٩٠/٢/٥
٤- ژیان، ڕۆژنامە: سلێمانی:
ژمارە ٢٧٩، ١٦ نیسانی ١٩٣١
٢٨٣، ٢٥ مایسی ١٩٣١
٢٨٤، ١ حوزەیرانی ١٩٣١
٢٨٧، ٢٥ حوزەیرانی ١٩٣١
٣٣٠، ١١ تەمووزی ١٩٣٢
٣٦٨، ٣ تەمووزی ١٩٣٣
٣٩٩، ٨ مایسی ١٩٣٤
٥- کاروان، گۆڤار: ئەمیندارێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر ژمارە (٦٣) ئازار و نیسانی ١٩٨٨.
* ٦- الثقافة الجديدة، مجلة: عدد (١٠) سنة (٣٨) آب ١٩٩١ سوريا، دمشق: د. رحيم عجينة: هل من تجديد في الموقف من الجنس؟

٧- القادسية، جريدة: عدد ١٩٨٩/١٢/١٥ الجمعة: أمين النقشبندي: وقائع ووثائق في حياة والدي..

* چاوپێکەوتن و سەردانی بەڕێزان:

١- جەمیلەخانی هاوسەری شەهید شاکر فەتاح لە ڕۆژی هەینی ٢٠٠٢/٦/٧

٢- مامۆستا سدیق مەحموود بەرزنجی لە ڕۆژی یەکشەممەی ٢٠٠٢/٦/٩.

٣- مامۆستا کەریم زەند لە ڕۆژی پێنج شەممەی ٢٠٠٢/٦/٦.

٤- مامۆستا خالید خاڵ لە ڕۆژی ٢٠٠٢/٧/٣

جگە لە چەند سەرچاوەیەکی دی کە لە جێی خۆیاندا ئیشارەیان پێدراوە.

# پێڕست